# وتاری سەردەم

وتاری هەینی
به زمانی سەردەم



مەلا ئەحمەدی قامیشی

# وتاری سەردەم

سەرنج وڕامان لەپرسەکانی ژیان
بەپێوەندگی ئیمان

نوسینی
مەلا ئەحمەدی قامیشی

١٤٣٥ك

**ناسنامە**

وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَاإِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ

ناوی کتێب : وتاری سەردەم

نوسەر : مەلا ئەحمەدی قامیشی

نۆرەی چاپ : دووەم

شوێنی چاپ : چاپخانەی شارستان/سلێمانی

بابەت : وتاری هەینی

تایپ : شۆخان قامیشی

تیراژ : ٥٠٠ دانە

ژ. سپاردن : ( ٢١٩٣ )ی، بەڕێوەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی:

ستەم وناعەدالەتی وپێشێلی مافەکان قسەوباس وکێشەی سەردەمە! کە دیاردەیەکە لە دەرەنجامەکانی سیستمی سیکۆلاری وعەولەمە،بابەتەکانی ئەم کتێبەکەمەقەیران و گرفتەکانی سەردەمەوتاری هەینی مزگەوتەکەمە،کەپێشترلەوتارەکانی ساڵی(٢٠١١) بەدواوەوخوێندومنەوەوپاشان لەگۆڤارورۆژنامەدابلاوم کردونەوە،ئەم چاپەکۆکراوەی کتێبەکانی(قسەی سەردەم،وتاری سەردەم مینبەری سەردەم،وتاری ڕەمەزان،بەرەوگۆڕان و هۆیەکانی بەختەوەری)کەلەکتێبخانەکانی بازاڕدانەماون، بۆیەبەدەستکاریەوە بۆسودی زیاترومانەوەیان بەپێویستم زانی لەدووتوێی کتێبێکداکۆبکرێنەوە،سەرجەم ئەوبابەتانەم لە وتاری هەینیداخوێندۆتەوەبەتایبەت لەسلێمانی،جاوەك چۆن کێشەوگرفتەکان زۆرن بۆیە باسەکانیشی هەمەجۆرن،هەندێ لەبۆنەکان سالآنەن ناچارهەندێ لەناونیشانی بابەتەکانیش دوبارەن بەلآم لە ناوەرۆکدا بەشێوازی کورت پوخت وسەردەمیانە نوسراوەتەوەلەگەڵ ڕەچاو کردنی بنەماشەرعیەکان،لەبەردرێژنەبون و دوبارەبونەوە(ارکان الخطبة)بنەماکانی وتاری هەینیم لەچەندوتارێکدانەبێ تێدانەنوسیوە،بەهیوای بەرچاوڕونی وبەئاگابون لەگرفت وپرسە هەنوکەیەکانی ژیان بۆچارەسەریان لەژێرڕۆشنایی دەقەکانی سوننەت وقورئان،بێگومان ئەم کتێبەش لەدوبارەوکەموکورتی خاڵی نیەولەئاست کەم توانایی خۆمدایە،ئەوەی پێکاومەلە خواوە یەوهەڵەکانیشی لەبەندەیە خوالێمان ببورێت،خواپاداشتی ئەوبەڕێزانەش بداتەوەکە هاوکاری چاپکردنی ئەم کتێبەیانکرد،بەهیوای خوێندنەوەودوعای خێر.

**مەلا ئەحمەدی قامیشی**

وتاربێژی مزگەوتی گەورەی هەواری شار

پێشنوێژی مزگەوتی شەفیق بەگ لەسلێمانی

Facebook mala ahmadi Qamishi

دەستپێك:

إن الحمدلله نحمده،ونستعينه،ونستغفره،ونعوذبالله من شرورأنفسنا،ومن سيئات أعمالنامن يهده الله فلامضل له،ومن يضلل فلاهادي له،أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له و أشهدأن محمداًعبدُه ورسولُه.

يَاأيها الذين آ مَنُوا اتقُوا اللهَ حَق تُقَا ته ولاتموتن إلا وأنتم مُسلمُون،

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً، وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَتَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً .

يَاأيهاالذين آمنوا اتقوا الله وقولواقَولاًسَديداً يُصلح لَكُم أعمالكم وَيَغفرلَكُم ذُنُوبَكُم وَمَن يُطع الله وَرَسُولَهُ فَقَدفَازَ فَوزاًعَظيما.

أمابعد: فإن خيرالحديثِ كلامُ الله وخيرالهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشرالأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

وتار وێنەیەكی جوان وبێگەردەلەسینەی سافی وتاربێژەوەدەردەكەوێ، گشت ڕەوشتەجوانەكانی تێدادەدرەوشێتەوە، وتاربێژی هونەرەڕۆشنبیریە،بەدواداچونی گۆڕانكاریەكانە،ڕێنمایی بەسودوهەواڵی ڕاست ودروستە بۆئاڕاستە كردنی جەماوەربەرەوبەختەوەری دنیاوذوارۆژ، هەریەكەلەوتارو وتاربێژ مەرجی تایبەتی خۆیان هەیەودەیان كتێب ونامیلكەلەوبارەوە نوسراون، وتاربێژ باخوازی حەقەوحەقیش بەلای ناحەقەوەڕەقە،بەتایبەت وتاری فیكری، بۆیە ڕوبەڕوی گرفت وكێشەی زۆردەبنەوەلەگرتن وگواستنەوەوتۆمەتباركردن،بە تایبەت لەم سەردەمی فیتنەدازیاترپێویستی بە(عِلم وحِلم)وخۆڕاگریە،بەندەش لەوپێناوەدوچاری دەربەدەری وگرفتی زۆربووەكەنزیكەی(٢٠)جارناچاری كۆچ وباربوم لەنەوەدەكانی سەدەی ڕابردو بەتایبەت لەدەڤەری بیتوێن لەچوارقورنەمزگەوتی(گولەك)ومزگەوتی جافان وگوندەكانی كفرەدۆڵ وگەرمكەداڵ ودواوەتاهەڵبجەوپاشان سلێمانی شایەتی ئەم ڕاستیەن،بێگومان ڕێبازی پێغەمبەران بەگوڵان نەچێنراوە،گرنگ ئەوەیەدڵسۆزبین زانای پەیاداربین نەك مۆزەف

# بیروباوەڕە کەت..ئەی موسڵمان

الحمدُلله..حمداًكثيراًكماأمَر،والصَلاةوالَسلامُ علـى حبيبنامحمدسيدالبـشر،وعلى الـهِ اصـحابهِ مااِتصلت بهِ عين بِنَظروأُذنُ بِخَبَر..وسلم تسليماًكثيراً.

امابعد: اصيكم ايهاالناس ونفسى قبلَكم بتقـوى اللهِ،فـانَ تقـواهُ أربَـحُ تجارةوبـضاعة،واحذَروا مَعصيَتَهُ قدخابَ عـبدُفَرطَ فى اَمرِرَبِهِ واَضاعة،وعليكُم بماكانَ عَليهِ السَلفُ الصالحُ والجَماعَـة، فخُذوابِهَديهم وماكانواعليهِ فى المُعتَقَدِ والعملِ والطاعَة..

سـلاوی خـوای گـەورەتان لەسـەربێت ئیمانـدارانی بەڕێزوخۆشەویـست: تێگەیشتنی ڕاست ودروست لەبیروباوەڕی یەکخواناسی(تَوحید)ی ئەهلی سـوننەوجەماعە چاکترین دەسکەوتە،ئیمان داینەمۆی سیستمی ژیانەچون تێگەیشتنی لاروخوارموسـڵمانی لاروخواری لێدەردەچێ،بۆیەبەپێویستم زانی بۆخوێنـەری بـەڕێزم لەسەرچاوەوە دەسـت پـێ بکـەین کەباوەڕە،موسـڵمانەتی تەنهاڕوکردنـە قیبلەونوێژورۆژونیە،بەڵکوپێـشی فیکـرەو باوەڕەکەلەدڵداجێگە دەگرێ وبەزمان دەگوترێ وبەکردەوەش ئەنجامدەدرێ، ئەگەر هـەموو ئیسلام بەدرەختێك دابنێین،ئەوەبیروباوەڕ ڕەگوڕیشەیەتی هەڵسوکەوت ورەوشـتی جـوانیش بەرهەمەکەیەتی،سەبارەت بەپێناسەی ئیمان زانایان بۆچـونی جیاوازیـان بـووە، بەتایبـەت لەسەرئەوەئایاکردەوەمەرجەبۆئیمان یـان تەواوکەرە؟بـەلام چـاکترین وتـەواوترین پێناسـەی ئیمان قسەی(ابن ابی عِزی حەنەفی) لەشەرحی کتێبی(العقیدة الطحاویة)دا دەڵێت:(مالـك وشافعی وئەحمەد وئـەزاعی واسـحاقی کـوڕی ڕاهویـەوزانایانی مـەدینـەو وەکۆمـەڵێك لـە زانایانی کەلام ڕایان وایەکەباوەڕبریتیەلە(الاعتقادبالجنان،والاقراربالِلسان،والعمل بالارکـان واتە:(باوەڕ بڕیاری دڵەوقسەوشایەتمانی زمانەوکرداری ئەندامانی جەستەیە)کەئەنجامـدانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگارە،پێشەوابخاری دەڵـێ: (زیاترلەهـەزارزانام دیـوە لـەجێوڕێی جیاوازداکەوتویانە بـاوەڕبڕیـارو کردارەوزیادوکـەم دەکـات)بۆیـەدەبینی لەقورئانـدائیمان وعەمـەل پێکـەوەهاتوەو(لازم وملـزوم)ی یەکترن،لـە کۆنەوەهەنـدێ دەسـتەوتاقمی وەك

(جوهمیەکانومورجیئیەکان)بون کردەوە یـان بەمـەرج دانـەناوەبۆئیمان وبەلایانـەوە تـە:ها بەڕاست زانینی ئیسلام بەسـەبۆ دینـداری بـەبێ کـردار!بـەوەش خزمـەتێکی زۆرکـراوە بـە دەسەلاّتدارە تاغوتەکان تالەسەرحوکم بن چـونکەئەوجۆرەدینداریەزیان بەپـەزەکانی ئـەوان ناگەیەنێ، بۆیەدەسـەلاّتەکان بـەردەوام لەخزمـەت ئەوجۆرەموسـڵمانانەدان کـە تـەنهاباس لەتەوحیـدی ئاسمـان وقەبروقیامـەتی ژێـر زەوی دەکـەن وناچـن بـەلای حـوکم ودەسـەلاّتی سەرزەویدا!،نمونەی ئیمان وکردەوەوێنەی ڕونـاکی چرایە،ئەگەرئیـسلام دابنـێین بەچـرایەك، ئـەوە شـەوقی چـراکە ئیمانەکەیەونەوتەکەشـی لـە جێگـای کردەوەیە،چـراتانەوتی زۆربـێ گڕوتینـی زیاتردەبێ،بەهـەمان شێوەش بیروباوەڕتـا زیـاترکردەوەی پـێ بکـەین پابەنـدبین پێوەی بەهێزتروبەرهـەمی چـاکتر ودیـارترە،(ابـن تیمیـە) ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت دەڵـێ: (حەتمـەن دەبێـت دیـن:کـرداروگوفتاربێـت،مکین نیەبـەدڵ یـان بـەزمان بـاوەڕی بـەخواو پێغەمبەر(ﷺ)هەبێت و بەکردەوەش هیچ فـەڕزێك نـەنجام نـەدا، هەربەقـسەبڵێ منـیش موسڵمانم،حەتمەن بەموسڵمان حسێب ناکرێت(مجموع الفتاوی،٧/٣٧٨)، ئیمـامی ئـەوزاعیش دەڵێ:ئەونەهلی سەلەفەی کەلەپێش ئێمەبون جیاوازیـان نەدەخـستە نێـوان بـاوەڕوکردەوە، بڕوانە(ابن رجب الحنبلی/جامع العلوم الحِکَم١/١٠٤،و ابن تیمیه: **مجموع الفتـاوی ٧/١٨٦**)، لەونێوەندەدانـەهلی سـوننەوجەماعەت مامناوەنـدن لـەنێوان(مورجیئـە)و(خـەوارج و موعتەزیلە)بەپێـچەوانەی مورجیئە،چـونکەئەو کەسـەبەکافردەزانن کەبەیـەکجاری واز لـە کرداردەهێنێت وئـەوەیان بـەکافر نـازانن کـە هەنـدێك کرداروازلێدێنێت،جگەلەشایەتمان، باوەڕبـەبێ کـردار پیـشەی بێبڕوایانـەوکرداریش بـەبێ باوەڕپیـشەی دووڕوەکانەبـەلاّم (بڕیاروگوفتاروکردار)کاری موسڵمانەنیشانەی تەواوی ئیمانـە،(حـافزی حەکـەمی) دەڵـێ: ئیمان بەکردەوەی چاکەزیاددەبێت وبەخراپـەکاری کـەم دەبێـت(**ایماننـا یزیـد بالطاعـات.. ونقصه یکون بالزلات**)ئیسلامەتی ودینداری بەقسەی ڕوتی بێ کردەوە قبوڵ نیەودەعوای بێ دەلیل وەرناگیرێ،حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)کاتێ ویستی وتـارێ بـدات

بۆئازادکردنی بەندەکان لەسەر داوای کۆمەڵێ عەبدماوەیەك وەستاتابۆخۆی بەندەیەکی کڕیوئازادیکرد، پاشان چوەسەرمینبەرووتارێکی کاریگەریدا کەبوە هۆی ڕزگارکرانی زۆر لە بەندەکان چونکەکرداروگوفتاری یەك بو،نەك وەك ئەوکەسەی کەوتویەتی (بەقسەم بکە بەڵام بەعەمەلم مەکە!)چونکەکەس گوێ بۆقسەی بێ کردەوە ناگرێ،ئیمانیش درەختێکی هەمیشەسەوزە،هەموکات بەرهەمی شیرینی خۆی دەدات،کەبریتیە لەسەرجەم ڕەوشتە جوانەکان وکردەوەچاکەکان،هەروەکو خراپەوتاوانیش بەرهەمی بێباوەڕیەهەرچەندەلە بەرگێکی جوانیش دابێت، تەنهاباوەڕی ڕاستەقینەیەکەمرۆڤ دەگۆڕێ بەرەوچاکە،ئیمان بووکەهاوەڵانی پێغەمبەری والێ کردبوکە پێشبڕکەیان دەکرد لەخێروچاکەدا،امامی عمر(خ)(پێش ئیسلام بوونی کچی زیندە بەچاڵ دەکردوزۆردڵ ڕەق بو،بەڵام دوایی یاری لەگەڵ منداڵان دەکردودەیخستنە سەرپشتی خۆی،هاوەڵان لەکەشێکی ئیمانی دا دەژیان کە پڕی بوولە ڕاستی وپاکی وچاکی وخۆشەویستی،بەڵام گەربەراوردی بکەین لەگەڵ ژیانی ماددی ئێستاماندا ئاسمان وڕێسمانی بەینە،ئیمانداری لەکاتی شین وشایی دالەکڕین وفرۆشتن دا دەردەکەوێ کابرایەك لای امامی عمرمەدحی کەسێکی کردپێشەواعومەرپێی وت:مامەڵەوسەفەرت لەگەڵ کردوە؟وتی نەخێر، ئەی هاوسێت بووە؟نەخێر،فەرموی کەواتەنایناسی،

**ئیمان سێ دوژمنی سەرەکی هەیە:**

یەکەم: نەفس/کەئەبێ کۆنترۆڵی بکەی جیهادی بکەی چونکەئەوهەرداوا دەکات حەلاڵ بێ یان حەرام،بەلاّم نابێ بیکوژی ولەسنوری شەرعدا دەبێ داوا کاریەکانی بەجێ بێنێ (ان لنفسك عليك حق)

دووەم:دنیا/ئێمە دژی ماڵ وسامان نین بەڵکوچاکترین هۆکارووەسیلەیەگەرنەبێتە مەبەست و ئامانج،چارەسەری ئەوەش قەناعەت ودنیابەکەم گرتنە،امام غەزالی جوانی فەرمووە دەڵێ:(خوایە دنیا بخەیتە باخەڵمەوە بەلاّم نەیخەیتە دڵمەوە).

سێیەم: شەیتان/ئەتوانین دژایەتی بکەین لاوازی بکەین بەلاّم ناتوانین بیکوژین، جاهەر کەس ئیمانەکەی پاراست لەم سێ دوژمنە ئەوە ئیمان داری ڕاستەقینەیەولەدنیاو دوا ڕۆژداسەرفرازوبەختەوەرە، جاوەك پێشەواعلی بەحاریسی ئەحوەتی فەرمووی:(..اعرِف الحق تَعرف اهلَهُ،ئەی حارس حەق بەخەڵکداناناسرێتەوە،حەقەکەبزانە حەقناسان دەناسیتەوە)کەحەقت ناسی دڵنیادەبی کەدین نابێ جوداببێ لەژین بەڵکوهەمووژینە.. دنیاودوارۆژە، لەکۆتایدانەی خوشك وبرای موسڵمانم لەم سەردەمی فیتنەیەدا: مەکەوەشوێن قەرە بالّغی،وانەزانی هەرکۆمەڵێك زۆربونەوە ڕاستەوشایەنەلەگەڵیابیت نا، حەق بەزۆرینەوکەمینەیان بەفلاّن وفیسارناناسرێ،بەڵکوبەپێوەری قورئان وسوننەت دەناسرێتەوە،بۆیە لەکەمی هاوبیروبرایانت ڕەشبین مەبە، دڵخۆشبە بەوەی حەقت ناسیوەوپێوەی پابەندی(ابن القيم)لە(مدارج السالكين١/٢٢) دەڵێ:پێویستەرێبازی حەق بگریتەبەرکەمی ڕێبوارانی ئەوکاروانەبێتاقەتت نەکات، نەکەی ڕێی ناحەق بگری ولەگەڵ زۆرینە دانغرۆبیت،باعەقیدەمان پاك بکەینەوە لەشیرك وبیدعەوریاونەفسانەباکوفر بە تاغوت بکەین ودەست بەرێسمانی توندی خواوە بگرین و بادورکەوینەوە لەو شتانەی کە ئیمان هەڵدەوەشێننەوە (ڕیسەکەمان نەکەینەوە بەخوری ).

# بیروباوەڕ ژیانە

گەورەترین هۆکاری بەختەوەری ژیان بۆمرۆڤەکان بیروباوەڕە،باوەڕی چاك و پاك چرای دڵانە،داینەمۆی ژیانە،چونکە مرۆڤ هەرچی دەیکات لەژیانیدا ڕەنگدانەوەی ئەوبیرو باوەڕەیەکەلە مێشکی دایە،ژیانی چاکوپاك زادەی بیرو باوەڕی چاکوپاکە،کەواتەباوەڕ ژیانە،خوای گەورە فەرموویەتی﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾النحل٩٧ واتە:هەرئیماندارێك نێربێت یان مێ کاروکردەوەی چاك بکات ئەوەلەدنیادا بەشادی وکامەرانی دەیژێنین، وەلەڕۆژی دوایشدابەباشترپاداشتیان دەدەینەوە، ئەمەوەعدی خوایەکەبڕواداربەختەوەرە لەدنیادا چونکەبەری ئیمان کردەوەی چاك وپاکەکرداروگوفتاری شیرینەبەوەیش خۆشی دەکەوێتە نێودڵی،بەڵام بەبێ ئیمان وباوەڕژیان ژانە،چونکە ئەوە بەرهەمی بێ بڕوایە کەسەرەڕای تەکنەلۆژیای سەردەم،قەیرانوکێشەکان لەزیاد بوون دان،وڵات لێوان لێوەلە گەندەڵی و خیانەت خەڵکی بێزاروخەمبارە،ساڵێ بۆساڵێ خۆزگەبەپارە،بۆجیهان دەرکەوتوەکەبێ باوەڕژیان مەحاڵە بەختەوەری دەستەبەربکات،ژیان لە بێ باوەڕیداخەم وخەفەت وکێشە و ناڵۆزی ونائارامیە،وەك خوای گەورەفەرمویەتی(من اعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكاً) دیارەژیان تاقیکردنەوەیە بەخۆشی وناخۆشی،تەنها ئیمانداری ڕاستەقینەیە دەتوانێ لە هەردووبارەکەدا ئارامی دەروونی دامەزراوی بەدەست بێنێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویە {عجبالأمر المؤمن ان امره كله له خير...} واتە:کاری بڕوادارجێگەی سەرسوڕمانەکە هەمووکات لەخێردایەو لەکارە کانیدا چونکەئەگەرکەوتەخێروخۆشی سوپاسی خوادەکات وخێری بۆدەنوسرێ ئەگەرتوشی ناخۆشی بوئەوەئارامگرەو وخێری بۆدەنوسرێ، ئەوەتەنها بۆبڕوادارەکەلەهەردوو بارەکە دالەخۆشی وناخۆشیدالەسایەی ئیمانەکەیدالەخێردایە،خێری سوپاسگوزاری وئارام گرتن کە دەبنە هۆی ئارامی دڵ وبەختەوەری دنیا ودوارۆژ، بۆیە دەبینی کەدووکەس دوچاری خۆشی یان ناخۆشی دەبن،هەڵوێستی هەریەکەیان جیاوازدەبێت

بەپێی ئەوبیرو باوەڕەی کەلەمێشکی دایە،بۆنمونە مسڵمانی ڕاستەقینە کەدوچاری نەخۆشی و ناخۆشی بوو بەهۆی ئیمانەکەی قەناعەتوڕازی بون وئارامی بۆدرست دەبێ،وەك خەڵکانی دنیایی ناکەوێتەهات وهاواروناشکوری وخراپەکاری وەئەگەرکەوتەخۆشیەوەو دەوڵەمەند بویان سەرکەوت،لوت بەرزوبایی نابێ و لەحەق لاناداوکەسایەتی خۆی دەپارێزێت وبەردەوام کرداروگوفتاری شیرینی ئیمانی لێ دەبینرێ ئەم دووحاڵەتە جیاوازە لە شین وشایی دا لەم ڕۆژگارەدا بە زەقی دەبینرێ، خۆکافرومسوڵمان،چاك وخراپ هەردولایان هاوبەشن لە خۆگری وئازایەتیدا بەرامبەرناخۆشیەکان بەڵام مسوڵمان بەهێزی باوەڕی ئارامگرتن وپشت بەستنی بەخوداو ئومێدی پاداشتی دوارۆژئازاترودامەزراوتردەبێت وئازارە کانی لەسەرسوك تردەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللّهِ مَالاَيَرْجُونَ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماًحَكِيماً﴾ (النساء/١٠٤) واتە:لە کاتی ڕوبەڕو بونەوەداکەئێوە ئازارونارەحەت دەبن، ئەوانیش وەك ئێوە ماندوو دەبن،بەڵام ئەوەی ئێوەبەتەمان وچاوەڕێین لەپاداشتی دوارۆژئەوان نیانە،بۆیەباوەڕبە خواژیانێکی ئارام بۆخاوەنەکەی دەستەبەردەکات،چون هەرخوایە بەختەوەری دەبەخشێت،بەختەوەری وئاسودەیی دڵ ودەرون تەنهالە باوەڕەوەیە.

# زيان ومەترسيەكانى شيرك

الحَمدُلله الغنى الحَميد..المُبدىءِ المُعيد..ذى العَرشِ المَجيد..الفَعال لمايُريد،

أشْهَدُأن لاَ إلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَه العزيزُالحميد،وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ افضلَ من دعاالى الايمانِ والتَوحيد،اللهم صَلِ على محمدِوعلى الهِ اصحابِهِ ومَن يَتبعهم مِن صالِحى العَبيد، امابعد: فَياعِبادَالله اتقواالله تعالى واطيعوه،وعَظِمواامرَهُ ولاتُعصوه...

يەكێك لەهۆكارەكانى دواكەوتنى كۆمەڵگەی موسڵمانان بەهەڵەحاڵيبون لەدين و شوێن كەوتنى بۆچونى لاروخواروشيرك وبيدعەتە!چاكترين دەستمايەو سەرمايەی موسڵمان بيرو باوەڕێكى ڕاست ودروستەكەمايەی سەرفرازی دنياو دوارۆژە(افضلُ الاسلام الايمان) چونكە بيروباوەڕی ڕاست كەسێتى ڕاست و دروستى لێدەردەچێ كەدەبنەخاوەنى ڕەوشتى جوان وڕەسەن وپەسەن،وەبە پێچەوانەيشەوە چونكەمرۆڤ هەرچى دەيكات ڕەنگدانەوەی بيرو بۆچونيەتى، بۆيە شەيتان بەردەوام لەهەوڵدايە(عيبادەت)وبەندايەتى بڕواداران تێكەڵى شوبهەو شيرك وبيدعەت بكات بەوەش ڕەنج بەخەساردەبن ودەستيان لەهەمبانەی بەتاڵ دەردەچێ. بزانەكەئيمان بەهەندێ شت هەڵدەوەشێتەوە،وەك چۆن دەست نوێژدەشكێ وبەتاڵ دەبێتەوە، لەبەرئەومەترسيەگەورەيەپێغەمبەرمان(ﷺ)بە گەورەترينى تاوانە گەورەكانى داناوە (أكبَرَالكَبائرالاشراكُ باللهِ...)وەهەروەها فەرمويوتى:(ئەوەی زۆرلێى ئەترسم ئەوەيە كەهاوەڵ بۆخوابڕياربدەن،چونكە شيرك زۆرناديارەبۆيەمەترسيدارە(اخف من دبيب النمل..) ناديارترەلەخشەی پێى مێرولەيەك لەشەوێكى تاريكدالەسەربەردێكى لوسدا بڕوات،بۆيە شيرك تێكەڵى كرداروگوفتارت دەبێت وبەخۆت نازانى!دەبێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) هەمو بەيانيەك پەنابگرين بەخوالەشيرك لەوەی دەيزانينونايزانين،نمونەی شيرك:{هاواروپەنابردن بۆغەيرى خوابۆفلان وفيسارمردوبێ يان زيندوشيركە،سوێندخواردن بەغەيرى ناوو سيفەتە كانى خوا شيركەوەك بەخوێنى شەهيدان وگۆڕی پياوچاكان وسەری من وتۆ،يان لەدادگای شەرعى خواوياساى دەستكردكاميان قازانجى ماددى تێدابوبەودەكات! لەكاتێدا لەهەر

دووبارەکەدادەبێ بەشەرع ڕازی بێت وهەربراوەیشەچونکەبەفەرمانی خوای کردوەونیشانەی ئیمانی ڕاست ودروستە}گەردەتەوێ خواڕازی بێت وڕوحمت پێبکات دەبێ بەگوێی بکەی، (امام علی/خ)فەرمویەتی:(حەق بناسە،ئەوجانەهلی حەق دەناسی)بۆیە دەبێ بەهۆی تێگەیشتن لەبیروباوەڕی ساغەوەئیسلامەکەبناسی ئەوکاتەدەزانی کێ ئیمانداری ڕاستەو کێش بە(ئەعرابی)بۆتەوەوتەنهاڕوکەش ودیکۆرە،لەتەفسیرەکەی مەلای گەورەی کۆیەدا نوسیویەتی وەك نوکتەیەك:مام سۆفیەك لەوتاری هەینیدازۆردەگریا،کاتێ مامۆستالێی پرسی،ئەویش ئەڵێ لەترسی خوائەگریم،جابەچ شێوەیەك خوا دەناسی؟لەوەلاّمداوتبوی:نوەلاّ ئەوەندە دەزانم کەئەم دنیایە(خواوپێغەمبەروغەوس) ڕایانگرتووە!مەترسیەکە لێرەدایە سەرەڕای ئەوهەمودڵسۆزیەیش،ئەگەرئەوکات وشیاری کەم بوبێت خۆئێستا هیچ پاساوێك نەماوە،شیرك ژەهری کوشندەوهەڵوەشێنەری ئیمانەوخوای زانابەگەورەترین ستەمی داناوە! وەك لەسەرزمانی لوقمانی حەکیم فەرمویەتی: (وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) واتە: کاتێ لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردوتی کوڕە شیرینە کەم هاوەڵ بۆخوادامەنێ بەڕاستی شەریك بۆخواقەراردان زوڵم وستەمێکی گەورە یە،ئەوەتاشیرك گەورەترین زوڵمەوزوڵمیش واتە دانانی شتێ لەجێگەی خۆی نەبێت وبەوکارەت بزانی یان نەزانی بەندایەتی بۆغەیری خوا دەکەی، گەرسەرنج بدەینە زیانەکانی شیرك بەکورتی دەبینین کە:

١)ستەمە لەمافی خودا،چون ئەوەی پەناوهاواری بۆدەکەیت دەیکەیتە هاوتای خودا،لەکاتێکدافەرمانمان پێکراوەتەنهاداوالەخوابکەین وپشت بەوببەستین (اذاسالتَ فاسالِ الله واذا استعنتَ فاستعن بالله..)ئەوپیاوچاکەتالەژیاندابو عیبادەتی دەکرد،ئەوبۆخۆی چاك بووەنەك بۆتۆ،پاشان بەڵگەوزەمانەت چیە خوالێی ڕازیەولەبەهەشتدایە؟ئەگەربەڕاستی خۆشتدەوێ ڕێبازەکەی بگرە.

٢)ستەموغەدرەلەخودی خۆت،کەخۆت زەلیل وداماودەکەی دەبیتە عەبدی

عەبدان لەوبەپیرۆزدەزانی وخۆی بەخزمەتکار،کەخوابەئازادی دروستیکردوین.

**٣)شیرك بنەمای ستەمە**،بۆیەموشریك ستەمکاروستەمکاریش دکتاتۆرەو ناڕەوایەودژی حەقەودەبێ لابرێ وشەی حەقیش لەقورئاندا لەبەرگرنگی وگەرەیی(٣٠٠)جاردوبارەبۆتەوە! بۆیە سەرجەم قەیرانەکانی ئەم ڕۆژگارەیش بەهۆی سیستەم وسەرکردەموشریکەکانەوە بەردەوام خۆنیشاندان وکێشەوهەرای لێکەوتۆتەوەوبەنیشانەی ئازادی ودیموکراسی ناوی دەبەن! لەکاتێکداهەمونەوراستیەدەزانین کەمرۆڤ تانەچەوسێتەوەوناچارنەبێت هاوارناکات.

**٤) شیرك سەرچاوەی خورافات وخەیالاتی نادروستە**،وادەزانێ فلان قەبر کوڕی دەداتێ ورزقی زیاد دەکات وفلان پیاوچاك شیفادەداتوشێت وهارچاك دەکاتەوە!موروی شین ونالی گوێدرێژوپەڕۆی سەوزلەچاوەزاردەیپارێزێ! کە ئەمانەمافی خودان،ئەگەروایە ئەوانەبۆخەمی خۆیان ناخۆن،یان دەڵێن غەوس لەنگەری بەغدای ڕاگرتوەوامام علی زامنی قەرزە..! پەنا بەخواگەروابزانی خواکارەکانی دابەشکردوە بەسەربەندەکانی داتاکو یارمەتی بدەن!بت پەرستەکانی مەککەیش دەیانزانی خواهەیەبەلام دەیانگوت ئەم بتانەلەخوامان نزیك دەکەنەوە،(لِيُقرِبنـاالى اللهِ زلفـى)تەنانەت شفاعەتی فریشتەوپێغەمبەران ئەوکەسانە ناگرێتەوەکە،هاوبەش بۆخوابڕیاردەدەن،بەڵکوتەنهابۆ یەکخواپەرستانە(موحد)نەك موشریك، امام عمرکانێ بینی خەلکانێ داری ڕیزاوانیان بەپیرۆزدەزانی ودەستیان پێدادێناودەکرایە موتفەرك فەرمانیدابڕیان!(شجرةالرضوان)ئەودارەبوکەپێغەمبەر(ﷺ) لەژێریدابەیعەتی لە(١٢٠٠)کەس لەهاوەلانی وەگرت،کەس هەیەلەپێغەمبەرچاکترو گەورەتر؟بێگومان نیە.

**٥)شیرك دەبێتەهۆی پەرتەوازەیی**،چون هەرکەسەشتی خۆی بەچاك دەزانێ،بەوەش خۆمانە خۆمانەی ناڕەوادروست بوە(هەرکەسەبەیارێ خۆیداهەڵ دەدا) ئێستادەبینی هەندێ لە موسڵمانان بەشێکی ئاینەکەیان بەتوندی گرتوەوتەنهاخۆی بەڕاست دەزانێت ودژایەتی بەرانبەرەکەی پێ دەکات!چارەسەریش بیروباوەڕی تەواو دامەزراوەبەتێگەیشتنی دروست.

**٦) موشیرك وبیدعەچی لەهەموشتێ دەترسێ جگەلەخوا!چونکەبەلایەوەفلان** وفیسارتوشی

خێروشەڕی دەکەن یان دەپارێزن!داهێنانی هەربیدعەیەکیش سوننەتێك دەمرێنێ،شە ك وبیدعـــــەی مۆدێرنیـــــشیان بۆنـــــاردوین وەك بورجـــــەکان و بیروبـــــاوەڕی سیکۆلاروعەولەمەوریالیزمی و...هتد.

٧)هاوەڵ بڕیاردان بۆخوانیشانەی عاقیبەتی شەڕەچونکەخواهەرگیزلە موشریك خۆش نابێ

## جادوگەری وفاڵچێتی (السحروالكَهانَة)

ئیمان ئەبێ بەکرداروگوفتاری چاك وپاك بسەلمێنرێ وبەهێزبکرێ،لەبەرانبەردائەبێ لەشتە خراپەکانیش بژاربکرێ وپاك بکرێتەوەولەشیرکوبیدعەوهەمونەو شتانەی ئیمان لاوازدەکەن یان هەڵی دەوەشێننەوە،لەدوو وتاری ڕابردوباسی گرنگی ئیمان وزیانەکانی شیرکمان کرد، لەم وتارەدابەکورتی تیشك دەخەینە سەردووڕەفتاری خراپ کەحەرامن ولەڕیزی تاوانە گەورەکانن وکاروپیشەی بێباوەڕانەنەوانیش:جادوگەری وفاڵچێتیەکەهەڵوەشێنەری ئیمانە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(اجتنبوا اسبع الموبقات، قالواماهی؟ قال:الاشراك بالله والسحر ..)(بخاری ومسلم)واتە:خۆتان دوربخەنەوەلەحەوت شتەفەوتێنەرەکەکەمرۆڤ بەهیلاك دەبەن، ئەوانیش شیرك وسیحرو..،یەکسەرلەدوای هاوەڵ بڕیاردان سیحرەولەڕیزی تاوانەگەورەکانە، سیحربریتیە: لەکردارێکی ناواقیعی چەواشە کاری لەڕێگەی نوشتەی ناشەرعی یان فوکردن بەگرێ یا مەشق وڕاهێنانێکی تایبەتە کەلەڕێگەی خێرایی دەستەوە ئەنجام دەدرێتوفێڵ لە چاوی بینەردەکرێت وەك لەبینینی بریقەی سەراب(تراویلکە)یان خێرای سوڕانەوەی پەڕەکانی پانکەبەجۆرێك وادەبینرێت کەبۆشاییان نییە،خوای گەورە فەرمویەتی: (سَحَروا اعینَ الناسِ واسترهبوهُم وجاءوا بسحرٍعظیم)،یان جاری وایەلەڕێگەی تیشکی چاوزیان لەبەرانبەردەدرێت!بەتایەبەت ئەوانەی خوی حەسودی تیایاندابەهێزە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەمویوتی:(العین حق..) چاوەزارحەقە،کەزانایان ئەم تیشکەیان بەحاسەی شەشەم داناوە، وێنەی ئەوەلەم ڕۆژگارەداتیشکی لەیزەرەکەنابینرێت ونەشتەرگەریشی پێدەکرێت ویێنەوەی نەخۆش هەڵبدرێت یان هەست بکات،سیحرلەقورئانوفەرمودەدازۆرباسی لێوەکراوەومێژوە

کەشی زۆرکۆنەودەگەڕێتەوەبۆپێش سەردەمی حەزرەتی سولەیمان وموسابۆدووفریشتە کە (هاروت وماروت)لەبابل بلاّویانکردەوەتاخەڵکی خراپی وکوفری سیحریان بۆدەربکەوێت وهاوکات پێشیان دەوتن ئەوەبۆتاقیکردنەوەیەوخۆتی پێکافرنەکەی(انما نحن فتنه فلاتکفر)، وەتاچیترپەیامبەرانی خوابەساحرتۆمەتبار نەکەن،سیحرلەپێغەمبەری خۆشەویستمان کراوە لەلایەن(لەبیدی ئەعصەمی)جولەکەوخوای گەورەلەرێگەی فریشتەوەئاگاداری کردەوە ئازارەکەی نەما،سیحرکاریگەری هەیەلەسەرمرۆڤەکان ونەخۆشیان دەکات ئاژاوە دەخاتە نێوان ژن ومێردەوە،بەلاّم بەئیزنی خودایەوبەندەکانی پێ تاقی دەکاتەوە، بۆیەبۆ خۆپاراستن بەیانی وئێواران هەرسێ سورەتی (ناس وفەلەق والاخلاص)بخوێندرێ.

* شوێن هەڵگروفاڵچێتی(العرافەوالکهانە)

کاهن بەوانەئەڵێن کەشەیتانەکان هەواڵیان بۆدێنن وبەشێوەیەك خۆیان دەردەخەن کە غەیب دەزانن،بێگومان ئەوەدرۆیەوشیرکەولەخوابەولاوەکەس غەیب نازانێ،دایکمان عائشە(خ) فەرموی:خەڵکانێك لەبارەی فاڵچیەوەپرسیان لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەویش فەرمووی: ( لیس بِشَیء )واتە ئەوەهیچ نییە،وتیان: ئەوان باسی هەندێ شت دەکەن ڕاست دەردەچێ، جا پێغەمبەری خوافەرموی: ئەو وشە ڕاستەشەیتانەجنێکە دەیدزێت لەفریشتەودەیچپێتە گوێی دۆستەکەی کەفاڵچیەکەیەئەویش سەددرۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکات(رواەالبخاری وملسم) حوکمی شەرعی/ ئەوەیە کەهەرکەس بڕوات بۆلای فاڵچیەك وتەنهاپرسیاری لێبکا چل شەودوعاوتاعەتی لێوەرناگیرێ! خۆئەگەرباوەڕی پێبکات بەوەی کەدەیڵێت ئەوە کافربوە بەوەی بۆمحمد(ﷺ)هاتووە،(من اتی عرفااوکاهنا فصدقهُ بمایقول فقدکفربما انزل علی محمدﷺ پەنابەخواگەرتەوبەنەکاتوپەشیمان نەبێتەوەلەبازنەی ئیمان دەچێتە دەرەوە، بەداخەوەزۆرجارئەوانەلەبەرگی ئاییندا خۆیان دەردەخەن تابڕوایان پێبکرێت چونکەخۆیان دەزانن کەجادوگەری وفاڵچێتی هەردوکیان لەرێگەی شەیتانەوە هاوکاری دەکرێن وشیرکە، سیحربازوفڵچی نەك بۆخەڵکی بەڵکوبۆخۆشیان هیچیان لەدەست نایە،ئەگەرڕاست دەکەن

باژیان وگوزەرانی خۆیان خۆش کەن،بەلاّم وەك خوا دەفەرمیّ: (ویتعلمون مایضرهم ولاینفعهم)تەنیافێری زیان گەیاندن دەبن وهیچ سودیان پێناگەیەنیّ، وەبڕیاری خوایەکە سیحربازوفالّچی لەناوخەلّکدا سوك وبێڕێزن(ولایفلحُ الساحرون)و کارەکەیان تەناهازیان گەیاندن وئاژاوە نانەوەیەولادانی خەلّکە لەڕێگەی ڕاست، بەپەنا بردنیان بۆجنۆکەو شەیتانەکان ئەوەی زیاتربازاڕیان گەرمتردەکات ئافرەتانن !دایکان وخوشکانی بیّ ئاگا دەچن بۆکێشەی ناومالّ ومێردونوشتەی ڕەشی وشتی گوم بوولەجیاتی پەنابردن بۆخوا، سەرەڕای بەفیڕۆدانی پارەیەکی زۆرودروستکردنی کێشەی کۆمەلاّیەتی وتۆمەتبارکردنی هاوسێکان،سیستمەبێباوەڕەکانیش زیاترگرنگیان پێدەدەن ویارمەتی ماددی ومەعنەویان دەکەن وهەندیّ لەمیدیاکانیش بەرنامەی تایبەتیان بۆدادەنێن پەنابەخوالەشەڕی سیحربازو فالّچیەکان،چارەسەریش:تێگەیشتنی ڕاست ودروستەلەعەقیدەی ئەهلی سوننەوجەماعە، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری و پشت بەستن بەخواوتەقواو ئارامگرتنە:

(..ان تصبرواوتتقوالایضرکم کیدهم شیئاً).

---

*ئەم تەوەرەچاوپێکەوتنیکی بەرنامەی هەیڤینی(T.V)جەماوەرلە ٢١/٦، لەگەلّ بەندە کرا.

# ڕۆڵ و پێگەی مزگەوت

الحمدُلله..حمداًكثيراًكماامر،والصلاةوالسلامُ على حبيبنامحمدٍسيدالبشر،وعلى اله اصحابه مااتصلت بهِ عين بِنَظروأذنُ بِخَبَر..وسلم تسليماًكثيراً.

امابعـد: اصيكم ايهاالناس ونفسي قبلَكم بتقوى اللهِ وطاعتِهِ وسارعواالى مَغفرتِهِ ومرضاتِهِ قبل انصرامِ وفواتِ اوقاتهِ وساعاتهِ...،قال تعالى(ان اول بيتِ وضع للناس للذى ببكة مباركاَ...)

**مێژووی مزگەوت/** یەکەمین وگەورەترین وکۆنترین مزگەوتومالّی خوالەسەر زەوی مزگەوتی حەرامە(کەعبە)قیبلەی موسڵمانان لەشاری مەککەی سەر دەمی حەزرەتی ئادەمە(ان اول بيتِ وضع للناس للذى ببكة مباركاَ..)حەزرەتی ئیبراهیم وئیسماعیل لەسەربناغەی پێشتر دروستیان کردۆتەوە(اڑيرفع ابراهيم القواعد من البيت)خێری نوێژێك بە (١٠٠٠٠٠)، دووەم مزگەوت لە گەورەیی وپیرۆزیدا مزگەوتی(أقصا)یە لەقودس کە(٤٠)ساڵ کەدوای کەعبەدروستکراوە لەلایەن حەزرەتی داودوسلێمانی کوڕی خێری نوێژەکانی(١بە٥٠٠)، سێیەم مزگەوت لەگەورەیی وپیرۆزیدامزگەوتی پێغەمبەرە(ﷺ) لەمەدینەی پڕنورەکە بەدەستی پێغەمبەروهاوەڵانی بەردی بناغەی دانراوەونوێژەکانی یەك بەهەزارە،بەپێی ئامارەکان کوردستاندا زیاترلە(٤٥٥٩)مزگەوتی تێدایە،هەرچەندە زۆرکۆسپ وتەگەرە دەخرێتەڕێگای دروستکردنیان وبەگران مۆڵەتیان پێدەدەن!لەگەڵ ئەوەشدا هەرلەزیادبوندان، لەبەریتانیا(١٥٠٠)مزگەوت هەیە،لەئەڵمانیا(٢٠٠٠)ولەڕوسیازیاترلە(٧٠٠)مزگەوت هەن

گەورەیی مزگەوت/( الله نورالسموات والارض..)واتە خواڕوناکی ئاسمانەکان و زەوییە، خواسەرچاوەی ڕوناکیەومیتۆدووێستگەوسەرچاوەی ئەونورورووناکیە ش لەسەر زەوی مزگەوتەکانن،جابزانەشوێن کەوتەی نوری یان نار؟

ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت/ بە دووشێوە ئاوەدان دەکردێتەوەنیەکەمیان ماددییە ئەوانەی بەماڵ وسامانی خۆیان دروستی دەکەن وخێروپاداشتەکەیشی ماڵێکەلە بەهەشت وەك

پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:(من بنی لله بیتاً بنی اللهُ له بیتاً فی الجنة)واته هەر کەسێ ماڵێ بۆخوادروست بکائەوەلە بەهەشتاخوامالێکی بۆدروست دەکات، ئاوەدان کردنەوەی دووەمیان مەعنەویەبەعیبادەت و خواپەرستی ئەنجام دەدرێ کەلەسەرخەڵکی گەرەکەبەردەوام لەخزمەتیدابن وچۆڵ وغەریب نەبێت لەناویانداهەوڵبدەن زۆربەی بۆنەکانیان بگێڕنەوە ناو مزگەوت وەك ئاشتەوایی ومارەبڕین وخوێندن و...هتد، نەك تەنها پرسە،

ناوی مزگەوت/بەزمانی عەرەبی(مسجد)واتە:شوێنی کوڕنوش وسوجدەبردنە، (جامع) مزگەوتێکەجومعەی تێدابکرێ کە(جمع)وکۆکەرەوەی خەڵك وزانستە.

ماناومەبەستەکانی مزگەوت:

یەکەم/ لەمزگەوتدا میحراب هەیەکەلە(حَرب)ەوەهاتوە واتە:جەنگ کەدەبێ لەپێشدا شەڕی نەفس وشەیتان بکەیت ولەمزگەوتدا خۆت پێبگەیەنی بۆڕوبەڕوبونەوەی بێباوەڕان نەك شەڕ لەگەڵ موسڵمانان .

دووەم/مزگەوت پەرلەمانی گەرەکەوشوێنی کۆبونەوەی ڕۆژانەی موسڵمانانی ئەوناوچەیەیە بەوەیش برایەتی ویەکڕیزی وخۆشەویستی بەرجەستەدەبێت.

سێییەم/ مزگەوت وەزارەتی ڕۆشنبیریە:کەلەسەرتاوە مەڵبەندی زانست و زانیاری بوە بۆڕێگەی ڕاست،شوێنی هەڵکەوتن ودەرچونی کەڵەپیاوانە(رجال لاتلههم اموالهم ولااولادهم عن ذکرالله)واتە:پیاوانێك کەماڵ ومناڵ بێئاگایان ناکات لەیادی خودا،سەرجەم پێشەوایانی وەك(حەنەفی وشافعی ومالکی وئەحمەد،وەلەکوردیشدا سەرجەم شاعیرەگەورەکانی وەك(نالی ومەحوی و مەولەوی ومەلای جزیری وسەرجەم سەرکردەوشۆڕشگێڕەکانی وەك قازی و شێخ سەعیدوسەرجەم زاناگەورەکانی وەك:ابن تیمیەوابن خلکان وابن صلاح ونۆدشی وبێتوشی ومەلای گەورەی کۆیەومەلا جامی ومەلاعەبدولای قامیشی ومەلاعبدوالکریمی مودرس وسەرجەم شێخان وپیاوچاکانی ئەم گەلە دەرچوی مزگەوتن،ئەگەرکوردئەوانەی لێدەربکرێ یەکسانەبە سفر،بۆیە دژایەتی

کردنی مزگەوت وپەیامەکەی واتەدژایەتی کوردلەژێرهەرناوێکدا بێت.

چوارەم/مزگەوت شوێنی ئارامی دڵانە:چونکە دڵەکان تەنها بەیادی خوا ئارام دەگرن ورزگاردەبن لەنەخۆشیە دەرونیەکان (الابذکرالله تطمئن القاوب)

پێنجەم/ مزگەوت شوێنی حەوانەوە ومالی هەژاران ونەداران ورێبواران بوە، چون پێشتر ئوتێل وخەلوەتگەی پیری نەبوە.

شەشەم/ مزگەوت شوێنی حەمام وپاك وخاوێنی خەلك بوە شوێنی سەرتاوو دەست نوێژوپاك وخاوێنی دەرەوەوناوەوەی مرۆڤە،لەبەرئەوجێگەوپێگە گرنگەی مزگەوتەکەنەیارانی پەی پێدەبەن وزۆرێك لە موسلمانان بێخەبەرن بۆیە بەردەوام لەهەولدان بۆکەمکردنەوەی رۆلی مزگەوت ودابرینیان لە ژیانی کۆمەلگاوکۆسپ وتەگەرەنانەوەی یاسایی وشارەوانی کاتی دروست کردنی،یان کەمکردنەوەی بلندگۆوتاری هەینی ونەهێشتنی خوێندنی حوجرە ودورخستنەوەی گەنج ولاوەکان بەبیانوی لایەنی ئەمنی کەدەیانەوێ تەنها بۆ چەند رکاتێ نوێژی بێ گیان بکرێتەوە زوودابخرێ تەنانەت هەندێ جار خەلکانی نوێژنەکەروبێئاگالەئیسلام یاساورێنمایی بۆمزگەوتەکان دەردەکەن!

---

هەرجارەشێوازوصیغەیەکی جیاوازم بەکارهێناوەلەحمدوصلات،نەك تەنهایەك شێوەی حمدو صەلاوات،کەهەریەکەیان تام وچێژی خۆی هەیەوجۆرێکیشە لەهونەری وتاردان.

# ڕۆڵی زانایانی ئاینی لەڕاپەڕینەکاندا

ڕاپەڕین بۆ؟ لەپێناوڕامالێنی ستەم وناعەدالەتی وبەرجەستەکردنی عەدالەت وژیان وژیاری یەکسانی بۆهەمووان،بۆچاکسازی سیاسی وخزمەت گوزاری وچەسپاندنی عەدالەت کە ئەوەش پەیامی پێغەمبەرانەوەك خوای گەورەلەسەرزمانی حەزرەتی شوعەیب فەرمویەتی: (ان اریدالاالاصلاح ما استطعت ..)بەهۆی لادانی سیستمی ئیسلامی لە بەڕێوەبردندا ستەم وگەندەڵی ژیانیان پڕکردوەبۆیە مانگرتن وخۆپیشاندان وهاواری چاکسازی بەردەوامەو زۆرینەی قوربانیانی ئەم ڕەوشەموسڵمانانن وەك لەناوبەندینخانەکاندا دەبینرێن،بۆیە هەوڵی ڕاپەڕین وچاکسازی لابردنی خراپە(ازالةالمنكر) بۆموسڵمانان پێویسترە وەڵام نەدانەوەی خواستی هاولاتیانیش سەرەنجام ڕاپەڕینی بەدواداهاتووە.

**ڕۆڵی مامۆستایانی ئاینی:**

پەیامی زانایان بەردەوام دڵسۆزی وئامۆژگاریەوەك لەفەرمودەی پێغەمبەرداهاتوە(ﷺ) (الدينُ النصيحه....)واتە:دین ئامۆژگاری ودڵسۆزییەبۆکتێبەکەی خواوپێغەمبەرو کاربەدەستانی موسڵمان وسەرجەم موسڵمانان بەگشتی،هەرئەو دڵسۆزیەش بووایکردلە ڕاپەڕینی گەلانی عەرەب لە(٢٠١١) دژبە سەرانی ستەمکاری خۆیان بەتایبەت لە(تونس ومیسرو لیبیاویەمەن)کەزانایانی ئاینی سەرمەشق و پێشەوابن بەتایبەت زانای گەورەی ئەهلی سوننە(یوسف قەرزاوی ،وەئەگەرسەیری مێژووبکەین زانایانی ئاینی پێشەنگ بون لە ڕەت کردنەوەی ستەموناعەدالەتی ولەوپێناوەشداباجی زۆریانداوەوبەدەیانی وەك(امام احمدو سەیدقوتب ومفتی زادە... )ڕاپێچی زیندان کراون یان شەهیدکراون لەپێناوی چاکسازیدا، هەرئەودڵسۆزی وپاڵنەرەئیمانیەبووکەوایکردلەموسڵمانانی کورد ستان ساڵی (٩٨٧) شۆڕشێکی ئیسلامی ڕابگەیەنن لەدژی ستەمی بەعسی بەناوی بزوتنەوەی ئیسلامی بەسەرکردایەتی کۆمەڵێك زانای عەمامەپاکی وەك م.مەلاعوسمان کەئەوکات ئەوکارەزۆر نامۆبوتاسەرەنجام ڕابونی گەورەی ئیسلامی لێکەوتەوەلەکوردستان،پاشان ئەوە مەلای

کوردە لەسەرمنبەرەکان خەڵکی ئاراستە دەکەن بۆدەستودامێن پاکی دورکەوتنەوەیان لەدرۆخیانەت و گەندەڵی کەئەمرۆژیانیان لیّ کردوین بەژان وپێیان دەڵێن دڵسۆزی گەلو نیشتمان بن دەنگ بدەن بەکوردستان ..،خۆئەگەرهاولاّتیان چاکەکارووشیارین ئەوە پێش هەموان حکومەت سودمەند دەبێتوبەندیخانەکان چۆڵ دەبنو ژیانوژیاریان پێش دەکەوێت لەبەرئەوەیەکەشوێن کەوتوانی مەلاواتە ئەهلی مزگەوتونەوەیشی بەڕاستی مەلایە تا ئیستابازرگانیان بەگەلونیشتمانەوە نەکردووە، لەکاتێکدا مەلای کوردستان پەراوێزکروان لەچاومەلای عەرەب بەتایبەت مەلای شیعەدەسەلاّتداروپارەدارنوخاوەنی مەرجەعنولە پەرلەمانیش پرپەتی لەمێزەربەسەر ئەوانی تریش هاوسۆزیانن، بۆیەبەراورد ناکرێن لەگەڵ مەلای ئێمەدا بەتایبەت لە ڕۆژگارێکی ماتریالستی وەك ئەمڕۆداکە هێزی دەسەلاّتوپارە کاریگەرترە لەشتەکانی تر،لەکەڵ ئەوەشدا شارستانی ئیسلامی شانازی دەکات بەزانایانی کوردکەلە زانایانی وەك(ابن ئادەم، ابن خەلەکانو شارەزووریوابن مستەوفی وبەدلیسی و مەلای گەورەی کۆیەو ومەلاعبدالکریمی مودرس‌وم عەلی تەرەماخی شاعیرەکانیشمان هەرلە مەلا بەتیەوەپێگەیشتوون کەبونە قوتابخانەی ئەدەبیاتی کوردی وەك( نالی ومەحوی ومەلای جەزیریو ئەحمەدی خانی و...هتد)وەهەریەك لەمەلا مەحمودی بایزیدی ومەلا سەعیدی نورسی کوردستانی ئەودووزاتەبون بەشێکی زۆری کەلتوری کوردیان لەفەوتان ڕزگارکرد،یەکەم زانای سیاسەتوبڕیاردەری بیرۆکەی فیدرالیەت لەنێوان میرنیشەنەکانی کوردوعوسمانیەکاندامەولانائیدریسی بەدلیسی بوو، وسەرجەم سەرانی شۆرشەکانی کوردیش لە بنەماڵەی ئاینی بوون قازی ئاسا لەپێناو گەلەکەیاندا گیانی خۆیان بەخشیو هیچ کۆشكو تەلاروفایلوباخیان بەجێ نەهێشت چونکە لە خوادەترسانوخزمەتکردنی گەلونیشتمانیان بەشێك بووە لە دینداریان کە هەرواشە،زۆر بەداخەوە کە عەقلی سیاسی دەسەلاّتی کوردی گرنگی بە عەقلی مەعریفی زانایانی خۆی نادات بۆیە ئیستا ناتوانن وەك پێویست ڕۆڵی سەرەکی ببینن، سەرەڕای ئەو هەموو گرفتانەش هەریەردەوامن

ولەسـەرجەم قەیرانـەکان هەڵوێـستیان بـووە، ئەوەجگەلـە بوارەکـانی فەتواوئاشـتەواتیی کۆمەڵایەتی،بەتایبەت پرسی نەتەوەیی چونکە ئێمە کێشەی نەتەوەیمان هەیە نـەك کێشەی (جگەرە کێشان خەتەنەی ئافرەتوکۆنسێرتی فلان و فیسار)،لەکۆتایدا دورلـە دەمـارگیری و بەشایەتی مێژووی نزیـك ودورنـەڵێم پرسی کـورد ئەگـەر هـەوڵ وخـەباتی زانایـانی ئـاینی ڕاسـتەقینەی لێدەربکـەی شـتێکی ئەوتۆنامێنێتـەوە لەسـەروەریەکان بۆکوردسـتان، (دیارەلەهەموسەردەمێکیشدامەلای نامەلاوخراپ دەروێشی سوڵتان هەبون!.)

مـەلاوسیاسـەت

بـەوپێوەرەی کەمەلاجێـداروميراتگری پێغەمبـەرەﷺمیراتەکـەش زانـستوزانیاریە، بۆیـە پێویستەلەسەریان وەك پێشەواکەیان لەسـەرجەم بوارەکـانی ژیاندابـەپێی توانـاڕۆڵی خۆیـان ببینن بەسیاسەتیشەوە،ئەوەی کەئێستاباوەو دەوترێ مەلاوسیاسـەت کوجامەرحـەبا؟ ئـەوە لەوپلانەپیلانـاویـەی دوژمنـانی دینەوەسەرچـاوەی گرتوەکەبـەبیانوی ئـەوەی دیـن پیرۆزەوبـا تێکەڵ بەژین نەبێت! ئەی بۆچی هاتووە؟ باهەرلەناومزگەوتابێت!مەگەردین بەرنامەی ژیـان نیەبۆ موسڵمان؟بۆیەویستی ئەوان لەگەڵ سۆفیگەریەچونکەئەودینداریە کەمەی ناومزگەوت زیان بە پەزەکانی ئەوان ناگەیەنێت هەرلەبەرئەوەیشە هەموو دەسەڵاتەکان لەخزمەتیانـدان لەبەرخۆنەك لەبەرخوا،بێگومان دابەشکردنی دین بـۆ ئیـسلامی سیاسـی ئیـسلامی بـەدڵی ئەوان بچوککردنەوەی ئیـسلامەونابەجێیە هەڵبژاردن وجیا کردنـەوەی فەرمانـەکانی ئیـسلام بەئارەزوی خـۆت حەرامەوکوفرە،جاکـەوابێ ئـەوەی لـە نـاو باخەکەیدانوێـژدەکات ئـەوەیش نوێژی کشتوکاڵیەوئەوی تریان ئیسلامی پیشەسازیە،دیارەئیسلامێك قبوڵەکـەخوا دەیـەوێ نەك وەك خۆت دەتەوێ،جاگۆشەگیرکردنی مەلالەناوچواردیواری مزگەوتدالەوپیلانی دابـەش کردنەوەرگیراوەکەنابێ مەلاباسی سیاسەتی ڕۆژگاربکات کەئەرکی سەرشانیەتی لەڕوانگـەی دینـەوە قـسەلەسەرهەموپرسەکان بکات،بـەڵام خـەڵکانی تربـەناوی ڕۆشـنبیروروناکبیربۆیان ببێ لەهەموشتێ بدوێن! کەزۆرجارئایەتەکانیش بەهەڵەدەخوێننـەوە ئەگەرمەسەلەپـسپۆڕی

بێت ئەوەمەلاپسپۆڕی دینەودەزانێ چیەوچۆنە،خۆئەگەرسیاسەتیش بریتی بێت لە هونەری بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك ئەوەمەبەستی سەرەکی ئیسلامەبۆیەرجەستە کردنی عەدالەت کەئەرکی مەلایە چونکەپێغەمبەران بۆئەوەهاتون، وەك لە فەرمودەی پێغەمبەرداهاتوە: (کانَت بنواسرائیل تَسوسُهم اَنبیائُهم..)خۆئەگەرمەبەست لە سیاسەت درۆوفرت وفێڵ بێت ئەوەپەیامی مەلا کەئیسلامەدورەلەوەوئیسلام سیاسەتی شەرعی خۆی هەیەکەبە هۆیەوەمەلاو شوێنکەوتوانی دەبنەپیاوی دنیاودواڕۆژ(رَجلٌ الدُنیا والآخِرة)ئەوانەی پێیان وایەئیشی مەلا تەنهالەناومزگەوتەﷲلەدوولاوەکەوتونەتە هەڵەوە یەکەم: ئاگاداری مێژووی نەتەوەکەیان نین کەمەلا پێشەوایەتی هەمووکایەکانی ژیانی کردووەوتەنانەت ئەوەی لای ئەوانیشە سەرچاوەکەی مەلایە.دووەم:وەك چۆن توێژەکانی تری کۆمەڵگالەژێرناوی ئازادی ڕادەربڕین و ڕۆشنبیریدا بەئارەزوی خۆیان دەدوێن،ئەوابۆمەلای کوردزۆرئەولاترە، چونکە مەلاناتوانێ بەمیزاجی خۆیشێ قسەبکات بەڵکویەپاڵپشتی بەڵگەکانی ئاین لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەئاخڤێ، ئەو مەلایانەش کەکەلەگەڵ واقعی گەلەکەیاندا نازین وتەنهالەناو مزگەوتدان سەرەڕای ئەوەی باسکراباسەرنجی وتەکانی مەلای گەورەبدەن کەدەڵێ{مەلای ئەمڕۆلازمەلەعلومی نەقلی وعەصری متبحربێ، وەزاتێ متفکرومدبروبەسیاسەت و قووەی تەعبیری چاك بێ،لە محافلی سیاسەت متابقی حاڵ ومەقام نوتق بدا} (تەفسیری کوردی، ب/١٠،ل ٥٥) .

ئەگەرمەلامەلابێ خۆی نەفرۆشێ بۆدنیا..مهندس ومحامی ملکەچن لەبەردەمیا

**لە نێوان ئەستێرەکانی ئاسمان وزەوی ...وریابەتۆی زانا نەکەوی:**

وەك چۆن ئەستێرەکان هۆکاری جوانی وروناکی ئاسمانن زانایانیش ڕوناکی سەرزەویمانن ئەستێرەکان ڕوناکی بەخش وڕێ نیشاندەروجوانی ئاسمانن،کاری زانایانیش هەمان شێوەیە لەسەرزەوی،ئەگەرئەستێرەلەخولگەی خۆی لایداودەرچووئەواکارەساتی سروشتی ووێرانکاری لێدەکەوێتەوە وەك سالآنە فەلەکناسان هەواڵی مەترسیدارلەوجۆرەبلاّو دەکەنەوەکەفلاّن

ئەستێرەی کلکدارنزیك بۆتەوەلەزەوی و مەترسیدارە،وەك ئەوەی لە(٢٠١٣/٢/١٤) پارچە نەیزەکێك لەخولگەی خۆی دەرچوپارچەکانی بەربۆوەسەرولاتی ڕوسیاوزیاترلەهەزار کەسی بریندارکردوترس وبیمی زۆری بلاَوکردەوەلەناودانیشتوانداکەئەوەکۆتایی جیهانەدواتر(ناسا) ڕای گەیاندکەئەستێرەیەکی تریش لەخولگەی خۆی دەرچوەوبەرەوزەوی دێت وبەلاَم بە (٣٥٠٠٠)کم دورلەزەوی تێپەڕبوە وئەم جارەش ڕزگارمان بوولەمردنی بەکۆمەڵ بەهۆی دەرچونی ئەستێرەلەخولگەکەی، لێرەداجێگەی سەرنج وتێڕامانەکەخودای تاقانەسوێندی خواردوەبەخولگەی ئەو ئەستێرانە،وەك فەرمویەتی:(فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ، وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ)، وەلەبەرامبەرزیانەکانی دەرچونی ئەستێرەلەڕارەوی خۆی بەهەمان شێوە دەرچونی زانای ئاینی لەخولگەوڕێبازی خۆی هەمان وێرانکاری بەدواوەیەو بگرەزیاتریش چونکە ئەستێرەتەنها ماڵی دنیا وێران دەکات،بەلاَم زانای خراپ ماڵی دنیاو قیامەت وێران دەکات،فیتنەی زانایان،پەرتەوازەی زانایان،بێ هەڵوێستی زانایان لەپرسە سەرەکیەکان بێ دەنگی زانایان..،ماڵوێرانیەبۆژیان،ئەگەرزانایان یەکبونایەچ ڕویدەدا لەم دنیایە! لەکاتێکدا هەموورێبواری یەك ڕێگان بەرەویەك مەنزڵ، ئەی بۆنەگەڕێینەوەبۆ سەرچاوە سەرەکیەکەی شەرعی خوالەڕێگەی لیژنەیەکی بالاَی فەتوامەرجەعێکی بەهێزدروست بکەین بۆوەلاَمی بەهێزی پرسەجۆراوجۆرەکان بۆخۆمان،بۆئەوبرایەتیەئیمانیەدروست نەکەین بۆهەست بە بەرپرسیاریەتی سەرشان نەکەین؟ بۆ(قیل بەسەرقال)دابدەین بۆچی پینەوپەڕۆ تەفسیرولێك دانەوەی خراپ بکەین بۆشتانێك کەبەمیزاج وبەرژەوەندی خودی خۆمانە لبۆخۆمان بچوك بکەینەوە بۆهەندێ پلەپۆست وبەرژەوەندی دونیاکە بەوەش وەك ئەستێرەکەدوچاری لادان و خزان دەبین وسەرەنجام کارەساتی لێدەکەوێتەوە،لەکاتێکدا پلەوپۆستی مەلایەتی ڕاستەقینە گەورەترین وبەرزترینەکەجێداری سیدالمُرسلینە،ماوەردی فەرمویە العُلَماءُقادةوالاتقیاءُسادَة

---

ئەم بابەتەم لەڕۆژنامەی(پەیام)ی زانایان ژمارە(٦٩)ی٢٠١١/٤/٣ بلاَوکرایەوە.

# بنەمای سیستمی ئیداری ئیسلامی..

هەوڵدان بۆپیادەکردنی بنەماکانی سیستمی ئیداری دەوڵەتی ئیسلامی چاکترین میکانیزم وئالیەتەبۆیەکریزیوکۆکردنەوەی موسڵمانان ودەربازبونیان لەپەرتە وازەیی، ئەگەرسەرنجێکی وردی ئەوئایەت وفەرمودانە بدەین ئاماژەیان بۆحوکم و دەسەلآت تێدایە،لەگەڵ تەجروبەی کەڵەکە بووی مرۆیی لە مەیدانی زانست و مومارەسەی سیاسیدا ئەوادەگەینە ئەنجامێکی ڕۆشنی واکەبتوانرێت بکرێتەبنچینە وببێتە بنەمابۆ زانستێکی سیاسی ئیسلامی لەم مەیدانەشدالەکۆن ونوێداهەولّی بەرچاوهەیە و دەشتوانرێت جێگەی سوود لێببینینی لێکۆڵەری ئەو مەیدانە بێت..

قورئان لە مەیدانی حوکم ودەسەلآتدا کۆمەڵێك بنەما دەخاتە روو،نەك ئالیەت و میکانیزم،چونکەبنەما نەگۆڕە وئالیەت ومیکانیزم گۆڕاوە،بنەما نەگۆڕەکان بەکام میکانیزم دەستەبەردەبن بۆزیری وبیرکردنەوەی مرۆڤ بەجێهێڵراوەکە هەمیشە ئەو میکانیزمانەبەپێی سەردەم وکۆمەڵگەوکولتوورەجیاجیاکان گۆڕانی بەسەردادێت،لەو بنەمانە :

۱)مەرام و رۆحی حوکم ودەسەلآت لە قورئاندا ڕێگە خۆشکردن و زەمینە سازییە بۆمرۆڤ وکۆمەڵگە تاکویاشترین وسازترین وئارامترین زیندەگی بەسەرببەن و لەوێشەوە بتوانن بەندایەتی بۆخودا بەئەنجام بگەیەنن،قورئان داوالەمەککەییەکان دەکات باخودای ئەو ماڵە (کەعبە)بپەرستن کەلەکاتی برسێتیدا خواردنی پێ بەخشیون ولەکاتی ترس وبیمدائارامی ئاسایشی وپێداون(فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ،الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ)

۲)قورئان ئەو دەستوورە نەگۆڕەیە شیرازەی تاك وخێزان وکۆمەڵگە و دەسەلآت رادەگرێت ونابێت یاسا وبڕیارەکان (لە هەر ئاستێکدا بێت) پێچەوانە لەگەڵ دەقێکی ڕۆشنی تەئویل هەڵنەگری قورئاندا بوەستێتەوە..

۳)دانانی حاکم ودەسەلآتدار مافی ئوممەتە، لەمەجلیسی شوراوە بۆ ئەهلی حەل وعەقد ولەوێشەوە دانانی ئیمام

٤)دەزگای قەزا دەزگایەکی سەربەخۆیە وهیچ کەسێك تەنانەت ئیمام و قازییەکەش ناکەوێتە پشتیەوە

٥) عەدالەت لەتەواوی یاساوحوکم وبڕیارومومارەسەدا بنەمایەکی بەرچاوە.

٦) تەواوی دەزگاودامەزراوەکانی دەوڵەت بەهەرسێ بەشەکەیەوە(تەشریعی،تەنفیزی، قەزایی)لە بچوکترین دامەزراوەوە تاگەورەترینیان دەبێت بە دەستەبڕیارەکانی تیا دەربکرێت واتە بنەمای شوراتەنها بۆ مەجلیسی شورانییە،بەڵکو بۆتەواوی دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەتە،تەنانەت قازی دەبێت بە مشاوەرەلەگەڵ چەند قازییەکی تردا حوکمەکەی خۆی دەربکات ئیمام دوای مشاوەرەبەوهەیئەتەی تایبەت بەخۆیەتی دەبێت کارەکانی بەئەنجام بگەیەنێت(وأمرهم شورى بينهم )"ئەمریان لە نێوانیاندابە شورایە" (ابن عطية)دەفەرموێت:شورایەکێکەلەبنەماسەرەکیەکانی ئسلام وشکۆمەندی (یاسا)ی، بۆیەهەرسەرۆکێك ڕاوێژنەکات بەزانایانی پسپۆڕواجبەلەدەسەلآت لاببرێت.

۷)دەزگاکان لەسەریەکتر چاودێرن وەکو چۆن کەسەکان هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان چاودێرن ولەلادان ئاگاداریان دەکەنەوە وبۆکارەباشەکان کۆمەکیانن(**وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ**) التوبه/۷، واتە:باوەڕدارانی پیاووژن هەندێکیان دەبن بە سەرۆ کاروسەرپەرشتیاری هەندێکی تریان وفەرمان بەچاکە دەکەن وپێش لە خراپە دەگرن "،لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشیدی پێنجەمدا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەزگایەکی چاودێری دامەزرابووبۆ چاودێری کردنی دارایی خەڵکی بە گشتی وبەرپرسان بە تایبەتی کەبەرپرسیارێك لێ پێچانەوەیان دەست پێدەکرد ئەویش ئەوە بوو دەیان پرسی :ئەم سەروەت وسامانەت چۆن بەدەست هێناولەکوێت بوو( **من أين لك هذا**)کە

ئەگەرلە ئەمڕۆدا ئەم دەزگایە دابمەزرێ وئەو یاسایەی تیا بەکاربهێنرێت دڵنیابن بنبڕی دزی و گەندەڵی دەکات...

٨)بوونی دەزگایەکی سەربەخۆ بۆلێپێچانەوە وبەرگری کردن لە تەواوی خو و خدە وڕەوشت و ئاکاروڕەفتار وهەڵسوکەوت وکار وکردەوەیەك لە ڕیزی مونکەرات سەر ژمێر بکرێت،ئەو کارە مونکەرە لە هەرکەسێك بوەشێتەوە لە بەرزترین دەسەڵاتەوە تا مرۆڤێکی ئاسایی سەرشەقامەکان جێگەی پرسیارولێپێچانەوەیە،لە فەرموودەدا هاتوە(**من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذالك أضعف الايمان)** رواه مسلم،هەرکەس لەئێوە کارێکی نارەواو ونەشیاوی بینی با بە دەستی بیگۆڕێت، ئەگەرنەیتوانی با بە زمانی،ئەگەر نەیتوانی بابە دڵ پێی ناخۆش بێت ئەوەش لاوازترین باوەڕە" ئەم دەزگایە بەشێوەیەکی کرداری لە مێژووی دەسەڵاتی ئیسلامیدابوونی هەبووەوناوی دەزگای(حسبە)ی لێنراوە وتوانیویەتی لەگەڵ مونکەراتی دەسەڵات وکۆمەڵگەدا بجەنگێت..

٩)دانانی کەسی شیاولەجێگەی شیاودا،بەڵکو گەڕان بە دوای ئەوکەسانە دا وناچارکردنیان بە شاندانە ژێر بەرپرسیارێتی،مافی کەسی شیاویشە تەعبیرلە خۆی بکات وبانگەشە بۆئەو زانست وئامادەیی وتوانایەی خۆی بکات تاکو لە جێگەی شیاودا بەکاربهێنرێت،حەزرەتی یوسف(علیە السلام) بە مەلیکی میسر دەفەرموێت:بمکە بەخەزنەداری زەوی، چونکە من کەسێکی زانا وکاردروستم و بە وردی دەتوانم ژمێریاری بکەم (اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ)یوسف،٥٥

---

(بۆئەم بابەتەسودم لەگۆڤاری کۆچ وەرگرتوە)

# ( فەرمان بەچاكەوڕێگری لەخراپە )چاكسازیە

یەكێ لەبنەماسەرەكیەكانی ئیسلام فەرمان بەچاكەوڕێگریەلەخراپەلەپێناودور كەوتنەوە لەتاكڕەوی وخۆسەپاندن وگۆڕانی ئیجابی بۆچاكسازی وپاكسازی كۆمەڵگایە وفەرمانی خواوپێغەمبەرەوبەداخەوەكەئێستالەناوماندا كەم بوەبەهۆی لاوازی ئیمان و سەرهەڵدانی نەفامیتی ئەم ڕۆژگارەكەدەڵێن(دەست بەكڵاوی خۆت بگرە)ودەنگ مەكە یان بەپاساوی ئازادی وسەربەستی كەس حەقی كەسی نیەوماف پێشێلكردنە! لە كاتێكداخوای گەورە وەسفی ئومەتی محمددەكا بەچاكترین گەل ونەتەوەچونكەفەرمان دەكەن بەچاكەوڕێگری دەكەن لە خراپەوباوەڕدارن،باوەڕداری ڕاستەقینەیەكەبەخەم گەل ونەتەوەیەوهەوڵی گۆڕانی ئیجابی دەدات وخیانەت لەخەڵكوخاك ناكات(كنتم خیرامة اخرجت للناس تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكروتؤمنون بالله)(ال عمران/١١٠) پێشەوا عمركاتێ ئەوئایەتەی خوێندەوە فەرمووی:كێ حەزدەكات لەوئومەتەبێت با مەرجەكانی خوابەجێ بێنێ،واتە فەرمان بكابە چاكەوڕێگری بكالەخراپە،بەداخەوەكە هەندێ كەس ئەگەرڕاستی نیشان بدەی دەڵێ:من ئازادم..تۆحەقت چیە ..خۆناچمە قەبری تۆوە..، ئەمەو چەندین وەڵامی تری نابەجێ! هەرلەبەر پلەوپایەی ئەوبنەما گرنگەیەكەپێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:{من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبلقبه وذلك اضعف الايمان } (مسلم وابوداودو الترمذي والنسائي وابن ماجه) واتە:هەركەس لەئێوەخراپەیەكی بینی بابە دەست بیگۆڕێ ولای بدات (ئەوە زیاتربۆخاوەن دەسەڵاتە)ئەگەرنەیتوانی با بەزمان پێیان بڵێ(ئەمەیان زیاترزانایان وڕۆشنبیران دەگرێتەوە )، ئەگەرئەوەشی نەتوانی بابەدڵ پێی ناخۆش بێ، كەئەوەش لاوازترینی ئیمانە،بۆیە پێویستەلەسەرمان لەپێناوكۆمەڵگەیەكی چاك وپاك وئاسودەوبەختەوەربەپێی توانافەرمان بكەین بەچاكەوڕێگری بكەین لەخراپە (بەچاك بڵێین چاك بەخراپ بڵێین خراپ)بەڵام خۆی لەبیرنەكاتولەخۆیەوە دەست پێبكات،یان لەحیزبو ڕێكخراوەكەی گەرئەهلی چاكەبن،گەرخۆت نەتبێت چی دەبەخشی،دەزگای

(امربەمعروف نەهی لەمنکر)دەبێتەچاودێربەسەرخەڵك ودەسەلآتەوەو کاریگەری ڕاستەو خۆیان دەبێت لەسەردەوڵەت،ڕێکخراوە مەدەنیەکانیش ئەگەرپیشەیی بن پاشکۆی حیزب نەبن سەربەودەزگایەدەبن،ئیسلامیش حکومەتێکی مەدەنیەوبەهۆی ئیمانی تاکەکانیەوە ئاسایش بەرجەستەدەکات بەبێ پۆلیس،زەرەدوزیانی کەمتەرخەمی کردن لەفەرمان بە چاکەو ڕێگری لەخراپەماڵ وێرانیەبۆهەموان وەك پێغەمبەر(ﷺ)لە فەرمودەیەکدا کۆمەڵگای بەسەرنشینی کەشتیەکی دووقات چواندووە جائەوانەی فەرمانەکان بەجێدێنن بەردەوام پارێزگاری لەکەشتیەکە دەکەن وناهێڵن خراپکارکونی بکات چونکە هەموویان بەچاکوخراپەوەلەناودەچن،بەلآم لەناو کەشتیەکەداهەوڵی کونکردنی دەدرێت،ئەگەرڕێگری لێنەکرێت وبێدەنگ بن ئەوەهەموولەئاوەکەدا دەخنکێن، بەڕاستی وێنایەکی جوانەوئێمەش هەموپێکەوەلەناوکەشتی کوردستان دەژین ودەبێ بەخەمیە وەبین وبەردەوام لەهەوڵی چاکسازی دابین ورێگری بکەین لەخراپە بێگومان ستەمکاران دکتاتۆرەکان دژی ئەم بنەمایەن چونکەتەنهابەرژەوەندی خۆیان دەبینن،شەمشەمەکوێرەیش حەزی لەتاریکیەیەتیشکی خۆرقەڵسە.

# ئاینی عورفی وچاولێکەری

کێشەکەمان لەفیکروچۆنیەتی تێگەیشتنەبۆدین،دینداریکردن بەعورف و عادەت زۆربـاوە!کەلەباووباپیرانەوەبەچاولێکەری بۆنـەوەکان بـەجێماوە کـەهێزوپێزی لەسـەر عورفی کۆمەڵگایەنەك لەسەرخودی پرەنسیپی ئاینەکە لەئـاینی عـورفی لەسەرچاوەی خـودی ئایینەوەهەڵنـەگۆزراوە، بەڵکولەسـەروەعزوگوتاری قۆنـاغ و سـەردەمەکانی هەڵدەهێنجرێت،چونکەئاین بۆهـەموقۆناغێك خیتـابی نـوێ لـە بـەرگی تـازەدا و بەزمانی ڕۆژگاری پێویـستە،دیارەهەرکۆمەڵگایەکیش عـورفی تایبـەتی خـۆی هەیـە وڕێگری لێناکرێ ئەگەرپێچەوانەی شەرع نەبێت،بەڵام مەترسی ئاینی عورفی ئەوەیە کەجەوهەری ڕاستی ئاین لـەکاردەخات وشـوێن کـەوتوانی ئاینەکـەش دەبنـەقوربانی یەکـەمی ئەودینداریەڕواڵەتیـەو ڕوبـەڕی هەنـدێ مەسـەلەی فیکـری وئایـدیۆلۆژی دەبنەوە،چـونکە وادەزانـێ ئـەم عـورف وعادەتـە خـودی ئاینە،لەکاتێکداناینەکـەی هـەڵگری پـەیامی ڕاسـتی و زانـستی ودادپەروەریە،گرفتـەکان لێرەوەسـەرهەڵدە دەن ولەسەر خودی ئاینەکەش دەکەوێ، وەك دەبینی زۆرشت بـەناوی دینـەوە کـراوەو لـە دیندانیە!بەناوی دینـەوەبازرگانی کراوەوگیرفانیـان پێپرکـردوە!سـتەم لـەئافرەتکراوە، هەندێ کەس دینیـان بۆخزمـەتی خۆیـان بـەکارهێناوە لـەجیاتی ئـەوەی بۆخزمـەتی خـەڵك وخـاك بـەکاربهێنن! لەبـەر بـاری ناهـەمواری ئەوسەردەمەمامۆسـتایانیش لەڕابردوودداوەك پێویست نەبون لـە گەیانـدنی کرۆکـی دینەکـە بەخەڵك،نـەك ئـەوەی کراوەبـەدین کـەدوورە لـەدین!بۆیـە ئـەرکی تـاکی موسـڵمانە کەڕاسـتەوخۆلەخودی سەرچاوەکانی ئیسلامەوەئاینەکە تێبگەن وبیکەنە تەرازووی هەڵسەنگاندن وگفتوگـۆ کردن لەسەرچـەمك ودیـاردەو مەسەلەنوێیەکان،ئێستائەوەندەیگرنگی بەڕواڵـەت و دیکۆردەدرێ!ئەوەندەگرنگی نادرێ بەجەوهەروناوەڕۆك وە هەروەهائەوەنـدەی گرنگـی دەدرێ بەعـورف وعـادەت ئەوندە بەخودی دینەکەنادرێ،چونکە هەنـدێ داب ونـەریت

گونجاونیەوحەرامە، جانەوانە یان کەپەسەندن وپێچەوانەی شەرع نین لەخزمەتیاندایین وهەندێکیشیان دەبێ هەمواربکرێن،ئەگەرلەناومزگەوتەوەدەست پێبکەین هەرلە فاتیحای دوای بانگ ولە چۆنیەتی ویردوتەسبیحاتی دوای نوێژەکان،بۆنمونەکێ وتی بانگی مەغریب فاتیحای لەگەڵ نەبێ بەلاَم ئەوانی ترلەگەڵی بێت؟ لەکاتێکدا خودی بانگ فاتیحای نییە،کێ وتی تەسبیحاتی مەغریب ونیوەڕۆکورت بێ بەلاَم ئەوانی تردرێژ بێت،کەفەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەوبارەوە دیاروئاشکرایە کەهەریەك لەویردەکانی(سبحان الله،الحمد لله،اللهاكبر)(٣٣)جاردەخوێنرێ کەدەکاتە (٩٩)وەبە (لااله اللهوحده لا شريك له...)(١٠٠)کە تەواودەکرێ هەرکەسە بۆخۆی بێدەنگ بیکات باشترە ...،جگەلەزۆرشتی تری ناومزگەوت، جادەبێ دینداری دەرەوەی مزگەوت حاڵی چۆن بێ؟ ئەوەندەی گرنگی بەدانیشتنی پرسە ونوێژەجەژنەکان دەدرێ ئەوەندە خەمی فەرزەکان ناخورێ!کە ڕاستیەکانیان پێ دەڵێی لەوەلاَمدادەڵێن:ئێمە هەرئاوامان هێناوە لێێوە شتێکی تازەتان هێناوە دەمگوت دەی باشەهەرلە کۆنەوە ئارەق وقومار وڕەشبەڵەك وژن بەژنەوجگەرە کێشان باوبوە،بەلاَم عادەتێ کی خراپ ونەگونجاوە،مەرج نییەهەرچی لەکۆنەوە بۆمان مابێتەوەچاك پەسەند بێت وبگونجێ بۆئەم سەردەمە ...،جابەڕاستی کێشەکەلەتێگەیشتنی دینەکەدایەکەلەخەڵکانی زاناوپسپۆڕ وەرنەگیراوە، بەڵکو زیاترلەکەسانێ وەرگیراوەلەبەرگی دیندابون بەلاَم زانا نەبوون!شەیتانیش لەوڕێگەوەشوبهەیان بۆدروست دەکات وکارەکەیان لاجوان دەکات، تەنانەت ڕۆژێ وتم بەیەکێ لەنوێژخوێنانی مزگەوت براکەم مادام تۆئەهلی مزگەوت ودینی بەلاَم کاسبیەکەت باش نیەوحەرامە،چونکە دینداری واتە تەسلیم بوون بە فەرمان و نەهی یەکانی خواوپێغەمبەر،لەوەلاَمدا وتی مامۆستا ئەمیان بە ڕێی خۆی ئەویشیان بەڕێگەی خۆی!وتم بۆ تۆبەچەند ڕێگەدا دەڕۆی؟ یان دەڵێ بەئارەزوی خۆم دەکەم،یان دەڵێ:دنیابەخواروقیامەت بە ڕاست!کەئەمانە نیشانەی بێئاگایی

وخۆپەرستیە نەك خواپەرستی،چون قیامەت بەرهەمی دونیایەوچی بچێنی ئەوە نەدوریتەوە(الدنیامزرعة الاخرة) یان کەپێیان دوترێ تەوقەکردن حەرامەلەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم گەر خزمیش بێ،ئەڵێ:عادەتەونیەمەدڵمان پاکە!لەکاتێکدادڵی پاك ئەوەیەکە بەنوری ئیمان رواناکەبۆیەخاوەنەکەی دەست ودامێنی پاکەوناچێت بە لای حەرامداودڵی کەسیش لەهی پێغەمبەر(ﷺ) پاکترنییەشەرعیش لەسەروی هەموو مانەوەیە،یان قەرەباڵغی مزگەوتەکان لەرەمەزانداوپاشان چۆڵ بونی لەدوای رەمەزان بالاپۆشی ئافرەتان لەرەمەزان وپاشان واز هێنانیان! (کەبەرەمەزانیلە ناسراون) هەمو ئەمانەچاولێکەری وعادەتە، تەواوگەورەبووم وام دەزانی موری شین لەچاوە زار دەپارێزێ‌لیان تا جارێك هاواری خوا دەکات ودەڵێ یاالله چەندین جاردەڵێ یاشێخ فلان! ئەمانەوزۆری تریش،کە دورن لە بنەماکانی ئیسلام وتائەمرۆو چەندین ساڵە کرابوون بەدین وخەڵکیان پێوە سەرقاڵەدەسکەوتیشی بەتاڵە! ئیترلەشتەگەورەکانی دەرەوەی مزگەوت گەرێ کەبەناوی مۆدیل ومۆدرێن سیستمی نوێی جیهانی و عەولەمەوعەلمانیەت و پێشکەوتن و ئازادی وکوردایەتیەوەئەنجام دەدرێن وبەهۆیەوە خەڵکێکی زۆردوو چاری(انحرافات)لادان بون،لەبێگانەپەرستی دائەوەندەلەپێشین وا خەریکە کلتورو رەسەنایەتی خۆمان لەدەست دەدەین‌لەوەی کەنوسرامشتێ بوو لە خەرمانی دینداری عورفی وچاولێکەری،لەکاتێکداپەرستش وبەندایەتی بەدوو مەرجی سەرەکی لای خواقبوڵە کە(الاخلاص والصواب)واتە: بەدڵسۆزی وبۆخوابێت، پاشان بەگوێرەی یاسای شەرع بێت،هەربۆیە گەورەترین خێری دنیاودوارۆژبۆ موسڵمان تێگەیشتنەلەدین،جێگەی سەرنجەوبێ حیکمەت نیەکەلەسەرەتای کتێبە فقهیەکاندا ئەوفەرمودەیەی کەپێشەواکەمان بوەبەسەرەتای کتێبەکان کەفەرمویەتی: {من یردالله به خیراً یفقه فی الدین}واتە:هەرکەس خواخێری بداتێ ئەوەشارەزای دەکات ولەدین تێیدەگەیەنێ کەئەوەش خێری دنیاودوارۆژە.

**نمونەی ئاینی عورفی وچاولێکەری وەك نوکتە:**

* لەنـــەودەکانی ســـەدەی ڕابردوولەچوارقورنەمەلابوم،ســـەردەمانێك لەودەڤـــەرە شـــایی ڕەشـــبەڵەك زۆربـــاووبو،منیش لـــەوتارێکی هەینیداجـــەختم دەکـــردەوە لەســـەر خراپـــی و حەرامی،کابرایەکی ڕیش سپی وتی:نوڵاهی لەوەتەی ڕەشبەڵەك وەك جاران نیـە بەرەکـەتیش نەماوە!دیارەبەلایەوەعادەتەنەك عیبادەت

* لەبەهارێکی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوولەچوارقورنەکشتوکاڵمان کردبوومام سۆفیەکی ڕیش سپی لەنزیك ئێمەوەکەبەلای حەیوانەوەبویزنەکانی کردبوەناو گەنمەوە کەقەرسیل ببو، خۆیشی لەسەربەرزاییەك دەستی کردبەنوێژکردن،منیش وتم مام سۆفی حەیوانەکان ئەو گەنمەیان نەهێشتوگەرلەزەڕدابلەوەڕێن شیرەکەیان حەرام دەبێت،ئەویش وتی: ئاخر زەمانە تۆئامۆژگاری من دەکەی؟!ڕۆڵەگیان بزن هارن نەگەرلەناو گەنمەکەدا نەبن ڕاناوەستن ومنیش دەمەوێ قەلاَیان زۆربکەم (مەبەستی نوێژگێڕانەوەبوو)!

* لەبەرناوەنـــەك نـــاوەرۆك!مزگـــەوتی گولـــەك لەچوارقورنەســـاڵی(٩٦٧)بەفـــەرمانی شـــێخ مـــستەفای بـــاقلانیێ وهاوکـــاری کـــاك زرارئاغـــای ئەوشوێنەبۆمەلاســـعیدی گولـــەك بنیـــات نراوە،لەسەرەتای ساڵی(٢٠١٠)کەئـــەوقاف تـــابلۆی بۆمزگەوتەکانکردبـــەناوی خۆیەوەنوســـی دوای زیاترلـــە(٤٥)ســـاڵ لەلایـــەن چەندکەســـانێك وەك خۆدەرخـــستن ودنیـــا (لەبەرخۆنـــەك لەبـــەرخوا)کێـــشەیان دروستکردلەســـەرناوەکەی!بۆیـــەناوی ئێمەوەنیـــە؟ کـــە ئەوانـــە لەڕاســـتیدانەهلی مزگـــەوت نـــەبون وبـــەلاَم دەیـــان ویـــست بـــەپیری نـــاوی بنـــێن! لەکاتێکدامەلایەکـەش لـەخۆیان بو،ئەوانـەی بۆخوادەچـنە مزگـەوت بـە لایانـەوە نـاوەرۆك مەرجەنەك ناو..بۆدین دەچن نەك بۆدنیا بۆعیبـادەت نـەك بۆعـادەت، کەبرایـەتی ئیمـانی ویەکریزی لەسەروی خزمایەتی وعەشیرەتە.

* لە(٢٠٠٣)وەبوم بەمەلالەمزگەوتی شەفیق بەگ لەسلێمانی،زۆرگرنگیم دەدابە ڕیزەكانی نوێژكەپێشتربەوشێوەڕانەهاتبون،ڕۆژێ كەوتم نەرەحمەتتان لێبێت پاڵ بدەن بەیەكەوەوڕێك بوەستن،لەناوڕیزەكەیەكێ لەڕیش سپیان بەدەنگی بەرزوتی: مامۆستا چەوەندەربەتەنكی!!

* هەبوودەیگوت:تۆیەكەیفێ ئێمەقسەبكەوحەدیسی خۆشمان بۆبخوێنەوە! یان دیگوت: ئەو حەدیسەم بەكەیفێ بو!دیارەهەندێكێ بەكەیفێ نەبون،كەیف وئارەزوش لەنەزانیەوە یان لە زۆرزانیەوەیان لەحیزبایەتیەوە،جاوەرەمەلائەوانە ڕازی بكە، منیش وتم: ئەگەردین بەكەیفی خۆم بێ ئەوارەمەزانێ بەڕۆژونابم یان نوێژی بەیانیان ناكەم،بەلام داواكاری لەوجۆرەنارەوایە ودەبێ دین بەوشێوەیەبێت كەخوادەیەوێت نەك وەك خۆت دەتەوێ، زۆرینەحەزیان لەچیرۆك وبەسەرهات بوو!كەنیوەی درۆیە! لەباسی بیروباوەڕ(عەقیدە)بێزاربون ویەكسەردەیانگوت ئەوەئیسلامیە..سەلەفیە! چونكەزیاترپەروەردەی سۆفیگەری ودەروێشی كرابون،حەزیان لە نوێژووتاری كورت وبەپەلەبو(لەكۆڵخۆكردنەوە)! تەنانەت جارێك وتم:ئەرێ نوێژی مەنگوڕی یان محمدی؟ هەندێ وتیان وەلانوێژی مەنگوڕی(مەبەست بەنوێژی سەرپێی وبە پەلەیە)! نەك بێ ڕێزی وتانە،هەبودەیوت:وەڵلارەمەزان پیاوانەیەسالێ مانگێكەوتەواو!

* شارەزابەباسەرگەردان نەبیت: ڕێبوارێكی شارەزابەلەدینەكەت بەئاگابە،بڕوادار ڕۆژانەزیاترلە(١٧)جارلەخوادەپاڕێتەوە،خوایەڕێنمایمان بكەبۆڕێگەی ڕاست،(اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)پڕحیكمەتە،ئەوەتاخەڵكێكی موسڵمان بەهۆی نەزانینەوەچەواشەكراون لەلایەن كەسانێك كەنەزانن لە بەرگی زانایاندایان لەخواناترن،یەكێ لەشێخەكان(لەگەڵ ڕێزم بۆچاكەكان)كاتێ دەبینێ دەروێشەكانی زۆرڕێزی ناگرن وبەپیرۆزی نازانن،دەڵێ: وەلامنیش نایەڵم باوەگەورە شفاعەتتان بۆبكات!! بێگومان شێخ ومەلای خراپ زۆرترین زیانیان لەدین داوە(پەنابەخوا)، ساڵی(٢٠١٣)لەمارەبڕینی كچەسۆفیەكداكەنیوەلەچك وپۆشاكی تەنك وتەسكی پۆشی بو،كاتێ پرسیم لەنوێژوعیبادەتی،مام سۆفی باوكی وتی:نەقوربان حاڵی لێدێ!!دیارە وێنەی ئەوانەبەپلەی یەكەم مامۆستاوپێشەواكانیان تاوانبارن.

# ڕەوشـتی باوەڕدار

ڕەوشتی جوان وشیرین بەری درەختـی ئیمانـە هەمیـشە سـەوزوجوانە پێناسـی مرۆڤـی موسڵمانە(تؤتی اکُلها کل حین باذن ربها)،ڕافعی لـە(وحـی القلـم)دادەڵێت:ئەگـەر داوام لێبکەن فەلسەفەی ئاینی ئیسلام تەنهالەدوو وشـەداکۆ بکەمەوەئـەوادەڵێم:(دامـەزراوی ڕەوشت)لەگەورەترین فەیلەسوفی جیهان داوابکەین کەچارەسەری کێشەکانی مرۆڤایـەتی کورت بکاتەوە لەدووشەدانەوا لە(دامەزراوی ڕەوشت) زیاترهیـچی ترناڵێت،پلەوپایـەی ڕەوشت بەجۆرێك بەرزوگرنگەپێغەمبەرمان(ﷺ)فەرموویەتی(انمابعثـتُ لاتمـم مکـارم الاخـلاق)واتـە:بۆیـەنێردراوم کەڕەوشـتەجوانەکان تەواوبکەم،ڕەوشـتی جـوان ئامـانجی پێغەمبەرمانەلەوپێناوەشداڕەوانەکراوە،لەوانەیەبڵێی ئەی پەرستـشەکان؟لەوەڵامدانەڵێم: پەرسـتش وعیبادەتـەکان وەسـیلەوهۆکارن بۆئامـانجێکی بەرزکەچەسـپاندنی ڕەوشـتە، عیبادەت ئەگەرکردەوەی لەگەڵدا نەبێت وەرزشـێکی بـێ گیانەوعادەتەنـەك عیبـادەت، کەواتەحیکمەتو فەلسـەفەی بەندایەتی بۆچەسپاندنی ڕەوشـتەکانەوبەندایەتی وەك نوێـژو ڕۆژوئامانج نیەبەڵکوهۆکارن بۆگەیشتن بەئامانج کەبەرجەستەکردنی ڕەوشتە جوانەکانـە لەدونیادا،ڕەزامەنـدی خودایەلەدوارۆژدابۆنمونەنوێژئەگەرسـەرنجی بـدەین بـەردەوام لـە مزگەوتداڕێزمان دەکاتەوەئەوەش مانای یەکگرتن وبرایەتی وخۆشەویستیە،خوای گـەورە فەرموویەتی﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾نوێژئەونوێژەیەکەخاوەنەکـەی لـە خراپەکاری بپارێزێ،واتەبێتـە خـاوەنی ڕەوشـتی جوان،بەهـەمان شـێوەیش ڕۆژوکـەخوا لەبارەیەوە فەرمویـەتی﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾مەبەست لـە وەرگرتنی صەدەقەوزەکات پاکبونەوەیەلەحەسودی زاڵبون بەسـەر ڕەزیلـی وبەخیلیـدا... وەفێری بەخشین وسەخاوەتمان دەکات کـە ئەمانـەش سـەرجەمیان لەڕەوشـتە بـەرزەکانن ڕۆژوش گـەورەیی بۆخواکەبەهـەمان شـێوەئەبێ ڕۆژوگرڕەوشـتی جـوان بێـت وسـەرجەم ئەندامانی لاشەی بەڕۆژووبێت لەبەرامبەرخراپەدا تەنانەت ئەگەر یەکێ قسـەی پـێ وت

یان شەڕی لەگەڵ کرد بڵێ من بەڕۆژوم!،وەهەروەها سەبارەت بە حەج خوای گەورە فەرمویەتی:﴿فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾واتە:نابێ خراپەکاری ودەمەدەمەبکرێ لەحەجدالەوقەرەباڵغیەدا ڕاهێنانە لەسەررەوشتی جوان، لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ)باسی ئافرەتێ کرانوێژوڕۆژوی بەردەوامەبەڵام ئازاری جیرانی دەدات ولەگەڵی خراپە پێغەمبەرفەرموی:لەناوئاگردایە!(هی فی النار) دەبینی سەرەڕای نوێژوڕۆژوەکەی چونکەکردەوەی لەگەڵ نەبوەچوەتە ناگرەوە، لای پێشەواعومەرپیاوێ وەسفی کەسێکی کرد،ئەویش فەرموی هاوڕێیت کردوە لەسەفەردا؟ فەرموی نەخێر،ئەی مامەڵەت لەگەڵدا کردووە؟وتی نەخێرئەی هاوسێت بووە،وتی نەخێرفەرموی کەواتە نایناسی،دیارەڕەوشت بەرزی لەهەڵوێست وکرداروگوفتارومامەڵەی ڕۆژانەدادەردەکەوێ (الدین المعامله)نەك زمان لوسی ودوڕویی ودروشمی بێ ناوەرۆك، لە فەمەرمودەی پێشەواماندا هاتوە کەزۆرینەی ئەوانەی ئەچن بۆ بەهەشت بەهۆی تەقوای خواوڕەوشتی جوانە،وەزۆرینەی ئەوانەی کەئەخرێنە ناو ئاگرەوەبەهۆی دەم وداوێنەوەیە،وەك نمونەی ڕەوشت بەرزی:تەنهادرۆمەکەبزانەچۆن دەبیتەکەسێکی دامەزراوخاوەن کەسایەتی ومتمانە پێکراوئارامی دەرون،بەداخەوەکەلەم ڕۆژگارەی ماددەگەرایەدا قەیرانی بەد ڕەشتی دروستکردوەومتمانەی بەرامبەرنەماوەبەهۆی سیاسەتی ڕۆژگاردرۆودوڕوی زۆر بووە بەوەیش ژیان یان لێکردوین بەژان،ساڵی(٢٠١٠) ڕابردومیدیاوگەنج ولاوەکانیان بەهەندێ شتی لاوەکی ونامۆوەسەرقاڵکردبویەمەبەستی بڵاوکردنەوەی خراپەو بەد ڕەوشتی،سەرەتاباسی تێکەڵی کوڕوکچ بوولە قوتابخانەکان کەهەموودەزانین ئاستی زانستدادەبەزێنێت وهۆکاری بەدڕەوشتیە ودوبارەکردنەوەی هەڵەی وڵاتانی دەرەوەیە، پاشان بازاڕی خۆیان گەرم کردبەخەتەنەی مێینە،دواتربابەتی(جێندەر)یان هێنایە ئاراوە کەنکوڵی دەکات لە سیفاتی فسیۆلۆجی وبایەلۆجی هەردوو ڕەگەزوەتیایدا دەبێت هەر کام لەژن وپیاوکاری ئەوی تربکاتوگرێبەستی هاو ڕەگەزو لەباربردنی منداڵ تیا دروستە

فرەژنی تیاحەرامەکەبەناوناوەڕۆکەوە لەگەڵ ئیسلام نایەتەوەو حەرامەچونکە لەدایك بوی ژینگەی خۆیەتی بارگراوندی فیکری وفەلسەفەی خۆی هەیە،پاشان لەکۆتای ساڵدا پرۆژەی قەدەغە کردنی لەشفرۆشی لەپەرلەمان پێشکەش کرابەلاَم بەداخەوەڕەتکرایەوە! جێگەی سەرسوڕمانە لەناوگەلی موسڵمانا لەناونوێنەری کوردانالەش فرۆشیان بەلاوە جوانە!لەکاتێکدا ئەم ساڵی ڕابردلەولاَتی چین(٦٠٠٠٠)شوێنی بەدڕەوشتیان داخست نەك لەبەرخوا وبەلکولەبەردەرەنجامەخراپەکانی کەکۆمەلگە هەڵدەوەشێنێ،باتێمەلەڕوی خزمەتگوزارییەوە کوردستان بکەینە ئەوروپانەك لەڕوی بەدڕەوشتیەوە،بۆیەلەفەرمودەی پێشەواماندا هاتوەکە ڕەوشتی بەرزوجوان نیشانەی ئیمانی ڕاست ودروست وتەواوە (اكمل المؤمنين ايمانا اَحسَنُهم خلُقاً)(رواه الترمذي)واتە:تەواوترینی ئیمانی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە، وەفەرمویەتی:(مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ أثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ) صحيح أخرجه أبو داود والترمذي'واتە:هیچ کردەوەیەك لەسەر ترازوودا قورستر نیەلەرەوشتی چاکە.(ابو ذر)رەزای خوای لێ بێ فەرموی:پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریم بکەئەویش پێی فەرموو:(اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ)صحيح الجامع:٩٦'،واتە:پارێزکاربەولەخوا بتر سەلەهەرکوێ بوی بێ فەرمانی مەکە، لەدوای هەموکردەوەیەکی خراپەوەچاکەیەك بکەباخراپەکەبشواتەوە،چونکەکردەوەی چاکەکردەوەی خراپەلادەبات، وە لەگەڵ هەموو کەسێکدا کردارورەفتارت باش بێت،جابۆئەوەی ببیتەخاوەنی ڕەوشتی چاك پێویستە هەوڵی جێگیرکردنی ئەوسیفەتانەبدەیت کەپەسەندن وەبەشوێن کەموکوڕیەکاندا بگەرێ وبژاریان بکەیت، پەروەردەوڕاهێنان تاکارەبەرزەکان لە دەروندا بکەبەحالەتێکی دامەزراو،بێگومان دەیان کتێب ونامیلکەی تایبەت لەوبارەوە نوسراوە لەکۆتایدا ئەلێم:

ڕەوشتی بەرزسەرمایەی ژینە....ئەوەی لێ دوربێت دایم غەمگینە

کردەوەکانت پڕیادی خوداکە.. ئەوسا دەزانی ژیان شیرینە.

# دادپەروەری چارەسەرە

ویژدان وعەدالەت لەسەردەمی ناعەدالەتی دا وەك ڕوناکی چرایەلەتاریکیدا، چەسپاندن وبەرقەرارکردنی دادپەروەری لەژیانی کۆمەڵگادایەکێکەلە بنەماوئامانجەسەرەکیەکانی پەیامی ئیسلام،چونکەبەعەدالەت هەموکەس بە مافەکانی خۆی دەگات وبەوهۆیەوەلەدنیاداکارەکانمان سەردەگرێ ولە قیامەتیش بەردەگرێ وولآت دوردەبێت لە مانگرتن وخۆپیشاندان وپەچە کرداروقەیرانی سیاسی ونابوری وکۆمەڵایەتی و... هتد،ئەگەرئیسلام بکەینە دووچەمکی سەرەکی ئەوایەکەمیان:پەیوەندی نێوان بەندەوخوایەکەلەئیمان وبیروباوەڕداڕەنگ دەداتەوەجابەتەقوایان بەمەعریفەیان بەهەرشتێکی ترناوی دەبەی کەبنەمای سەرەکیە،دووەم:عەدالەتە کەلە(فقە)دا بەرجەستە دەبێت مەبەست لەیاساوڕێساکانیەتی لەحەرام وحەلآڵ وسەرجەم حوکمەکانی تر، گەورەی ئیسلام لەگەورەیی شەریعەتەکەی دا دەردەکەوێ کەعەدالەت و میانڕەوی لەسەرجەم بوارەکانداڕەچاوکردووە،لەدنیادا (٤تا٥) دەستوری جیهانی هەبوون کەم وزۆرعەدالەتیان زانیوەوەك( دەستورەکانی ڕۆمانی و ڕوسی وچینی)بەلآم هیچیان وەك پەیامی ئیسلام نەیانتوانیوەلەسەردەمی خۆیاندا عەدالەت پراکتیزە بکەن وبمێننەوە،دیارە پێچەوانەی عەدالەت وداد پەروەری ستەمەکەخیانەت وگەندەڵیە،ئامانج وستراتیژی پەیامی ئیسلام لابردنی زوڵم وستەمەنەك نەهێشتنی کوفر دیارەکەستەم نەماداپەروەری لەشوێنیەتی،وەسونەتی خوایەلەبونەوەرداکەزۆرینە بێباوەڕبێ،وەئیسلامیش ڕازی نیە نەستەم بکەی وەنەستەم قبوڵ بکەی(لاضر ولاضرار)،وەهەروەها ئەو پەڕی عەدالەتەکەموسڵمان ئیمانی دانامەزرێ تائەوەی بۆخۆی پێ خۆشە بۆ بەرانبەرەکەیشی پێی خۆش بێ(لایؤمن احدکم حتی یحب لاخیە مایحب لنفسە) کەئەوەش لەکرداروگوفتارو ڕەوشتەجوانەکاندا ڕەنگ دەداتەوە،لێرەدا مەبەستمان پێ(عەدالەتی ممکن)ە ئەوەی لەتوانادابێت،یەکێ لەناوە پیرۆزەکانی خوا(العدل)ە،هەربۆیەپلەوپایەی داد

پەروەرنەوەنـدە بەرزەکەخاوەنەکـەی لـە ژێرسـێبەری عەرشـی خـوادا حەشـر دەکرێت(امـام عـادل)،وەلەفەرمودەیەکی تـردا پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمویـەتی:(یـەك ڕۆژی حـاکمی عـەدل خێری عیبادەتی شەست ساڵی هەیە!)،ئەگەر سـەرنجی ئامـانج ومەبەسـتەکانی شـەریعەتی ئیسلام بدەی لە دانانی حوکمەکانیدا دەبینـی هاتووەبۆیـەدیهێنانی بەرژەوەنـدی مرۆڤـەکان لەڕێگەی پاراستنی پێنج شـتەگرنگەکانی ئادەمیزادکـەژیانیان لەسـەریەندەوبیان دەوتـرێ (مقاصـد الـشریعە)کـەبریتین لـە(دیـن ولاشـەی مـرۆڤ وئـەقڵ ووەچـەی مـرۆڤ ومـاڵ وسامان)بەنەمانی هەرکام لەمانە ژیان ژانە سەرئێشانە،لەبەرئەوە :

١- بۆپاراستنی(عەقڵ) هەمووسەرخۆشکەرێکی حەرام کردووە وسزای دار لێدانی بۆ داناوە

٢- بۆ پاراستنی( دین) جیهادی داناوە .

٣- بۆپاراستنی(گیانی مرۆڤ)کوشتنی ناهەقی حەرامکردووەو(قصاص)تۆڵەی داناوە

٤- بۆپاراستنی(وەچەی مرۆڤ)زیناوداوێن پیسی حەرام کردووەسزای(حەددو ڕەجمی)بۆداناوە

٥- بۆ پاراستنی (مـاڵ وسـامان) هەموومامەڵەیـەکی نادروسـتی وەك (غـەش و خیانـەت ودرۆو دەست بەسەراگرتنی) حەرام کردووە .

وەك نمونەیەکی مێژوویی لە جێ بەجێ کردنی عەدالەت دەبینی لـەدادگای ئیـسلامیدا،قازی (شورەیح) پێشەواعلی وجولەکەیەك وەك یەك ڕائەگرێ بـۆ ئـەوەی بزانـرێ کەزرێـەکـە هـی کامیانە؟کاتێ پێشەوا علی زرێیەکەی گوم کردبوولەدەستی جولەکەیەکـدا بینیـەوە بـەهۆی ئەوعەدالەتەوەبووکەجولەکە موسـڵمان بووکـەبینی کاربەشـایەت وبەڵگـەدەکات وتەنانـەت شایەتی حەسەنی کوڕی لێوەرنەگیراودای بەجولەکەکە، بـەلام لـەم ڕۆژگـارەدا دەبینـی یاسـا تـەنها بۆخـەڵکی هـەژارە وتونـددەکرێ لەسەریان،دەسـەلاتدارودەوڵەمەندوجام ڕەشـەکان لەسـەروی یاسـاوەن ووەك بـەرزەکی بانـان بـۆی دەردەچـن!، کـاتێ (پێـشەواعمر کـوڕی عبـدالعزیز) بویەخەلیفـەی موسـڵمانان زۆربـەی بەرپرسـە کـانی گـۆڕی وسەرەتاسـکرتێری کۆشکی لابردکەئەوکات پیان دەوت(حاجب) پێی وت لەبەرئەوەی ڕۆژێ تۆقسەت بۆخەڵکی

دەکردخۆت لەبەرسێبەربوی وخەڵکیش لە بەرخۆرەتاوبوون بێگومان کاربەدەستێ بەوشێو
ـت وداد پەروەربێت لەگەڵ گەلەکەی پێویستی بەپاسەوانی زۆروسەیارەی گوللە نەبێ
ـکات وقسەیەکیش نامێنێتەوەبۆئۆپۆزسیۆن،وەك دابەشکردنی بەشی ژیانی مرۆڤەکانیش
کەری خوا یەکپارچە عەدالەتەکە ژیانی هەریەکەی بەجۆرێك دابەشکردوە، بەڵام خەڵکانێك
کەوەك وخۆی ئەم دینەیان نەناسیوەولەزمان نەیارانی دینەوە بۆیان پێناسەکراوەودەڵێن
ئیسلام دواکەوتویی وکۆنەپەرستی وتیرۆرو تۆقاندنە وچی و چیە،دیارە مرۆڤ دژی
ئەوشتەیەکەنایناسێ (الانسان عدوماجهل)نمونەی ئەوە وەك ئەوکەسەیەکەمێژووبۆمان
دەگێڕێتەوە ڕۆژگارێ گەنجێ گاڵتەی بەپیاوچاکێك کردوەووتویەتی دینەکەت بەکەڵك
نایەت! ئەویش ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی پێداووتی بیبە بۆفلان نانەواپێی بڵێ(٥)نانم
بدەرێ و بانەوموستیلەیەت لابێت تاپارەکەت بۆدێنم، ئەوکات پارەکەم بوە هەژاری
زۆربوە، نانەواکە چونکە موستیلەکەی نەناسی پێنج نانی پێنەداو گەنجەکەش گەڕایەوە لای
زاناکە،ئەمیش وتی ئەمجارەیان بیبە بۆلای فلان زەڕەنگەرەوبڵێ درهەمێکم بدەرێ وباوەك
بارمتەلات بێ تاپارەکەت بۆدێنم، کاتێ ئاڵتونچیەکە سەیری کرد وتی نرخەکەی
(١٠٠)درهەمە وچیت دەوێت هەڵگرە!گەنجەکە حاڵی بوولەوبەسەرهاتەوگەڕایەوەلای زاناکە
وتەویەی کرد،زۆرێك لەخەڵکانی خۆشمان وەکوخۆی دینەکەیان نەناسیوەو نازانن
بۆیەکەوتونەتەدویەرەکی وهەندێکیشیان فڕێیانداوە وەك چۆن ناناواکە موستیلەکەی نەناسی
وفڕێی دا،بۆیەوتراوە:قەدری زێڕلای زەڕەنگەرە،ڕیزی ئەم دینە لای زانایانەوئەوان دەزانن کە
عەدالەتی ڕاستەقینە تەنهالە ئیسلامدا بیبینە،بێگومان میتۆدی عەدالەت
وبەهارەوشتیەکان بیروباوەڕە،ئەوەتابۆساغ کردنەوەی کێشەکان یاسای(البینەعلی المدعی
والیمین علی من انکر)ی داناوە واتە دەبێ بەشایەت وبەڵگەداواکاریەکەت بسەلمێنی
کەئەوشتەهی تۆیە، پاشان سوێند دەردرێتە ئەوەی نکوڵی شتەکەدەکات،یاسای شەرع
بۆهەموانە بێ جیاوازی لەنێوان کافروموسڵماندا،ئەوەیەعەدالەتی ڕاستەقینە.

# گەندەڵی...هۆکاروچارەسەر

پێناسە:گەندەڵی بریتیەلەبەکارهێنانی پلەوپایەی گشتی ئیداری بۆبەرژەوەندی تایبەتی، (گەندەڵی/فەساد)جۆرێکەلەخیانەت،هۆکارەکەیشی لەپێناسەکەیەوەدەردەکەوێ کەهەست نەکردنەبەبەرپرسێتی بەهۆی نەترسان لەخواوەودانانی کەسانی نەگونجاوونەشیاولەپلەو پۆستی ئیداریدا،کەسێکیش لەگەڵ خواڕاست نەبێت لەگەڵ خەڵکی خوا ڕاست نابێت، کەسێك بڕوای بەلێپرسینەوەی دواڕۆژنەبێت بێگومان گەندەڵ(دزودرۆزن وخائن)دەبێت تەنهابیرلەبەرژەوەندی خۆی وحیزبەکەی دەکاتەوە،بۆیەچارەسەرتەنهالەخواترسانە،نەك دەستەی نەزاهەوچاودێری دارایی،زۆرینەی گەندەڵیەکانی ئەم سەردەمەبەهۆی دەستی حیزبەلەپۆستەئیداریەکان لەبەتایبەت لای خۆمان حکومەت حیزبەوحیزب حکومەتە! دیاردەکەزۆرقێزەونەولەزیادبونیشدایەناچارنەمیش سالی ڕۆژێکیان بۆدیاریکردوەکە (١٢/٩)ی هەموساڵێ بەڕۆژی بەگژداچونەوەی گەندەڵی ناسراوە! لەڕونکردنەوەی نەتەوە یەکگرتوەکانداڕاگەیەنرابو،عێراق دوەم وڵاتەلەڕوی گەندەڵی ئیداریەوەدوای بەنگلادیش! کەجێگەی سەرسوڕمانوتێڕامانە لەگەڵ ئەوهەموسەروەت وسامانە،سەرەڕای حیزب و دەسەڵاتی خودی وخۆماڵی،بەوەش دواڕۆژی خراپ چاوەڕێمانە،ئەوڤایرۆسەکوردستانی لەمەڕخۆشمانی گرتۆتەوە کە(١٢)ساڵ بەرلەڕوخانی ڕژێم خاوەنی ئیدارەی خۆی بوە، پێشتر واگومانمان دەبردکەدوای نەمانی دیکتاتۆری وهاتنی ئەمریکای بەناوڕزگارکەرئێمەش لە نەهامەتی ڕزگاربین وبۆماوەیەك پشویدەین وخەونەکانمان بێنەدی،بەلآم زۆربەی شتەکان پێچەوانەبونەوەوخەمەکان کەڵەکەبون وخەونەکان لەبارچون ودروشمەکان بونەبریقەی سەراب، دوای زیاتر لە(٢٢)ساڵ لەدەسەلآتی خۆمانە..دوای ئەوهەموخەبات وتێکۆشانە..لەگەڵ هەبونی ئەوهەموکۆمپانیاوسامانە...هێشتا وولآتمان ڕوولەوێرانە! بەهۆی گەندەڵی ئیداری وخراپ بەکارهێنانی دەسەلآت،لەڕوی خزمەت گوزاریەوەقەیرانی سوتەمەنی بێ چارەسەر ماوە،سیستمی کارەبامان هەرماوەچون موەلیدەی ئەهلیمان بۆدانراوە،زۆرینەی ڕێگەوبانمان

چاڵ وچۆڵەوقیر نەکراوە،قەیرانی هەژاری و بێ کاریش هەرماوە حکومەتی مەرکەزی موچە زیاد دەکات،لای خۆمان گرفتی بۆدادەنرێ ودوادەخرێ !لەماددەی(٢)ی دەستوری عێراقدا ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکی دەستورەو دینی دەوڵەتە،بەلاّم لە بڕگەی حەوتی دەستوری هەرێمدا ئاماژەیەکی کەمتری پێکراوەو هەوڵی لابردنیشی دراوەلەلایەن خەڵکانێك کە (٤./.)یژمارەی دانیشتوان یان پێك هێناوە،لەکاتێکدائیسلام بەمانای ئاشتی وسەلامەتی وڕەوشتی بەرزودادگەری کۆمەلاّیەتی دێت وبەرلە هەموکەس حکومەت سودمەند دە بێت لەهاولاّتی ڕەوشت بەرزوبلّند،بەپێوەری دیموکراتی زۆرینەحوکم دەکات کەمینەماف خوراوە جا بۆچارە سەرکردنی ئەم هەموودەردونەخۆشیانە پێویستەپەلەبکرێ لەسەروەری یاساو بەرقەرارکردن حکومەتی شەرعی نەك حیزبی یان حکومەتی شەخص،لەم هەل ومەرجەدا هەموکات زیاترپێویستمان بەچاکسازی دەسەلاّت وحکومەتێکی قانونی خزمەتگوزار هەەبۆڕوبەڕوبونە وەی ئەگەروپێشهاتەکان وکەمکردنەوەی گەندەڵیەکان چونکە بەپلەی یەکەم دەسەلاّت بەرپرسیارەلەگەندەڵی،ئاوەکەلە سەرچاوەکەوە لێڵەبۆیە خەلکەکەش بەهەمان ئاڕاستەدادەڕوا،پێشینانیش وتوویانە(گەورە ئاودەرێژێ وگچکەش پێی لێدەخشێنێ )بۆیەدەبێ چاکسازی لەلوتکەوەبێت، چارسەری گەندەڵی ئەم وولاّتە بەڕیفۆرم کردنی دەسەلاّتە )...

**شێوازو ڕواڵەتەکانی گەندەڵی بەنمونە:**

(لایەنگری(المحسوبیة)Nepotism،واصطة(Waste)، بەرتیل(الرشوة)Bribery، تالاّن وبەفیڕۆدانی دارایی گشتی(نهب المال العام)Looting of public money

**چارەسەر:**

لەفەرمودە ناسراوەکەداهاتوەکاتێ حەزرەتی جبریل هاتەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردلەئیسلام وئیمان وئیحسان؟سەبارەت بەئیحسان لەوەلاّمیدا فەرموی:(**ان تعبدالله كانك تراه فان لم تكن تراهُ فانه يراك**)واتە:بەشێوەیەك خوا پەرستی بکەی وەك ئەوەی

خوابینی گەرتۆنەونەبینی بێگومان ئەوتۆدەبینێ، ئەوەش هەستکردنە بەلێپرسراوێتی وچاودێری خوایی کەدەرمانی هەمودەردانە بەتایبەت گەندەڵی ئەم زەمانە،دیارەنەبونی پسپۆڕی ونەشارەزایی یەکێکە لە هۆیەکانی گەندەڵی،(مستەفاسویاعی)لەلێکدانەوەی ئیحسانداودەڵێ:احسان واتەبەجوانی کارەکە ئەنجام بدەی لەبەرخواکەدەکاتە (اتقان)بۆیەکە احسان نەبوئیتقان نابێ وکە ئیتقانیش نەبوناعەدالەتی دێتەئاراوەکەبەمانای خیانەت و گەندەڵیە،کەواتە:ئیحسان ئیتقان دروست دەکات بەهۆی چاودێری خواییەوە ئیحسان و ئیتقان پێکەوەن بەلاّم ئیحسان گشتگیرترە،اتقان بەکەسێکی پسپۆڕو شارەزادەوترێ لە کارەکەیدا بەلاّم کەاحسانی لەگەڵدابێت ئەوەبەڕاستی ودروستی دەیکات بەهۆی هەست کردنی بەچاودێری وترسی خودا،کەئەوەش چارەسەرەبۆبنەبڕکردنی گەندەڵی وەکوتاك، بۆیە پلەومەقامی احسان بەرزترین پلەی خواناسینە،بەلاّم وەك کۆمەڵگانەوەچارەسەری ڕاست گەڕانەوەیەبۆ یاساوڕێساکانی ئەم دینەکەسیستمی ئیداری ئیسلامیەوچاکترین زەمانەتە بۆبنە بڕکردنی پەتای گەندەڵی کەئەمەپوختەکەیەتی لەسەردەمێکداکاری پێکراوە:

١)دەزگای دادوەری(قەزا)لەسەروی هەمودەسەلاّتەکانەوسەربەخۆیە،

٢)دەزگائیداریەکان هاوکاروچاودێری یەکترن،وەك چۆن تاکی موسڵمانان پشت وپەنای یەکن بۆفەرمانکردن بەچاکەوڕێگری لەخراپە(سورەی تەوبە/٧).

٣)دەزگای چاودێری دارایی بەتایبەت بۆلێپرسینەوەی بەرپرسەکان،کەپێشەوا(عمرکوڕی عبدالعزیز)دایمەزراندوەو لەسەربنەمای چۆن ولەکوێت پەیداکردوەئەم ماڵە(من این لك هذا؟)،کەچاکترین هۆکاری بنبڕ کردنی گەندەڵیە.

٤)دەزگای لێپێچینەوەونەهێشتنی تاوان(ازالةالمنکر)کەبە(حسبة)ناسرابوو بە تایبەت لە بواری خووڕەوشتی کۆمەڵایەتیدا،لەسەربنەمای(من رای منکم منکرا فلیغیره بیدة..) هەر کەس لەئێوەخراپەیەکی بینی ئەگەرتوانی بابەدەست بیگۆڕێ ئەگەرنابەزمان بیڵێ گەر نا بابەدڵ پێی ناخۆش بێت ئەوەش لاوازترینی ئیمانە،دیارەپێچەوانەی گەندەڵی عەدالەتە.

# بەکێ دەڵێن ڕۆشنبیر ؟

لەگرفتەسەرەکیەکانی ئەم ڕۆژگاروسەردەمە..کەیەکێکە لە دەرهاویشتەکانی سیستمی عەولەمە..ونبونی کەسایەتی وپێناسەکەمە،لەومیانەیەداچەمك و زاراوەی ڕاست ودروست وجوان بەکاردێنن بۆمەبەستی خراپ! یەکێ لەو چەمك وزاراوانەکەستەمی لێکراوەوبچوك کراوەتەوە چەمکی ڕۆشنبیریە، سەرەتا پێناسەی ڕۆشنبیری(culture)دەکەین وەك لە ڕوکەشی وشەکە دادیارەواتە:خاوەن بیروباوەڕی ڕۆشن وڕوناك،کەبەهۆیەوە دەبێتەخاوەنی کرداروگوفتاروڕەوشتی جوان وڕەسەن وپەسەن بەهۆیەوەدەبێتەکەسایەتیەکی دامەزراوو نمونەیی،پێچەوانەی ڕۆشنبیرخاوەن بیری تاریك ونەفام ودواکەوتوە، سەرچاوەومیتۆدی ڕۆشنبیری ئیسلامی زاتی(الله)یە(الله نورالسموات والارض)ئەونورورڕوناکیەش لە قورئاندا یەولەڕێگەی پێغەمبەرەوە(ﷺ)ناردویەتی بۆ ئەوەی مرۆڤەکان لەتاریکی نەزانین وبێ بڕواییەوەڕزگاربکات بۆڕوناکی ئیسلام وئیمان(يخرجهم من الظلمات الى النور.)وشەی تاریکی بەکۆهێناوە وڕوناکیش بەتاك،چونکە ڕێبازی تاریکی زۆرن وجۆراوجۆرن بەڵام تاکە بیرو ڕێبازی ڕوناك ئیسلامەکەمرۆڤ دەکاتە ڕۆشنبیر،بۆزیاتربەئاگابون لەماناومەبەستی ڕۆشنبیرلەدەرەوەی ئیسلام ئەوەتازانای بەریتانی(ئەدواربیرنت تایلۆر)لەکتێبی (الثقافة البدائية) داساڵی(١٧٨١)زدەڵێ:{ڕۆشنبیری ئەوکۆگا گشت گیرەیەکەزانست و زانیاری وبیروباوەڕوهونەرو ڕەوشت وسەرجەم تواناکانی مرۆڤ دەگرێتە خۆ}کەئەوەش لە زانایانی ڕاستەقینەی ئسلامدابەرجەستەدەبێت کەبەڕێنماییەکانی پێغەمبەری پێشەوا بانگەشەی ڕەوشتەجوانەکان دەکەن(وخالق الناس بخلق حسنة)(امام شافعی)ڕەحمەتی خوای لێبێ لە پێناسەی ڕۆشنبیروسەرۆك ودەوڵەمەندافەرمویەتی:

انَّ الفقيهَ هوالفقيهُ بفعلهِ،ليس الفقيهُ بنُطقهِ ومَقالهِ

وكذاالرئيسُ هوالرئيس بخُلقهِ،ليس الرئيسُ بقومَهِ ورِجالهِ

وكذاالغنىُ هوالغنىُ بحالهِ..ليس الغَنىُ بمُلكهِ ومالهِ

واتە :ڕۆشنبیروتێگەیشتونەوکەسەیەکەبەکردەوەتێگەیشتوبێت،نەك تەنهابەقسە ونوسینی ڕوت،وەهەروەهاسەرۆکیش دەبێ بەڕەوشتەجوانەکانی سەرکردەبێت نەك بەژمارەی پیاوانی چەکداری،وەدەوڵەمەندیش کەسێکە بەدڵ دەوڵەمەند بێت نەك بەسەروەت وسامان، لەدوای شۆڕشی فەرەنسی لەئەوروپاوڕۆژئاوا توێژێك پەیدابوون کەبەچەمکی ڕۆشنبیری دژایەتی دینی شێواوی کەنیسە یان دەکردوزاراوەی ڕۆشنبیریان بۆخۆیان قۆرخکرد،ڕۆشنبیرانی لای خۆشمان لە دوای ڕوخانی عوسمانیەکان وەك بەشێك لە ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵات کەوتنە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ڕۆژئاواوزیاترئەوچەمکەجوانەیان بۆ مەبەستی خراپ بەکاردێنا!

(کلمة الحق یرادبهاالباطل)زۆرێك لە موسڵمانانیش فریویان خواردو بەودروشمانە بازاڕەکە یان گەرم کرد لەسەرەنجام کۆمەڵێك بەناوڕۆشنبیرهاتنەئاراوەکەناوی بێناوەڕۆك بون وزیاتر گرنگیاندەدا بەدیکۆر(فۆرمالیزم)وخۆ دەرخستن وناوبانگ وسەروەت وسامان زۆربەیان ڕەسەنایەتیان لەدەست داو لەخزمەت کەلتوروهونەری بێگانەدابون!کەئەمە هەندێ لەتایبەتمەندیەکانیانە:

١/لەقسەکردنداوەك فەلسەفەزاراوەی بێگانەبەکاردێنن وشانازی پێوەدەکەن وەك (میتۆدو فاکتەرومیکانیزم وئالیەتی قەیران،بۆپراکتیزەی سیستمێکی مۆدێرن کەسانی پرۆفیشناڵ وئیجابی گەرەکەلەبەڵێیان okیە!)

٢/لەپۆشینی جل وبەرگ وملیوانەونینۆکی درێژوهەڵسوکەوتی فول ئەوروپی! ( sopar man)جل وبەرگ وداب ونەریتی باوباپیرانیان بەدواکەوتویی و کۆنەپەرستی دەزانن! ئەگەرخاوەنی دەیان کتێب وبڕوانامەیش بیت بەجلی کوردیەوە هەربەڕوناکبیرت نازانن!

٣/ بەلای هەندێکیانەوەتادژایەتی ئاین بکەی ڕۆشنبیرتری! دیارەگەر ریش و سیواك هەڵبگری ئەوەبەلایانەوەزۆردواکەوتوی و جێگەی گومانە!....

ئایابەچ پێوەرێك ئەوجۆرەبەناوڕۆشنبیرانەڕێگەبەخۆیان دەدەن دەست بخەنە ناوکاروباری ئاینەوە؟پرۆژەپێشکەش بەپەرلەمان بکەن وقسەی شەرع بخەنە دەنگ دانەوە! لەکاتێکدا

پسپۆڕنین لەوبوارەدا،ئایادەگونجیٚ ئەوانەبکرێنە نوێنەر ونیشانەی گەلێکی موسڵمانی وەك کورد ؟لەکاتێدامزگەوت وحوجرەبەردی بناغەی ڕۆشنبیری کوردی بووە،ئەگەرمەبەست لەڕۆشنبیرنوسینی چیرۆك ورۆمان بێت،ئەوە یەکەم کەس لەکوردستان کەرۆمانی نوسیوە مەلای ڕەش بووەلەهەولێر،ئەگەرمەبەست نوسینی پەخشان بیٚ ئەوەیەکەم کەس کە پەخشانی نوسیوە لەکوردستان شێخ حسینی قازی بووە،گەرمەبەست پیٚ هونەری شانۆ گەری بێت ئەولەدێرین زەمانەوە فەقێی حوجرەی مزگەوتەکانی کوردستان لەڕۆژانی پشویان سێشەممان ولەکاتی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتن دا شانۆگەریان دەکردوئامادەبوانیان دەخستە پێکەنین،ئەگەرمەبەست شیعرو هۆنراوەبێت ئەوەهەمونەوڕاستیە دەزانین کەقوتابخانەی شیعروئەدەبی کوردی دەرچوی مزگەوتەکان بون دەیانی وەك نالی ومەحوی ومەولەوی ومەلای جزیریمان هەیەکەئەدیبانی سەردەم بەردەوام لێکۆڵینەوە لەسەرشیعرەکانیان دەکەن، هەیانەبەسیٚ چوارزمان شیعری نوسیوەبەتایبەت فارسی وعەرە بی و تورکی،جگەلەدەیان نوسەروشاعیروزانای وەك مامۆستاملاعبدالکریم مدرس ومەلاجامی ومەلاعبداللە ی قامیشی ومەلای گەورەی کۆیە..،ئیترچ بوارێك ماوەتەوەکەزانایانی ئاینی ڕۆڵی سەرەکیان تێدا نەدیبێت؟ئەگەربەویژدانەوە بدوێین زانای ئاینی ڕاستەقینەودڵسۆزینەمای ڕۆشنبیری گشتیەوپاشان ئەوانەی ترکەڕەسەنایەتی گەلەکەیان پاراستوەوشایستەی ئەوپلەوپایەن کەپێیان بوتریٚ ڕۆشنبیر،کەواتەمەلاورۆشنبیردوو ڕوی یەك دراون،دیارەبوارەکانی ڕۆشنبیری هەمەلایەنە،ڕۆشنبیری ئاینی زیاترتایبەتمەندی زانایانی ئاینیە،وەڕۆشنبیری گشتی بەسەرجەم بەشەکانیەوەگەنجان هەرکەسەلەبواری پسپۆڕی خۆیداپێوەسەرقاڵە گرنگ ئەوەیە ئەوهونەرە ڕاست وڕەسەن بێت ولەخزمەت ڕەوشت وڕێبازو بەرژەوەندی گشتی گەلەکەماندا بێت،بۆچارە سەربێت نەك کێشەوقەیران وپشێوی بنێتەوە،لەکۆتایدابەکورتی وبەکوردی:

ڕۆشنبیری پێگەنیە بەلگوپیشەیە،پێدانی ناونیشان دەبێ بەپیشەبێ،نەك بەناو.
ڕۆشنبیران لەناوکۆمەلگەداکەمینەن بەلاّم کاران،بەهەولی خۆیان پێگەیشتون.
ڕۆشنبیر(نُخبة)ن،واتەدەستەبژێری ناوکۆمەلگان،(دەستەچیلە).
ڕۆشنبیری ڕاستەقینە شەڕیۆخەلك دەکات،نەك شەڕبەخەلك بکات.
ڕۆشنبیر هەولدەدات بۆسەروەری یاسا،چونکەنەبونی یاسامەرگی کۆمەلگایە.
ڕۆشنبیر هەولدەدات بۆبەیەکگەیشتن لەپێناولەیەکگەیشتن.
ڕۆشنبیر لەکێشەکاندا ماندونابێ، بێ ئومێد نابێ، خاوەن پەیامێکی زیندوە.
ڕۆشنبیر لەبازنەگەورەکانداکاردەکات بۆبەرژەوەندی گشتی.
ڕۆشنبیر (دەستەبژێر)کۆمەلگەدەستنیشانیان دەکات،نەك حیزب یائەم وئەو!!
ڕۆشنبیر حەناکات کۆیلەبێت،باشتریش لەوەحەزناکات کوێخای خەلك بێت.

---

* ( کۆنفرانسی ڕۆلی دامەزراوە ئاینی وڕۆشنبیریەکان لەپتەوکردنی ئاشتی کۆمەلآیەتی کەلە(٢٠١١/٢/١٢)لەهەولێرلەژێرچاودێری سەرۆکی هەرێم بۆئەومەبەستە ڕێکخرابوو بەندە یەکێك بولەبەشداربوانی ئەوکۆنفرانسە،پاشان بەو شێوەیە لەوتاری هەینبداخوێندمەوە).

# هەستکردن بەچاودێری خوا

هەستکردن بەچاودێری خودابەسەرتەوە هەرچاوەی هەمووڕاستی وخێرێکەوزامنی پاراستنی دەسکەوتەکانی عیبادەتە بەرهەمی ئیمانە کەدڵنیات دەکات خواچاودێرمانە ئاگای لێمانە(..ان الله کان علیکم رقیبا)کەدەبینە کەسێکی چاك وپاك وخاوەن ڕەوشتی جوان،وەك چۆن لەدونیادا نەسێ چاوی کامێرای لەسەر بێ خێراخۆی ڕێك دەکات بۆئەوەی کەلێدرایەوەنانێرین دەرنەکەوێ،یان شۆفێرێ کەبزانێت مەفرەزەی مرورلە پێشیەوەیەخۆی ڕێك دەکات،دیارە ئامێران خوداومەفرەزەی فریشتەکان لە چاوەی بەندەزۆرجیاوازە،یان گەرکەلەکۆڕ.اهەنگێك بێت جوان دائەنیشی چونکە چاودێرزۆرە...ئەی گەرکەسێ هەست بکات بەچاودێری خودا ئەبێ چۆن بێت.بێگومان نمونەیی دەبێت چونکەخیانەت لەکارەکەی داناکات،بڕوانامەی ڕاستەقینەلەهەردام و دەزگایەکدا بێت دزی ناکات لەناووکارەباو پول وپارە چونکەلەڕۆژێ ئەتر سێ کەنهێنیەکان ئاشکرا دەبن ودزودرۆزن و دوڕووەکان تیایدا خەجاڵەت دەبن(پەنابەخوا)ئەوڕۆژە (یوم تبلی السرائر)، (امام فەخری ڕازی) زۆرگرنگی دەدا بەیەکسانی لەناوقوتابیەکانی دا،ڕۆژێك وەك تاقیکردنەوە هەریەك چۆلەکەیەکی پێ گرتن ووتی بڕۆن هەریەکەتان لە شوێنێ سەری بڕن کەس چاوی لێنەبێ،هەریەکەیان لەپەناشیوێك وبەردێکدا سەریان بڕی وهێنایانەوە،تەنها یەکێکیان نەبێ کە چۆلەکەکەی بەزیندوی گێڕایەوەوسەری نەبڕی بووکەئەم قوتابیەیان زیاتر خۆشەویستی مامۆستا بوو لەوانی تر،مامۆستالێی پرسی بۆسەرت نەبڕی؟وتی چونکەهەر شوێنێ خواچاوی لێبولێیستاش کەئەم هەموودرۆودوڕویی وخیانەت وگەندەڵیە لەئارادایە هۆ کارەکەی هەست نەکردنە بەچاودێری خودا بۆیە ژیانمان لێبوەبەژان چارە سەریش ترسان وشەرم کردنەلەخواوهەست کردنەبەچاودێری خوا،کەتۆ لە مولکی خوادای ڕزقی ئەودەخۆی بەندەی ئەویشی لەبەرچاوی ئەودا بەچ ڕویەکەوەتاوان وخراپە ئەنجام دەدەی کەئەمەوەش ئەو پەڕی نامەردی وبێوەفاییە ،لەپێشینانی ئێمە نمونەی سەرسوڕ هێنەری بەدی هاتوە وەك

جارێکیان کە پێشەواعمرشەونەگەڕابەکۆلانەکانی شاری مەدینــەدا بۆئــەوەی بـەئاگابێت لـە گوزەرانی خەلّك گوێی لێبولـەماڵێك دایکەکـە وتـی بەکـچەکەی ئاوی زۆر بکەشـیرەکەوە تازیاد بێت کچەکەش وتـی دایکـەگیان ئەوەحەرامـە ونەبادا امـام عمرئاگاداربێت،دایکی وتـی ئەوئێستاخەوتوە،کـچەکەش وتـی دایکـەگیان ئەگـەرعمریش خـەوتبێ خـوای عمـر نەخەوتوەوئاگادارە،بۆبــەیانی پێـشەواعمر بــە کوڕەکــانی وت کــێ ژن دێــنێ وهــەواڵی ئەوکچەشی پرسی وخواسـتی بۆکـوڕە کـەی وسـەرەنجام بوبـەدایکی پێـشەوا( عمـری کـوڕی عبدالعزیز)ئەوەئەنجامی هەسـتکردنە بەچـاوە دێـری خوایەکەلـە دنیـاودواڕۆژدا سـەربەرزت دەکـات، بـەکاروکردەوەی ڕاسـت ودروسـت کۆمــەڵگای نمونـەیمان بۆدێتەبەرهەم،ئــەوەتا چونکەئەوهەســتە نــەماوە دەبینــی لەژورەتاریکـەکانو زیندانــەکان ودامــەدەزراوە کـان چ خیانەت وگەندەڵیەك ئەنجام دەدرێت!کە جێگەی سەرسـوڕمانە لەسـەر دەمـی مـافی مـرۆڤ وعەولەمەدا،بەڵام وەك پێشینان وتویانـە : لەوەبترسـێ لـەخوا ناترسـێ،ئەوەی لەگـەڵ خـوا ڕاست نەبێت لەگەڵ خەڵکی خواش ڕاست نابێت

# زوڵم وستەم... هۆکارودەرەنجام

ئامانجی سەرەکی لەپراکتیزەکردنی یاساورێساکانی شەریعەتی ئیسلامی بەر جەستەکردنی عەدالەتەکەپێچەوانەی زوڵم وستەمە،پەیامی ئیسلام هاتووە بۆلابردنی زوڵم نەك نەهێشتنی کوفر،چونکەخەڵکی ئازادن لەهەڵبژاردنی بیرو باوەڕداوبەپێی دەقی قورئانیش زۆرینەی مرۆڤەکان باوەڕناهێنن وزۆرێکیش لە باوەڕداران شیرك تێکەڵ بەئیمانەکەیان دەکەن! وەك خوای گەورە فەرمویەتی ( وماأكثرالناس ولوحرصت بمؤمنين)،لەئیسلامدا ستەم یان ڕازی بون بەستەم قەدەغەکراوەورێگەی پێنەدراوە(**لاضررولاضرار**)بۆیە ستەمکار زاڵمەورازی بون بەزوڵم ستەمە وتاوانەوکەسی بێدەنگ لەبەرانبەرستەمدا لە فەرمودەی پێغەمبەردابەشەیتانی لاڵ دانراوە(**الساكت عن الحق شيطان اخرس**)ئەوەتاخوای گەورە باسی فیرعەون دەکات کەلەڕۆژی قیامەتدادەیبەن بۆدۆزەخ ودەبێتە پێشەنگ وگەلەکەیشی بەدواوەیەتی بۆناوئاگرچونکەڕازی بون بەزەلیلی و ستەم(**يقدم قومه**.. ،بۆیەپێغەمبەری دڵسۆزوپەرۆشی دنیاودوارۆژمان فەرمویەتی:(**من راى منكم منكراً فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه،فان لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الايمان**)واتە:هەر کەس لەئێوە خراپەیەکی بینی بابەدەست بیگۆڕێ،ئەگەر نەیتوانی بابەزمان بیگۆڕێ وئەگەرنابابەدڵ پێی ناخۆش بێت کەئەوەیش لاواز ترینی ئیمانە،دیارەئەوکەسانە خاوەن ڕەوشتی بەرزوبڵندن ودەبنەدڵسۆزوخەم خۆری گەل وولات بەوەی کەدژی ستەم وتاوان وخراپەکاری ڕادەوەستن و حەق وڕاستیەکان ئاشکرا دەکەن بۆخەڵك ودەکەونە بەرئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) (**افضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر**)واتە:چاکترین جیهادو تێکۆشان وتنی حەق وڕاستیەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار،نەك ئاغابەلێ و ماستاوکردن،ئەوەش ئەرکێکی ئیمانیەوهەرچەندەکارێکی ئاسان نیەبەلام ولات وژیان وژیارێش دەخات وسەرەنجام کۆمەڵگایەکی تەندروست ونمونەییمان بۆفەراهەم دێت کە ئامانجی پەیامی ئیسلامە، بەپێچەوانەی قسەوتۆمەتی نەیارانی ئیسلام کەبەدواکەوتن وکۆنەپەرستی وتیرۆروتۆقاندن

ناساندویانه،خوای گەورەبۆماوەیەك مۆڵەتی ستەمكاردەدات بۆئەوەی دەربكەوێ تاچەند ئەو گەلەئامادەی گۆڕانكاری وئازادی خوازن یان ستەم وزەلیلی قبولّ دەكەن و دەبیّ باجی ئەوژێردەستەییە بدەن،(ان الله لیملي للظالم ..)ئەیناكەس لەدەستی خوادەرناچیّت ورۆژێ بە توندی ئەیگرێت وبەری نادات(ان اخذه الیم شدید)(ان بطش ربك لشدید)هێزولێدانی خوازۆرتونده،وەك وتراوەبۆهەرزالمێك زەواڵێك دەنێرێ، لە تەمەنی خۆماندا بینیمان چۆن سەدام وشای ئێران وابن علي تونس ....، بونەپەندی زەمانەبۆكەسانی ژیر،

**هۆیەكانی پەیدابونی ستەم:**

١)دانانی كەسانی ناشایستەونەگونجاولەپلەوپۆستی ئیداریداكەلەبری خزمەت دەبنەخەفەت وخیانەت،چونكەپسپۆڕنیە،كەپێغەمبەر(ﷺ) لەفەرمودەیەكدا بە نیشانەیەكی ئاخرزەمانی داناوە(اذا وسدالامرالی غیراهله فانتظرالساعة) واتە: ئەگەرشت درایەدەستی كەسانیّ كەشایستەی ئەوكارەنەبون ئەوەچاوەڕانی دنیاوێران بون بكەن،چونكەئەگەرعەدالەت نەماو ستەم وخراپی پەرەی سەند ژیان دەبیّ بەژان وبۆنەمان چاكە.

٢) نزمی ئاستی هوشیاری بەگشتی وشیاری ئاینی بەتایبەتی،چون زۆرشت بەناوی دینەوەدەكرێت و بەوشێوەیەش نیەلەدیندا!

٣) دەمارگیری ورەگەزپەرستی بەجۆرێك كەهەرچی خزمەكەی یاحیزبەكەی بیكات چاك یان خراپ پشتیوانی دەكات!كەئەوەڕەوشتی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامەورێگری لێكراوە، لەكاتێكداپێویستەلەگەڵ حەق و ڕاستی دابین بالەسەرخۆشمان بكەوێ(قل الحق ولوعلی نفسك)پێغەمبەرمان(ﷺ)فەرمویەتی( من دعاالی العصبیة فلیس منا،ومن قاتل علی العصبیة فلیس منا...)باپێوەری چاكەوخراپەعەدالەت وخزمەتكردن بێت(سید القوم خادمه)نەك خۆمانە خۆمانەی نا دروست لەپێناوستەم وتاواندا.

**جۆرەكانی زوڵم:**

١- شیرك: چونكەلادانەلەرێگەی ڕاست بۆیەگەورەترین تاوانە،اكبرُالكبائر...

٢-وەك چۆن ڕازی بون بەكوفركوفرەبەهەمان شێوە ڕازی بون بەزوڵم زوڵمە

٣- ستەمكردن لەخودی خۆت بەوەی كەدوچاری حەرامی بكەیت كەسەرەنجامەكەی شەرمەزاری دنیاودواڕۆژەنەگەرتەوبەنەكات.

٤- ستەمی كۆمەلایەتی لەخێزان وخانەوادەودەوروبەربەگشتی بەمامەڵەی كردنی خراپ.

٥- ستەم لەژێردەستەوئەوانەی لەخوارخۆتەوەن لەپلەوپۆستی ئیداریداتا دەگاتە ستەمی نەتەوەیی،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی(من ولی امرعشرةِ ...) واتە:هەركەس لەدنیادا بەرپرسیاری(١٠)كەس بوبێت نەوەلەدواڕۆژداكاتێ حیسابی لەگەڵدادەكرێت كۆت وپێوەند كراوەوهیچ شتێ ناتوانێ ئەوزنجیرە بكاتەوە تەنهاعەدالەت نەبێ .

**سەرەنجامی ستەم:**

یەكەم: لەدنیادادەبێتەهۆكاری مانەوەوبەردەوامی زوڵم وستەم وقەیرانی سیاسی وئابوری وكۆمەلایەتی لێدەكەوێتەوەویاسای جەنگەڵ بەرقەراردەبێت و تەقینەوەی باروودۆخ و تێك چونی ڕەوشی ئاسایی وخوێن ڕشتن ومانگرتن وخۆپیشاندانی بەردەوام وپشێوی وئاڵۆزی و ناكۆكی وخیانەت وگەندەڵی وژیان دەبێت بەژان،وەك لەم ڕۆژگارەدادەبینی،هەرچەندە دروشمی بریقەداریان بەبەرداكردووەوەك مافی مرۆڤ وئازادی وبەجیهانی بون و...هتد،بەلام ناوی بێناوەرۆكەوبۆشە..دەنگی دەهۆڵەولەدوری خۆشە.

دووەم: ستەمماڵوێرانی دنیاودواڕۆژە،لەدواڕۆژداسزای سەخت وتاریكیە،لەفەرمودەداهاتوە (الظلم ظلمات یوم القیامة..)واتە:زوڵم تاریكایەكانی ڕۆژی قیامەتە،پەنابەخوالەسزای خوا

---

ئەم بابەتەساڵانەوتاری یادی ڕاپەڕینی كوردستانەكەلە(١٩٩١/٣/٥)لەشاری ڕانیە دژبە ستەمی بەعسیەكان لەسەرمینبەردوبارەم دەكردەوە،كەدواتر ڕاپەڕین بوبەمۆدیلی گەلان.

# ئەوەی پەند وەرنەگرێت ئەبێ بە پەند

سەرکردەی ستەمکاروزۆردار..یان ئیماندارو خزمەتکار؟!

دیارەهەمومان هەڵەوکەموکورتیمان هەیەبەلاَم مرۆڤی ژیروبیرتیژکەسێکەبەخۆیدا دەچێتەوەوخۆی پێدەگەیەنێت ودوربینەوکۆشش دەکات بۆدوای مردن وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی(الکیسُ مَن دانَ نفسه وعمِلَ لمابعدالموت...)یەکێك لەورەوشتەچاکانە پەند وەرگرتنەلەرِوداوەکانی زەمانەلەسەرئاستی تاك وکۆلەسەرجەم پلەوپۆستەکاندا، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی(السَعیدُمَن اتعظَ بِغَیرِه) واتەنبەختەوەرئەوەیەکەپەند لەکەسانی تر وەردەگرێت،پێویستەهەمومان پەند وەربگرین لەرووداوەکانی مێژووئەوشتانەی دەبیسین دەیبینین جێگەی پەندن:

* ووشەی(العبر)بەواتای پەندوەرگرتن(٧)جارلەقورئانداهاتووە ئەمەش ئیعجازێکی قورئانە کەزانایان زۆرکتێبیان لەسەرئەم ئیعجازە رەقەمیە نوسیوە

* ئاسمانەکان حەوتن وزەوی(٧)تەبەقەیە(الله الذی خلق سبع سماوات ومن الارض مثلهن یتنزل الامر بینهن لتعلموا ان الله علی کل شیْ قدیر)الطلاق١٢،

* تەوافی کەعبە حەوتە *السعی فی الصفاوالمروە(٧)وژمارەی دەرگاکانی دۆزەخ(٧)، ژمارەی بەردی رەجمی شەیتان(٧)ورۆژانی هەفتەش،لەسەرەتای ژیانەوە مرۆڤەکان دوو بەرەبون:بەرەی خێروچاکەوبەرەی شەرِوخراپە،سەرەتاچەند نمونەیەك لە(بەرەی خێر) کۆمەڵی یەکەم: دەخەینەبەچاوتان تابیان کەینەپێشەنگی خۆمان،ئەوانەی کەخاوەنی عەقیدەی تەوحیدویەکخواناسی بون،بۆخواژیان نەك بۆخۆ،ئەوانەی بۆخەڵك ژیان نەك بە خەڵك،ئەوانەی وەك مۆم خۆیان تواندەوەورِوناکیان بەدەوروبەربەخشی،ئەوانەی بونە سەر کردەی خزمەتکار..کاتێکیش مردن قەرزدار!! وەك:

**١)حەزرەتی یوسف/** یوسف لەناوبیرەوەبۆسەرۆکایەتی خەزێنەی میصر(**قال قائل منه م لاتقتلوا یوسف وألقوة فی غیابت الجب،قال اجعلنی علی خزائن الارض إنی حفیظ علیم) (یوسف /٥٥ )**

یوسف لەفرۆشتنیەوە بەنرخێکی هەرزان(**وشروه بثمن بخس دراهم معدودة وکانوا فیة من الزاهدین)(یوسف/ ٢٠)**بۆچ ئاستێك دایك وباوك وبراکانی سوجدەی ڕێزی بۆدەبەن(**ورفع أبویە علی العرش وخروالە سجداً..)یوسف ١٠٠** ،ئەمەولەکۆتایی داستانی یوسف و براکانیداکەپریەتی لەرووداووبەسەرهاتی گەورەفەرمویەتی:(**لقد کان فی قصصهم عبرة لاولی الالباب** )بەڕاستی لەگێڕانەوەی چیرۆکەکانیان پەندوئامۆژگاری تێدایەبۆکەسانی ژیر!

**٢)دەولەتی خەلافەتی ئیسلامی/** بەشایەتی مێژوو،تەنانەت نەیارانیشی شایەتی خزمەت وعەدالەتیان بۆداوە،وەك مێژوونوسی ئەمریکی(وولْ دیوراِنت) لە کتێبی تەرجەمە کراوی (**قصةالحضارة/ب ١٣ ل ١٤٥**)دەڵێ:{ئیسلام یەکەم ئاین وسیستمە کەمرۆڤ سەرپشك دەکات لەسێ شتدا،ئیسلام بون یان جزیە یان شەڕ،بەلاّم گەلانی تربەشەڕ بەرانبەرەکانیان سەرشۆڕکردووە،دەولەتی ئیسلامی لەو(٣٠)ی ساڵەی دوای پەیامبەرکۆمارێکی دیموکراتی بووە}ئەوە شایەتی کەسێکەکەموسڵمانیش نیەبەلاّم بەویژدانەوە ڕاستیەکەی نوسیوە،بۆیە خۆنیشاندان ومانگرتنی بەخۆوەنەبینی،بائێمەش چاولەئەوان بکەین وبزانین بەچی توانیان ببنەپێشەنگی شارستانی وچاکەکاری بائێمەش شوێنیان بکەوین،

**٣)عمری کوڕی عبدالعزیز/**کەبەهۆی ڕاستی ودڵسۆزیەوەلەسەردەمی ئەودا گورگ ومەڕ پێکەوەئاویان دەخواردەوەوگورگ پەلاماری مەڕی نەدەدا!لەم ڕۆژگارەداکەقەیرانی ڕاستی و دڵسۆزیە چەندە پێوستمان بەورەوشتەجوانانەیە،

**٤)کۆماری کوردستان/**لەتەمەنێکی کورتداتوانی ببێتەنمونەیەکی جوان کە جێگەی شانازی کوردانە،چونکە سەرۆکەکەی قازی خاوەن ئیمانە،

**کۆمەڵی دووەم:** بەرەی شەڕوخراپە،ئەوانەلەبەرستەمکاریان لەناوچون نەك لەبەرپێباوەڕیان،

ئەوەدوارۆژی ستەمەوپەندلەهەڵەکانیان وەرگرن،ئەوانەبونەسەرکردەی زۆرداروستەمکاروەك:

* محمدرەزاشای ئێران دوای ئەودەسەلآت وزوڵم وستەمەزۆرەی کردی ساڵی (٩٧٩)بەتەیارە رایکردبۆمیسر،کاتێ دەمرێت شارەوانی دەینێژێت کەسی لا نەبووتەنانەت کەس وکاریشی (إن فی ذالك لعبرة لمن یخشی)

* شارۆن وەك نمونەی تازەدوای ئەوزوڵمەزۆرەی کردی ئیستازەلیلە شەش ساڵەتەنها پێست وئێسقانی ماوەومێشکی ئیش دەکات فرعەون ئاسابوەبەپەند!

* صدام نمونەی دەسەلآتی زۆرو زوڵم وستەم لەکونێك دەرهێنرا!خرایە بەردەم دادگالەرۆژی جەژنی قوربان‌دا لەسێدارەدراوبوبەقوربانی تاوانەکانی رابردوی(إن فی ذالك لعبرة لمن یخشی)

* (زین العابدین بن علی)سەرۆکی تونس بانگونوێژوسەرپۆش ودروشمە ئاینیەکانی قەدەغە کردبو،هەزاران موسڵمانی لەزیندانەکان بەندکردبوچون بۆمزگەوت بەبلیت بوسەرئەنجامەکە کەی مەهزەلەبولەئاسمان دەخولایەوە کەس وەرینەدەگرت وفەرمانی دەسگیرکردنی دەرچوو هەرزوونەخۆشکەوت..!

* میصرجگەلەوفیرعەونەی سەردەمی حەزرەتی موساکەقورئان باسی کردوە وتادنیادنیایە بوبەپەندی زەمانە،لەتەمەنی ئێمەشداحوسنی موبارەك کە زیاترلە ٣٠ساڵبوخەڵکی دەچەوساندەوەلەماوەی(١٨)رۆژدابەچەپڵەدەریان پەڕاند وئەویش وەك سەرۆکی تونس بە نەخۆشی وزەلیلی ورسوایی کۆتایی هات! کەئەوەسەرەنجامی هەمودکتاتۆروستەمکارێکەو جێگەی پەند وەرگرتنە!بەلآم کەمن ئەوانەی پەندوەردەگرن،کەسێ پەندوەردەگرێ کەلەخوا بترسێ،ئەوانی تربەپلەوپایەودەسەلآت بایی دەبن پەند وەرناگرن!بۆیە وتراوە:لەوەبترسێ کە لەخواناترسێ،لەکۆتایدا ئەڵێم: ئەگەربوی بەمیرخوات ئەچێ لەبیر.

## بیّ دەنگی:

وتراوە کەئەگەر قسەکردن زیوبیّ بیّدەنگی زێڕە،چونکە دەبیّت مرۆڤ گوێگرتنی زیاتربیّت لەقسەکردن،چون زمان یەکەوگوێچکەدوانە واتەنیەك قسە بکەودوان بزانە،بەلاّم ئەوەی لێرەدا مەبەست بیّت هەلّوێستی بیّدەنگی یە بەرامبەرپێشهات وڕوداوەکان کەماناکەی بەپێی بارودۆخ وهەلومەرجی ئەو سات وکاتەدەگۆڕیّ: هەندیّ جاربیّدەنگی نیشانەی ڕازی بونە، هەندیّ جار نیشانەی بیّ دەسەلاّتیە، هەندیّ جاریش هونەری سیاسەت کردنە کات بەسەربردنە، هەندیّ جاربیّدەنگی تاوانە وەك شاردنەوەی شایەتی ڕاست و بیّدەنگی لەبەرامبەرحەقدا شەیتانی لالّە.

---

* ئەم وتارەم لەگۆڤاری شاهۆی ساداتی پیرخدری ژمارە (١٤) دابەزیوە.

* (ئەم وتارەم هاوکات بولەگەلّ ڕاپەڕینی هەندیّ لەگەلانی عەرەب دژبەدکتاتۆرەکانیان بەهاری عەرەبی بو،ئەمجارەیان خۆری ئازادی لەرۆژئاواوەدەرکەوت وپریشکی گەیاندە ڕۆژ هەلاّت، کەلەتونس ومیصرکلپەی سەندولەماوەی چەند ڕۆژێکدادکتاتۆری ئەوولاّتانەی سوتاندوپاشان چەند ولاّتێکی تریشی گرتەوە وەك یەمەن ولیبیاو سوریاوئوردن، کەبویە مۆدیلی شۆڕشێکی سپی)هەرچەندەلەسوریاومیصربەپیلانی نەیاران فتنەکەپەرەی سەندوگەورەبو زۆرخویناوی کرا.

## یادی لەدایکبونی پێغەمبەرﷺ

**پیرۆزبێ لێمان یادی سەرداریێ.........بەناوهێنانی شادی دەباریێ،**

**شادی میوانە شادی خۆشهاتی ...ڕزگارت کردین لەپەستی وماتی**

سالأنە موسلمانان لە(١٢ی ربیع الاول)خۆشی وشادی دەردەبڕن بەلەدایك بونی سەرداری مرۆڤایەتی،دیارەئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایك بونی پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) خراپ نیە ئەگەرزیادەڕۆیی وشتی بێ شەرعیَ تێدا نەکرێ ونەوترێ،دیارەئاهەنگ گێڕان بەویادەلەنێوزانایاندامشت ومڕی زۆری لەسەرکراوەئایابیدعەتەیان نازانایانی(اصول الفقه) فەرمویانە(**الاصل فی العبادات العبادات الحظر،والاصل فی المعاملات الاباحة**)وئاهەنگ گێڕانیش لەجوغزی هەلسوکە وتاندایە(**دائیرةالمعاملات**)نەك بواری بیروباوەڕوخواپەرستی (العبادات)کەواتە ئەگەربەشێوەیەکی شەرعی وبەمەبەستێکی چاك بکرێ خراپ نیەو دەتوانرێ ئەوکۆڕەبکرێتەزیکروفیکروپێغەمبەرناسی..لەباسی سیرەت وسوننەتو عاموخاسی بیکەین بەشەحنی ئیمان..بۆتازەکردنەوەی وەعد وپەیمان..نەك کات بەسەربردن وپیاهەلدان ..یان خوێندنەوەی کتێبی پلاوان!،بەلکوهەولبدرێ لەبەر تیشکی قورئان وسوننەت خەت وڕێبازوڕەوشت وژیانی پێغەمبەر(ﷺ)بە خەلکی بناسێنرێ ئەویش لەدوای لەدایك بونی تاکۆچی دوایی،نەك مەولود نامەی جاران کەپڕی بولەشتی لاوازونابەجێ،بۆئەومەبەستە سالی(٢٠٠٩) نامیلکەیەکم نوسی بەناوی(مافەکانی پێغەمبەربەسەرموسلمانانەوە) کە دەبێ زیاترباس لەوەبکرێت ئایا ئێمەمافەکانی ئەومانداوە؟تاچەندرێبازی ئەومان گرتوە؟ لەکاتێداپێشەواکەمان مەردی مەیدان وپێشەوای میحراب بووە،پێشەوای دین ودنیابووە.

**مێژووی سەرهەلدانی یادی مەولود:**

ئـــەم یـــادە نەسوننەتەونەفەرزەونەجەژنە،لەســـەردەمی پێغەمبـــەروهاوەلان وتابعینـــدا نەبوە،بەلکولەسەدەی چوارەمی کۆچیدالەسەردەمی دەولەتی فاتمیداکەشیعەی ئیسماعیلی بون لەمیصرداهێنراوە، نەریتێ شیعەکان بـوە کـەجنێویان بەهەنـدێ لـە هـاوەلانیش دەدا!

وەك(المقريـزى)لـەكتێبى(المـواعظ والاعتباربـذكرالخطط والاثـار، ج/١ص٤٩٠) خەلیفـەی فەتمیەكان بەدرێژایی سـاڵ لەیادكردنـەوەی مردوانـدا بـون وەك نـەریتی بـەردەوامیان لەپاشـان لەكۆتایی سەدەی شەشەمداگوازرایەوە بۆكوردستان ویەكەم كەس ئەویادەی كردبـێ سـوڵتان موزەفەرەدینی هەولێری بووە،وەك(ابن كثیروابن خلكـان)باسیان كردوە،تەنانەت ابن كەسیر وەسفی سوڵتان موزەفەرەدینی كردوە بەسەركردە یەكی ئازاوزیرەك وخواناس،كـاتی خۆشـی كەخواردنی بەخەڵكداوە،خەڵكی هەژاروبرسی بووەوكاریگەری زۆری بوەلەدەعوەوبانگەوازدا بەڵام ئێستا زیاترپێویستمان بەخواردنی ڕۆحـی هەیەبۆیـەدەتوانین بەشـێوازی سـەردەم دوای نوێـژی خـەوتنان بـەبێ مەسـرەف هەنـدێ وتاروئامـۆژگاری بخوێندرێتەوە،بۆبەرچـاوڕونی موسڵمانان نەك بۆدژایەتی هەندێ لەموسڵمانان لیان خۆدەرخستن وخۆمانەخۆمانـە لەچونكە ئەویادە بۆخۆشەویستی پێغەمبەرەوخۆشەویستی ڕاستەقینەش شوێنكەوتنی ڕێبازەكەیـەتی زیندوكردنەوەی سوننەتەكانیەتی،نەك پیاهەڵدان وسەڵەواتی ڕوت(ان المحب لمن یحب مطیع كەسێ یەكێكی خۆش بوێت گوێڕایەڵی دەكات، وەك شاعر دەڵێ:ئەگەر ڕاستەڕێزی ئەوزاتـە ئەگرن فەرمون لەسەر ڕێبازی ئەوبژین وبمرن

## مافی پێغەمبەر (ﷺ)لەسەرشوێنكەوتوانی

١- ئیمان وبڕوا پێ بوونی:خوای گەورە دەفەرموێت:قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ(الاعراف/ ١٥٨ )،واتـە: ئـەی پێغەمبەری خواﷺ بڵێ: ئەی خەڵكینە چاك بزانن كە من پەیامبەرونێردراوی خوام بۆلای سەرجەم ئێوە، ڕەوانەكراوم لە لایەن ئەوخوایەی كـە دەسـتەڵاتدارێتی تـەواوی ئاسمانـەكان و زەوی تەنها هـی ئەوەوجگـە لـەوهیچ پەرسـتراوێكی بـە هـەق نیـە،ژیـان دەبەخشێ وگیـان دەستێنێ، دەسا ئێوەش بە خواوئەو پەیامبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە ی خوابڕوابكەن كـە ئەوبۆخۆی بڕوای كامڵی بە خواوبە هەموووشەكانی ئەو هەیە دەسا ئێوەش شـوێنی بكـەون

تابەڵکو بەختەوەروشارەزای ڕێگای هەق بن یەکەمین مافی پێغەمبەر(ﷺ)بەسەر نومەتەکەیەوە ئەوەیە کە بەدڵ ودەرونەوە بڕوامان پێی هەبێت کە لەلایەن خواوە هەڵبژێردراوەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ خەلات کراوە،وە بڕوامان وابێت کە ئەو زاتە چاکترین وتەواوترین وراسترین رابەروپێشەوایە لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا وە هەرچی فەرمووە راست و رەوایەولەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە...

٢-ناسینو شارەزابوون لەژیان وسیرەتی:

چونکە تا زیاترشارەزابین لەژیانی چاکتر دەیناسین وزیاترخۆشمان دەوێت،وەك عەرەبیش دەڵێ (الناس اعداوماجهلوا)خەڵکی دوژمنی ئەوشتەن کەنایناسن و شارەزاییان نییە لەبارەیەوە. لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان خۆمان شارەزا بکەین لەژیاننامەی گەوهەرستانی پێغەمبەری خوا ص،لەچۆنیەتی رەوشت و مامەڵەی لەگەڵ دۆست ودوژمنانیدا.

٣-خۆشویستنی زیاترلەماڵ ومنداڵ وکەس‌وکارو تەنانەت لەخودی خۆشمان، وەك پێغەمبەری خواص فەرموویەتی:(لایؤمن احدکم حتی اکون احب الیه من والده وولده والناس اجمعین))رواه مسلم،چونکە خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ الاحزاب/٦

واتە:پەیامبەرص بە بڕواداران لە خودی خۆیانیش لە پێشترە،وەخێزانە کانیشی دایکیانن،بەڵێ خوشك وبرای ئیماندارەبێ کەسێك کە بانگەشەی موسڵمانێتی دەکات پێغەمبەری خوای ﷺ لەگیانی خۆی خۆشتربوێ وبەوەش دەبێ لەفەرمانی دەرنەچێ، چونکە(ان المحب لمن یحب مطیعُ)،دیارە دەعوای بێ دەلیل وەرناگیرێ وقسەش فەقیرە هەمووکەسێ پێی دەوێرێ،دەبێ تۆی بڕوادارشوێن کەوتەی ئەوشەریعەتو پەیامە بی کە ئەو ئازیزە لەلایەن خواوە هێناویەتی،نەك بەهەواوئارەزووی خۆت، لەسەرخۆشەویستی ئایەت وفەرمودە ونمونەی هەڵوێستی هاوەڵان زۆرە،بەلام بەم وتەیەی (سەهلی کوڕی

عبدالله) ئەم خالە كۆتايي پێ دێنم كە دەڵێ:(نیشانەی خۆشەویستی خواخۆشە ویستنی قورئانە،نیشانەی خۆشەویستنی قورئانیش خۆشویستنی پێغەمبەرە،وە نیشانەی خۆشەویستی پێغەمبەرص خۆشویستنی سوننەتەكانیەتی،وە بەڵگەو نیشانەی خۆشویستنی خواوقورئان‌و پێغەمبەر(ﷺ)حەزونەمادەباشی یە بۆقیامەت)

٤- شوێن كەوتنی رێبازەكەی وگوێڕایەڵی وجێبەجێ كردنی فەرمایشتەكانی، وەبەپێشەنگ وەاەومرقبوڵ كردنی لەهەمووبوارەكانی ژیاندا،خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ الاحزاب/ ٢١.

واتە:بەراستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاكترین نمونەی رێكوپێكی وسەرمەشقە بۆتان بەتایبەتی بۆئەوكەسەی بەتەمای خواورۆژی دوایە ویادی خوای زۆر دەكات؛؛چونكە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەر بێت)بۆیە نێردراون تا سەرمەشق و پێشەوایەتی وچاوساغی خەڵكی بكەن،كەوابێ لەسەرهەموو ئەوانەی كە خۆیان بەشوێن كەوتویان دەزانن پێویستە بەشوێن ئەواندا بڕۆن و گوێڕایەڵیان بكەن؛چونكە بانگەشەكردنی خۆشەویستی بەبێ گوێڕایەڵی كردن هیچ بەهایەكی نییە؛ئەم بەپێشەنگ و دادوەر قبوڵ كردنەش لەكاتی كێشەوگرفت دابەجوانی دەردەكەوێت داخۆ تا چەندێكە:خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ النساء/ ٦٥،واتە: نەخێرسوێند بێ بە پەروەردگار ت ئەی پێغەمبەر ﷺ نابنە باوەڕدارتا بۆ یەكلاكردنەوەی كێشەكانی نێوانیان تۆ دەكەنە دادوەروئەوساش بەرامبەربەو بڕیارەی تۆ داوتە،هیچ تەنگی یەكیان دەست نەكەوێ لە دەرونیانداوبە چاكیش تەسلیم وملكەچ بن،ئەوانەشی گوێڕایەڵی ناكەن ولەرێنموییی ئەولادەدەن بەرهەڕەشەی خوا دەكەون كە دەفەرموێت:﴿...فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾النور/٦٣،واتە:دەبائەوانەی سەر

پێچی لە فەرمانی پێغەمبەرێکەن بترسن کە سەرەنجام توشی بەڵاونەهامەتی یەکبن یا توشی سزایەکی بەئێش ببن

٥- بەردەوام سەلاواتدان لەسەری‌وسەلام ناردن بۆی،بەتایبەت کاتێك ناوی دەهێنین یان ناویمان بیست،کە ئەمەش فەرمانی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ الاحزاب/٥٦.واته: بە راستی خواو مەلائیکەتەکانی درودو صەلاوات لەسەرپێغەمبەر(ﷺ)دەدەن،(خوا بەزەیی ومیهرەبانی خۆی ئەرژێ بە سەریا،مەلائیکەتەکانیش داوای پایە بەرزی‌ولێبوردنی بۆ دەکەن)دەسا ئێوەش ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە درودوصەلاواتی لەسەر بدەن وە سەلامی لێ بکەن،وە سەڵەوات دان لەسەری مایەی رێ لێ ون نەبوونی بەهەشت و بەدووربوونە لەسیفەتی بەخیلی وهۆی زیاد بوونی توێشووی چاکەکانمانە.

٦- سەرخستنی:خوای گەورە دەفەرموێت﴿ إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ...﴾ التوبە/٤٠،واتە:ئەگەر ئێوە یارمەتی پەیامبەر(ﷺ) نەدەن و(لەگەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبوك) ئەوا دڵنیابن خوا یارمەتی دەدات هەرچۆن یارمەتی‌دا ئەو دەمەی کە بێ باوەڕەکان لە مەککە دەریان پەڕاندو ناچاریان کرد کۆچ بکات بۆمەدینە کە یەکێك بولە دووکەسان کە لە ئەشکەوتەکەی کێوی (ثور)دا بوون،کە لەو دەمەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە هاورێکەی خۆی دەوت:خەمی مەنت نەبێت ولەبەرمن دڵتەنگ مەبە،دڵنیابە خوا لەگەڵمانە،ئینجا خوا ئارامی و هێمنی و ئۆقرەی خۆی ناردە سەرئەبوبەکرو وە پێغەمبەریشی بە لەشکرێك کە ئێوە نەتانەدیت لە مەلائیکەتەکان پشتگیری کرد،وەووشەوشیرکی وبێ باوەرەکانیشی ژێرخست وتێك شکاند،وەهەرووشەی خوا بەرزو بڵندە،وە خواش بۆخۆی زۆربە دەستەلات وکارزان وکاربەجێیە،ئەم سەرخستنەش یەکێکە لەمافەکانی بەسەرمانەوە بەزیندویی‌و مردوویی، جا هاوەلان (رەزای خوایان لەسەر بێت) لەکاتێکدا پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) زیندوبووهەستان بەئەنجامدانی ئەم کارونەرکە

بەجوانترین شێوە بەرۆح وگیان ومادیی ومەعنەویی، بەچەك و هۆنراوە..،بەلام ئ.رای وەفاتی ئەم ئەركەلەسەر شوێن كەوتوانێتی كە پارێزگاری بكەن لەهەیبەت وحورمەتی خودی پێغەمبەر وپاراستنی سوننەتەكانی لەخراپەی تانەوتەشەردەران ونەفامان كە ئەمەش بەستراوەتەوە بەرادەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئومەتەكەی دا...

٧- دۆستایەتی كردنی دۆستانی و بوغزاندن وخۆبەری كردن لەدوژمنانی، چونكە خوای گەورە دەفەرمویێت:﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ...﴾( المجادله/٢٢)واتە:هیچ كۆمەڵێك نابینیت كە باوەری بەخواو رۆژی دوایی ببێت دۆستایەتی ئەوانە بكەن كە دژایەتی خواو پەیامبەرەكەی دەكەن! هەرچەندە ئەوانە باوكیان یان كوڕونەوەیان یا براوعەشیرەتیان بن، (ئەوانەی كە لە دۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆیان دەپارێزن)كەسانێكن خوا ئیمان وباوەڕی لە نێودڵیاندا چەسپاندوەوبە هیچ شتێك لەق نابێت، وە پشتگیری كردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە، وە لە پاشە رۆژیشدا دەیانباتە نێوچەند باخێكی بەهەشتەوە كەجۆگە ئاوی زۆر لە ژێردرەختەكانیدا دەڕوات،بە هەتا هەتایش تێیدا دەبن،خوا لێیان خۆشنوودو ڕازی بووە و ئەوانیش لە خوا رازی بوون،ئائەوانە گروپەكەی خوان،ئاگاداروهۆشیار بن كە هەر حیزب وگروپەكەی خوابراوەن لە دونیاولەقیامەتدا.

كەواتە پێویستەلەسەرمان هەمو ئەوانەمان خۆش بوێ كە شاگردی زانكۆی پێغەمبەری خوان(ﷺ) وەشوێن كەوتەی ڕێبازەكەی ئەون وخۆشیان ویستوە، لەپێش هەموویانەوە هاوەڵانی بەرێز(رەزای خوایان لەسەر بێت)بێ جیاوازی، وە خۆشارەزاكردن لەژیانیان وخۆشویستنی هەركەسێك ئەوانی خۆش دەوێ و رق لێ بوون ودژایەتی كردنی هەركەسێك بەخراپە ناویان دەبات،هەروەها خۆشویستنی خانەوادەوئالوبەیتی ودۆستایەتی وخۆشویستنی هەمونەوزانایانەی ئەهلی سوننەتن كە بەراستی ڕێبازی ئەویان گرتووەو پاراستنی قەدروڕێزیان.، لەهەمان كاتدا دوژمنایەتی كردن وبوغزاندنی بێ بڕوایان

ومونافیقـان وهـەموو ئەوانـەی هـەوڵی شـەووڕۆژیان بـۆلاوازکردنی ئیسلام وکوژاندنـەوەی روناکییـە کەیەتی،لەوانـەی شـوێن هەواوئارەزووکەوتوون،کـە لەعەقیـدەدا ئـەم بابەتـە بـە (الولاءُ والبراء) ناسراوە کە مایەی پاراستنی عیززەت وکەسایەتی موسڵمانە.

٨- هەوڵـــدان بۆبڵاوکردنـــەوەی بانگەوازودینەکـــەی و خۆفیـــداکاری بـــەماڵ و گیـــان بۆگەیاندنوبرەودان بەڕێبازەکەی:خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ یوسف/ ١٠٨،واتـە: ئـەی پێغەمبەر(ﷺ)بەو خەڵکە بڵێ: ئەمەیە رێبازی من خۆم و ئەوەی شوێنم کەوتوون خەڵکی بانگ دەکەین بۆ یەکتا پەرستی لەسەربنچینەی چاوساغی وبەڵگـەی شـەرعی وعـەقڵی،وە هەمیشە یش خوا لە هەمووکەم وکورتی وناتەواویەك بدرێتـە پـاڵی بـێ خـەوش رادەگرم و مـن لەوانـەش نـیم شـەریك وهـاوەڵی بۆبڕیاردەدەن،ئەنجامـدانی وەفاوەیـەبۆ پێغەمبـەری خوا(ﷺ)کە هەستین بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام وگەیاندنی بانگەوازە کەی بەهەموو شوێنێك بەهەرشێوازێکی گونجاوشەرعی کە بلوێت،چونکە خـۆی فەرمویـەتی:(بلغـواعني ولوايـة) البخاري،وە هەوڵ بدەین عەقیدەو بیرو باوەڕێك کە پێغەمبـەری خۆشەویـست(ﷺ)هێنـای ولەپێناویدا هەزاران لەمپەرو ناڕەحەتی هاتە ڕێی ئێمەش بیگەیەنین و تاریکاییـەکانی ئـەم سەردەمەی پێ ڕووناك بکەینەوە،بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە دوژمنـانی ئیـسلام هـەموو هـەوڵ وکۆششـێکیان خـستۆتەکاربۆ لـەناوبردن ولـەباربردنی پـەیامی ئیـسلام ودروشـم و رەوشـتەکانی..،بەجێبـەجێ کردنـی ئـەم مافانـەی لەسـەرمانە بەرامبەربەپێغەمبـەری خـوا(ص)ئـەوجا توانیومانـە فـەرمانی خوامـان جێبـەجێ کردبـێ کـە دەفـەرموێت : ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (٨) لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ الفتح ٨-٩،واتە: بێ گومان ئێمـە تۆمـان رەوانـەکردووە ئـەی پێغەمبەربـە شـایەت ومژدەدەروترسـێنەرتا ئێـوە بـەخواو پێغەمبەرەکـەی ئیمـان بێـنن، وەکۆمـەکی بکەن(پشتیوانی لە ئاینەکەی بکەن )وبە مەزنی بگرن(واتە بە ڕێزداری دابنـێن) وەبـەیانیان

ـ تێواران تەسبیحات ویادی خوای گەورە بکەن وبە پاك وخاوێنی رابگرن،ابن سعدی دەفەرموێت: (واتە پێغەمبەری خوا ﷺ بەگەورەبگرن وڕێزی بگرن ومافەکانی بەجێ بگەیەنن هەروەك چۆن منەتی گەورەی لەگەردنی ئێوەدا هەیە)تفسیرابن سعدی/ل٧٣٦

ئەوەتا صەفوانی کوڕی سلیم هەرکاتێ باسی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بکرایە لەلای دەستی دەکرد بەگریان، بەردەوام دەگریا تا خەڵکی لەلای هەڵدەستان وبەجێیان دەهێلا...،لەمیانەی باس کردنی ئەم مافانەوە بۆمان دەردەکەوێت کەئێمە چەندێك دووریـن لە شوێنکەوتنی راستەقینە...، کاتێ ئەم ئایەت و فەرمودانەت بەسەردا دەخوێنرێتەوە زۆربەجوانی تێدەگەیت کەهەمونەوخراپە وتاوان ولاروخوارییەی لەم کۆمەڵگایەدا هەیە.. هەموئەو دواکەوتویەتیەی بلاوبووەتەوە...هەموو ئەودیاردە نامۆوسەیروسەمەرانەی دەیبینین ودەیبیستین سەرجەمیان بەرهەمی دوورکەوتنەوەمانە لەرێگاورێڕەوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وپشتگوێ خستنی رێبازەکەی،چونکە موسڵمانیەتی تەنها یەك بوارولایەنی ژیان نیەوبەس،بەڵکومافی هەمووخاوەن مافێکی لەسەرمان واجب کردووەو هەمووگۆشەکانی ژیان و مردن،دنیاو قیامەتی بۆ دارشتووین..،کەواتە ئەگەر راستە پێغەمبەری خوامان خۆش دەوێت ومەبەستمانە لەسەرشەریعەت و رێبازەکەی ئەوبژین وبمرین ئەوا پێویستە لەسەرجەم بوارەکانی ژیانندا بەشوێن پێی موبارەکی ئەودا هەنگاو هەڵگرین بەتایبەت لە:

١- بواری پەرستش وعیبادەتدا:-

هەوڵبدەین وبزانین ئەوچۆن عیبادەتەکانی ئەنجامداوە ئێمەش بەوهەیئەت و چۆنیەتیە ئەنجامی بدەین بێ کەمکردن وزیادە خستنەسەروگۆڕانکاری، کە ئەمە پەیوەندییەکی گرنگی نێوان بەندەیە لەگەڵ خوای خۆیدا، دیارە بۆقبوڵ و وەرگرتنی عیبادەتیش دوومەرجی سەرەکی پێویستە کە ئەوانیش بریتین لە (الاخلاص والصواب)واتە:کارەکە بۆخوا بێت وبەپێی شەرعی خواش بێت.

٢- بەزەیی و سۆز:-

پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەهەمووکەس بە بەزەیی تربووە،کە لە قورئاندا بەرامبەریە نیمانداران بە(رؤوفُ رحیم) ناوبراوە وەك خۆشی ﷺ دەفەرموێت:(**بعثت بالرحمة**)رواه مسلم،وە فەرموویەتی (( لایرحم اللهُ من لایرحم الناس) متفق علیه،واتە:خوای پەروەردگاربەزەیی بەکەسێکدا نایەتەوە کە ئەو بەرامبەربە خەڵك بەزەیی نەبێت،بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەدا کە لەژێر دەستی تۆدان وسەرپەرشتیان دەکەیت،چونکە پێغەمبەرلەگەڵ ئاژەڵ وپەلەوەر ومێرووشدابەبەزەیی بووە،بەجۆرێ دەفروجامی ئاوی بۆ پشیلە لاردەکردەوە تا لێی بخواتەوەوبەزیادەکەشی دەستنوێژی دەگرت/ صحیح رواه الطبرانی..

٣- لەپاراستنی مافی ئافرەتاندا:-

پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەهەمووکەس چاکتربووە بەرامبەر خێزانوهاوسەرەکانی وفەرمانیشی پێکردوین رێزیان لێ بگرین ولەگەڵیاندا نەرموبە سۆزبین وەك فەرموویەتی:(...وخیارکم خیارکم لنسائهم خلقاً))رواه **الترمذی وقال حسن صحیح**، واتە:چاکترینتان ئەوانەتانن کە رەوشتیان لەگەڵ خێزانەکانیاندا جوان و چاکە.وە سەبارەت بە رێزومافی ئافرەتان بەگشتی فەرموویەتی:(**ماأکرم النساء إلا کریم، وما اهانهن الالئیم**))رواه مسلم. واتە: تەنها کەسی بەرێز رێزی ئافرەتان دەگرێت،ئەوەشی نەفام وبێرێزنەبێت سوکایەتیان بەرامبەر ناکات، لەمڕۆشدا بە جۆرەها شێوازسوکایەتی وگەمە بەکەسێتی وسومعەی ئافرەتان دەکرێت ولە ژێردروشمی سەربەستی وئازادی دابە زۆرشێواز مافیان خوراوە کە مەبەستە شاراوەکە یان بریتیە لەنبە ئازادی و سەربەستی گەیشتن بە ئافرەتان بۆلەکەدارکردنیان نەك ئازادی بۆئافرەتان.

٤-لەخزمایەتی وپاراستنی مافی دراوسێیەتیدا:-

بەجۆرێك فەرمانی پێ کردوین لەخۆشیو ناخۆشیدا بەسەریان بکەینەوەو سەریان لێ بدەین ویارمەتیان بدەین،وەك فەرمویەتی:(**لایدخل الجنة قاطع**)واتە:ئەوەی سیلەی رەحم وپەیوەندی خزمایەتی بپچڕێت ناچێتە بەهەشتەوە.

ئەمرۆش بەهۆی دووریـان لـەڕێبازی ئەوەیـە کـە دراوسـێیەتی وکەسایەتی کـاڵ بوەتـەوەو بەرژەوەندییە دنیاییەکان سـەرقاڵی کـردوین وئەوەمافـە گەورانـەمان بـیر چـۆتەوەو دراوسـێ بـەخیلی وحەسـوودی بـە دراوسـێ دەبـاتو پێـی خـۆش نییـە خۆشـحاڵ بێـت. (ئەوەی بەڕاستی خودادەناسێ .ڕەوشتی باشەلەگەڵ دراوسێ)

٥-لەسیماوبەرگوپۆشاکدا:-

سەروەرمان(ﷺ)دەفەرمویت:(من تشبه بقوم فهومنهم)واتە:هەرکەسێك خـۆی بـچوێنێت بەهەرگەلێك ئەوە لەوانە، وەرێگری لێ کـردووین کـە خۆمـان بـشوبهێنین بەگاوروجولەکـەو نەفام وخوانەناسان لەجلوبەرگ وپۆشاك وهەر تایبەتمەندیەکی ئەواندا. لەبەرئەوە پێویستە هەرکەسێك بانگە شەی خۆشە ویستی پێغەمبەری خوا دەکات ئاگای لـە پۆشـاکی خـۆی و ماڵ ومنـداڵی بێت، پۆشـاكوجلێك نەپۆشـێت کـە ئەوڕابـەرە پێـی نـاخۆش بێـت، سـیماو شـێوەیەك نـەنوێنێ کـە لەموسـڵمان نەوەشێتەوەوشـەرعی نـەبێت، بەتایبـەت زۆرێـك لـە ئافرەتانی موسڵمان بەجلوبەرگی مۆدیل چەواشە کراون،وەك سفوری وپانتۆڵ

٦-لەکاسبی ومامەڵەی بازاڕدا:-

چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:(من غشنا فليس منـا)واتـە:هەرکەسـێ غـەش وفێڵمـان لێ بکـات لـە ئێمەنیە،لەبەرئـەوە پێویـستەوەك چـۆن مـافی خوامـان لەلاگرنگەونوێـژەکان ئـەنجام دەدەیـن بەهـەمان شـێوە ئاگامـان لـەمافی خـەڵکی بێـت بەسـەرمانەوە.لـەبازاڕدا زوڵـم وفێڵیـان لێ نەکەین،مامەڵـە قـورس وگرانجـان وفێڵبازنەبین،لـەکاتێ پەیـداکردنی بژێویـدا بـیری خوامـان هـەبێت ونـەهێڵین حـەرام تێکەڵاوبەساماغان ببێت،ئەوەندەش هەوڵبدەین ولە خەمی دنیادا بین کـە مافـە خواییـەکان نەفەوتێنین،چونکە ئیسلامەتی وئیمانداری لە شینو شـایی ولـە کـڕین وفرۆشـتن ومامەڵـەی ڕۆژانەدا دەردەکەوێ وکردەوە سەنگی مەحەکە.

٧-لەگۆڕان وپێشکەوتن وچاکسازیداودووبارە نەکردنەوەی هەڵـەو تاوانـە کـانی ڕابـردوو،وە نەگەڕانەوە بۆسەردەمی نەفامی لەبەرگێکی تردا:-

چـونکه هـاتنی ئەوپێغەمبـەرە(ﷺ)خـاڵی گـۆڕان ووەرچـەرخان بوولەخراپـەوە بـۆ چاکولەچاکەوەبۆچـاکتر،وەك لەبەشـێکی وتارەکـەی(حجـه الـوداع)دافـەرموی: (ألا ان كـل شيء من امر الجاهليةِ تَحتَ قدمي موضـوع)واتـە: هەرسـیفەت و خوویـەکی نـەفامی لـە ژێردوو پێمدایەو ڕۆیشت وناگەڕێتەوە.هەمووشتە خراپەکانی سەردەمی نەفامی خستە ژێـر پێوەوخرانەزبڵدانی مێژوە وە،وەك (کوشتن وبڕین ڕیباومەی خواردنـەوەوقومارواوێن پیـسی وخیانەت وگەندەڵی وڕەگەزپەرستی و دەمارگیریو دوویەرەکی و هتـد..)کـە لەسـەر دەمـی تەکنەلۆژیاولەعالەمی عەلمانیەت وعەولەمەدا سەریان هەڵداوەتەوە بونەتە گرفتـی گـەورەو ژیانیان کردووە بەژان وکە ئەمانە هـی سـەردەمی نـەفامی بـون ونێـستا لەبـەرگێکی تـردا گەڕاونەتەوەو مێـژودووبارە بۆتـەوەو چارەسـەر یـشی تـەنهاو تـەنها دەسـتگرتنە بـەڕێبازی ئەوپێشەوایەمان،وە پاشان هەوڵبدەین خۆمان بگۆڕین وسەرجەم شـتەکانی نـەفامی بخەینـە ژێر پێمانەوە وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمویەتی:(دعوها فانهامُنتنة)واتـە:دەسـتی لێ هـەڵگرن چـونکە بەراسـتی بۆگەنە،نـەك ئـەوەی ئەوخـستیە ژێـری پێـی ئێمـە بیخەینـە سەرسەروچ ولەمۆدیلی خراپ وبێگانە پەرستی.

خوای گەورە یارمەتیمان بدات بتوانین بە ڕاستی شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوابین(ﷺ)تـا لە دونیاداسەربەرزولە ڕۆژی دوایشدا بەدیداری شـاد بـین..خـوای پەروەردگارمیللەتەکـەمان بێداربکاتەوە کەبەراسـتی دەسـت بـە ڕێبـازی پێغەمبـەری خواوەبگرێـت وکۆمەڵگاکـەمان ببێتەنمونەی کۆمـەڵگای پڕلەخۆشەویستی وخۆشـبەختی وکامـەرانی پڕلـە ئیمـان ورەوشـتی جوان..خـوای گـەورە ئـەم کـارە بـچوکەشمان لێ قبـوڵ بکـات و نیـەتمان پـاك بکاتـەوە لـە هەرشتێکی تری غەیری ڕەزامەندی خۆی.... ئامین

# پەیامی کۆتایی مانگی مەولود... هیدایەت ودینی حەق

مـــــانگی مەولودڕابرد کەوەســـــفی پێغەمبـــــەر(ﷺ)ی تیاکراهەرچـــــەندەپیاهەڵدانی نیمبۆنەوخۆشەویسته(قەترەبەدەریایـه)لەبەرانبەروەصـفی خوادا،چـونکەناو نیـشانەکەی لەقورئانـدا(رحمـةًللعالمین)لەسـەرجوانترین ڕەوشـتی ژینـه،دوای ئـەوەی کەباسـی مافـەکانی پێغەمبەرمان کردبەسەرموسڵمانانەوەئینجاپێویستەبزانین پێشەواکەمان دووشتی زۆرگرنگی بۆهێنـاوین کەبەسمانــە بۆســەرفرازی دنیــاودوا ڕۆژمـــان ئـەوانیش(هیدایــەت ودینـــی حەق)،هیدایەت بەمانای ڕێنوێنی وبیروباوەڕ کەلەناودڵەوەدەست پێدەکات ودینـی حەقیش واتەنەخشەی ڕێگاو یاساو ڕێسای ڕاست ودروست،وەك لە قورئاندا هاتوە:وهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ (٩/الصف) واتـە:خوانەوزاتەیەکەپەیامبەرەکـەی خـۆی بـە قورئـانێکی ڕێنمونیکاروئـاینێکی ڕاسـت ودروانەوەناردبۆنەوەی بەسەرتەواوی ئاینەکانداسەری بخات.ت/ ڕامان

١) هیدایـــەت: مـــرۆڤ هەرچـــەندەزیرەك ولێهاتوبێـــت..بڕوانامەوپلەوپایەهەرچـــەندە بـــەرزبێت..تەکنەلۆژیاهەرچەندەپێـــشکەوتوبێت..ئەگەرهیدایـــەتی لەگـــەڵ نـــەبێت سەرکەوتونابێت وزەرەدوزیانی زیاتردەبێت لەقازانج،وەك لەم سەردەمەدا دەبینـی سـەرەڕای ئەم هەمووپێشکەوتن وکرانەوەی عەقڵەکان ودروشمەکانی دیموکراسی ومافی مـرۆڤ وئـازادی بیروڕاوجیهانگیری و...هتد،بەڵام ژیان بوەبە ژان یـەك پارچـەبۆتە قـەیران وکێشە!لـەجیاتی بەختەوەری بیٚ سەرئێشە،دەبینی زانست وپێشکەوتن وتەکنەلۆژیاکەزیاتربۆمەبەستی خراپە بەکاردینن!بۆیە گەرهیدایەتی لەگەڵ نەبومۆبایلەکەبۆخراپەبەکاردێنیٚ!چەك وسـیلاحەکە بـە ناڕەوالـەدژی هاولاتیـانی بـەکاردێنیٚ لـەجیاتی دوژمنـان!زیرەکیەکـەی بۆخیانـەت وفێـڵ بـەکاردێنیٚ لـەجیاتی خزمـەت!ئەگـەرئیمان وهیدایەتەکـەی لەگـەڵ نـەبیٚ: ئەوکاتـە پرۆفیـسۆردەبێتە پەرۆفیـسۆر..فەیلەسـوف دەبێتـە فەیلـە فلـوس..شـۆرش دەبێتـە شەوەڕەش..ڕۆشنبیردەبێتە ڕەشەبیر..سـەیران دەبێتـە قـەیران...!!(لەگـەڵ ڕێزمـدا بۆخـودی

بڕوانامەوکەسەباشەکانیان)،پرسیان لە پێشەواعومەرئێوە کاتی خۆی لەسەردەمی نەفامیداکچتان زیندەبەچاڵ دەکرد ئایاعەقڵتان نەبوو؟ فەرموی:بەڵێ عەقڵمان هەبوویەلاّم هیدیەتمان نەبوو!،کە دەوترێ سەردەمی نەفامی وەنەبێ گێل ونەزان بوبن بەڵکولەهەندێ بواردازیرەك وپێشکەوتوبون وەك لایەنی نوسین وڕەوانبێژی،شوێنی تایبەتیان هەبوێ پێشبڕکەی شیعروپەخشان خاوەنی بازاڕی عوکازوموعەللەقات بون، یەك لەموعجیزەکانی قورئان ڕەوانبێژیە(البلاغـە) کەلەوسەردەمەداباوبوە،جا پێغەمبەر(ﷺ)بەو هیدایەت و ئیمانەبەجۆرێك کاریگەری خۆشەویستی هەبولەوکۆمەڵگە جاهیلیەدا،لەمەیدانی بەندە فرۆشتندا(کەئەوکات باوبوە)بەندەهاواری کردوە هەرکەس دەمکڕێت هەرچی پێم ئەکات بارێگریم نەکات لەنوێژی جەماعەتی دوای پێغەمبەر(ﷺ)!،ئێستاش بەچاوی خۆتان سەرانی دنیاپەرستی ئەم ڕۆژ گارەدەبینن چ کارەساتێکیان بەسەرمۆڤایەتیداهێناوە! چونکە هیدایەتیان لە دەستداوە، بۆیەدەڵێن:تێگەیشتن مەرجە نەك پێگەیشتن، ئەگەر هەموودنیا بەریتەوەبەلاّم خۆت بدۆڕێنی بەهیچ ناچێ،

٢)دینی حەق:دیارەهەموکەس ڕێگەوڕێبازی خۆی بەڕاست دەزانێ کورد واتەنی(کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە)بەلاّم ڕاست ئەوەیەلەتەرازوی خوادا ڕاست بێت،نەك بەئارەزوی من وتۆ،لەپێش ئیسلامیشداوەك ئەمرۆژگارەدین و ڕێبازی دەستکردهەبون وهەندێکیان جیهانیش بون لەوسەردەمەداوەك (شەریعەتی ڕۆمانی وڕوسی وصینی..دواتریش دیموکراسی)بەلاّم چونکە بنەمای کۆنکرێتیان نەبوسەرەڕای هێزی ئاگروئاسن وهەمواركردنی بەردەوام بونەبڵقی سەرئاوشەرمەزاربون،بەلاّم دینی حەق تادنیادنیایەهەردەمێنێ ودوایی نایە(فماذابعدالحق الاالضلال)،هەندێك لەفەیلەسوف وپیتۆڵەکانی ڕۆژئاوا دیراسەی قورئانیان کردوەبۆئەوەی ڕەخنەی لێبگرن بەلاّم سەرەنجام موسڵمان بون،دینەکەمان لەئاستی خاوەنەکەیدایەکەخودایەبۆیەبێ کەموکورتیەتاهەتایە، ئەم دینە بەرنامەیە بۆڕێکخستنی پەیوەندیەکانی ژینەبۆنموونە:

١- پەیوەندی مرۆڤەکانی لەگەڵ خوادالەسەربنەمای بەندایەتی رێکخستووە.

٢- پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردالەسەربنەمای عەدالەت ورێزی بەرانبەرە

٣- پەیوەندی مرۆڤەکانی لەگەڵ بونەوەردالەسەربنەمای بەکاربردنە(تسخیر)ە،

جهەرکاتێ مرۆڤ لەپەیامی خوالایدا هەرچەندەعاقڵ وپێشکەوتوویێت بەلاّم هەندێ لە پەیوەندیەکانی لێدەشێوێت لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەردالەجیاتی ئەوەی بەرێزوبەعەدالەت مەمەڵەیان لەگەڵ دابکات ستەم ناعەدالەتی دەکات وتەنها بەرژەوەندی خۆی لەبەرچاو دەگرێت،بۆیەبەڕاستی عەدالەتی تەواوتەنها لەودینەدا بەرچاودەکەوێ کەمیانڕەوی لەیاساو رێساکانی دالەبەر چاوگرتووە دورلەهەلکشان وداکشان لەهەموبوارەکانی ژیاندا،وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد،ئەگەرئیسلام بکەینە دووچەمکی سەرەکی ئەوایەکەمیان: پەیوەندی نێوان بەندەوخوایەکەلەئیمان وبیروباوەڕەدارەنگ دەداتەوە جابەتەقوایان بەمەعریفەیان بە هەرشتێکی ترناوی دەبەی کەبنەمای سەرەکیە،دووەم:عەدالەتە کەلە(فقه)دابەرجەستە دەبێت مەبەست لەیاساو رێساکانیەتی لەحەرام وحەلاڵ وسەرجەم حوکمەکانی تر،چونکە هەرشتێ ئیسلام فەرمانی پێ کردبێ وبەحەلاڵی دانابێ ئەوە لەبەرژەوەندی مرۆڤەکانە وە هەر شتێکیش حەرامی کردبێ ئەوەزیانی هەیە بۆیە رێگری لێکردووە،سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیەمانە وەك پراکتیزەبەشایەتی دۆستان ودوژمنان،مێژوو نوسی ئەمریکی(وڵ دیورانت)لەکتێبی(قصةالحضارة/ب ١٣ ل ١٤٥)دەڵێ:{ئیسلام یەکەم ئاین وسیستمەکە مرۆڤ سەرپشك دەکات لەسێ شتدا،ئیسلام بوون یان جزیەدان یان شەڕ، بەلاّم گەلانی تربەشەڕیەرانبەرەکانیان سەرشۆڕکردووە،دەولەتی ئیسلامی لەو(٣٠)ی ساڵەی دوای پەیامبەرکۆمارێکی دیموکراتی بووە}ئەمە شایەتی کەسێکەموسڵمانیش نیەبەلاّم ڕاستی نوسیوە،لەبەرانبەرداگەندەڵی وستەمی عەلمانی ئەمڕۆژگارەچاکترین بەڵگە یەلەسەر شکستی بەرنامەمرۆڤ کردەکان وهەرلەسایەی ئەوانەدایەکوردی موسڵمان گەورە ترین ستەمی نەتەوەی لێکراوە وخاکەکەی پارچەپارچەکراوە،چارەسەریش هیدایەت ودینی حەقە.

# تۆنەوەی کەبیردەکەیتەوە

مرۆڤ ئاوێنەی بیرکردنەوەکانێتی..

پێویستەزۆرگرنگی بدرێت بەهەڵبژاردن وپەختەکردن وپێگەیاندنی بیروهۆش، چونکەمرۆڤ هەرچی دەیکات لەژیانی ڕۆژانەیدارەنگدانەوەی بیروباوەڕیەتی، بۆیەبیرکردنەوەی خراپ ولاروخوارمرۆڤی لاروخواری لێدەردەچێت،جوانیان وتوە(تێگەیشتن مەرجەنەك پێگەیشتن) ئەگەرسەرنجی قورئانی پیرۆزبدەیت دەبینیت لە(١٣٠٠)ئایەتدا وشەی(تَفَكُر) هاتوە کە مەبەست لێی بیرکردنەوە وسەرنج دان وتێڕامانە،بەداخەوە کەئێمەئەوگرنگییەی پێنادەین وبەڵکوهەندێ کەس لەجیاتی هۆشکردنەوە خۆیان بێ هۆشدەکەن بەماددەهۆشبەرەکان بەوەش خۆیان دەخەنەڕیزی ئاژەڵانەوە،بەلام تەنهالەیەك ئایەتدا باسی دەست نوێژهاتووە کەئەوهەمووەلەخزمەتیدایین، بۆنمونە:کەباسی دروستکردنی ئاسمانە کان وزەوی دەکات لەکۆتای ئایەتەکەدا فەرمویەتی(لَآیات لقومٍ یَتَفکرون) واتەئەوانە بەڵگەونیشانەن بۆ خەڵکانێ کەبیربکەنەوە سەرنج بدەن لەگەورەی خوا،بۆیە(حەسەنی بصری)ڕ.ح.فەرمویەتی (تَفَکرساعَةَ خَیرُ مِن قِیامِ الیلَة) واتەساتێك بیرکردنەوە چاکترە لەشەونوێژی شەوێك، لەکاتێکدا هەمومان دەزانین کەشەونوێژچەندە ئەرکی زۆرەبۆیەوەخێریشی زۆرە بەلام ساتێ بیر کردنەوە لەوەبەگرنگتردانراوە چونکە بەهۆی بیرکردنەوە ڕێگەی ڕاست ئەدۆزیتەوە و بە خۆت دائەچیتەوەکە لەکوێوەهاتوین وبۆکوێ دەچین ومن چیم ودەبێ چۆن بم وچی بکەم چیم ڕاستە وچیم هەڵەیە؟ چونکە مەودای بیر کردنەوە(فەزای أفکار) دونیایەکی فراوانە و سەرەنجام ئەتکاتەکەسێکی (مەبدەئی)وخاوەن هەڵوێست ورزگارت دەکات لەچاولێکردن وبەدوکەوتنی کوێرانە ولەڕۆتین وڕوکەشی وبەندایەتی ئارەزوەکان،چونکە ئارەزوی نابەجێ بەرەولەناوبردنت دەبات وەك ئەودەنکە گەنمەوایە کەلەسەرفاقەوتەڵە دانرایە وباڵندەکە پەلاماری دەدات وملی پێوە ئەبێت وتیائەچێت،شوێن کەوتنی ئارەزوەکانیش بەبێ بیرکردنەوەی ڕاست ودروست کەشەرعە خاوەنەکەی وەك ئەوباڵندەیە دوچاری لەناوبردن و

ـــەربڕین نـەکات،یان دانیـشتن وبـیر کردنەوەوبەخۆداچونەوەلەسـەرقەبران لـەپاڵ گـۆڕی خۆشەویستێکت بزانەچـۆن حـاڵ دەگۆڕێت،ئەوانـەی بیردەکەنـەوە لـە لێپرسـینەوەی دواڕۆژو ـوگۆڕ ناتوانن دەستیان بخەنە ناوماڵ وناموس وخوێنی خەڵك بەناڕەوا،ئەوانەی کە ژیانیـان ێکردوین بەژان بەدرۆودوروی گەندەڵی لەودەستەوتاقمانەن کەبڕوا یـان بەلێپرسـینەوەی دوا ڕۆژنییە بۆیە شەرم ناکەن دەڵێن:هی خۆم بۆخۆم هی تـۆش دەخـۆم یـان دەڵـێن حازربەقـەرز ـدەین! بێگومان شێوازی بیرکردنەوە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیەلەسەرسەلامەتی جەستە چونکە لاشەی مرۆڤ خزمـەتکاری زینـی ئەوە،وتراویشەکەبیرکردنەوەی تـرس وبـیم وخراپـە خێراتر لەخێرایی گولە خاوەنەکەی دەکوژێ،چونکە چۆن بیربکەیتەوە ولەچی بترسی دوچاری دەبی،دڵە ڕاوکێ ونیگەرانی زۆرلاشەی مرۆڤ سست ولاواز دەکات ودوچاری نەخۆشی دەبێت بەخێرایی دەتوانێ سیستمی عەقڵ وبیرکردنەوەی مرۆڤ تێکبشکێنێت،وەبەپێچەوانەوە بیر کردنەوەی ڕاست ودروست وتەواو،شاد، بەهێز،لاشەیەکی بەهێزوخۆڕاگرو جوان دەسازێنن، گەردەتانەوێ لاشـەیەکی سـاغ وتەندروسـتان هـەبێت ئاگـاداری بیروزەینتـان بـن جـوان ڕای بگرن،ئەندێـشەی بـەد ڕژدوحەسـودی گونـاهو نائومێـدی خـەم وگرفتـاری ودڵەڕاوکـەزیان بەجەستە دەگەیە نێت، زانایەکی ڕاستەقینەم بینـی لەنەخۆشـی سـەرەمەرگدا پیردیارنـەبوو بەڵام بەتەمەن بوو،هەر بەوشێوەی کەلەڕۆژانی تەمەنیدا بەسـەری دەبـەرد ئـاواش قۆنـاغی مەرگی تێدە پەڕاند،بۆدەرمانی نەخۆشیەکانی جەستەهیچ پزیشکێك باشـترنییەلەبیرکردنەوە ی شادوخۆش ڕاست ودروسـت بۆلـەناو بردنـی سـێبەرەکانیان،هیچ شـتێك لـە چـاکەخوازی باشترنییە،ژیانێك بەبەردەوامی لەسەربنەمای دژایەتی بـەدگومانی وخراپەوپاشـەملە بنیـاد نرابێت وەکونەوەوایە خۆی خـستبێتە چاڵی ئـاگرەوە، بـەڵام ئەگـەردەربارەی هەمووشـتێك وهەموکەسێك بیرکردنەوەیەکی (ایجابی) مـان هـەبێت وبزانینودڵنیـابین کەچـاکەکاری لـەبیر کردنەوەی ڕاسـت ودروسـت دایە،لەقورئانداسـەرنج بدەلـەم وشـانە(لاتقنطـوا..، لاتحزنـوا..، لاتیأسـوا..)،کورتـەی ئـەم باسـەش لەپـەیامی ئیـسلامدابەدوو ووشـەبڕاوەتەوەکەفەرمانی

پێکردوین بە (حُسن النیـة وحُسن الظَـن )کەنیـەتی چـاك وگومـانی چـاك وپاکـە، کـە سەرچاوەیان بـیری یـەکتا پەرستیە،باچـیترپێگەنەدەین سـەرکردەوحیزبوخێڵ لـەبری نێمـەبیر بکەنەوە(نیگەران مەبە بەوەی کەدەمری چونکەبەدەست خۆت نیە..بـەلاّم پێویـستەنیگەران بیت کە چۆن بژیت چونکەبەدەست خۆتـە)،لەکۆتاییدانـەڵێم: جارێـك بـیرت نـەکردەوە: لـەم یاسایـە..لەم گەردونـە..لەم ژین ومردن وبونـە

**جۆرەکانی بیرکردنەوە:**

جوانترین بیروبیرۆکەنەوەیانەکەبۆخوای گەورەبێت وبەرژەوەندی قیامەت لە بەرچاوبگرێت کەئەویش چەندین جۆرەلەوانە:

١ـ بیرکردنەوەلەنایەتەکانی خوای گەورەوتێگەیشتن لەماناومەبەستەکانی.

٢ـ بیرکردنەوەلەناسینی خودای گەورەوەناسینی سیفات وناوەپیرۆزەکانی.

٣ـ بیرکردنەوەلەنیعمەت وفراوانی ڕەحمەتوبەزەیی ولێبوردەیی خوای مەزن.

٤ـ بیرکردنەوەلەناسین وتێگەیشتن لەدەروونی مرۆڤ.وەهەروەها دەستنیشان کردنی کەم و کوڕی وکورتی وەخاڵە لاوازەکانی وجۆرەکانی دەرون.

٥ـ بیرکردنەوەلەئەرکی ئەم ساتەوەختەوخۆجۆشدان بۆجێ بەجێ کردنی،چونکەخواناس کوڕی کاتی خۆیەتی،ودەرفەت ناداکاتەکەی بەفیڕۆبڕوات، (امام شافعی) دەڵێت: چەندە هاوڕێیەتی پێڕی سۆفیەکانم کرد تەنها دوودێڕ فێربووم:

یەکەمیان:کات شمشێرەگەر نەیبڕیت.نەتبڕێ.دووەمیان:گەردەرونت سەرقاڵ نەکەیت بەحەق وڕاستیەوە،ئەواسەرقاڵت دەکات بەشتی پڕوپوچەوە.جاکات بریتییە لەتەمەنی مرۆڤ.

٦ـ بیرکردنەوەی ماددی،کەتەنهابەرژەوەندیەماددیـەکان دەکاتـەپێوەری هەڵسەنگاندن،وەك لـەم سـەردەمەدادەبینی:کەدەسـەلاّتداروەدەولّەمەندبوی هـەر بـەپیاوی چـاك وپێـشکەوتو و خانەدان وبنەماڵەلەقەڵەم دەدرێ! کەلەڕاستیدا (تێگەیشتن مەرجە نەك پێگەیشتن).

**خەیاڵ وبیرۆکەکان:-**

مەبەست لێی ئەوبیرۆکانەیەبەدڵ ودەرونی مرۆڤدا دێت کەسەرچاوەی چاکەو خراپەکانە، وەبزوێنەرودروستکەری ویست وخواست وهەڵمەتەکانە. جاهەر کەسێك توانی زاڵ بێت بەسەربیرۆکەکانیدا ئەوادڵ ودەرونی شاددەبێ وسەر ئەنجام بەختەوەردەبێت،وەهەرکەسێك ملکەچی ئەوبیرۆکەخراپانەبونەوا بەر شالأوی حەزوئارەزوەکانی دەرون دەکەوێت وپڕدەبێت لە ئەهامەتی وبەر دەوام ئەوبیرۆکەخراپانەهێرش دەهێننەسەردڵی مرۆڤ تادەیکەنەمولگەی ئاواتە پڕوپوچەکان،خوای گەورەدەفەرموێت:﴿ ..كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾واتە:وەك سەراب وتەراویلکەوایەلەبیابانێکدابریسکە دەداتەوەکەسێکی تینو وابزانێت ئاوەوبە هەڵەداوان بۆی دەچێت،کەگەیشتە لای دەبینێت هیچ نییە، ئەوسا بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتایی هاتوە و قیامەت بەرپابوە،خوای گەورەش ئامادەیەلەلایدابەگوێرەی کردەوەکەی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات خودالەلێپرسینەوەداخێرایە،جابێ نرخترین هەولۆهەڵمەت،لەوکەسەدایەکە هەمیشە خۆی بەئاواتەپڕوپوچەکان سەرخۆش دەکاوگوێ بۆڕاستیەکان ناگرێت، هەمیشەخەون بە خەیاڵی بێ سنورودوورلەواقیع دەبینێت!کەبەڕاستی ئەمەمایە پوچترین کەس وخەسارە تمەندترین جۆری بازرگانیە.ڕەحمەت لەپێشینان کە وتویانە(کەس بەخەیاڵ نەبووەبەماڵ)ئەم حاڵە دەردێکی کوشندەیەکەدەبێتە هۆی دروستبونی تەمەڵی وبێ دەسەلأتی،ڕسوایی و پاشگەزی لەوتەمەنەی کەبەفیڕۆدورلەڕاستی ژیان بەسەرچو،کە هەمیشەلەخەیاڵ و ئاواتدا بزربوکاتێ بەئاگاهاتەوە،لەژیانێکی بێناوەڕۆك وبازنەیەکی بەتاڵدادەخولایەوە. ئەمەوەك ئەوکەسەبرسیوتینوەیەکەهەمیشەلەخەیاڵداباشترین جۆری خواردن دەخوات کەچی لە ڕاستی داجگەلەئەندێشەوبرسیەتی هیچی تری لە مایەدانیە،بگرەئەم ئەندێشەوبیرۆ کانەهێزوتوانای لێبڕیوە،کەئەمەش لە ئاخدا دەیڕوخێنێ ودەیتەپێنێ سەرەنجام دوچاری خەمۆکی ووەسواسی ونەخۆشی دەرونی،دەبێت بەلأم مرۆی ژیروهۆشیاربیرۆکەیخەیاڵەخراپ وپوچانەوەلاوەدەنێت

# گەشت وسەیران لەکوردستان

لەپێشوازی بەهاردا: بەهاربەمانای نوێبونەوە..وەرزێکی تازەی ژیان، گەشتوسەیران مێژویەکی کۆنی هەیە لەژیانی مرۆڤایەتیدا دوای دابڕانێکی سێ مانگی سەرماوسۆڵەی زستان جارێکی تردەست لەملانی سروشت دەبێنەوە بۆیەدەبێت لەپێشوازی بەهاردا بە گەشبینیەوەبڕوانین بۆژیان،مرۆڤی گەشبین بەختەوەرەچونکەبەردەوام گوڵەکانی ژیان دەبینێ گومان ونیرادەشت چۆن بێت هەرنەوەشت دێتەوەرێ(تفالوابالخيرتجدوا) بەپێچەوانەی رەشبین کەتەنها دڕك وناخۆشیەکانی لەبەرچاوەبۆیەبەردەوام دوچاری خەمۆکی ونەخۆشی دەرونی دەبێت،بەهاروسەیران کە وەرزێکی گرنگی ژیانەپێویستە ئەوهەلە بقۆزینەوەبۆ ئەنجامدانی کارەگرنگەکانی ژیان بۆسودی دنیاودوارۆژمان،چون تەمەنی ئێمەش کورتەو بەهارناسازوودەگوزەرێ بۆیەپێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)لەفەرمودەیەکدائاگاداری کردوینەوەکەهەلەزێڕین وگرنگەکانی ژیان لە دەست نەدەین وفەرمویەتی:(اغتنم خمساًقبل خمسِ حياتكَ قبلَ موتكَ شبابكَ قبل هرمكَ ...)واتەنێنج شت پێش پێنج شت بقۆزنەوە ژیانەکەت پێش مردنت.. تەمەنی گەنجی تاپیرنەبوی لەش ساغیت تانەخۆش نەکەوتوی دەوڵەمەندیت تا هەژارنەبوی بێکاریت تا سەرقاڵ نەبوی،تۆش کەلەژیانی بەهاریدایت و گەنج ولەش ساغیت بزانەکە ئەوەکاتیەوبەسەردەچێت فریای خۆت بکەوەوئەوهەلە گرنگ و زێڕینەبقۆزەوە بەچاکەکاری وخزمەت تالەدەستت نەچوەبۆیەدەڵێم:

سودوەربگرەلەم هەلە..تانەمردوی بەپەلە..بەلەشساغیت فریومەخۆزۆرێك مردن بەبێ هۆ

*** مەبەست لەگەشتوسەیران چیە؟**

مرۆڤی ژیردەبێ هەوڵبدات بۆزانینی حیکمەت وفەلسەفەی ڕوداوەکانی ژیان، کاتێ دەبینێ بەهارژیانی کردۆتەوەبەبونەوەردادەکەوێتەسەرنج وبیرکردنەوەوبەخۆداچونەوەکەبەهاربەڵگەی ژیان ومردن وزیندوبونەوەی ئێمەیشە،ئەوئێسك وپروسکەی کەوەك پوش وپەلاش بلاّوبۆتەوە ڕۆژێك دادێت وەك گژو گیای ئەوبەهارەزیندوئەبێتەوە،خوایگەورە فەرمویەتی:

• فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَةِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (الروم/(٥٠)،واتە:ئەوەبۆسەیرناکەن لە شوێنەواری دەسەلاتی خواکەبە هۆی بارانەوەچۆن زەوی مردوی زیندوکردەوە !بەهەمان شێوەیش مردوەکان زیندودەکاتەوە وهەرخۆی بەتوانایەبەسەرهەموو شتەکاندا،لەوبارەوەزانایان دەڵێن:

١ـ گەنم ودانەوێڵەلەشوێنی تەڕوشێدارئەڕزێ وخراپ ئەبێ،بەلاَم لەزەویدا تێك ناچێت وئەکاتی خۆیدائەڕوێت!

٢ـ دەرچونی ئاولەشوێنەبەرزەکان لەبەهاردا!کەئاوبەسروشتی خۆی لەشوێنی نزم دەردەچێت،وەدەرچونی لەنێوتاشەبەردی ڕەق وەك سەرچاوەی زەڵم.

٣ـ هاتنەدەرەوەی مێرولەوزیندەوەرەکان لەبەهاردادوای ماوەی سڕبونیان لە زستاندا،شاعیروتویەتی:بەهارغونەی زیندەوەربونە..بۆتێفیکرینی هێزی دەرونە، بۆحەیواناتیش هەوەس بازیە..بەتایبەت گوێدرێژزۆر پێ ڕازایە.

نەك پێشبڕکەی خواردن وخواردنەوەوگۆشت برژاندنیان ڕەش بەڵەك وخراپەکاری،بەتایبەت ئەمڕۆژێکی پیرۆزی وەك هەینداکەبەچاولێکەری کوێرانە ئەڕۆن بۆسەیران نەجێگەو ڕێگەبەر دەکەوێت نەئارمی دەستدەکەوێت! زۆر یێکیش نوێژەکەیان لەدەست دەچێت! ئێوارەکە گەڕانەوەبۆشارزۆرهیلاك و بێزار!!نازانم خۆشی ئەوسەیرانە لەچی دایەکەلەبازاڕقەرەباڵغترە تۆش بۆ مەبەستی ئارامی وبێدەنگی ودوورلەجەنجاڵی وسەرقاڵی بۆچەند ساتێ هەوای پاك هەڵ مژین دەرچوی،بەتایبەت ئێمەی موسڵمان پێویستەلەسەیران ولە قەیرانا لەخوابترسین ونەچین بەلای گوناهوتاوانەوە،(مەنصوری عەممار)کەیەکێ بوە لەخاسان وخواناسان ڕۆژێك لەگەڵ قوتابیەکانی ئەچن بۆسەیران بۆسەر کەناری دیجلەلەوکاتەدا دەبینن چەندگەنجێك لە بەلەمێکدا بەلایاندا تێدە پەڕن وگاڵتەیان پێدەکەن ودەڵێن:سەیرەهاتوون بۆسەیران نوێژی بەکۆمەڵ دەکەن وقورئانیان پێیەووتاردەدەن!قوتابیەکانیش داوادەکەن کە شێخ مەنصور ڕێگەیان بدات تەمبێیان بکەن بەلاَم قبوڵی نەکرد،لەبری ئەوەدوعای بۆکردن وتی

خوایەوەك چۆن لێرە پێدەکەنن ئاواش لەدوارۆژپێبکەنن،قوتابیەکان بەتەمای ئەم دوعایە نەبوون،بەلاّم ئەوانەی کەبۆخوادەژین هەردەم دڵیان پاکەوچاکەیان بۆخەڵك دەوێت،بۆیە دوای چەندساتێ کەگەڕانەوە لایانداوداوای لێ بوور دنیان کردوتەویەیان کردویەوەش بە ئیمانەوە ژیان ودوارۆژیشیان دەبێتەخۆشی وشادی وپێکەنین،ئەرکی ئێمەی مرۆڤ ئاوەدان کردنەودیە نەك وێرانکردن کوردستانیش یەك پارچە سەیرانگایەوشوێنی گەشتیاریەبەلاّم بەداخەوە لەبەر سیاسەتی درۆینەوشەڕی کورسی وکولێرەنەتوانراوە وەك پێویست خزمەت بکرێت وقەدری ئەم نیعمەتەنەزانراوە،بائێمەش سەیرانگاکان پاك وخاوێن ڕابگرین وچونکە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی(تَنَفظوا فَانَ الاسلامَ نظیفٌ)واتە: پاك وخاوێن بن چونکە ئیسلام پاکە،دەی تۆش کانیەك ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ مەخە،سفرەی خواڕاخراوەو ڕازاوەنان خۆری سفرە دڕمەبە ، با هەموومان لەئاست بەرپرسیاریەتی دابین وبەڕەوشتی بەرزبیسەلمێنین کە خۆشویستنی گەل ونیشتمان بەشێکە لەدینداریمان ڕەوشتی جوانیش لە هەڵسوکەوتدا دەردەکەوێت(الدین المعاملة)بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی :(أکمل المؤمنین .یماناًاحسنهم خلقا)واتە:تەواوترینی بڕواداران ئەوانەن کەڕەوشتیان جوانە،وتراوە ڕەوشتی بەرز سەرمایەی ژینە..ئەوەی لێدووریێت دایم غەمگینە
کردارەکانت پڕیادی خواکە.. ئەوسا ئەبینی ژیان شیرینە
بەهیوای بەهاری خۆشی وشادی وسەیران نەبێتە قەیران

---

* ئەم وتارەبۆسەرەتای بەهارە،وەبەشێکەلەچاوپێکەوتنی کەناڵی سەحەری ئێرانی بەرنامەی پەنجەرەکەلەگەڵ بەندەئەنجامدرابولەوبارەوەلە(٢٠١١/٣/٢٣)لەسلێمانی.

# نیشانەکانی قیامەت

سەرەتا مەبەست لەباسکردنی نیشانەکانی قیامەت چیە؟

- بۆبەدیهێنان وبەهێزکردنی بڕوابون بە(غەیب)کەیەکێکەلەشەش پایەکانی ئیمان،چونکەڕودانی ئەونیشانانەڕاستی پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ)زیاتردەسەلمێنێ کەدەبینی سەرجەم فەرمودەکانی هاتونەدی ودەڵێی لەم ڕۆژگارەدافەرمویەتی!

- ناسینی نیشانەکانی قیامەت هاندەرەبۆخۆئامادەکردن بۆڕۆژی دوایی،بێ ئاگایان وشیار دەکاتەوەبۆتەوبەکردن وخواپەرستی،چون مردنی هەرکەسێ قیامەتی ئەوەجاوەك چۆن مردن هەموچرکەیەك هەیەبۆیەدەبێ ئێمەش هەمووساتوکاتێ بەتەقواولەخواترسان بۆی ئامادەبین

- دەرگای ئومێد دەکاتەوەکەدوای ئەوهەموخراپەکاریەسەرکەوتن وسەرەنجام بۆئیسلامەبەهاتنی مەهدی ودابەزینی حەزرەتی عیسا(ﷺ)جگەلەزۆرسودی تر.

دیارەسەرەتانیشانەبچوکەکانن،کەهەندێکیان ڕابردون وەك(ڕەوانەکردن ولە دنیادەرچونی پێغەمبەر(ﷺ)موعجیزەی لەتبونی مانگ،بانگەشەکارانی پێغەمبەر ایەتی بەدرۆکە نزیکەی(٣٠)کەس بون..)،زۆریش لەونیشانەبچوکانەکەزیاتر لە(١٤)سەدەبەرلە ئێستا پێشەواکەمان بۆی ڕونکردوینەوەووەك موعجیزەی فەرمودەکانی لەم سەردەمەدابەئاشکرا دەرکەوتون وژینیان لێکردوین بەژان! وەك ئەوەی کە فەرمویەتی:(دایك ئەبێ بەخزمەتکاری ڕۆڵەکەی‌لپێخاوس و شوانەکان کۆشك وتەلاری بەرزدروستدەکەن فتنەوئاژاوە دنیادەگرێتەوە پاشان نیشانەگەورەکانی قیامەتەکەئێستادەرنەکەوتون،وەك حوزەیفە بۆمان دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:قیامەت هەڵناستێت تالەپێشدا (١٠) نیشانەنەبینن،ئەمانەی ژمارد(الدخان/دوکەڵ،الدابە/ئاژەڵەکە،هەڵاتنی خۆرلەڕۆژئاواوە،یەئجوج وماجوج، دابەزینی عیسی(علیەالسلام)،سێ ڕۆچون لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو دورگەی عەرەب،ئاگرێك لەیەمەن دەردەچێت وخەڵکی ڕاودەنێ بەرەوشوێنی کۆکرنەوەیان)(مسلم)،نیشانەگەورەکان بەدوای یەکتردادێن وەك دەنکی تەسبیح، لێرەدا بەکورتی ئاماژە دەکەین بەهەندێ لەنیشانە

بچوکەکانی قیامەت کەلەم سەردەمەدا لەگەڵیاندانەژین ئەیان بینین ودەیانبیستین:
لە(ابی هریرە)وەگێڕاوەتەوەکەپێغەمبەر(ﷺ)فەرمویوتی:**لاتقوم الساعة حتی...**،
قیامەت هەڵناستێ هەتاپێشترئەم شتانەبلاّودەبنەوە:
١)**تَظهرالفِتَن**..،ئاشوب وئاژاوەسەرهەڵدەدەن،وەك لەفەرمودەیەکی ترداهاتوە وەك شەوی تاریك دنیادەگرێتەوە(**فتنٌ كقطع الليل المظلم**..)بەجۆرێك کەسی وایەبەیانی باوەڕدارەو ئێوارەکەی بێباوەڕەیان بەپێچەوانەوەودینەکەی دەفرۆشێ بەشتێکی کەمی دنیا! (بەئافەرینێکوخەلاّتوبەراتێ،ئەوەش بەهۆیگەورەیی فتنەکەوە)فتنەکەبەمانای تاقیکردنەوەیە بەلاّم بۆهەموشتێکی خراپیش بەکارهاتوە .
٢)**ويَكثرُالكذب**،زۆربونی درۆودەلەسە،وەك دەبینی درۆبوەتەسیستمێکی نوێی جیهانی بەتایبەت کەبەدرۆی پیاوی گەورە دەڵێن سیاسەتێ شەرمکردن لە وەکەدرۆنەفرەتی لێکراوەوسەرەنجامەکەیشی شەرمەزاری دنیاودوارۆژە،وەلە فەرمودەیەکی تردا(**بين يدى الساعةكذابين فاحذروهم**)(مسلم)واتە لەوکاتەدا درۆزن پەیدادەبن خۆتان لێیان بپارێزن،پێشتردرۆزنودرۆزان بەمشێوەنەبوە
٣)**وتتقارب الاسواق**..،بازاڕەکان لەیەکترنزیك دەبنەوە،وەك دەبینی بەهۆی سەیارەوفڕۆکەو کەشتیەوەوسەرجەم هۆیەکانی گواستنەوەوگەیاندن ئاگادارن لەبەرزی ونزمی نرخەکان، هەر چەندەدوریش بن لەیەك جیهان بوەبەیەك بازاڕ.
٤)**ويتقارب الزمان**..،نزیك بونەوەی کات وڕۆژگار،وەك دەبینی بەرەکەت لەکات وساتدا نەماوە،بەخێرایی گوزەردەکەن ودەڕۆن وفریای هیچ ناکەوین! کەپێشتربەوشێوەیەهەستی پێنەکراوە،ئەبوهورەیرەلەپێغەمبەری گێڕاوەتەوەکە فەرمویەتی(قیامەت نایەتاڕۆژگارنزیك نەبێتەوەوبەجۆرێ کەساڵ وەکومانگی لێدێت!مانگ وەك هەفتە!هەفتەش بەئەندازەی ڕۆژێ خۆی دەگرێت ڕۆژیش وەك سەعاتێك وساتیش وەك بڵێسەی ئاگر!)(رواه احمد والترمذی)
٥)**ويكثرُالهرج/قال:القَتلُ**،یەکێکی ترلەنیشانەکانی کۆتایی دونیاکەلە فەرمودەی

پێغەمبەرداهاتوەزۆربونی کوشتنە،بەجۆرێك بکوژنازانێ بۆکوشتی؟و کوژراویش نازانێ لەسەرچی وبۆکوژراوە؟!(لایدری القاتل فیم قَتَل ولاالمقتول فیمَ قُتِل..)(مسلم)،وەك لەم رۆژگارە دەبینی لەسایەی دروشمەکانی بەناومافی مرۆڤ کوشتن ئەوەندە زۆربوەکەمرۆڤ نرخی زۆرکەم بوەورووباری خوێن دەڕوا! لەجەنگی جیهانی یەکەمدا(١٥)ملیۆن ولەهی دووەمدا(٥٥)ملیۆن مرۆڤ نەك مریشك کوژران!لەجەنگی ڤێتنام(٣)ملیۆن لەشەڕەکانی ناخۆی روسیا(١٠) ملیۆن ولەشەڕی عیراق ئێران یەك ملیۆن کەس بەبەلاش کوژران،ئەوەجگە لەکوژرانی موسڵمانانی جیهان بەتایبەت لەعێراق وئەفغانستان وفەلەستین و شەڕوتەقینەوەی بەردەوام لەسایەی پلان وپیلانی ولاتانی ئەورووپاورۆژئاوا...

٦)مردنی کتوپڕ(..ان یظهرموت الفَجاةَ)(رواه الطبرانی وحسنه الالبانی)یەکێکی ترلە نیشانەکانی قیامەت پەیدابونی مردنی کتوپڕە،ساغ وسەلامەتەیەکسەر دەمرێ،چی بو؟ جەڵتەی دڵ یان دەماغ یان ڕوداوی هاتوچۆبو،یان لەکاتی یاریداولەئاهەنگی گۆرانیدامرد! بۆیەئاقڵ ئەوکەسەیەهەموکات ئامادەیەبۆمردن.

٧)دەرکەوتنی پیاوانی ستەمکارکەبەقامچیەك لەخەڵك دەدەن وێنەی کلکی مانگایە،(وەك کێڤڵ)کەلەناوزیندانەکاندایێی لەخەڵك دەدەن جگەلەشتی تر، (قومٌ معهم سیاط کأذناب البقریضربون بهاالناس..)رواه مسلم،کەئەوکات نەبوە.

٨)دەرکەوتنی ئافرەتانی ڕوتی پۆشتە،بەرواڵەت پۆشتەن بەلام ڕوتن چونکە جلەکانیان تەنك وتەسك وئەندامەکانی لاشەیان دەردەخات،لارولەنجەدەکەن وقژی سەریان توێەڵەدەکەن وەك کۆپانەی پشتی حوشتر،ڕێك ئەوەی کەلەم رۆژگارەدابۆئافرەتانی سفورمۆدیلی سەردەمە، دەفەرموێ ئەوانەناچنەبەهەشت وبۆنیشی ناکەن،ئەوەش موعجیزەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ) چون ئەوکاتە ئەومۆدیلە نەبوە،(نساءٌکاسیاتٌ عاریاتٌ ممیلات مائلاتٌ)رواه مسلم.

٩)ئافرەت بەخێوکەروگەورەی خۆی لێ لەدایك دەبێت!یان ئافرەتی کۆیلە منداڵەکەی دەبێتە ئازادوبەرپرس(أن تَلدالأمة رَبتَها)مسلم،تەنانەت ئێستادایکوباوك بون بەخزمەتکاری منداڵ

١٠) شانازی کردن ودروستکردنی کۆشك وتەلاری بەرزوبڵند لەلایەن خەڵکانێ کەپێشترشوان بون پێخواس بون،واتەلات وپاتی کەژوکێوان بون لەئەشکەوتاندابون (..وان ترى الحفاةَ العُراةَالعالةَرِعاءِالشاءِيَتَطاولون في البنيانِ).

١١) یەکێکی ترلەنیشانەکانی قیامەت سەلام کردن تەنهالەکەسی ناسراو! ئەو دیاردەیەلەشارەکان زۆرترە،لەکاتێکداسەلامکردن هێمای ئیمان وخۆشە و یستیە،بەڵام وەك دەبینی گەرخزمی نەبێ یان لەحیزبەکەی نەبێ یان بەرژەوەندیەکی نەبێ گەرموگورنیەلەگەڵیدایان سەلامی لێناکات ! (..والایسلم الاعلى من يعرف)(رواه ابن خزيمة وصححة الالباني).

١٢) سەرهەڵدانی نەفامی لوەك لەفەرمودەداهاتوەکەماناکەی بەم شێوەیەیە: (لەسەروبەندی کۆتایی دنیادارۆژێك دێت کەزانست بەرزدەکرێتەوەونەفامی تیابلاودەبێتەوە)(متفق عليه)، وەك دەبینی نەفامێتی سەدەی(٢١)بەرانبەربەدین لەهی کۆن خراپترە،لەدینەکەیان بێناگان !بەڵام بۆبەرژەوەندی ژیانی دنیایان زیرەکن!(چوم بۆمارەبڕینی ئافرەتێك شایەتمانی بەچاکی نەدەزانی بەڵام وەستای مکیاج وناوی هەموگۆرانی بێژویاریزانەکانی لەبەربو،هەیانەتەنها لەکورد و موسڵمان ناچێت،وەبەکورتی لەنیشانەکانی قیامەتن:شایەتی درۆ،پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی،بلاوبونەوەی خیانەتوونبون ونەپاراستنی ئەمانەت،ناکەس بەچە دەبنە گەورەوقسەکەر،ڕەوابینینی مۆسیقاوخواردنەوەی ئارەق،زۆربونی نوسین وخوێنەروکەم بونی زانای شەرعناس،زۆربونی ئافرەتان وبومەلەرزە،زۆربونی دیاردەی قەڵەوی..،زۆرنیشانەی تریش لەفەرمودەکانداباسکراون وئێستاهاتونەدیکە(١٣١)نیشانەیە،بەڵام ئەوەندەوەك مشتێ لەخەرمانێ،بۆ بە ئاگابونت لەوبارەوە سەیری کتێبی(نهاية العالم)بکەکەباس لە نیشانەکانی قیامەت دەکات لەنوسینی(د.محمدعبدالرحمن عريفى)کراوە کوردیش.

---

* (ئەم باسەکاتی خۆی(٢٠١٣) لەدوو وتاری هەینیداخوێندومەتەوە لەسلێمانی).

# کارەساتی بەناوئەنفال.. پرۆسەیەکی سیاسی بوو

سـالأنە لـە(٤/١٤)بـەولاوە برینـەکان ئەکولێنەوە،خەمـەکان وەبیردێنـەوە، پەیمانـەکانی خزمـەتووەفاداری چـەندبارەئەکرێنەوە!بـەلأم زولەبیرئەبرێنـەوە ! مەرگەسـاتی بەناوئـەنفال پرۆسـەیەکی سیاسـی بوونـەك ئاینی،سیاسـەتی حیزبـی بەعـسی عـەلمانی بەشـێوەیەك پیلانەکانی دادەڕشت کە تاوان وکارە دزێوەکانی بەدروشمەئاینیەکان دادەپۆشی!وەك ئـەنفال وشەڕی قادسیەوهێزەکانی بەناوی بەدروسـعد وقعقـاع وهێرشەکانیـشی بـە(الله اکبر)جـۆش دەدا،بـەلأم لەبەرانبەرداکارەخزمەتگوزاریـەکانی بـەناوی خـۆی وحیزبەکـەی ناودەنـا! وەك (نەخۆشخانەی صدام،شاری هاوچەرخی صدامی)لەگەڵ زۆرێك لەشەقام وشوێنەگـشتیەکان،! بەومەبەستەی دینەکەیان لاناشیرین بکات!سورەتی ئەنفال باسی کوشتن وبڕین ناکات،بەلکو باس لەدابەش کردنی ئەومالّ وسامانە زیادە دەکات کـە پێـشتر لەشـەڕی بێباوەڕانـدا ببـوە دەستکەوتی موسلّمانان،نەك کۆمەلکوژی مرۆڤەکان پاشـان دژبـە بێبـاوەڕان ئـەنجام دراوە، نەوەك میللەتێکی موسولّمانی وەك کـورد ! لەبەرئەوەدروسـت نیـە بەوتراژیدیایـە بگـوترێ ئەنفال یان بەدەستە واژەکە بلّێی بەدناوەئەنفالەکان ئەمانە هیچیان دروست نین،بـەلکودەبێ بگـوترێ بەناوئـەنفال بەبەلّگـەی ئـەقلی ونـەقلی نابێتـە ئـەنفال،وە ڕەوانییـە ئێمەقـسەی دوژمنەکەمان دووبارەبکەینەوەوهەمان سوکایەتی بەشـەهیدەکانمان بکەینەوە،چـونکە ئـەوە پرۆسەیەکی سیاسی بووە بەناوی ئاینـەوە بۆلێـدانی ئاین،کـە زۆرجارلـە هەنـدێ رۆژگـاردا مێژووخۆی دووبـارە دەکاتـەوە وە هـەمان پـیلان دوبـارە پراکتیـزە دەکرێتـەوە لەژێردروشـم وناوی جۆراوجۆردا!هێنانەوەی ڕوفاتی بەناوئەنفال کراوەکان وناشتنیان لەگۆڕستانی تایبـەت بە مەراسیمی شایستەوشکۆدار جێگەی خۆیەتی وزیاتریان قابیلە،بەلأم پرسەومەراسـیمەکە ئەوەنـدەی سیاسـی وڕوکـەش وبازرگانیە،ئەوەنـدە دلّـسۆزی وپەرۆشـی لێناخوێندرێتـەوە! بێگومان بێدەنگی لەئاست جینۆسایدی بەناوئەنفال بێ دەنگیەلـەکارەدزێوە کـانی بـەعس، بۆیە پێویست بوودادگایی ئەنفالچیەکانی ناوخۆمان بکرایەونەوانەی کەفایلدارن وهاوکاریان

بوون،بەخاتری شەهیدەکان وکەس وکاری بەناو ئەنفالەکان کرابانە پەندوئامۆژگاری بۆ هەموئەوانەی کەبازرگانی بەم گەلەوە دەکەن،نەك پلەیان پێ بدرێ یان پارێزگاریان لێ بکرێ!لەبەر مەنسوبیەت ومەحسوبیەت چاوپۆشیان لێ بکرێت!چون ئەگەرلەئەنفال تێنەگەین،کەواتەلە بەعسیش تێنەگەیشتووین،پاشان ئەپرسین ئەرێ گەلۆ کەس وکاری بەناو ئەنفال چیان بۆکراوە؟وەچیان ماوە؟ئەوەی لە دیمانەکانیاندابینراگلەیی وگازندە بوو! دڵگەرمی بوو،تەنها وتاری بەرپرسەکان رێك وجوانە بەڵام کردارەکانیان وێرانە لەجیاتی قەرەبوی ماددی ومەعنەوی،ئەبووپاشماوەکانیان شارێکی جوانو مۆدێرن یان گوندێکی ئەمریکی وئەوروپی هاوشێوەی گوندی ئەڵمانی سلێمانیان بۆدروست بکرایە،لەناوکەلاوە کانی گەرمیاندا،نەك موچەیەکی کەمی مانگانە،کەئەوشارەهاوچەرخەبەئەندازەی مەبلەغی بودجەی تەلاری چەند بەرپرسێکی تێدەچێ!دەبوعەدالەتومافی مرۆڤ بۆهەموان بوایە، وە بەجدی هەوڵ بدرایە بۆبەجێهێنانی داواکانیان،بەڵام وەك چۆن خودی پرۆسەکە سیاسی بوو، کاربۆکردنیشی سیاسیانەیە!!کە دەبوودڵسۆزانە بوایە.

## عەرەبی دوێنێ و ئەمڕۆ:

سەرەتادەبێ بزانین کەئێمەی کوردکێشەی نەتەوەییمان هەیە نەك کێشەی ئاینی،چونکە پێناسی زۆرینەی کوردموسڵمانە،دیارەکەکێشەی نەتەوەیش لەلایەن زلهێزەکانەوەدروست کراوەکەبەشێوەیەك دابەشیان کردوین تاهەتایە چەوساوەبین!کەواتە ستەمەکەلەبێدینیەوەیە نەك لەدین،ب،داخەوەکەزۆربەی وەڵامەکان لەجیاتی پێوەری زانستی ڕاستیەکانی مێژویی بن زیاترکاردانەوەن کەبەوەش دۆسیەکان تێکەڵ دەکرێن وتەڕو وشك بەیەکەوەدەسوتێنن ئەوەش بۆخۆی ستەمە،وەك قسەی عەلیاغای پشدەرێ دەردەچێ کەوتبوی (پۆلیس هەر پۆلیسە)مەبەست لەنوسینەکەم دەرخستنی ڕاستیەکانی مێژووەنەك بەرگری لەعەرەب، ئەو عەرەبەی کەلەسەرەتاوەهات پەیامی ئازادی ورزگاری گەلانی هەڵگرتبو،ئەوکات دەوڵەتی ئیسلامی بوونەك عەرەبایەتی، سیستمی بەڕێوەبردنی وڵات(ولایات)بووهاوشێوەی فیدرالی

ئەمرۆ،بۆیەکوردیش لە سایەی دابوژایەوەوبوە خاوەن(١٨)میرنشین،لەوسەردەمەداکێشەی ئەوتۆنەبووەبە ناوی کوردەوە،کەسێکیش ئەگەرنەچەوسێتەوەهاوارناکا،بەلاّم دوای ئەمانی دەولّەتی ئیسلامی عەرەبەکان دروشمی قەومایەتیان بەرزکردەوەودینیان جیاکردەوەلە دەولّەت!جگەلەبەندایەتی تاکەکەسی،بەوەش هەم خۆیان زەلیل وپارچەپارچەبون هەم ستەمیشیان لەئێمەکرد،کەواتەپەیامی عەرەبی ئێستا جیاوازە لەسەردەمی ئیسلام،بۆیە نارەوایە ستەمی عەرەب بدەینە پالّ ئیسلام،هەرچەندەدینەکەش بەزمانی عەرەبیە بەلاّم بۆ هەموجیهانەو(ئومەمیە)، بەداخەوەکەخەلّکانێك لەوەدا بێویژدانی دەکەن وهەمووزەردێك بەزێڕدەزانن!وەك ئەوکەسەیان بەسەرهاتوەکە:(دەمی بەشیری سوتابووفوی لە ماستاوێ دەکرد!)بۆیە دەبینی کەبراعەرەبە چاوڕەش ومل ئەستورەکانی ئەمرۆ نیەتیان خراپە بەرانبەرمان! سەرەڕای ئەوهەمووخزمەتەی کردمانن لەسەر دەمی رژێم وپاشانیش لە هەولێروبەغدا !لەوتێوەندەدا خەلّکانێك کەنەیاری ئیسلامن یان بەهەلّەلەئیسلام گەیشتون بەناوی کوردایەتیەوە دژایەتی دین دەکەن وهەرچی ستەمێ عەرەب کردویەتی دەیخەنە پالّ دین !(لەکاتێکدا بیرمان نەچێ بەپاساوی بەرژەوندیەوە ئێستاش هەندێك هەرلەخزمەت عەرەب دان وەك ئەوانەی عێراقچیەتی دەکەن)،وادەزانێ کەدین کەلتوری عەرەبە! سروشتی مرۆڤیش وایەدژی ئەوشتەیە کەنایناسێ،خۆئێستا عەرەبەکان حوکم بەئیسلام ناکەن، بەلکولەسێبەری رۆژئاوادان وسیکۆلاریزمین!ئیترچ خەتالە ئیسلامە؟کەی سەددام ئیسلامی بو؟هەمومان بەعس وعەفلەق دەناسین ، ئیسلامێکیش رێگربێت لەمافەکانی کوردقبولّ نیە،بەلاّم مافی هەمووگەلانی تێدایە گەرکاری پێ بکرایە،مێژوی رابردوش بەلّگەی ئەو راستیانەیە،ئێستاش بائیسلام وەك خۆی وەربگرین وبۆبەرژەوندیەکانی خەلّك وخاکمان، بزانین کەعەرەبی دوێنێ ونەمرۆناسمان ورێسمانیان بەینە،جاران ئیسلامی بووبەلاّم ئێستا (عروبە)یەوعەلمانیەوسیاسەتی عەلمانیەکانیش بەشێوەیەکەدین وەك دروشم تەنهابۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردێنن!.

# تەكنەلۆژیالەخزمەت ڕاستیەكانی ئیماندایە

یەكێك لە(١٠)نیشانەگەورەكانی كۆتایی جیهان كەلەفەرمودەدا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوین:هەلاتنی خۆرەلەڕۆژئاواوە،دوای زیاترلە(١٤)سەدەتەكنەلۆژیای سەر دەم ئەم ڕاستیەی سەلماندبەپێی ئاژانسی فەلەكی(ناسا)دەڵێ:بەهۆی دەركەوتنی هەسارەیەكی زۆرگەورەلەبۆشایی ئاسماندابەناوی(نیبرۆ)كەهێزی كێشكردنی ئەوەندە زۆرەبەنزیك بونە وەی لەزەوی ئەمسەری دەگۆرێت بۆنەوسەركەلەئەنجامدادیاردەیەكی ناسروشتی ڕودەدات وبۆیەك جارخۆرلەڕۆژئاواوەهەڵدێ!كەپێشبینی دەكەن لەم چەند ساڵەداڕوبدات،خۆئەگەرپێشبینیەكەش كاتەكەی دوا كەوت هیچ لەمەسەلەكەناگۆڕێ چونكەئەوان موعجیزەكەی پەیامبەریان بەزانست سەلماندوەوپێغەمبەرڕاستی فەرموە ولەخۆیەوە قسە ناكات (وماینطق عن الهوی)ئەگەرسەیری زۆرێك لەئایەتەكان بكەین سەبارەت بەگرنگی وگەورەیی دروستكراوەكان لەكۆتایی ئایەتەكاندا دەفەرموێ ﴿...لعلكم تتفكرون، لعلكم تعقلون،عبرةلاولی الالباب ...،كەمەبەست لەهەمویان پەندوئامۆژگاری وتێڕامان وبیر كردنەوەوبەگەڕخستنی ژیری مرۆڤەكانە،میراتی پێشەواكەمان دینارودرهەم وكۆشك وتەلارنەبووەبەڵكو زانست وزانیاری بووەكە هۆی سەرەكی پێشكەوتنە، وە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆهەندێ لە ئایەتەكان ئامــاژە یانكردوە بۆگەڕان بەناوبۆشایی ئاسمان داووە بۆنەوت وفڕۆكەو ئۆتۆ مبیل وكۆپی كردن (استنساخ)وسەرجەم پێشكەوتنەكانی سەردەم یان لێ دەخوێندرێتەوە، ئەوەندە بەسەكە یەكەم فەرمانی پەیامی ئیسلامی (اقرأ)بووەكەئاماژەیە بۆخوێندن وزانیاری ودەیان ئایەت وفەرمودەی زۆركەهاندەرن بۆزانست وزانیاری،كەئێمەئومەتی (اقرأ) خوێندنەوەین بەلام ناخوێنینەوە!! ووشەی عیلم زیاتر (٣٤٥)جارلە قورئاندا دووبارە بۆتەوەبەلام ئەگەركاریان پێنەكرێت ولێیان بێئاگابین سودی ئەوتۆی نابێ بۆمان وەك وتراوە(قەدری زێڕلای زەڕەنگەرە)ئێمەقورئان بۆمردو دەخوێنین كەبۆزیندوەكان

هاتوه‌لرۆژئاواییه‌كان به‌عه‌قڵێكی مه‌عریفی سه‌یری دینه‌كه‌ مـان ده‌كـه‌ن بۆیه‌له‌هـه‌ر وڵاتـێ روبـه‌ری ئـازادی فراوانتربـێ ئیسلام تیایـدا زیاترگه‌شـه‌ی كردوه‌وبڵاوبۆتـه‌وه‌، له‌هه‌رشوێنێ گرنگـی بـدرێ به‌زانسـت وزانیـاری ئه‌وه‌له‌وشـوێنه‌ خـه‌ڵكی زیاتریـه‌ره‌و ئیسلام دێن چونكه‌مرۆڤه‌كان وێڵن به‌دوای ڕاستیداومرۆڤیش به‌بێ ئـاین سـه‌رگه‌ردانه‌ وه‌ك ئه‌نیشتاین ده‌ڵێت(الانسان بلادين كسفينة بلا ملاح) واتـه‌: مرۆڤـی بـێ دیـن وه‌ك كه‌شـــتیه‌كی بێكه‌شـــتیه‌وانه‌،بۆیه‌خه‌ڵكانێك له‌ڕۆژئاواله‌لوتكـــه‌ی زانـــسته‌وه‌ موسڵمان ده‌بـن وه‌ك كه‌شـتیه‌وانی ئاسمـانی ئـه‌مریكی نارمـسترۆنگ سـاڵی( ٩٦٩) به‌هۆی ئه‌وه‌ی له‌سه‌رمانگ گوێی له‌بانگ بووه‌لوزانای مه‌جه‌ری (جرمانۆس) هه‌شـت زمانی زانیوه‌و( ١٥٠) كتێبی نوسیوه‌لوه‌ده‌یانی وه‌ك(دیمیتری بۆلیـاكۆڤ)كـه‌ دكتـۆرای بوه‌ له‌فیزیا له‌ئۆكرانیا،وه‌خاتوون(د.كاملاس داس)خاوه‌نی خه‌ڵاتی نۆبـڵ،وه‌ خـاتوون (یۆڤۆن ڕیدیلی)،ته‌نانه‌ت(مایكڵ ۆڵف)له‌ڕۆژنامه‌ی (میـدیامۆنا تـۆریس)لـه‌ ١١/٦/ ٢٠٠١بابـــه‌تێكی نوسیوه‌به‌ناونیـــشانی( islam the next amrkan relegon)واتـه‌ئیـسلام ئـاینی داهـاتوی ئه‌مریكایـه‌،وه‌ ڕۆژنامـه‌ی( sandey times)ی به‌ریتانی له‌٢٢/٤/٢٠٠٤نوسیویه‌تی كه‌زیاترله‌(١٤)هه‌زارسـپی پێـستی به‌ریتانی موسڵمان بون به‌هۆی بێزاری ونائومێدیان له‌بـه‌های ڕۆژئاواییـه‌كان كه‌لـه‌ناو ئه‌وانداكه‌سایه‌تی ناوداری(جۆناسان بێـرت)ی كـوڕی (لـۆردبێرتی)به‌ڕێویـه‌ری پێـشوی (B.B.C)،وه‌زانستی بێدین وپه‌روه‌رده‌ یان دینی بێ زانـست هـه‌ردوكیان نوقـسانن، وه‌ك ئه‌نیشتاین وتویه‌تی:(زانست به‌بێ دین وه‌ك شه‌ل وایه‌ودینی بـێ زانستیش وه‌ك كوێروایه‌)كه‌ئێمه‌به‌ هه‌ردووكیانه‌وه‌گیرۆده‌ینلسه‌یروسه‌مه‌ره‌ یه‌كه‌تازه‌ده‌یانـه‌وێ بـه‌ری خۆربه‌ بێژنگ بگرن ولێره‌وله‌وێ دینه‌كه‌مان به‌كۆنه‌په‌رست ودواكه‌وتووتۆمه‌تباریكـه‌ن ئه‌گه‌رمه‌به‌ست له‌كۆن بوون زه‌مه‌ن كات بێت؟ئه‌واناینی مه‌سـیحی وجوله‌كه‌ومێـژوی دیموكراسی زۆرله‌پێـشتروكۆنترن له‌ئیـسلام وئیـسلام تازه‌یـه‌ له‌چـاوئه‌واندا، خۆنه‌گـه‌ر

بێزاربوون بێت لەشتەکۆنەکان بۆنەوەی بەکاریان نەهێنین ئەوا .ئاووهەواوخۆرومانگ وسەرجەم دروستکراوەکان کۆنن، ئەگەر مەبەست لەپێشکەوتنیش ڕوتی ئافرەتان و خیانەتودرۆودوڕوی وخواردنەوە و دامێن پیسی وڕەفتارەدزێوەکان بێت ئەوە گەڕانەوەیەبۆسەردەمی نەفامی پێش ئیسلام،کەواتە ئەوانە پاشکەوتوی بەناو پێشکەوتون!لەڕاستیداپێشکەوتوکە سێکەخاوەن ئەقلێکی بەرهەم هێن بێتو بە کرداروگوفتاری جوان سودبەخش بێت بۆمرۆڤایەتی ئەوەش تەنهالەموسڵمانی ڕاستەقینەدایە،وەلەسەردەمی حوکمی ئیسلامیشداخاوەنی ئەو پێشکەوتنە بووە، مێژوی ڕابردوی ئیسلامی شایەتی ئەم ڕاستییەیە،دیارەکەپێشکەوتنیش بەدروشم ودیکۆرنابێت.

(وەك ڕۆژی مەعریفەلەیادی ڕۆژنامەگەری وڕۆژی جیهانی کتێب(٢٣،٢٢/٤)خوێندمەوە)

## (٦/١)ڕۆژی جیهانی ساوایان/مافەکانی منداڵ/childrens rights

١) شێوازی پەروەردە:

*ئەگەرمنداڵێك زۆررەخنەی لێبگیرێت سەرەنجام کەسێکی نارازی دەردەچێت

* گەرمنداڵێك بەتوڕەییەوەمامەڵەی لەگەڵداکراکەسێکی شەڕانگێزدەردەچێ

* ئەگەرمنداڵێك زۆربترسێنرێت ئەوەکەسێکی دوودڵ ڕاڕادەردەچێت.

* ئەگەرمنداڵێك بشکێنندرێت ئەوەسەرەنجام هەربەزەیی بەخۆیدا دێتەوە.

* ئەگەرمنداڵێك گاڵتەی پێبکرێت دواڕۆژکەسێکی شەرمن دەردەچێت.

* ئەگەرمنداڵێك بەخیل فێربکرێت ئەوەسەرەنجام هەست بەتاوان دەکات.

* ئەگەرمنداڵێك بەنازونوزپەروەردەکرائەوەسەرەنجام کەسێتی لاوازدەبێت.

پەروەردەی ڕاست ورەسەن بونیادوبنەمای پێگەیشتنی مرۆڤە،بۆیەگەرسەرنجی قورئانی پیرۆزبدەین دەبینی پەروەردەی خستۆتەپێش فێرکردن(..یُزکیهم و یعلمهُم الکتاب..)چونکەفێربون ئەگەرپەروەردەی لەگەڵدانەبێت زیانی زیاترە لەسودەکەی وزانستەکەی بۆخراپەبەکاردێنێ وەك لەم سەردەمەدادەیبینی!، (مافی منداڵ لەخێزانی بەختەوەروکۆمەڵگای ئاسودەدا بەرجەستە دەبێت) بۆیە دەبێ سەرەتا گرنگی بدرێت بەخێزانەکان،لەئیسلامدابەشێوەیەك گرنگی بەمافی منداڵ دراوەکەئەگەرمنداڵەکە دۆزراوەش بێت وخاوەنەکەی نادیار بێت کەلە فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێ(لقیط)حکومەت بەخێوی دەکات،وەك لە سەردەمی پێشەواعومەرداکەسێك منالکی دۆزیەوەوبردیەلای پێشەواعومەر ئەویش فەرموی:تۆسەرپەرشتی بکەووبەخێوکردنیشی لەسەرئێمەیە،چ جای منالی خۆت،پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ منداڵی ئامۆزاکانی یاری دەکردو دەیفەرمو{من سبقني فله كذا وكذا}هەرکەس پێشم بداتەوە فلان شتی ئەدەمێ،جارێکیان کە پێغەمبەرلە سوجدەدابوولەمزگەوت زۆر مایەوە،وتیان: اطلت يارسول الله؟واتە:سوجدە کەدرێژبوزۆرمایتەوە،فەرمووی حسین لەسەر پشتم

بووویستم به ئارەزووی خۆی بێتەخوارێ‌لوخۆشیەکەی لیٚ تیٚك نەدەم! هەرکاتیٚ سیستمی شەریعەتی ئیسلام لەئارادانەبوویان تێگەیشتن لەدین بە هەڵەبوونەواتوندوتیژی دەکەویتەوە، ئەو مافانەی لەقورئان وسوننەت بۆمنداڵ هاتوە هیچ شتێك جێگەیان ناگرێتەوەوشەریعەتی ئیسلام چەندبەشێکی تایبەتی دیاریکردووەبەمنداڵ وەك{باب العقيقة،الحضانة،الرضاع، الختان}ئەومافەش لە منداڵدانەوەدەست پێدەکات بەوەی کەداوێن پیسی حەرامکردوە وتالەرێگەی خێزانەوەپارێزگاری لەوەچەی نادەمیزادبکرێت، پاشان بەهۆی:

١) (حُسن الاختيار)هەڵبژاردنی دایکێکی چاك(ئیماندار)(تخيروا لنطفكم..)

٢) خۆشحاڵ بون بەلەدایکبونی،لەرۆژی حەوتەمداسوننەتی حەوتمی بۆبکریٚ،(عقيقة)

٣) پەروەردەکردنی لەسەربیروباوەڕی ئیسلامی،لەحەوتساڵیەوە.

٤) لەتەمەنی (١٠)ساڵیدا شوێنی خەوتنی کوڕوکچ لەیەك جودابکرێنەوە

٥) دایك وباوك پێویستە بەیەکسانی سەیری کوڕوکچەکانی بکات.

٦) رێگرتن لەهاورێیەتی بەدوناڵەباروچاودێری بکریٚ لەگرتنی هاوڕیٚ.

٧) لەبەرچاوگرتنی سزاوپاداشتی گونجاولەلایەن دایك وباوکەوە.

بەشێوەیەکی گشتی دایك وباوك وپەروەردەکاران بەرپرسیارن لە: پەروەردەی ئیمانی وڕەوشتی وجەستەیی ودەرونی وکۆمەڵایەتی و پەروەردەی جنسی،بێگومان هیچ کەسێك ناتوانیٚ شوێنی دایك بگرێتەوە بۆمناڵ،لەژمارە(٥٢٥)ی رۆژنامەی(الشرق الاوسط)داهاتوەکە ٦٠٪ی ئەومنالأنەی لەدایەنگەکان بەخێودەکرێن دوچاری کێشەی دەرونی دەبن، بۆیە ئافرەتان کەلەکاری سەرەکی وسروشتی خۆیان دورخرانەوەسەرەتا مناڵەکان دەبنە قوربانی ودواتروسەرەنجام کۆمەڵگایەکی ناتەندروستی لێدەردەچێت وپارەومادەش کەلێنی سۆزوخۆشەویستی پرناکاتەوە، بۆ زیاتربەئاگابون لەوباسەکتێبی(تربيةالاولادفي الاسلام، د.عبدالله ناصح علوان) بخوێنەوەکەکراویشەبەکوردی.

٢) هۆکارەکانی توندوتیژی دژی منداڵان

ساڵانە لە(٦/١)دا دروشمەکانی مافی منداڵان وساوایان لەمیدیاکان بەرز دەکرێتەوەکەبەرۆژی جیهانی منداڵان ناسراوەوساڵی(٩٥٦)ڕاگەیەنراوەکە هاوکاتەلەگەڵ سەرەتای پشوی هاوینەگەربیکەینەفرسەت بۆفێرکردنیان لەم دینە،بێگومان مافی منداڵانیش بەشێکی سەرەکیە لەمافەکانی مرۆڤ هەرچەندە ئەوانەی ئەومافەیان داهێناوەمەبەستیان پێ لەمافەکانی مرۆڤ ومنداڵانی خۆیانە (ئەوروپا وخۆرئاوا)نەك ئەوانەی ئێمەچونکەڕۆژگارئەم ڕاستیەی سەلماندوە، ئێمەش بازاڕی میدیاکانی پێگەرم دەکەین وبەدروشمەکەش قەناعەت دەکەین ! دوای ئەم پێشەکی بەکورتی دێمەسەرهەندێ لەهۆکارەکانی توندوتیژی

* منداڵ نابێ پێش باڵغ بوونی یان پێش (١٨)ساڵ بخرێتە بەرئیش وکارچونکە دووچاری لادان(انحرافات)دەبێت وستەم تاوانە،ئێستا بەپێی داتایەکی منداڵ پارێزی کوردستان زیاترلە(١٥) هەزارمنداڵی ئیشکەرلە کوردستاندا هەن!لە کاتێکدا جیهانی منداڵ دنیایەکی پاك وپڕبەرائەتەوخۆشی وجوانی وچاکترین سەروەت وسامانی دنیایەونەوەوئومێدی دوارۆژە: المال والبنون زینەالحیاەالدنیا..، لەکاتێکدا پێشەواکەمان فەرمویەتی: لیس منا من لم یرحم صغیرنا ولم یعرف قدرکبیرنا..،واتە: لەئێمەنیەئەوەی سۆزوبەزەیی نەیەتەوە بەبچوکەکانمانداو ڕێزی گەورەکان نەگرێ،ئەوەبانگەوازوپەیامی ئیسلامەنەك ترس وتۆقاندن!

هۆکارەکانی توندوتیژی زۆرن لەوانە:

١) دوورکەوتنەوەلەمەنهەج وبەرنامەی ئیسلامی،

٢) کاریگەری سلبی میدیاکان،بەدرامای توندوتیژوبلاوکردنەوەی فەسادوخراپە

٣) هاوڕێی خراپ،بەتایبەت لەشوێنی کار

٤) نەبونی سۆزوبەزەیی، بەتایبەت لەکاتی جیابونەوەی دایک وباوک ئەو کات دەکەویتە لای کەسێ کە هەرگیزجێگەی دایك وباوکی ناگریتەوە .

مامەڵەی سەلبی ماڵەوە،بەتایبەت کەئێمەی کوردپەروەردەی توندوتیژبوەتەبەشێکی کەلتورەکەمان،جائەودایکەی منالەکەی بەکەوچکی چاداخ دەکات یان بەهەڕەشە ئەیترسێنێ زۆرهەڵەیە،پەروەردەی خراپ تەنها زیان لەخێزان نادات بەڵکوکۆمەڵگاش زیانی لێدەکەوێ وکاریگەری خراپی دەبێ بۆی چونکە ئەندامێکی لەدەست داوە، بۆیەئیسلام زۆر گرنگی بەخێزان داوە کەبەردی بناغەی کۆمەڵگایە،ڕێکخراوەکانی مندالان تائێستاش نەیان توانیوەچارەسەری کێشەکانی مندالان بکەن، چونکەپاشکۆی حیزبن!کێ بەرپرسیارەلەمندالانی دەست گیڕوسوالْ کەری سەرشەقام(مندالانی کارو کۆلان)؟وەلەومنالانەی کەلەخوێندن دا براون؟ئەومندالانەی کەخاوەن پێداویستی تایبەتن؟مندالانی بێنازی یەتیم وپاشماوەی شەڕی ناوخۆ؟تاکەی بێدەنگی؟ بۆچی کەس نامادەنییەئەوبەرپرسیاریەتیەبەکردەیی بگریتە ئەستۆ؟ڕێکخراوەکانی منالان دەزگاکانی حکومەت،بەسەبۆگەورەیی ئەم دینەکەنەیارانیشی دانیان بەوە داناوەکە ئیسلام لەمامەڵەی ڕۆژانەیدانەرمونیانە،(جۆن ئیسپۆزیتۆ)م.لەزانکۆی(جۆرج واشنتۆن) وتویەتی{ئیسلام ئاینی میهرەبانی وپێکەوەژیانە ودورەلە توندوتیژی}

**٣) چەندنمونەیەك لەمنالانی پەروەردەکراو:(منالەژیرەکان)**

یەکەم/ منالێکی تەمەن(١١)ساڵ قسەکەری شاندی حیجازیەکان بوکاتێ چونە خزمەت خەلیفە(عمری عبدالعزیز)بەمەبەستی پیرۆزبایی،خەلیفەپێی وت:بالە تۆبەتەمەنترقسە بکات! منالەکەش وتی قوربان:مرۆڤ بەدووشتەبچوکەکەیەتی (دڵ وزمانی)ئەگەرخوای گەورەزمانێکی پاراوودڵێکی تەقوای بەخشیەبەندەی خۆی ئەوکەسەشایستەی قسەکردنە، ئەگەربەپێی تەمەن بوایەئەوالەتۆبەتەمەنترهەبو بکریتەخەلیفە!خەلیفەوتەکانی بەلاوەسەیر بووزۆرڕێزی لێگرت.

دووەم/ منالێـك لەبـەردەم خەلیفـە مەئموندا قسـەی دەكردبـەجوانترین شـێوە! خەلیفـەپێی گـوت:تۆكـوڕی كێی؟منالەكـەوتی:كـوڕی ئـەدەب وڕەوشـتم! مـەئمون گـوتی:ئەوەچـاكترین نەسەب ونەژادە.

سێیەم/ لەشـارباژێڕی خۆمـان منـالێكی پـۆلی سـێیەمی سـەرەتایی بـەپارەی ڕۆژانەكـەی ویـستی ئەوچۆلەكەیەلەهاوڕێكەی بكڕێتەوەكـەگرتبوی،وتی بۆچیتە؟وتی:ئـەیكرم وئـازادی دەكەم بۆئەوەی خودای گەورەش من ئازاد بكـات وبم بەخـشێت!بـەلام هاوڕێكـەی نەیدایـە! بـۆ؟وتی منـیش حەزبـەئازادی دەكەم،ئەواچـۆلەكەكەم بەرداوئازادمكردتابگەڕێتـەوەلای بەچكەكانی بەو ئومێدەی لەدوارۆژداخوالەهەردوكمان خۆش ببێت.

چوارەم/ لەسەردەمی(هیشامی كوڕی عبدالملك)داگرانی ووشكەسالی ڕوویكردە بیابانەكان وقات وقڕی بو،نوێنەری هۆزەكان سكالایان دەهێنا بۆلای خەلیفە هیشام، كاتێ نوێنەریان هاتە خزمەتی ودیاریان پێشكەش كرد منداڵێكی چواردە سالانەیان لەگەڵدا بووبەناوی(درواس كوڕی حبیب)، خەلیفەهیشام سەیریكرد درواس ئەوەندە منداڵە،بەدەرگەوانەكەی دیوانی خەلافەتی وت:ئەم دیوەخانەی من قەدرورێزی نەماوە كێ بیەوێ دێتە ژورە وەتەنانەت ئەگەرمنداڵیش بێ؟!درواس زانی مەبەستی ئەوە هەڵی دایەو گوتی:ئەی پێشەوای ئیمانداران! هاتنە ژوورەوەی من هیچ لە دەسەلاتی تۆی كەم نەكردۆتەوە،بەلام من پێی ڕێزداربووم،ئەی پێشەوای ئیمانداران! سێ ساڵە تووشی گرانی وقاتوقڕی ووشكەساڵی هاتورین:ساڵێك پیوو چەوری توایەوەونەما،ساڵی دووەم لاواز بووین وگۆشت بەئێسقانەكانمانەوە نەما،ساڵی سێیەمیش واخەریكە ئێسقانەكانمان نامێنێ،كەچی ماڵ وسامانی زۆروبێ شومارلەژێر دەستی ئێوەدایە،ئەگەر ئەومالە هی خودایە دابەشی بكە بەسەربەندە هەژارەكانی خوادا،ئەگەرهی بەندەكانیشە ئیتربۆچی لێت شاردونەتەوە؟خۆ ئەگەرئەو ماڵ وسامانە هی خۆشتە بیكە بەخێرو بەشی هەژارانی لێ بدە،جونكە خوای گەورە پاداشتی خێرۆمەندوچاكەكاران ون ناكات بەچەند قات پاداشتیان دەداتەوە،ئەی پێشەوای ئیمانداران! بزانە پێشەواوسەركردە بۆ ژێردەستەكانی

وەك رۆح وایە بۆ جەستە،جەستەش بەبێ رۆح ناژی،ئەوەندە وتەكانی شیرین وجوان بوویێشەوا گوێی بۆ راگرت وفەرمانیدا سەدهەزاردرهەم بدەن بەبیابان نشینەكان و،سەد هەزار یش بدەن بەدرواس،درواس گوتی:ئەی پێشەوای ئیمانداران!ئەوەی منیش بگێڕەرەوە بیدە بەبیابان نشینەكان،چونكە من پێم خۆش نیە ئەوەندە نەبەخشی بەئەهلی ناوچەكەم بەشیان نەكات، هیشام پێی وت: درواس ئەی تۆچ پێویستیەكت هەیە بۆخۆت تابۆتی جێبەجێ بكەم؟وتی:من هیچ پێویستیەكم نیەجگە لە پێویستی گشتی موسڵمانان!!.

پێنجەم/ یەكێك لەوبەسەرهاتەدانسقەوبەكەڵكانەی بۆمان دەگێڕنەوە لە بارەی ئەوەی كە پێشینانی چاك چۆن منداڵەكانیان راهێناوە لەسەر راست گۆیی وپەیمان وبەڵێنیان لێ وەردەگرتن كە درۆنەكەن ئەوەیە،كە خواناس وپیاوچاك شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانی دەگێڕێتەوەو دەڵێ:كاتێك لەماڵ دەرچووم بەرەوبەغدای شاری زانست و زانیاری وناشتی، پایتەختی هارونە رەشید، دایكم چل دیناری پێدام بۆخەرجی رۆژانەم وپەیمانی لێوەرگرتم كە راستگۆبم وهەرگیزدرۆنەكەم،كاتێك گەیشتینەدەوروبەری هەمەدان هەندێ دزوجەردەمان لێ پەیدابووكاروانەكەیان رووتكردینەوەوهەرچیەكمان پێبوو لێیان سەندین،یەكێك لەدزەكان دای بەلای مندا وتی هیچت پێیە؟ گوتم: چل دینارم پێیە،وا گومانی بردگاڵتەی لەگەڵ دەكەم لێیداورۆشت،یەكێ تریان منی بینی وتی:هیچت پێیە؟گوتم:چل دینارم پێیە،بردمی بۆلای گەورە كەیان سەرۆكی چەتەكان،ئەویش پرسیاری لێكردم وتی:چی وای لێكردی راستی بڵێی؟گوتم:بەڵێن وپەیمانم داوەبەدایكم كەدرۆنەكەم،ترسام خیانەت لەپەیمانوبەڵێنەكەی بكەم!سەرۆكی چەتەكان ترسی لێ نیشت كراسەكەی خۆی دادڕی وهاواریكردوتی:تۆترسای خیانەت لە بەڵێن و پەیمانەكەی دایكت بكەیت،بەڵام من ناترسم خیانەت لە بەڵێن وپەیمانی خوای گەورەو پەروەردگاردەكەم؟!!..پاشان فەرمانی دەركردهەرچی شمەكی كاروانیەكان هەیە بیگێڕنەوە بۆیان،وتیشی:ئەوامن تەوبەم كردوپەشیمانم دەگەڕێمەوە بۆ لای خوالەسەردەستی تۆدا،ئەوانەشی لەگەڵی بوون هەرهەموویان بەجارێ وتیان:تۆگەورەی

نێمه بووی لـه چـەتەیی وراورووتکردنـدا،دەبێ لـه ئـەمڕۆ بـەدواوە گـەورەشمان بیـت ا بە گەڕانەوە بۆلای خوادا،هەموویان بە بەرەکەتی ئەوراستگۆییـە تەوبەیان کردوگەڕانەوە.

شەشەم/ یەکێك لەدادگا شەرعیەکان حوکمی دادگایی کردنی دزێکـی دەرکـرد بـەوەی کە دەبێت دەستی ببڕدرێت،کاتێك رۆژی دادگـایی کردنـە کـەی هاتـە پێـشەوە،بەدەنگی بەرزپێی وتن:پێش ئەوەی ئێوە دەستی من ببڕن دەبێ من زمانی دایکم ببڕم،چونکە مـن یەکەم جارهێلکەیەکی مـالی دراوسـێکەمانم دزی،دایکـم سەرزەنـشت ولۆمـەی نـەکردم پێی نەوتم:دەبێ بیگەڕێنیەتەوە بۆمالی دراوسێکەمان،بەلکوهەلهەلەی خۆشی لێداو وتی سوپاس بۆخواکوڕەکەم بوەبەپیاو،ئەگەرزمانی دایکم نەبوایە،ئەوانەدەبومەدز. *

ئەوئێوە ئەی کۆمەلی باوکان ودایکـان چـەند نمونەیـەك لەسـەرخۆراگری وبـەردەوامی مندالانی پێشین وسوربوونیـان لەسەربەجێهێنانی مافەکان و پابەندبوونیان لەسەرپاراستـن ودانەوەی ئەمانەت،خیانەت نـەکردن وخـوا بـە چـاودێرزانین بەسـەرخۆیانەوە لـە نهێنـی وئاشکرادا،وەلەهەرجێگاوبارو حالەتێکدابوونایە،.

- عومـەر رەزای خوای لێ بێ لە سەفەرێکیدا بەرەومەککەلەکێوێکـدا شـوانێکی بینـی مەڕی دەلەوەڕاند،عومەرشوانەکەی تاقیکردەوە فـەرموی: ئـەی شـوانەکە! یـەکێك لـەم مەڕانەمان پێ بفرۆشە،ئەویش وتی: من بەندەم ناتوانم بەبێ مۆلەتی گەورەکەم بیفرۆشم عومـەر فەرموی: لای گەورەکەت بلێ گورگ خواردویەتی، شوانەکە وتی: ئـەی خـوا لـە کوێیە؟ ئایاخوائاگای لێ نیە؟عومەردەستیکردبەگریان وپاشان لەگەل شوانەکەدا چوو بۆ لای گەورەکەی لێی کڕی و ئازادی کرد، ئینجا پێی وت: ئـەی بەندەکـە لـە دنیـادا بـە هۆی ئەووشەیەوە رزگات بوولەکۆیلەیی،هیوادارم خوای گـەورەش لـە قیامـەتدا رزگـات بکات لە سزای سەختی دۆزەخ.

(مافی مندال لەخێزانی بەختەوەروکۆمەلگای ئاسودەدا بەرجەستە دەبێت)

---

*ئەم بابەتەم لەرۆژنامەی(ئایندە)یخوشکانی یەکگرتوژمارە(١٨٠،لە١/٦/٢٠١١)دابەزیوە.

# ئامۆژگاری باوکێك بۆکوڕەکەی

١ـ کوڕی شیرینم: هەمووکەس بناسە،بەلاّم هاوڕێیەتی هەمووکەس مەکە.

٢ـ هەمووشوێنێك شارەزابە،بەلاّم بۆهەمووشوێنێك مەڕۆ.

٣ـ هەمووشتێك ببینە،بەلاّم باوەڕبەهەمووشتێك مەکە.

٤ـ گەرهەموودنیادڕك بێ،تۆهەرگوڵ بە.

٥ـ گەرلەسەرمارەق بویتەوە،بەرگی ناپاکی لەبەرمەکە.

٦ـ باگورگ بتخوالەمبەرەوە،بەسەرپردی نامەردامەپەڕەوە.

٧ـ بەگریانی کەس پێمەکەنە،مەهێڵەکەس بەگریانت پێبکەنێ.

٨ـ مافی کەس مەخۆ،بۆمافی خۆشت بجەنگە.

٩ـ نهێنی خۆت بەهەمووکەس مەڵێ،نهێنی خەڵکیش بپارێزە.

١٠ـ گەرکەسێك دڵی شکاندی،تۆدڵی مەشکێنەچونکەپڕکردنەوەی دۆڵێك ئاسانترە لەچاکردنەوەی دڵێك.

# بەدوای دنیادارامەکە..مردن بەدواتارادەکا

دنیاوقیامــەت وەك رۆیـشتنەبەرەورۆژهەلآت یـان رۆژئاوالەهــەرکامیان زیاترنزیـك بییــەوە ئەوەبەوئەندازەلەوی تریان دوردەکەویتەوە،زۆرن ئەوانەی بێ قەناعــەتن چاوبرسی شـەیدای (کاسەوقاسـەن)وهەموهــەولێکیان بۆتــەماعی دنیایــەو شــەڕی کورسـی وکولێرەیـان کـردو سـەرەنجام لــەنیوەی ڕێگاکــەوتن وشــەرمەزاری دنیـاودوارۆژبون! خوالەقورئاندابۆجومعــەو عیبادەت کەتوێشوی قیامەتەفەرمویەتی(فاسعَوا..سـابقوا..واتـە:بەهەڵـەداوان پەلەبکـەن، پێشبڕکەبکەن،هانمان دەدات کەبۆقیامەت بەتەماع بین،بەلآم بۆدنیا(فامشوا..)بەرۆیـشتنی ئاسایی بۆی بچن پەلەمەکەن،ئیمامی عەلی دەفەرمویت( الدنیا أولهاعناء،وآخرهافناء،في حلالها حساب،وفي حرامهاعقـاب)،پیغەمبـەرمان دەفـەرموێ(الـدنیا مزرعـةالآخرة) دونیـا کێلگــەی دوارۆژە،کەواتەهەرگیزرێگامەدەومەهێڵەئـەم فرسـەتەزێرینەت لەدەسـت بـچێت، خۆت مەدۆڕێنە خۆت مەفرۆشە،ئەبیتەچەکی دەستی ئەمو ئەو بـەئارەزوی خۆیـان بـەکارت بێنن بۆئەوەی جێگای خۆیان خۆش بکەن، هەرگیز بیرلەوە مەکـەرەوە بڵێیـت بالـە دونیابـە ئارەزوی خۆم ڕابوێرمو،لەرۆژی قیامەت چی دەبێت بابەبێت،ئێمەلە ژیـانی دونیاجێنـشینی پەروردگارین بۆماوەیەکی کـەم ودیاریکراوتاپـەروردگارمان بپەرستینولەفرمانی دەرنەچینو سنورەکانی نەبەزێنین،ئەبێ هەست بەبەرپرسیاریەتی بکەین لەوئەر کـەی پێمـان سـپێردراوە ،پەروردگاردەفـەرمووێ(وماالحیـاة الـدنیاالامتـاع الغـرور) ژیـانی دونیاماوەیەکـە زۆرکـەمو کورتەهەمووکاتێك مەترسی مردنت لە سەرە،بەهەرهۆکارێك بێت بەکارەسـاتێکی کوشندە وەك، ئاگرێك،خنکانێك، ئەخۆشیەکی لەناکاو، خلیسکانێك،وەرگەران یـان ڕوداوی ئۆتۆمبێـل پێوەدانێکی ژەهراوی یان فیشەکێکی وێڵ..،بۆیـەدەبێت هـەموکات ئامـادەبین بـۆمردن بـە تەقواوکردارو گوفتاری چاك،دەسـکەوتەکانی دونیاگـشتی کاتیـەودەروات ..پـارە..ئـافرەت ..خانوو..پلەوپایـە..شـەهادە.. ناوبـانگ، بەتـەنیاجێت دەهـێڵنو کـەلکیان نابێـت بـۆت، پەروردگاردەفـەرموێ:(وماهــذە الحیــاة الـدنیاالالهوولعب وإن الـدارالآخرة لــهی الحیـوان) ،

بەئەندازەی مانەوەکاربۆدنیابکەکەدیارەتەمەن کورتەو زوو ڕادەبری،وەهەوڵبدەبۆقیامەتت بە ئەندازەی ژیانومانەوەت تیایداکەلەچاودنیا (قەترەبە دەریایە) {زەمانەدێت و ڕادەبری وەکی بادی سەباوایە..حەیف بۆو عومرە سەرفی کەین بەبێ هودە لەدنیایە} بۆتەماعی دنیاهەموی بەپەلەیەو کەسیش بەتەواوی نەیگەیشتێ،سەرنج بدەلەم بەسەرهاتەوخۆت بریاربدە لە ژیانی خۆت،ئاخۆ ڕاکردن بەدوای دونیاچ سودێکت پێ دەگەیێنێ، جگەلە ماندوبون وبێئاگابون لەدین‌وژین...لەدەگێڕنەوە کوڕێك بە باوکی دەڵێت: دەمەوێت ئەو ئافرەتەی کە بینیومەوشەیدای جوانییەکەی بووم بیخوازم باوکیشی بەم قسانە زۆردڵخۆش بوو ووتی ئەوکچە لەکوێیە هەتا بۆتی بخوازم کوڕی خۆم ؟ کاتێك ڕۆشتن‌وکچە کەیان بینی باوکەکەی زۆرکچەکەی بەدڵ بووبۆیەبەکورەکەی دەڵێت:کوڕی خۆم ئەوکچە لەئاستی تۆدا نیەوبۆتۆباش نیە،ئەوەشایستەی پیاوێکی شارەزاوبەئەزمونی وەك منە،کوڕەسەری لەقسە کانی باوکی سوورِما،بۆیەوتی نەخێرشتی وانیە تەنها من دەیخوازم،ئاکۆکی دروست بوولە نێوان کورو باوك! بۆچارەسەری کێشەکەیان پەنایان بردە لای مەرکەزی پۆلیس چیرۆکی خۆیان گێرایەوە بۆ زابتەکە، ئەویش وتی کچەکە بهێنن هەتا لێی بپرسین کامتانی دەوێت، کاتێك زابتەکە کچەی بینی زۆرسەرنجی ڕاکێشا بۆیەوتی ئەوتەنها شایستەی کەسێکی وەك منەوبۆمن باشەکەبیخوازم!،ئەوجارەکێشەکەوتەنێوان هەرسێکیان کوروباك وئەفسەرەکە، هەریەکەو بۆخۆی دەویست‌لەناچارچوونەلای وەزیر،بەهەمان شێوەکەوەزیرکچەی بینی پێی باش بووبۆخۆی بێت‌وکەسی ترباسی نەکات تالەکۆتاییدا چونەلای بەرپرسی وڵات‌ومەسەلە کەیان تێگەیاند هەروەك ئەوانی ترکەچاوی بەکچەکەوت حەزی لێکردوپێی وتن تەنها شایستەی کەسێکی بە دەستەڵاتی وەك منە بۆیەئەم کچە بۆمن دەبێت‌ودەیخوازم!کێشەکە زیاترگەورەبوومشتو مڕەکەزیادی کردلەبەرئەوەکچەکەوتی تاکە چارەسەرئەوەیە،من ڕادەکەم ئێوەش بەدوامداڕاکەن ئەوکەسەی توانی بمگرێت ئەوا من دەبمە نسیبی وئەو دەمخوازێت ...بەڵێ ئەوە بووکچە ڕای کردوهەموورایان کرد بەدوایدا،لە پڕێکداکە بەدوای

کچەکەوە بوونو رایان دەکرد هەرپێنجیان کەوتنەچاڵێکی قووڵەوە،پاشان کچەسەیرێکی کردن‌ووتی زانیتان من کێم ؟من دونیام !!! من ئەوشتەم کەهەمووخەڵکی بە دوام دا رادەکەن‌و پێش برکێ دەکەن تاپێم بگەن‌وبەدەستم بێنن،لە دینەکەیان بێئاگادەبن،لە قورئان‌وسونەتەکانی پێغەمبەر بێئاگادەبن،هەتادەکەونەچاڵی گۆڕەوە،بەڵام ناشتوانن پێم بگەن،ئیتربیربکەرەوە،لەکۆتایدابزانەژیان هەیەبەمانای(عَیش،مَعیشَة)کەخواردن وخەوتن وڕابواردن وزاوزێیە،هەمووگیانداران تیایدابەشدارنبگرە ئاژەڵان زیاتریش لەمرۆڤ چێژی لێدەکەن، ئەمجۆرەیان بۆمرۆڤەکان وەك مردو وایەچونکەبێ ئامانج وهیوایە،بەڵام ژیانی بە مانا(الحیاة،حیاة طیبة)ئەوەیەکەدەزانێ بۆچی دەخواوبۆچی دەژی ئەوەژیانی ڕاستەقینەی ئیمانداره کەئامانجداره بۆدنیاودواڕۆژی،چونکەژیانی بێ هیواوئاوات جۆرێکەلەمردن بۆیەئەوانەی بۆخواژیاون هەربەزیندوی لەناودڵان ماون چونکەپێشتربەژیانی ڕاستی(حەیات) ژیاون. مرۆڤی موسوڵمان ژیانی دنیا بەجێگەی تاقی کردنەوە دەزانێ و کێڵگەی دوا ڕۆژە و چاکەی تێدا دەچێنێ ، بەڵام ئەوەی لای موسوڵمان شتێکی هەڵە ونا پەسەندە ئەوەیە کە ژیانی دنیابگرێتە ئاوات وئامانج ،وەبەسەردواڕۆژدا هەڵبژێردرێ ئەوەش ڕەوشتی کافرانەخوای گەورە فەرمویەتی:(وویل للكافرين من عذاب شديد الذين يستحبون الحياة الدنيا على الاخرة ..) ابراهيم (٢،٣)، واتە :سزای توندبۆبێباوەڕان توند ئەوانەی کەژیانی دنیا بەسەردواڕۆژدا هەڵدەبژێرن،بەداخەوە ئێستا بەختەوەری کەم بووە بەهۆی سەرقاڵ بوونی زۆرینەی خەڵك بەپێشبڕکێی دنیادارى باس باسی(مۆدێل ومۆبایل وخانوسەیارە و ......)

کەواتەبڕۆن بەرەوژیانی تاهەتایی ودواڕۆژ(وإن الدارالأخرةَ لهي الحيوان لوكانوايعلمون) بەڕاستی ژیان وخۆشی ڕاستەقینەلەڕۆژی دوایی دایەگەربیزانیایە.

**بەدوای دنیادارامەکەمردن بەدواتاڕادەکا...ئاقڵ کەسێکەبراکەم تەنهاکردەوەی چاك دەکا ماڵی دنیات گەلێ زۆرەبەردەوام کۆیدەکەیتەوە..گۆڕت تەنگوتاریکەبۆیبری لێناکەیتەوە!**

# ڕێڕەوی گوتاری ئایینی کوردستان..

بێگومان رۆڵ وکاریگەری وتاری ئاینی نکوڵی لێناکرێت وقسەی ئەورۆژهەڵاتناسەی بەسە کەوتویەتی:(ئەگەرحەج ووتاری هەینی وزانکۆی ئەزهەرنەبا ئەوائیسلامان لەناودەبرد)، بەڵام گوتاری ئاینی لەکوردستان لەئاستی پێویستدا نیە!چونکەزۆرێك لەوتاربێژەکان لە وتاری هەینی وبۆنەپیرۆزەکانداهەرلەسەر ڕەوتی تەسەوفی کتێبەکۆنەکان وتاردەخوێننەوە کەبەزۆری جەختکردنەلەسەرلایەنی قیامەت وژێرزەوی ودورکەوتنەوەلەباسەکانی سەرزەوی وپرسەکانی سەردەم کەئەوەش لەبەرژەوەندی دەسەڵاتەستەمکارەکانی ڕۆژگارە،بۆیەهەر باسی حەشرونەشرومارودووپشکی دۆزەخ دەکەن وخەڵك دەترسێنن ودەیان خەنەگریان، کە ئەمانەڕاستن ولەپێش هەمومانن،بەڵام خۆنایین دژی ژیانوژیاری دنیانیە،چونکە قیامەتش بەرهەمی دنیایە،دینیش بۆبەرژەوەندی مرۆڤەکانەلە دنیاوقیامەت،دۆستێکم وتی: مامۆستاکەمان هەرباسی مردن وقیامەت ئەکات و ئەڵێ بابەوشێوەیەبمرین؟بەڵام تا ئێستا نەیوتووەچۆن بژین!؟ئەڵێ لەخوابترسن بەڵام پێمان نالێت چۆن لەخوابترسین!وتارەکان زیاتر جەختکردنەلەسەردین کە(مثالیة)نەك لەسەر(تدین)دینداری کە(واقعیة)کردارەدەبێت موسڵمان پیاوی دنیاودواڕۆژبن لەسەرڕێبازی ئیسلامی،بەڵگەشمان ئەوەیەفیقهی ئیسلامی چواربەشەوسێ بەشی بۆڕێکخستنی کاروباری ژیانی دنیایە ئەوانیش بریتین لە: (معاملات ومناکحات وجنایات)،تەنهابەشی(عیبادات)بۆنهێنیەکانی قیامەتە،کە ئەویش هەندێ بەرژەوەندی دنیای تێدایەوەك سودەکانی تەندروستی ڕۆژو و بیرکەوتنەوەی هەژاران، یەك ڕیزی ویەکترناسین وخۆشەویستی لەئەنجامی تێکەڵی بەردەوام لەنوێژی بەکۆمەڵدا،ئەمەش وەڵامە بۆئەوانەی کەدەڵێن ئیسلام تەنهاشتێکی ڕۆحیەولەنێوان بەندەوخوادایەوپەیوەندی بەژیانی دنیاوە نییە!دیارەئەوجۆرەوتاربێژانەش دەیانەوێ دڵی ئەوانەڕازی بکەن کەدەڵێن: دین جیایەلەژین!،پەنابەخوالەژیانودەوڵەتی بێدین!،کەمن ئەوانەی باسی چاکسازی کۆمەڵایەتی وگرفت وقەیرانەکانی ڕۆژگاروپرسەچارەنوسسازەکان دەکەن!یان پرسەنەتەوەیی

وگۆڕانـە ئیجابیـەکانوپێش کەوتنـەکان بکـەن،ڕۆژگارێك بووەکـە عـەرەبوتورك لەڕێگـەی سیستمی ئیسلامیەوەپێشرەویان لەجیهانداکردوەوپاشان بەهۆی ڕەگەزپەرستی وقەومایـەتی لەڕێنماییـەکانی ئیـسلام لایانـدا بۆعەلمانیـەت ونەتەوەپەرستی هێزوپێزیـان نەماوبـچوك بونـەوە تائاسـتی کەمترلەقـەوارەی زایـۆنی! بۆیەپێویـستە پەرەبەکۆلێژوپەیمانگائاینیـەکان بدرێ وهونەری وتـاردان وزانـستی ومێـژو جوگرافیـای کوردلـەپێش ئیـسلام ودوای ئیـسلام بخوێندرێ وبزانرێ، بۆئەوەی وتار بێـژی ئـاینی زاناورۆشنبیروکوردپەروەربێ،چـونکە هەسـت وسۆزی نەتەوایەتی لە سنوری شـەرعداڕێگەپێدراوە،هەولّبدەین وتـاری ئـاینی بەرژەوەنـدی نەتەوەکـەمان بپـارێزێ وپەرەبەسـەرجەم بوارەکـانی ژیـان بـداوەك لایەنـەکانی ئـابوری و ڕۆشنبیری کە ناوەرۆکی دینەکەش گشتگیروهەمەلایەنە دنیاوقیامەتە،شاردنەوەی بەشـێکی دینەکە لەبەرخاتری ئەم وئەوتاوانە لەژێرهەرفشارێکدابێ نابێ وناکرێ تورەبـونی خوابـدەین بەرەزامەندی خەڵك،پاشانیش پێویستەوتارکورتوپوخت وئامانجـداربێ لەپرسـەکانی سـەردەم بێ وبەزمانی سادەورەسەنی ئەوخەڵکە بێت لەگەڵ ڕەچاوی بنەماشەرعیە کانی،نەك لـەکۆڵ خۆکردنەوەبێ!چونکەگوێگربێزارە لەوتاری درێژودووبارە.

# پەتای حیزبایەتی

وەك چۆن نەخۆشی بیروباوەڕوجەستەیی کوشندەیە،پەتای حیزبایەتی کوشندە ترەسەردەمێك بووڕۆژگاروابوو..دەستی حیزب لەهەموشتێك دا بوو!
هەرچەندە دیاردەی حیزبایەتی کاڵبۆتەوەوئەوەی کەماویشەزیاتربەرژەوەندی ماددیەکەیە هێشتویەتیەوە،بەلاّم وەك جگەرەکێشێکی لەمێژینەنیکۆتینەکەی بەتینە،تێکەڵی خوێن بووەوبەئاسانی دەست بەرداری نابن،حیزبایەتیش جۆرێکە لەکۆیلایەتی سەردەم کەبەچاوی حیزبی سەیردەکات ودەرگای (عەقڵ وعیلم)دادەخات!بۆیەکەسی حیزبی ئازادوسەربەخۆ نیەلە بۆچونەکانیدا ودووچاری ناعەدالەتی وبێویژدانی ودرۆودوورویی دەبێت چونکە بەلایەوە پێوەری حیزب سەنگی مەحەکەوتەنهاپەیڕەوی حیزبەکەی بەڕاست دەزانێ ! بۆیەکەسانی حیزبی بەگشتی ڕاستگۆنین،لەحوکمڕانیشدا بەهۆیەوەیاسا سەرەر نابێت!لەبری ئەوەی بڕیاری یاسایی بدەن بڕیارەکانیان سیاسین وپەرلەمانیش هەربەناوهی گەلەئەینا نوێنەری حیزبن،وەك لەوڵاتی خۆمان دەبینین کەحیزب حکومەتەوحکومەتیش حیزبە! سەرەنجام کەیاساسەرودەرودادوەرنەبوو گەندەڵی پەرەدەسێنێ،حیزبایەتی لەژیانی ڕۆژانەماندا ڕەنگی داوەتەوە، لەشێوازی جلو بەرگ وڕەنگی تەسبیح وجۆری مۆبایل وململانێی سەرجەم ڕێکخراوەکان تا دەگەیشتە لافیتەی مردوەکان!ئەویان بەزەرد ئەینوسی وئەمیان بەسەوز! لە سەرکێلی گۆڕەکەیشی بەدروشم وڕەنگی حیزبەکەی فاتیحەی بۆ ئەنوسن، کەسێ مردشەبێتان وازی لێدێنێ حیزب وازی لێناهێنێ !یەکیەتی زانایانیش بە هەمان شێوەی خەڵکەکەدابەش ببون!بەڵێ حیزب بوەتە بتی سەردەم، دەڵێن حیزبایەتی وەسیلەیە بۆئامانجێکی دیاریکراو،لەوپێناوەدائامانجی ئێمەکە کوردایەتی وسەروەری یاسابوبە قوربانی،بەداخەوەکەلەم سەردەمەدا حیزبایەتی بۆکورسی وکولێرەیە!شەڕی قاسەو کاسەیە، بۆیە دوای ئەوهەموو ساڵەهێشتادوونیدارەیی وجیاوازی زۆردەبینرێ!یەکترقبوڵ ناکەن! تەنانەت ئۆپۆزسیۆنێکیان دەوێت کەوەك ئەوان بیربکاتەوە!دوای زیاترلە(٢٠)ساڵ ئەزمون

سەرەڕای دروشمەکانی بەناودیموکراسی ومافی مرۆڤ بەلاّم هێشتا عەقلّیەتی حیزب زاڵە بەسەرهەموشتەکاندا!حیزبایەتیش لەولاّتی ئێمەهۆکاری دوبەرەکی وشەڕی ناوخۆیە، ئازادیش لای ئێمە بۆمەبەستی خراپەبەکاردێنن! وەلەحیزبدائەوەی موخلیصە موفلیسە! ڕەحمەت لەپیرەشاعیرکەوتویەتی:

هەرداریّ لقی زۆرلێبێتەوە ئیترئەوەندەبەرزنابێتەوە
ولاّتیّ حیزبومیزبی تێکەویّ هەرچی دەستی بوبەشی خۆی ئەویّ
هەرچی هەڵئەستیّ ئەڵیّ من حیزبم براڵیم لادە نامەویّ حیزبم!

## مارەبڕین وگواستنەوەوموخێزانداری.. هەڵوێستەوسەرنج *

١) **گرنگی خێزان:** خێـزان واتـە:ژیـانی خۆشەویـستی نێـوان ژن ومێـرد..واتـە: پـەروەردەی منداڵ..ڕێزی دایك وباوك..ماڵـداری وخزمایـەتی وكەسـایەتی..واتـە ڕەوشـتویەهابەرزەكانی ژیان..كەواتەخێزان واتە:ژیان، ئەگەرخێزان نەمازیان دەبێـت بـەژان،بێگومـان خێـزان بـەردی بناغەی كۆمەڵگایە،جائەگەرخێزانەكانمان لەسەربنەمایەكی ڕاست ودروست بەیەككگەیشتن ئەوەكۆمەڵگایـەكی نمونـەی و تەندروسـت فەراهـەم دەبێت،وەبەپێچەوانەیشەوە،بۆیەئیـسلام هەرلەسەرەتاوە گرنگی داوەبە خێزان لەڕێگەی هەڵبژاردنی تەندروسـت ومامەڵـەی دروسـت (حُـسنُ الاختیاروحُـسنُ المعاملـة)،دیارەچـاكترین بنـەمایش بۆدروسـتكردنی خێـزان تەقواولەخوا ترسانە،ئەگەرئەوكوڕوكچەكە لەتەمەنداولەبیروباوەڕولە پیشەدا هاوشان ونزیـك بـون لـە یەكەوە،وەتەقواولەخواترسـان هـەوێنی كارەكـەیان بـوو ئەوەلەژیانـدا پایەداروماـیـەداردەبن لەكۆشـكی هاوسـەریدابەختەوەردەبن چـونكە تەقواسەرچـاوەی هەموخێروچاكەیەكە بەرهەمەكەی ڕاستگۆیی ورەوشتی جوانە كەچاكترین دەستمایەن،بەڵام گەرهاوسـەریەكە تەنهالەسـەربنەمای دینـاورودۆلارو كۆشـك وتـەلاروجوانی یاردامەزرا،كەئەمانـەكاتین وتاسـەرنین ئـەوە دوای ئـەوەی حـەزەكانیان تێربوهۆكارەكـان تـەواوبون بـایی دەبـن دەمەبۆڵەولەیـەك نەگەیـشتنو تـەلاق دێتەئاراوە،لەبەرئەوگرنگیەیەكەخوای گەورەلەقورئانـدا(٧٠)ئایـەتی تایبـەتكردوە بـەخێزان وبەوهۆیەوەلەكتێبەفقهیەكاندابەشـێكی تایبـەتی بـۆدانراوە لـەژێرناوی (المناكحـات)كەبـەزاراوەی ئـەمڕۆیی دەوتـرێ بـاری كەسـێتی........

٢) **شێوازی مارەبڕین وگواستنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویـەتی:(**تـنكح المـراة لأربـع: لِمالهاو لِحَسبِهاولِجَمالهاولِدِنها،فاظفربـذات الـدین تَرِبـت یـداك**)واتـە:ئافرەت بۆچوارشت خوازبێنی دەكرێت:لەبەرسەروەتوسـامانی یـان ئەسـەبونەماڵەی یـان لەبەرجوانیەكـەی یـان لەبەردینەكەی،بەڵام تۆخاوەن دینەكەیان هەڵبژێرەچون بەرەكەتـە(باهـەژاریش بێـت)چـونكە

دینــداری سەرچــاوەی بەهابــەرزەکان ورەوشــتە جوانەکانەوســامانێکی نەبڕاوەوبەردەوامــە، دیارەهەمووبەوەخۆشحاڵین کوڕو کچەکانمان لەسەرشەریعەتی ئیسلام ژیانی هاوسـەری پێـك دێنن،بـەلاَم دەبـێ هەوڵبـدەین بـەپێی تواناژیـان وگـوزەران وگواستنەوەیـشی لەسـەر ئـەو شــەریعەتەبێت کەلەســەری مارەکراوە،بێگومــان دینــداری وئــسلامەتی لەشــین وشــایی و مامەڵــەی ڕۆژانەدادەردەکــەوێ وەك وتــراوە(الــدینُ المعاملــة)نەینابەقــسەهەموو کــەس موسوڵمانی باشە(قسەفەقیرەوهەمووکەس بەلاَم کردەوەکەم کەس) بەپێی هەنـدێ عـورف و عادەتی لاروخواروکاریگەری سلبی ڕۆژئاواهەندێ مۆدیـل پـەیڕەوی دەکـرێ کـە حەرامــەو لەگـەڵ بیروبــاوەڕی ئێمــەی کــوردی موســڵمان نایەتەوە،بەتایبــەت لــەکاتی گواســتنەوەی بوکدا،وەك ڕوتی وتێکەڵی و..هتد، کەدەڵێین ئەوەحەرامەهەندێك دەڵـێن:مۆدیلـەلیان دەی قەیەچ دەکاڕۆژێکەو دەبڕێتەوە!خۆهەمووڕۆژێ شـوناکات،نازانێ کەلەخۆشـترین وگـرنگترین هەنگاوی ژیانیدا خوالەخۆی توڕە دەکات وشەیتان گۆڵی لێدەکات!.

---

* (ئەم بابەتەووتاری بەندە بووە لەزۆربەی هۆڵەکانی شەکراوخواردنەوەی سلێمانی)

**نمونەی مۆدیلی خراپ لەکاتی مارەبڕیندا:**

١ـ هێشتامارەنەبڕاوەکچەکەدەبەنەئارایشتگابۆڕازاندنەوەووێنەگرتن!کەدەبوو ئەوەبۆڕۆژی گواستنەوەبوایە،دوجارمەسرەف!مەجلس چاوەڕێیەتاخاتون لەصالۆن دەگەڕێتەوە!لامان سەیرەبۆچی لەکاتی مارەبڕینداەڕازێندرێتەوە؟!

٢ـ کەمارەکراهێشتا مەلانەڕۆیشتوەبەناوی نیشانەکردنەوەمالی زاواتەسجیلێ گەورەدێنن دەیکەنەچەپلەوهەلپەڕکەوهەل هەلەلێدان تادرەنگانی شەو بێنەوەی حساب بۆمەلاومیوان ونەخۆش وئیسراحەتی دەرودراوسیێ بکەن!.

٣ـ خەلکێکی زۆربانگدەکرێ لەکەس وکاری هەردوولا،مالی بوکیش جاری وایەکرێچین یان خانوەکەیان(١٠٠)مەترەسەربان وبن بان پڕەوشوێنی دانیشتن نیە،لەدەرەوەش ڕێگەوکۆلان پڕدەبێت!پرسیار: ژن مارەکردن ئەوهەموخەلکوقەرەبالغیەی بۆچیە؟خۆشەڕی عەشیرەت نیە

٤ـ هەندێ کەسی ناشایستەوبێ ڕێزوبێ ئەزمون بانگ دەکرێت کەهیچ لە ئاداب ورەوشتی مەجلیسی ژن مارەکردن نازانێت وڕێزلەکەس ناگرێت ومەجلیسەکەناخۆش دەکات تەنها ئاوات وئامانجیان هەلپەڕکەوشاییەوزۆریش بێ ڕێزن بەرانبەرمامۆستاکەوتاری ئاوژگاری دەدات ەلێن:مامۆستادرێژەی پێ مەدەوزۆرلێی مەکۆلەوەئێمەڕێککەوتوین زووتێکی پەڕێنە(عەسری سورعەیە!) جاری وایەکەسێکی زۆربلەوزمان درێژبەحیکایەت وقسەی لابەلا مەجلسەکە کۆنترۆڵ دەکات،یان خەیالیان لای تلفزیۆنەشاشەگەورەکەیە! (lcd).

٥ـ یەکیکی ترلەوگرفتانە:نوێژنەکردنە،کاتێ دەپرسی لەکوڕوکچەکەنوێژ دەکەن؟ نەخەیر! لەدینەکەیان بێئاگان،بەلام لەدنیاکەیان زیرەکن،ئاوی زۆریەی گۆرانی بێژویاری زانەکانی لەبەرەووەستای مکیاجە،دەلێن:فەرموومامۆستا قەراروبڕیارلەکچەکەوەربگرە،کاتێ دەبینی ژورەکەپڕیەتی لەئافرەتی ڕوت و ڕازاوە!نازانم چۆن شەرم لەوخەلکەناکەن،کەحەیاو ئاموس زۆرگەورەوگرنگە لەئیسلامدا،جامامۆستاقەراری چی وەربگرێت وچۆن دەست بکاتەوە بەئامۆژی (دیارەئەوەبەومانایەناکەخەلك هەموی وابێت بەلام حیساب بۆزۆرینەیە).

۳)گرفت وكۆسپەكانی خێزان:

۱ـ شەیتان:كەدوژمنی سەرەكی موسڵمانەسوێندی خواردووەكەلەرێگەكە لایان بدات تەونهابەندەدڵسۆزەكان نەبێت(..ولأغوينهم اجمين الاعِبادكَ منهم المُخلَصين)٤٠/الحجر، لەفەرمودەی پێغەمبەرداهاتووە(ﷺ){شەیتان كۆشكەكەی لەسەرئاوەبەردەوام سەربازەكانی دەنێرێ بۆئاژاوەكەدەگەڕێنەوەلێیان دەپرسێ چیتان كرد؟یەكەم دەڵێ:وام لەیەكێك كردتاكەسێكی كوشت!هیچ نیەتەوبە دەكات،دووەم:دزیم بەیەكێك كرد ئەویش تەوبەدەكات،سێیەم دەڵێ: ئاژاوەم خستەماڵێك تاژنەكەی تەلاقدا!شەیتان ئافەرینی دەكات وتاجی نازایەتی دەنێتە سەر!}چونكە(نەگبەتی ماڵ ئاژاوەیە...تێكشكانی كەژاوەیە) هەڵوەشاندنەوەی خێزان كۆمەڵێك كێشەبەدوای خۆیدا دێنێت وەك دەبینیٚ رێژەی تەلاقدان لە زیادبوندایە!كێشەی سەرەكی لیژنەی فەتوایە!،

۲ ـ **تێگەیشتنی هەڵەلەمانای (قیوامە)**وخراپ بەكارهێنانی لەلایەن پیاوەوە،

۳ـ **دەستخستنەناوژیانی خێزان** لەلایەن كەسی سێیەمەوە لەدەرەوەی خۆیان بەپاساوی هاورێیەتی و خزمایەتی بەنەزانی یان بە نیەتی خراپ یان بۆدژایەتی وتۆڵەسەندنەوە.

## هاوشانی هاوسەران گرنگەبۆپێکەوەژیان:

زۆربەی ژنانی ئەم ڕۆژگارەقوربانی لەدەستدانی کەسێتی خۆیانن خۆی ناناسیّ وقەدرو ڕێـزی خۆی نازانێوبڕیارەکانی سەرپێی وبەپەلەن چون لەسۆزوعایفەوە دەردەچیّ وزودەخلەتیّ بۆیـە زوپەشیمان دەبنەوە،وەك ئەوانەی شویەهاوتەمەن وهاوبیروباوەڕوهاوشانی خۆیان ناکەن! بـە هۆی دەوڵەمەندی وئاڵتون هەندەران بۆیەهۆشیاری خێزانی بەگشتی ولەبواری ئاینی بـە تایبەتی هەوێنی بەختەوەری خێزانەوبنەمای پێکەوەژیانە(کەفائەت)هاوشانی ونزیکی پلـەو پایەی ژنومێردلەسەرجەم بوارەکانی ژیانداهۆکارەبۆیەردەوامیوبەختەوەری خێـزان بەتایبـەت لە:

١ـ لایەنی بیروباوەڕودینداری:چونکە چاکەکاروخراپکاروپاك وپیس فاسق و صالح وەکویەك نین وهاوشانی یەکترنین،خوای گەورەفەرمویەتی{أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًالَايَسْتَوُونَ، (السجدە/١٨)ئایابڕواداروفاسق یەکسانن؟ بیّ گومان نەخێر،بەوهۆیەوەزۆرژن خەساربون زۆر پیاوخەساربون کەدرانەکەسانی ناشایستەونابەرانبەر،بەزۆریش ئافرەت لەسەردین ورەوشـتی مێردە،ئاف ڕەتی قورئان خوێن وموسڵمان خلەتێنراوەودراوەبـەپیاوی بێـدین ونوێژنەکەرهەرلـە بەرنـەوەی لەکۆمپانیاوکـەرتی تایبەتەوسـامانی زۆرەوئـاڵتونی زۆری بـۆکردوەو سـەرئەنجام ئافرەتەکەخۆی دۆڕاندوەوئیـمان وحیجاب ورەوشـتەجوانەکانی لـە دەستداوەوکەوتۆتەشـوێنی مۆدیل،یان نەگونجاونوتەلاّقدراوەودوچاری کێشەی زۆربۆتەوە،زۆرجارئێمـەی مەلاتەلـەفۆنمان بۆدەکریّ لەلایەن ژنەکەوە دەڵیّ: مامۆستامن نوێژخوێنم وپابەندم وموسڵمانم پیاوەکەم هەر کەتوڕەدەبێت وهەر سیّ تەلاّقی فڕێئەداولەجێی خوشك وداکـی لیـان لەوکەسـانەیەکە دەڵـیّ: تەلاّق چیە؟!کەئێمەخۆمان ڕازی بـین!لـەجیاتی پیاوەکەبەخـەم تەوکێشەوەبێت کـە خـاوەنی تەلاّقەوکێشەکەی بەدەستە،ناچارژنەکەخەم دەخوات وهیچیـشی بـۆ ناکریّ؟بۆیـەچاکتروایەبە دین بۆیـەدین،مۆدێل بۆمۆدێـل،وەك وتـراوە(قـەل وەقـەل کۆتروەکـۆتر)وەك لەسـورەتی نـور ئایەتی(٢٦)خوای گەورەفەرمویـەتی:ژنـانی پیسوناپاك بۆپیـاوانی پـیس وەبەپێـچەوانەوە،

تامافی یەکتریش پێشێل نەکەن وژیان یش بەزەبروزۆری ناگوزەرێ،باناقرەتانی بڕوادارچاو لە(ئوم سولەیم)بکەن کەدەوڵەمەندێکی ناوداری وەك(ابوتەلحە)ی ئەنصاری هاتەخوازبێنی ، بەلآم ئەوبە دینـارودۆلاری ئەوکاتەنەخەڵـەتاوپێی وت:هەرچەندەتۆکەسێ نیت کە دەست بنرێـت بەڕوتەوە،بـەلآم بەداخەوەکەتۆبێبڕوای،بڕوابێنەوشـوت پێدەکـەم حەقـە مـارەیم موسڵمانبونی تۆبێت،ئەویش قبولێکردوبەوەش(ام سُلیم)کەسێتی خۆی لەدەست نەدابۆ دنیاوهەم پیاوی شایستەومالی زۆریشی بەنسیب بوو.

٢- کاروپیشە(الحِرفة)،لەدوای هاوشانی بیروباوەڕهاوشانی پیشەیی زۆرگرنگە چون قەردی زێڕلای زەڕەنگەرەوهەریەکەیان ڕێزی پیشەی بەرانبەری دەزانێ خاوەن پیشەیەکی وەك خزمەتگوزاروژێنگەپارێزهەندێ کاروکاسبی سەرجادە وکۆلآن هەر چەندەحەلآڵ ودروستن بەلآم هاوشان نیەلەگەڵ دکتۆروحاکم و بازرگان،بۆیەکچی هەریەك لەمانەبدرێ بەهاوپیشەی خۆی یان هەردووکیان مامۆستابن پزیشك بن پارێزەربن،یان پیشەکانیان لەیەکەوەنزیك بن، بۆئەوەی نابەرانبەری ومـاف پێشێل کران ڕونەدابەکـەم سەیری بەرانبەرەکەی نەکات، بۆنمونەیەکێ لەفلیمەکانی تلفزیۆن باسی لەگرفتی نێوان خێزانێك دەکرد،ژنەکە بڕوانامەی هەبوومێردەکەشـی بازرگـان وسـەرمایەداربوو،بەلآم ژنەکەهەرمنـەتی بڕوانامـەی بەسەردادەکرد،پیاوەکە مالی خەزورانی بانگ کردبۆخوانێکی ئێوارەوژمارەیەك بڕوانامەی ژنەکەی کۆپی کردوکەسفرەڕاخراهەریەکەولەشوێنەکەیەوە بڕوانامەیەکی ژنەکەی لەبەردەم دانان وتی:فەرموون بخۆن!چی بخۆین؟شەهادە! دۆستێکم بۆی گێڕامەوەکە خۆی زانایەو خێزانەکـەی نەخوێندەوارە،مامۆستاکەبەخوێندنەوەونەسـین وکۆمپیوتەرسـەرقالبووەو ژنەکەیشی خۆشی لەوەنەهاتووەوهەربۆلەی بەسەرداکردوەو،ژنانیش حەزیان لە باسکردنی ناومال وقسەکردنی زۆرەومامۆستاش کارەکەی خوێنـدن وخوێندنەوەبوە ژنەکـەش قەدری ئەوپلەوپایـەی لەبەرچاونەگرتووەلێرەدامەبەست ئەوەنیەکـەگوێ بەداواکاری خێزانەکەت

نەدەی بەلاَم وتراوە(نەشیش بسوتیّ ونەکەباب)گرنگ ئەوەیە تاچەند لەیەکتری دەگەن وهەندیّ جارئەوەبوەتەگرفت وکیّشە.

**٣ـ سەلامەتی لەنەخۆشی گەورە**:کەهۆکارەبۆهەلّوەشاندنەوەی گریّبەستی هاو سەری،بۆ نمونەکەسی شیّت وگولی وبەلّەکی هاوشان نیەبەکەسانی تەندروست ، ئەبیّ هەرکام لە نەخۆشیەگەورەکان ئاشکرابکریّن پیّش پرۆسەکە هاوشانی هەر چەندە مەرجیّك نیەبۆ دروستی گریّبەستی هاوسەری بەلاَم مافیّکی ئافرەت وسەرپەرشتیارەکانەو زۆر گرنگەبۆ مایەداری وپایەداری وبەردەوامی بەختەوەری خیّزان، چونکە فاکتەری لەیەکگەیشتن و خۆشەویستیە هاوکات دەتوانن تەنازولیش بکەن لەمافی خۆیان(**اسقاط حق الكفاءة**)واتە: ئەگەرئەوهاوشانیەی باسکرانەبوو هەردوولا ڕازی بوون کارەکەیان دروستەوپیرۆزە، هەموو ئەمانەنیشانەی گرنگی پیّدانی دینە بەخیّزان،وەك لەم فەرمودەیەدا پیّغەمبەری خوا(ﷺ) داواکاری هاوشانی هاوسەرانەوفەرمویەتی:{**تَخَيَروا نُطَفِكُم وانكحواالاكفاءَوانكحوا اليهم**} (رواه الحاكم وصححه)،وەك ئەوەی ئیّستادەکریّ بۆدەزگیرانەکان لەپشکنینی پزرشکی زۆرباشە.

---

* **ئەم بابەتەلەگۆڤاری خیّزان ژمارە(٥٤)بلاَوکراوەیەوە.**

## مەئزونی شەرعی ..هەڵسەنگاندنی لایەنەباش وخراپەکانی

بۆنەوەی بڕیارەکان نەبنەمەرەکەبی سەرکاغەزیان وەك ئەوپەندەی بەسەر نەیەت کەدەڵێ: (چاکی مەکەباخراپ نەبێت)پێویستە پێشترهەڵسەنگاندنیان بۆبکرێت وڕاوبۆچونی ڕوناك بیرانی ئاینی لەسەروەربگیرێ، پرۆژەی مەئزونی شەرعی کەماوەیەك باس وخواسی لێوەکرا بۆرێکخستنی پرۆسەی گرێبەستی هاوسەرگیری بەشێوەیەکی باشترلەرێگەی دیاریکردنی چەندمامۆستایەك لە هەرشاروشارۆچکەیەك بۆئەومەبەستە،تاچەندلەکوردستاندا سەرکەوتو دەبێت، ئایازەمینەوزەمانی ئێرەگونجاوەبۆئەوکارە؟ئایابەزەقی کێشەی مارەبڕینمان هەیە؟ لێرەدا ئەمەوێ بەکورتی تیشك بخەمەسەرسلبیات وئیجابیاتی ئەم پرۆژەیە: بێگومان لایەنی باش وخراپی هەیە،بەلاّم لایەنەخراپەکانی زیاترن،لایەنی باشی هەیەوەك دەڵێن بۆ دانانی سنورێك بۆئەوانەی کە زانانین بەوکارەهەڵدەستن یان بۆئەوانەی کە بازرگانی پێوە دەکەن کەئەمانەکەم بونەتەوەلە ئێستادا،بەلاّم لەبەرامبەردا ئەم لایەنەخراپانەشی تێدایە:

١ـ سەروەری یاساپێشێل دەکات چونکە دادگا دەڵێ ئەبێ کێشەکان بەپێ ی یاسا چارەسەر بکرێ ورێك بخرێن،لێرەداکێشەبۆدادگادەخولقێ،ئایادادگاقبوڵی دەکات؟ئەگەرپەسەندی کرددەبێتەیاسائەوکات لەگەڵ هەندێ یاساکانی دادگا تێك دەگیرێن،ئەگەرقبوڵی نەکرد ئەواخەڵکیش ناچارنابن بچن بۆمەئزونەکە.

٢ـ خەڵکی ئێمەواڕاهاتووەکەمامۆستای گەڕەك یان بەئارەزوی خۆی مەلا یەکی زانادەبات بۆگرێبەستەکەوشانازی دەکات کەفلاّن مامۆستا ناودارەیان بردوە.

٣ـ خەڵکی ئێمەبەزۆری لەشەودا کۆئەبنەوەوئەم کارەئەنجام ئەدەن،ڕانەهاتوە کچە کەبەرن بۆنوسینگەوئایادەوام هەیەیان نا،یانوسینگەکراوەیەیان نا.

٤ـ زانایان ئاگادارن کەبونی زانای ئاینی لەگرێبەستی هاوسەریدامەرج نیە،بۆرێزە.

٥ـ ئەم بڕیارە پەراوێزخستنی هەندێ لەزانایانی ئایینی بەدوای خۆیدا دێنێ، چونکە زیاترئەو مەلایانەدیاری دەکرێن کەجێی ڕەزامەندی دەسەلاّتن و سەرەنجام جۆرێك

کێشەوململانێ دەخاتە نێوان زانایانی ناوچەکە.

٦ـ گونجاوو جوان نیەکەپیشەبۆماموستای ئاینی دیاری بکرێت وبلێین فلاّن ماموستا هی ژن مارەکردنەلئەوەیش بچوککردنەوەی کارەکەیەتی لەکاتێکدا هەموو ئەوە دەزانین کەئەرکی ماموستایانی ئاینی فراوان وهەمەجۆرە.

٧ـ لەولاّتانی دەوروبەرکەنمونەیان پێ دێنینەوەبەوەی نوسینگەی مەئزونی شەرعیان تێدایە بەهۆی خراپ بەکارهێنانیەوەخەلکانی خراپ ئەوهەلەیان قۆستوەتەوە بۆ (زەواجی عورفی وصیغە)کەتەنهابەنوسراوی ئەوان رێك دەکەونوجاری وایەناچن بۆدادگایان لەورێگەیەوە فێلّ لەدادگادەکەن!جگەلەکێشەی یاسایی وکۆمەلاّیەتی.

٨ـ بەهۆی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری ئێستا بازرگانیکردن وپارەی مارە برین زۆرکەم بوەیان هەرنەماوە،چاکتروایە لەجیاتی دانانی نوسینگە مارەبرین هەلّمەتی هۆشیاری خێزانەکان بەرزبکرێتەوە،وەك چۆن دەبینی ئێستا دەتوانین بلّێین: مارە برینی بەزۆروکچی بچوك و ژن بەژن هەرنەماوە،بەهەمان شێوەیش بۆمارەبرین بە گشتی ئەینا مەگەردادگابلّێ ئەوەی نوسراوی مەئزونی لانەبێ گرێبەستی هاوسەری بۆ تۆمارناکەین (کەئەوەش دورەلەیاسای ئەوان) ئەینا جێ بەجێ کردنی مەئزون وکاریگەری وەك بریاری قەدەغەکردنی جگەرەکێشانی بەسەردێت!.

---

* بۆگفتگۆی ئەم تەوەرەبانگهێشت کرام بۆرادیۆی(نەوا)لەگەلّ د.موسەننالە(٢٠١١/٦/١٢)

# بەختیاری خێزان.... بەڕەوشتی جوان

بێگومان ئیسلام زۆرگرنگی داوە بەپرۆسەی هاوسەرگیری ودروست کردنی خێزان، هەر لەسەرەتاوە مەرج وبنەمای بۆداناوەبۆئەوەی خێزانێکی بەختەوەرو سەرکەوتوبن لەژیاندا، چونکەخێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگایەگەرخێزانەکان لەسەربنەمایەکی ڕاست دامەزران ئەوەکۆمەڵگایەکی بەختەوەرفەراهەم دێنن ئامانجی ئیسلامیش لەدروست بونی خێزان بەردەوامی وبەختەوەریە،بۆیەلەو پێناوەدافەرمان بەپیاوان دەکات بەجوانی لەگەڵ ئافرەتان بجوڵێنەوە (وعاشروهن بالمعروف)وەبەهەمان شێوەیش فەرمان بەسەرئافرەتان دادەکات کە دەبێ مێردەکانیان ڕازی بکەن بەهەڵسوکەوتی جوان،وەك لەفەرمودەدا هاتووەلەوەلامی ئەوەی کەبۆچی جیهادیان لەسەر پێویست نەکراوە(حسن تبعلكن يعدل ذلك) بەهەڵسو کەوتی جوان لەگەڵ مێردەکانیان پاداشتی غەزایان دەست دەکەوێت!جائەگەربەختەوەریت ئەوێ لەژیانی هاوسەریدا ئەوەپەنا بەرەبەرهەڵس وکەوتی جوان وشیاوبۆنەو مەبەستە بە کورتی تیشك ئەخەینە سەرهەڵس وکەوتی هەردوولایان:

**یەکەم: هەڵس وکەوتومامەڵەی پیاوان :**

مسوڵمانی ڕاستەقینەکەسێکە زۆربەوردی ئاگاداری ژیانی خێزانیە ولەخەمی بەدەست هێنانی خۆشی وکامەرانییەوبەلایەوە بەختیاری خێزان لەسەروی هەمووشتێکەوەیە، بۆیە نابێ بەچەند شتێکی بێ بایەخ لەدەستی بدەین وشتی بچوك گەورە بکەین،وەك ئەوەی هاوسەرەکەت هەندێ کاری کردووە پرسی پێت نەکردووە،یان ئەگەر هەندێ جاریەگوێی نەکردیت ئیتر تۆش دنیات لێ بێتەوە یەك وبیکەی بەشەڕوهەرا،یان جارێك چێشتەکەی درەنگ پێ بگات یان کراسەکەی بۆئوتو نەکردبی یان یان...،وەك بڵێی قەت چاکەی لەگەڵ دانەکردوی،بەڵکو پێویستە لەبەرانبەریانداوەفاداربین وڕێزوخۆشەویستی و قسەی خۆش وجاربەجارشیرینی یان چەپکێ گوڵی پێشکەش بکەو دەست خۆشی لێ بکەلەسەرکارو خزمەتی ماڵ ومنداڵی وپێکەوەسەردان وگەڕان بکەن،تەنانەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)

لەبەردڵی خەدیجەی خێزانی کەسوکاری خەدیجەشی خۆشت دەویست،تاپاش مردنیشی هەواڵی هاورێکانی دەپرسی،جارێکیان لەگەڵ پیرێژنێك زۆروەستاوقسەی لەگەڵ کرد، عائیشە لێی پرسی ئەم پیرێژنەکێ بوونەوەندە لەگەڵی وەستای؟پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەوە یەکێك بوولەهاورێکانی خەدیجەوکاتی خۆی سەردانی دەکردین.ئایا پرسیارت لەخۆت کردووەکەئەگەرپێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ هاورێیانی خەدیجەدا ئاوا دڵسۆزی نواندبێ ئەی دەبێ لەگەڵ خەدیجەداچۆن بوبێ؟! ئەی جەنابت چۆن بەختیاری خێزان بەدەست دێنی کەهێشتا بە چاکی خزمی خێزانەکەتناناسی چونکە دەوڵەمەندنین یان لەحیزبەکەت نین.. لەتەنانەت لە کاتی ڕودانی کێشەو هەرادا دەبێ پشتی خێزانەکەت بگری نەك بەقسەی خەڵك یان بە گومانی خۆت یان هەندێ شتی بێ بنەماوبەڵگە بەپەلە حوکم بدەی ماڵی خۆت وێران بکەی ومناڵەکانت بێنازبکەی وخۆت بکەیتەبنێشتەخۆشەی سەرزاری خەڵك ئەوەتا لە ڕووداوی(بوختان کردن بۆعائیشە)پێغەمبەرمان(ﷺ)هیچ خۆی تێك نەداوبەرواڵەت ڕەوخۆشەکەی جارانی هەربەردەوام بو،بەلاّم پاش ئەوەی کە تەواوبلاّوبۆوە پێغەمبەر (ﷺ)بەهێمنیەکی پرسۆزەو پێی ووت(ئەگەرخوانەکردە هەڵەیەکی وات کردووە ئەوە تەوبەبکەوپەشیمان بەرەوە،ئەگەرواش نیەئەوە خواپاکیت دەردەخات)ئیتر نازانم بۆچی پیاوانی ئیسلام چاولەپێشەواکەیان ناکەن،لەسەرپچوکترین شت هەڵدەچن ونارامیان لێ دەبڕێتوکێشەکان گەورە دەکەن وزۆرجاریش پەلاماری تەلاّق ئەدەن وهەرئەوەشەکە دەبینی دادگاکان ڕۆژانەزۆرلەم سکالاّوکێشانەیان ڕووبەڕوودەبێتەوە،بەلاّم ئەگەر هەڵسوکەو تمان بەڕاستی موسڵمانانە بێ ئەوە بەختەوەردەبین ،وەلە مێژووی زێڕینی ئیسلامدا زۆرنمونەمان هەیەکەلەپێناوپاراستنی بەختیاری خێزاندا چاویان لەزۆرشتی گەورە نوقاندووەو ئاویان بە ئاگرداکردووە نەك بەنزین،دیارە لەم بارەوە زۆروتراوەونوسراوە،ئامەوێ زیاترلەسەری بڕۆم وکۆتایی بەم خاڵە دێنم کەوتەیەکی خاتوو(توروتیدکس)وەدەڵێ:(بۆخاتری خوا بۆچی پیاوان تێناکۆشن لەپێناوبەختیاری خێزاندا،ئەی بۆچی لەپێناودەسکەوتنی ملیۆنێ ڕیاڵدا زۆر

تێدەکۆشن وترسناکترین ڕێگە دەگرنەبەر،دەی کامیان بەختیاری زیاتر تێدایە؟ پول وپارە یان ژیانی پڕلەشادی وبەختەوەری لەکۆشکی گونجاوی هاوسەریدا)

**دووەم: هەڵسوکەوتی ئافرەتان :**

لەپێناوبەختەوەری خێزانـدا دەبێ هەردوولا دەست باری یەکتربگرن وئەرکی خۆیان بەرانبەریەکترجێ بەجێ بکەن،بەنسبەت خوشکانەوە چەند شتێکی بچوك وناسان هەیەئەگەرجێبەجێیان بکات دڵنیای دەکەم کە مێردەکەی هەر گیزبیرلەجیابونەوەوژن هێنان ناکاتەوە،وەك:بەرویدا هەڵنەشاخێ وبەرپەرچی نەداتەوە(زمان درێژی و دەمە دەمە) نەکات،لەناوخەڵکدابەدرۆی نەکاتەوە و گاڵتەی پێ نەکات،بێ گوێی نەکات لەکاتی هەبوون ونەبونداڕوخۆش بێت بەرانبەری،ڕێزی خزمەکانی بگرێ،بەتایبەتی دایکی،کەشتێکی لەبازاڕهێنایەوە مەڵێ جانەوەچیەوکێ دەیخوات،ماڵی باوکیشت خۆش بوێت،بیانوی زۆری لێ مەگرەمەدحی بکەوبەسوکی سەیری مەکە،جابزانەکەهەموودنیا(مەلیکەجەمال) بێت دەیگۆڕێتەوەبەتۆ؟بەڕاستی ئیتاعەکردنی ژن بۆ پیاوەکەی جگەلەوەی کە پێویستەلەسەری مایەی خۆشی و شادی وبەختەوەریە،دەڵێن جارێك پاشایەك خەیاردەخوات لەناویاندا خەیارێکی تاڵ دەکەوێتە بەردەمی خێرا بەخزمەتکارە کەی دەڵێ ئەم خەیارە بخۆ،ئەویش هەمووی دەخوات، پاشادەڵێ:ئەگەبەت خۆ ئەوە تاڵ بوچۆن بۆت خورا؟خزمەتکارەکە لەوەڵامدا وتی:قوربان زانیم تاڵ بو بەڵام مادام هی دەستی تۆبوو زۆربەلەزەت بوولەلام لبەم هەڵوێستە لای پاشا زۆرخۆشەویست دەبێ و یەکسەرئازادی کردچاکە چاکەی لەدوایە،بەڵام ئەو بلێ سیرئەم بلێ پیازبەوەژیانەکەیان بەرەوگرفت وکێشەی خێزانی دەبات و خۆشەیتانیش نەخەوتووە،ژیانی ناوخێزان خۆشی وناخۆشی تێدایەلەکاتی ڕوو دانی هەرناخۆشیەك تۆئارام بگرەوبەقسەی خۆش لەگەڵی بدوێ چونکە وتراوە برینی شیروتیرزووچاك دەبێتەوەبەڵام برینی قسەچاك نابێتەوە،بۆیە قسەی خۆش و زەردەخەنە دوژمن دەکا بەدۆست،پاشان خوشکەکەم هەوڵ بدەوەك هاوسەرەکەت بژی خۆت لەو

بەزیاترمەزانە وەك پێشینانمان وتویانە (ئەگەر ئەوشوان بوتۆنان بچنەوە)وەك بەسەرهاتی ژنە شوانەکەجارێك عائیشە خاتون(خ) فەرموی بەپێغەمبەر(ﷺ)ئایاهیچ ئافرەتێك هەیەلەمن باشتربێت، ئەویش فەرموی بەڵێ، بچۆلای ژنی فلانە شوان جاکاتێ کەچوو سەیریکرد ژنەکەلەبەرخۆرەتاودانیشتوە وئاووخواردنەکەشی لەبەرهەتاوداناوەلێی پرسی بۆچی لەبەرئەم هەتاوەدانیشتوی؟وتی چونکە مێردەکەم لەبەرهەتاوە ئەی ئەو ئاوونانە بۆلەبەرگەرماداتناوە ؟وتی:چونکە ئەوئاوی گەرم دەخواتەوەونانەکەی لەبەرهەتاولەکۆڵ بەستوە!!ئەك بڵێی ئێستا مۆدیلی ئەوەیەوخانوومالّی فلانە کەس ئاوایەودەبێ بۆمنیش بکڕی، بێگومان ئیمانداری سەرچاوەی حەیاو حورمەت وبەختەوەری وهەمووشتەچاکەکانە، هەربیروباوەڕیش دەتوانێ ئەو جۆرە ئافرەتانە دروست بکات لەهەموسەردەمێکدا،دەڵێن لەم سەردەمەی خۆشماندابرایەك لەگەڵ خێزانەکەیدا دەچن بۆلای دکتۆر،پاش فەحسکردنی پیاوەکە،دکتۆرەکەدەڵێ چیتان لێ بشارمەوەوتۆتواناى پیاوەتیت نیە،هەرلەوێ ئەوخوشکە بەئارامیەوە بەدکتۆرەکەی ووت من (٩)ساڵە ئەم حاڵەتە دەزانم،دکتۆرەکەوتی:باشەئەی چی وای لێکردوی وازت لێ نەهێناوە؟ لەوەڵامدا خێزانەکەی وتی تەنها لەپێناوبەردەوامی کامەرانی وبەختیاری نێوانمان !!

بۆچی ژن ومێردەکانی ئەمرۆچاوناپۆشن لەشتەبچوکەکان وهێلانەی بەختیاری پێ دەشێوێنن وکەکاریش گەیشتەجیابونەوەیەکەم زەرەرمەند ئافرەتە و کۆمەڵگای نەفامیش بەچاوێکی ترسەیری دەکەن!کەواتە خوشکی بەڕێزتابۆت دەکرێت خۆت بکە بەزەوی بۆهاوسەرەکەت ئەویش دەبێتەئاسمانی تۆ.

# ئیسلام : نەرم ونیانە میهرەبانە..لەمامەڵەی ڕۆژانە

دوای شکستیان لەبواری فیکروئایدیاوەنەیارانی ئیسلام کەوتنەچەواشەکاری وتۆمەت هەڵبەستن ونیشاندانی ئیسلام بەتیرۆروتۆقاندن!دەڵێن سەرچاوەی توندوتیژی وهەڕەشەیە، بۆئەومەبەستەش هەندێ نیوە ئایەتوفەرمودەدێنن ولێکدانەوەی خراپ ونابەجێی بۆدەکەن، بۆئەوان ڕەوایەکەخاوەنی هێزوچەکی کوشندەوترسناك بن کارەسات ومەرگەسات بخوڵقێنن هەردیموکراسین ماف پەروەرن..ڕزگارکەرن نەرمو نیانن..میهرەبانن!بەلام بۆ موسڵمان نابێ نینۆکی هەبێ خۆی پێبوخرێنێ چەقۆیەك یاقسەیەکی حەقوڕەق بۆی ناڕەوایە! ڕاستەوخۆ تۆ مەتی تیرۆروتۆقاندنوتوندوتیژی دەدەنەپاڵ!کاتێ پێوەرنامێنێ ڕاستیەکان پێچەوانە دەبنەوە، ئەوەتالەدەیان ئایەتوفەرمودەداهانی موسڵمانان دەدات بۆنەرم ونیانی ولەسەرخۆبون و تەسامح ولێبوردەیی،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی{اِنَّ الرِفقَ لایَکونُ فـی شَـیِ الازانَـهُ، ولا یُنزَعُ مِن شَیِ الاشانَهُ}(مسلم)واتە: نەرم ونیانی لەهەرشتێکدابێت جوانی دەکات وکەلێی دەرهێنراناشیرینی دەکا) هەروەهالەفەرمودەیەکی تردا کەماناکەی بەم شێوەیە:(خوای گەورە نەرمونیانەونەوسیفەتەی لاخۆشەویستە،وەئەوخێروپاداشتەی کەلە سەرنەرمونیانی دەیدات بۆشتی ترنایبەخشێت،یان بەوشێوەنادرێت بەتوندوتیژی) (ابوهُریرە/خ)بۆمان دەگێڕێتەوە: دەشتەکیەك لەناومزگەوت میزیکرد،خەڵکەکەویستیان پەلاماری بدەن پێغەمبەری ڕەحمەت فەرموی وازی لێبێنن ودۆلکەیەك ئاوبێنن بیکەن بەسەریداوئامۆژگاری کابرایکرد،وفەرموی ئێوەکارئاسانی بکەن وشت قورسو خراپ مەکەن (پێشەوابخاری هێناویەتی)گەرئەوەبەراورد بکەین لەگەڵ هەندێ لەکێشەکانی ناو مزگەوتەکانی ئەم ڕۆژگارەدەبینی لە سەرشتی لاوەکی بچوك دەیکەن بەهەراوکێشەو لە جیاتی ئاوبەنزینی پێدادەکەن!عائشەی دایکمان فەرمویەتی:ئەگەرپێغەمبەر(ﷺ) سەرپشك بکرایەلە نێوان دووشتدا،کامەیان ئاسان بوایە ئەویانی دەکردگەرتاوان نەبوایە، وەلەسەرخودی خۆی تۆڵەی لە کەس نەسەندووەبەلام گەر سنورەکانی خوابشکێنرایەلەبەرخوا تۆڵەی دەکردە وە(بخاری ومسلم)،دیارەتوندوتیژی لە

شـوێنی خۆیدائازایەتیـەوەك لەمەیـدانی شـەڕ وڕوبەڕوبونەوەدالەبـەرخواوەك دەبینـی خـوای زاناودانابەم شێوەوەسفی ڕەوشتی پیـاوانی دەوری پێغەمبـەردەکات(..وَالَّـذِينَ مَعَـهُ أَشِـدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَـاءُ بَيْـنَهُمْ ..) لەسـەرکافران تونـدوئازابون بـەلاَم لەنێوخۆیانداواتـە(لەگـەڵ موسـڵمانان)نـەرم و نیـان وبەسۆزبون،بەپێـچەوانەی مامەڵـەی هەنـدێ لەموسـڵمانانی ئـەم سەردەمە! بەسەبۆگەورەیی ئەم دینەنەیارانیـشی دانیـان بـەوە داناوەکەئیـسلام لەمامەڵـەی ڕۆژانەیدانەرمونیانە(جۆن ئیسپۆزیتۆ)مامۆستای زانکۆی (جۆرج واشـنتۆن)وتویـە {ئیـسلام ئاینی میهرەبانی وپێکەوەژیانەودورەلە توندوتیژی} بائێمـەش لەماڵـە کانمانەوەدەست پـێ بکەین نەرم ونیان ولەسەرخۆبین تادەگاتە شوێنی کارو دامودەزگاکان وبەڕێوەبەرەکانوتاپلـەو پۆستەبەرزەکان کەئەوان سەرمەشق وڕابەرن هـەمووبان نـەرمونیان بـن لەیەکتربـەقین نـەبین بەڵکوهەوڵی لێکگەیشتن بدەین، پەند لـەڕابردووەربگرین و بـزانین کەتوندوتیـژی وڕقوتۆڵـەو کاردانەوەکارەساتی بـەدواوەبوەوکلتورێکی نابەجێیـەودورە لـە ڕەوشـتی بـاوەڕدارانی ڕاسـتە قینە،ئەنجامی ئەوپەروەردەئیمانیەبوکەموسڵمانان لەگەڵ جولەکـە وگاورەکاندا پێکـەوەژیاون، مێژوبۆمان دەگێڕێتەوەکەجولەکەیەك ویستبوی خانوەکەی بفرۆشێ بـە(٢٠٠) دینارکـەلێیان پرسیوەبۆوابەگرانودووقیمەت دەیفرۆشی؟ لەوەلاَمداوتبوی (١٠٠) دیناری حـەقی خانوەکـەو (١٠٠)دینارەزیادەکەش هی جیرانەتی عبداللەی کوڕی مویـارەك کەچاکترین جیرانـەلئـەی چی دەڵێی بەوموسڵمانەی لەبەر خراپـی هاوسێکەی خانوەکـەی دەفرۆشـێ بەهـەرزان!یـان دەنگیان پێکەوەنیە چونکەحیزبەکانیان جودایە!،خوای گەورەدووپێغەمبـەر (موسـاوهاروون) دەنێرێ بۆلای فیرعەون پێیان دەڵێ کەبە شێوەیەکی نەرمونیان قسەی لەگەڵدابکەن(فقولالـە قولاًليناً ..)دەی ئەمەپەندوئامۆژگاریەبۆمرۆڤەکان، خۆخوای گـەورە بەدەسـەلاَتەولەفیرعەون ناترسێ،دیارەوەك زۆربەی دەسەلاَتدارەستەمکارەکان ئەویش قبوڵی نەکردوهەوڵی سـەرکوت کردنی دان،بۆیەکەجادوگەرەکانی باوەڕ یان هێنا فیرعەون وتی(لأقطعَنَ أيـديَكم وارجُلَكـم..) وتی دەست وقاچتان دەبڕمەوە وهەڵتان دەواسـم بەقـەدی دارخورماوە،ئەوساوئێستاش هـەر

دەسەڵاتدارە ستەم کاروبێبڕواکانن هەڕەشەو توندو تیژی چەکی دەستیان بوەبۆسەرکوتکردنی بەرانبەرەکانیان،بەڕێزان:حەق وڕاستی لای هەر کەس بولێی وەریگرە،چونکە گرنگ ئەوەیە کەچی وتووەنەك کێ وتی،(ئەبوهورەیرە) شەوێك پاسەوانی خورماوخواردەمەنی زەکات بووەکەکۆکرابۆوە،دووسێ جارشەیتان لە شێوەی زەلامێك هەوڵیداخواردنی لێ بدزێت، لەجاری سێیەمداگرتی وپێی وت ئەتبەم بۆلای پێغەمبەرﷺ ئەویش ترساوزۆر پاڕایەوە پاشان شەیتان وتی بە(ابوهُریرە) شتێکت فێردەکەم گەرشەوانەبیخوێنی پارێزراودەبی لە شەیتان ئەویش پێی وت ئایەتولکورسی بخوێنە،بەیانی بەسەرهاتەکەی بۆپێغەمبەرگێڕایەوە ئەویش فەرموی:ئەوە شەیتان بوە(صدق وهو كَذوب)ڕاست دەکات بەلاّم خۆی درۆ دەکات ، ئەیفەرموودرۆیەچونکەشەیتانە،ئێستاش هەریەکە بەشێك لەحەق و ڕاستی لایەوباحیساب بۆبەرامبەرکەمان بکەین،مەڵێ مادام لەگەڵمدا نییەیان لەوحیزبەیەهەموی درۆیە،بابەچاك بڵێین چاك بەخراپیش بڵێین خراپ(ولاتبخسُ الناسَ اشیاءهُم)،ئەگەردەتانەوێ تەمەنتان درێژبێت ولاّت ئاوەدان بێت بائەم دووشتە ئاسانەئەنجام بدەین(حَسنُ الخُلق وحُسنُ الجِوار) واتەڕەوشتی جوان و هاوسێیەتی کردنی چاك ولاّت ئاوەدان دەکات وتەمەن درێژدەکات، وەبە پێچەوانەوە بەدڕەوشتی ودژایەتی جیران ماڵی دنیاودواڕۆژمان وێران دەکات،کە هەمو ئەمانە دەرەنجامی مامەڵەی ڕۆژانەی کەسی نەرمونیانە،ئەیناوەك ڕێبازو ویاساسنوری حوکمەکانی ئیسلام نەگۆڕەوکۆنکرێتیەو زیادوکەمی لێناکرێت ، بێگومان سۆزوبەزەیی ونەرم ونیانی(صبر)ودان بەخۆداگرتنی پێویستەودەبێ باجەکەی بدەی وەك وتراوە: (سەبرتاڵەوبەری شیرینە)چون جاری وایەخەڵکانی بێباروبێوەفالەبەرانبەردابۆمەبەستی خراپ ئەوهەڵوێستەدەقۆزنەوەئەوەش تاقیکردنەوەیەوە وتراوەنەرمەن ڕێزتگرت شەرمەزاردەبێ بەلاّم نارەسەن تابێ هاردەبێ)چینیەکان دوای (٥٠٠٠)ساڵ لێکۆڵینەوەگەیشتنەئەم حیکمەتە:(ئەوەی بەنەرمونیانی هەنگاوبنێت،زۆردەڕوات)،باپیرانی ئێمەش جوانیان وتوە: بەتوندوتیژی کارناچێتە سەر ...ماربەقسەی خۆش لەکون دێتە دەر.(پەندی پێشینان)

# هیممەت بەرزی شێرانە..نیشانەی هێزی ئیمانە

ورەبــەرزی:پــەیمان وســوربونی دڵەلەسەرشــتێ پــێش ئەنجامــدانی کارەکەچــاك بــێ یــان خراپ،ورەبـــەرزی لەدڵەوەیـــە،دڵیش کـــەس دەســـەلاتی بەسەرداناشـــکێ جگـــە لەخاوەنەکەی،جاوەك چۆن باڵندەبەباڵ ئەفڕێ،بەهـەمان شـێوەش مـرۆڤ بەنیـەت وهیمـەتی ئەفڕێ بەرەوبەرزی بۆرزگاربونی لەکۆت وبەندی مـادی و مەعنـەوی (ابـن قتیبـە)لەهەنـدێ کتێبی حیکمەتداهێناویەتی(عیون الاخبار/٣ /٢٣١)مرۆڤـی هیممـەت بەرزنەگەرکـەوتیش نەفسی هەربەرزی دەوێ وکەوتن وژێر دەستەیی قبوڵ ناکا،وەك بڵسەی ئاگرهەرچـەندە پێـی پیائـەنێ تـا بکوژێتـەوە بـەلاّم ئـەوڕازی نیەوهەربەرزدەبێتەوە،بەتایبـەت موسـڵمان نیـەت وهیممـەتی لـەپێش کـاروکردەوەیەتی،هەرچـەندە بۆیـشی نـەکرابێ چـونکە ویـستویەتی ومەبەسـتی بووەبۆیـەبۆی نوسـراوە:پێغەمبـەر(ﷺ)فەرمـوویـەتی(مَـن هَـم بِحَـسنةِ فَلَـم یَعملهاکَتبها الله عِندهُ حَسنةً کاملة...)(بخاری)واتە هەرکـەس ویـستی بوچـاکەیەك بکـات وبۆی نەکرا،خوای گەورە چاکەیەکی بۆدەنوسێ،خۆئەگەرویـستی بیکـات وئەنجامیـشدا،ئەوە یـەك بـە دەتایـەك بـە(٧٠٠)بـۆی دەنوسـرێ، وەلەفـەرموودەی تـردا هاتووەکەپێغەمبـەر (ﷺ)(هەرکەس بە ڕاسـتی داوای شـەهید بکـات خـوای گـەورە دەیخاتـە ڕیـزی شـەهیدان گەرلەسەرجێگەی خۆیشی مردبێ)(مسلم وابوداود والنسائی وابن ماجه) ئەوەهەموی پاداشتی نیەت وهیمەتی بەرزوبڵندەکە بەڕاستی ویستویەتی و هەوڵیشی بۆداوە هەرچەندەبۆی ئەنجام نەدراوە،چونکە هێزی موسڵمان لـە نیـەتی دڵـەوە سەرچـاوەی گرتـووە،وەك خۆشەویـستمان سـەبارەت بـە تـەقوا فەرموویـەتی(التقـوی ههنـا) دەسـتی خـستە سـەردڵی وفـەرموی تەقوالێرەوەیە،جا کەسی ژیروئازابەهۆی ورەبەرزی وحەزوئارەزوی ڕاستی نیەت پاکی بۆکارە کەی گوێ بەئازاری دڕك وداڵی سەرێگە نادات،چونکە هێزوژیانـەوەی دڵـی بەسـراوەبەهێزی هیمـەت ونیـەتی دڵی،کەهاندەرەبۆخۆشەویـستی کارەکـەی و سـەلامەتی دڵ لـە دوودڵـی وخـەمۆکی وبـێ هێـزی و بێـزاری...،بۆیـە ورە بـەرز ماندونەناسـەوپیری نـازانێ ،پێـشەوا

بوخاری ڕەحمەتی خوای لێبێت لە(صحیح) کەیدا دەڵێ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)بەڕێزی فێری زانست وزانیاری بون(ابن معاژ)دەڵێ پرسیم لە(أبا عمرو)تاکەی گونجاوەمرۆڤ فێربێ وبخوێنێ ؟ووتی:تاله ژیاندابێ چون ورەبەرزماندونەناسەومتمانەی بەخۆیەتی،بۆیەسەرەنجام بونەڕابەر لەسەرجەم بوارەکانی ژیانداوجوانترین نمونەی ژیانیان پێشکەش بەمرۆڤایەتی کرد،وەبەپێچەوانەیشەوەدیارەخەڵکانی بێ هیممەت لەناخداڕوخاووترساو داماووجێ ماووشەرمنن چونکە متمانەی خۆیان لەدەست داوەناتوانن هەنگاو بنێن وبارن بەسەرکۆمەڵگاوەوسەرەنجام بێ هیممەتی والەمرۆڤ دەکات دوای شکست هەڵنەستێتەوەوناماجی ژیانی لەدەست بدات،بۆیەپێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)لەپاڕانەوەیدادەیفەرموو(اللهم انی أعوذبكَ مِنَ العجزِوالكَسَل..)واتە:خوایەپەنا دەگرم بەتۆ(بەدورم کەی)لەبێدەسەلاتی وکەم توانایی وتەمبەڵی،پێشەوا عەلی (خوالێی ڕازی بێت)دەیفەرموو:ئەگەر هەووڕازی بەویارودۆخەی تیایدا دەژین(بێ هەوڵوهیممەت)ئەوادنیاکاول دەبێ، زۆرن ئەوانەی متمانەیان بەخۆنەماوەبۆیەنازانن چۆن بژین و سەرەنجام نازانن چۆن دەمرن چونکەلەحیکمەت وفەلسەفەی ژیان بێئاگابون وشکستیان خوارد،قیامەتیش بەرهەمی دنیایەوچی بچێنی ئەوەئەدوریتەوە.

هیممەت بەرزی پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل:

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ)دەبێتەمیوانی عەرەبێکی دەشتەکی،زۆرڕێزلەحەزرەت دەگرێ و خزمەتی دەکات،ئەویش پێی دەفەرموێ:چیت دەوێ داوابکە،کابرا وتی:ئەی نێراوی خوا، حوشترێك بەپێداویستیەکانیەوەوبزنێك کەخێزانم بیدۆشێ،ئەمەی دوو جاردوبارەکردەوە، حەزرەت(ﷺ)پێی فەرمو(نەت توانی وەك پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل بیت)هاوەڵان وتیان پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل چییە؟فەرمووی:کاتێ موسی(ﷺ)ویستی لەگەڵ بەنی ئیسرائیلداشەودەرچێ،ڕێی لێ تێك چوو،زاناکانیان وتیان:ڕەنگە حیکمەتی تیابێت ونبوین وڕێمان لێ تێك چووە، بۆئەوەی هەر خۆمان نەڕۆین ودەمانەوێ پێت بڵێین کەحە... تی

یوسف پەیمانی لێوەرگرتوین ئەگەر لە میسردەرچوین لاشەی ئەویش لەگەڵ خۆمان ببەین. .موسی فەرموی:کامتان دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە؟وتیان:تەنها پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە،ناردی بەدوایداوکەهات پێی فەرموو: قەبری (یوسف)م نیشان بدە،وتی : پیشانت نادەم هەتاوەکونەبمەهاوەڵت لەبەهەشتا ئەویش پێی ناخۆش بو(ڕەنگە لە بەرئەوەبێ کەداوای چونەبەهەشت بەدەست ئەونیەیان لەبەرئەوەی ئەوپرسیارەی بۆپیشاندانی قەبرەکە،کەی ئەوەدێنێ وئەوەندە گەورەیەبەرامبەر بەهەشت بێ؟) خوای گەورەشروشتی بۆنارد،کەپەیمانی بەهەشتی بدەرێ. .کەپەیمانی چونەبەهەشت وهاوەڵیەتی دایە،ئەویش شوێنێکی پیشاندان کەئاوی تیاوەستابوو،وتی:ئاوەکەلابدەن کە لایان بردوتی دەی ئێرەهەڵکەنن،کەهەڵیان کەندلاشەی حەزرەتی یوسف دەر کەوت، لاشەکەی هیچ تێك نەچوبو!کەدەریان هێنادەدرەوشایەوەورێگای بەوشەوە بۆڕوناك کردنەوەورێی خۆیان دۆزیەوە،ئەمەش بەڵگەیەکەئاینی ئیسلام زۆرگرنگی داوەبەورەبەرزی ودورکەوتنەوەلەتەمەڵی وسستی وکەمتەرخەمی وترسان ...

# تەقوا : چیەوچۆنە ..گرنگی وجۆرەکانی و نیشانەکانی

أ) پێناسـە: تەقوالەزمانەوانیداواتـە:پارێزگاری،وەلـەزاراوەی شەرعدامەبەسـت پێـی خـۆ پاراستن ودورکەوتنەوەیەلەخراپەوتاوان،تەقوافەرمانی خوایەبۆگشت بەندەکانی وڕاسپاردەی پێغەمبەرانەبۆگەلـەکانیان تەقواتوێـشوی ڕێگـای کـاروانی صالّحانە،کەشـتی نـەجاتی هەموانە..هێماوسیمای لەخواترسـانە .. بەری درەختـی ئیمانـە..تـەقوادارخاوەنی کـۆی ڕەوشتەجوانەکانە،تەقواپێناسـەی جۆراوجـۆری بۆکراوە،بـەلاّم ئەوتەقوایـەی کەپێـشەوا (علی/خ)تێی گەیشتوە وپێناسەی کردووە بەم چوار خالّە:باخۆمان بخەینەژێر تیشکی ئـەو پێناسەیەو بزانین لەچ پلەیەکی تەقوادایین وچۆن تێی گەیشتوین ؟

١ ـ الخوف من الجليل: ئەوەیە کە بەڕاستی لە خوا بترسی وخراپە نەکەی .

٢ ـ العمل بالتنزيل: ئیشکردن بەبەرنامەی خوا،تەنهائەوبەرنامەیە یاساوڕێسای ژیانت بێ وهەولّ بدەی بۆحاکمیەتی دینی خوالەژیاندا،بزانەکاربە(هودا)دەکەی یان بە(هەوا)؟

٣ ـالقناعةبالقليل: ڕازی بوون بەوبەشەی کەخوا پێی داوی،سەرچاوەی هـەمو دەردەکـانی ئەم سەردەمە دنیا خۆریە،هەست ونەستمان بـەدنیاوە شـێلراوە، قەناعـەت گەنجینەیـەکی نەبڕاوەیە..ئەوەی بیبێ حەساوەیە.

٤ ـ والاستعدادليوم الرحيل: واتـەخۆ ئامـادەکردن بـۆڕۆژی کـۆچ کـردن(مـردن) خـەمی سەفەری قیامەتت بێ ،ئەوەیەپێناسەی تەواوی تـەقوا،ئایاخۆمان ئامـادە کردووەبـۆ ڕۆژی کۆچ ؟بۆوەلاّمدانـەوەی پرسـیارەکانی ناوگۆڕ؟ئایـاوەکو مانـدوهیلاکین بۆئـەم دنیا،خـەمی قیامـەتمان لەبەرە؟کەواتـە مانـای تـەقوا فراوانـە، بەوشـێوەنیەکەخۆت فـەقیر وزەلیـل بکەی،بەلّکوبە بەهۆی تەقوادەبتەپیاوی دنیـاودواڕۆژلەدیارەپێـچەوانەی تـەقوا(طغـوی)یـە واتەکەسێ تەقوای نەبوو، توغیانی کردووەولای داوە،بەهـەواوئارەزوی خـۆی دەکـات،دوای ئەوەی کە لەماناکەی تێگەیشتین، پێویستە لەسەرمان(بـەپێی توانـا)لـە هـەمووبوارەکانی ژیانداتەقواداربین وجۆرەکانی تەقوابزانین بۆ نمونە:(لـەعیبادەت وبەندایەتیـدا ) ئاگـات لـە

تـەقوا بـێ بـەدڵ وگیـان بیکـەی دورلـەڕیایی وناپـاکیلـەبواری سیاسـی دابزانەلەبـەرخوا پـشتیوانی لـەکێ دەکـەیت ورِقـت لـەچ کۆمەڵێکە،کەبـە(ولاء وبـراء)ناسـراوە،لەبواری عەقیدەوبیروباوەڕدا تەقوا وپارێزی ئەوەیە کە وریابـە دوچـاری شـیرك نەبی،هـەواوئارەزوی خۆت تێکەڵی نەکەیتلوەتەقوای عەسکەری ئەوەیەلەکاتی شەڕدا،نەخـشەوپلانێ داڕێـژی کەبـەزیانێکی کـەم سـەریکەوی ژن ومنـداڵ و پـیرە پیاووسـەدەنی نـەکوژی وئاگـاداری مامەڵەی دیل وگیراوەکان بیت،تەقوای ئابوری ئەوەیە لـەکاتی کـڕین وفرۆشـتندا تـەقوات ببێت ودوربەلەغەش وفێـڵ وخیانـەت..،وەلـەبواری کۆمەڵایەتیـدا تەقوانەوەیـە کەلەگـەڵ خەڵکدا هەڵسوکەوتت چـاك وپـاك بێـت خورەوشـتت جـوان بێـت و دوربـی لـە دووڕویـی ودوزمانی ودرۆکردنوخەڵکی لەدەستوزمانت سەلامەت بن ،بەم شێوەیە موسڵمانی پابەنـد ومولتەزیم دەبێ تەقوا لەهەموو ژیانیدا ڕەنگ بداتەوە،ئەوجا سودو گرنگـی تـەقوات بـۆ دەردەکەوێ کە ئەمانەی لای خوارەوە هەندێکن لە گرنگی وبەرهەمەکانی تەقوا:

ب) گرنگی تەقوا لە ژیانی موسڵماندا :

أ- خوای گەورەلەگەڵ تەقواکارانەوپشتگریان لێدەکات﴿ان الله مع الذین اتقوا والذین هم محسنون﴾ .

ب - بەهۆی تەقواوەکارەکانمان ئاسان دەبێت وخوای گەورە سەختی ونا ڕەحەتیمان لەسەر لادەبات،وەڕزق وڕۆزیمان دەدات ودەروی خێرمان لێ دەکاتەوە،دەفەرموێ﴿ومن یتق الله یجعل له مخرجا ویرزقة من حیث لایحسب..

ج - بەهۆی تەقواوە زانست و زانیاری زیاد دەبێت،خوای گەورەفەرمویەتی:﴿ واتقوا الله ویعلمکم الله ﴾تەقوا نوری عیلم و زانیاری دەخاتە ناودڵەوەوشارەزاوزانست و زانیار دەبین

د - تەقوا هۆکاری خۆشەویستی و دڵسۆ زی ویەکڕیزی وتەباییە،وەك دەفەرموێت:﴿ان الذین امنوا وعملوا الصا لحات سیجعل لهم الرحمان ودا﴾..

هـ - پێوەری قەدروڕێزلای خوا تەقوایە﴿ ان أکرمکم عند الله أتقاکم ...﴾ بەڕێزترینتان

لای خواتەقوادارترینتانە،نەك دەسەلاتترین ودەولەمەندترین کەس،بۆیەدەبێ کێ ئەهلی ئیمان وتەقوایەبەلاتەوەخۆشەویست بێت،نەك خۆمانەیی

و- **بەهۆی تەقواداریەوە حەق وناحەق دەناسین لێت تێکەڵ نابێت وسەرت لێ ناشێوێ**،وەك خوادەفەرموێت:﴿ ان تتقوا الله يجعل لكم فرقانا ﴾واتە : ئەگەرتەقوا بکەن خوا حەق وناحەقت پێ دەناسێنێت ولێت تێکەڵ نابێت، ئەوکاتە( هەموو زەردێك بەزێڕنازانی )وەك ابن اسحاق دەڵێ:فرقاناً ،(أي فَصلاًبَينَ الحقِ الباطل).

ز- **بەهۆی تەقواوەعیبادەت وکارەکانمان لێوەردەگرێ**،کردوکۆششمان بەبێ تەقوا وەرناگیرێ بازۆریش بێ وەك دووکوڕەکەی نادەم (قابیل وهابیل ) کە هەردوکیان قوربانیان کردوولە قابیل وەرنەگیراخوای گەورە فەرموی:﴿ انما يتقبل الله من المتقين﴾ واتە:خوای گەورە تەنها کردەوەی تەقواکارانی ڕاستەقینە وەردەگرێ،واتەبەدڵسۆزی وبۆخوابێت،

ح - **سەرەنجام سەرفرازی ودوارۆژ تەنهابۆموسڵمانانی(متقی) یە تەنها ئەوان براوەن**،جگە لەوان موفلیس ودۆڕاون﴿ والعاقبه للمتقين ﴾جا بەڕاستی تەقواداری ڕاستەقینە دۆستی خوایە،سود وگرنگی تەقوالەژمارەنایە،ئەوەندە بەسەکەخوای میهرەبان بەچاکترین توێشو پێناسەی کردوە،وەك فەرمویەتی:﴿وتزودوافان خيرزادالتقوى واتقونى ياولي الالباب﴾ دەی باپارێزگاری وبەندایەتیمان بەڕاستی لەدڵەوە بێت،وەك پێغەمبەر(ﷺ)لەحەجی ماڵ وئاوایی دا فەرموی:(التقوى هاهنا) دەستی خستە سەرسینەی موبارەکی و فەرموی تەقوالێرەوەیە !لەدڵەوەیە بەلام شوێنەوارەکانی لەدەرەوە دیارەکە بریتیەلەپابەندی بە شەریعەتەوە، جاوەکوئاماژەمان پێ دابا هەمووکاتێ لە تەقوای خوادابژین لەئامادەباشی داین بۆمردن،بەتایبەت زیاترلە مانگی ڕەمەزانداکەمانگی زیادکردنی تەقوایە،بەڕێزان: گرنگ ئەوەنیەچەند ساڵ دەژی کەم یان زۆر،بەڵکوگرنگ ئەوەیەچۆن دەژی؟ تەقواداری یان هەواداری،بائێمەش موسڵمانانە لەسەرتەقوابژین وبمرین تالەو کەسانەبین بە ئیمانەوەبژین وبمرین﴿يا أيها الذين أمنوااتقواالله حق تقاته ولاتموتن الاوأنتم مسلمون﴾

**ج) موسڵمانی تەقوادار(دۆستانی خوا) بەچی ئەناسرێنەوە؟:**

**أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ *الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ(يونس)**

بـە سیماوسیفەت ورەوشتی صاڵحان،بەتایبەت بەم پێنج ڕەوشتەدەناسرێنەوە:

١ـ شەونوێژکردن

٢ـ ڕۆوژوی سوننەت

٣ـ قورئان خوێندن

٤ـ گریان لەترسی خوای گەورە

٥ـ زیکرویادی خوا

*ـ ئەترسن لە:(قیامەت...ئاگری جەهنەم...فەتوادان)

***ـ هەلوێستیان بەرانبەرخۆیان بەم شێوەیە:**

(خۆیان بەدڵ نییە،خۆیان بەنزم سەیرکردوە،خۆیان لەپلەوپۆست وناوبانگ پاراستوە)

*ـ خۆشەویستی بەردەوامیان بووەبۆ:

١ـ خوای گەورە ، ٢ـ پێغەمبەر(ﷺ)، ٣ـ قورئان، ٤ـ موسڵمانان

***ـ شوێنی دڵخۆشی وحەوانەوەیان:**

{ڕیزی مزگەوت و نوێژی جەماعەت}

*ـ خۆگروبەئارامن لەبەرانبەرنەخۆشی وناخۆشیدا..

***ـ پێشوازی دەکەن لەشەهیدی...**

**(اللهم اجعلنامن المتقين)**

# نوێژئارامی وبەختەوەریە

نوێـــژخۆراکی ڕوحــــەوبەهێزی دەکـــات بەرانبەربەلاَوناڕەحەتیەکان،بەنوێـــژکردن دلّ ئـــارام وبەختەوەردەبێ کاتێ نوێژەکەی دادەبەستێ ودەڵێ(الله اکبر)وخوالە هەمووشـــتێ بـە گـەورە تردەزانێ وئیترلـەهیچ شتێ ناترسـێ بـەوەش هەسـت بـە ئـارامی وحەوانەوەدەکات،بەنوێـژ ناوپڕژێنی دڵودەرونی دەکات ئەی ئەو کەسـەی بەختـەوەریت دەوێ ڕونـاکی چـاوانت دەوێ، بـەدلّ وگیـان نوێـژەکانت ئـەنجام بدە،ئەوکاتەهەسـت دەکـەی ئاسـودەوبەختەوەری،خۆئەگەر واشت نەکرد ئەوەتەنها لۆمەی خۆت بکە،پێغەمبەر(ﷺ)هەرکاتێ توشی بەلاَوناخۆشـیەك بوایەهاناى بۆ نوێژ دەبرد وبانگی بیلالی دەکرد دەیفەرمو:(اقم الصلاة یابیلال ارحنابها) زانایەکی خواناس کاتێ دوژمنەکانی نازاریان دەدالـە زینـدانا فـەرمووی:چیتان لـێم دەوێ ؟من بەهەشتی خۆم لەناوسنگدایە، بەدەستی ئێوە دەرنایە،بەندیخانـەم خەلّوەتە،دەربـەدەریم سەیران وسیاحەتەو کوژرانیشم پلەی بەرزی شەهادەتە،وەهەروەهادەڵێت:ئەگەرپاشاکان بیان زانیایەئێمەی موسڵمان دلّمان چەندخۆشە بەزەبری شمشێرلێیان دەسەندین گەربیان توانیایـە، ابن تیمیە کاتێ خستیانە زیندانەوە بێ تاقەت وخەمبارنەبوو کەلێیان پرسی وتی :زینـدانی کەسێکەدڵی بەندکراوبێت لەیادی خواو نەسیر یش کەسـێکە کـۆت وبەنـدی هـەواوئارەزوی بێت،(ابوبکری وراق )وتویەتی: ئەگەر هەواوئارەزووزالّ بووبەسـەردڵی مرۆڤـدا دڵـی تاریـك دەبێت،ئەگەر دلّ تاریك بووهەست بە ناڕەحەتی دەرونی دەکات وبـەردەوام ئەودڵـە تەنگـە، ئەو کاتەڕەوشتیشی ناشیرین دەکـات وبەهۆیـەوە خۆیـشی بێـزار دەبێـت وخـەلکیش ڕقیـان لێدەبێتەوە .ئەوە فەزلّ وگەورەیی نوێژە بەگشتی،بێگومان ڕەنگدانەوەو کاریگەری شەونوێژ زیاترە لەسەر بەختـەوەری وئاسـودەیی دەرونـی بڕوادار،خێزانـی چـاك شـەوگاریەش دەکـەن بۆشەونوێژوعیبادەت(عەتای کـوڕی ڕەبیـاح لەگـەلّ خێزانەکـەی شـەوگاریان بەشـکردبوویۆ عیبادەت وکۆتایی شـەویان بۆخەسـوەکەی دانـابو کەبەشەچـاکەکمیە!( نـەك دژایـەتی بـوك وخەسوی ئەمڕۆ)کەخەسوەکەی مردئەوجاشەویان کردبەدووبەشەوە،کەژنەکەش مرد(عـەتا)

شەوتابەیانی عیبادەتی دەکرد ودەیگوت بایادی خوالەماڵەکانمان نەبڕێ بە ڕاستی ئەم ماڵانە دەزانن بەختەوەری چیە؟جێگای سەرسوڕمانە ماڵەکانی ئێمە وەکو ڕۆژئاوای لێهاتووە،ژورێك بۆ ئارایشت و ژورێك بۆ دانیشتن و یەکیان بۆڕابواردنی خێزان وژورێك بۆ نان خواردن ونوستن ومیوانی وپێشوازی و ....، ئەی کواژوری نوێژلەوماڵەگەورەیەدا؟ ئەگەر عومەروابوبکرسەردانمان بکەن ئامان ئاسنەوەودەڵێن:ئەمانە ئەوەی ئێمەنین! کەواتەئەو ماڵەی شەونوێژی تێدایەبەختەوەرترین ماڵە،کەتیایدا بیردەکەنەوە لەم گەردونە..لەم یاسای ژیانو بونە جاوەك دانیشتوانی سەرزەوی ئەستێران لەئاسۆەبەدی دەکەن،فریشتەکانی ئاسمان یش ئەوماڵانەلەسەرزەوی دەبینن کەیادی خوایان تێادەکرێتەوەبەڕوناکی درەوشاوە،.شەو نوێژخوێن کاتێ نەخۆش ئەکەوێ یان گرفتێکی دێتەپێش فریشتەکان هەواڵی دەپرسن کوا افلانەکەس ئەمرۆکارەکەی بەرەوئاسمان نەهات وەرمان نەگرتوە وەك ڕۆژانی تر، کە دەڵێن گرفتێکی هەیە یان کێشەیەك، فریشتەکان بۆی لەخوا دەپاڕێنەوە کەرزگاری بکات، چونکە ئەوانیش جگە لەکارەکەی خۆیان داوای لێخۆش بوونیش بۆ شەوبێداران دەکەن،بەلآم ئەك بۆکەسانی تیا ترۆخانەوگۆرانی وکلیپ وسینەماوبەڕەڵلآیی بەداخەوەکەهەندێ لەموسڵمانان بۆنوێژە فەرزەکانیش ئامادەنین یان هەرلەکۆڵ خۆی دەکاتەوە چێژ لەئیمانەکەی وەرناگرێ ودەرونی ماندوو هیلاکە بەدونیاوە ولەئارامی دورە کەسەرئەنجام بەختەوەر ودامەزراو نابن

نوێژ

نوێژە بناغەی کۆڵەکەی دینە
نوێژە سەرمایەی بەختیاری ژینە

نوێژە دەرمانی دەردی ئینسانە
سارێژ کەرەوەی گشت برینانە

نوێژە ڕوناکی و چرای ناوگۆڕە
لابەری ترس و شین و شەپۆڕە

نوێژە ئارامی ئەبەخشێ بەژیان
هۆی تورەبوونەهەردەم بۆشەیتان

نوێژ تکاکارە لەڕۆژی مەحشەر
لەناو جەهەنەم ئەتهێنێتە دەر

هەرکەس نوێژیکردبەراستی وجوانی
بەهەشت ئەکرێ زۆر بەئاسانی

# کاریگەری خراپی تاوان لەسەر ژینگەوژیان

سالانە(٥/٦)بەرۆژی جیهانی پاراستنی ژینگەناسراوە،بەهۆی ئەوپێشهات وگۆڕانکاریە سروشتیانەی لەجیهاندارویانداوەکەدەرەنجامی خراپەکاری مرۆڤەکانە،تاوانکاری جۆرەهافەسادلەبونەوەربەرپادەکات لەئاووهەواو کێڵگەومالٚ...ئەوەتا خوای گەورەباسی دەکات دەفەرموێت(ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّوَالْبَحْرِ بِمَاكَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوالَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) ٤١/الروم)واتە:تاوان وخراپەکاری دەرکەوتووەوسەریهەڵداوەو هەمووسەرزەوی ودەریاکانیشی گرتوەتەوەبەهۆی ئەوتاوان وگوناهانەوەکەخەڵکی دەستیان داوەتێ،سەرەنجام دەبێت تالاوی هەندێ لەکردەوەکانیان بچێژن، کەبەرپابونی جەنگوکارەساتەسروشتیەکانە،بۆئەوەی بگەرێنەوەبۆ یەکخوا ناسی،(خراپەخراپەی لە دوایە)لەم ئایەتەدا ئاماژەبۆتێکچون وپیس بوونی ژینگەکراوە،کەژینگەپێك دێت لەسێ بنەمای سەرەکی ژیان(خاك وئاوو هەوا)کەلەم ئایەتەپیرۆزەدائاماژەیان بۆدەکات کەبەهۆی کردەوەخراپە کانی مرۆڤ زەوی دوچاری پیس بوون وگۆڕانی ئاووهەواوی زەوی وبەرزبونەوەی پلەی گەرماومەترسی بەرزبونەوەی ئاستی ئاوی زەریاکان لەبەرتوانەوەی بەستەڵەکەبەفرینەکانی جەمسەرەکانی زەوی،کەئەمەش دەبێتە هۆی نقوم بونی بەشێکی زۆرلە وشکانی کەنارئاوەکانوەهەندێ دەوڵەت بەتەواوی ژێرئاودەکەون وەك هۆڵەندا وبەشێکی زۆرلە دانیمارك، وەلە ئەنجامی بەرزبونەوەی رێژەی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وگازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن کاریگەری خراپی کردووەتەسەر بەرگی چینی ئۆزۆن ئەتمۆسفیر(بەرگەهەوا)کەلەهەندێ شوێن بووەتەهۆی کون بوونی ئەوبەرگەپارێزەرەوئەمەش دەبێتەهۆی گەیشتنی تیشکەزیان بەخشەکان بە تایبەتی تیشکی سەروووەنەوشەیی،کە مرۆڤ دوچاری نەخۆشی جۆراوجۆر دەکات بەتایبەتی نەخۆشیەکانی پێست،وەدەبینی ودەبیستی سالانەپەتای کوشندەی قڕکەرومەتریسدار سەرهەڵدەدەن جگەلەئەنفلۆزاکان لەم سالێشدابەکتریای ناسراوبە(ئی کۆلای)هەرەشە لە

ژیان دەکات!لەو پێناوە داهەولێ زۆری ماددی ومەعنەوی خراوەتەگەڕبەلاّم سودی ئەوتۆی نەبوە یەکێکی ترلەودیاردەو پێشهاتە نوێیانە وشکەسالّی وخۆلّبارینە کە قسەوباسی سەردەمەولەتەمەنی ئێمەداپێشتربەوشێوەیەنەبینراوە،ئەودیاردەیە لەولاّتە عەرەبیەکان بەشێوەی ناوچەیی وکەم وزۆر ڕویداوە لە بیابانە ووشکوچۆلّەکانیدابەهۆی ڕەشەباوگەردەلولی بیابانەوەبەلایانە وەئاسایی بوە،بەلاّم لەکوردستانداتازەیەولەدوای هاتنی هێزەداگیرکەرەکانی ئەمریکابۆعێراق لە(٢٠٠٣)بەدواوەزیاترسەری هەلّداوە کە ژیان وژینگەی لێ پیسکردین وهەرلەزیاد بوونیش دایە!لەبەرهەلّتەکینی توێژەڕەقەکەی سەرەوەی زەوی بەهۆی لێدانی بەچەکەقورس وتێشکدەرەیۆرانیومەکان، بەشێوەیەك ژمارەیەکی زۆرلەوانەی دوچاری(ڕەبوە)وتەنگە نەفەسی بون گەیەنراونەتەنەخۆشخانەو تادێت پەرەدەستێنێت!وەلەلایەکی تریشەوە ناچاربوین کە هاوینانیش لەژوری خەوتنی زستانان بخەوین!کاتێ کارەباش لەنیوەی شەودابۆماوەیەك ئیسراحەت ئەکات وئەخەوێ ئێمەگیانمان سەر ناونەگەڕێت وناخەوین!ئای بۆدلّی سافی باپیران بۆژینگەی پاکی جاران بۆخۆشیەکانی هەواوباران،سالاّنی زووسالّی ڕۆژێك دنیا غوباروزەردبوایە دەیانگوت پیاوێکی گەورەکۆچی کردووە یان غەزەبی خوایە یان...،بەلاّم واماوەی چەند سالێکە بەردەوامەولەزیادبوندایە!تەنهادەیگێڕنەوە بۆوشکە سالّی،بەلّێ وشکە سالّی هۆکارێکەبۆدیاردەی خۆلّبارین،بەلاّم هۆکاری لە پێشتروگرنگتربلاّوبونەوەی فەسادوخیانەتوگەندەلّی وڕژانی خوێنێی زۆرە بەناڕەوالەعێراقداکەهۆی سەرەکیەبۆ ئەوەی خواوەرزەکانمان لێبگۆڕێ! نوسەرانی ئیسلامیش خۆدەبوێرن لەوەکەهۆکەی بگێڕنەوەبۆخراپی تاوان لەبەرتانەی بەرانبەریان وهەرتەنهابەگشتی باسی لێوەدەکەن، بەلّگەیەکی تریشم بۆ پشتیوانی قسەکەم ئەوەیەکەنەگەرسالاّنی ڕابردووش وشکە سالّی بوبێ خۆسالّی وابوە بارانێکی باش بارِیوەوگیاوگولّی بەهاریش زۆربووە!لەگەلّ ئەوەشدا لەم وەرزی تەڕی وتوشی قوڕەدا ئەبینی خۆلّ بارین هەرڕویداوە!لەنوێژی نیوەڕۆدادنیا

تاریك دەكات؟!ئەگەرئەڵێ هی بیابانەلماویەكەی باشورە،دەی لەدێر زەمـ(ـانەوە بیابانەکە)ی
ڕومادی وخواروی عێراق هەربوەوئەوخۆڵەبۆكوردستانیش نەهاتووە،ئێستا بۆچی بەهۆی
شەپۆلی هەواوەبەرزی دەكاتەوەودێتە ئاسمانی ناوچەكەلئەگەرلەبەرتێك چونی وەرزەكان
نەبێت بەهۆی گۆڕانی خەلكەوەبەرەو خراپە! چارەسەر یش گەڕانەوەیە بۆخاوەنی هەواو
خۆڵ وباران كەخوایە،وەك ئەوپیاوەی وتی بەكورەكەی ئەگەركۆمەڵێ سەگت بۆهاتن
چی ئەكەی؟وتی لێیان ئەدەم،باوك:ئەوە زۆردەكێشێ ولەوانەیەسەرنەكەوی،بەلاّم ئەگەر
پەنابەری بۆخاوەنی سەگەكان كەشوانەكەیەبەئاسانی لەكۆڵت دەكاتەوە(ولله المثل
الأعلى)ئێمەش ئەگەربەڕاستی پەنابەرین بۆخواولێی بپاڕێینەوەو دەست هەڵ بگرین لە
فەسادی ئیداری وئەخلاقی وسیاسی،ئەوا پشت بەخوارزگاردەبین لەدیاردەی وشكەساڵی
وخۆڵبارین كەبێزارین،ڕەحمەت لەپێشینان كەلەپاڕانەوەیانداوتویانە(خوایە فەسلْمان
لێنەگۆڕی)لەكۆتایدادەرمانی دەردان بۆچارەسەری ژینگەوژیان گەڕانەوەیەبۆیەرنامەی
خوای میهرەبان.

* وەلاّمی چوارپرسیاری گرنگ !

پیاوێك چوارپرسیاری لەپێشەوا علی(خ) كرد،وتی:

واجب چیە.. واجبترچیە؟،نزیك چیەونزیكترکامەیە؟،سەیرچیە..سەیرترچیە؟،

قورس چیەوهەروەهاقورسترچیە؟/

ئیمام علی لەوەلاّمدافەرموی:

واجب ئەوەیەخواپەرستی بەلاّم واجبترئەوەیەوازلەتاوان بێنیت ..

نزیك ڕۆژی قیامەتە بەلاّم نزیكترلەقیامەت مردنە..

دنیاسەیرەبەلاّم لەویش سەیرترسەرقالّبونەبەخۆشیەكانی دنیا..

قورسیش قەبرە بەلاّم لەوقورستر چونەناوگۆڕەبەبێ توێشوو..

## وانەكانی (ئیسراومیعراج)

سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَاحَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آَيَاتِنَا إِنَّه هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ،واتە:پاكوبێگەردی بۆئەوخوایەی شەوڕەوی كرد بە بەندەكەی خۆی،كە(محمد)لەمزگەوتی حەرام لەمەككەبۆمزگەوتی ئەقصالە(بيت المقدس) تابەڵگەونیشانەكانی خۆمانی پیشان بدەین،بەڕاستی خوا بیسەروبینایە.زانایانی سیرەو تەفسیرفەرمویانە:شەوڕەویی وبەرزبونەوەكە بە جەستەولاشەوەبوەچون ئەگەرخەون بوایە نەدەبوبە(موعجیزە)وەك چۆن ڕێزی لە حەزرەتی نوح گرت بەكەشتیەكەی خۆیی وبڕوادارانی لەخنكان ڕزگاركرد، وەحەزرەتی ئیبراهیمی لەناوئاگرەكەداپاراست لەسوتان،وەدەریای لەت كردبۆحەزرەتی موساوقەومەكەی هەرئاوایش ڕێزی لە(محمد ﷺ)گرت شەوڕەوی پێكردو ئاسمانەكانی بۆتەیكردوەك یەكەم گەشتی ئاسمانی گەیاندیە ئاستێك هیچ دروستكراوێكی خواجگەلە(محمد)ﷺ،پێینەگەیشتووە(سەلامی خوا لەسەر هەمویان) وەلەوسەفەرەدا بەڵگەونیشانەی زۆرگەورەی بینی(لَقَدْ رَأَى مِنْ آَيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى)پێغەمبەرانی بینی، دیمەنەكانی بەهەشت ودۆزەخی پیشاندرا،بەكورتی ئەمانەی لێدەخوێنرێتەوە:

* دوای مردنی خەدیجەی خێزانی ومامی كەبۆی بویەساڵی خەمان، ودوای ئازارونەشكەنجەی زۆرلەلایەن بێباوەڕان ودەركرانی لەتائیف ..،لە بەرانبەرهەمو ئەمانەدا واتە:ئەگەرئەوان میواندارێت ناكەن ئەواخوای گەورە میواندارێت دەكات،ئەگەرئەوان دەرگات لێناكەنەوەئەواسەرجەم دەرگاكانی ئاسمانت بۆدەكرێتەوە،ئەگەرئەوان بەپێشەوا قبوڵت ناكەن ئەواكردمانی بەپێشەوای پێغەمبەران.

* پێمان دەڵێ:ئارامگرتن سەركەوتنی بەدواوەیەودوای ناخۆشیان خۆشیە.

* ئیسراومیعراج خاڵی وەرچەرخان بو،گۆڕینی سەركردایەتی مێژویی بولەبەنی ئیسرائیلە وەكە(٣٠٠٠)ساڵ بوپێشەوایەتی جیهانیان دەكردوسەدان پێغەمبەریان لێ ڕەوانەكرابو، گوازرایەوەبۆپەیامبەرێكی نەخوێندەواری عەرەب لەوڵاتێكی وشكی بێكشتوكاڵ(غيرذي زرع)

* بيت المقدس كەوێستگەيەكى گەشتەكەى بوو،واتە:موسڵمانان ئاگادارى ئەو شوێنەبن گەورەو پيرۆزەورِوگەى ئاينەكانەوبێشكەى پێغەمبەرانە.

* ابن عباس(خوالێيان رِازى بێ)فەرمويەتى: بينين بۆمحمد..قسەكردن بۆموسى ..و خۆشەويستى بۆابراهيم،بووە

* ميعراج وەك موعجيزەيەكى ئاينيە،هاوكات رِوداوێكى زانستيە،يەكەم كەسێ بۆشايى ئاسمانەكانى برِى بێت بەوخێراييە،كەلەوكاتەداخێرايى تيشك وموشەك وشەپۆلەكانى مۆبايل نەدۆزرابونەوە،ياساكەى ئەنشتاين لەئارادا نەبوكەدەڵێ: تاخێرايى زياتربێت كات كەم دەبێتەوە،بێگومان خێرايى( بوراق)ى بەرق ئاسا بەراوردناكرێت بەخێرايى تيشك كەلەچركەيەكداهەزاران كيلۆمەتردەبرِێت!

دەى بانێمەش لەيادوبيرەوەرى ئيسراوميعراجداپەيمانى وەفادارى وپابەند بون وشوێنكەوتنى خاوەنى ئەوموعجيزەيەدوپات بكەينەوەبەكردەوە،نەك تەنهائاهەنگ وپياهەڵدان،هەزاران درودوسەلام لەسەرپێشەواكەمان بێت.

## نەزمری حەرام زینای چاوە..خەڵکێکی زۆرتێوە گلاوە

الحَمدُللهِ الغنی الحَمید..المُبدیءِ المُعید..ذی العَرشِ المَجید..الفَعال لمایُرید،

أشهَدُأن لاَ إلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَه العزيزُالحميد،وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ افضلَ من دعاالى الايمانِ والتَوحيد،اللهم صَلِ على محمدٍوعلى الهِ اصحابِهِ ومَن يَتبعهم مِن صالِحی العَبید،

امابعد:فَیاعِبادَالله اتقواالله تعالى واطیعوه،وعَظِمواامرَهُ ولاتُعصوه،وعلیکم بِغَضِ البَصرفاِنَ النظرةَسَهمٌ من سِهامِ اِبلیس،قال تعالی(قل للمومنين يغضوامن ابصارهم ...)

تــەقواوپارێزگاری لەســـنورەکانی خوابنەماوسەرچـــاوەی هەمووخێرێکـــە، یـــەکێك لەنیشانەوبەرهەمەکانی تەقواداخستنی چاوەلەئاست ئافرەتـانی نامەحرەم،کەداخستنی دەرگای شەیتانە،ڕەوشتێکی جوانی پیاوانو ئافرەتـانی موسـڵمانە،بەجێهێنانی فـەرمانی خوای میهرەبانە﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوامِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوافُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌبِمَايَصْنَعُونَ ..، واتە: ئەی پێغەمبەرلبڵێ بەپیاوانی ئیمانـدار:باچـاوی خۆیـان بپـــارێزن لەســـــەیرکردنی ئافرەتـــــانی بێگانەونامەحرەم،وەعـــــورەتیان بپـــــارێزن لەزیناکردن،بێگومان ئەوە چاکتروپاکترەبۆئەوان،بەراستی خواناگادارەبەهەموکردەوەیـەك کەدەیکـەن، دەبینـی لەئایەتەکەدانـەزەری خـستۆتەپێش زیناوەچونکەسـەرەتای داوێـن پیسی لەچارچاوێنەوەیە،پێشیێ سەیرکردن وپێکەنین وزەردەخەنەبۆیـەکترو سـەلام وکـەلام وپاشـــــان بەیــــــەك گەیـــــشتن لەجێـــــژوانلوەك ئەحمەدشـــــەوقی دەڵـــــێ: (فنظرةفابتسامةفسلام..فكلام فموعدفلقاء)،بەهەمان شێوەیش داوالەئافرەتان دەكات ئەوانیش نەزەرنەکەن،وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَ يَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَاظَهَرَ مِنْهَا ..،واتـەبڵێ بـە ئافرەتـانی ئیمانـداریش چـاویان داخـەن لەتەماشاکردنی پیاوانی نامەحرەم وداوێنی خۆشیان بپارێزن لـەزیناکردن جـوانی خۆیـان

دەرنەخەن جگەلەوەی دیارەکەمەبەست دەست ودەموچاوە،باسەرپۆشەکانیان بەدەن بەسەرسینەوملیانداجوانی وزینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆھاوسەردکانیان نەبێت یان باوك وبرا و..، کەسەمەحرەمەکان..،دایکی سەلەمەڕەزای خوای لێبێت گێراویەتیەوەو فەرمویەتی:من ومەیمونەلای پێغەمبەری خوا(ﷺ)دانیشتبووین پێشوازیمان کردلە(إبن المکتوم)کەپیاوێکی کوێربو،دوای ئەوەی فەرمانمان پێکرابووبە بالاپۆشی،پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموی:(احْتَجِبَا مِنْهُ)پەردەدادەنەوەوخۆتان داپۆشن،وتمان:ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەکوێرە ئێمەنابینێ ونامان ناسێ؟ فەرموی:(أفَعَمْيَاوَانِ أنتُما ألَسْتُمَا تُبْصِرَانِه!؟)ئەی ئێوەکوێرن وئەونابینن؟لەبەر ڕێزوپارێزگاری ماڵ وناموسی موسڵمانان نەزەرڕێگەلێگیراوەحەرامکراوە بەزینای چاوان ناوبراوە بەتیری ژەھراوی شەیتان دانراوەلێرەدامەبەست لە سەیرکردنی دوەمجارەبەشەھوەت،ئەینابەشێوەیەکی گشتی دەڕوانی ویەکەم جارتابزانی کێیەومەحرەمەیان نا،بەلام بۆت نییەبۆدووەمجارسەیری شێوەو لەش ولاری بکەی بۆ ئارەزوو..، مەگەرلەکاتی ناچاری وەك پزیشك و مامۆستائەوەیش نابێ بەتەنیابێت،وەك لەفەرمودەی پێغەمبەرداھاتووە:(لاتتبع النظرة النظرة فانما لك الاولى وليست الاخرى) (حدیث حسن)،وەپێشەواعلی فەرمویەتی:(النظرنظرتان:نظرة اليك ونظرةعليك)واتەتەماشاکردنی یەکەم بۆ تۆیەوھی دووەمیان لەسەرتۆیە،ھەرکەس نەزەرەکانی بخاتەگەڕوچاوی بەرەلابکات لەناموسی خەڵك ئەوەحەسرەتەکانی زیاددەبن،چونکەشتێ دەبینێ وپێی ناگات بۆئەونابێت وبۆی دەبێتە خەفەت ومەراق ونائارامی دەرون،بۆیەدەبینی ئەوانەی دڵداری دەکەن گەرسەیری لاشەیان بکەی بە تایبەت دەستەکانیان ھەمویان کوتاوەبەئاخ وئۆف ودڵیشی بەتیرکونکردوە

## سـودەكـانی چـاوداخسـتن:

* بێگومان پاداشت لەجۆری كارەكەیەوئەوانەی چاویان لەحەرام دەپارێزن خواقـەرەبویان بۆدەكاتـەوە بەچـەندنیعمەتێكی زۆرگەورەوچـاكترەوەك لـەكۆتایی ئایەتەكـە فەرمویـەتی (هوازكی لهم)واتە:چاوداخستن چاكتروپاكترەبۆئەوان...

١ـ بەردەوام ئەوكەسەلەگوێڕایەڵی فەرمانی خوادایە.

٢ـ چـاوی بـەهێزدەكات بۆبینین،ئێـستابەزوی چـاویان دادەبـەزێت هۆكـاری سـەرەكی مەعنەوی نەزەرەجانەگەربیپارێزی دەتپارێزێ.

٣ـ عـەقڵ بـەهێزدەكات وەك چـۆن كۆمپیوتەربەوێنـە قـورس وخاودەبـێت بـەلآم بـەعیلم ونوسین(word) تێـك ناچـێ شـریتی عـەقڵیش بەهـەمان شـێوە بەسـەیر كردنـی حـەرام لەرێگەی چاوەوەقورسولاوازدەبێت،بۆیەئەوان زیرەكترن.

٤ـ چاوداخـستن دەبێتـە هۆكـاری زیـادبونی زانـست وزانیـاری، چـونكە عـیلم نوروڕوناكیەولەوشـوێنەجێگیرنابێ كـەتاوان وخراپـەی تیایـە،وەك سـكالآی امـام شـافعی بۆلای(وەكیع)ی مامۆستای ئەویش ئامۆژگاریكردكەدوربەلەتاوان.

٥ـ چاوداخـستن لەحـەرام دەبێتـە ڕونـاكی دلآن ئـارامی جەسـتەوگیان، جێگـەی سەرنجەكەباسـی نەزەرلەسورەتی (نـور)ولەگـەڵ ئایـەتی نورهـاتووە كەڕاستەوخۆباسـی نوروڕوناكی خودادەكات .

٦ـ دەرگاكانی دڵ لەسەرشەیتان دادەخات،چونكە دڵ وچاوپەیوەستن بە یەكەوە،كەچـاوپیس بووتێك چوودڵیش تێك دەچێت وپیس دەبێت،كەچاو خائین بودڵیش خیانەت دەكات، بۆیـە ئەوانەی نەزەردەكەن شەیتان بەوەدەیان خڵەتێنێ ودەڵێن:باچـاوان شـەحن بكـەین(بێگومـان شەحنی دادەبەزێت)یان دەڵێن:چاوبازەناگیرێ!كەئەمانە قـسەی نابـەجێن وفێڵـی شـەیتانە، نایاتۆئـەوەت قبوڵـەبۆكچ وخوشـك وخێزانەكـەت؟بێگومان نـەخێر،یان دەڵـێن نـەزەرهیچ نیەوگوناهی بچوكەبێ ئاگالەوەكـەئاگری گەورەلەبلێـسەیەكی بـچوكی دەنكـە شـقارتەیەك

دەکەوێتەوە،بۆیەلەگەڵ بەردەوامیدادەبێتـە تـاوانی گەورەوگـەر تەوبەنـەکات، جاگەرنـ
پەرژینەی شکاندبەناسانی دەگاتەزیناکە،وەك وتـراوە (لاصـغیرقمع اسـتمرارولا کبیرقمـع
استغفار)لەکۆتایدا نەڵێم وریابن نەکەونە ژێرکاریگـەری ڕاگەیانـدنی دیماگۆجی درۆینـەی
جیهانگیریەوە،چـونکەعەولەمە دەیـەوێ پێناسـەی تۆبـسرێتەوەوپێت دەڵێـت: زیناچـیە؟
نەزەرچیە؟تەلاق چیە؟ مادام کوڕوکچ ڕازی بن خـەڵك ئـازادە!؟وەلەبەرامبـەردا شـەرعیش
پێت دەڵێ:غیرەتی ئیمانیـت بـسەلمێنەوخۆڕاگربەولەوتاقیکردنەوەیە بیروبـاوەڕو کەسـایەتی
خـۆت نـەدۆڕێنی ودوارۆژی خـۆت بـەدنیای خـەڵك نەدەی،جێگـەی سـەرنجەکە پێغەمبـەر
(ﷺ)فەرمویەتی:(ماترکت فیتنة اضرعلی الرجال من النساء) فیتنەو تاقی کردنـەوەی
ئافرەتان زۆرسەخت وگران ومەترسیدارەلەسەرپیاوان، هەگەربەئیمان ڕوبەڕوی بینەوە ئەینا
کەمکەس خۆی بۆدەگرێ،بەتایبەت ئافرەتانی ئەم ڕۆژگارەکەزۆربەی جەستەیان دیارە!

- لەرۆژنامەی(الأحد)ی لوبنانی لەژمارە(٦٥٠)لەسەرزمانی سەرپەرشتیاری پەروەردەی کۆمەلایەتی(مرغریت سمیـث)ەوەنووسیویەتی:لەسەداشەستی قوتابیەکچەکان لـەزانکۆو قوتابخانەکاندالەوانەکانیانداکەوتوون،چونکەبەردەوام بیریان بـەلای خۆشەویـستی وکـاری جنسیەوە بووە،ئەوەندەگوێیان بەوانەکانیان نەداوە،لەهەرێمی کوردستانی خۆشمان سـاڵی (٢٠١١)ڕێژەی دەرچون لەپۆلی(١٢)شەشی ئامادەیی(١٧./.)بووەئەگەردوو ئەوەندەشی بکەیتەوەبـەپێی سیـستمی پـەروەردەیی هێـشتا کەمـەو خەلەلـە،هیچ نەماوەتەوەتـەنها ئەوەندەنەبێ کەبەرپرسیاران لە پەروەردەکاران ودایکان وباوکان منداڵـەکانیان بپـارێزن و دوریـان بخەنەوەلەوتێکەڵاویـەبێ سەروبەرەناشارسـتانیەهەولبدەن هەرچی لەتواناياندايـە بیخەنەگەڕبۆیەگژاچوونەوەی،لەدلۆدەرونی مناڵەکانیاندا تۆوی ڕەوشتی بـەرزی وئاکـاری جوان بڕوێنن لەنەزەربەریدی زینایە،خەڵکی زۆرپێی مویتەلایە..چارەسەریش یاسای خوایە

* ئەم وتارەم لەگۆڤاری پەیامی زانایان ژمارە(٧٤)دابەزیوە.

# نەزمربەریدی زینایە..خەڵكی زۆرپێی موبتەلایە

خـوای زاناوكاربـەجێ فەرمویـەتی(وَلَاتَقْرَبُواالزِّنَاإِنَّـهُ كَـانَ فَاحِشَةً وَسَاءَسَبِيلًا)واتـە:بـەهیچ شێوەیەك توخنی زینـاوداوێن پیـسی مەكەون،وەپێشەكیەكانیـشی وەك(مـاچ ومۆچودەست لێدان وتێكەلاوی..،چونكەبەڕاسـتی زیناتـاوانێكی قێـزە ونوڕێگایـەكی زۆرخراپە،سـەرجەم ئاینەئاسمانیـەكان زینایـان حـەرامكردووەودژی داوێـن پیـسی وەستاون،چـونكەحەیاوناموس زۆرگرانەونیوەی ئیمانە،گەورەیی ئیـسلام لەوەدایەكەپێشەكیەكانی زیناشـی حـەرامكردووە كەلەنەزەرەوە دەست پێدەكات،هەركەس سـلی نەكردەوەلەپەرژینـەكانی وەك:نەزەروتێكـەڵی حەرام وتەوبەی نەكردئەوەبەئاسانی شەیتان دەرگای تری بۆدەكاتەوەتادەگاتەزیناكە، زینالـە تاوانەگەورەكانە،ڕسوایی هەردووجیهانەكەدەبێتـەهۆی تێكـەلاوی نەسـەب وهەڵوەشـانەوەی خێزان ولەباربردن وكوشتنی ئەومنالەی كەبەهۆیەوەدروست دەبێـت وەبلاوبونـەوەی فەسـادو خراپەوبەرەلایی وزۆریەتای كوشندەی تر وەك (ئایدزوزوهری و..)،لاوێكی تازە پێگەیـشتوو لەپێغەمبەر(ﷺ)دەخوازێ مۆڵـەتی زینـای بـداتێ،ئینجـا خەڵكەكـەی دەوروبـەری پێیـان ناخۆش بوویستیان دەم كوتی بكەن،پێغەمبەر(ﷺ)هێوری كردنەوەوفەرموی بەگەنجەكە : وەرەپێش،هاتە پێش ولای خۆی دایناوفەرمووی:ئەرێ حەزدەكـەی خـەڵكی لەگـەڵ دایـك و خوشك وپورتازینابكات؟لاوەكەگوتی:نـەخێرباب وداكـم لـەدەورت گـەڕێن، فـەرموی: دەسـا خەڵكیش حەزناكات تۆلەگـەڵ كـەس وكاریازینابكەیت،پاشـان دەسـتی پـیرۆزی خـستەسەر شانی وفەرمووی:خوایە ئەملاوەخۆش ببە،دڵی لەگوناه پاك بكەوەعەورەتی لەحەرام بپارێزە ئیترگەنجەكەبەیەكجاری بیری لەو شتانەنەكردەوە،لەفەرمودەی پێغەمبەرداهاتووەكەزۆرینەی خەڵكی بەهۆی دەم ودامێنەوە دەخرێنەناوئاگرەوە(..الفم والفرج)(رواه احمد)لەفەرمودەیەك پێغەمبـەر(ﷺ)ئاماژەبەگـەورەیی تـاوانی زینادەكـات كەلـەكاتی زیناكـەدا ئەوكەسـە ئیمانەكەی نامێنێت ولەبەری دائەكەنرێ و(لایزنـی الزانـی حـین یزنـی وهومـؤمن..)(رواه البخاري ومسلم)بەداخەوەكەبـەناوی ئـازادی وخۆشەویـستیەوەزۆرلەكوڕان وكـچان چەواشـە

کـراون ودەبنــەهاوڕێ وتێکــەڵ دەبــن! بــێ ئــەوەی ســنوری ئــازادی وخۆشەویــستی بــزانن، کەدووشەی جوانن بۆمەبەستی خـراپ بـەکاری دێـنن، بـەوەش لـەپێش هەمویانەوەکـچان دەبنەقوربانی،پاشان دەیان یانەی شەوانەو مەسـاج وسـەدان مـاڵی لەشـفرۆش دەرکـەوتوون نمناوگەلی کوردی موسـڵمانی خانەدان،لەکاتێکداچارەسـەری خۆشەویـستی هاوسـەرگیرییە، بەلاّم لای ئـەوان هاوسـەرگیری کۆتـایی هێنانەبەخۆشەویـستی لبەپێـچەوانەی شـەرعەوەکە سـەرەتای خۆشەویـستی وپێکەوەژیانە،بلاّوبونـەوەی زیناهۆکـاری مـاڵوێرانی دنیـاودوارۆژە، بۆپاراستنی خێزان وئابڕووکەسایەتی مرۆڤەکان ئیسلام توندترین سزای داناوە بۆژن ومێردی زیناکار(سعد بن عبـادە)(خ)دەڵـێ:ئەگـەرپیاوێك ببیـنم لەگـەڵ خێزانەکـەم زینابکـات، بـە شمشێرلەت وپەتی دەکەم،ئـەم قـسەیان گەیاندەپێغەمبـەر ئـەویش فـەرموی:(تعجبـون مـن غیرەسعد؟واللە لاناأغیرمنه..)(بخاری)واتە:ئایاسەر سـوڕمانن بـەغیرەت وپەرۆشـی سـەعد؟ سوێندبەخوامن لەسـعدبەغیرەت ترم،وخودالـە مـن بـەغیرەت ترە،جالەبـەرغیرەتی خودابـوو خراپەکاری زینابەهەموشێوەکانیەوەبە (ئاشـکراونهێنی)قەدەغـەکراوە،(ئـەم باسـەدەرەنجام وبەشی دووەمی وتاری نەزەرە).

# چۆن ڕزگارمان بێت لەم بارە..لەنیگەرانی خەم وپەژارە

بەهۆی پەراوێزخستنی سیستمی ئیسلامی ولەسایەی سیکۆلاری وعەولەمەدا ستەم و نا عەدالەتی وپێشێلی مافەکان دنیای پڕکردوەوبەهۆیەوەخەڵکێکی زۆردوچاری خەمۆکی و خەم وخەفەت ونیگەرانی بون،بۆڕزگاریت لەم هەموخەم وپەژارە..ئەم چەندهەنگاوەچارەسەری دروست ولەبارە:

١) لەئیسلامدا خەم وخەفەت ڕێگەپێنەدراوە:

لێرەولەوێ بەرگوێمان دەکەوێ ودەڵێن ئیسلام لەگەڵ خۆشیوشادیداناکۆکە! دەڵێن گەرپابەندبین بەدینەوەئەبێ بەردەوام خەمبارین و(ببینەمامەخەمە)ونابێ شادی دەربڕین یان پێبکەنین ..هتد،بێگومان وێنەی ئەم قسانەلەبێئاگاییەوە سەرچاوەی گرتوەوپێچەوانەکەی ڕاستە،ئەوانەچ وەلامێکیان هەیەبۆدەقەکانی وەك:(..فبذلك فليفرحوا...)،(ولا تهنوا ولاتحزنوا)واتە:خەمبارمەبن وخەفەت مەخۆن لەسەرئەوەی کەبەسەرتان هاتووە،وەدەیان فەرمودەی وەك:(يسروا و لاتعسروا بشرواولاتنفروا...)واتە:ئاسانکاری بکەن شت قورسوگران مەکەن مزگێنی وهەواڵی خۆش بدەن بەیەکتر نەك شتی ناخۆش.وەفەرمودەی:(وأن يتناجى الاثنان منهم دون الثالث ،لان ذلك يحزنه)ئەرسێ کەستان پێکەوەبوون نابێ دوانتان پێکەوە چپەبکەن چونکە ئەوی تردڵگران وخەمباردەبێت، وە فەرمودەی(ابتسامتك في وجه اخيك صدقة)ڕووخۆشی وزەردەخەنەلەبەرامبەر براکەت چاکەیە،ئەمانەودەیان فەرمودەی ترمەگەرهەمویان لەبەرناخی مرۆڤەکان نیە؟وەئەوڕاستیەدەسەلمێنن کەئیسلام خەم لابەرەو شادی هێنەرە،ئیسلام بۆڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان هاتووە تاکوبگەنەلوتکەی بەختەوەری دنیاو دوارۆژبۆخۆشی وبەختەوەریەکی بەردەوام وڕاستەقینە،نەك خۆشی یەکی ڕۆتینی وروکەشی وکاتی وەك مۆم داگیرساندن یان هێنانی چەپکەگوڵێکی لاستیك یان تەنهاساتێ بۆخۆشی و پیاسەیەك وداوەتێك وئاهەنگێ ... ،ئێمە خۆشیەکمان دەوێت کەدڵ ودەرونمان بەهێزبکات

کەئەویش تەنها لەئیسلامدا بەرجەستە کراوە ..ئیسلام ڕێگری کردووە لەخەم و پەژارە چونکە خەفەت بۆدڵ زۆرخراپە وپاشان دوچاری چەندین نەخۆشیت دەکات وەخاوەنەکەی وەك لێقەوماوداڕوخاوداماو زەبون نیشان دەدات،وەشەیتانیش زۆرحەزدەکات وەهەوڵ دەدات کەمسوڵمان خەمباربکات ولەوڕێگەیەوەکاری خۆی بکات،وە داواکراوەلەمسوڵمان کەبەرەوڕوی خەمەکانی بێتەوەبەڕێگەی شەرعی و تەسلیمی خەم وخەفەتی شەیتانی نەبێت،چونکە خەم باری مەبەست و داواکاری شەرع نیەوپێشەواکەمان(ﷺ)خۆی لێ پاراستووە وفەرمویەتی: {اللهم اني اعوذ بك الهَم والحزن}واتە:خوایە پەنا دەگرم بەتۆلەخەم وخەفەت، هەمم وخەم بۆشتی داهاتوەوخەفەتیش بۆشتی ڕابردووە،کەهەردوکیان دڵ لاوازدەکەن وجەستەولاشە شەکەت وماندوودەکەن ولەزەرەدوزیان بەولاوە هیچ سودێکیان نیەوە نەخۆشی وناخۆشیش کەبەسەرمرۆڤ دێت دەسەڵاتێکی تێدانیەنەوەجۆرێکەلەتاقیکردنەوەو پێویستەبەهۆکارە شەرعیەکان وەك صەبر گرتن ودوعاوپاڕانەوەوکاری ژیرانە لەڕوی بوەستینەوە،چونکە هەمووکەس توشی ناخۆشی دەبێت لەدنیادا بەڵام بۆمسوڵمان دەبێتە کەفارەتی تاوانەکانی بەوەش جۆرێك لەدڵخۆشی بۆدێت، وەك خوای گەورەلەسەرزمانی ئەهلی بەهەشت کاتێ کەچونەبەهەشتەوەفەرموویەتی: (الحَمدلله الذی اَذهبَ عنا الحَزن) وەهەندێك خەم خواردنیش نیشانەی ئیمان وهیدایەتە وەك خەمباری لەسەر ئەوەی کەگوناهوتاوانی ئەنجام داوەوبێ فەرمانی خوای کردووە،یان نوێژو ڕۆژوی فەوتاوە یان ناوی دەرنەچووە بۆحەج،یان ئەوانەی کاتی خۆی دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)بۆئەوەی بچن بۆغەزابەڵام هیچیان نەبوو بیبەخشن وەیان هیچیان دەست نەدەکەوت پێی بڕۆن وبەخەمباری دەگەڕانەوەبۆماڵ بەپێچەوانەی مونافیقەکان.پوختەی قسان لەوبارەوەئەوەیەکەدین داوای لەکەس نەکردووە بەخەمباری بژیەت وخەم وخەفەت بەعیبادەت بزانێ چون ئەگەرئەوەڕاست بوایەئەوا پێغەمبەر(ﷺ)هەموژیانی بەخەم و پەژارە دەبردە سەر،بەڵام بەپێچەوانەوەبەردەوام سینە پاکوکرداروگوفتار شیرین و ڕووخۆش

ودەم بەزەردەخەنەوەبوە،هەندێك ڕیوایەتیش گێڕدراونەتەوەکەهانی خەمباری دەدەن بەلاّم سەنەدەکانیان نەزانراوەوئەوفەرمودانەش لاوازن.

**٢) سەیری خوارخۆت بکە بۆ دنیا:**

چاکترین شت بۆدروست بوونی قەناعەت ورِازی بوون بەبەشی خۆت،بۆ ئارامی دڵ ودەرون ڕوانینەبۆخوارخۆت لەشتی دونیایدا،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویە{**انظروا الی من هواسفلَ منکم ولاتنظروا الی من هوفَوقَکم فانه اجدران لاتزدروا نعمةالله علیکم**} (رواه مسلم) واتە:سەیری ئەوکەسەبکەکەلە خوارخۆتەوەیە،چاو لەوانەمەکەن کەلەسەروی خۆتانەوەن چون ئەوە باشترەبۆئەوەی هەست بە نیعمەتەکانی خوابکەیت ولەبەرچاوت بن وهی خۆت بەکەم نەزانی،نیعمەتە کانی خوابژمێرەبەسەرتەوەکەگەلێ زۆرن وناژمێردرێن(**وان تعدّ نعمةالله لاتحصوها**) مرۆڤ گەربەوشێوەیەبیرکاتەوەئەوەهەست دەکات کەلە زۆربەی خەڵك باشترە بۆ نموونە:نیعمەتی ئیسلام وئیمان یان دەڵێ:شکورلەشم ساغە،خۆکرێچی نیم، قەرزدارنیم، چانیە دیل نیم ...،بێگومان لەتۆش خراپتر هەیە،بەم کارەخەمەکان دەڕەونەوەودڵ ئاسودە دەبێت،واتە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوادەکات، (هارۆلدئابوت)لەسەرئاوێنەکەی نوسیبوی:{هەستم بەدڵتەنگی کردلەبەر ئەوەی پێلاّوم نەبو،بەلاّم لەبازاڕکەسێکم بینی هەر دووقاچی نەبو} بەلاّم تۆی موسڵمان کەچویتەبەرئاوێنەکەت پێشەواکەمان دوعای تایبەتی بۆداناوین تاکو زیاترهەست بەبەخششەکانی خوابکەیت بەسەرتەوەوبڵێ(**اللهم کماحسنت خلقي فحسن خُلقي**)واتە:خوایەوەك چۆن بەرِێك وپێکی دروستت کردووم ئەولاشە جوانەت پێداوم هەرئاوایش ڕەوشتم جوان بکە،لەبەرئاوینەکەت نیعمەتی ئەو دەم وچاوەجوانەی خۆت دەبینی تەنانەت ئەگەرلێوەکانت نەبێت خەڵك قێزت لێدەکاتەوە،ئیترلەوڕێگەوە دەگەیتەلوتکەی سوپاس گوزاری کەهەندێ لەزانایان فەرمویانە ئیمان بریتیەلەدووبەش: سوپاس گوزاری وئارامگرتن (نصف شکرونصف صبر)بەلاّم گەربە پێچەوانەوە بیرکاتەوەو سەیری سەروی خۆی بکات،ئەوەهیلاك وماندوو دەبێت وخەم وخەفەتی بۆزیاد دەبێ

بەبەلاش ولەوانەیە نەگات بەومەبەستەش،(شۆینهاوەر)دەڵێ:(بەدەگمەن بیرلەوشتانە دەکەینەوەکەهەمانە،بەڵکوهەمیشەلەبیری ئەوشتانەداین کەپێویستمانە!)

٣) لەدوای ناخۆشیەکان خۆشیە (.. انَ معَ العُسرِ یُسراً..)

ئەی مرۆڤ بزانەکە:دوای زستان بەهارە..تاریکی سەرەتای ڕوناکی یە.. ناخۆشی ونائارامی وفشارەکان سەرەتای بەختەوەری وحەوانەوەن،شکست ودۆڕان سەرەتای سەرکەوتنە ..لەپاش برسێتی تێریە،لەپاش تونێتی تێراویە ،لەپاش ماندوبون خەوتنە لەپاش نەخۆشی شیفایە،دەگونجێ دواکەوتووبگاتە جێ ولادەرڕێگەی ڕاست بگرێ لیقەوماودەروی لێ بکرێتەوە وتاریکی بڕەوێتەوە،ئەگەربیابانت بینی درێژبۆتەوە بزانەکۆتاییەکەی باخ و باخاتی سەوز وسێبەری درێژوچڕوئاوی سازگارە..ئەگەرگوریست بینی زۆرئەستوربوو بزانە کاتێك دەبێت بپچڕێت..،خۆشەویستمان لەئەشکەوتدامژدەبە هاوەڵی دەدات کەخوامان لەگەڵە ئیترئارامی وئاسایش باڵی کێشا بەسەریاندا ..

بەندەکان هەمیشەبەهۆی ئەوزروفەی کەتیایدادەژین تەنهاخەم وماندوبون وئازاردەچێژن لەبەرئەوەی تەنهاچواردیواری ژورێك ودەرگاکەی دەبینن،خۆئەگەرفراوانتربیرلەژیان بکەنەوە ئەوادەتوانن گۆڕانکاری گەورە ئەنجام بدەن،لەبەرئەوەی کەحاڵێکتان بەسەرداهات وامەزانن ئیترتەواو،نەخێربەڵکو ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایەومرۆڤیش لەیەك قاڵبدانامێنێتەوە،باشترین بەندایەتیش چاوەڕوانی کرانەوەی دەرگای ڕەحمەتی خوایە،بەڵکوخوای گەورە لەوکارە داخێرێکی دانابێ وئێمە پێی نەزانین،وە لەگەڵ هەموناخۆشیەکداخۆشیە،مرۆڤ هیچ کات لەیەك قاڵبدانامێنێتەوە،هەموباروزروفێکی بەسەردا دێت،بۆیەدەبێ هەمیشەچاوەڕوانی دەروی خێربی وبزانێ کە لەگەڵ هەموناخۆشیەکداخۆشیە.

## خەمبار مـــەبە

- خەمبارمەبە:چونکەساردەبیتەوە لەبەندایەتی پەکت دەخات لەتێکۆشـان لـە ناخەوەدەتهەژێنێ..دەترۆخێنێ..گومانی خراپت بۆدێنێ،ژیانتلێدەشێوێنێ .
- خەمبارمەبـە: خـەم وخەفـەت دەبێتـەهۆی دودڵـی وخـەمۆکی ونەخۆشـی یـە دەرونیەکان وسەرچاوەی ئێش و ئازارو ژانە .
- خەمبارمەبە: کەتۆخاوەنی قورئان وزیکرودوعاو نوێژوخێرو چـاکەکاری ،ئـیتر تاکەی بۆخەمباری .
- خەمبارمەبە: خۆت مەدەرە دەست شەپۆلی خەمەکان ومەڕوخێ ودامەمێنـە بـەهۆی بێکـاری ،سـەردان بکـە..بخوێنـە بنوسـە .. کاربـدۆزەوە ..بیربکـەوە ..گەشبین بە بۆداهاتوو .
- بۆچی خەم دەخۆی ؟(شێخ جونەیدی بەغدادی)بەلای پیاوێکـدا ڕۆیـشت بینـی زۆرخەمبارودااماوە لشێخ پرسی:لەوەدەترسی کەزوتربمری لەوماوەیـەی کـەبۆت دیاریکراوە؟وتی نەخێر،شێخ پرسی :ئایانەو ڕزقەی کەخوابۆتی دیاری کـردووە کەس دەتوانێ بیخوات؟ وتی نەخێر،کەواتەخەمی بۆچیەوبۆچی خەمباری ! ؟

خەمەکان فڕێدەوهەڵیان مەگرە:

مـامۆسـتایەك ویـستی بەکردەوەقوتابیـەکانی تێبگەیـەنێ لەزیانـەکانی خـەم و خەفـەت، دەبەیـەك ئـاوی بەدەسـتەوەبووتی:کـیش وقورسـایی ئـەم دەبـەئاوە چـەندە؟وتیان چـەند گرامێکەوسـوکەبابڵێن نیوکیلۆ،کەواتەهـەڵگرتنی ئاسـانە،بەڵێ،بەلام ئەگـەربۆ ماوەیـەکی زۆربەدەستمەوە ڕایبگـرم هـیلاکم دەکات؟بێگومان،مامۆستاکە وتـی:خـەمیش هـەر وایـە کەماوەیەکی زۆر هەڵتگرت هیلاکت دەکات.

---

* سەیری کتێبی(لاتحزن)ی(د.عائض القرنی) بکە،کراویشەبەکوردی

# خۆناسین

دنیابەکلیلی خۆناسین خواناسینە،وەك وتراوە(من عرف نفسه فقد عرف ربه)دیارە هیچ شتێ لە خودی خۆت لەخۆت نزیکترنیە،جاکەخۆت نەناسی چۆن کەسی تردەناسی؟لەوانەیە لێیی خۆم دەناسم،بەلاّم هەڵە دەکەی! ئەوناسینەی کلیلی خۆناسینەبریتیەلەوەی کەبزانی لیە کوێ هاتوی؟ بۆچی هاتوی؟بۆکوێ دەڕۆی؟وەبزانی بەختەوەریت چیەولەچیدایە؟ وە بەد بەختیت چیەوچۆن دەتوانی خۆتی لێ بپارێزی؟نەك خۆناسینی دنیاگۆچی وسیاسیانە کە وێنەری خۆیان نین ئەوانە! یان خۆناسینی ئاژەڵانەکەتەنها ڕواڵەتی جەستە ولاشەی دەزانی وکەبرسی بوودەخواوکەتوڕەبوو بەشەڕدێت وکەئارەزوی جولآجوت دەبێتەلەورەوشتانەدا نێمەوئاژەڵ هاوبەشین،جابزانە تۆخاوەنی کام لەم ڕەوشتانەی:

١ـ بەختەوەری ئاژەلآن لەخواردن وخەوتن وجوت بون دایە

٢ـ ڕەوشت وبەختەوەری دڕندان لەکوشتن ولێدان ودڕین وبڕین دایە.

٣ـ خواردن وبەختەوەری دێوان وشێتان لەدزی وفزی وشەڕوئاژاوەدایە

٤ـ ڕەوشت وبەختەوەری فریشتەکان ڕۆچونە لەسەیری سیمای خاوەنی خۆیان کەخوایە، کەبەندایەتیە بۆخودای خۆیان

جا بزانە شوێن کەوتەی کامیانی لەو چوارانە.

## خۆکوشتن.. خۆکوژو دەرئەنجام

بێگومان خۆکوشتن بەهەمووجۆرەکانیەوەدیاردەیەکی قێزەونەونیشانەی بێ دەسەڵاتی و دۆڕانە،کارەساتەکەسێ دەستی بچێتەکوژاندنەوەی مۆمی تەمەنی خۆی،دیارە خۆکوشتنەکە دەرەنجامەوکۆمەڵێ هۆکارکەڵەکەدەبن وکارلێك دەکەن وکارەساتەکەدروست دەکەن، ئەوە نیەتەنهادەرنەچوەیان دەزگیرانەکەی شوی کردووەیان خێزانەکەی خیانەتی لێکردووە، خۆ هەرچی کێشەیەکی بۆ دروست بووخۆی بکوژێ ئەوادەبێ هەموومان خۆمان بکوژین،یان هەرچی ستەمێکی لێکراخۆی لەناوبەرێ ئەوکاتەتەنها ستەمکارەکان دەمێنینەوە،بەلاّم بەوشێوەیەنیەوخۆکوشتن بەزین وبێدەسەلاّتیەلەبەرانبەرچارەسەرکردنی کێشەو قەیرانەکان، سەیارەیەك باری تەواوی لەسەرەو چیترهەڵناگرێ کەیەکێ سوار دەبێتوتایەکەی دەتەقێ دەڵێن خەتای تۆبو،نا بەڵکوئەوهۆکارێکەلەهۆیەکان، میزەڵاّن هەوای زیادی تێکرانەتەقێ وجام کە پڕبوولێی دەڕژێ،پەروەردەی لاروخواروهەڵەمان زۆرەدایك وباوك هەڕەشە لە منداڵەکەیان دەکەن ئەگەر دەرنەچی دەتکوژین،یان... هۆکاری دەرونی:هەندێك لەوانەی دوچاری نەخۆشی دەرونی دەبن هەستەکانیان لەدەست دەدەن وکۆمەڵێك بیروخەیاڵی لادروست دەبێت وادەزانێ بەردەوام ستەمی لێدەکرێ گاڵتەی پێدەکرێ ولێی دەبێتە خەمۆکی و(کأبە)دەڵێ ژیان تامی نەماوەومردن باشترەبۆیە پەنا دەباتەبەرخۆکوشتن! نامەیەك بەجێ دێلێ کەبۆیەخۆی کوشتوەتا بەرامبەرەکەی خەمباربکات،بەلاّم بزانەکەژیان لەدوای تۆهەربەردەوامەو ناوەستێ وئەودڵ ڕەق وستەمکارانەی خراپەیان لەگەڵ تۆداکردوە منیش میوانیان نیەودەڵێن بێعەقڵ بورنەیتوانی ڕوبەڕوی کێشەکان بێتەوە،نایائەوە عەقڵەمەزلومەکان خۆیان بکوژن وزاڵمەکان بمێننەوە؟لەڕوی زانستیەوەئەم کارەبێ دەسەلاّتی وبێ عەقلیەچونکەلەوەتەی دنیا دنیایەخێروشەڕهەربووەو لەسەردەمی قابیل و هابیلەوەتاوەکەڕژاوەبەلاّم تۆبۆچی لایەنی شەڕهەڵدەبژێری خۆکەس تاسەر بێکارنیەو خەمبارنیەونەخۆش وهەژارنابێ،هیچ گرفتێ بەخۆ کوشتن چارەسەر نابێ ئەوتێگەیشتنە

هەڵەیە،کەدەرنەچوی ئایاژیان هەربریتیە لەشەهادەخۆیاو باپیرانمان شەهادەیان نەبوخۆلە وڵاتی سویدگرفتی ماددەوگوزەرانیان نیەولەگەڵ ئەوەشدارێژەی خۆکوشتن لەهەمودنیازیاترە چونکە دەڵێ تێربوم لەڕوی مادەوجەستەوە بەلاّم چونکە لایەنی ڕۆحی برسیەوخۆی دەکوژێ ...، لەلایەنی ئاینیەوە ئەم کارەحەرامەوقەتڵەولەتاوانە گەورەکانەو سەرەنجامەکەی ئاگری دۆزەخە،دیارەحکومەتیش بەرپرسیاردلەوەی وڵات ئاوەدان دەکاتەوە بەلاّم لەڕێگەی پەروەردەی ڕەسەن وڕۆشنبیری دروست دڵە کان ئاوەدان ناکاتەوەوگرنگی بەناخی مرۆڤەکان نادا!کەدەرمانی ئەوبوارە پەیامی ئیسلامی نازدارە..،زۆرێك لەوانەی خۆیان دەکوژن ئەوانەن دینداریان لاوازەوڕۆحیان برسیە،یان باوەڕیان بەلێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی نیە، میدیاش کاریگەری سلبی هەیەلەسەرڕەوشەکەوخۆکوشتن دەکەنەمانشیت وحاڵەت دەکەنەدیاردە! سەرەنجام پاڵەوانی فلیمەکە خۆی کوشت وبەوەش کوڕوکچی هەرزەکار لاسایی دەکاتەوە .

---

*ئەم بابەتەلەگۆڤاری خێزان ژمارە(٥٧)مانگی/١٠ی٢٠١٠بلاوكرایەوە.

# حیکمەتی حەرامبوونی گۆشتی بەراز

لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوزانستی سەردەم موعجیزەکانی قورئان و راستیەکانی ئیسلام زیاتردەدرەوشێتەوە ئەوەدەسەلمێنن کە تەکنەلۆژیا لە خزمەتی ئیسلامدایە دوای بڵاوبوونەوەی ئەنفلۆنزای بەرازومەترسیەکانی ڤایرۆسی(H.N)حیکمەتی حەرامبوونی گۆشتی بەرازکەلەقورئاندا بەتایبەت ئاماژەی بۆکراوەزیاتربووبەجێگەی سەرنج و هەڵوێستە لەسەرکردن بۆخەڵکانی خاوەن بیروهۆش،پزیشکێکی ئەڵمانی بەناوی(هانسەریلفیك) سەرنجیدالەنێوان دووتیرەی (هۆنزا)کە لەچیاکانی هیمالایە نیشتەجێ بوون، تیرەیەکیان موسوڵمان بوون وگۆشتی بەرازیان نەدەخوارد ،ئەوەی سەرنجی پزیشکەکەی راکێشابووئەم هۆزە زۆرچالاك وتەندروست بوون،بەڵام هۆزە کەی ترلەگەڵ ئەوەشدا کە لەهەمان نەژادو نەتەوەیەو لەهەمان ناوچەشدا بوون بەڵام دووچاری چەندین نەخۆشی سەردەم بووبوون!
چونکە موسوڵمان نەبون وبەرازخۆربوون،دکتۆرەکە وتی:گۆشتی بەرازنەك لە ئیسلامدا بەڵکو لەهەموو ئایینەکانی تریشدا حەرامە.زۆرکەس هۆی حەرامبوونی دەگێڕنەوە بۆ بونی کرمێك بەناوی(الکیرکینا)لەناوگۆشتەکەی دایە چونکە بەرازگیانلە بەرێکی گیاخۆروگۆشت خۆرە وەك مرۆڤ بۆیە حەرامە خواردنی—والله اعلم.
لەڕووی بایلۆجیەوە تەمەنی بەرازچەند ساڵێکی کەمەودەبێ سەربڕدرێت پێش ئەوەی بگاتە شەش ساڵ ئەگەرنا لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە دەبێت، هەروەهالەقەسابخانەکاندا پێش سەربڕینیان بەچەند هەفتەیەك دەبێ ئەندامی نێرینەکەیان ببڕێت ئەگەرنالەکاتی سەربڕیندابۆگەنێکی زۆری لێ دێ ولەنرخی گۆشتەکەی کەمدەکاتەوە بەهەرشێوەیەك سەربڕێ گۆشتەکەی ناتەندروستە،بۆیەخوای گەورەفەرمویەتی(فإنهُ رجس)

**سیفەتەکانی بەراز:**

١-سیفەتە بێزراوقێزونەکانی بەرازئەوەیە تاکەگیانلەبەرێکە پاشەڕۆی خۆی دەخوا

٢-بەراز گیانلەبەرێکی بێ غیرەت وبێ شەرمە ئەم دووسیفەتەبەهۆی خواردنی

گۆشتەکەیەوە دەگوێزرێتەوە بۆنەوکەسەی گۆشتەکەی دەخوات! بێگومان دارمانی رەوشت ونەوهەموحاڵەتی ئیغتیصابەی لەرۆژئاوا ڕوودەدات دوورنییەبەشێکی لەبەکارهێنانی ئەوگۆشتەوە سەرچاوەی گرتبێت.

٣-بەهۆی ئەوکرمەوەکە لەگۆشتی بەرازدا هەیە مرۆڤ دووچاری داوێنپیسی دەبێت وتوانای بەرگری کردنی لەخۆی نامێنێ.

٤-بەرازلەبەرئەوەی گیانلەبەرێکی پیسوپۆخڵە هەمیشە هەڵگری جۆرەها میکرۆب ونەخۆشی یە،هەروەها کۆمەڵێك نەخۆشی پیس هەن کە بەرازخۆی توش دەبێت ولەوێشەوە دەگوێزرێتەوە بۆخاوەنەکەی.

جیاوازی گۆشتی بەرازلەگەڵ گۆشتی گیانلەبەرانی تردا:

١-گۆشتی بەرازبچوك بێت یان گەورە رێژەیەکی یەکجار زۆرچەوری تێدایە بەبەراوردلەگەڵ گۆشتی گیانلەبەرانی تردالەبەرئەوە لەکاتی بەکارهێنانی گۆشتی بەرازدا رۆنی تێناکرێت،چونکە زۆرچەورە بەخواردنی ئەم گۆشتە چەوری لەلەشی مرۆڤدا کەڵەکە دەبێت وبەئاسانی لەش توانای رزگاربوونی نیە لەوچەورییە،هەروەها هەرس کردنی لەگەدەدا زۆر نارەحەتە بەهۆی ئەو چەورییە زۆرەوە.

٢-کە باسی چەوری دەکرێت واتە بونی رێژەیەکی زۆری کۆلیسترۆڵ لەناویدا ئەم ماددەش کە تێکەڵ بە خوێن بوو پەستانی خوێن بەرزدەکاتەوە، هەروەهابەکەڵەکەبوونی لە دەمارەکانی خوێندا ئەبێتە هۆی ئەستوربوونی دەمارەکان وزۆرجاریش قەپات بونیان کە دەبێتە جەڵتەوسستی سوڕی خوێن لە قاچ ودەستدا بەتایبەتی لەوکەسانەدا کە جگەرەکێشن پرۆفیسۆر(رۆفۆ) ئامۆژگاری نەخۆشەکان دەکات بەدورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی گۆشتی بەراز چونکە زۆرمەترسیدارە.

٣-گۆشتی بەرازدەوڵەمەندە بە ئاوێتەی کبریتی هایدرۆمبینی کە بەخواردنی ئەم ماددە مرۆڤ دوچاری رۆماتیزم وهەوکردنی جومگەوئێسك وبڕبڕەی پشت دەبێ.

پرۆفیسۆر (بیر)رایگەیاندچەندە رێژەی ئەوکبریتەکەمتربێت رێژەی بەرگری و توندوتۆڵی زیاتر دەبێت،بەڵگەش لەسەربوونی ئەومادەدەیە پارچەیەك گۆشتی بەرازوچەند گیانلەبەرێکی هێناوهەریەکەیانی کردە گیراوەی تایبەتی لە ئەنجامدا گۆشتی بەرازەکە بۆگەنێکی بڵاوکردەوە بەئەندازەیەك لە ژوورەکەدا خۆی بۆرانەگیرائەوبۆنەش ماددەی($H_2S$)واتە کبریتی هایدرۆجین بوو بە پێچەوانەی گۆشتی گیانلەبەرەکانی ترەوە وەك مانگاوبزن.

٤-گۆشتی بەرازرێژەیەکی زۆرماددەی هیستامینی تێدایەکە دەبێتە هۆی توش بوون بەحەساسیەت،ئەوکەسانەی ئەم گۆشتە دەخۆن دوچاری خوران دەبن لەپێشداودواتریش دوچاری نەخۆشی (ئاوڵە)وزەردویی وهەوکردنی پێست و دەمارەکان دەبن،لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە ئەومادانەی هەوکردن دروست دەکەن لەرێگەی گۆشتی بەرازەوە ماددەی هیستامین وئەرکۆمایۆ نین،ئەگەرمرۆڤ لەرێگەی دەرزی یەوە ماددەی هیستامین بکرێتە لاشەیەوە دوچاری قورحەی گەدەوخواردن ورەبۆوهەوکردنی لوت وتێکچوونی لێدانی دڵ وتەنانەت جەڵتەی دڵیش دەبێت بۆیە ئامۆژگاری ئەوکەسانە دەکرێت کە دوچاری جەڵتەی دڵ بوون واز لە خواردنی گۆشتی بەراز بهێنن.

٥-گۆشتی بەرازکۆمەڵەکاریگەرییەکی تێدایە بەناوی فاکتەرەکانی خوێن (BloodFactors) وەك ئۆتکۆجین وئیندۆبایۆنتوو سیفۆنۆسپوراو پۆلێنۆرفا،هەرچەندە تائێستا ئەندازەی لێکچوونی لەنێوان ئەم ماددانەدا نەزانراوە،بەڵام زانای روسی(سپیرناسکی)بەوماددەی سەرەتاییانەی لە قەڵەمدان کە دەبنە هۆی توشبوون بەشێرپەنجە.

٦-لەگۆشتی بەرازدا ڤایرۆسی ئەنفلۆنزاهەیە،پرۆفیسۆر(شۆپ)لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی ڤایرۆس لە لەندەن ئەم ڤایرۆسەی دۆزیەوە،شایەنی باسە ئەم ڤایرۆسە لەسیەکانی بەرازدا بەرێژەیەکی زۆرهەیە،سیەکانی بەرازیش لە دروستکردنی(باستۆرمە)دا بەکاردەهێنرێت کە

خـــــواردنێکی ئامــــــادەکراوە لــــــە زۆربـــــەی وڵاتـــــە رۆژئاواییەکانـــــدا رۆژانــــە بەکاردەهێنرێت،لێکۆڵەرەوەکە رایگەیاند ئەم ڤایرۆسە دەچێتە سییەکانی ئەوکەسانەی ئەم خواردنـە دەخـۆن و لەوێـدا دەمێنێتـەوە تابـارودۆخێکی گونجـاوی بـۆ دەرەخسێت پاشـان زۆردەبـن وتەشـەنە دەکـەن و ئەوکەسـە توشـی نەخۆشـی دەکـەن.لێـرەدا دووپرسـیاردێتە ئـاراوە:بۆچـی گۆشـتی بەرازکەسەرچـاوەی ئـەو هەموونەخۆشـیەیە تائێـستاش بـەردەوام بـەکاردەهێنرێت لـە ئـەوروپاورۆژئاوادا؟ یـان بەرازبەوهەمووزیانـەوە ئـەبێ حیکـەمت لـە دروستکردنی دا چی بێت؟لەوەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین:پزیشکێکی ئـەڵمانی بـەناوی (هوفمان)رایگەیاندکە گۆشتی بەراز هەمو نیشانەکانی موعتادیی تێدایە،ئەوەشی راگەیاند ئەوکەسانەکەگۆشـــتی بـــەراز دەخـــۆن بەهەموئـــەم زیانانـــە ئاگاداردەکرێنـــەوە لەلایـــەن پزیـشکەکانیانەوە،بەڵام لەبەرئـەوەی خویـان پێوەگرتـووە نـاتوانن دەسـتی لێ هـەڵبگرن هەروەها ئەو کەسانەی مودمن بوون بـە خـواردنی عـارەق وجگـەرە.. لـەوەڵامی پرسـیاری دووەمدا دەڵێین:خوای گەورە هیچ شتێکی بـەبێ هـودە دروسـت نـەکردووە بـەرازیش خـوای گەورە بۆپاك کردنەوەی پاشەڕۆ(نفایات)ی سەرزەوی دروستی کردووە چونکە گیانلەبـەرێکی پیس خۆرە نەك بۆ خواردن.

دەگێڕنـــەوە رۆژێـــك ســـولەیمان(علیـــە الـــسلام)بەبـــەردەم گوێدرێژێکـــدا تێپـــەڕدەبێت لەسـوجدەداودەڵێ سـوپاس بۆتۆخوایـە کەبەسـەگ دروسـتت نـەکردم بـەلای سەگێکیـشدا تێپـەڕدەبێت لەسـوجدەدا دەڵـێ سـوپاس بۆتـۆ خوایەکـە بەبـەراز دروسـتت نەکردم،بـەلای بەرازێکیـشدا تێپـەڕدەبێ کـە سـوجدە دەبـات پێـی دەڵـێ ئـەی تـۆ بۆسـوجدە دەبـەی لەبەرازخراپترچیترهەیە،بەرازەکە دەڵێ سوپاس بۆ تۆ خوایـە کـە وەك مرۆڤێکـی بـێ بـاوەڕ دروستت نەکردوم!.

---

* سەرچاوە: العلم والاعجاز - ملامح الاعجاز

# شمشێر له‌ ئیسلامدا

سلاۆرەحمەتی خودای پەوروەردگار.... برێژیٚ بەسەر ئێوەی بەڕێز وئیماندار لێرەولەویٚ دەبیستین وبەرگوێمان دەکەویٚ کەئیسلام توندوتیژە وبەزەبری شمشێربە سەرماندا سەپێنراوە!کە ئەوەبوختان ودرۆیەکی شاخدارە پێچەوانەی ئایەتی خودای پەروەردگارەکە فەرمویەتی لەم بارە:(لاأكراهَ في الدين)واتە:زۆریکردن نیەلەدیندا،بەواتافراوانەکەی، هیچ شتیٚ بەزۆرنابیٚ ئەگەر بەزۆر کە سیٚ ناچاربکەی کارێك بکات ئەوە لەبەرچاوی دەیکات ودواترنایکات بەوەش دەبێتە کەسێکی دووڕوو،مەبەستم لە شمشێرچەکی سەردەم وڕۆژگارە، نەك ئەو شمێرە دارە کە لەهەندیٚ مینبەردادیارە!جێگەی سەرنج وڕازیبونی دەسەلاتدارە، کەچەکی ڕۆژگاری خۆی بوە، شمشێر لە ئیسلامدا هۆکار بووە نەك ئامانج، بۆڕامالینی کۆسپەکانی سەر ڕێگای بانگەوازی ئیسلامی، نەك بۆ بەزۆر موسلمانکردنی خەلکی، گەر سەرنج بدەین لە ئایەتەکانی جەنگ وجیهادیش (مقید)ومەرجدارن، بۆنمونە ئایەتی: (قاتلوا في سبيل اللهِ الذين يُقاتلونكم ولاتعتدوا ان الله لا يُحبُ المعتدين...)واتە:بجەنگن لەپێناوی خوا لەگەلٚ ئەوانەی شەڕتان پیٚ دەفرۆشن ولەدژتان دەجەنگن ودەستدرێژی مەکەن چونکەخوا دەستدرێژ کەرانی خۆش ناوێت، لێرەداخوای گەورە فەرمویەتی شەڕ لەگەلٚ ئەوانە بکەن کە شەڕتان لە گەلٚ ئەکەن وسنوریش نەبەزێنن دەست درێژی مەکەن زیادە ڕۆیی مەکەن،پێغەمبەری ڕەحمەت(ﷺ)لە یەکیٚ لەجەنگەکاندا ئافرەتێکی بینی کوژرا بووخەلکی دەورەی دابوو،فەرمووی نەدەبوو ئەم ئافرەتەبکوژرایە وناردی بەدوای(خالید)دا وفەرمووی:(لاتقتلوا شيخاً فانياً ولاطفلاً صغيراًولاامراءةً) واتە:پیاوی پیرومنالی پچوك و ئافرەت مەکوژن،ئەوە لە گەرمەی شەڕاکە ئەوان هاتون بۆشەڕ،وە هەروەها ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی پێشەوا ئەبوبکربۆسوپاکەی ئوسامەکاتیٚ بە ڕێکەوت بۆشەڕلە گەلٚ ڕۆمەکان پێی فەرمون: ژن ومنالٚ و پیرە پیاومەکوژن،سوکایەتی بە مردوان مەکەن، ڕەزوباخ مەبڕن ومەسوتێنن ....،ئەمە ودەیان نمونەی تر لە گەورەیی و بەزەیی ودلفراوانی ئیسلام تەنانەت

بەرانبەردوژمنانیش لە گەرمەی شەڕدا چ جای لەمامەڵەی ڕۆژانە کە ئیسلام زۆرنەرم و میهرەبانە،نەك توند وتیژیە ئەوە تۆمەت وبۆختانی نەیارانە، دیارە توندوتیژی لە شوێنی خۆیدا غیرەتی ئیمانە وەك لە شەڕی بێ باوەڕانە یان لەسەرئیسلام یان لە جێبەجێ کردنی یاساکاندا(تنفیذ الاحکام)،مێژووی ئیسلامیش لەنوسینەوەوگێڕانەوەیدا هەندێ جار چەواشەکاری تێدا کراوە،بۆنمونە (تاریخ الخلفاء،الکامل فی التاریخ)وچەندین کتێبی تری مێژویی دەبێ بەتەرازوی(کتاب،سنة)بکێشرێن،ئەوەی ڕاست دەرچومالّی ئیسلامە،هەرچی نەگونجابەمالّی ئیسلام وەرناگیرێ(بانوسەرەکەیشی زانای ئیسلامی بێت)چونکەزۆرشتی نابەجێ خراوەتەناومێژوی ئیسلامەوەلەلایەن نەیارانیەوەبەناوی ئەوزانایانەوە، نزیکترین کتێب کەڕوداوەکانی تێدا تۆمارکراوە،(تأریخ طبری) کە(٣٠٠)ساڵ دوای ڕوداوەکان نوسراوەتەوەئێستالێکۆڵینەوەی لەسەرکراوەلەلایەن بەڕێزان(دکتۆرصوبحی حسن حلاق ودکتۆرمحمد)نزیکەی(٥٠./.)ی بەناڕاست دەرچوە!! تەنانەت بۆشەڕەکانیش حەزرەت ﷺ ڕاوێژی بەهاوەلاّنی دەکرد،سەرەڕای ئەوەی کەهۆکاری جەنگەکانیش کەڕویانداوە سەرجەمیان دەستپێشخەری وناژاوەکە لەلایەن بێ باوەڕانەوە بووە کە ئێستایش هەروایە، بۆنمونە : جەنگی بەدربۆ سەندنەوەی ماڵ ومافی خۆیان بوولە کاروانی بازرگانی قورەیشیەکان کە ماڵ وحاڵی موسڵمانانیان لە مەککە داگیر کردبوو ئەمانەیش ئاوارە ودەربەدەر کرابوون،جەنگی ئوحد بێ باوەڕانی قوریش هەڵیانگرساندلە تۆڵەی شەڕی بەدر،شەڕ لەگەڵ جولەکەی (بەنی نەزیر)بەهۆی ئەوپیلانە یان بوو بۆکوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)بەدەعوەتکردنی وبەردانەوەی بەردێکی گەورەبەسەریدا کەجبریل ئاگاداری کردەوە،لە سیرەدا هۆکاری سەرجەم شەڕەکان تۆ مارکراوە کە پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە یان دەست درێژیان کردۆتە سەر موسڵمانان ئەوشەڕەی بەنی قورەیزە و شەڕی خەندەق و ....هتد.

بەڵگەی ئەقڵی ونەقڵی ومێژوویی ئەوڕاستیە دەسەلمێنێت کە ئیسلام بەردەوام لە حاڵەتی بەرگریکردندا بووە و نەرم و نیان بووە نەك کوشتن وبڕین و توند و تیژی،خۆسپای ئیسلام نەگەیشتە هندستان و ولاتانی ڕۆژهەلاتی دوور،ئەی چۆن ئیسلام گەیشتە ئەمریکا و ئەوروپاوئوستڕالیا، تەنها لەڕێگەی بانگەواز و ڕەوشتە جوانەکانی موسڵمانان بون،تەنانەت لەو ولاتی چین گەورەترین مزگەوت هەیە بەناوی مزگەوتی (پنگ وان) کە ۱۰,۰۰۰ کەس ئامادەی وتاری هەینی دەبن تیایدا و ڕۆژانە (۲۰۰۰) موسڵمان نوێژی تێدا دەکەن، ئایا ئەوانە بەزەبری شمشێر وتوندوتیژی موسڵمان بوون؟ بێگومان نەخێر تەنها بەعەدالەت و زانست وڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام باوەشیان لەم دینەداوە، لە کاتێکدا ئەوانە عەرەبیش نین تەنانەت نەیارانی ئیسلامیش دانیان ناوە بەوەدا کە ئیسلام خوێنڕێژ نیە، پیاو ناکوژێ بەڵکو ناپیاوەدەکوژێت،زانای لاهوری(بوکید)لە زانکۆی کامبریج لەکتێبی(مقارنة الادیان)دا دەڵێ کوژراوەکانی هەردوولای موسڵمانان و بێ باوەڕان لە سەردەمی پێغەمبەردا(۵۰۰) کەس بووە،لەسەرچاوەی تر دەڵێ (۱۰۱۸) کەس بوون، کەبەڕاستی ئەو پەڕی دەست پاراستنە لەخوێن ڕێژەی،دیارە ئەگەر ناچاریشکرای دەبێ شێرانە بجەنگێ ئەوە وەك شمشێری ئێمە،ئەی شمشێری ئەوان؟ بێگومان چەك ئەگەر ئیمانی لە گەڵدا نەبوو ئەوە ستەم ودەست درێژی پێ دەکرێت و کاردسات ومەرگەساتە، ئەوەتا لە هەردووجەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا نزیکەی هەشتا ملیۆن مرۆڤیان لە ناوبردا !(۸۰) ملیۆن مرۆڤ نەك چۆلەکە،لە هەردووشاری هیرۆشیما وناکازاکی بەچەکی ئەتۆمی لەدوو ڕۆژدا(۲۰۰) هەزارکەسیان لە ناوبرد !! تەنانەت دوای ڕامانی دەوڵەتی ئیسلامی خاچ پەرستان ڕوباری خوێنیان هەستاند لەقەتل وعامی موسڵمانان،مێژوودەڵێ تەنانەت یەکێ سەربازەکانی سوپای جەنگیزخان لە بەغدادوای کوشتنی سەرجەم ئەندامانی خێزانە موسڵمانەکە منالێکی خنجیلانەوجوانی بینی لەناوبێشکەدابوکاتێك لولە تفەنگە کەی خستەناودەمی وای زانی مەمکە مژەیە، سەربازەکە هەڵوێستەیەکی کردوو نەیکوشت ئەفسەرەکە چاوی لێ بووپرسی بۆ نەتکوشت؟

فەرمانیدا ئەوسەربازە بکوژن چونکە کەسێ بەزەیی بە منالی موسلماندا بێتەوە بە کەلکی سوپای ئێمە نایە!! بەلێ لەوە بترسە لە خواناترسێ، بەردەوام مێژووی ستەمکاری بێ بەوران خۆی دووبارە دەکاتەوە، وەك لە ئەفغانستان وکشمیر وشیشان وغەززەی فەلەستین وسوریاومیصر بۆسنەوهەرسك وتەنانەت لەبۆرما دەسەلات دارانی میانماریێشانگا یان کردبۆوە بەلاشەی هەزاران مو سلمان دروشمەکانی ئازادی ومافی مرۆڤ ودیموکراسیش بونە بلقی سەرئاوچونکەخەلکی موسلمان ناگرێتەوە تەنها بۆخۆیانە،سەرەڕای داگیرکاری و دژایەتی کردنی موسلمانان بەناوی شەڕی(دژەتیرۆر)کێ توندوتیژە؟ کێ خوێن ڕێژە؟ ئیسلام یان ئەوانەی ئێستاش سوکایەتی بەپیرۆزیەکانی ئیسلام دەکەن بەفلیم وکاریکاتێرو سوتاندنی قورئان وپەراوێزخستنی پەروەردەی ئیمانی لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا....؟ئەو تە قینەوە وهەندێ شت کە بەناوی ئیسلامەوە کراوە ، ئەوە موسلمانان ڕەتیان کردۆتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هەندێکی سیناریۆی دەستی خۆیانە، هەندێکیشی کاردانەوەی ستەمی زلهێزانە، بەلێ ئەوان سەلماندیان کە بێ بڕوایان بە هەموودەنگورەنگە جیاوازەکان یەك بەرەن بەرانبەر بە ئیسلام (الكفر ملةً واحدةً) بە داخەوە ئێمە بەکردەوە پێمان نەوتن کە ئیسلام یەك ئومەتە، ئەوزەلیلیەش بە هۆی پەرتەوازەیی خۆمانەوەیە،سەرەرای ئەوەی کەبرای ئیمانین بەلام ئامادەنین ببنەیەك بەرە یان یەك لیست بن!!لە کۆتایدا سەرەنجام هەربۆموسلمانانە وەك خوای گەورە فەرموی بەموسلمانان لە شەڕی (توحود) (وَلاتخافوا وَلا تحزنوا وأنتم الاعلون إن كُنتُم مؤمنين).لە خودای گەورە دەپاڕینەوە کە حکومی ئیسلامی و شمشێری عەدالەتی ئیمانی بگێڕێتەوە سەرشانۆی ژیانمان بۆ بەختەوەری دین و دنیامان.

# كاريگەری دەست نوێژ لەسەر تورەبوون

یاساکانی ئیسلام لەپێناوبەختەوەری مرۆڤەکانە بۆبەرجەستەکردنی ڕەوشتەجوانەکانە، دەچینەخزمەت گرنگی وگەورەیی دەستنوێژ گرتن پاشان کاریگەری لەسەرتوڕەبوون.

**یەکەم :گەورەیی دەستنوێژ لە ڕووی فیقهیەوە:**

١- دەستنوێژکلیلی نوێژە،مەرجی نوێژە،نوێژ بێ دەست نوێژنابێ وبەتاڵە وقبوڵ نیە،

٢- دەستنوێژپاکوخاوێنییەوبەشێکی ئیمانە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: **(الطهورشطُرالأيمان)**

٣- گوناهەبچوکەکان دەسڕێتەوە،(ابوهريره)دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:﴿ **اذا توضأ المسلم أو(المؤمن) فَغَسلَ وجههُ خرج من وجههِ كل خطيئةِ نَظرا اليها بَعينيهِ معَ الماء، أومَعَ أخر قطر الماء .......﴾** واتە: ئەگەر بەندەی موسڵمان (ئیماندار)دەستوێژی گرت دەم وچاوی شۆرد، ئەوا هەرگوناهێك بەچاو کردوویەتی ل.گەڵ ئاوەکەدا دەڕوات، یا لەگەڵ دواتنۆکی ئاوەکەدا، بەهەمان شێوە بۆ شۆردنی دەست وقاچەکانیش.... بۆیە سڕینەوەو وشك کردنەوەی دەست نوێژبەخاولی باش نیە وکەراهەتی هەیە.

٤- دەستنوێژ ڕێگای بەهەشتە،لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە کە پرسیاری کرد لە بیلال فەرمووی:**(حَدِثني بأرجى عمل عَمِلْتَهُ في الأسلام)**....، ئەی بیلال بۆم باس بکە چ کارێکت زۆر ئومێدت پێیەتی بۆدوارۆژت،چونکە من لە بەهەشتدا لە پێش خۆمەوە گوێم لە خشەی نەعلەکانت بوو، فەرمووی وەڵا قوربان شتێکی ئەو تۆم نیە، بەڵام لەگەڵ هەموودەستنوێژێ نوێژم کردووە، واتە سوننەتی دەست نوێژ ودەستنویژ تازە کردنەوە......

٥- دەستنوێژ نیشانەی ناسینەوەی ئوممەتی محمد(ﷺ)،لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە کە هاوەڵان پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن براکانت دەناسیتەوە کە نەتبینیون (لەو قەرەباڵغی مەحشەردا)پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کەسێك چەند ئەسپێکی چوار پەلْ سپی ناوچەوان قەشانی هەبێ لە ناو کۆمەڵێ ئەسپی ڕەشدا ئایا دیارنین لە دوورەوە؟، وتیان بەڵێ، فەرمووی ئومەتی من لەو ڕۆژەداچوارپەڵیان سپیە لە شوێنەواری دەستنوێژ (غُرّاًمحجلين من الوضوء)

دووەم: توڕەبوون ماڵوێرانی دنیا ودوارۆژە:

توڕەبون لەپێناسەیەکدا هاتوەکە:(ظاهرةٌ أولهاجنون أخِرهاالنَدَم) دیاردەیەکە (سەرەتاکەی شێتییە وکۆتاییەکەی پەشیمانیە)لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە کە یەکێ وتی بەپێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە،پێغەمبەر (ﷺ) سێ جار فەرمووی (لاتغضب) توڕەمەبە، لە فەرموودەیەکی تردا کە(أبو داود و امام أحمد) گێڕاویانەتەوە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:گێڕاویانەتەوە،پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی(توڕەبوون لەشەیتانە و شەیتانیش لەئاگردروست کراوەوئاگریش بەئاودەکوژێتەوە،بۆیەکە توڕەبوون دەستنوێژ بگرن)، بێگومان توڕەبون لە شێوێنی خۆیدا نیشانەی غیرەتی ئیمانە وەك توڕەبوون لە سەر ئیسلام.

سێیەم: لە ڕووی زانستیەوە سەلماندنی کاریگەری دەستنوێژ لە کەمکردنەوەی کاریگەریە خراپەکانی توڕەبوون وەك موعجیزەیەکی زانستی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)لە تاقیکردنەوەیەکی تایبەتدا لەکۆلێجێکی پزیشکی کە لەسەر (١٢) کەس ئەنجامدرابوو لەلایەن ((د. وەهیب و د.هدی و دابتهال)) کە لە حاڵەتی ئاسایدا نەخشەی لێدانی دڵیان وفشاری خوێنیان بۆ کراو پاشان سیناریۆیەکیان بۆ دروستکردن و توڕەیانکردن و شەش کەسیان دەستنوێژیان گرت لەوکاتەدا و پێش دەستنوێژ ودوای دەستنوێژ پشکنینیان بۆئەنجامدراو و سەرئەنجام دەرکەوت کە توڕەبوون دەبێتە هۆی:

١- زیاد بوونی لێدانی دڵ و بەرزبوونەوەی فشاری خوێن

٢- بەرزبوونەوەی ڕێژەی شەکر و کۆلیسترۆڵ

٣- بەرزبوونەوەی ئاستی(کۆرتیزۆڵ)کەڕێگرە لە جوڵەی خوێن و خێرایی گواستنەوە.

بەلاّم ئەوانەی دەستنوێژیان گرتبووجیاوازیان گەلێ زۆر بوو لە دابەزینی خێرای لێدانی دڵ و فشاری خوێن و کاریگەری ڕاستەوخۆی بووە لە ئارامکردنەوەی دەرونیان!! وە هەروەها لە توێژینەوەیەکی تری زانستیدا دکتۆر(تشیفتشك)) ئەوەی سەلماندوە کە ئاوی سارد کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر دابەزینی پلەی گەرمی ئاستی فشار، ئەندامەکانی دەستنوێژیش سەرجەم ئەو شوێنانە دەگرنەوە کە پلەی گەرمی (تا) دادەبەزێنێ وەك ناوچەوان و پێیەکان، دیارە ئاخی مرۆڤ بەردەوام گەرمە،لە نوێترین توێژینەوەی پسپۆڕانی ئەڵمانیادا لە سەربەکارهێنانی ئاوی سارد کە زۆر بەسوودە و هۆکارە بۆبەهێزکردنی کۆئەندامانی بەرگری لەش، ئارامکەرە وەیە بۆ مێشك چونکە هۆرمۆنی (ئەندرۆمین) بە لەشدا بلاّو دەکاتەوە ئەوەش دوورت دەخاتەوە وە لەو دڵتەنگی و ئازاری ماسولکەکان، وە هەروەها ئاوی سارد هۆکارە بۆ تەمەن درێژی و دواکەوتنی نیشانەی پیری توێژینەوەکە بۆچونی (أبن سینا) پشتڕاست کردۆتەوە کە ئاوی گەرەم تەمەن کورت دەکات خوێن دەگەنێ و دەترشێت.

مامۆستایەکی هاوڕێم هەیە قەت بەئاوی گەرم خۆی ناشوات ولە زستانیش دا خۆی لە زۆپا دوور دەگرێ و لە بەرامبەر داجستەی مەناعەیەکی بە هێزی بۆ دروست بود کە تائێستا کۆکە وهەلاّمەتی نەگرتووە، ئێمەش گرتومانە بە ئاوی گەرم کە زۆر خراپە و زۆر بەمان وەك (هینی مەصلحە) ناسك بوین و بەهەوایەکی کەم ساردو گەرم هەلاّمەت دەگرین و نەخۆش دەبین، بەلێ تەکنەلۆژیای سەردەم لە خزمەتی ڕاستیەکانی ئیسلامدایە و سەرجەم فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) لە بەرژەندەوەی دین و دنیا ماندایە،

حیکمەت و فەلسەفەی زۆریان تێدایە، لەوانە دەستنوێژ کە بەردەوام ڕۆژی چەندجارێ دەستنوێژ دەگری جگە لەوەی کە عیبادەتە و پاکوخاوێنییە، تەندروستی جەستەیشی تێدایە و دەرمانی دەردانە، لە کۆتایدا ئایا: بەم شێوەیە گرنگی و گەورەیی و کاریگەری دەستنوێژت زانیوە؟ یان هەر بەپلە لە کۆڵ خۆت کردۆتەوە، ئایا سەرنجت داوە کە لە پەیوەندی وکاریگەری(دەستنوێژ وتوڕەبوون وتەندروستی) وەك لە سێ خاڵی سەرەوەدا تیشکی خرایە سەر.

خۆزگە دکتۆرەکانی ئێمەش ئاوا لێکۆڵینەوەی زانستیان بکردایە لەخزمەت زانستابونایە نەك تەنها لەخزمەت پارەوبازرگانیدا ![1]

---

سەرچاوە/ گۆڤاری هەیڤ ژمارە (٢٨) ٢٠١٣

ئەم بابەتەلە سپێدە T.V بەرنامەی ڕۆشنایی بلاوم کردەوەلە ٢٠١٣/٢/٦

# ڕاگەیاندن ئەمانەتە ..... چەواشەکاری خیانەتە

الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله وعلی آلهِ وصحبهِ ومَن والاه..

وبعد: اصیکم بتقوی الله.....،

لەم وتارەدا تیشك دەخەینەسەرلایەنەچاکوخراپەکانی میدیا بەهەمووجۆرەکانیەوەلە(بینرا و بیسترا وخوێندراو)، ڕاگەیاندن ڕۆڵی کاریگەری وسەرەکی دەبینێ لەم ڕۆژگارەدالەشەڕی فیکرداودەسەلاتی چوارەمەولە هەمووماڵێکدایە،جاران دەوتراخەڵکی لەسەرئاینی پاشاکەیانن،بەڵام ئێستادنیاگۆڕاوەوخەڵکی لەسەرئاینی ڕاگەیاندنن!لەبەرئەوەشە دەسەلاتە کان سورن لەسەردەستبەرداگرتنی دەزگاکانی ڕاگەیاندا، ئەوەتا(شەمعون پیرێز)ی سەرەك وەزیرانی پێشوی ئیسرائیل وتویەتی:(ئێمەدەتوانین لەرێگەی ئەوصەحنەبچوکەی سەتەلایت ولاَتانی عەرەبی بگۆڕین،چون کاریگەری ڕاگەیاندن زیاترەلەهێزوتوانای سوپا) لەوانەیەتۆش بڵێی دین ومیدیاومەلا کوجامەرحەبا؟بەڵام ڕاگەیاندن پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ئیسلامەوە،چونکە ڕاگەیاندنی ڕەسەن وپەسەن کاری پێغەمبەرانە(سەلامی خودایان لە سەربێت)، لە پەیامەکەی خودا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کەخوای گەورە فەرمانی کرد بە حەزرەتی ئادەم کە ناوی شتەکان ڕابگەیەنێ بە فریشتەکان(قالَ یاأدم أنبئهم بأسما ئهم / بقرة/٣٣)لە ئیسلامیشدا لە دەوڵەتی مەدینەوە دەستی پێ کردووە بە بانگدانی بیلال و پاشان وتاری هەینی و بۆنە ئاینیەکان بە ئالیەتی سەردەم تا گیشتە قوتابخانە ونوسین وشیعر وڕادیۆ و تلفزیۆن و..... هتد، پاشان کۆڕوسیمینار و گۆڤار و ڕۆژنامە، حوکمی ڕاگەیاندن فەرزی کیفایەیە ودەبێ لە هەر کۆمەڵێ خەڵکانێکی تایبەت هەستن بەوکارە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی:(فلولا نفرمن کل فرقةٍ منهم طائفةُ لیتفقهوافي الدین)، وە پێغەمبەریش فەرموویەتی:الدین النصیحة.....،دین ئامۆژگاری و دڵسۆزیە،میدیا وەك شمشێری دووسەرەدەتوانرێ بۆ چاکە وخراپە بەکار بهێنرێ،بەڵام ئەرکی ڕاستەقینەی میدیا گواستنەوە و گەیاندنی ڕاستیەکانەبە ئەمانەتەوە، دوورلەچەواشە کاری ودیماگۆجی، بەڵێ

ڕاگەیاندن ئەمانەتە ودەبێ ئەوئەمانەتە بپارێزرێ، پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی(لادین لمن لاأمانة لـهُ)واتە:دینی نیە یان دینی تەواو نیە ئەو کەسەی ئەمانەتی لانیە، کەواتە ئەومیدیا کارەی کەمتەرخەمی دەکات و ڕاستیەکان دەشێوێنێ و یان دەیانشارێتەوە ئەواخیانەتی کردووە ودینەکەی ناتەواوە،بەندە هەندێ جارکەچاوپێکەوتنم لەگەڵداکراوە بلاویان نەکردۆتەوەچونکە قسەکان حەق ورەق بون لەبەرژەوەندیان نەبوە! ئامانجی ڕاگەیاندنی ڕەسەن چاکسازی وپاکسازیەبۆیەدەبێ میدیاکان بەتایبەت ڕاگەیاندنە ئیسلامیەکان ئەم ئایەتەبکەنە دروشم وڕێبازی کاری خۆیان(ان اریدالا الاصلاح مااستطعت وهەوڵەکانیان بۆچاکسازی بێت وڕێنمایی ڕاست ودروست بلاوبکەنەوە،ئەوەتا هەندێ جاردوژمنان بەهێزی چەك ولاتی موسڵمانانیان داگیرکردوە،پاش ماوەیەك هەندێکیان موسڵمان بون بەهۆی ڕاگەیاندنی حەق و ڕاستیەوە لەلایەن بانگخوازانەوە،خۆسوپای ئیسلام نەگەیشتەولاتانی هیندونەوروپا وڕۆژئاوا وئوسترالیا و چین و ژاپۆن ومالیزیا ...،بەڵکوبە هۆی بازگانی وڕاگەیاندنەوەخەڵکێکی زۆرموسڵمان بون؟[٢]

**ڕاگەیاندن چەکی سەردەمە:**

دوژمنان لەکۆنەوەزانیویانەکەڕاگەیاندن گەورەترین چەکەبۆڕوبەڕوبونەوەموسڵمانان،بۆنمونە کاتی خۆی شاعیرێك بەقەدەرکەناڵێکی ئاسمانی دەوری بوە،بۆیەکاتێ شاعیرێك بەناوی (اعشی)لەیەمەنەوەبەرێکەوت بەرەومەدینەبۆئەوەی موسڵمان بێت،کافرەکان چونەڕێگەی پێانوت:نازانی گەرموسڵمان ببی ڕێگەی مەی خواردنەوەت نادرێ،وتی مەی شتێکی خراپەومرۆڤ بێ عەقڵ دەکات،وتیان ڕێگەی زیناوڕابواردنت لێدەگیرێ،وتی:پیربوم وکارم بەوشتانەنەماوە،کەزانیان ناگەڕێتەوەوتیان(١٠٠)وشترت ئەدەینێ بگەڕێوە، ئای تەماع

---

لەبەرنامەی ڕۆشنایی کەناڵی سپێدە لە(٢٠١٣/٣/٧) بلاو کردەوە،هەروەها لەمزگەوتیش وەلە(سایەی شەریعە)ی پەیام لەشەوی ٢٣ بو ٢٤ /٢٠١٣/٤ لەساڵیادی ناوی ڕۆژنامەگەری دوبارەمکردەوە [٢]

سەدوشتربەزمانی ئەمڕۆواتە(١٠٠)مۆنیکا،بەوەڕازی بوگەڕایەوەولەنزیك یەمەن لەوشترێك بەربۆوەوبە کافری مردوخێری لەومالّەنەدی،باشەشاعیرێك ئەەندەگرنگ بوەتائەوەندەی بدەنیّ؟بەلّیّ، دیارەزۆرشارەزابون،چونکەزانیویانەئەوەجۆرێکەلەراگەیاندن،ئێستاش ڕاگەیاندن بودجەی زۆری لەسامانی گشتی بۆخەرج دەکریّ،بەتایبەت میدیای حیزبی و سێبەر،ئەوەش تەصدیقی قورئانەکەدەفەرموێت کافران مالّوسامان سەرف دەکەن لەپێناودورخستنەوەی خەلّکی لەدینی خوا،(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ).

**جۆره کانی ڕاگەیاندن:**

١) ڕاگەیاندنی ئیمانی: ئەوەیان میدیای ڕەسەن و پەسەنە وپێناسی گەلی موسلّمانەو یەکتاپەرستی و ڕاستیەکانی ئیسلام بلاّودەکاتەوە کەژمارەیان کەمە.

٢) ڕاگەیاندنی شەیتانی:ئەوانەدژایەتی ئیسلام دەکەن بەناوی پێشکەوتن وعەولەمە

٣) ڕاگەیاندنی نیقاف ودووڕو: ئەوانە کە میدیای سێبەرن وتەنها بەرژەوەندی حیزبەکەی لە بەرچاودەگریّ ودروشمیەکانیان ئەوانەبەلاّم کردەوەی پیّ ناکەن ودیاگۆجی پیشەیانەو(دعاة علی ابواب جهنّم)خەلّکی بانگ دەکەن بەرەو ئاگاری دۆزەخ، ئەو میدیایانەن کە سەربە موخابەراتی گاوروجولەکە وماسۆنیەتی جیهانین کەتاوان باردەکاتەپالّەوان،موسلّمان بەپیاو کوژودواکەوتوو نیشان دەدآت،کەلتوری بێگانەوەك بەرەللاّیی بەپێشکەوتن نیشان دەداوە دەیکاتەخۆمانە وهی خۆمانەدەکاتە بەبێگانە!!

(تۆی میدیاکار ورۆژنامەنوس:هەرشتیّ بلاّوبکەیتەوە لەخێروشەڕی دنیاو قیامەتی بەشداری بەرپرسیاری)

**نمونەی دەزگای راگەیاندن وکاروپیشەیان:**

تەلەفزیۆن/ T.V

**تەلەفزیۆن:** ماڵەکانی ئەمرۆ بێ تەلەفیزیۆن نیە،ئەم ئامێرە ئەگەربەدەست بڕوادارانی ڕاستەقینەوە بێ سودبەخشەوبەشێکەلەپێشکەوتن بەڵام ڕادیۆوتەلەفیزیۆنی ئەم سەردەمە قورئان گوتەنی (**اثمهما اكبرمن نفعهما**)زەرەریان زیاترەلەقازانج،تەماشاکردنی فلیمەکان و گوێگرتن لەزۆربەی گۆرانیەکان حوکمەکەیان لەکات بەفیرۆدان تێپەڕدەکات بەرەوحەرام چونکە(**كل مايجرّالى الحرام حرام** )،بەوە زیان لە دین ودنیامان دەدات وتەلەفزیۆن دەبێتە (تەلەفی دین)بابەئەندازەی پێویست لیّی بچنە پێش بۆئاگاداربوون لەهەواڵی دنیاوبابەتە زانستییەکان..، یەکی لە سیفەتی میدیای ڕەسەن ئەوەیەکە واقعی بێت وهەڵقوڵاوی جەماوەرەکەی بێت ونوێنەروپێناسی خۆی بپارێزێ، هەندێ لە تیڤیەکانی خۆمان بەردەوام لەشایی خۆشیدان؟ هەیانە بەدەگمەن وێنەی مزگەوتێك پیشان نادا لەکاتێکدا کورد ٩٠٪ موسڵمانە ونزیکەی(٥٠٠٠)مزگەوت لەکوردستانداهەیە،گرنگی بەجل وبەرگی کوردی وکەلتور و ڕەسەنایەتی میللەتەکەیان نادەن ولەخزمەتی کەلتوری بێگانەدان!! ئەوە باسی ئافرەتی ڕوت هەرناکرێ کەسوکایەتی بەئافرەت دەکەن وبەناوی مافی ئافرەتەوە بازاڕی خۆیانیان پێ گەرم دەکەن،یان لەپێناوگەرمکردنی بازاڕی خۆیان وسەرقالکردنی خەڵك و بێ ئاگادارکردنیان لە پرەسە سەرەکیەکان دەبینی لە سەری ساڵی زاینیدا وانیشان دەدەن کە کوردستان زۆرینەی مەسیحیە یان لە (٨)ی مارسدا وادەزانی ئافرەت لە کوردستان گەورەترین ستەمی لێ کراوە، یان نەورۆزت لێ دەکەن بە جەژنێکی نەتەوەی کورد کە وانیە ودرۆیە، ئەمە ودەیان دیاگۆجی تر کە خەڵکی متمانەی بەزۆرێك لە میدیا کان نەماوە کاتێ یادی ڕاپەڕین دەکرێتەوە وانیشان دەدەن کە مەلا ومزگەوت هیچ ڕۆڵێکیان نەبووە!! لە کاتێکدا زۆرترین کاریگەریان بووە لەحەوانەوەی(پ.م) هاندانی جەماوەرجگە لەوەی کە زانایان شۆڕشی ئیسلامیان بەرپاکردوە.

**تلفزیۆن وڕیکلام:** هەندێ کە ئاڵ وەك بازرگانی داهاتێکی زۆری دەستکەوت دەبێ بە ڕیکلام، کەواتە هەتا زۆریان بدرێتێ چاکتر دیعایەی بۆدەکەن ومێشێ دەکەن بە گامێش،

جاری وایە ئەو شتە بازاڕی نەبووە و ماوەی بەسەرچووە لبۆیە هەردرۆیەك زیادەڕەوەیەك بکرێ لە ڕیکلامدا خیانەتەو حەرامە...

**تلفزیۆن وسیاسەت:** لەبەرئەوەی زۆربەی میدیاکان حیزبین ومیدیای سێبەرن ئەوە هەرشتێ لە بەرژەوەندی سیاسەتی حیزبەکەی نەبێت بلاۆی ناکاتەوە!!

**تلفزیۆن وشەوخونی:** خەلکێکی زۆر تا شەوانێکی درەنگ ئالوودەبون بەسەیرکردنی فلیمەکانی شەو ئیتر عەقلێ وچاوی کۆنترۆل دەکات تادرەنگانی شەو ناخەوێت و بەیانیش نەوە نوێژەکەی هیچ تەنانەت بە پەلە کاتی دەوامیش هەر وڕەو تێرخەو نەبووە کاتێکی زۆری داناوە بۆ سەیرکردنی و پشتی داناوەبۆپالدانەوەی بەلام لە ٢٤ سەعاتێ نیو سەعاتی بۆخواپەرستی دانەناوە ولەنوێژەکانیشی زۆر بەپەلەو بێ ئاگایە، شەوێ لە میوانی برادەرێك بووم سەیر ئەوەبوو کە تەلەفزوێنەکەی هەلنەکردبوو، منیش وتم بۆ هەلی ناکەن، ئەویش وتی: ئەگەر بۆلای من هاتوی با کەمی ٚ وتووێژ بکەین و باس و خواسی یەکتر ئاگاداربین لە بواری دین و دنیا ئەگەر بۆ سەیری تلفزیۆن هاتوی ئەوە هەموو کەس لەمالەوە تەلەفزیۆنیان هەیە وبەئیسراحەت لەمالەوە سەیری بکە، قسەکەیم زۆر بەلاوە ڕاست بوو، چونکە بەشێوەیەکی گشتی خەلکی لە سەیری تلفزیۆن دەمیان بوە بە تەلەی تەقیو ومێشك و چاو یشیان قفلێ بوە ومیدیا چی گوت ئەوە دەلێنەوە.

**فەیسبوك و گەنج:** بەداخەوە کە زۆرێك لە گەنج و لاوەکانمان ئالودەی فەیسبوك بون و کاتێکی زۆریان لەتەمەنی زێرینی خۆیان بەبادەدەن هیچ بەرهەمیشی نیەوهەمووی بە قوربانی لەبەرکردنی چەند ئایەتێك وفەرموودەیەك بێت جگەلەوەی کەبۆشەڕەجنێو و سوکایەتی یەکتر بەکاری دێنن..... فەیسبوك حوتە و کات هەلدەلۆشێ.... ئەوەی بەردەوام بۆی دادەنیشێت، هەریەك لەدەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەگەر پەروەردوەی ئیمانی لەگەلێ نەبێت زەرەر و زیانی زیاترە ودەبێتە گرفت و کێشە و سەرئێشە، هەرچەندە ئەم

دەزگاوئامێرانە مایەی پێشکەوتن وخۆشگوزەرانی ژیانە، بەلاّم بێ پەروەردە ئەودەرەنجامە خراپەنەی لێدەکەوێتەوە کە باسکران

**بەمۆبایلەکەت بێزارمان مەکە:**

سەرەڕای گرنگی وخزمەت وکارئاسانی، بەلاّم گەربەکارهێنرا بە نەزانی و بێ چاودێری و پەروەردەیی ئیمانی هۆکارە بۆ مالّوێرانی، کۆمپیتەر وفەیسبوك و مۆبایل زیاتر بۆکات بەسەر بردن بەکاردێت لە بواری تەندروستیەوە شەپۆلەکانی مۆبایل زیانبەخشە بۆنەخۆشیە دەرونیەکان لەبواری نابوریە وە مەسرەفی زۆرە و هەرنازانی چۆن (وحدە) تەواو دەبێت، لەبواری کۆمەلاّیەتیەومامەلّەی ڕۆژانەلەکاتی ناوەختدا ولەنیوەی شەویالەکاتی ئیسراحەتدا لەناو سەیارەدا بەدەنگی بەرز هاوار دەکات وحساب بۆ نەفەرەکان ناکات،جەرەسی مۆبایل کۆڕ و کۆبونەوە ومزگەوتەکانیشی نا خۆش کردووە، لە فەرمانگە کانیش کاربەدەستان کاتی زۆری پێوە بەسەر دەبن،جگەلەوەی کە زۆرکێشەی کۆمەلاّیەتی لێکەوتۆتەوە وخێزان هەلّوەشاوە و ژن تەلاّق دراوە وخەلّك کوژراوە، تکایە وێنەی کەس مەگرە بەبێ مۆلّەت وشتی کەس بلاّو مەکەوە وەبەبێ ئاگاداری خاوەنەکەی چونکە هەموو ئەوانە دەبێتە سوکایەتی وخیانەت.....،

**مۆبایل ومنالّ /** هەرمنالّە و لەهەموو تەمەکان سەرقالّی مۆبایلە یاری پێدەکات وخەلّکی بێزار دەکات! لەئەوروپا مۆبایلی منالّ تایبەتەوتەنهاسێ ژمارەی تێدایە(دایك ،قوتابخانە، پۆلیس)، سیم کارتی (علوج) و ژمارەی نەناسراو بوەبەمایەی کێشە وهەڕەشەی مەترسیدار کۆمپانیاوحکومەت بەرپرسیاری یەکەمن لە بلاّوبوونەوەی ئەم ژمارە نەناسراوانە...، ڕاگەیاندن و ڕێبازی وخۆدەرخستن، ئەوەش پەتایەکی کوشندەیە و لە کارەکاندا ناهێلّێ، بۆیە دەبینی لەو ناوەندەدا تەقواو لە خواترسان کەمترە، خوایە هیدایەتی هەموو لایەکمان بدەی بۆ ڕێگای ڕاست و ئیما ن و ئیخلاّص وتەقواو لە خواترسان... ئامین ...

**أللهم أصلح وسائل الاعلام في بلاد الأسلام.**

## جاسوسی

وتاری ئەمجارە بۆبابەتێکی هەستیارە..کەزۆر مەترسیدارە..کەمتر قسە کراوەلەوبارە.. بۆ فتنەوشەرِوئاژاوە هۆکارە.. ئەویش جاسوسیە کە بەتوندی نەهی لێکراوە، جاسوسی، سیخوری،شۆڤاری، ئەوانەن بەدوای عەیب و عاری خەڵکەوەن، یەکێ لەڕەوشتەجوانەکان کە بړواداری ڕاستەقینەی پێ دەناسرێتەوە ئەوەیەکەخۆی لەشت هەڵناقورتێنێ پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت ناچێ بەلایدا وەك بەجێهانانی فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی (مِن حُسن اسلام المرء تَركهُ مالا يعنيهِ) واتە: لەجوانی کەسی موسڵمان کە هەرشتێ پەیوەندی بە ئەوەنەبێ گوێی پێنادات، وەبەپێچەوانە وە خەڵکانێك هەن لەهەموو دیزان دەبنە ئەسکۆێ، خۆلەهەموو شتێ هەڵدەقورتێنێ و بەدوای عەیب و عاری خەڵکەوەیە!!

**هۆکاروپاڵنەرەکانی:**

نەبوونی متمانەبەخەڵکانی بەرانبەر سەردەشکێ بۆ گومانی خراپ بردن بە بەرانبەر کە ئەویش کارێکی دەرونیە(سوء الظن)گومانی خراپیش ئەتبا بەرەوکارێکی خراپی جەستەیی کەجاسوسیە، ئیسلامیش کۆمەڵگایەکی نمونەیی دەخوازێ کە ئاشکرا و نهێنیان (**ظاهیر وباطین**) یا ن پاك بێت پاشان غەیبە تکردنی بەدوادا دێت،جاسوسەکە باسی دەکات وفلاَن وایکرد وفیسار وایگوت خۆی پێوە هەڵدەکێشێ لەناوخەڵکدا ودەڵێ بەڵگەم لایە،بۆیە هەرکەس جاسوسی بکات حەتمەن دوایی دەکەوێتە غەیبەتی ئەو کەسانەوە،کەواتە هاوکێشەکەبەم جۆرەیە(گومانی خراپ ـ جاسوسی ـ غەیبەت کردن)، ئەوەش موعجیزەی قورئانە کە بێحیکمەت نیە لە ئایەتەکەدا گومانی خراپ هاتووە پاشان جاسوسی وبەدوایدا غەیبەت!! چونکە پەیوەستن بەیەکەوە﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا

فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾واته: ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان دوربگرن لە گومانی خراپ بردن چونكە هەندێك گومان گوناح و تاوانە جاسوسی مەكەن و غەیبەتی یەكتریش مەكەن جاری وایە كەسێ شەربەتی سێوی لەبەردەم بووە وتویانە مەشروب دەخوا،چونكە ڕەنگەكەی لەودەچێ!! بەو گومانە خراپە گوناهبار بووە، بزانن كەنابێ مافی خەڵكی پێشێل بكەین بەجاسوسی كردن بەسەر مسوڵمانانەوە، بۆت نیە باسی ماڵ وحاڵ و كەم و كورتیەكانیان بكەی، مەبنە چاودێر بەسەر خەڵكەوە(دوایی بەرسوایی و خەمەوە سەردەنێنەوە) چۆن دەژین چی دەكەن؟ تەنانەت ئەگەر لەماڵی خۆیدا بەنهێنی تاوانێك ئەنجام بدەن مادام ئاشكرانیەمافی ئەوەت نیە جاسوسیان بەسەرەوە بكەی، یەكێ لە هاوەڵان بەناوی (أبي الهيثم) ئەڵێ وتم بەعوقبەی كوڕی عامر: جیرانەكەمان بە نهێنی ئارەق دەخۆنەوە منیش بەتەمام پۆلیس ئاگاداربكەمەوە تابیانگرن،عوقبەپێی وتم: وامەكە بەڵكو ئامۆژگاریان بكەو بیان ترسێنە كە نەخۆنەوە؟ وتی چونكە من گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ)بوودەیفەرمو:(من سَتَرَعورة فكانماأستحيامؤدة في قبرها)(أبوداود،النسائي وابن حبان

واتە هەركەسێ عەیبی كەسێ داپۆشی وەك ئەوەیە زیندەبەچاڵێكی زیندوكردبێتەوە، لە گێڕانەوەیەكی تردا هاتووە هەركەسێ عەیبی كەسێ داپۆشێت خواعەیبی ئەوداداپۆشێت لە قیامەتدا، وەلە پێناو پاراستن و داپۆشینی عەیب وعاری خەڵك پێغەمبەر(ﷺ) حەرامی كردووە چاودێری كرنی خەڵك بەبێ ئاگاداری ئەوان، تەنانەت ئەوكەسانە هەرچیان بەسەر بێت لەوكارەخراپەیاندا خوێنیان بە زایە دەڕوات، بۆیان هەیە ئەوچاوەی كوێر بكەن، وەك چۆن گوێ هەڵخستنیش حەرامە بەبێ ئاگاداری ئەوان، لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە(من أستمع الى حديث قوم هم لَهُ كارهون صب في ادنيهِ الأنك يوم القيامة

(البخاري) واته:هەركەسێك گوێ هەڵبخات بۆ بیستنی قسەی كەسانی تركە حەزناكەن، ئەوا خودای گەورە قورقشمی سپی تواوە دەكاتە گوێچكەیانەوە، ئەوە حوكمی كەسێك بێ كە لە فزولی حەزێكی خۆیدا گوێ لە قسەی كەسانێك بگرێ كە پەیوەندی بەوەوە نیە،دەبێ حوكم و سزای ئەو كەسەجۆن بێت كە جاسوسی دەكات ڕاپۆرت و زانیاری موسڵمانان دەبات بۆ موشریك و دوژمنانی ئیسلام،عەیب و عارو نهێنی موسڵمانان بلاٌودەكاتەوە بەوەش دۆستایەتی و پشتیوانی خۆی دەسەلمێنێ بۆ بێ باوەڕان،لە پێناوپارەیەكی حەرام و پیسداجاسوسی لەسەر موسڵمانان دەكەن و بەوەش سەدان لاوی موسڵمان و ڕەوشت بەرز دەخەنە زیندانی تاغوتان و جۆرەها ئەشكەنجەیان لەسەر تاقیدەكەنەوە.....

جاسوسی وگەڕان بەشوێن كەم و كورتی موسڵماناندا لە ڕەوشتی دووڕوو دەغەڵەكانە(صفة المنافيقين) كەتەنها بە قسە باوەڕدارن، (ابن عمر) ئەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) چوە سەر مینبەر بە دەنگی بەرز فەرمووی: (ئەی ئەوانەی بەزمانیان موسڵمانن و ئیمان نەچۆتە ناو دڵیان: لا تؤذوا المسلمين و لاتتبعوا عوراتهم......، (ئازاری موسڵمانان مەدەن و مەگەڕێن بەدوای عەیب و عاریان، هەركەس بەدوای عەیبی موسڵمانان بڕوات خوایش عەیب وعاری ئەوان ئاشكرادەكات، تالەناو ماڵ و منالی خۆیشیدا بێت ئابوری ئابڕوی دەبات ) (ترمذي وابن ماجه، أبوداود)

**پێناسەی جاسوس:** كەواتە جاسوس (سیخوڕ ،شوڤار) كەسێكە بەدوای نهێنی وكەموكوڕی خەڵكەوە وێڵە بۆ مەبەستی خراپ، بەلاٌم ئەوە بزانە كە جاسوس جیاوازە كە (تحسس)، تحسس سۆراخ كردن و گەڕانە بۆ شتێكی ڕەوا بۆمەبەستێكی باش بۆ بەرژەوەندی گشتی وچاكەی موسڵمانان، وەك ئەوەی خوای گەورە لە سورەتی یوسفدا ئایەتی (٨٧) كاتێ حەزرەتی یەعقوب بەكوڕەكانی دەڵێت(إذهبوا فَتَحَسَسوا مِن يوسف وَ أخيه.....) واتە: بڕۆن بگەڕێن هەواڵی یوسف و براكەی بزانن...، هەرچەندە بۆ خراپیش بەكارهێنراوە وەك

گوێ هەڵخستن، جگە لـە قورئـان و پێغەمبـەر (ﷺ) نـەهی کـردووە ڕێگـری کـردووە لـە جاسوسی وەك لەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی:

(... لاتَجسَسوا، ولاتقـاطعوا، ولا تَدابـدوا، وكونـوا عبـاد الله أخوانـا) (بخـاری) واتـە : جاسوسی مەکەن، پارچـە پارچـە مـەبن ،پشت لـەیکتری مـەکـەن، بەنـدەی خـوابن و بـرای یەکتربن،لە هەرەشەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:(مَن اكَـلَ برجـل مسلم اكلَةً فان الله عزّوجل يُطعمهُ مِثلَها من جهنم...)واتە:(هەرکەسێك پارویـەکی بەموسـڵمانێکەوە خوارد ئەوا خوای گەورە لە دۆزەخدا وەك ئەوپارووەی دەرخواردەداتەوە، مەبەست ئەوانەیە کەنانی خۆی پەیدادەکات بەدژایەتی موسڵمانان،.....)(بخاری و ابی داود)

وە بەپێچەوانەشەوە لە فەرموودەیەکی تردا لە (سـنن ابـی داود) هـاتوە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من حَمى مؤمناً من منافقٍ بعث الله مَلَكا يحمي لحمهُ يَوم القيامة من نـار جهنم....) (هەرکەسێك موسڵمانێك لەدەست دووڕویەك ڕزگار بکات خوای پەروەردگار لـە ڕۆژی قیامەتدا فریشتیەکی بۆ دەنێرێت تاگۆشتەکەی لـە ئـاگری دۆزەخ بپارێزێـت، وەهـەر کەسێك تانەو تەشەرێك لـە موسـڵمانێك بـدات و لەکـەداری بکـات سـوکی بکـات، خـوای گەورە لەسەر پردی سیرات ڕایدەگرێت تاتۆڵـەی لێدەکاتـەوە لـەوەی کـە وتویـەتی! جائـەوە سزای کە سێ بێ کە سومعەی موسڵمانێکی شێواندووە، دەبێ چ هەرەشەیەك لەو جاسوسە تاوانبارە بکات کە موسڵمانێکی بە گرتداوە یان بەکوشتن داوە، (سەلەمەی کوڕی ئـەکوەع) ئەڵێ: جاسوسێکی موشریکەکان لەسەفەرێکدا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) تانهێنی بـدزێت وپاشان بۆی دەرچوو پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی:(اطلبـوه فـاقتلوهُ)بیگـەنێ و بیکـوژن، (سەلەمە) دەڵێ منیش پێش هەموان خۆم گەیاندێ وکوشتم و چەك و تفاقەکەیم هێنایـەوە بۆپێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەخشی بەخۆم (متفـق علیـه).لەسـەردەمی پێشـەوا عوسمانـدا ئەوجاسوس و دووڕوانە گەورەترین ڕۆڵیان بینی لە ئاژاوە نانەوەی ناوموسڵمانان و نامـەیان

دەنوسی بۆ والی میسر بە مۆر و ئیمزای تەزویر بە ناوی خەلیفەوە کە هەرچی نارازیە بیانکوژن، لە کاتێکدا خەلیفە ئەوەی نەوتبوو نەنوسیبوو.....!

**حوکمی جاسوس:** (ابن قاسم) لە کتێبی(المستخرجه)دادەڵێت: **تۆبەلەجاسوس وەرناگیرێت و دەکوژرێت**، چونکەحوکمی جاسوس وەکوزەندیقە، (ابن تیمیه) فەرمویەتی: أمام مالك و هەندێ لە یاوەرانی ئیمام ئەحمەدیش کوشتنی جاسوس بەرەوا دەزانن (الفتاوی ۲۸ / ۱۰۹)، دیارە کوشتنی جاسوس لەسەر کوفر وهەڵگەڕانەوەیەتی نەك لەسەر شتێ تر(والله اعلم)، شێخ (ابو بصیرعبدالمنعم) لەفەتوایەکدا ساڵی ۲۰۰۱ ز وتویەتی (هەرکەس جاسوسی بکات بەسەرموسڵمانانەوە بۆ بەرژەوەندی بێ باوەڕان ئەوە (مورتەددە) هەڵگەڕاوەیە ولە بازنەی ئیسلام دەرچوەودەبێ بەکافری بکوژێ.لەکۆتایدا دەڵێم: ئەی جاسوسی.. چەند کارێکی بەدوپیسی..چەند نەگریسی..دژ بە ئایەت و حەدیسی بۆ لەدوارۆژت ناپرسی.

# ئازاد بوون له زیندان

کام زیندان؟ زیندانی ژیان،کام ئازاد بون؟ لەکۆت وبەندی تاوان،لەبەندیخانەی دنیا بۆ دوا ڕۆژی فراوان، زیندانی ڕاستەقینە ئەوکەسە نیە کە لاشەی لە زیندانە،بەڵکو ئەوەیانە کە دڵی کۆت وبەندی تاوانە کوناحت کرد تامی ڕۆیی سزاکەی واچاوەڕێتە..دە فرمسێکی پەشیمانی هەڵوەرێنە هەتا ئەمری، دەچینە خزمەت فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) کە فەرموویەتی:(الدنيا سجن المؤمن وجنة الكافر)واتە:دنیا بەندیخانەی بڕوادارانە،بەهەشتی کافرانە، چونکە بێ بڕوا سنورەکانی حەڵاڵ وحەرام ناپارێزێ و لەشێوەی ئاژەڵ تەنها لە خەمی تێرکردنی سەرو بەری دایە بەهەرجۆرێك بێت، وەك خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرموویەتی﴿والذين كفروا يَتَمتعون وَيأكلون لماتأكُل الانعام والنارُ مثوى لهم﴾(محمد ١٣) واتە: بێبڕوایان وەك ئاژەڵ دەخۆن و ڕادەبوێرن ئاژەڵانە سەرنجام ئاگرجێگایانە.

دنیا بۆموسڵمان وەك زیندانە وگرنگ ئەوەیە چۆن خۆی ئازاددەکات لەو بەندیخانەیە،دەبێ بەردەوام لە هەڵێك بگەڕێ بۆ ئازاد بوون وەك چۆن ئەوەی لە زینداندایە لە هەوڵی ڕزگار بوندایە ئەوەش بەوە دەبێ کەبزانێ چۆن دەژی نەك چەند دەژی، پێش ئەوەی باسی ڕزگار بون بکەین دەبێ ئەوە بخینە بەرچاوی خۆمان کە: لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتوە ئەم دنیایە زیندانە لەچاو ئەوقیامەتە فراوانە وەك ئەوەوایە کە پەنجەت بخەیتە ناو دەریایەك و پاشان کەدەرتهێنا بزانە چی پێوەیە؟ دڵۆپە ئاوێك لەچاو دەریاکە، قەترەبەدەریایە(ما الدنيا الأخرةِ الاكمثل مايجعل أحدكم اصبعهُ في اليم فلينظر بم ترجع....)) بۆ ئەوەی زیاتر فراوانی قیامەت بزانی لەچاو تەنگی دنیا بزانەکەلەبەهەشتدانێوانی هەردەرگایەکی (٤٠) ساڵ ڕێگایە وسێبەری دارێك لەبەهەشتدا(١٠٠) ساڵ ڕێگایە بە سواری ئەسپ، ئێمە بەلامانەوە سەیرە لەدنیا گەورەترین دارلە بەرازیل کە سێبەرەکەی تەنها(٢٠) مەترە، بەڕاستی دنیا زیندانە وشوێنی تاقیکرانەوەمانە،ژیانی نەبڕاوە لە بەهەشتی نەبڕاوەوبەرینە، بۆیە دنیا لەچاو ئەو بەهەشتەدا باڵە مێشولەیەك ناهێنێت (نەك باڵی مێش) یەك باڵی

مێشوله نەك هەردوو باڵەكەی!! كەئەوەش فەرموودەكەیە یەو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(لوكانت الدنیا تعدیل عندالله جناح بعضوضةٍ ماسقی كافراً منها شربة ماء.....) واتە: ئەگەر دنیا بەئەندازەی باڵەمێشوولەیەك نرخی بوایە لای خوائەوا ئەی دەهێشت كافرقومێ ئاوی لێبخواتەوە، بەڵێ فراوانی بەهەشت بەراورد ناكرێت بە دنیایەكی تەسك و تەنگ كە هەموویان بەش بەش كردووە و شەڕی لەسەر دەكەن، هەروەك چۆن فراوانی دنیاش لە بەرانبەر منداڵدانی ناو سكی دایك بەراورد ناكرێ و ئێمە لەناو سكی دایكماندا شوێنمان زۆر بچوك و كەم بووە چەند سانتیمەترێكە لەچاو دنیا زۆر زۆر بچوكە بەلایەوە خۆش بووە و كاتێ لە دایك بوین و هاتینە فراوانی دنیا ئەوكات زانیمان دنیا چەند خۆش و فراوانە و دنیاش لە بەرانبەر قیامەتدا بە هەمان شێوەیە، جا گرنگ ئەوەیە بەودنیایە نەخلەتێن و بایی نەبین و نەیگۆڕینەوە بەبەهەشت، چارەسەریش دنیابە كەم گرتنە(زُهد)دونیا وەك زۆپای زستان وایە ئەگەر لێی دووربی سەرمات دەبێ وە ئەگەر باوەشی لێبدەی دەتسوتێنێ بۆیە واچاكە مامناوەندبی لە بەرانبەریدا، لە كاتێكدا زۆرێك دەبینی كەشەڕی دنیادەكەن ولەفەرموودەی پێغەمبەریش داهاتووە كەخوای گەورە بەندەیەكی خۆش بوێت دوری دەخاتەوە لەدنیا وەك چۆن نەخۆشەكان دەپارێزن لە ئاوی سارد،(اذا أحب الله عبداً حماهُ الدنیا كما یضل احدكم یحمی سقیمهُ الماء....)

**پلانی ئازاد بون ودەربازبون لەزیندان:**

**پلانی یەكەم: ئاگاداری دڵت بە :**

خۆساغكردنەوە بەدڵ مەرجە بۆهەموكارێك دڵت دامەزراوبێت لەسەر ئەوەی كە دەیكەیت چونكە كاتێك خوای گەورە باسی كافر و مونافیقەكان دەكات لە دڵیانەوە دەست پێدەكات كە دڵیان نەخۆشە یان ڕەقە ....، كوردیش قسەیەكی جوانی هەیە لەو بارەوە كاتێ یەكێ هەڵەیەك بەرانبەر كەسێ دەكات هەست بەكۆت و زنجیر دەكات لە گەردنی ودڵی ئارام نیە بۆیە دواجار دەڵێ: گەردنم ئازادكە... لێم ببورە، چونكە تاوان دڵ و دەروون نەخۆش دەكات

ڕەقی دەكات بۆیە بێ ویژدان وخراپكار ئـەوەتا ڕۆژێـك قـسـەیەك دەكەوێتـە نێـوان هـەردوو هاوەڵانی بەڕێز (ئەبوبکر صدیق و ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی) لەسەر دارخورمایـەك كە دەكەوێتە نێوان زەوی هەردوو هاوەڵە بەڕێزەكە، ئەبوبكر قسـەیەك بـە ڕەبیعـە دەڵێـت و یەكسەر پەشیمان دەبێتەوە و لەسەر دڵی ئەبوبكر قورس بوو، ئەبوبكر دەڵێت: گەردنم ئازاد بكە یان قسەكەم پێ بڵێوە بۆ ئەوەی وەك یەك بین،(ئێستا كێشەكە لەوەدایـە كـە ئێمـە دان بەهەڵەی خۆماندا نـانێین، ڕۆژێـك لەمزگـەوت یـەكێ دەرگاكـەی زۆر بەتونـدی پێوەدایـەوە خەڵكی ڕاچەنین وسەیریانكردوكەوتنە دەمەبۆڵە، كابرایش لە جیاتی ئـەوەی داوای لێبـوردن بكات بڵێ نەمزانی وتی ئەم هەموو كوێخایە، ئەو ناڕازی بوو!)

ڕەبیعەدەڵێ كاری واناكەم، ئەبوبكر دەڵێ: ئەگەر پێم نەڵێتەوە دەچـم بـە پێغەمبـەر دەڵـێم (ﷺ) كە ڕەبیعە قسەم پێناڵێتەوە، سـەرنج بـدەن كـە ئەبوبـەكر دوای پێغەمبـەر (ﷺ) گەورەترین كەسە ئیمانی ئەبوبەكر لە ئیمانی ئوممەت قورسترە خۆ دەیتوانی گـوێی نـەداتێ، بەڵام دڵی مرۆڤ بەتاوان كۆت وبەنـد دەكرێـت، ڕەبیعـەیش لـە ئـەهلی(صـوفە)بـووە كەچـی جەخت دەكات كەقسەی پێ نەڵێتـەوە چـونكە قـسەوتن بـە أبـوبكر قـسەوتنەبە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەبوبەكر تاكە یاری ناو ئەشكەوتە كەخوا لـە قورئانـدا باسـی كـردووە(پـانی اپـنین اژهمافی النار)، ڕەبیعە دەچێتە خزمەت پێغەمبـەر (ﷺ)و كێـشەكەی بـۆ دەگێڕێتـەوە و دەڵێ ئەبوبەكر قسەیەكی پـێ وتـوم پـێم نـاخۆش بـووە ئـەویش داوای كـردم پێـی بڵێمـەوە منیش پێم نەوتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چاكت كرد قسەت پێ نەوت بـەڵكو بڵـێ خوالێت خۆش بێت ئەبوبكر، ئەوجار ڕەبیعە وتـی: خوالێـت خـۆش بێـت، ئەوەنـدە لـەتاوان دەترسان!! پێویستە موسڵمانان ئاوا لەخەمی دڵی خۆیی وبەرامبەرشی بێ، ئەوجار دەگـات بە ئارامی دەرون دەگات بەدڵی چاكوپاك و خاوێن و ئازاد دەبێت لە ڕق وكینە وحەسودی و خراپە....، كەخاوەنەكەی ئازا و ئازاد دەكات و لەمردن ناترسێ لە هەوڵی بەهەشتدادەبێت

پلانی دووەم: ئامادەکردنی خۆراکی ڕۆح بەئەنجامدانی عیبادەت، چونکە دڵ بەیادی خودا ئارام دەبێت (الابذکر الله تطمئن القلوب) بەتایبەت بەخشین وشەونوێژ وسەرجەم عیبادەتە کان کەپێشتر باسکران

پلانی سێیەم: شوێنکەوتەی دینی خوابە نەك زۆرینە.... بۆئەوەی سەرکەوتویی بەردەوام لەگەڵ حەق و ڕاستی دابە باشوێنکەوتوانیش کەم بن، هەرگیز مەڵێ: لەگەڵ عامێ دەچمە شامێ ! یان مەڵێ کە چوومە شاری کوێران دەست بەچاومەوە دەگرم، ئاخۆت کوێرمەکە بەڵکو دەستی نابینایەك بگرە تا نەکەوێتە چاڵەوە، ئەگەر زۆرینەش لەسەر حەق و چاکە بوون باشەو لە گەڵیان بە ئەگەر ناحەق بەحەق دەناسێرێتەوە(بەبەڵگەی شەرعی) نەك بە زۆرینە،ئەوەتا زۆرینە بەناوی دیموکراسیەوە گومڕابوون و دەیانەوێت بیکەن بە بەدیلی ئیسلام!! خوای گەورە فەرموویەتی:(وان تطع اکثرمن في الارض یضلوك عن سبیل الله ان یتبعون الا الظن وان هم الایخرصون) الانعام ١١٦ واتە ئەگەرگوێڕا یەڵی زۆرینەی خەلکی سەرزەوی بکەی ئەوا لە ڕێبازی خوا لات دەدەن، چونکە زۆر بەیان شوێنی گومان کەتون و درۆو ناڕاستی هەڵدەبەستن، هەمیشە گۆڕانکاری بەکەمینەدەکرێت، ئەگەر شوێن زۆرینە بکەویت سەرگەردان دەبیت، چونکە زۆرینەی خەلکی ناشکورن، سوپاس گوزارنین (ولکن أكثر الناس لایشکرون)ئەواتا لە جیاتی سوپاسی خوا بکەن لەسەر نیعمەتەکانی بە هارو باران و خۆشی لە سەیراندا فەسادی و خراپە دەکەن لە بۆنە کاندا لەجیاتی بیرلەخاوەنی نیعمەتەمان بکەنەوە تاوان ئەنجام دەدەن ئەوانە چەندە بەغیرەتن لەئاگری دۆزەخ ناترسن!! فمااصبرهم علی النار،کەئاگری دنیابەشێکە لەحەفتابەشی ئاگری جەهەننەم (پەنا بەخوا).

زۆرینەی خەلکی نازانن،(وَلَکن أکثر الناسِ لایعلَمون) ڕاستیەکان نازانن وهەربەدوای قەڵە باڵغی کەوتون!! زۆرینە نازانێ بۆهەڵدەپرن، بۆ شەڕدەکەن، نازانن حیکمەت و فەلسەفەی ژیان چیە،... هەندێ جارعیبادەتی زۆریشی کردووە شەونوێژ وحیجاب و نوێژ وچاکە بەلاّم لە سەیرانێك دا یان لە بۆنەیەکی شین وشایدا بەدەنکە شقارتەیەك ئاگر لە خەرمانی

خۆی بەردەدات:چونکە زۆربەی ئیسلام ناناسن نازانن کە مافی هەموانی داوە وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە، نازانن کە دین بۆ ڕێکخستنی ژینە،نازانن بۆیە لادەدەن، نازانن بۆیە دەکەونە شوێن ئارەزووەکانیان دەکەونە شوێن مۆدێل وچاولێکەری بێ بڕوایان ئەوانە لەدنیا لەناودەچن پێش قیامەت، نازانن کە نازانن، نازانن کەدنیا زیندانە لەچاو قیامەت ودەبێ هەوڵ بدەین بۆئازادبوون لە ڕێگەی ئەو سێ پلانە کە باس مانکرد،بزانە کە ئازادی ڕاستەقینە ئازادی دڵە کە ئەویش ئازدابونیەتی لە تاوان.لەکۆتایدا :

ئەوە پێناسەی ژیانی دنیایە قسەی پێغەمبەر ڕاست و ڕەوایە

بۆ موسڵمانان بەندیخانەیە ...... بۆ کافرانیش وەك بەهەشت وایە

گەر سەرنج بدەی ئاشکراو ڕونە ...... ئەوەش حیکمەتی پاشای گەردوونە

چونکە مانەوەی ژیان زۆر کەمە ئەوەش کە هەیە ئەشکەنجەو خەمە

بەڵام قیامەت نابڕێتەوە ....... پاداشتی دنیای تیا ئەدرێتەوە

باخۆمان ئازادبکەین:

کەواتە خەڵکینە وەرن باخۆمان ئازاد بکەین کات زۆر لە بەردەستدانیە....، تامردن یەخی نەگرتوین لە نکاو،وەك شێخ حەسەنی بەصری فەرمویەتی : خەڵکی بیٚ ئاگان کاتی مردن بە ئاگا دێنەوە، بالە مەولاپەڕیەکی نویٚ هەڵبدەینەوە وسەرەتایەکی تازە لە ژیان دەست پیٚ بکەین تەوبەو ئیستغفارێکی ڕاست بکەین، دەستنوێژ بگرە و دوو ڕکعات نوێژی أستغفار بکەو تەوبە یەکی نەصوح بکە و بەڕاستی ڕوبکەرە خوا ئەوا خوا لێت خۆش دەبێت وەك مەلۆتکەی تازە لە دایك بوو پاك ئەبیتەوە و تەوبە لەدایك بوونێکی تازەیە، لەوانەیە بڵێی کە ڕەمەزان هات یان کە چوم بۆحەج تەوبە دەکەم، بەلاٚم ئایا دەگەیتە ئەو کاتە؟ گرەنتی هەیە؟ بۆیەپێغەمبەر (ﷺ)ڕێگە چارەی بۆ داناوین کە بریتیە لە تۆبەی ئێکسپرێس، خێرا فریاکەوە و تۆبە دوامەخە.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (ﷺ) کە (مرۆڤەکان هەموو خۆ فرۆشن... یا خۆیان بەخوا دە فرۆشن یان بەدنیا)، یاژیانی خۆی ئازاد دەکات یان زیندانی دەکات، تەوبە و پەشیمان بوونەوە وگەڕانەوە بۆ بەندایەتی خوا فرسەتێکی زێڕینە بۆ ئازادی دڵ و دەروون و ڕزگار بوون لە ئاگر، ئێرە شوێنی تاقیکردنەوەیە وبڕوانامەی ئازادی بەدەست بێنە تالە بەهەشت دابەزرێی، ئەم دنیایە زیندانی ئیماندارانە،بەهەشتی بێباوەڕانە، دوبارە دەڵیم وەرن با ئازادبین(فستذكرُونَ ماأقولُ لكم..)

ڕۆژێك دێت ئەم قسانەی منتان بێتەوەیاد بێگومان خوا بیسەرو بینایە......

# گرنگی و گەورەیی قەرز

قەرز هاوکاری ودەستبارگرتنە ..خێروپاداشتی بۆدوای مردنە

گەر بۆخوا بێ و لەبەرخوابێ: قەرز دوومـالآن ئـاوە دان دەکاتـەوە، ئەگـەر نادوومـالّ وێـران دەکات، هەمووومان پێویستمان بە یەکترە وکەس بەتەنیا ناژی، دینەکەشمان دینی هاوکـاری و یارمەتیدانە،قەرزیش هاوکاری ودەستبارگرتنە، پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)فەرمویـە: (والله في عون العبد ماكان العبُدفي عون أخيـه) واتـە:خـوای گـەورە هاوکـاری ئەوبەندەیـە دەکات کەهاوکاری براکەی بێت، خێر و بێری قەرز بۆدوارِۆژە، قەرزەکە هەرچەند بێـت وەك نیوەت کردبێ بەخێرا وایە،پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی(مامن مسلم يُقـرض مُـسلماًقرضاً مرتين الاكان كصدقهامرة) واتە: هەرموسڵمانێ دووجار قەرزبـدات بـە موسـڵمانێ وەکـو ئەوە وایە یەکجار کردبێتی بە خێر وصدقە، واتە ئەگـەر(١٠٠٠)دۆلارت دابـە قـەرز وەکـو ئەوەیە کە (٥٠٠) دۆلارت بە خێر دابێت، هەر لەبەر ئەوەیە تاکو خێری قیامەتت لەدەست نەچێ نابێ سودی ماددی و زیادە وەربگریەوە لەو قەرزە و ئەبێ بەسـوو(ڕیبـا) خـۆ ئەگـەر نەیبولە کاتی خۆیدا بیداتەوە ئەوە با قـەرزدارە کـەخۆی نەشـارێتەوە و مۆبایـل دانـەخات لەکاتی خۆیدا بێت و داوای درێژکردنەوەی مۆڵەت و لێبوردن بکـات، تـۆی خـاوەن قـەرزیش زیاتر ئارامبگرە و خێرت زیاترە، خوا فەرموویەتی: (وان كان ذوعسرة فنظرة الى مسيرة) بقرە /٢٨٠، واتە ئەگەر نەدارو دەستکورت بووچـاوەڕوانیلێبکەن تـا دەیبێـت، وە هـەروەها قەرزاریش توانی قەرزەکە بداتەوە ودوای خست یان مامەڵەی پێوەکردنەوە ستەمی کردووە و گوناهبارە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (مِطل الغـني ظُلـم) واتـە : ئـەوەی هەیـەتی و دوای دەخات دەسـتی پـێ دەکـات (قـەرزکوێرە) ئـەوە سـتەمی کـردووە، بۆیـەکار گەیشتۆتە ئەوەی بەداخـەوە، لەزۆربـەی دوکانـەکان نوسـراوە(تکایـە قەرزنیـە تەنانـەت بـۆ تۆیش)کە ئەوەدەرگای متمانە وهاوکاری دادەخات وپێچەوانەی فەرموودە وخێر وبرایەتیـە! وەك موعجیزەیەك لەقورئاندا قەرزی نێوان بەندەکان بە(دَین)ناوی بـردوە چـونکەبۆی هەیـە

بفەوتی ونەدرێتەوە،بەلاّم کەسێ شتێ بدابەهەژرایێ لەبەرخوابەقەرزبیداتەخوانەوابە(قرض) هێناویەتی چونکەنافەوتی وخاوەنەکەی لەپاداشتەکەی مسۆگەرە وەردەیگرێتەوە! مەترسی وزیانەکانی قەرز:تا زۆر ناچارنەبێ قەرزمەکە چونکەدانەوەی زەحمەتە،قەناعەت بکە،ڕەحمەت لەپێشینان کەوتویانە:ئەوەی بیەوێ سەری ئەیەشێ..بە قەدەربەڕەی پێی ڕادەکێشێ،

**ئەگەر وریا نەبی توشی ئەم خەمانە دەبی:**

١- قەرزاری دوچاری درۆ وپەیمان شکاندنت دەکات، پێغەمبەر (ﷺ)زۆر پەنای دەگرت بەخوا لە قەرزاری، چونکە فەرمووی: کەسی قەرزار لە قسەدا درۆدەکات و پەیمان دەشکێنێ لە دووعاکانیدا دەیفەرموو:(**اللهم اني اعوذبكَ من الهمِ والحزن.....وضَلَعِ الدين وغلبة الرجال**)

٢- هەندێ جار قەرزار دوچاری ڕێبازی خوار دەبێت، بەداخەوە خەلّکێکی زۆر قەرز بە سوو ئەدەن

٣- پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی جەنازەی لەسەرمردووی قەرزار نەدەکرد!(جابر)دەلّێ پیاوێك مردو دوای شۆردن و کفنی دامانناتا پێغەمبەر (ﷺ)نوێژی لەسەر بکات کە ئاگادارمان کردەوە چەند هەنگاوێ لەگەلّ هات وفەرمووی: لە وانەیە هاوەلّەکەتان قەرزی لەسەر بێت؟ وتیان بەلّێ دوو دینار قەرزارە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)خۆی دواخست، تا (**أبو قتادة**) گرتیە ئەستۆی خۆی و بۆی بژارد، ئەوسا پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر کرد.

٤- مردووی قەرزادارئەگەرشەهیدیش بێت ناچێتە بەهەشت تاقەرزەکەی بۆ نەدرێتەوە چونکە مافی خەلّکە!،ڕۆحی ئیماندار هە لّواسراوە بەو قەرزە کەلەسەریەتی!! لە

فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ)هاتووە کە فەرمووی یەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر پیاوێك لە پێناوی خوا بکوژرێت و زیندو ببێتەوە پاشان بکوژرێتەوە، بەلاّم قەرزی لەسەر بێت ناچێتە بە هەشتەوە تا قەرزەکەی بۆدەدرێتەوە) مردوو کۆت و بەندی قەرزەکەیەتی

قەرزکردن دروستە،بەلاّم پێغەمبەر (ﷺ)لەبەر پێویستی قەرزی کردووە، چونکە بەردەوام پەنای دەگرت بە خوا لە قەرز، سوننەتە قەرز بەچاکی و بەجوانی و بەدوعای خێرەوە بۆ خاوەنەکەی بگێڕیەوەلەکاتی خۆیدا،چونکە مالّی قەرزئەمانەتە ودەبێ قەرزاربەئامانەتەوە بیداتەوەخاوەنەکەی،خوای گەورە فەرموویەتی:(أن الله يأمركم أن تؤدوا الامانات الى اهلها

**قەرزوشایەتگرتن:**

هەندێ جار کێشە دروست دەبێت لەسەرچەندی وچۆنی قەرزەکە لە بەرئەوەی شایەت و نوسین نەبوە لە نێوانیاندا و سەرەنجام چاکە دەبێت بەخراپە، ئەوەتا درێژترین ئایەت لە قورئاندا باسی قەرزدەکات لە سورەتی البقرە ئایەتی (٢٨٣)کە باس لەوە دەکات ئەگەر قەرزتان دا بەکەسێ بینوسن یان ڕەهنێکی لێ وەربگرێ، چونکە ئەمانەتە وبا ئاگاداری ئەمانەت وشایەتی ڕاستی بدەن ومەیشارنەوە،(ابن کثير) دەلّێ:پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی لە جولەکەیەك کڕی بەقەرز بۆ ماوەیەك قەلّغانەکەی کرد بە ڕەهن لای جولەکەکە داینا.

**قەرزدانەوە بۆ مردووپێشدەخرێ بەسەروەسیەت ومیراتدا:**

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی داوەکە: دوای مردن قەرزدانەوە پێش وەسیەتەکانی مردووخرێ، (سعدبن الاكول) وتی براکەم مرد(٣٠٠)درهەمی لە پاش جێما منیش ویستم پێداویستی پێ بکرم بۆخێزانەکەی پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: براکەت بەندکراوە بە هۆی قەرزەکەیەوە بۆیە قەرزەکەی بۆ بدەرەوە

- کاتێ قەرز دەبێ بەسو(ڕیبا):

ئەگەر قەرز دەر مەبلەغێ پارەی دا بەکەسێ و لە بەرانبەر دواخستنی زیادەبخاتە سەر ئەوە دەبێت بە ریبا با کەمیش بێت ئەو زیادەیە، لە فەرموودەی پێغەمبەر دا هاتووە (ﷺ): (کل قرض جرنفعاً فهو ربا) واتە: هەموو قەرزێ سودی بە مەرج گیراوی لەگەڵ بێت ئەوە ڕیبایە، بەداخەوە زۆرێك لە بانکەکان ڕیبەوین هەرئەوەشە کە سیستمی ئابوریان شکستی خواردووە،بەلاّم بانکی ئیسلامی کە سیستمی(**مرابحة و مضاربە**)ی تێدابە زۆرسەرکەوتووە وەك ئەوەی لە ئابووری مالیزیا و تورکیای سەردەمی (ئۆردوگان) بینرا، بێگومان ڕیبا لە عنەتی لێکراوە لە زینا و داوێن پیسی خراپ ترە، چونکە کەمێك پێی پڕدەبن زۆرێکیش قڕدەبن، خواردنی ماڵی یەکترە بەناهەق، پەنابەخوا لە قەرزاری و ڕیبا، خوایە قەرزی قەرزداران پڕبکەیتەوە و بەرەکەت بخەیتە ماڵ و حاڵی چاکە کاران.

## ئەوانەی خوا سەیریان ناکات

با پێکەوە گەشتێکی ئیمانی بەرۆحە کانمان بکەین، بچین بۆمەیدانی مەحشەر وبزانین چ باسە، کە ڕۆژی جیابونەوەی چاکە کاران وخراپە کارانە. بێگومان گوناهو تاوان سەرچاوەی هەمووخراپەیەکە لەدنیاوقیامەت، لە دنیادا تاوان کۆت وبەندی دلآنە،هۆکاری لە ناوچونی گەلانە، ئەگەر تەوبەی لەسەر نەکرێت بۆ قیامەتیش مالوێرانیە و لەمەیدانی مەحشەردا لەو قەلەبالغیەدا بانگێك دەکرێت (وَأمتازو اليَومَ أيهاالمجرمون....) يس ٥٩، جودابنەوە ئەی تاوانباران! ئیتر خۆکەس ناتوانێ خۆی بشارێتەوە، لەو ڕۆژەدا کۆمەلەخەلکانێك هەن خوای گەورە قسەیان لەگەلّ ناکات و پاکیان ناکاتەوە و ڕوی ڕەحمەتیان لێناکات، پەنا بەخوا کێن ئەوانە کەتونەتە بەر خەشم و قینی خوا؟ خۆ ئێمە هەموو هەولّ و هیمەتمان بۆ ڕازیبونی خوایە ئەوانە بریتین لە:(خۆبەزلزان، منەتکردن،فرۆشتن بە سوێندی درۆ ، سەرۆك وپاشای درۆزن ، پیری داوێن پیس ، ئازاردەری باوك ودایك ، ئافرەتانی بەشێوە پیاو)

یەکەم: سوێندخواردن بەدرۆ ومنەتکردن وبەرگی درێژ:

(عن أبي ذر)عن النبي(ﷺ) قال(ثلاثَة لا يُكلَمُهُم الله يومَ القيامة،ولا ينظرُ اليهم ولا يُزكيهم و لَهم عذبُ اليم، قالَ:فقرأها رسول الله(ﷺ)ثلاثَ مرار؟ قالَ أبوذر:خابوا و خسروا،من هم يارَسُول الله؟ قال:(المُسْبل و المنان و المُنفق سِلعتهُ بالحَلِف الكاذب) واتە:سێ کۆمەلّ هەن لە قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەلّدا ناکات سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوە، ئەلێ سێ جارئەمەی دووبارە کردەوە! ئەبو زەڕ وتی! مالوێران و ڕەنج بەخەسار کێن ئەمانە؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (( ئەوەی جل و بەرگی درێژی لەبەرە و بەسەر زەوی دەخشێنێ، (کە نیشانەی خۆ بەزلزانیە، ئەگەر بۆلوت بەرزی بێت)وئەوەی منەت دەکات لەسەر ئەوەی چاکەی لە گەلّداکردوە وبەچاوی دەداتەوە، وەئەوکەسەیش کە بەسوێندی درۆ شتەکانی دەفرۆشێت)سەبارەت بە لوت بەرزی وخۆ بەزلزانین لە فەرموودەی

تردا هاتووه که پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ناچێتە بەهەشت ئەوەی مسقالە زەڕڕەیەك تەکەبورلە دڵی دابێت)لوت بەرزی سیفەتی شەیتانەوکەخۆی لەحەزرەتی ئادەم بەگەورە تر زانی و سەرەنجام دورخرایەوەلە ڕەحمەتی خوا، لە فەرموودەیەکی تردا(ئوبەی کوڕی کەعب) دەگێڕێتەوە کە دووکەس لەلای پێغەمبەردا شانازیان بەباوباپیرانەوەکردوخۆیان هەڵدەکێشا، یەکیان وتی بەهاوڕێکەی من کوڕی فلانی کوڕی فلانم، توکێی ناکەس بەچە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((دووکەس لە خزمەت موسا پێغەمبەردا خۆیان هەڵدەنا بەسەر یەکتردا و یەکیان بە شانازییەوە تا (٩) پشتی خۆی هەڵدا!خوای گەورەیش وەحی نارد بۆحەزرەتی موسا و فەرمووی : بەوکەسە بڵێ کە شانازی کرد بەسەر ئەویتردا هەر نۆپشتی لەئاگردایە وە ئەویش دەیەمیانە، پەنابەخوا لە خۆبەزلزانین لە شەیتانەوەیە و هەمومان سەرەنجام چنگێ خۆڵ و ئێسکە ڕزیوین.

سەبارەت بە شت فرۆشتن و ساغکردنەوەی بازاڕکەت بە سوێندی درۆ

ئەوە دەبێتە غەش و فێڵکردن وحەرامی دەکات، تەنانەت ئەگەر بەڕاستیش بێت باش نیە سوێند خواردن بۆ شت فرۆشتن و مامەڵە پێوە کردنی، ئەبوهریرە دەڵێ گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (اَلحلفُ منفَقَةٌ للسِلَعةِ، مَمحقةٌ للكسبِ) متفق عليه، واتە: سوێند خواردن فرۆشی زیاد دەکات بازاڕ گەرم دەکات بەڵام داهاتەکەی لە ناودەبات و بەرەکەت لە ماڵە کەیدا ناهێڵێ، ئەوەتا لەدووسێ لاوە بە چەنگ پارە پەیدا دەکات و هەر فریا ناکەوێ هەر هاواریەتی.....

وەسەبارەت بەمنەتکردن وبەچاودادانەوەی چاکەوباسکردنی ودەهۆڵ بۆ لێدانی، ئەگەر بۆ خوات کردوە باسی مەکە، ئەگەر بۆ ڕیبا بازی وخەڵکت کردووە ئەوە پەنا بەخوا لە سەری قەرزدار دەبیەوە وخاوەنەکەی دبێتە سەپانێ پۆشی و ڕەنج بە خەسارە، وەك لە فەرموودەکەداهاتوە خوا سەیری ناکا ولێی توڕەیە لە قیامەتدا،خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿ياأيهالذين أمنوا لاتبطلوا صَدَقاتِكُمْ بالمن و الاذى﴾ واتەئەی بڕواداران خێرو چاکەکانتان

به تالّ مەکەنەوە بە منەتکردن و ئازاردانی ئەو کەسە بە باسکردن و بەچاودا دانەوەی، (کلبی) دەڵێ واتە: منەت بەسەر خوادا دەکات کە خێر و صەدەقەی کردووە ئازاری ئەوکەسەش دەدات کەپێی داوە بەباسکردنی.

**دووەم: دەسەلآت داری درۆزن و هەژرای بە فیزوپیری داوێن پیس:**

ئەبو هریرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((سێ کەس هەن خوای گەورە لەقیامەتدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات، نە پاکیان دەکاتەوە، نە ڕووی ڕەحمەتیان لێدەکات، وە سزای توندیان دەدات، ئەوانیش: (**شیخ زان ، ملك كذاب ، عائل مُستكبر**)پیری زیناکار ، پاشا وسەرۆکی درۆزن ، هەژاری لوت بەرز)پەنا بەخوا لەو تاوانە کە ڕیشی سپی لای خوا ئەوەندە ڕێزی لێناوە شەرم دەکات کە بە ئاگر سزای دەدات بەلآم ئاخر شەڕ بووە و بە پیری دامێن پیسی کردووە، سەبارەت بە کاربەدەستی درۆزنیش کە لەم سەردەکەدا گەلێ زۆرن و شانازی دەکەن بە سیاسەتی درۆینەو چەواشەکاری و بەدرۆی پیاوی گەروە دەڵێن سیاسەت درۆی شاخدار ودرۆی هەڵبژاردن و درۆی نیسان سەرفکردن وخلەتاندن و بەداخەوە کە درۆبوەبە سیستمی نوێی جیهانی و دەڵێ درۆ بکە درۆبکە تا قەناعەت دەکەن لە کاتێکدا درۆلە ئیسلامدا نیشانەیەکی دووڕوەکانە و نەفرەتی لێکراوە لەقورئاندا (الالَعنة الله علي الكاذبين)خۆبەزلزانین لە هەموو کەس ناشرینە ولە هەژار ناشیرنتریش کەپێشتر ئاماژەمان پێکرد،پەنابەخوا لە لوت بەرزی کە ئێستا نەخۆشیەکی کوشندەیە وپەتایەکی بلآوە کە هەرئەوەیشە خەڵکی ئاتەبان و نایەڵێ ڕێك بکەون،چونکە هەریەکەیان حساب بۆ بەرانبەرەکەی ناکات و خۆی بە عەنتەری کوڕی عەنتەردەزانێ و بەهۆی دەسەلآتەوە بێت یان بەسەروەت و سامانەوە بێ بایی دەبێت و لە فەرمانی خوا یاخی دەبێت و قارون ئاسا لەناو دەچێت

**سێیەم: ئازاردانی دایکوباوك ،ئافرەتانی بەشێوە پیاو،پیاوی بێ غیرەت وتەرەس:**

خوا سەیریان ناکات لە قیامەتدا: لە(أبن عمر)وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی ((سێ گروپ لە قیامەتدا خواسەیریان ناکات،(**العاق الوالدیە و المرأة المترجلة ، والدیوث**)، ئازاردەری دایك و باوك ، ئافرەتانی بە شێوە پیاو، پیاوی بێ غیرەت لە بەرانبەر بەد ڕەوشتی جێزانەکەی بێ دەنگ و بێ هەلوێستە))

سەبارەت بە دایکوباوك، پێویستە لە خزمەتیان دابین و ئێمە قەرزداری ئەوانین، ڕەزامەندی خوا بەسراوە بە ڕەزامەندی دایك و باوکانەوە، بە داخەوە کە زۆرێك هەن ئازاری دایك و باوکیان دەدەن و گەردنی خۆیان ئازاد ناکەن و ئەو هەلە لە کیس خۆیان دەدەن کە بە هۆیانەوە بچنە بە هەشت،

(ابی هریرە) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((رِغِمَ أنفه ، رغِمَ انفه.... ، سێ جار فەرمووی لوتی بچێت بە خۆڵدا، سەرشۆڕ بێت، وتیان کێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرموی: کەسێك کە دایك و باوکی و یان یەکێکیان لە کاتی پیریدا بە هۆیانەوە نەچوبێتە بە هەشتەوە) واتە چاك نەبوبێ لەگەڵیان، جا کەسێ وەفای بۆدایك و باوکی خۆی نەبوبێ چۆن وەفای بۆمن و تۆدەبێ، کەپەروەردەی ئیمانی لەگەڵ نەبوو منالێ کە جەرگی تۆیە دەبێتە بەلاو دوژمن خەم و خەفەت، دەیان کەسم بینیوە کە بێزاری دەربڕیوە لە دەست کورەکەی و وتویەتی نەبونی ١٠٠ گا دێنێ خۆزیا نەبایە، ڕۆژێك لە بەردەرگای مزگەوت وەستابوم لەگەڵ دووکورە کەرولاڵەکانم کە بە ئیشارەت قسەیان دەکرد کابرایەکی ڕیش سپی وتی خۆزیا کورەکەی منیش ئاوا بوایە، منیش وام زانی زەلیلی سەرجێگان، وتی خۆزگایا وابوایە، بەلکوچی خراپ نامێنێ پێمان نەکات و ژیانی لێ کردوین بەژان!!

یەکێکی ترلەوانەی کەخوا سەیریان ناکات ولێیان تورەیە، ئەو ئافرەتانەن کە سفور و نیمچە ڕوتن یان بەناوی ئازادی و سەربەستی و بەدروشمی بریقەدار خلەتاون و وادەزانن

پێشکەوتن ئەوەیە کە ژیانی ئاژەڵی و تێکەڵی و لەبەرکردنی بەرگی پیاوان،وەك لە فەرمودەکەدا هاتوە، چونکە ئەوە سەرگەردانیە و نێرو مێ هەریەکەیان بە سروشتی خۆی و بەجل و بەرگی خۆیەوە جوانە، بۆیە لە فەرموودەی تری پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوەکە نەفرەت کراوە لە وژنانەی وەك پیاوان دەچن وە ئەو پیاوانەی وەك ژن خۆیان دەچوێنن، وەك دەبینی هەردوو لایان یەك پانتۆڵ لە پێ دەکەن و یەك شێوە کراس تەنانەت بە پێچەوانەی سروشتی یەکتر ئێستا جلی پیا ودرێژە و هی ژن کورتە، پیاو پۆشتەیەو ژن ڕوتە!!،وە لە فەرمودەکە هاتوە کە ئەوانەش خواقسەیان لەگەڵدا ناکات کە لە بەرانبەر بەدڕەوشتی خێزانەکەی بێ دەنگ و بێ هەڵوێستە، ئێوارە ژن و کچەکەی دێنە ماڵەوە ڕوت و قوتن!! کەلە کوردەواری خۆماندا بە بە کەسانی (تەرەس،بێ غیرەت) ناسراون، لە فەرمودەیەکی تر پێشەوای بە غیرەتمان فەرمویەتی: (سێ کەس خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردون، (مدمن الخمر، والعاق الوالدیە، والدیوث)، ئالودەبون بە خواردنەوە، ئازاردانی دایك و باوك و ئەوکەسە کە ڕازیە بە خراپ و بەدڕەوشتی خێزانەکەی))

١- لەوانەی کەخوا سەیریان ناکات ئافرەتانی نا شکورە، (عبداللە کوڕی عمر) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(لاینظر اللە الی امرأة لاتشکرُ لِزوجهاوهی لاتستغنی عنهُ) واتە:خوا سەیری ئەوئافرەتە ناکات کە سوپاسگوزاری مێردەکەی ناکات کە بێ نیاز نابێت لێی،بەداخەوە زۆرێك هەن بەردەوام دەبۆڵێنێ و ناشکورە و هەردەڵێ! جانەوە کەی ماڵە ؟ کەی حاڵە؟ ئەوە پیاوە من هەمە، پیاوی خەڵکی ئاوان ئاوان، خانوماڵی خەڵکی ئاوان.....

٢- یەکێکی تر لەوانەی خوا سەیریان ناکات، کەسێ لە دواوە لە کۆمەوە بچێتە لای خێزانەکەی،(ابو هریرە)لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:(خوای گەورە سەیری ئەوکەسە ناکات کەلەدواوە لەکۆمەوەدەچێتە لای خێزانی))،

نێربازی حەرامە و نەفرەتی لێکراوە، پێشەوا(**شمس الدين الذهبي**)لە کتێبەکەی بەناوی (**الكبائر**)باسی حەفتا تاوانی کردووە کە لە تاوانە گەورەکانن وەك ناوی کتێبەکەشە، هەموو ئەوانەی کە باسمان کردن لەو کتێبە هاتون کە بەلای هەندێ لە ئێمەوەبەتاوانی گەورەیان نازانین! لە کۆتایدا هەموو ئەو تاوانانەی کە باسکران خوای گەورە لە بکەرەکانیان تورەیە و سەیریان ناکات بە چاوی سۆزەوە چونکە سنور بەزاندنە و پێشێلی مافی بەرانبەرە و زیانی هەیە بۆ کۆمەلگا، بۆیە هەرچی زیان بەخشە بۆ مرۆڤەکان حەرامکراوە و قەدەغەکراوە، بۆ نمونە کە دامێن پیسی حەرامکردوە ئەوەتا پەتای ئایدز گەورەترین هەڕەشەی مەرگ لە مرۆڤایەتی دەکات بەسەدان ملیۆنیشی لە ناوبردووە کە ٨٠٪ ی لە سیکسی نا شەرعیەوەیە، بۆیە ئیسلام بەردەوام لەگەڵ ئەوەدایە کە خۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکردن. بەداخەوە کەسانێك حەرامیان لا شیرین دەبێت و گوێڕایەڵی شەیتان دەکەن وەکو ئەو کەسەوایە کە نەخۆشە و ئاوی شیرینی لەلاتاڵە یان وەك چاوی شەمشەمە کوێرە بەرِوناکی قەڵسن،هەموودەزانین کە ڕوناکی خۆرعەیبی نیەوخەلەل لەچاوی شەمشەمە دایە.خوای گەورە هیدایەتمان بدات بۆ کاری چاکە بەدورمان کات لەو تاوانە گەورانە وئەوەی لێرە بترسێت لە قیامەتدا ناترسێت وە ئەوەی لێرە دۆستی خوا بێت لەوێیش دەبێتە خۆشەویستی خوا، خوایە لێمان تورەنەبی و بەزەیت بێتەوە پیاماندا‌ولێمان خۆش ببی..... ئامین

# ئەوانەی فریشتە سڵاواتیان لەسەردەدەن

لە وتاری ڕابردوودا باسی ئەوانەمان کردکەخوای گەورە لێیان تورەیە وسەیریان ناکات، ئەمجارە باسی ئەوانە دەکەین کە چاکە کارن وخۆشەویستن بە جۆرێ کە فریشتەکان دوعای خێریان بۆ دەکەن، زۆر جاردەبینین کە سێك بە ماموستاکەی یاکەسێ بە دیندار دەزانێ پێی دەڵێ دوعای خێرم بۆ بکە لە دوعای خێر بێبەشمان مەکە، جاریوایە ئەوکەسە لە بیری دەچێت یا دوعاکەی وەرناگیرێ، ئەی چی دەڵێی کەفریشتە پاك وبێگەردەکانی خوابۆیەکێ بپاڕێنەوە وداوای لێخۆشبونی بۆبکەن لەخوا،چونکەنزیکن لەخواوە لەفەرمانی خوا دەرناچن بۆیە دوعاکانیشیان گیرایە، چونکە ئەوانە (لايعصونَ الله ماأمرهم وَ يفعلون مايؤمرون)، بەڕاستی مژدەیەکی خۆشە، پیرۆزتان بێت دوعاکردنی فریشتەکان، ئەوکەسانەکێن ئەوکارە چاکانەچین کە بەهۆیەوە بون بە خۆشەویستی خواوفریشتەکان: ئەوانە کە( سەلآوات لەسەر پێغەمبەر دەدەن و ئەوانەی خەڵکی فێری زانست و زانیاری دەکەن و ئەوانەی سەردانی نەخۆش دەکەن ئەوانەی لەڕیزی یەکەمی نوێژدان ولەلای ڕاست وئەوانەی بۆشایی ڕیزی نوێژەکان پڕدەکەنەوە وەهەروەهائەوانەی پارشێودەکەن وچاوەڕوانی نوێژدەکەن)بەکورتی ئاماژە بەهەریەکەیان دەکەین:

**١ـ ئەوانەی صەلاوات لەسەرپێغەمبەردەدەن:**

لە عامری کوڕی ڕەبیعەوەپێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(**ما صَلى عليَّ أحدٌصلاةً الاصلَت عليهِ الملائكةُمادام يُصلي علي فَليُقِل عبدٌمِن ذلكَ أوليُكثر**)(**مسندأمام أحمد**) واتە: هەرکەسێك سەلآوتێکم لەسەر بدات فریشتە سەلآواتی لەسەردەدەن تاصلآواتم لەسەر بدات،ئیتر هەرچەند بێت بازۆریش بێت.

**٢ـ ئەوانەیخەڵکی فێری زانستی شەرعی دەکەن:** زانست کلیلی دەرگاداخراوەکانە یەکەم فەرمانی خوای میهرەبانە (أقرا)لە(أبی أمامەی باهیلی) وە دەڵێ:(لای پێغەمبەر(ﷺ)

باسی دووکەس کرا(عابد وعالم)خواپەرست وزانا،پێغەمبەر (ﷺ)فەرموی: ڕێزوگەورەیی زانالەچاوخواپەرستێکی ئاسایداوەك ڕێزو گەورەیی من وایەبەسەرکەمترین کەستانا،پاشان فەرمووی:خواخۆی وفەریشتەکانی ونەهلی ئاسمانەکان وخەلکی زەوی هەمویان سەلاوات دەدەن لەسەرئەوکەسانەی دەبنە مامۆستای خێر وچاکە وخەلکی فێری چاکەدەکەن، تەنانەت مێرولەش لەناو شارەکەیدا وماسی لەناوئاوداسەلاواتیان لەسەردەدەن ودوعای خێریان بۆدەکەن)، ئەوەیە دەولەمەندی و گەورەیی و پلە وپۆستی بەرز بۆهەر مامۆستا وبانگخوازێك کەلەخزمەتی دینەکەیدابێت،ئەوانە ئەوکەسانەن کەدەبنەجێداری پێغەمبەران کاری ئەوان دەکەن ولەوپێناوە زۆرماندوو دەبن بۆیەفریشتەکان دوعای خێریان بۆدەکەن.

**٣ـ سەردانی نەخۆش:**

لە پێشەواعلی وە گێردراوەتەوە،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(**مامن مسلم يَعودُ مُسلماً غُدوَةً الاصلى عليهِ سَبعونَ الفَ مَلَك حتى يُمسى وان عادهُ عَشيةً الاصلى عليهِ سَبعون الفَ مَلَك حتى يُصبحَ و كان له خريف في الجنة) (ترمذي) (رواه الترمذى و صحه البانى)**

واتە:هەرموسلمانێك گەرسەرلەبەیانی بچێت بۆ سەردانی نەخۆشێك حەفتاهەزارفریشتە تا ئێوارە سەلاواتی لە سەردەدەن ودوعای خێری بۆ دەکەن،ئەگەر ئێوارەچووبۆسەردانە کە ئەوا(٧٠٠٠٠ )فریشتە سەلاواتی لەسەردەدەن ودوعای خێری بۆدەکەن تابەیانی، ئەوەش بەردەام ئەو بۆئەوانەی سەردانی نەخۆش دەکەن ئەی ئەوانەی خزمەتی دەکەن؟(موورافیقن) بێگومان زیاترو زۆرتر،وە لەبەری باخی بەهەشت دەچێنێت، واتە دەچێتە بەهەشت، لە (ابی هرەیرە) وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (**ان الله (عزوجل) يقولُ يَوم القيامة: ياابن أدم مرضتُ فَلَم تَعُدني** ،.....) خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێ: ئەی ئەوەی ئادەم نەخۆش بوم نەهاتی بۆلام، ئەویش دەڵێ:ئەی پەروەردگار چۆن سەردانت بکەم

تۆ پەروەردگاری جیهانی؟! فەرموی: ئایا نەتزانی کە فلاّن نەخۆش بووسەردانت نەکرد، ئایا نەتدەزانی ئەگەر سەردانت بکردایە منت لەویّ دەست دەکەوت؟!.....))، سەردانی نەخۆش مافی موسلّمانانە لەسەر یەکتر وحیکمەت و فەلسەفەی زۆری تیّدایە،کەتۆی لەش ساغ هەست بەنیعمەتی تەندروستی دەکەی،جگەلەو هەمووخیّر و بیّرەی قیامەت کە فریشتەکان داوای لیّخۆشبونی بۆ دەکەن! بە کاریّکی کەم خیّریّکی زۆرت دەست دەکەویّت، لە ولاّتانی ئەوروپا و رۆژئاوا کەس ناچیّ بۆ مواجەی نەخۆش لەخەستەخانەچون دەلّیّن:پیّویست ناکات تالەنەخۆشخانەبیّ خواردنی ئەدەنیّ وکەمردیش شارەوانی دەینیّژیّ!!لە یەکیّ لە مزگەوتە کوردەکانی ئەوروپا پیاویّکی بەتەمەن لە نەخۆشخانەخەویّنراو کۆمەلّیّك لە نویّژخویّنانی مزگەوت چون بۆ سەردانی، پەرستارەکە وتی: ئیّوە هەموتان کوڕی ئەون؟ نا، ئەی کۆمەلّی خیّر خواز ین؟ نا، بەلایەوە سەیر بوو کە ئەوان هاتوون بۆلای ئەو پیاوە پیرە، دوایی تیّیان گەیاند کە ئیّمە موسلّمانین ونەوە حەقی ئیسلامە زۆرسەرسام بون بەو دینە، یەکیّ لە نەخۆشە ئەوروپیەکان بەوە خۆی هەلّدەکیّشا کە لە ڕۆژی سەری سالّدا کچەکەی کارتیّکی جەژنانەی بۆ ناردبوو!! تەنانەت کە مردن لە خستەخانە شارەوانی دەیانیّژیّ، ئەی موسلّمان شانازی بکە بە دینەکەتەوە نەك بە عەقلّی ئەوروپی......

**٤ـ ئەوانەی گرنگی بە ڕیزی نویّژەکانیان دەدەن:**

ئەوەی لە ڕیزی نویّژدا وەستاوە لەخزمەت خوایە وقسە لەگەلّ خوا دەکات جابزانە چۆن دەوستی؟ تۆی موسلّمان دوو وەستانت هەیە لەخزمەت خوادا یەکیان لەنویّژدایە ئەویتریان لە مەیدانی مەحشەر دایە،لە فەرموودەیەکی پیّغەمبەر(ﷺ) هاتووە کەعایشەی دایکی بڕواداران بۆمانی گیّڕاوەتەوە، خوای گەورە و فریشتەکان سەلاّوات لەسەر ئەوانە دەدەن کە لەلای ڕاستی ڕیزەکانەوە نویّژدەکەن، لە فەرموودەیەکی تردا کەهەر لەعایشەی دایکمانەوە ڕیوایەتکراوە، پیّغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی:(ان الله وملائكتَهُ يُصلّونَ على الذين يَصلونَ

الصفوفَ، وَمن سَدَّ فرجَةً رَفَعَهُ الله بِها درجَةً) (أبن ماجة) واته:خوای گەورە وفریشتەکان سەلاوات دەدەن لەسەر ئەوانەی کە ڕیزەکانیان پڕدەکەنەوە وبەیەکی دەگەیەنێن، هەرکەسێ کە لێنی ڕیزێك پڕبکاتەوە خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە، ئەو هەمووخێروچاکەی بۆ دەنوسرێ،بەداخەوە خەڵکانێ بەوە قەڵس دەبن ودەڵێن جێگە زۆرە یان تورە دەبێ و دەچێتە ڕیزی دواوە!! کە ڕیزی ڕاست وڕێك کاریگەری هەیە لەسەر یەکڕیزی دڵەکان جگە لەوەی فریشتەکان دوعای خێریان بۆدەکەن.

(نوکتە) بەندە لەئیمامەتیدا زۆرگرنگیم داوە بەڕیزەکانی نوێژ،ساڵی(٢٠٠٤) لە مزگەوتی شەفیق بەگ لەسلێمانی ڕۆژێکیان کە وتم ڕەمەتتان لێبێت ڕێك بوەستن پاڵ بەن بەیەکەوە یەکێ لەڕیشسپیان کەلەڕیزی نوێژەکەدابوبەدەنگی بەرز وتی:مامۆستا چەوەندەریەتەنکی! .خوای گەورە بمانگێڕێ لەو کەسانەی کەزۆر صلاوات لێدەدەن و سەردانی نەخۆش دەکەن وخەمی ڕیزەکانی نوێژ دەخۆن، بۆئەوەی بکەوینە بەردوعای خێری فریشتەکان ....ئامین

# سیفاتی ئیماندارانی ڕاستەقینە..کەجێگایان فیردەوسی پان وبەرینە

سڵاوی خوای گەورەتان لەسەربێت ئیماندارانی بەڕێز وخۆشەویست، لەوتاری ڕابردوودا باسی ئەوانەمان کرد کە فریشتەکان داوای لێخۆشبوونیان بۆدەکەن بەهۆی کاروکردەوەی جوانیانیان، لەم وتارەشدا باسی ئەوانە دەکەین کە ئەهلی بەهەشتن بەهۆی(١٠)ڕەوشتی جوانیانەوە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە،کەلە سەرەتای سورەی(المؤمنون)دا باسکراوە، واتە سورەتی باوڕداراِن چونکە ئەو کار وکردەوانە زادەی ئیمانی ڕاستەقینەیەکە لە ڕێگەی عیبادەتەوە بەرجەستەدەبن بۆیەکە ئەو ڕەوشتانە تەنهالەبڕوادارای ڕاستەقینە دەوەشێتەوە، پێشەوا ئەحمەد هێناویەتی کە پێشەوا(عومەر)گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ)بوو فەرموویەتی (ئێستە دە ئایەت دابەزیوەتە سەرم هەرکەس کاریان پێبکات دەچێتە بەهەشت) پاشان ئایەتەکانی (قَد أفلَحَ المؤمنون ......)ی خوێندەوە (ترمزی لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە)، هەروەها(نەسائی) ڕیواتی کردووە کە پرسیار کرا لەعائیشەی دایکی باوەڕداران: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)چۆن بووە؟لە وەلآمدا فەرموویەتی:(ڕەوشتی قورئان بووە)، ئینجا ئایەتەکانی (قَد أفلَحَ المؤمنون ......)ی خوێندەوە. ئیستا بەکورتی دەچینە خزمەت لێکدانەوەی ئەو دە ئایەتە:

(قَد أفلَحَ المؤمنون)،واتە:ڕزگاروبەختەوەر وسەرفراز بوون ئەو باوەڕدارانەی کەخاوەنی ئەم سیفەتانەن:

یەکەم: (الذین هم في صلاتهم خاشعون) ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا گەردن کەچن، واتە ئاگایان لە نوێژەکانیانە بەدڵ وگیان،چونکە تۆ لە نوێژدا لەگەڵ خوادا قسە دەکەی، نوێژ پێناسی موسڵمانە،ئەوەی جێگەی سەرنجە زۆربەمان خەیاڵمان دەڕوات لەنوێژداوخەڵکانێك هەن (ڕوو لەقیبلەودڵ لە بازاڕن) بۆیە پێویستە لە نوێژدا کۆنترۆڵی خۆمان بکەین، سەیری شوێنی سوجدەمان بکەین، چاو نەگێڕین وسەربانەدەین، بیر لە مردن بکەینەوە وابزانە کۆ

تانوێژه، پێشەوا علی فەرمویەتی:(خشوع) ترس و ملکەچی دڵە،کەدڵ ملکەچ بوهەموو ئەندامەکان ملکەچ دەبن، کە ئەوەش دەبێتە(خضوع) واتە گەردن کەچی ئەندامەکانی لاشەی،پێشەوا عومەر یەکێکی بینی جولەی زۆربوولە نوێژەکەیداتەویش فەرمووی ئەو کەسەئەگەر دڵی گەردن کەچ ئەوا ئەندامەکانیشی ملکەچ دەبون، شایەنی باسە کە خوای گەورە لێرەدا بە نوێژ دەستی پێ کردووە چونکە نوێژ پێناسی موسڵمانە و کلیلی خێرەکانە وهەندێ زانایان نوێژ نەکەر بەبێ بڕوا دادەنێن! یەکەم شتیش لەحسابی قیامەتدا لە نوێژ دەپرسرێتەوە، پێشەوا(ئەحمەد ونەسائی) لەئەنەسەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (سێ شت لام خۆشەویست کراوە:( بۆنی خۆش ،ئافرەت ، نوێژیش گلێنەی چاومە)مادام لە خزمەت خودا وەستاوی دەبێ هۆش و گۆشت لەلای ئەو بێ،بە گەردن کەچی بۆی،دەگێڕنەوە (ئیمامی بوخاری) شەوێك لە نوێژدا حەڤدەجار زەردەواڵە پێوەیدا، دوای تەواو بوونی فەرمووی : بزانن ئەوە چی بوو ئازاری دام .....؟!

* (حاتەمی ئەصەم) فەرموویەتی: کاتێ هەڵدەستم بۆ نوێژ کەعبە دەخەمە پێش چاوم، بەهەشت دەخەمە لای ڕاست وجەهەننەم لای چەپم، وای دادەنێم کۆتا نوێژم بێ، پاشان دەست بە نوێژکە دەکەم ناشزانم خوا لێم وەردەگرێت یان نا...!!

* (عەلی کوڕی حسین) کاتێ دەستوێژی دەگرت دەلەرزی و ئارەقی دەکردو ڕەنگی تێك دەچوو، پرسیاریان لێکرد بۆچی وات بە سەردێت دەیفەرموو: دەزانن کەمێکی تر لە خزمەت کێدا دەوەستم؟!

* (ابن سیرین)دەفەرموێ:(موسلیمی کوڕی یەسارم)بینی سەری لەسوجدەدا بەرز کردەوە، کەسەیری شوێنی سوجدەی کەیم کرد لە بەر فرمێسك شوێنەکە تەڕبوو!!

بۆیە خوای گەورە ستایشی ئەوکەسانە دەکات کەلە عیبادەتدا خشوعیان هەیە ودڵ بێدار و ملکەچن، دەفەرموێت:(یَسجُدون للاذقان و بیکون و یزیدهمْ خشوعاً) (اسراء ١٠٩) واتە: ئەوانەی کڕنوشی ملکەچی بۆ پەروەردگاریان دەبەن فرمێسك لە چاویان دەبارێت و زیاتر ملکەچ وفەرمانبەردار دەبن، بێگومان ئەوەش ئەرکێکی گەورە وگرانە مەگەر لە سەر ئەوانە کە بەخۆشەویستی و سۆزەوە بە گەردن کە چیەوە نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن (انهالکبیرةٌ الا علی الخاشعین) (البقرة ٤٥ )

* کەواتەنوێژئەونوێژەیە کە بەتەواوی مەرجەکانیەوە ئەنجام بدرێت ویەکێ لە مەرجەکان یشی بریتیە لە(خشوع)ە،کە بە هەبوونی خشوع وگەردن کەچی دەگەینە حقیقەت و ڕۆحیەتی نوێژ چێژی ئیمانی لێوەردەگرین، بەم چێژ وەرگرتنەش فێری شوکرانە بێژی دەبین، خۆ ئەگەر بە مەرجەکانیەیەوە ئەنجام نەدرێت و هەر لەکۆڵ خۆکردنەوەبێت و کردەوەی لەگەڵ نەبێت، ئەوا بەپێی فەرموودەی سەرۆوەرمان ئەونوێژە لای پەروەردگار شکات لە خاوەنەکی دەکات و دەڵێت (خوا بتفە وتێنێت وەك منت فەوتاند) تەنانەت تۆی بڕوادار ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ پێناسەی دینەکەت سەرنج بدە هەربەمانای گەردن کەچی و تەسلیم بون دێت بۆ خوای گەورە، (جرجانی) گوتویەتی: الاسلام هوالخچوع و الانقیاد.....) واتە: ئیسلام بریتیە لە ملکەچی بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە لەلایەن خواوە

* (ابن منظور) گوتویەتی:(الاسلام من الشریعة:اظهار الخضوع و اظهار الشریعه والتزام ماأتی بهِ النبی (ﷺ) ) واتە: ئیسلام لە شەرعدا بریتیە لە پیشاندانی گەردن کەچی وخستنەڕوی بەرنامەی خواو پابەندبون بەوەی کەپێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن خواوە هێناویەتی.لەپێشینان هەبووە لەنوێژدا قاچیان بڕیوەتەوە کە نەخۆش بووە، بەوجۆرە لە

دنیادا باوڕداران و تێکەڵی نوێژەکەیان بون و چێژی ئیمانیـان لێوەرگرتـوە، ئـەو نوێژکردنـە زۆرجیاوازە لەوەی ئێمەلەماڵەوە دڵمان لای تلفزیونە ولەمزگەوتیش زوویەپەلە دەردەپەڕین،

دیارە پێچەوانەی گەردن کەچی ودڵسۆزی بێ ئاگاییە ولە کۆڵخۆکردنەوەیە و ئەوجۆرە نوێژە کردەوەی لەگەڵ نابێ و خوای گەورە لەبەرانبەردا هەڕەشەی کردووە لـە ونوێژخوێنانـەی کـە لەنوێژەکانیان بێ ئاگان وەك فەرموویەتی (فویل للمصلین، الذین هُم عن صلاتهم ساهون)، بێگومـان پلـەو پایـەی خشوع زۆر گەورەیـە بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە پاڕانەوەکەیـدا فەرموویەتی: (خوایە پەنادەگرم بەتۆ لە چوار شت، (من علم لاینفـع و مـن قلـب لا یخشع ومن نفس لاتـشبع ومـن دعـاءٍ لایسمع)،لـە زانیاریـەکی بـێ سـود،دڵێك ملکـەچ نـەبێت نەفـــسێك تێرنـــەخوات، وەلـــە دوعایـــەك ولاّمـــی نـــەبێت)

دووەم: ڕەوشتی دووەمی ئەوباوڕدارانە ئەوەیە کە گوێ نادەن بە قسەی پڕو پوچ

(والذین هم عن اللغوِ مُعرِضون) واتە: ئەوانەی لـە قـسەی هـیچ وبـەتاڵ پـشت هەڵدەکەن، موسڵمانی ڕاستەقینە سیفەتی بە جۆرێکە یان چاك دەڵێت یـان بێـدەنگ دەبێـت (فلیقل خیراً اولیصمت)،خۆیان بـەدووردەگرن لەهـەرکرداروگوفتارێك سـودی نـەبێت،خێر وچـاکەی تیانەبێت (عوقبەی کوڕی عامر)پرسی لە پێغەمبەر(ﷺ): ما النجاه یا رسول الله؟ بەچی ڕزگـار دەبـین ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، پێـی فـەرموو:(أمـسك(أملیـك)علیـك لسانك)زمانت بگرە و بیپارێزە، سـەرنج بـدە کـە ئـەوان لـە چـاکترین سـەردەم ولەخزمـەت پێغەمبەردابون بەو شێوەیەترساون لەفتنەوئافاتی زمان،ئـەی ئێمـەی سـەردەمی (شـوبهات وشەهەوات)،(پەنا بەخوا)لە فتنەوئاژاوەی زمان لە درۆ و دوزمـانی و بوختـان کـە ژیانیـان کردووە بەژان، بەتایبەت بەزۆرێك لەدرۆو دەلەسەی میدیاکان کە بوون بە بەریدی شەیتان شاعیریش لەو بارەوە جوانی وتوە:

زمان ڕابێنە لەسەر قسەی حەق ..... بەئەدەب نەك بەشێوازی ڕەق
ئەو پارچە گۆشتەی لەناو دەمدایە ..... کلیلی دەرگای خێر وبەلآیە
هەروەکو دەرگای خێر دەکاتەوە ..... سەری زۆر بەلآش هەڵدەداتەوە
بزانە کە ئەوانەی زمانیان پیسە ئەوە ناودڵیان پیس وخراپە بۆیە قسەی خراپ دەکەن
چونکە زمان ئەسکویی دڵە،وەك وتراوە:(گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێدەڕژێت) زمان شڕی
دورە لە ڕەوشتی موسڵمان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:
**(لیس المؤمن بالطعان والااللعان ولاالفاحش و لاالبذیء)**
واتە: موسڵمان تانە لێدەر و نەفرتکەر و زمان شڕ وخراپەکارنیە،جگە لەوەی کە درۆ و دەلەسە و دووڕویی سیفەتی دووڕوەکانە، نەفرەتیشی لێکراوە، کە بەداخەوە ئێستا درۆ بوتە سیستمی نوێی جیهانی.
سێیەم: ڕەوشتێکی تری بڕوادارنی ڕاستەقینە ئەوەی کە زەکاتی ماڵەکانیان دەدەن بە هەژاران و نەداران (والذین هم للزکاة فاعلون)، سەخاوەت ومالّ بەخشین ڕەوشتێکی تری موسڵمانانی ڕاستەقینەیە بۆیە هاوەلآن پێشبڕکێیان دەکرد لە بەخشیندا بەپێچەوانەی ئێمە، ئەوەتا بۆ ئامادەکردنی پێداویستی یەکێ لە جەنگەکان پێغەمبەر(ﷺ) داوای هاوکاری کرد، پێشەوا عومەر ویستی لە پێشەوانەبوبکر زیاتر ببەخشێ بۆیە نیوەی ماڵەکەی هێنا،بەلآم ئەبوبکر هەمووماڵەکەی هێنابوو، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردن، امام عمر فەرمووی نیوەی ماڵەکەم بۆخواو پێغەمبەر(ﷺ) هێناوە و نیوەکەی تریش بۆ منالّەکان، ئەبوبکر فەرمووی منیش هەموو ماڵەکەم هێناوە بۆ خواو پێغەمبەر (ﷺ)وخواو پێغەمبەریشم جێهێشتوە بۆ منالّەکان! ئیسلام دینی هاوکاری و پێکەوەژیانە وداوامان لێدەکات خۆ پەرست نەبین و بەتەنیا نەژین، جاوەك چۆن بەڕۆژوگرتن لاشەمان پاك دەکەینەوە، بە زەکاتیش ماڵە کانمان پاك دەکەینەوە و بەسەخاوەت و بەخشین زالّ

دەبێ بەسەر ڕژدی و تەماع و بەخیلی و حەسودی، خوای گەورە فەرموویەتی: (ومن یوقَ شح نفسهِ فالئكَ هم المفلحون)ئەوەی خۆی پاراست لە ڕەزیلی نەفسی ودەرونی خۆی ئەوانەڕزگاربون،ئیسلام سەرجەم ڕێنماییەکانی بۆدیاریکردوین بۆگەیشتن بەتەزکیەی نەفس.

چوارەم: (... والذین هم لفروجهم حافظون الاعلی أزواجهم ......)واتە:ئەوانەش کەدامێنی خۆیان دەپارێزن لەحەرام و شتی ناشەرعی،ئارەزوەکانیان لەحەلاڵ تێردەکەن لەخێزانەکانیان یان ئەو کەنیزەکانەی کە لەکاتی خۆی هەیانبون، ئەوانە لۆمە کراونین، جگە لەوە بەهەر ڕێگەی تری ناشەرعی ئارەزوی جنسی دامرکێنێتەوە (زینا ونێربازی) ئەوانە دەست درێژ کارن و سنوریان بەزاندووە، ئەم ڕەوشتە باسی ئەخلاقە وبڕواداری ڕاستەقینە ڕەوشتی بەرز وجوانە، ڕەوشت پێناسەی موسڵمانە چونکە زادە و بەرهەمی ئیمانە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ئیمان شەست و ئەوندە بەشە یان حەفتاو ئەوندە بەشە، بەرزترینیان (لا اله الا الله) یەو نزمترێشیان لابردنی دڕك و ئازارێکی سەر ڕێگایە، وپاشان فەرموی (...والحیاءُ شعبةٌ من الأیمان)حەیا و ئابڕ وبەشێکە لە ئیمان، ڕەوشتی جوان وشیرین بەری درەختی ئیمانە هەمیشە سەوزوجوانە پێناسی مرۆڤی موسڵمانە(تؤتی اکُلها کل حین باذن ربها) ڕافعی لە(وحی القلم)دا دەڵێت:ئەگەرداوام لێبکەن فەلسەفەی ئاینی ئیسلام تەنهالەدوو وشەداکۆ بکەمەوە ئەوا دەڵێم: (دامەزراوی ڕەوشت)،ئەگەرلە گەورەترین فەیلەسوفی جیهان داوابکەین کەچارەسەری کێشەکانی مرۆڤایەتی کورت بکاتەوە لەدووشەدا ئەوا لە (دامەزراوی ڕەوشت) زیاترهیچی ترنالێت،پلەوپایەی ڕەوشت بەجۆرێك بەرزوگرنگە پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی{انما بعثتُ لاتمم مکارم الاخلاق}واتە:بۆیە نێردراوم کەڕەوشتەجوانەکان تەواوبکەم، ڕەوشتی جوان ئامانج ومەبەستی پێغەمبەرمانەلەو پێناوە شدا ڕەوانەکراوە، لەوانەیەبڵێی ئەی پەرستشەکان؟لەوەلامدانەڵێم:پەرستش وعیبادەتەکان وەسیلەوهۆکارن بۆ ئامانجێکی بەرزکە چەسپاندنی ڕەوشتە،ئەگەرعیبادەت کردەوەی لەگەڵ

نـەبێت ئەوەوەرزشـێکی بـێ گیانــە وعادەتەنــەك عیبــادەت، کەواتەحیکمەتوفەلـسەفەی بەندایەتی بۆچەسپاندنی ڕەوشـتەکانەوبەندایەتی وەك نوێـژوڕۆژوئامانج نیـە بـەڵکوهۆکارن بۆگەیشتن بەئامانج کەبەرجەسـتە کردنـی ڕەوشـتەجوانەکانە لەدونیاداوڕەزامەنـدی خودایـە لەدوارۆژدابۆنمونە نوێژئەگەرسەرنجی بدەین بەردەوام لەمزگەوتـدا کۆمـان دەکاتـەوە ئـەوەش مانای یەکرێزی وبرایەتی وخۆشەویستیە،وە خوای گەورە فەرموویەتی﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ نوێژئـەو نوێژەیـە کـە خاوەنەکـەی لـە خراپـەکاری بپارێزێ،واتـە ببێتـە خاوەنی ڕەوشتی جوان،بەهەمان شێوەیش ڕۆژوزەکات وحەج،

پێنجەم وشەشەم(.... والذین هم لأماناتهم وعهدهم راعون....) ئەوانەش کـە ئەمانـەت و پەیمانەکانیان دەپارێزن، خیانەت ناکەن وئەرکی سـەر شـانیان جـێ بـەجێ دەکـەن و وەعـدو بەڵێنی خۆیان دەبەنە سەر،بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا قـەیرانی ڕەوشـت وخیانـەت و گەنـدەڵی وڵاتی پڕکردووە،کەئەوەش بەرهەمی نەبون یان لاوازی ئیمانە و نیشانەی دووڕوو منافقانە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (نیشانەی مونافیق سـیانە : لـە قـسەدادرۆدەکات ،پـەیمان دەشکێنێ وەعدبەخیلافە ،خیانەت لە ئەمانەت دەکات)

ڕەوشتێکی تری بڕوادارانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە نوێژەکانیان دەپـارێزن بـەردەوامن و نایـان فەوتێنن، شەیدای جومعە وجەماعەتن، یان نوێژەکانیان دەپارێزن لە خراپە، کارێـك ناکـەن کە لە نوێژخوێن نەوەشێتەوە، گەر سـەرنج بـدەین لـە سـەرەتا بەنوێـژ دەسـتی پێکـردووە و کۆتاییەکەیشی هەربەنوێژە ئەوەش گەورەیی پلە وپێگەی نوێژ دەگە یـەنێ کـە لەئیـسلامدا وەك وسەر وایە بۆلاشە،

(ابن مسعود)پرسی لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)چ کارێ لای خوا لە هەموشتێ خۆشەویـسترە؟ ئەویش فـەرمووی: (الـصلاةُ علـی وقتهـا) نوێـژ لـەکاتی خۆیـدا، پاشـان فـەرموی چـیتر؟ (ئەویش فەرموی : چـاکە کـردن لەگـەڵ دایـك و بـاوك، پاشـان چـیتر؟ فـەرموی؟ جیهادلـە پێناوی خودا). پاشـان لـە کۆتـایی ئـەو ئایەتانـەداخودای گـەورە فەرمویـەتی:(أولئـك هـم

الوارثون)واتە : ئەوانەن میراتگران و جێنیشینی بەهەشتن. بەهۆی ئەو کار وکردەوەی کردویانەکەخوالەسەری پێویست کردبون،هاوشێوەی ئەو ئایەتە لە سورەتی(زخرف/٧٢) فەرمویەتی(وَتلكَ الجنة التي أُورِثْتُمُوها بماكنتم تَعلمون)واتە: ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە (پێتان دراوە) بۆئێوەیە ماوەتەوە بەهۆی ئەو کردەوانەی کە دەتانکرد، (أبن ابی حاتم عن ابی هريرە) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (هەمووکوس لە ئێوە دووشوێنی هەیە، جێگەیەك لە بەهەشت و جێگەیەکیش لە ئاگردا، ئەگەر مردووەکە چووە ناو ئاگر ئەوە خەڵکی بەهەشت دەبنە میراتگری و شوێنەکەی دەبەن بۆ خۆیان، بۆیە فەرموویەتی (أولئك هم الوارثون)ئەوانە میراتگری ئەوانن،(الذين يرثون الفردوس هم فيها خالدون) ئەوانەدەبنە خاوەنی (فیردەوس) بەهەشتی بەرزوبڵند، وەك چۆن لە سەرەتای ئایەتە کاندا بە مژدە و مزگێنی و ڕزگار بوون دەستی پێکردووە لە کۆتایشدا هەر بە مژدەی فردەوس ئەوانەی دڵنیا کردۆتەوە، فیردەوس خۆشترین شوێنە لە بەهەشت کە لەناوەڕاستی بە هەشتدایەوشوێنەکەی بەرزە ولە خوار عەرشی خوادایە وکانیاوەکانی بەهەشت لەوێوە دەتەقنەوە ، خواپێمانی ببەخشێت بەڕەحمی خۆی، بۆیە لەفەرمودەیەکدا پێغەمبەر(ﷺ) هانمان دەدات کەبپاڕێینەوەلەخواباداوای فیردەوس بکەین،ئەوەبوبەکورتی ڕەوشتی باوەڕدارانی ڕاستەقینەکە سەرەنجام ئەگەر بەردەوام بن لەسەری دەبنە جێنیشین و میراتگری بەهەشت، خوای گەورە پێمان ببەخشێ...... ئامین [٣]

---

* یەکەمجارئەم وتارەم لەمزگەوتی گولك/ چوارقورنەخوێندەوەلە(٢٥ / ١ / ١٩٩٧ )
لەسلێمانی جارێکی تردوبارە خوێندمەوە لە(١٠ / ٥ / ٢٠١٣) بەدووجار

# ماددەهۆشبەرەکان ژیانیان کردەژان

٦/٢٦/ ڕۆژی جیهانی قەدەغەکردنی ماددەهۆشبەرەکان

بەپێناسە بیناسە،نەزانە وڕوکاسە:

ماددەی هۆشبەر،سەرخۆشکەر،پێشەواعومەرلەسەرمینبەری پێغەمبەرلەمەدینەبەم جۆرە پێناسەی کردوە(الخمرماخامرالعقل)واتەهەرشتێ عەقڵ دپۆشێ ولەسروشتی خۆی لایبدات ئەوەهۆشبەرەو حەرامەتاڕۆژی دوایی،جاهەرناوێکی هەبێت وەك تریاك وحەشیش وحەب و هیرۆین وئارەق ومەی ..هتد،لەقورئانیشدابە(خمر)هاتووەواتە:داپۆشەرکەبەسەرپۆشی ئافرەتانیش دەوترێ خمار،چون وەك لەچك وسەرپۆش عەقڵ مێشك دادەپۆشێ، هۆش و گۆشی نایەڵێ کەلەوکاتەدادەچێتەڕیزی ئاژەڵان چونکە مرۆڤ بەعەقڵ وژیری بۆتەسەرتۆپی دروستکراوەکان،وەلەفەرمودەدابە(سکر،اسکار)هاتووەکەبەمانای هۆشبەر دێت نەك سەر خۆشکەر واتە:سەری بێ ئاگادەکات نەك خۆشی بکات؟وەك چۆن ئێستابەمەبەستی ڕەواج پێدانی لەجیاتی(ئارەق)پێی دەڵێن:خواردنەوەی ڕۆحی،کەلەڕاستیدا عەقڵی لادەبات و ڕوحیشی دەڕزێنێت بەهەمان شێوەش زاراوەی سەرخۆکەریان بۆداتاشیوەکەسەرنەخۆش دەکات،بەڕاستی هەڕەشەیەکی مەترسیدارەبۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان وکۆمەڵگاو لەناو بردرنی ڕەوشت وزیانی ماددی ومەعنەوی زۆری بەدواوەیە،ئەگەرسەرنج بدەین لەزیانەکانی لەئەنجامی ئاماری نەخۆشخانەکان کەبەهۆی سەرخۆشی دوچاری ڕوداوی هاتوچۆوکێشەی کۆمەڵایەتی ونەخۆشی هەناوی وکوشتن وبڕین بوون دەردەکەوێت کەگەورەترین لێدانەلە مرۆڤەکان،ئەوەش گەورەیی دینەکەمان دەسەلمێنێ کەبە(أم الخبائث) دایکی پیسیەکان ،سەرچاوەی خراپەکان ناونراوەبۆیەلەڕیزی شیرك وهاوەڵ بڕیاردان دانراوە،نەفرەتی لێکراوەو لەتاوانەگەورەکانەوئەگەرتەوبەنەکات ناچێتەبەهەشت.

شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێبێت)وتی:(مالیك هەواڵی پێداین لەنافیعەوەلە ئیبن وعومەرەوە) کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك لەدونیامەی خواردبێتەوەولێی پەشمان

نەبوبیێتەوەلەشەرابی ڕۆژی دوایی بێبەشە)بوخاری ومسلیم ڕیوایەتیان کردووەوە،دیسان مسلیم ڕیوایەتی کردوەلە ئیبنوعومەرەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێك مەیە،هەمووسەرخۆشکەرێك حەرامە، هەرکەسێك مەی خواردبێت ومردبێت وبەردەوام بوبێت وتەوبەی نەکردبێت لێی،لەڕۆژی دوایدا لێی ناخواتەوە)لە عبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشامەوەوتی:لەعوسمانی کوڕی عەفانم بیست دەیوت: (دوربکەونەوە لەمەی چونکەمەی دایکی گشت پیسیەکانە،پیاوێك لەناوگەلانی پێش ئێوەدا خەریکی خودا ناسی بوودور کەوتبویەوەلەخەڵکی وئافرەتێکی فریودەرحەزی لێکرد، کەنیزەیەکی خۆی ناردبەدوایداوپێی وت:داوات لێدەکەین کەشایەتێکمان بۆبدەیت،لەگەڵی چوەژورەوەبۆماڵەکەلەهەردەرگایەك چووەژورەوەدەرگاکەی داخست،هەتاگەیشتە لای ژنێکی جوان ومنداڵێك وکوپێك مەی لەلابوو، ئافرەتەکەوتی: سوێندبەخودامن بۆشایەتیم بانگ نەکردوی،بەڵکوبۆئەوەبانگم کردی کەلەگەڵم ڕابوێریت،یان ئەم منداڵە بکوژیت یان ئەم مەیەبخۆیتەوە،ئەویش بەگومانی خۆی ئاسانەکەی هەڵبژاردوپیاڵەیەك مەی خواردەوە، پیاوەکەوتی:هی تریشم بدەرێ،دەستی لێهەڵنەگرت وهەتالەگەڵ ئافرەتەکە ڕایبوارد منداڵەکەشی کوشت،کەبێ ئاگابوهەرسێ تاوانەکەی کرد!،دەی دوربکەونەوەلەمەی خواردنەوەچونکە مەی وبڕواهەرگیز لەگەڵ یەك کۆنابنەوەئەینا یەکێکیان ئەوی تریانی وەدەرناوە.

**مێژوودوبارەدەبێتەوە:**

مێژوی خواردنەوەی هۆشبەرەکان کۆنەولەسەردەمی نەفامیدا خواردنەوەی مەی زۆرباوبوە کۆڕو دانیشتنەکانیان پێڕازاندوەتەوە،کاتێ ئیسلام هات بەشیوەیەکی حەکیمانە پلەبە پلە بنبڕی کرد،یەکەمجارلەکاتی چون بۆنوێژ لێ قەدەغەکردن،پاشان زیانەکانی بۆڕونکردنەوەتالە کۆتاییدابەیەکجاری حەرامیکرد،ئەوەی جێگەی سەرنج وتێڕامانەلەسەردەمی تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنداجارێکی ترمەی خواردنەوەلەبەرگێکی تازەونوێدالەخزمەت ئەوەی نوێدابوەبە

نیشانەی پێشکەوتن وبەئاشکراو بەشانازیەوە بەناوخوێندەوارورۆشنبیران دەیخۆنەوە! کەبۆ سەردەمی نەفامی دەگەڕێنەوەبەپۆشاکی جیهانگیری! سەیر لەوەدایەکەهەموودانیان ناوەبەزەردوزیانەکانی وسالێی ڕۆژێکیشان دیاری کردووە(٦/٢٦)بۆجەختکردنەوە لەسەر قەدەغەکردنی بەلاّم سەرکەوتوونەبوون،چونکە مەبەستیان نیەوبەکردەوەیش هاندەرو ڕێخۆشکەرن بۆخواردنەوە!هەندێ لەحوکمەتەکان ویستویانە بەهێزی یاسا قەدەغەی بکەن وەك لەئەمریکاوپاشان ئێران بەلاّم بێهودەبو چونکە ئەوەپەیوەندی بەعەقیدەو ئیمانەوەیە بۆیەدەبێ هەرلەوەوەدەست پێبکرێ، تەنانەت لای ئەوان خۆشەویستروزیاتربلاّوبویەوە، لەدەولّەتی مەدینەدا(١٣٣٤)ساڵ بەرلەئێستا کاتێ حەرام کراسەرجەم کوپەکانیان ڕشت و کۆتایان پێهێنا،وەك وەك وەلاّمێك بۆئایەتەکە کەلەشێوەی هەڕەشەخوای گەورەفەرموی (فهل انتم منتهون)ئایا ئێوەدەستبەرداری نابن،پێشەواعومەریش فەرمووی بەلێ وازمان هێناودەست بەرداربووین،کەواتە عەقیدەوبیروباوەڕی ڕاست ودروست سەرچاوەی هەموو خێروگۆڕانکاریەکە.

**مەیخۆری وقومارحەرامە:**

خوای مەزن فەرمویەتی:( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِوَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِاللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ )

واتە:ئەی باوەڕداران شەرابخۆری وقوماربازی وکێل پەرستی وگرەولەسەرتیرتەقاندن، پیسن و لەکارەکانی شەیتانن خۆتانی لێ بەدوربگرن تاکورزگاربن.

**مەیخۆرلەکاتی خواردنەوەدا ئیمانەکەی نامێنێ !!**

عن ابی هریرە،پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمویەتی:(لەکاتی دزیکردندا دز ئیمانەکەی لا نامێنێ،لەکاتی زیناکردندا ئیمان نامێنێ ودەڕوات،(ولایشرب الخمر حین یشربهاوهو مؤمن)،لەوکاتەی مەیخۆرئارەقەکە دەخواتەوەئیمانی نیە،تەوبەکردنیشی پێشەوڕێگەی

لێنـەگیراوە)،دیارەهــەرکام لەوســێ تاوانەلــەبڕواداری ڕاستەقینەناوەشێتەوەچــونکەوئیمان ڕێگرە،بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکەئیمانەکەی لەبـەردانامێنێ وەك چۆن جـل وبـەرگ لەبەرخاوەنەکەیدادادەکەنرێت،هەربۆیەئارەقخۆرئەگەرتەوبەنەکات ومردئەوەناچێتە بەهەشت هەندێ لەگۆڕهەڵکـەنی سـەردەمی ڕابـردوودوای تەوبـەکردنیان گێڕاویانەتەوەکەئەوانـەی مەیخۆربون لـەناو گۆڕداڕویـان لەقیبلەوەرگەڕاوە،پەنابەخوالەمـەیخۆری خەجاڵـەتی ورِسوایی دنیاودوارِۆژە.

**بازرگانیکردن بەماددەهۆشبەرەکان حەرامە:**

ئیسلام بەوەنەوەستا کەتـەنها خواردنـەوەی حـەرام بکات،بـەڵکوکڕین وفرۆشتنیـشی حـەرام کردبالەگـەڵ بێباوەڕانیـشدا بێت،لەپێناوبنـەبڕکردنی ئەوپـەتا کوشـندەیەپێغەمبەر (ﷺ) (١٠)شـتی لەئارەقـدا حەرامکردوەلەعنـەتی کردلـە(لـەخودی مەی،لەمــەی خۆر،لـەوەی دەیکرِێـت ودەرخـواردی خـەڵکی دەدا،لـەوەی دەیفرۆشـێت ،لـەوەی دەیکڕێـت ولـەوەی دەیگوشێت،لەوەی بۆی دەگوشرێت ،ئەوەی هەڵیدەگرێت،لەوەیش بۆی هەڵدەگرێت،لـەوەیش پارەکەی دەخوات )چونکە خراپەخراپەبەدوای خۆیدا دێنێ،تەنانەت حەرامە موسـڵمان تـرێ بفرۆشێ بەکەسێ کەدڵنیابێ ئەوکەسەدەیگوشێ ودەیکا بەئارەق.

**لەگەڵ ئارەقخۆر دامەنیشە:**

لەگەڵ ئارەقخۆر دامەنیشە..دوارِۆژی ئەوت لەپێشە

لەپێناودورکەتنەوەوبنـەبڕکردنی ئەوپەتایەئیـسلام هـەمووڕێگاکانی بـەڕودا داخـستوەلە بازرگـانیکردن یـان تێکـەڵی ودانیـشتن لەگـەڵ مەیخۆردا،هەیەوتویـەتی کـەمن دادەنیـشم لەگەڵیان تەنهامەزەکەی دەخـۆم ئارەقەکـەی ناخۆمەوە،بـەڵام هـەموویان لەتاوانەکـەداوەك یەکن،پێشەواعمر دەڵێ گوێم لەپێغەمبەربوو(ﷺ) فەرمویەتی:(هەرکەسێ بڕوای بـەخوا ڕۆژی دوای هەیەبالەسەرسفرەوخوانێ دانەنیشێ کەمەی لەسـەربێت) دەگێڕنـەوە کەپێـشەوا (عمرعبـدالعزیز)شـەلاقی ئەدالەوانـەش کەلەگـەڵیان دابنیـشتایە،جارێکیان کۆمـەڵێکیان

بردبۆلای کەمەیان خواردبۆوەفەرمانی داداریان لێدەن(٤٠)دار وتیان فلانیان لەگەڵ بوەبەڵام بەڕۆژوو بوە،فەرمووی لەوەوەدەست پێبکەن.

**دەردەنەك دەرمان:**

هەندێك دەڵێن ئێمە وەك دەرمان بەکاری دێنین،(بۆگورچیلە باشە)، بۆئەوەپێغەمبەر(ﷺ) وەلامی داوەتەوە،کاتێ پیاوێ پرسیاری لێکردکەبۆدەرمان بەکاری دێنێ،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویی:(انة لیس بدواء ولکنة داء)(مسلم)واتەئەونابێتەدەرمان بەڵکودەردو نەخۆشیە ، لەفەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: (لاتتداوابحرام)،(ابن مسعود)فەرمویەتی: خوای گەورە شیفای نەخۆشیەکانی نەخستۆتە شتی حەرامەوە.

**کەهۆشت لەدەستداماڵ وناموسیشت لەدەست دەدەیی!**

زۆربەی ئافرەتان کەدەبنەقوربانی بەهۆی لەدەستدانی کەسێتی خۆیانە،بەئاڵتون ودینارو دۆلارکۆشك وتەلارنەخڵەتێن،ناپرسن لەدینی لەڕەوشتی لەتەبیعەتی عەقڵیەتی...هتد، لەڕوداوێکی واقیعیدا کچێك شویکردبەکوڕەدەوڵەمەندێکی لەخۆیایی بۆگواستنەوەی بردیەئوتێلێکی بەناوبانگی لوبنان،چونکە زۆربەیان بۆخەڵك دەژین نەك بۆخۆیان،ئێوارە پێش جووت بوون بەزۆربوکەکەی بەمەی سەرخۆش کردوە هەردولا خامۆش وخەیاڵ بوون، بوکەخان کەبۆسەرئاودەچێتەدەرەوەلەژوردکەی لەگەڕاندنەوەیدا سەرنەکا بەژورێکی ترداچون دەرگای ئوتێلەکان وەکویەکن تابەیانی لەگەڵ عەرەبێکی(..) ڕادەبوێرێ وکاتێ زاوا هۆشی دێتەوە!ئای چیم بەخۆمکردوە!!کوردواتەنی:کەرلەکوێ کەوتوەوکوندەلەکوێ دڕاوە! زیانەکانی مەیخواردنەوەئەوەندەزۆرن جگەلەدۆڕاندنی حەیاوناموس ماڵ بەزایەدانیشەکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (نهی رسول الله(ﷺ)عن اضاعةالمال).

# ریفۆرم

زۆرن ئەوانەی بانگەشەی ریفۆرم وچاکسازی دەکەن ،بەلآم گرنگ ئەوەیە تا چەند مەبەستیانە وبەراستیانە یان بۆپلەو پۆستیانە،یان بۆبانگەشەی هەلبژاردنیانە، ئایا فاکتەرومیکانیزم و ئالیەتی ریفۆرمیان لە بەر دەستدایە ؟ئایادەرمانەکەیان بۆ دەردەکەشیاوە ؟

**پێناسە:** ریفۆرم وشەیکی ئینگلیزیەوبەرانبەرزاراوەی(الاصلاح )ی عەرەبیە، پێچەوانەکەی ( الفساد)،کەبە کوردی چاکسازیە.

**جۆرەکانی:** مەودای چاکسازی فراوانەبەئەندازەی حەزەکانی مرۆڤ،بەلآم دەبێ ئەو چاکسازیە سەرەتالەخۆتەوەدەست پی بکات،پاشان نێوانی خەلك چاك بکرێ،ئەوەی لێرەدامەبەستمانە چوارلایەنی ژیانە لەوانە:چاکسازی( سیاسی وئابووری وکۆمەلآیەتی و رۆشنبیری) .

**١- چاکسازی رامیاری ( الاصلاح السیاسی ) :**

بێگومان قەیرانی سیاسی کە زۆربەی ولآتانی گرتوەتەوە،پێویستی بەچاکسازی سیاسی هەیە،چاکسازی سیاسیش لەجۆرێکەوە بۆجۆرێکی تر لە ولآتێکەوە بۆ ولآتێکی ترجیاوازە، دەکرێ چاکسازی سیاسیی بە چاککردن و هەموار کردنی دستور بکرێ،بە سەروەری یاسا و پابەند بوون بە ئالۆ گۆری دەسەلآت وهەلبژاردنی پاك بکرێ، وە هەروەها چاکسازی سیاسی چاکسازی هەیکەلی ئیداری دام و دەزگاکانی جێ بەجی کردن ویاسا دانان ودادوەری دەگرێتەوە، تا دەگاتە سەرجەم دەزگاکانی تری سیاسیی و ئیداری، چوونکە سیاسەتکردن واتە هونەری بەرێوەبردنی ولآت ،کە بوارە سیاسیەکەی کەوتە قەیرانەوە وکێشەو قەیرانی تر بەدوای خۆیدا دێنێ لەوانە قەیرانی ئابووری کە راستەو خۆ پەیوەندی بە هاوکێشەی سیاسیەوە هەیە،وەك دەیان قەیرانی سووتەمەنی و خۆراك و گرانی بازار و .....هتد .

**٢ـ چاكسازى ئابورى( الاصلاح الاقتصادى).**

مەبەست بەچاكسازى ئابورى هەموار كردنەوەى سيستمى ئابوريە،بە كەمكردنەوەى پاوانخوازى و هاندانى وەبەرهێنان و رەچاو كردنى بەرژەوەندى گشتى ولآت،چاككردنى سيستەمى كەرتى كشتووكالْ و پيشە سازى ونرخى دراوەكان وەزالْبوون بە سەرهەلآوسانى ئابوريدا،وەك نمونە سيستمى ئابوورى ئيسلاميى كەمامناوەندە لەنێوان رژێمى ئابورى سۆسياليستى وەبە سەرمايەدارى دايە و چاكترين رژيمى ئابوريە، بەلْگەش گەشەى ئابوورى توركيايە كەمێك پاشخانى ئيسلامى هەيەكە بە ١١ سالْ گەندەلْى ٨٠ سالْى چاككرد،يان پێشكەوتن وگەشەى ئابورى ولآتى ماليزيا،كاتى خۆشى لەسەردەمى پێشەوا(عمركورى عبدالعيز)دا بەشايەتى ميژوومرۆڤايەتى گەورەترين گەشەى ئابورى بەخۆوەديوە، بە پێچەوانەى ئەم رۆژگارە كەبەدەست گەندەلْيەوەبێزارە.

**٣ ـ چاكسازى كۆمەلايەتى( الاصلاح الاجتماعى)**

چاكسازى لە بوارى كۆمەلآيەتى پێويستى بەفكروپەروەردەى دياريكراو هەيە،ئەمەش لە كۆمەلْگايەكەوە بۆ كۆمەلْگايەكى ترجياوازە، هەر كۆمەلْگايەك گرفت و كێشەى تايبەتى خۆى هەيەبۆيەچارەسەرى تايبەت بەخۆى دەوێت،چونكەژينگە وژيارى نەتەوەكان جياوازن، پێويستەپسپۆڕانى بوارى كۆمەلآيەتى رۆلْى خۆيان ببينن،پەيامى ئيسلاميش پێشەنگە لە دادگەرى كۆمەلآيەتيدا.

**٤- چاكسازى رۆشنبيرى( الاصلاح الثقافى ).**

چاكسازى رۆشنبيرى بەچاككردن وكاراكردنى دامەزراوەرۆشنبيريەكان دەكرێت،نوێكردنەوەى گوتارى ئاينى و گوتارى رۆشنبيرى و بنەماى گفتوگۆولەيەك گەيشتن و رێزى بەرامبەر، چاكسازى لەسيستەمى پەروەردەو فێركرندا وگرتنە بەرى سەرجەم ميكانيزمو ئاليەتە گونجاوەكان بۆ بەرز كردنەوەو چاككردنى ئاستى رۆشنبيرى.

مەرجەکانی چاکسازی...

دوای زانینـــی جۆرەکانی،پێویـــستە کۆمــەڵێ مــەرج هــەبن بـۆ سـەرخـستنی هـەنگاوەکانی پرۆسەی چاکسازی لەوانە:

١- بونی حالەتێکی نەخوازراو کەپێویست بەچارەسەر بکات،وەکنەخۆشـێك پێویـستی بە دەرمان بێت وەك دیاردەی گەندەڵی.

٢- ئەبی ئەوچاکسازیەلەخراپەوە بۆچاك ولە چاکەوەبۆچاکتربێ، نەك بڵێ چـاکی مەکـە با خراپ نەبێ .

٣- ڕەچاوکردنی پلەپلەیی وخاڵبەندی ونەخشەی ڕێگا،چون کەس لەپڕێ نابێ بەکوڕێ.

٤- ئەبێ ئەو چاکسازیەشێوەی بـەردەوامی بێت،نـەك گـڕو فڕێـك بێ،ئـەبێ هەنگاویـە هەنگاو ڕێ ببرێ .

٥- کارو ئامانج ومەبەستی دیاریکراوت ببێت.

٦- لێپرسینەوە و بەداوداچوون هەبێت، نوینەرانی گەل بتوانن لەحوکمـەت بپرسـنەوە، ئەوەش کاتێ دەکرێ‌کەحکومەتێکی سیستماتیکی ویاسایی بێت،نەك حیزبی.

٧- سیستم و سیاسەتی  ڕاست و درووست دیار.

لە گەڵ کۆمەڵی مەرجی تریش کەپێویستە هەبن بۆئەو کارەگرنگە.

لە کۆتاییدادەڵێم: ئەوەی بانگەشەی چاکسازی دەکات و هەوڵی گۆڕانکاری دەدات ،پێویستە خودی خۆی لە ئاستی گرفت و پێشهاتەکاندابێت، ئەگیناوەك ئەو قسەیەی بە سەردێت کە وتراوە:خوێ بەشت ئەکەن تا بۆگەن نەکا،ئەی ئەگەر خوێکە خوێ بۆگەن بو؟!.(ابولعتاهیە)ی کوفیش جوانی وتوە کەدەڵێ:

ترجوا النجاةولم تسلك مسالكها     ان السفينة لا تجرى على اليبس

# نرخ وبەهای مرۆڤ.. لەبەرنامەی خەڵك وخوادا

لەم وتارەماندا بەکورتی تیشك دەخەینە سەرقەدرو قیمەتی مرۆڤ لە بارنامەی دەستکردی مرۆڤەکان(کەلەم کاتەدا فەرمانڕەوایە)ولەبەرنامەی خودای گەورەدا

**یەکەم/ لەبەرنامەی خودای گەورەدا:**

لە پە یامی خودا مرۆڤ سەرتۆپی بونەوەرە وبەڕێزترینی دروستکراوە کانە کاتێکیش خوای گەورە باوکە ئادەمی دروستکرد فەرمانی کرد بە فریشتەکان سوجدەی ڕێزی بۆ بەرن و هەموویان سوجدەیان برد جگە لە شەیتان لەبەر ئەوەی خۆی بە گەورەتر زانی و تەکەبوری کردو بەوەش نە فرەتی لێکرا، هەرچی لەئاسمان وزەویدایە لەخزمەتی بەرژەوەندی مرۆڤدایە (سَخَرَ لكم مافي السموات والأرض) وەلە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی (وَلَقد كَرمنا بني أدم.... الأسراء/٧٠) واتە:بێگومان ئێمە ڕێزمان لەئادەمیزادگرتوە ولە وشکانی ودەریادا هەڵمانگرتون و ڕزق و ڕۆزی باشمان پێداون، زانایان ئەو ئایەتەیانکردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ لە فریشتە بەڕێزترە لێرە دەگەینە ئەوڕاستیەکە: کلیلی خۆناسین خواناسینە وەك وتراوە(من عرف نفسَه ُقد عرفَ ربَهُ)دیارە هیچ شتێ لەخودی خۆت لەخۆت نزیکتر نیە،جاکەخۆت نەناسی چۆن کەسی تردەناسی؟لەوانەیەبڵێی خۆم دەناسم،بەڵام هەڵەدەکەی! ئەوناسینەی کلیلی خۆناسینە بریتیەلەوەی کەبزانی لەکوێ هاتوی؟بۆچی هاتوی؟بۆکوێ دەڕۆی؟وەبزانی بەختەوەریت چیەولەچیدایە؟ وەبەدبەختیت چیەوچۆن دەتوانی خۆتی لێ بپارێزی؟نەك خۆناسینی دیماگۆجی وسیاسیانە کەنوێنەری خۆیان نین ئەوانە!.یان خۆناسینی ئاژەڵانەکەتەنها ڕواڵەتی جەستە ولاشەی دەزانێ وکەبرسی بوودەخواو کەتوڕەبوو بەشەڕدێت وکەئارەزوی جولاجوت ببێت، هەربۆیە کوشتنیشی تاوانێکی ئەوەندە گەورەیە وەك ئەوەیە دنیات ڕوخاندبێ وەهەر کەسێکیش یەکێ زیندوو بکاتەوە و لەمردن ڕزگاری بکات وەك ئەوەی نەیەڵێ خۆی بکوژێ یاخۆی بسوتێنێت یا لە خنکان ڕزگاری بکات یامناڵێ

هەڵبگرێتەوە، وەك ئەوە وایە هەمووخەڵکی زیندوو کردبێتەوە(ومـن أحیاهـا فکأنمـا أحیـا الناس جمیعـاً)،ئیـسلام دژی خـوێن ڕشتنەئەوەتابەگەیـشتنی پێغەمبـەر(ﷺ)بۆمەدینـە شەڕی(١٠٠)ماڵەی ئەوس وخەزرەجی کۆتایی پـێ هێناکەشمـشێرەکانیان بـەخوێنی یـەکتر سوربوبوو.

دووەم/ لەبەرنامەی دەسکردی مرۆڤدا:

نرخ وبەهای مرۆڤە کان لە بەرنامە دەسـتکردەکاندا زۆر کەمـەو بەچـاوێکی مـاددی سـوك سەیری دەکرێ، تەنها حساب بۆ بەشەماددیەکەی دەکرێ و گیـان و ڕۆحـی ناخوێندرێتـەوە، ئەوکاتە ئالتون و تەپاڵە یەکسان دەبن چونکە هەردووکیان ماددەن، لە سەدەی (١٩)فرۆیـد توێکاری کرد بۆ پێکهاتەی لاشەی مرۆڤ و بەشەکانی جیاکردەوە لـە چـەوری وفـسفۆروخوێ وخەڵوز و شەکر،چەوریەکەی بای چـەند دەسـتە مـومێ بـوو، نرخـی هـەموو پێکهاتـەکـەی ئەوکاتە بایی شەش دۆلار بوو،کابرایان دەکوشت و (٦)دۆلاریـان دەدا بەخاوەنەکـەی بـەلاّم لەئیسلامدا خوێنی مرۆڤ (١٠٠)حوشترەکە ئەمڕۆ نالێم (١٠٠)دەفتەر دۆلاریەلکو (١٠٠) مۆنیکادوومانگیش لەسەر یەك بەڕۆ ژووبێت، ئەوە بۆئەوەی بەئاسانی مرۆڤ لە ناونەبرێت، تانەڵێ دە‌‌ەکوژم و خوێنەکەی دەدەم،(داروین) بە تیۆری پەرەسەندن مرۆڤی گێڕایەوە بۆسەر مەیمون، کەبە بەڵگەی ئەقلی و نەقلی و زانستی بیرۆکەکـەی پوچـەڵکرایەوە ودرۆبوو،بۆیـە ئەوکات خەڵکێکی زۆر پێشوازیان لە بیرۆکەکەی کردوو شانازیان بەوە کـرد کـە بگەڕێنـەوە بۆ ژیانی ئاژەڵی و هـیچ سـنورێکی حـەلاڵ و حـەرام نـەمێنێت، بـەجۆرێك زانـای ناسـراوی ئینگلیزی مستەر(شیبەر)دەڵێ: لە بەریتانیا نەوەیەك پەیـدا بووەکـەژیانی خێزانـی نـازانن، جگە لە ژیانی مێگەلی ومەڕومالاّت!! نـەوەی مـەیمون لـە کـوێ ونـەوەی ئـادەم لـەکوێ؟؟ کامیـان شـانازیە؟ ئێـستایش ئەوانـەی بانگەشـەی بـەڕەڵلاّی دەکـەن بـەناوی ئازادیـەوە و تێکەڵی ئافرەتان دەبـن و هـیچ سـنورێ ناهێڵنـەوە خـاوەنی ئـەو جـۆرە بیرۆکانـەن، کەلـەو

نێوەندەدا ئافرەتان دەبنە قوربانی وسوتەمەنی بەهۆی لە شفرۆشی وبەکارهێنانی وێنە وجستەی ئافرەت لە هەموو شتێکی سوك وبێ نرخدا کە ئەوە دژی هەموومانە چونکە ئێمە هەموومان لە ئافرەت بووین، جا ئەگەر حیکمەت و فەلسەفەی ژیان بو بە خواردن و خەوتن و تێرکردنی سەر وبەر ئەوکاتە ئاژەڵان لە ئێمە چاکتر دەژین و ڕادەبوێرن چونکە ئەوان موکەلەف نین و سنوری عەیب وعار وحەڵاڵ وحەرام نیە لای ئەوان، چ بێ ڕێزیەکە مرۆڤ دابەزێتە ئاستی ئاژەڵان (پەنا بەخوا)، تاگەیوەتە ئەوەی هەندێکیان هاوسەرگیری لەگەڵ سەگەکەی یان گوێدرێژەکەی بکات دەیان بەڵگەی زیندومان لە بەردەست دایە لەو بارەوە، بێ ئەقڵی خۆیان بە جۆرێ سەلماندوە کە لەگۆڤاری چرپە ژمارە(٢٠)شوباتی ٢٠١٣ هاتوەلەجۆرجیا پیاوێك لەپێشکەوتنێکی تازەدا مۆدێلێکی تازەی هاوسەرگیری داهێنا کەلەگەڵ گوێدرێژەکەیدا بونە هاوسەر! وەك لە ئاهەنگەکەدا بە وێنەیش پیشان دراوە تارای بوکێنی بەسەرگوێدرێژەکەدا داوە!نوخشە بێت لەوکەرانەی کەهاوکوفی خۆیان نەدۆزیوەتەوە، مرۆڤی ئەوروپا یاساوغەرامە کردونی بە ئادەمیزادئەینا لەبواری کۆمەڵایەتی و ڕەوشتدا سفرن، وەك خۆیشم ساڵی( ٢٠١٢ )لەسەفەری نەرویجدالەئۆسلۆ بینم ،وەلە بواری دڕندەیی ویەکتر قڕکردنیشدا میستەر(ئیدن) سەرۆك وەزیرانی پێشوی بەریتانیا لە وتارێکیدا ساڵی (١٩٣٨)پێشکەشی کردبوخۆی ئیعتراف بەوبێ ویژدانیەدەکات ودەڵێ:خەڵکی بەرەو وەحشیەت ودڕندایەتی دەگەڕێنەوە بە ململانێ کردن لەسەردروستکردنی چەکی کۆکوژ ، چونکە ئەوچەکە بۆلەناوبردنی مرۆڤەکانە،وەك ئەوەی لە ڕابردوودارویداله(کوشتن و برین) . زانایەکی هیندی هاوشێوەی(الکسیس کاریل)ڕەخنە لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا وئەوروپا دەگرێ و دەڵێ لە بواری تەکنەلۆژیا بەجۆرێك پێشکەوتن کە توانیتان وەك باڵندە بە ئاسماندا بفرن و وەك ماسی لە ژێر ئاودامەلە بکەن، بەڵام نەتان توانی وە ك مرۆڤ لەسەر زەوی ڕێبکەن!! هەست و ڕێزی مرۆڤایەتیان نەبوو! دەبینی زلهێزەکان لە پێناو سەرکەوتنی سەرۆك لە هەڵبژادنەکاندا شەڕی گەورە هەڵدەگیرسێنن مرۆڤەکان لە ناودەبەن وەك ئەوەی

لە عێراق و ئەفغانستان کردیان، یان ئەوەی بە ناوی شەڕی دژە تیرۆرەوە هەڵیانگرساند دژبە ئیسلام و موسڵمانان ئێستاش ئەوەی دەکرێ ودەگوزەرێ لە تیرۆر و تۆقاندن و تەقینەوە،فکرەی ئەوانە یان دەستی ئەوانە وهەندێکیشی کاردانەوەی ستەم وداگیرکاری ئەوانە وەك دەبین ودەبیستی ڕوباری خوێنیان هەڵساندووە ولەم لاوەیش بانگەشەی مافی مرۆڤ دەکەن!! چونکە دەزانن بانگەشەکەیان بلقی سەرئاوە و تەنها دروشمەوچاووڕاوە بۆیە زۆر هاواردەکەن مافی مرۆڤ، بەڵام لە ئیسلامدا ئەو هاوار و بانگەشەی ناوێ چونکە مافی مرۆڤ حە ق و واجبێکی خودایە و نەدان و نەمانی تێکدانی دنیایە، هەر لەبەر گەورەی ڕێزی مرۆڤەکان لە ئیسلامدا ئەگەرکۆمەڵێك بە شداربن لە کوشتنی کە سێك بەناحەق ئەوە هەموویان دەکوژرێنەوە چونکە لە کوشتنەوەی بکوژەکە خەڵك ژیانیان ئارام دەبێ (وَلَكم في القصاص حياة ياأولى الأباب) لە تۆڵە سەندنەوەدا ژیان هەیە بۆئێوە، لەسەر دەمی پێشەوا عمردا لەمەدینە بە(١٠)کەس یەکێکیان کوشتبوو، پێشەوا عمر هەموویانی کوشتەوە لە تۆڵەیدا فەرمووی: ئەگەر هەمووخەڵکی مەدینە بەشدار بونایە لەوکوشتنە ئەوا هەمویانم دەکوشتەوە. بەڵام ئێستا لەسایەی سیاسەتی عەلمانیدا وبەناوی مافی مرۆڤەوە بکوژەکان لە زینداندا خزمەت دەکرێن و پاشان ئازاد دەکرێن.ئەی ئەوەی کوژراوە مرۆڤ نەبوو؟ مافی نیە؟ لە گەورە بیریارانی فیکری ئینسانی فەرەنسا کە زۆرێك لە نوسەران شانازیان پێوە دەکەن بەرهەمە کانیان وەرگێڕدراوە وەك (نیتشە)کەلە کۆتایی ژیانیدا دوچاری خەمۆکی و کەنارگیری بوو وەك شێتی لێهاتو بە نەخۆشی زوهری مرد،یەکێکی تر لەو زانایانە بە ناوی (مۆپاسان) داوای دەکرد خەڵکی وەك سەگەکان بژین، تۆسەیرکەلەم سەدەیەداچ کارەساتێکە؟لەسەدەی مەرگی مرۆڤەکانە،سەدەی بێویژدانیە،ولاتە زلهێزەکان بەناو (پێشکەوتوەکان، دیموکراسیەکان)بەملیارەهادۆلارخەرج دەکەن بۆبەرهەمهێنانی چەکی ناوەکی تاکومرۆڤی پێ قڕبکەن، کەچی هەزاران وملێۆنان مرۆڤ هەن چاوەڕێی پارویەك نانن تالەبرسان دەمرن!ئەمە بانێکەوچەند هەوا؟

چارەسەریش گەڕانەوەیە بۆعەدالەتی ئیسلام و ڕەوشتەجوانەکانی دینەکەمان، لەکۆتایدا!
ئەگەردەتەوێت قەدرو قیمەتی خۆت بزانی و خۆت بناسی بزانە: کلیلی خۆناسین
خواناسینە (ألاَ یعلَمُ من خَلَقَ وَهو الطیفُ الخبیر)*

## پێم بڵێ بۆچی؟! Tell Me Why



وێنەی چەکی کۆکوژ



نمونەی برسیەتی

---

* ئەم وتارەم لەکەناڵی سپێدە/بەرنامەی ڕۆشنایی لە(٢٠١٢/٣/٥)دوبارەم کردەوە

+ وەهەروەهالەگۆڤاری (جودی) وەزارەتی ئەوقافیش ژمارە(١٠)بلاوکراوەتەوە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

پێشەکی:

وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ

ستەم وناعەدالەتی وپێشێلی مافەکان قسەوباس وکێشەی سەردەمە!کە دیاردەیەکە لەدەرەنجامەکانی سیستمی سیکۆلاری وعەولەمە،بابەتەکانی ئەم کتێبە قەیران و گرفتەکانی سەردەمە وتاری هەینی مزگەوتەکەمە،کە پێشترلەوتارەکانی ساڵی (٢٠١٢) خوێندومنەوەوپاشان لەگۆڤاوروژنامەدابلاوم کردونەتەوە،ئەم چاپەبەرگی دووەمی کتێبی (وتاری سەردەمە)بۆسودی زیاتر وبەزیندوڕاگرتنیان بەپێویستم زانی لەدووتوێی کتێبێکدا کۆبکرێنەوە،هەرکوچۆن کێشەوگرفتەکان زۆرن.. بۆیەباسەکانیشی هەمەجۆرن، هەندێ لە بۆنەکان ساڵانەن بۆیە هەندێ لەناونیشانی بابەتەکانیش دوبارەن بەڵام لەناوەڕۆك دابە شێوازی نوێ وسەردەمیانەنوسراوەتەوە،وەلەبەردوبارەودرێژنەبون(ارکان الخطبة)بنەماکانی وتاری هەینیم بەکەمی نوسیوە،چونکە وتاربێژخۆی دەتوانێ ودەزانێ کەبۆهەمو وتارێ پێویستەبنەماکانی بۆزیادبکرێ کەبریتین لە(الحمد+ الصلاة+ وەصیەت بەتەقوی، ودعاو پاڕانەوەش بۆکۆتایی وتارەکە)،بەهیوای بەرچاوڕونی وبەئاگابون لەگرفت وپرسە هەنوکەییەکانی ژیان بۆچارەسەریان لەژێر ڕۆشنایی دەقەکانی سوننەت وقورئان،بێگومان ئەم کتێبەلەدووبارەو کەموکورتی خاڵی نیەولەئاست کەم توانایی بەندەدایە،جانەوەی پێکاوەلەخواوەیەوهەڵەکانیشی لە بەندەیە وخوالێمان ببورێت،هیوادارم بیخوێننەوەو دوعای خێرمان بۆبکەن.

# شوێنكەوتەی كام لەم سیانە..ڕێبازی موسڵمانە

الحمـــدُلله..حمداًكثيراًكماأمَر،والصَلاةوالَــسلامُ علـى حبيبنامحمدِسيدالبـشر،وعلى الــهِ اصــحابهِ مااِتصلت بهِ عين بنَظرواُذنٌ بخَبَر..وسلم تسليماًكثيراً.

امابعد: اصيكم ايهاالناس ونفسى قبلَكم بتقـوى الله،فـانَ تقـواهُ اَربَـحُ تجارةوبـضاعة،واحذروا مَعصيَتَهُ قدخابَ عبدُفَرطَ فى اَمرِرَبهِ واَضاعة،وعليكُم بماكانَ عَليهِ السَلفُ الصالحُ والجَماعَة، فخُذوابِهَديهم وماكانواعليهِ فى الُمعتَقَـدِوالعملِ والطاعَـة،قال تعـالى:وَمَامُحَمَّـدٌ إِلّارَسُـولٌ قَـدْ خَلَــتْ مِـــنْ قَبْلِــهِ الرُسُـــلُ أفَـــإِنْ مَـــاتَ أَوْ قُتِـــلَ انْقَلَبْـــتُمْ عَلَـــى أعْقَـــابِكُمْ.....

١)كەسەكان(الاشخاص)بەداخەوەوەك جۆرێك لەكۆیلایەتی سەردەم هەندێك لەخەڵكی بونەتە بەندەی بەندەكان بەچاك وخراپ بەحەق وناحەق لەخزمەت فلاَن وفیسادایەوئاغا بەڵێی بۆدەكات! تەنانەت هەندیَ لەموسڵمانانیش دوچاری ئەم دەردە بون! تەنهاقسەی شێخەكەی یان لێپرسراوەكەی بەڕاستدەزانیَ! وەك جۆرێك لەشەخسپەرستی وپەڕۆ پەرستی پیرۆزكراون بەناوی دینەوە!،كەجگەلەپێغەمبەرﷺكەس مەعصوم نیە.

٢)**شتەكاو** (الاشیاء)شتەدونیاییەكان لەماددەوپوڵ وپارە،بەهۆی لاوازی ئیمان وچاو لێكەری كوێرانە زۆرێك لەخەڵكی كەوتونەتە شوێن دونیا پەرستی وبەجۆریَ سەرقاڵی كردون كەخەریكە دواڕۆژیان لەبیر بباتەوەو بونەتەبەندەی هەواوئارەزو ودینارودۆلار كۆشكوتەلار!بێگومان هەتابەرەو دنیابڕۆی لەقیامەت دوردەكەویتەوە،چارەسەریش قەناعەت ودنیا بەكەم گرتنە(الزهد)وناسینی شتەكان وەك خۆی،دنیاوەك زۆپای زستانە ئەگەر لێی دوربی سەرمات دەبیَ وڕەق دەبیەوە،ئەگەرلەنزیكی بی یالەباوەشی بگری دەتسوتێنیَ،بۆیەدەبیَ بەرانبەری بیت مامناوەند،دونیاشوێنی تاقیكرانەوەیە،ئەوەتا پیاوبەئافرەت تاقیدەكرێتەوە،ئافرەتیش بەئاڵتون تاقیدەكرێتەوەوئاڵتونیش بەئاگر،كەلە بەرانبەریەكتردالاوازن وخۆیان ناگرن!

٣) فیكر(ئایدیا)بیروباوەڕ،ئەمەیان هەڵبژاردنی ڕاستە وئیسلامیش داوامان لێدەكات كە

شوێنکەوتەی ئەوبیروباوەڕەبین کەلەقورئان وسوننەتدایە نەك شوێنکەوتنی کەسەکان وپول وپارە،لەقورئاندانمونەی زۆرمان هەیەکەپێمان دەڵێ(مەبدەئی)بن شوێن کەوتەی بیروباوەڕ بن،لەشەڕی ئوحود دەنگۆی ئەوە بلاوبۆوەکەپێغەمبەرﷺشەهیدکراوەکۆمەڵێ لەهاوەلان دەستیان بەخۆدابەردایەوەوساردبونەوەلەشەڕوتوانایان نەما،بەلام هەندێکی ترئاگاداریان کردنەوەکە ئەگەر پێغەمبەریش شەهیدکرابێ وەك (زەکەریاو یەحیا)یاوەفاتی کردبێ وەك (موساوعیسا)ئێوەپاشگەزدەبنەوەلەدین؟!خۆبیروباوەڕەکەی ماوە،دەی ئێوەش لەسەرئەو عەقیدەو بیروباوەڕبجەنگن کەئەولەسەری بووە،(وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ)(١٤٤ال عمران)واتە: محمدﷺ پێغەمبەرێکەوەك پەیامبەرانی تر،هاتون و ڕۆیشتون ومردون دینەکەشیان دوای خۆیان ماوەتەوە،ئەمیش وەك ئەوانە،ئایائەگەرمردیان کوژرائێوە پاشگەز دەکات؟!هەرکەس ،بۆیەدەبێت مامەڵەمان لەگەڵ فیکردا بیت نەك لەگەڵ شەخصدا،ڕابەروپێشەوای ناسراوی کورد(سعیدنورسی)کەبینی قوتابیەکانی زیادلە خۆی ڕێزی دەگرن وبەپیرۆزی دەزانن،بۆیەپێی فەرموو:ئاگادارتان دەکەمەوەکە ئەوحەقەی من ئێوەی بۆبانگ دەکەم مەیبەستنەوەبەکەسێتی فانی ولەناوچوی منی گوناهبارەوە، بە ڵکولەسەرتانە وابەستەبن بەسەرچاوەی پیرۆزەوەکەکتێبەکەی خواوسوننەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ ئەوەتائیمام مالك جارێکیان چوەسەرگۆڕی پێغەمبەروفەرمویەتی:هەموکەسێ لە ئێمەقسەی دەدرێتەوەدواوەوتەنهاخاوەنی ئەمگۆڕەنەبێت ئاماژەی کردوەبۆگۆڕی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە پێویستە زیاترگرنگی بدرێت بەهەڵبژاردن وپوختەکردن وپێگەیاندنی بیروهۆش، چونکەمرۆڤ هەرچی دەیکات لەژیانی ڕۆژانەیدا ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕیەتی (گۆزەچی تێدا بێ ئەوەی لێدەڕژێ)بیرکردنەوەی لاروخواروخراپ مرۆڤی لاروخواری لێدەردەچێت،جوانیان وتوە(تێگەیشتن مەرجەنەك پێگەیشتن)ئەگەرسەرنجی قورئانی پیرۆزبدەیت دەبینیت لە (١٣٠٠)ئایەتدا وشەی (تفکُر)دوبارەبۆتەوەکەمەبەست لێی بیرکردنەوەوسەرنجدان وتێڕامانە

بەداخەوەکە ئێمەئەوگرنگیەی پێنادەین وبەڵکوهەندێ کەس لەجیاتی هۆشیاری خۆیـان بـێ هۆشدەکەن بەماددەهۆشبەرەکان بەوەش خۆیان دەخەنەڕیزی ئاژەڵان! وەلە بەرانبەردا تـەنها لەیەك ئایەتدا باسی دەست نوێژکراوەکەبەردەوام پێویستمانە، بۆنمونە:کەباسی دروستکردنی ئاسمانەکان وزەوی دەکات لەکۆتایی ئایەتەکەدا فەرمویـەتی:(لَآیـات لقـوم یَتَفکـرون) واتـە: ئەوانە بەڵگەونیشانەن بۆخەڵکانێ کەبیر بکەنەوە سەرنج بدەن لەگەورەی خوا،بۆیە(حەسەنی بصری) فەرمویەتی: (تَفَکرساعَةَ خَیرُمِن قِیامِ اللیلَة)واتە:سـاتێك بیرکردنەوەچـاکترە لەشـەو نوێژی شەوێك،لەکاتێکدا هـەمومان دەزانـین کەشـەونوێژ چـەندەئەرکی زۆرە بۆیـە ئەوەنـدە خێریـشی زۆرە،بـەلاّم سـاتێ بیرکردنـەوە لەوەبەگرنگتردانراوەچـونکە بـە هـۆی بیرکردنـەوە ڕێگەی ڕاست ئەدۆزیتەوە وبەخۆتدائەچیتەوەکە لەکوێوە هاتوین وبۆکـوێ دەچین ومـن چیم ودەبێ چۆن بم وچی بکەم چیم ڕاستەوچیم هەڵەیە،چونکە مەودای بیرکردنەوە(فەزای أفکار) دونیایەکی فراوانە و سـەرەنجام ئەتکاتەکەسێکی(مەبـدەئی)وخـاوەن هەڵوێـست وڕزگـارت دەکات لە چاولێکردن وشـوێنکەوتنی کوێرانە،لـەڕۆتین وڕوکەشـی وبەندایـەتی زەمانـە، بـە تایبەت بەندایەتی ئارەزوەکان،چونکە ئـارەزوی نابـەجێ بەرەولـەناوبردنت دەبـات وەك ئـەو دەنکـە گەنمەوایەکەلەسـەرفاقەوتەڵەدانرایەوباڵندەکە پـەلاماری دەدات وملـی پێـوە ئـەبێت وتیانەچێت،شـوێنکەوتنی ئارەزوەکـانیش بـەبێ بـیر کردنـەوەی ڕاسـت ودروسـت وشـەرعی خاوەنەکەی وەك ئەو باڵندەیە دوچاری لەناوبردن وسەربڕین ئەکات،یان دانیشتن وبیرکردنـەوە وبەخۆدا چونەوەلەسەر قەبران لـەپاڵ گـۆڕی خۆشەویـستێکت بزانـە چـۆن حاڵـت دەگۆڕێـت، ئەوانەی بیردەکەنەوە لەلێپرسینەوەی دوارۆژوناوگۆڕناتوانن دەسـتیان بخەنـەناوماڵ ونـاموس وخوێنی خەڵك بەناڕەوا،ئەوانەی کە ژیانیان لێکـردوین بـەژان بـەدرۆودوڕوی گەنـدەڵی لـەو دەستەوتاقمانەن کەبڕوایان بەلێپرسینەوەی دوارۆژنییەبۆیە شەرم ناکەن دەڵێن:هـی خـۆم بـۆ خۆم هی تۆش دەخۆم یان دەڵێن حازربە قەرزنادەین! کەلەڕاستیداژیانی مسۆگەرونەبڕاوەیان گۆڕیوەتەوەبەخۆشیەکی کەمی دنیا،بێ گومـان شـێوازی بیرکردنەوەکاریگـەری ڕاسـتەوخۆی

هەیەلەسەرسەلامەتی جەستە،وتراویشەکە بیرکردنەوەی ترس وبیم وخراپەخێراتر لـەخێرایی گولە خاوەنەکەی دەکوژێ،چونکە چۆن بیربکەیتەوەولەچی بترسی دوچاری دەبی، دڵـەڕاوکێ ونیگەرانی زۆرلاشەی مرۆڤ سـست ولاوازدەکـات ودوچـاری نەخۆشـی دەکـات وبـەخێرایی دەتوانێ سیستمی عـەقڵ وبیرکردنـەوەی مـرۆڤ تێکبشکێنێت،وەبەپێـچەوانە بیرکردنـەوەی ڕاست ودروست وتەواوشـادوبەهێز لاشـەیەکی بـەهێزوخۆڕاگروجوان دەسـازێنن،گەردەتانەوێ لاشەیەکی ساغ و تەندروستان هەبێت ئاگاداری بیروزەینتان بـن جـوان ڕای بگرن،ئەندێـشەی بەد وڕژدوحەسودی گوناهونائومێدی خەم وگرفتاری ودڵەڕاوکـەزیان بەجەسـتە دەگەیـەنێت، زانایەکی ڕاستەقینەم بینی لەنەخۆشی سەرەمەرگدا پیردیارنەبوو بـەلاّم بەتەمـەن بـووا هـەر بەوشێوەی کەلەڕۆژانی تەمەنیدابەسەری دەبردهەر ئـاواش قۆنـاغی مـەرگی تێـدە پەڕانـد، بۆدەرمانی نەخۆشیەکانی جەستەهیچ پزیـشکێك باشـترنیەلەبیرکردنەوەی ڕاست ودروست بۆلـەناوبردنی سـێبەرە کانیـان،هیچ شـتێك لەچـاکەخوازی باشـترنیە،ژیانێك بەبـەردەوامی لەسـەرینەمای دژایـەتی بـەدگومانی وخراپەوپاشـەملەبنیادنرابێت وەکونەوەوایـە خـۆی خـستبێتە چـاڵی ئاگرەوە،بـەلاّم ئەگـەردەربارەی هەمـوشـتێك وهەموکەسێك بیرکردنـەوەی (ایجابی)مان هەبێت وبزانین ودڵنیابین کـە چـاکەکاری لەبیرکردنـەوەی ڕاسـت و دروسـتدایە، گەرلەقورئانداسەرنج بدەلـەم وشـانە(لاتقنطـوا..،لاتحزنـوا..،لاتیأسـوا.. کـەداوامان لێـدەکات گەشبین بین نائومێدوڕەشبین نـەبین تاکوزیـان بـەفیکرمان نەگات،کورتـەی ئـەم باسـەش لـە پەیامی ئیسلامدابەدوو ووشە بڕاوەتەوە کە فەرمانی پێکـردوین بـە:(حُسن النیـة وحُـسن الظّن )نیەتی چاك وگومانی چاك و پاکە،کەسەرچاوەیان بیری یەکتاپەرستیە، باچیتر ڕێگـە نەدەین سەرکردەوحیزبو خێڵ لەبری ئێمەبیربکەنەوە(نیگەران مەبە بەوەی کەدەمری چـونکە بەدەسـت خـۆت نیـە..بـەلاّم نیگـەران بەکـە چـۆن بـژیت چونکەبەدەسـت خۆتـە).

جارێك بیرت نەکردەوە! لەم یاسایـە لەم گەردونـە لەم ژین ومردن وبونـە!!

## بومبەلەرزە (زەمین لەرزە)

زەمین لەرزە ئاگاداری وئامۆژگاری تێدایە..زللەی میهرەبانی خودایە کارەکانی خوایەك پارچە عەدالەت ورەحمەتە،وەك وتراوە(خواکاری نابەجێ ناکات تاکێونەبینێت بەفری تێناکات)یەکێ لەباس وخواسەکانی ئەم سەردەمە زیادبوونی کارەساتەسروشتیەکانی وەك بورکان وبومبە لەرزەولافاوو..هتد،کە بووەتەجێگەی ترس ونیگەرانی مرۆڤەکان، چونکەلەحالەتەوەبوەبەدیاردە،لێرە دا پرسیارێك بەسەردڵی خەلکانێکدا دێت کەخوابۆچی بومەلەرزەی دروستکردووەکەهاورێی مەرگەسات وکارەساتە،ئەی خوابەڕوحم نیە؟ بێگومان خوا بەڕوحمەبۆئەوانەی کەڕوحم بەخۆیان دەکەن وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن هاوکات سزاو تورە بونیشی هەیەبۆئەوانەی ستەمکارو بێباوەڕن،جابەپێی لێك دانەوەی ئیمانی وپەروەردەیی وپەندوەرگرتن(تفسیرالایمانی وتفسیرالتربوی) بومبەلەرزەسێ حیکمەتی تێدایە:

**یەکەم/ مُذکرات**، واتە: **بومەلەزرەبیرخەرەوەیەویەئاگامان دەهێنێتەوەلەسێ شت :**

١ـ لەنیعمەتەکانی خوا کەلەژمارەنایەن جایەکێ لەونیعمەتانەگۆی زەوییە کە بۆمانی ڕامکردوە وسەرچاوەی ژیانی ئێمەیە لەسەری ئەخۆین ونەیفرۆشین و کاتێ بەسەیارەمۆدیل بەرزەکانمان نازوفیزی بەسەردا ئەکەین وبێ ئاگاین لەو کەسەی کەبۆی ڕاگیرکردوین لە بۆشایی بونەوەرداکە( الله)یە،خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ ان الله يُمسك السمَوات والارضَ ان تزولاولَئِن زالَت اِن اَمسَكَهُمامِن اَحدِمِن بَعدهِ﴾ واتە:خوای گەورەئەم ئاسمان وزەویەی ڕاگرتوە تانەکەون بەسەریەکداجگەلەوکێی ترهەیەڕایان بگرێت ئەگەرلاچون ونەمان، لەکاتێکدا زانایانی زەوی ناسی دەلێن :قورسای زەوی(٦٠٠٠)ترلیۆن تەنەواتە:ژمارەی شەشەکە (٢٧) سفری بەدواوەیە!حەزرەتی موساش وتی ئەی خودایەهەمودروستکراوەکانت دەخەون بەلاّم تۆناخەویت؟خوای گەورەفەرموی سوێندبەگەورەیی وشکۆمەندی خۆم ئەگەروەنەوزێك خەوە چکەیەك بمگرێ ئاسمانەکان ئەکەون بەسەرزەویدا،ئەی کوڕی عیمران گەرپەرداخێك شیربە دەستەوەبگریت وخەوت بەسەردابێت چی ڕودەدات؟وتی پەرداخەشیرەکەم لەدەست دەکەوێتە

خوارەوە،وەك لەئایەتی کورسیدا(لاتاخذه سنة ولانوم)خوداخەوەچکەوخەوی بەسەرانایەت ٢ـ بومەلەرزەکان ئاگادارمان دەکەنەوەلەهێزودەسەلاتی خواوەك دەفەرموێ: (ومانرسل بالایات الاتخویفاً..)ناردنی ئەوبەلگانەبۆئاگاداری وترساندنە،بۆئەوەی لەهێزودەسەلاتی خوا بێ ئاگانەبن وبەخۆیاندا بچنەوە،وەبۆئەوەی تاوانباران تەوبەبکەن وبگەرێنەوە و ستەم کارانیش دەست هەلبگرن لە خوێن رشتن وخراپەکاری .

٣ـ هەروەهابەئاگامان دەهێنێتەوەلەبومەلەرزەی دنیاخەرابون وهاتنی رۆژی دوایمان بیر دەخاتەوەکەئەوەش هاندەرەبۆئەوەی توێشووبۆقەبروقیامەتمان کۆ بکەینەوەبەردەوام لە تەقوای خوادابژین ولەئامادەباشیدابین بۆدوارۆژخوای گەورەفەرمویەتی:(یَا أَیُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّکُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَیْءٌ عَظِیمٌ...)الحج، بەراستی زەمین لەرزەی رۆژی دوایی شتێکی گەورەوسامناکە،شاعیرجوانی وتوە: ئەی سەرقالێ بەدونیاوە.. .تەفرەدراوبەهیواوە..

مردن دلۆپەی ناکاوە.. چیت بۆگۆرنەنجام داوە

دووەم / کاشفات : کۆمەلێ راستیمان بۆئاشکرا دەکات بەتایبەت ئەم سیانە:

١ ـ کەم وکورتی دنیا،وتراوە:دنیا پێچی مێزەرێکە ژیانێکی کەمەوشوێنی تاقیکرانەوەیە، پێشەواحەسەنی بصری دەلێ:دنیا تازیاتربیناسی لێی دوردەبی بەلام تازیاترخودابناسی لێی نزیك دەبیتەوە،ئیبراهیمی ئەدهەم لەسەرگۆرستان دەگریا،وتیان بۆدەگری؟وتی دنیایەك ئەم هەموبێنەوبەرەوماندوبونە سەرەنجامەکەی ئەوچالە بێت چەندەکەموکورتە!قیامەتێکیش بەم چالەقەبرەدەست پێ بکات دەبێت چەندمەترسی داربێت؟ جاچۆن نەگریم؟

٢ـ پلەی ئیمانی موسلمان ئاشکرادەکات، ژیانی دنیاتاقیکردنەوەیە بەخۆشیوناخۆشی بروا داریش هەربەقسەنابێت بەلکولەکرداروگوفتار،لەشین وشایدالەکرین وفرۆشتندادەردەکەوێ، خوای گەورەفەرمویەتی﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ یُتْرَکُوا أَنْ یَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا یُفْتَنُونَ..،واتە : ئایا خەلکی واگومان دەبەن کە هەربەوەندەلێیان بگەرێن کەبلێن باوەرمان هێناوەوتاقی نەکرێنەوە؟ بێگومان وەك چۆن خەلکانی پێش ئەوانیشمان تاقیکردنەوە ئێوەش تاقی

دەکەینەوە تا بزانین کێ ڕاست دەکاوکێ درۆ دەکات،ڕەوشتی موسڵمانی ڕاستەقینەش بەو جۆرەیەکەلەکاتی ناخۆشیدا ئارام دەگرێت پشت بەخوادەبەستێت وبەئومێدە وەلەکاتی خۆشیدابایی نابێت وسوپاس گوزارە .

٣- بومەلەرزەکورت بینی زانستی زانایانمان بۆئاشکرادەکات،خوای گەورە فەرمویەتی: (وماأُوتیتم من العلمِ الاقلیلاً)واتە:پێتان نەدراوەلەعیلم وزانیاری مەگەرکەمێك نەبێت کە لەچاوزانستی بێ سنوری خواقەترە بەدەریایە، ئەو ڕاستیەی دەرخست کەتەکنەلۆژیالە خزمەت ئیسلامدایەوهەرچەند هەوڵی زۆریش دراوەلەدژایەتیکردنی ڕاستیەکانی ئیسلام بەلاّم سەرەنجام بیردۆزەکان بەسەرخۆیانداشکاوەتەوە،بۆنمونەئاژانسی فەلەکی ناساڕایگەیاند بووکەلە (٢٦/٩/٢٠١١)کلکداری(نیپرۆ/ئەلەنن) ئەدابەزەویداوبەشێکی زۆری کاول دەکات وکاولکاری ومەرگەساتی زۆری بەدوادادێت وخەڵکیان ترساندوهەندێ لەمیدیاکان پێوەی سەرقاڵبون،ساڵی(٢٠١١) تەواوبوو بەلاّم دنیاخەرانەبووزانیاریەکەیان بەدرۆ دەرچوو، لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەریخستوەکەبۆق پێشبینی ڕودانی بومەلەرزەدەکات! بێگومان بومبەلەرزەی گەورە هەردێت ودنیاخەرادەکات بەلاّم خوانەبێت کەس نازانێت ئەوەکەی دەبێت ئێستانیشانەگەورەکانی ماون بێنەدی ...

سێیەم/ مُؤیِدات: واتە پشتگیری ڕاستیەکانی ئیسلام دەکات :پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: لاتقوم الساعة حتی تکثرُالزلازل،واتە:دنیاکۆتای نایەت هەتابومەلەرزەزۆرنەبێت،کەم ڕۆژهەیەهەواڵی بومەلەرزەی بچوك وگەورە نەبیستین لەڕاگەیاندنەکان،کەلەسەردەمانی ڕابردووبەوشێوەیە نەبووە پێشتر حاڵەت بووەئێستابوەبەدیاردە،وڕاستی فەرموەپێغەمبەری ئازیزمان ولەخۆیەوە قسەناکات وقسەکانیشی موعجیزەن،یەکێ لەهۆکارەکانی زۆربونی بومەلەرزە فەسادوبەدڕەوشتیە،پێشەواعومەریش(خ) فەرمویەتی:زیناهۆکارێکە بۆزۆربونی بومەلەرزەچونکە توڕەبونی خوای بەدواوەیەپەنابەخوائێستافەسادی ئیداری و ئەخلاقی گەلێك زۆربوەوهاوکات دیاردەسروشتیەکانیش زۆربون،(ئەنیشتاین)دەڵێ:زانستی بێ دین

وەك شەل وایەبەلاّم دینی بێ زانست وەك كوێروایە،ئێستائێمە گیرۆدەین بەهەردووڵایانەوە باشان پشتگیری ئەوڕاستیەمان بۆدەكات كەمرۆڤەكان هەموبرای یەكن وەك مرۆڤایەتی بۆیەهەموو پێویستیان بەیەكەوناتوانن بەتەنیابژین ولەوجۆرە ڕوداوانەدا دەبینی هەموو هاوكاری یەكتردەكەن جاوەك برایەتی ئیمانی هەیە برایەتی ئینسانیش هەیە،ئەوڕاستیەش پێغەمبەرﷺ (١٤٣٤)ساڵ لەمەوبەر سەلماندویەتی ولەوتاری ماڵ ئاوایدا فەرموی: **ایها الناس ان ربكُم واحدوان اباكم واحد،كلكم لادم وادم من تراب..**،واتە:ئەی خەڵكینە ئێوەهەموویەك خواویەك باوكتان هەیەهەموتان لەنەوەی ئادەمن وەئادەمیش لەخۆڵ دروست كراوە،ئەوەش بەڵگەیە لەسەرجیهانی بونی ئیسلام،بۆیە دەبینی پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەكدا فەرمویەتی(**الله فی عونِ العبد مادام العبدُفی عونِ اخیه.... .**) واتە:خوایارمەتی ئەوكەسە دەكات كەئەویش یارمەتی براكەی بدات،برای ئیمانی بێت یا انسانی مادام لەبەرخوابێ كارەكەی،وەك بینیمان كاتی ڕودانی زەمین لەرزەی تسونامی وشاری وان..لەهەمولایەكی دنیاوەهاوكاریان كرابەسەرجەم دەنگ وڕەنگەجیاوازەكانەوە جارێكیان(ابن عباس)گوێی لەیەكێ بوو لەخوا دەپاڕایەوەودەیگوت:خوایەپێویستیم بەكەس نەكەیت،( ابن عباس) پێی وت ئەم شێوەلەخواپاڕانەوەت هەڵەیە،تۆسوننەتی بونەوەر بەدرۆ دەخەیتەوە،وەك ئەوەوایەبڵێی خوایەشەونەیەت یان ڕۆژنەبێتەوە،چون پاڕانەوەكەت نابەجێیە كابراوتی لەوەزیاترنازانم، ابن عباس فەرموی :بڵێ خوایە پێویستم بەكەسی خراپ نەبێت، ئەیناكەس بەتەنیاناتوانێ بژی،هەموو پێویستیان بەیەكترە،جالەڕودانی كارەساتدائەوە بە ئاشكرادەبینرێ كەخەڵكی لەهەروڵاتێك بن بەهانای یەكترەوەدەچن وبەخەم برایەتی ئینسانین،وەك لەبومەلەرزەی شاری وان ولافاوی تسونامی بینرا.

---

**ئەم وتارەم دوای بومبەلەرزەكاولكاریەكەی شاری(وان)ی كوردستانی باكورساڵی (٢٠١١ ) لەوتاری هەینی خوێندەوە،وەلەگۆڤاری(شاهۆ)ی ساداتی پیرخدری ژمارە(١٥) بڵاو كراوەیەوە**

# قـەرزوقیسـت..بە پێی پێویست

قەرزوقیسـت لەشـەرعدارێـگەپێدراوە،بەتایبـەت گـەرلەبەرهـەژاری وناچاری بێ خێرەودوومـالآن ئاوەدان دەکاتـەوە،(ابن تيمية لەمجموعتى فتتاوا/ب٢١ل٥٠١) ئەفـەرموێ:پرسیارکرادەربارەی پیاوێ ئەسپێکی کڕیوەبە(١٨٠)درهەم ئەیفرۆشێتەوەبە(٣٠٠) درهەم بۆماوەی سێ مانگ؟ لەوەلآمدافەرموی دروستە وزیانی نیە(فلابأس ببيعةالی اجل)،(ابن باز)یش هەمان وەلآمی بووەلەو پرسیارە چونکە جۆری مامەڵەکەونرخەکەی دیاریکراوە،ئەوەش هاوکاری هـەژارانی تێدایە،دیارەئیـسـلامیش دۆسـتی هەژارەنـەك هەژاری،پێـشەوا علـی فەرمویـەتی: (ئەگەرهەژاری پیاوێك بوایەئەم کوشت ولەناوم ئەبرد)چونکەهەژاری و برسیەتی مرۆ توشی لادان دەکـات وبێبڕوایـی پێوەیـە هەربۆیـە پێغەمبـەری پێـشەوا ﷺ پـەنای بـەخوا گرتووەلەهەژاری وبێبڕوایی پێکەوە(اللهم انی اعوذُبكَ ..من الكفروالفقر..)ئەمەجێگـەی سەرنج وڕامانە خەلکێکیش وادەزانێ کەموسڵمان بوی دەبێ هەژاربێ!..هەنـدێ لـەهاوەلآن دەوڵەمەندبون بەلآم بۆکەمکردنەوەو بەرگری لەهەژاری بەخشیویانەبەهەژاران لـەڕێی خـوا، دیارەجیاوازی ئاستەکان بەپێی جیـاوازی تواناکانە،هەژارودەوڵەمـەندیش هەربوەوهـەردەبێ سوننەتی ژیانە بۆمەبەستی تاقیکردنەوەیانە،گرنگ هاوسـەنگی وپێکەوەژیانە،لەئیـسلامدا هەولـدان بۆدنیاودوارۆژلەیـەك کاتدابەیـەك چاوسـەیرکراوەپێکەوەهەوڵیان بـۆدراوە،وەك لـە فەرمودەداهاتوە(هەوڵ بدەبۆدنیاوابزانەقەت نامری،وەئیش بکەبۆدوارۆژوەك سبەینێ بمری) ئیسلام زۆرهانی داوەبۆکاروهۆکارەکانی بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی دەوڵەمـەند بون،بـەلآم لەگـەلّ ئەوەشداسـەروەت وسـامان تاکـەئامانج ومەبەسـت نیەبەلکوهۆکارەبۆگەیشتن بـە مەبەسـتێکی گـەورە ئـەویش بەختـەوەری دنیاودوارۆژەبـەڕازی بـونی خـوای پـەروەردگار، چونکەلای موسڵمان دنیاکێڵگەی دوارۆژە بۆیەوەك خەلکانێ نالێت (هـی خـۆم بۆخـۆم هـی تۆش دەخۆم!)خوای گـەورە لەقورئانـداماڵ وسـامانی بەخـەیر نـاوبردوە(..ان تـرك خـيراً.. البقرة/١٨٠،چـون بەوماڵەئەگەرڕەحمـەت بێـت دەتـوانی خێربـەخۆت وخـەلکیش بگەیـەنی

ناسوودەیان بکەی بۆیـەماڵی حـەلاڵ خێـری دنیـاودوارۆژە، قەرزوقیـست هاوکاریەبۆهـەژاران وخێرەبۆخـاوەن ماڵەکە،قیـست هەرچـەندە لـە نرخەدیاریکراوەکـەی گرانترەبـەلام.مۆڵـەت و ماوەی تێدایەودەبێت تەنهالـە نێوانی دوولایـەنی کڕیاروفرۆشـیاردابێت ولایـەنی سـێیەمی نەبێت،قەرزیش دەبێ لە کـاتی خۆیدابدرێتـەوەیان قەرزارەکەلـەماوەی دیاریکراوداسـەردانی خاوەن قەرز بکات ومتمانەو وەفاداری خۆی لەدەست نەدات تاکەسایەتی لەکـەدار نـەبێت، بەداخەوەکەهەندێ کەس قەرزکوێرەولەکاتی خۆیدا نایداتەوە یا مامەڵەی پێوەدەکـات! کـە ئەوەش ستەمکردنەوبێ وەفاییەبەرانبـەرخاوەن قـەرز کەچـاکەی لەگەڵداکردوە، پێغەمبـەر ﷺفەرمویەتی ( مطل الغني ظلمٌ)واتەئەوەی هەیەتی ودوای دەخـات ودرەنـگ دەیداتـەوە ستەمی کردووە،لەوحاڵـەداخاوەن قـەرزدەتوانێ سـکالا لـەدادگاتۆماربکات ولەناوخەڵکدا باسی بکات تا بێوەفـایی ئەوکەسـەبزانرێ ونابێتەغەیبەتیش،قەرزوقیـست بۆکـاتی ناچـاری وهەژاریە وتا بکرێ خۆی لێ بەدوربگری چـونکە خـەمی شـەوانەوڕوزەردی ڕۆژانـەوزیان لـە کەسایەتیت دەدات،(د.علی شەریعەتی)وتویەتی:پێم خۆشەلەبازاڕ پێڵاوم لەپێ نـەبێ بـەلام دڵم لای خوابێ،نەك دڵم لای پێڵاوەکانم بێ،(خەتیبی بەغدادی) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێ : کابرایـەکم بینـی ڕۆژی هـەینی زووهاتـە مزگـەوت و سـەرقاڵی بەندایـەتی بویـەلام کـاتێ وتاربێژهاتەسەرمینبەرکابراڕۆیشتەدەرەوەونەگەڕایەوە!دەڵێ دوایی هەواڵم پرسـی ودۆزیـەوە ولێم پرسـی بۆلـەکاتی وتـار ڕۆیـشتی ونەهاتیتەوەوسوننەتەکانت کردوواجبەکـەت نـەکرد؟ کابراوتی قەرزارم کەسـەیرم کرد خاوەن قەرزەکەلام دانیشتووەولەشەرمەزاریدامیزم بەخۆمـدا کردچونکەکاتەکەی تێپەڕیبوتاچوم خۆم شۆردەوە جومعەکەم لەدەست چو! وتار بێژەکەدەڵێ ئەوڕوداوەزۆرکاریگەری کردەسەرم وچومەلای خـاوەن قەرزەکـە وتم کۆیلەیـەك هەیـەڕزگاری بکەوبەسەرهاتەکەم بۆگێرایەوە،ئەمیش دیـارە موسـوڵمانێکی بەشەخـصیەت بوەوچـوبۆلای کابراولەقەرزەکەی خۆش بو هەنـدێ پـارەی تریـشی بۆهێنابوتابیکاتەکـەفارەتی ئەونوێژەی کەبەهۆی قەرزی ئەمەوە فەوتاوە!بەڕاستی دینداری نمونەی کەسایەتی بەرزدروست دەکـات

پێغەمبەرﷺ پرسیاری دەکردلەحاڵی هەرمردویەك بۆنوێژی جەنازە ئەگەر قەرزاربوایە نوێژی لەسەرنەدەکرد تایەکێك قەرزەکەی لەئەستۆدەگرت چونکە قەرزمافی خەڵکە دەیفەرموو:(صلوا علی صاحبکم)جاتکایەخۆت لە قەرزبپارێزە تاشەرمەزاری دنیاودوا رۆژنەبی دەرگای بەهەشتت بۆناکرێتەوەو تەنانەت ئەگەرلەپێناوی خواخوێنت برژی لەهەمو تاوانەکانت دەبورێ جگە لەقەرز!،چاکترین چارەسەرکەدەرمانی دەردانەقەناعەتکردن و لەقەدەر بەرەپێ ڕاکێشانە،چاولەخەڵکی خوارخۆت بکەوبزانەداهات وموچەکەت چەندە؟ وەك وتراوە:ئەوەی بیەوێ سەری نەیەشێ لەقەدەربەرەی پێ ڕادەکێشێ، وەرگرتن بەقەرزو قیست ئاسانەبەلاّم دانەوەی گرانە،بالەجیاتی کاشی خانوەکە گەچکاربێ بالەجیاتی ئەلەمنیۆم دەرگاوپەنجەرەت ئاسن بێ،باکورسیوقەنەفەت نەبێ یان نیوداش ودەستی دووبێ . بەودعەیبدارنابی بەڵکوبەودعەیبداردەبی کەقۆڵی خەڵك ببڕی و پارەکەت پێنە درێتەوە چونکەبۆشتی زۆرپێویست نەبوە ئەوە عەیبەکەدرۆت بێتەسەروخاوەن قەرزتەلەفۆنت بۆبکات وتۆش ناچار تەلفۆن دابخەی وسەرەنجام دوچاری کێشەبیت وکەسێتیت بکەوێتەژێر پرسیار! ئەگەرلەبری ئەوقیست وقەرزەمولك ومالّت نەبووسەیارەبەقیست مەکرە چونکەماڵ نیەولەوانەیەدوای چەندرۆژێ توشی ڕوداوکارەساتی هاتوچۆبیت و خەمی قەرزەکەشت بکەوێتەسەروسەیارەکەشت لەدەست چوو..،سەیارەیەکی لەقەدەرخۆت بکرەبابلێن داشقەی پێیەنەك بلێن قۆڵ بڕەومالّی خواردوین و دوچاری کێشەبیت،بامۆبایلت(٣٠)دۆلاری بێ نەك فول مواصفات و (٥٠٠) دۆلاری بێ بەقەرزوقیست خۆهەربۆقسەکردنە،مۆدیل وچاو لێکەری ماڵی زۆر لەخەڵکی وێرانکردبەتایبەت کە ئافرەتان هانی پیاوەکانیان دەدەن تاقمی کورسیان بەگران پێدەکرن ودوای چەندمانگێ مۆدیلی نامێنێ وبەنیوەقیمەت بەتالاّن دەیفرۆشنەوە!( جۆرج فۆن)دەڵێ :بەوریایی دەمی کیسەباخەڵەکەت بکەوە تادەمی کەمتر بکەیتەوە، نهێنی خێزانەکەت پارێزراوترەوشەخصیەتت بەرزترە، ئەمانە هەموویۆکەم کردنەوەی خەمی هەژاری ونەدارییە کەسەرچاوەی زۆرێك لەتەنگژەوقەیرانەکانە لەپێناو

خۆشگوزەرانی وناسودەیی دەرونە،چونکە دەوڵەمەندی هۆکاری پێشکەوتنە،وتراوەولاَتانی دەوڵەمەندو پێشکەوتوو،بزانە کەدەوڵەمەندی لەگەڵ پێشکەوتندا پێکەوەن،وەهەروەها وتراوە(هەژارودواکەوتوو)،بۆنمونەمیسرخاوەنی شارستانی کۆنی زیاترلە (٢٠٠٠)ساڵەبەلاَم لەریزی ولاَتەهەژارودواکەوتوەکانە،بەلاَم ئوستراڵیاو کەنەدامێژویان ناگاتە(٢٠٠)ساڵ ولەریزی ولاَتەپێشکەوتوەکانن،ولاَتانی ئەمریکاش بەهەمان شێوەکەمێژوی دروست بونیان کەمەبەلاَم پێشکەوتوون بەهۆی دەوڵەمەندیەوە،لەکۆتایدا دوبارەی دەکەمەوەکەبەلاَی قەرزوقیست ئەوەیەکەشت کڕینەکە قەرزوقیستەکەبۆشتی پێویست نەبێ،بۆیەتادەکرێ خۆتان بەدوربگرن لەقەرزو قیست مەگەر بۆناچاری،دەربارەی ئەم سەیارەو ئۆتۆمبێلانەی کەئێستابەقیست ئەفرۆشێ،هەندێکی دروستەوهەندێکی نا دروستە، ئەگەرمامەڵەکە هەر لەنێوان کڕیاروفرۆشیارەکەیش کۆمپانیابێت دروستە،گەربانکەکەکڕی لەکۆمپانیاکە وپاشان فرۆشتیەوەبەهاولاَتی بەقیست بەزیادەدروستە،گەربانکەکەشەریك بوو لەگەڵ کۆمپانیەکە هەردروستە چونکەبەهەردوکیان دەبنەفرۆشیاربەرانبەرکڕیار بەلاَم ئەگەربانکەکە شەریك نەبێت وفرۆشیاریش نەبێت،پارەکەبداتەکۆمپانیاکەوزیادەکەبۆخۆی هەڵبگرێت ئەوەحەرامە وەئەچێتەریزی(کل قرض جرنفعافهو رباً)هەرقەرزێ زیادە ڕاکێشێ ئەبێتەسو.

## پەیامبەر. پێشەواو ڕابەر بۆ هەموو بەشەر

پێغەمبەرﷺپێشەوایەکی گشتیەبۆسەرجەم بوارەکانی ژیان،(مەعصوم)بوە ئیمامی دین ودنیاودوارۆژە،بۆیەخوای گەورەکردویەتی بەپێشەنگ وسەرمەشق وڕابەروفەرمویەتی:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوااللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَوَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾الاحزاب/ ٢١، واتە: بەراستی پێغەمبەری خواﷺچاکترین نمونەی رێکوپێکی وسەرمەشقەبۆتان بە تایبەتی بۆئەوکەسەی بەتەمای خواورۆژی دوایـیەویادی خواش زۆردەکات،،چونکە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت)بۆیە نێردراون تاسەرمەشق وپێشەوایەتی وچاو ساغی خەلکی بکەن،کەوابێ لەسەرهەموونەوانەی کەخۆیان بەشوێنکەوتویان دەزانن پێویستە بەشوێن ئەواندا برۆن وگوێرایەلّیان بکەن،چونکەبانگەشە کردنی خۆشەویستی بەبێ گوێرایەلّیکردن هیچ بەهایەکی نیە،ئەم بەپێشەنگ و دادوەرقبولّ کردنەش لەکاتی کێشەو گرفت دابەجوانی دەردەکەوێت تاچەندێکە،خەلکانێ دەتوانن لەیەك دووبواردا پێشەواوپسپۆڕبن بەلاّم خۆشەویستمان پێشەوایەکی گشتی بوەبۆسەرجەم لایەنەکانی ژیان،امامی میحراب و مەیدان بووە،بۆنمونەوزۆربەکورتی وەك مشتێ لەخەرمانێ:

١)پێشەوای عەدالەت ویەکسانی بووەبەکردەوە:فەرمویەتی(**لافضل لعربی علی عجمی ولاابیض علی اسودالابالتقوی...**)،واتە ڕێزوفەزلّی عەرەب نیە بەسەرخەلکی تری غەیرە عەرەب وفەزلّی سپی نیەبەسەرڕەشدابەتەقوانەبێ خەلکی یەکسانن وەکودانەکانی شانە، بێگومان ئەوەی ئێستادەبینرێ لادانە!

٢)پێشەوای سەربازی بوە:لە(٢٠)جەنگداخودی خۆی لەگەرمەی شەڕدا بەشداری کردووە..

٣)پێشەوای بازرگانان بوە:بەمالّی خەدیجەی دایکمان بازرگانی کردووەوڕەمزی دەستپاکی بوە

٤)پێشەوای شوانەکانیش بووەوشوانی کردوەونەوانیشی بیرنەکردوە تا شوانەکان دلّخۆشەبن بەکارەکەیان ونەلّێن شوانەوێلە..

٥)پێشەوای هەژاروبرسیەکان بوەوژیانی هەژاری هەڵبژاردوە،بەدوومانگ ئاگرلەماڵدیاندا نەکراوەتەوەوبەئاووخورماگوزەراندویانە! لەسەرپارچە حەسیرپالکەوتوەوشوێنی حەسیرەکە لە جەستەی پیرۆزی دەرچوەوکاتێ پێشەوا عومەرپرسیاری لێکردوە،فەرمویەتی:لهم فی الدنیاو لنافی الاخرە،ئایارازی نابی کەئالتون وسامان ورابواردنی دنیابۆدنیاویستان بێت ولە قیامەت بۆئێمە بێت؟

٦)پێشەوای مافی چینی پرۆلیتاروکرێکاران بووە،دەستی زبری ماندوی کرێکاری ماچ کردوەوفەرمویەتی ئەم دەستە خواوپێغەمبەرخۆشەدەوێ!

٧)پێشەوابوەلەبەرجەستەکردنی مافی ئافرەتاندا،کەفەرمویەتی،خیُرکم خیرکم لأهلِه وانا .. پێوەری چاکەی بەوەداناوەکەچاکترینتان ئەوەیەکەبۆماڵ وخێزانی باش بێت و فەرمویەتی: من لەهەموتان باشترم بۆخێزانەکانم،جاێکیان عائیشەی دایکمان وتی ئەمەوێ بۆم بسەلمێنی لەبەرچاوی هەموان کەمنت زیاترخۆش دەوێت،درهەمێکی داپێی وتی دەنگ مەکە،چووهەریەکەی درهەمێکی پێدان وبەیەکتریان نەزانی ورۆژێ هەموویانی کۆکردەوەو عائشە پرسی کامانت زیاتر لەهەموان خۆشتر دەوێ؟فەرموی:ئەوەیان کە درهەمێکم داوەتێ بادەست بەرزبکاتەوە،عائیشەی دایکمان وایزانی هەرخۆیەتی کەسەیری کرد هەمویان دەستیان بەرزکردۆتەوە!

٧) پێشەوابوەلەبەرجەستەکردنی مافی ئاژەڵاندا:ئافرەتێك بەهۆی لەناوبردنی پشیلەیەك دەچێتە دۆزەخ وپیاوێکیش بەئاودانی سەگێك لەگەرمای بیاباندا دەچێتەبەهەشت!..

٨)پێشەوابوەلەسۆزوبەزەییدا،دەیان فەرمودەی فەرمان دەکات بەبەزەیی هاتنەوەوفەرمویەتی: هەرکەس رەحمی نەبێت خواش رەحمی پێناکات،خۆی پێغەمبەری رەحمەتە(انما انارحمة مُهداة)

٩) پێشەوابووەلەسەخاوەت وبەخشین دا(جابر)دەڵێ:هەرکەسێ داوی شتێکی بکردایە

دەستی نەدەنابەڕویەوە،ئەوهەموودەستکەوتەی دەبەخشیەوەوخۆیشی کاتێ وەفاتی کردقەرزار بوو!

١٠) پێشەوابووەلەخۆشەویستیدا وەسەرجەم هاوەڵانی خێزانەکانی وهەرکەس وای هەست دەکرد ئەوی لەهەموان خۆشتردەوێ .

١١) پێشەواوسەرمەشقی وەفاداری بووە،بۆنمونەلەگەڵ خێزانەکانیدابەردەوام باسی چاکەی خەدیجەی کردووەوتەنانەت کاتی فەتحی مەککە لەگەرمەی پێشوازیدابوون ئەوفەرمووی خێوەتێکم لای گۆڕی خەدیجە بۆهەڵبدەن! گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ زۆرێک لە بێوەفایی وکێشەی ژن ومێردی ئەمڕۆدا!

١٢) پێشەواوباوکی هەتیوان بووە،چونکە خۆی بەهەتیوی ژیاوەورێزی هەتیوانی زۆرگرتووە دیارەهەریەک لەم خاڵانەوتاری تایبەتە،کەپێغەمبەرﷺ قورئانێکی زیندووبوو لە سەرزەوی، لەیادی مەولودازیاترگەورەیی باسکرانەوەش قەترەبەدەریایەلە چاووەسفی خوابۆ پێغەمبەرەکەی کەفەرموویەتی﴿وانك لعلى خلَقِ عظيم﴾بەلاّم ئەوەی جێگەی داخەکە بە کردەوەئێمە شوێن کەوتەی نین!بەتایبەت هەندێك سوننەت وکرداری کەئاسانە،ڕۆژێك لە یادێکی مەولوددا لەوتارەکەمدا وتم ئەگەرئەوەندەتان خۆشدەوێ خۆئەوزاتەڕیشی بووە بۆ ڕیشتان نیەولەلۆمەی خەڵك دەترسن!هەندێك لەخەڵکە دنیاییەکەهەندێکیان بەحیساب پێشەوابوون پیان ناخۆش بووکردیانە مقۆمقۆدەیانگوت خۆ ئێمەئیسلامی نین! یان سەرقاڵ بون بەشتی لاوەکی ودورکەوتنەوە لە شتە سەرەکیەکان لەبیرکردنی (گرنگ وگرنگتر) بۆیەلەکۆتایدائەڵێم:

ئەگەر ڕاستەڕێزی ئەوزاتە ئەگرن ..فەرمون لەسەر ڕێبازی ئەوبژین وبمرن

* (لەبلاّوکراوەی(دێنی) کەدەردەکرا لەبیتوێنێ ژمارە/٦ی ساڵی ٢٠١٢دابەزیوە)

# غەفلەت وبێ ئاگایی .. هۆکاری دورلەخوایی

ئاینی پیرۆزی ئیسلام جەختی زۆری کردووەلەسەرهۆشیاری وبێداری(..علی بصیرة) بۆ تێ گەیشتن وپێگەیشتن کەخێری دنیاودوارۆژەبۆیە ئەگەرسەرنجی قورئانی پیرۆزبدەیت دەبینیت لە(١٣٠٠)جاروشەی (تَفَكُّر)هاتوەکەمەبەست لێی بیرکردنەوە وسەرنجدان وتێڕامانە، بە داخەوەکەئێمەئەوگرنگییەی پێنادەین وبەڵکوهەندێ کەس لەجیاتی هۆشکردنەوە خۆیان بێ هۆشدەکەن بەماددە هۆشبەرەکان بەوەش خۆیان دەخەنەریزی ئاژەڵان،بەڵام تەنهاڵەیەك ئایەتدا باسی دەست نوێژهاتووەکەکلیلی عیبادەتە،بۆنمونە:کەباسی دروستکردنی ئاسمانەکان وزەوی دەکات لەکۆتایی ئایەتەکەدافەرمویە(لَآیات لقومِ یَتَفکرون ) واتە ئەوانە بەڵگەو نیشانەن بۆخەڵکانێ کەبیربکەنەوەسەرنج بدەن لەگەورەی خوا،بۆیە حەسەنی بەصری( ڕ.ح) فەرمویەتی(تَفَكرساعَةخَيرُ مِن قِيامِ الليلَة) واتە :ساتێك بیرکردنەوەچاکترە لەشەونوێژی شەوێك،لەکاتێکدا هەمومان دەزانین کەشەونوێژچەندەئەرکی زۆرەبۆیەخێریشی زۆرە بەڵام ساتێ بیرکردنەوە لە وەبەگرنگتردانراوە چونکە بەهۆی بیرکردنەوە ڕێگەی ڕاست ئەدۆزیتەوە وبە خۆتدائەچیتەوەکە لەکوێوەهاتوین وبۆکوێ دەچین ومن چیم ودەبێ چۆن بم و چی بکەم چیم ڕاستە وچیم هەڵەیە؟چونکە مەودای بیرکردنەوە(فەزای أفكار) دونیایەکی فراوانە وسەرەنجام ئەتکاتەکەسێکی (مەبدەئی)وخاوەن هەڵوێست ورزگارت دەکات لەچاولێکردن وبەدواکەوتنی کوێرانە ولەڕۆتین وڕوکەشی وبەندایەتی ئارەزوەکان ،چونکە ئارەزوی نابەجێ بەرەولەناوبردنت دەبات وەك ئەودەنکەگەنمەوایەکەلەسەرفاقەوتەڵەدانرایەوباڵندەکەپەلاماری دەدات وملی پێوەئەبێت وتیائەچێت،شوێن کەوتنی ئارەزوەکانیش بەبێ بیرکردنەوەی ڕاست ودروست کەشەرعەخاوەنەکەی وەك ئەوباڵندەیەدوچاری لەناوبردن و سەربڕین ئەکات،یان دانیشتن وبیرکردنەوەوبەخۆداچونەوەلەسەرقەبران لەپاڵ گۆڕی خۆشەویستێکت بزانە چۆن حاڵ دەگۆڕێت،ئەوانەی بیردەکەنەوەلە لێ پرسینەوەی دوارۆژوناوگۆڕناتوانن دەستیان بخەنەناو ماڵ وناموسوخوێنی خەڵك بەناڕەوا،ئەوانەی کەژیانیان لێکردوین بەژان بەدرۆودوڕوی

گەندەڵی لەوپێڕو تاقمانەن کەبڕوایان بەلێپرسینەوەی دوارۆژنییە بۆیەشەرم ناکەن دەڵێن:هی خۆم بۆخۆم هی تۆش دەخۆم یادەڵێن حازربەقەرزنادەین! دیارەپێچەوانەکەی بیرنەکردنەوەیە غەفڵەت وبێئاگایەکەماڵوێرانی دنیاودوارۆژەچونکەلە دنیا خاوەنەکەی دەخاتەژیانێکی سەرگەردانی و ئاژەلانە لەقیامەتیش لەئاگردا سوتانە،وەك خوای گەورەلەسورەتی (الاعراف /١٧٩)فەرمویەتی:(وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ) واتە: زۆرێکمان لەجنۆکەوئادەمی بۆدۆزەخ بەدیهێنا،چونکە لەئەنجامدابەئارەزوی خۆیان ڕێگای بەدبەختیان گرتەبەر،چونکەئەوانە دڵیان هەیەکەچی هەقی پێ وەرناگرن وتێناگەن لەحەق،وەچاویان هەیەکەچی دەسەلاتی خوای پێ نابینن گوێچکەیان هەیەبەلام پێی نابیستن!واتە:دڵ وچاوگوێیان بووەبەلام بەداخەوە ئەوانە نەبیرنەکەنەوەنەڕاستی ئەبیستن! ئەوانەلە تێنەگەیشتنداوەك ئاژەڵن بەڵکولەئاژەڵیش گومڕاترن،چونکە ئاژەڵ دەگەڕێ لەشوێن وسودوکەڵکی خۆی ولەزەردی خۆی ڕادەکات وتەکلیفیشی لەسەرنیە(أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ) ئەوانەغافڵ وبێئاگان،خراپترین غەفڵەت وبێ ئاگایی غافڵ بوونەلەدین وەك دەبینی خەڵکانێك بەکەیفی خۆیان دینداری دەکەن وموسڵمانی مۆدیلن! لە جل وبەرگ وسەروسیما ,کرداروگوفتاریداپابەندنین،بۆیەنەیارانی دین زۆرترین سودیان لەبێ ئاگایی موسڵمانان بینیوەبۆدورخستنەوەیان لەدینەکەیان بۆهۆی غافڵ بونیانەوەچەواشەبون،وەك چۆن دزلەتاریکی شەوداولەبێ ئاگایی خاوەن ماڵداکاری خۆی دەکات ئەمانەش بەهەمان شێوەبۆنمونە دەڵێن:{دین مافی ئافرەتی نەداوە،مافی کرێکاروجوتیاری نەداوەتوندو تیژیە دین جیایە لەدەوڵەت دین دواکەوتنەودینی عەرەبە...ئەمانەودەیان تۆمەتی تردەدەنەپاڵ ئیسلام}کە پێچەوانەکەیان ڕاستە،غەفڵەت وبێئاگایی من وتۆوەکوتاك زیاترزیانی بۆ خۆمان هەیە،غافڵ بوونی دایك وباوك زیانی بۆخێزانەکەیان هەیەوسەرگەردان دەبن، بە غافڵ بونی شوان مەڕەکانی پەرتەوازەدەبن وگەرگ دەیان خوات،غافڵ بوونی سەیرانکەر

لەکێڵگەی مین وخنکانی ناوئاوسەیران دەکاتە قەیران،غافڵ بوونی شۆفێرەکان کارەساتی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوەبۆسەرنشینەکانی،غافڵ بوونی میدیاکان وچەواشەکاریان سەر گەردانی وئاڵۆزی لێ دەکەوێتەوە،غافڵ بوونی کاربەدەستان بەهۆی ڕاپۆرت وچەپڵەی درۆینەوماستاوچییانی دەوروبەر وهەڵبژاردنی تەزویرستەم ولەخۆبایی بوونی لێ دەکەوێتەوەخوای گەورەش غافڵ نییەلەوەی کەستەمکاران دەیکەن وماوەیەك مۆڵەتیان دەدات پاشان بە توندی دەیانگرێت وەك ئەودیکتاتۆرانەی کەلە شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبیدا کەوتن فەرمویەتی:﴿ولاتحسبن الله غافلا عمایعمل الظالمون﴾بۆیەدەبێ سەرانی خۆشمان غافڵ نەبن لەدەسکەوتەکانی ڕاپەڕین وبزانن کەئەم خەڵکە ساڵی (١٩٩١)بۆ ڕاپەڕی؟ بۆدەرپەڕی؟ بۆهەڵپەڕی؟کەواتەکاربەدەستان ئاگادارین لەستەم وگەندەڵی وبەفیڕۆ دانی سامانی وڵات،وامەزانن دنیاهەرواڕۆشن دەبێ وڕێگاهەرئاواپان دەبێ،خوا بێ ئاگانیە لەوەی کەدەیکەن بەڵکودوای دەخات بۆ ڕۆژێکی دیاریکراوکەڕۆژی قیامەتەجگەلەهەندێ سزاوخەجاڵەتی دونیا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: {السعیدمن ابتعظ بغیره} واتە: بەختەوەرکەسێکە پەندوئامۆژگاری لەکەسانی تروەردەگرێت،ئێستا سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنە لۆژیابەلاّم بەختەوەری وئارامی دەرون کەمەچون بۆدنیابەئاگان بەلاّم لەخودا ودینیان بێئاگان وتراویشە(ئەوەی لەخواغافڵە کافرە)بەڕاستی غەفڵەت وبێ ئاگایی ..هۆکاری دوور لەخوایی سەرگەردانیەلەدوایی،چارەسەریش:بێداری وهوشیاری وبەئاگابونە لەم چەندو چونە بەخویندنەوەوتێگەیشتن لەم دینە، خۆ ئەگەرهەر بەئاگانەهاتنەوە هۆشیاروبێدار نەبوونەوە ئەوەلەدونیاداسەرگەردان دەبن ولەدواڕۆژیش سەرەنجام ئاگری دۆزەخە،وەك لەسەرەتای ئایەتەکە ئامارەمان پێدا،شاعرلەمانای ئایەت وبەزمانی دۆزەخ دەڵێ:

دۆزەخ بانگ دەکات خەڵکم بۆبێنن..ئەوانەی ئەمری خوائەشکێنن

تالەناوئاگربیان سوتێنم .. فەرمانی خوایە وبەجێی دەهێنم

خوشك وبرایان دورین لەتاوان..مەبنەقوربانی سەروەت وسامان.

# نەورۆزی کوردان بۆتەجێی گومان!

مێژووی نەورۆز زۆرکۆنەودەماودەم هاتووە،تەنانەت لەدوای ئیسلامیش جگە لە(عومەری کوڕی عبدالعزیز)هەندێ لەخەلیفەکانی ئەمەویش ئەو یادەیان گێڕاوە،بەڵام کۆنی نابێتە بەڵگەبەڵکوڕاستی وڕەوایی مەرجە،چونکەمێژووی بت پەرستی زۆرلەوەکۆنترەو نابەجێشە، بناغەی ئەم نەورۆزەدەگەڕێتەوەبۆسەر دەمی فیرعەونەکانی میسر(٤٧٠٠)ساڵ پێش زاین، پێش دامەزراندنی دەوڵەتی مادد،سەرەتا(شن النسیم)یان پێ وتوە،پاشان گوازراوەتەوە بۆ جولەکەودواتربۆ فارسەکان،(نەورۆز)وشەیەکی فارسیەواتەڕۆژی نوێ بەوڕۆژەوتراوەکە (جەمشید)ی پاشای فارسەکان هاتەسەرتەخت وناونراڕۆژێکی نوێ ودوایی جەمشید بە دەستی زوحاك کوژراوهیچیشیان کوردنەبون،داستانی کاوەو زوحاکیش ئەفسانەیەودورە لەڕاستیەوە،گریمان ئەگەرشتێکیش لەوبارەوەبوبێ ئەوەسەرکەوتنی(کۆرش)ی فارسیەبەسەر (ئیستاگ)ی کۆتاپاشای میدیەکاندا، لەتەفسیری(ابن کپیر:١/٢٥٨)،وشێخ ئالوسی لە تەفسیری(روح المعان،١٦/ /٤٦١) هاتوە:کاوەی ئەصفەهانی پیاوچاك بووەوسەرلەشکری (ذوالقرنین) بووە!کەواتەفارس بوە،بۆیەناکرێت نەورۆزبەجەژنی نەتەوەی کورد دابنرێ بەلای هەندێکەوەلەسەری ساڵی سۆمەریەوەوەرگیراوە،دواتریش کرا بەیادو بۆنەی گەلانی ڕۆژهەلات ئەوەبوونەتەوەیەکگرتوەکانیش ساڵی (٢٠١٠) ئەوەی ڕاگەیاندووهەرئەوساڵەش (ئۆباما)ی سەرۆکی ئەمەریکا پیرۆزبای ئاڕاستەی گەلی فارس کردبەوبۆنەوە، هەرچەندە ئێمە دڵسۆزی ئەمریکابوین و ئیرانیش نەیاری بوو بەلام ئۆباماحیسابی بۆئێمە نەکرد، لەکاتێکدا ئێمەچەندین ساڵەلەزمانی(حەسەن زیرەکەوە)دەڵێین:ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزەهاتەوە جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی بەهاتەوە!کەلەبنەماداپەیوەندی بەکوردو ئیسلامەوەنیە،ئێمەش وەك چاولێکەری کوێرانەلەبەرخاتری خاتران کردمان بەسەری ساڵی خۆمان!گەرقەناعەتیش ناکەی بڕۆلە ناوفارسەکان بڵێ نەورۆز جەژنی کوردەبزانەچۆن خۆت دەبینیەوە،بەڕاستی چەواشەکردنی مێژوە،کەئێمەخۆمان بە(میدیاوکەیخوسرەو)ببەستینەوە

مێژووی شارستانی هەزاران ساڵەی باپیرانی خۆمان لەیادبکەین کەلەپێش لۆلۆیەکا وگۆتیەکان ومادده کانەوەهەرکوردبوین وهەرکورددەبین،خوابەکوردی دروستی کردوین نیعمەتی خوایە،جگەلەوانەش خۆشوبهاندنەبەبێبڕوایان کە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) فەرموویەتی(مَن تشبَّه بقَوم فهومِنهم)(رواه ابو داود) واتە:هەرکەسێك خۆی بە قەومێك بچوێنێ ئەوانەوکەسەلەوانە،چاولێکەری دەردێکی کوشندەی کۆمەڵ گای کوردەوارییانە! بەتایبەت مێژووی ڕەسەن و پەسەنی هەزارساڵەی موسڵمانەتیمان کەدوورەلەگومڕایی و لادان،چونکە پەیامەکەجیهانیەوبۆ هەموانەکەلەگاوانی کوردیەوە(جابان)پەڕەیەکی تازەی مێژوی کوردی موسڵمانی هەڵدایەوە، نەورۆزوەك مەشخەڵێکی شۆڕشی نەتەوەی بەکار هێنراوە بۆئامانجی دیاریکراودوای سەرکەوتنی شۆڕشەکان وەدوای دەرکەوتنی ڕاستیە مێژوییەکان ئەم جۆرەبۆنانەکاڵ بونەوەوبون بەڕوکەش،سەرەڕای پشتگیری وپڕوپاگەندەی بەهێزی میدیاکانیش چونکە بنەمای زانستی ومێژوییان جێگەی گومانە، تاگەیشتە ئەوەی ساڵی(٢٠٠٠) هەیکەلی کاوەی ئاسنگەرکەهێمای ئازایەتی وبەرخۆدان بوولەسلیمانی لابرا کەمەترێك لەفلکەی گرتبو،ئێستاش ئەوەی کە ماوە نەورۆزکراوە بەسەرەتاوهێمای بەهار.. چونەدەرەوەلەشار..بۆسەیران وگەشت وگوزار.. بۆ ڕەشبەڵەك وشایی ناڵەبار..بۆپۆشینی بەرگی کوردی وەك پاروپێرار.سەبارەت بەئاگریش لەکۆندا بەپیرۆزوهێمای ڕوناکی و سەرکەوتن دانراوە،بەتایبەت لەمێژوی فارسەئاگرپەرستەکانی کۆندا،لەئێستاداداگیرساندنی مۆمە،بەڵام خەڵکی ئێمەبەونیەت ومەبەستەنەیکردۆتەوە بەڵکویەلایانەوە هێمای سەرکەوتن و نیشانەی بەهاربوە،بەهیوای بەهاری خۆشی وشادی بۆهەرچوارپارچەی کوردستان بەئازادی .

# توندوتیژی..هۆکاروچارەسەر

خوای بەدیهێنەری مرۆڤەکانی جۆرێك دروستکردووەکەلەهەموویاندا توانای خێروشەڕ توندوتیژی ونەرمونیانی خۆشەویستی پێداون بەرێژەی جیاوازبۆرێکخستنی تواناکانیان رێنمونی کردون چون ئەگەرتواناکانیان رێك نەخرێن ئەوادەرهاویشتەی خراپی لێ دەکەوێتەوەکەیەکێ لەوانە توندوتیژیە توندوتیژی(العُنف)پێناسەی تایبەت هەڵناگرێ و لەهەرشوێنەبەجۆرێکە!.

**هۆکارەکانی توندوتیژی** :پێش ئەوەی چارەسەریدۆزیتەوەئەبێ میتۆدوسەرچاوەکەی بزانی کەزیاتر بریتین لەهۆکاری(ئابوری وکۆمەلایەتی وسیاسی وفیکری) کەدەبنە هۆکاری توندوتیژی لەنێوان خێزانەکان وپاشان کۆمەڵگا،توندوتیژی لەشوێنی خۆیدا گونجاوەوەك لەجێبەجێکردنی یاساکاندا (تنفیذالاحکام)یان لەمەیدانی روبەروبونەوەداکە لەگۆرەپانی جەنگدایە، بەلام لەسەرجەم کایەکانی ژیاندا عەدالەت وچاکەکاری چاکترین چارە سەرە،کەفەرمانی خواوپێغەمبەرە،(ان اللەیامربالعدل والاحسان) ئەوەتادەیان ئایەتو فەرمودەداهانی موسڵمانان دەدات بۆنەرم ونیانی ولەسەرخۆبون وتەسامح ولێبوردن، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:(اِنَ الرِفقَ لایَکونُ فی شَیِ الازانَهُ ولایُنزَعُ مِن شَیِ الاشانَهُ)رواه مسلم (واتە:نەرمونیانی لەهەرشتێکدا بێت جوانی دەکات،وەلەهەرشتێ دەرهێنرانا شیرینی دەکات)لەفەرمودەداکەپێشەوابخاری گێراویەتیەوە ابوهریرەخ،فەرموی: پیاوێك لەمزگەوتدا میزیکرد، خەلکەکە خەریك بو ئازاری بدەن ودەری بکەن،پێغەمبەرﷺپێی فەرمون:وازیلێبێنن وبرۆن دۆلکەیەك ئاوبێنن وشوێنەکەی پاك بکەنەوە ....،فاِنمابُعثتُم مُیَسَرین ولم تُبعَثوامُعَسرین،واتەئێمە بۆنەوەرەوانەکراوین کارئاسانی بکەین نەك شت لەخەڵك قورس بکەین،) هەڵەبەهەڵە چارەسەرنابێ دیارەپێچەوانەی نەرمو نیانی تورە بونەکەسەرچاوەوهۆکاری توندوتیژیەولەئیسلامدابەتوندی رێگری لێکراوە،ابوهریرە بۆمان دەگێرێتەوەکابرایەك وتی:بەپێغەمبەرﷺ (اوصنی)..، واتە،ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەر ﷺلاتغضب ، تورەمەبە، پیاوەکەچەند جارێك هەمان پرسیاری دووبارەکردەوە هەر فەرمووی (لاتغضب)واتە:تورە مەبە(بخاری)،چەندجاردووپاتکردنەوەی ئەم ئامۆژگاریە بێ حیکمەت نەبووە وجێگەی سەرنجەلپیاوەکەدەڵێ دوایی بیرمکردەوە لەووەسیەتەی

پێغەمبەر ﷺ چونکەتوڕەبوون هۆکاروکۆکەرەوەی هەموو خراپە یەکە، لەفەرمودەیەك داهاتووەك پێشەواکەمان فەرموویەتی:( توڕە مەبەو بەهەشت بۆتۆیە.. ولك الجنة) چونکەهەرچی لەکاتی توڕەبوندا بکرێ کاری شێتانەیەوکۆتایشی پەشیمانیەو پەشیمانیش سودی نیەوخەجاڵەتی دنیاودوارۆژە؟کەتوڕەبوو جوێن ئەدات ستەم و خراپە دەکات تاهەندێ جار دەکوژێ ودەبڕێ، بکەری هەرکام لەمانەماڵ وێرانەو پەشیمانە، بەتایبەت لە کێشەکۆمەڵایەتیەکاندا یەکسەرسێ بەسێ تەلاق ئەخوات وپاشان دەبینێ ماڵی وێران بووە منالی دەربەدەربووەلەناوخەڵکداعەیبداربووە، .هتد، جا ئەگەربیر بکاتەوەلەئەنجامەکانی هەرگیزتوڕەبونەکەی جێبە بەجێ ناکاتودان بەخۆیدا دەگرێ وسەرەڕای ئەمانەش توڕەبون کاریگەری زۆرخراپی هەیەلەسەر تەندروستی لاشەودەبێتەهۆی بەرز بونەوەی پەستانی خوێن، زیادبونی لێدانی دڵ، تەنگە نەفەسی ، بەرزبونەوەی شەکرەوهەنێ جارجەڵتەی دڵ، پەنابەخوا لەشەیتان ولەمەترسی و زیانەکانی توڕەبون کەتوندوتیژیە.

**جۆرەکانی توندوتیژی :**

١ـ(عنف أسری) توندوتیژی خێزانی،ئەوەکاتێ دروست دەبێ کەپێکهێنانی خێزانەکە لەسەرەتاوەلەسەربنەماکانی خێزان دروستنەکراوەوتەنهاڕوکەش و سۆزوعاتیفەیەك بوەیان بەکەلتورێکی لاروخواری کۆمەڵایەتی بەیەکگەیشتون سەرەنجام ئەورێزوخۆشە ویستیە (**سکونەت ومودەورحمە**)کەپێویستەبەرجەستە نابێت،لەفەرمودەدا، پێغەمبەر (ﷺ) پێوەری چاکەی بەوە داناوەکە لەگەڵ ئافرەتانداباش بن فەرموویەتی:( **خیرکم خیرکم لاهله وانا خیرکم لاهلی**).

٢ـ (العنف السیاسی)توندوتیژی سیاسی،کەزۆرترین کێشەی بەدواوەیە.

٣ـ (العنف الجسدی)توندوتیژی جەستەیی،لەڕوی جەستەییەوەئازاردەدرێ لێی دەدرێ وماندودەکرێ ململانێ نابەجێ دەکەن،کەزیاتربەهۆی لەیەکتر نەگەیشتنە، لەئیسلامدا ڕێگری لێکراوەوسزای هاوشێوەی خۆی بۆدانراوە (..من اعتدی علیکُم فاعتدواعلیهِ بِمثل مااعتدی علیکم).

٤ـ (العنف المعنوى)توندوتیژی وئازاردانی ڕۆحی بەفشاری دەرونی،وەك لێ سەندنەوەی دەسەلآت وپەراوێز خستنی ووەلآم نەدانەوەوبەکەم سەیرکردن، چارەسەرلەئیسلامدا خوا قەدەغەی کردووەناوناتۆرەویەکترناشیرین کردن،(ولاتلمزواانفسکمولاتنابزوابالالقاب..،الحجرات

٥ـ(العنف الجنسی)توندوتیژی سێکسی،وەك اغتصاب دەستدرێژی سێکسی ولادانی سێکسی مامەڵەی نادروست بەئافرەتانەوە،چارەسەری ئیسلام بۆئەوە زیناونێربازی وحەرام کردووەسزای بۆداناوە لەپێناو پاراستنی حەیاوحورمەت.

٦ـ(العنف الاقتصادی)توندوتیژی ئابوری،وەك ئەوانەی ئافرەتان ناچاردەکەن بژێوی پەیدابکەن،کاری ماڵەوەودەرەوەیان پێدەکەن،یان میراتی نادەنێ یان ئاڵتونەکەی پێ دەفرۆشن،ئیسلام چارەسەری بۆداناوە نەفەقەبەخێوکردن لەسەرپیاوە،هەرچەندەئافرەتیش ڕێگەی لێنەگیراوەوە.

چارەسەر: یەکەم/پابەندبونەبەڕەوشتەجوانەکانی ئیسلام: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی (ماکرم النساءالاکریم وماهانهن الالئیم)(مسلم)واتە: ئەوەی ڕێزیان دەگرێ چاك وبەڕێزن،وەگێل ونەفامەکانن ڕێزیان ناگرن وبەکەمیان دەزانن، وەهەروەهافەرمویەتی ( لَيْسَ الشَّدِيدُبِالصُّرَعَةِإِنَّمَاالشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَالْغَضَبِ) (متفق علیه) ئەوکەسە ئازانیەکەپاڵەوانی چاکە وکەس لەزۆرانبازیدادەرەقەتی نایەت بەڵکوئازانەوکەسەیە لەکاتی توڕە بیداخۆی دەگرێ ورقی خۆی دەخواتەوە (ئازاکەسێکەلەکاتی بەڵلا ... خۆی بۆبگیرێ ونەیکابەهەڵلا .

دووەم/زوویەدەم کێشەکانەوەبچین وهەوڵی چارەسەرکردنیان بدەین و بەخەم یەك ترەوەبین،وەك پێغەمبەرﷺرۆژێ کەچووبۆماڵی فاتیمەی کچی وپرسی علی لەکوێیە؟ فاتیمەفەرمووی: دەمەبۆڵەیەکمان بووڕۆیشت بۆدەرەوەکەبینی والەمزگەوت پاڵکەوتوە ولایەکی عەباکەی خۆڵاوی بووە، پێغەمبەرﷺپێی فەرموتقم یاابا تراب . .بردیەوە ماڵەوەبۆلای فاتیمەی خێزانی بێگومان سۆزوبەزەیی ونەرم ونیانی(صبر)ڕەوشتی بڕوا دارانی ڕاستەقینەیەو دان بەخۆداگرتنی پێویستەودەبێ باجەکەی بدەی وەك وتراوە (سەبرتاڵەو بەری شیرینە)جاری وایەخەڵکانی بێباروبێوەفالەبەرانبەردابۆمەبەستی خراپ

ئەوهەڵوێستەدەقۆزنەوەئەوەش تاقیکردنەوەیە،وتراوە : ڕەسەن ڕێزت گرت شەرمەزاردەبێ بەڵام ناڕەسەن تابێ هاردەبێ (چینیەکان)وتویانە: ئەوەی بەنەرمونیانی هەنگاو بنێت، زۆردەڕوات،باپیرانی ئێمەش جوانیان وتوە:

بەتوندوتیژی کارناچێتەسەر ...ماربەقسەی خۆش لەکون دێتەدەر

**هۆکارەکانی توندوتیژی تایبەت بەمنداڵان:**

١)دوورکەوتنەوەلەمەنهەج وبەرنامەی ئیسلام،

٢)کاریگەری سلبی میدیاکان،

٣) هاوڕێی خراپ،بەتایبەت لەشوێنی کار

٤)نەبونی سۆزوبەزەیی، بەتایبەت لەکاتی جبابونەوەی دایك وباوك ئەو کات دەکەوێتە لای کەسێ کە هەرگیزجێگەی دایك وباوکی ناگرێتەوە،مامەڵەی سلبی ماڵەوە، بە تایبەت کەئێمەی کوردپەروەردەی توندوتیژ بوەتەبەشێکی کەلتورەکەمان،جاتەودایکەی منالەکەی بەکەوچکی چاداخ دەکات یان بەهەڕەشەئەیترسێنێ هەڵەیە،پەروەردەی خراپ تەنها زیان لەخێزان نادات بەڵکوکۆمەڵگاش زیانی لێدەکەوێ وکاریگەری خراپی دەبێ بۆی چونکە ئەندامێکی لە دەست داوە،بۆیەئیسلام زۆرگرنگی داوە بەخێزان کە بەردی بناغەی کۆمەڵگایە،ڕێکخراوەکانی منداڵان تائێستاش نەیان توانیوەچارەسەری کێشەکانی منداڵان بکەن،چونکە پاشکۆی حیزبن کێ بەرپرسیارەلەمنداڵانی دەست گێڕوسواڵ کەری سەر شەقام(منداڵانی کاروکۆڵان)؟وەلەومناڵانەی کەلەخوێندن دا بڕاون؟ ئەو منداڵانەی کەخاوەن پێداویستی تایبەتن؟منداڵانی بێنازی یەتیم وپاشماوەی شەڕی ناوخۆ؟تاکەی بێدەنگی؟بۆچی کەس ئامادەنییەئەوبەرپرسیاریەتیەبەکردەیی بگرێتە ئەستۆ؟ڕێکخراوەکانی مناڵان دەزگاکانی حکومەت،نەیارانیش دانیان ناوە کە ئیسلام لەمامەڵەی ڕۆژانەنەرمونیانە(جۆن ئیسپۆزیتۆ)لەزانکۆی جۆرج واشنتۆن وتویەتی: ئیسلام ئاینی میهرەبانی وپێکەوەژیانە ودورەلەتوندوتیژی

نەرم ونیانی لەتوندوتیژی ورقەبەرایەتی بەهێزترە(خۆروبا)ناکۆکی کەوتەنێوانیان لەسەر ئەوەی کامیان بەهێزترە!ڕەشەبای توندوتیژوتی :ئێستابۆتی دەسەلمێنم کەمن بەهێزترم سەیری ئەو پیاوەبکەبزانەچۆن چاکەتەکەی پێ فرێدەدەم،هەلّی کردبەتۆزوباو گەردەلول بەلاّم تابەهێزتری دەکردپیاوەکەش چاکەتەکەی تونتردەگرت بەخۆیەوە..،سەرەنجام ڕەشەبای توندو تیژشکستی هێناوکپ بوو،ئەمجارەیان خۆرەتاو لەپشتی هەورەوە دەرکەوت وگەرمای کرد، هێدی هێدی پیاوەکەئارەقی نێوچاوانی دەسڕی وناچارچاکەتەکەی داکەندلەکۆتایدا ئەلّێم: کەدین ئەمازین نامێنیٚ،ئەوەتابەردەوام هەوالّی ناخۆش وستەمە،کەئیمان ئەمائەمن و ئەمان نامێنیٚ، وەك دەبینی هەموی هاواریەتی لەدەست ستەمویٚ دادی،جاران پیاو ستەمی لەئافرەت دەکرد،ئێستائافرەت ستەم لە خۆی دەکات،وەك لەڕیکلام وتیڤیەکاندا دەبینی بونەتەهۆکاری فتنە!.

---

*(وتاری تایبەت بە هەفتەی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژبە ئافرەتان کۆتایی مانگی یانزە)،٢٥/١١ی هەموسالّیٚ.

# کوشتن وبڕین بوه بەسەرباسی ژین!

الحمدُلله..حمداًكثيراًكماامَر،والصَلاةوالَسلامُ على حبيبنامحمدِسيدالبشر،وعلى الهِ اصحابهِ ما اتصلت بهِ عين بِنَظرواُذنُ بِخَبَر..وسلم تسليماًكثيراً.

امابعد: اصيكم ايهاالناس ونفسى قبلَكم بتقوى اللهِ،فانَ تقواهُ اَربَحُ تجارةوبضاعة،واحذروا مَعصيَتَهُ قدخابَ عبدُفَرطَ فى اَمرِرَبهِ واَضاعة،وعليكُم بماكانَ عَليهِ السَلفُ الصالحُ والجَماعَة فخُذوابِهَديهم وماكانواعليهِ فى الُمعتَقَدِ والعملِ والطاعَة، قال تعالى: وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا.

ئەنیشانەکانی ئاخیرزەمان کەئاگاداری کردوین پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کوشتن و ئەناوبردنی مرۆڤەکان،(لاتقوم الساعة حتى ويكثرُ الهرج،قيل ومالهرج يارسول الله؟قال: القَتلُ)واتە:قیامەت نایەتازۆربونی کوشتن پەیدا دەبێ، بەجۆرێك بكوژنازانێ بۆكوشتی؟ و كوژراویش نازانێ لەسەرچی وبۆكوژراوە؟(لايدرى القاتل فيم قَتَل ولاالمقتول فِمَ قُتِل..) (مسلم)،وەك لەم ڕۆژگارەدەبینی لە سایەی دروشمەکانی بەناومافی مرۆڤ كوشتن ئەوەندە زۆربوەکەمرۆڤ نرخی زۆر کەم بوەوڕوباری خوێن دەڕوا!لەجەنگی جیهانی یەکەمدا(١٥) ملیۆن ولەهی دووەمدا(٥٥)ملیۆن مرۆڤ نەك مریشك كوژران! لەجەنگی ڤێتنام(٣)ملیۆن ئەشەرەکانی ناخۆی ڕوسیا(١٠)ملیۆن ولەشەڕی عیراق ئێران یەك ملیۆن کەس بەبەلاش كوژران،ئەوەجگەلەکوژرانی موسلمانانی جیهان بەتایبەت لە عێراق وئەفغانستان و فەلەستین وشەڕوتەقینەوەی بەردەوام لەسایەی پلان و پیلانی ولاتانی ئەوروپاوڕۆژئاوابەناوی تیرۆردنیایەك ژنومنال وپیرەپیاوخەلكی بێ تاوان كوژران،ئێمەی کوردیش زۆربەی یادو یادەوەریەکانمان کوژرانە خوێن ڕژانە،کاتێ یادی ڕاپەڕین کیمیابارانی هەلەبجە بەناوئەنفال گۆڕەبە کۆمەلەکان شەڕی ناوخۆو خۆپیشاندان ...،یاشەڕوئاژاوەی ولاتان یاخۆ کوشتن و خۆسوتاندن سەرەڕای پێشکەوتنی ماددی ودروشمەکانی بەناو ئازادی دیموکراسی ومافی مرۆڤ..،هەرزانترین شت لەئێستاداخوێنە لەبەردەوام کوشتن و بڕینەچونکە دورکەوتونەوە

لەبنەماکانی ئەم دینە،لاحول ولاقوە الا باللە، یەکەم کەس کوشتنی ئەنجامدا(قابیل)بو کە هابیلی برای کوشتلبۆیەتادنیا دنیایەهەرقەتلێ بکرێ بەشی ئەوی تێدایە،لەکاتێکدامرۆڤ دەستکردو دروستکراوی خوایە زۆربەرێزەوهەرکەس تێکی بدات بەناهەق لەعنەتی لێ کراوە،ئەگەرچەندین کەس بەکردەیی بەشدارین لەکوشتنی کەسێك بە ناحەق ئەوەلەتۆڵەیدا هەمویان دەکوژرێنەوەنەك بەندکردن وپاشان ئازادبون ، وەك لەسەردەمی پێشەواعمرلە مەدینەبە(١٠)کەس یەکێکیان کوشتبوهەمویانی کوشتەوەو فەرموی‌ئەگەرهەموو خەڵکی مەدینە بەشداربونایەئەواهەمویانم لە تۆڵەیدادەکوشتەوە،چونکەبەلەناوبردنی بکوژ(قاتل) ژیانی خەڵك ئاسودەو بەختەوەردەبێت،ئەوەیەرێزومافی مرۆڤ نەك دروشمی بێ ناوەرۆك، بۆیەکوشتن لەریزی تاوانە گەورەکانە(الکبائر)، ئامانج ومەبەستی شەریعەتیی ئیسلامیش بۆ پاراستنی پێنج شتە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤەکانە،کەزەوی بەم پێنجەئاوەدانە کەبریتین لەمانە(ئەقڵ ودین ومالّ ووەچەی مرۆڤ ولاشەی مرۆڤ )بەنەمانی هەر کام لەمانە ژیان ژانەسەرئێشانە،جابۆپاراستنی (عەقڵ)هەمووسەرخۆشکەرێکی حەرام کردووەوسزای دار لێدانی بۆ داناوە،بۆ پاراستنی( دین) جیهادی داناوە، بۆ پاراستنی(ماڵ وسامان) هەموو مامەڵەیەکی نادروستی وەك(غەش وخیانەت و درۆو دەست بەسەراگرتنی)حەرام کردووە،بۆ پاراستنی (وەچەی مرۆڤ) زیناو داوێن پیسی حەرام کردووە(حەددو رەجمی)بۆداناوە،بۆ پاراستنی(گیانی مرۆڤ) کوشتنی ناهەقی حەرام کردووە(قصاص)تۆڵەی بۆداناوە،ئەگەرقاتل کوژرایەوە ئەوکات خەڵك ئەژی دەحەسێتەوە،بەلاّم ئێستا بەیاسا بریاری کوشتن لادراوە لەسەربکوژلبۆئەوەی ولاّتانی ئەوروپا ورۆژئاوا لێیان رازی بن وبلێن ئەوانە دیموکراسین، کە بەوەش کوشتن زیاددەبێت،چونکە بکوژدلنیایەکەناکوژرێتەوە دیارەهۆکاری کوشتنیش جۆراوجۆرەوەك هۆکاری(دەرونی وبێ ئومێدی لە ژیان ونەبونی یاسافاکتەری سەرەکین بۆ کوژرانی تاکەکان وەپاوانخوازی و سیاسەتی درۆینەوستەم کارانە هۆکاری لەناوبردنی گەلانە بانەوانەی ئاگری جەنگیان هەڵگیرساندو ئەوانەی خوێنی بێ تاوانەکانیان رشت وجەستەی

منالّ و نافرەتانیان پارچەپارچە کردو، هەڕەشەی پەروەردگاری زەوی وئاسمانەکان ببیستن لەونایەتەی کەواخوای گەورەلە سورەتی (نساء)داباسی کردوەوە{وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا} واتە: هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن ئیمان بکوژێ سزاوتۆڵەی ئەوەچوارشتی زۆرقورسوگرانە،

**یەکەم:** لەدۆزەخ دابە هەتاهەتای تیایدا دەمێنێتەوە،

**دووەم:** غەزەب وتوڕەیی خوای لەسەرە،

**سێیەم:** (لەعنەت)نەفرینی لێکردووە،

**چوارەم:** سزایەکی گەورەوقورسیشی بۆئامادەکردوە،ئایالەهەموقورئاندا لەسەرەتای سورەتی (فاتحە)تاکوکۆتای سورەتی(الناس) هەرەشەیەکی ترهەیە لەم هەرەشەیە گەورە تربێت؟ نەخێر،ئاواتە خوازبوم کەبەبەرزترین دەنگم هاوارم بکردایەبۆئەوەی هەموسەرۆك وسەرکردەکانی جیهان تابیان بیستایەئەوانەی کەئێستاخوێن دەڕێژن بەناوی ئازادی ودیموکراسیەوە لەلای ئەوانەخوێن بووەتەهەرزانترین شت لەبونەوەردا،سەرە ڕای هەموونەوانە دینەکەشمان تۆمەتباردەکرێت...ئیسلامەکەمان تۆمەتبار دەکەن کەوادینی خوێن ڕشتنەودینی تونڕەوی وتۆقاندنە..! یان پێغەمبەرە هەڵبژێردراووبەبەزەیەکەمانﷺ تۆمەتباردەکرێت بەتۆقاندن وتوندوتیژی! ودەڵێن دینەکەی بلاّوکردووەتەوەبەزەبری شمشێر! وچەندین پڕپاگەندەی بەتاڵ و ناڕەوا،کەپێغەمبەری ئاشتیﷺتۆمەتباردەکەن بەتۆقاندن وترساندن!...، لەکاتێکدائەو پێغەمبەریڕەحمەتەﷺ بەڕاستی ئایەتەکە هەڕەشەیەکی ترسناکەلەکتێبەکەی خوای گەورە بۆئەوانەی دەستیان سورەبەخوێنی ناڕەواپێغەمبەری میهرەبانی ﷺهاتوەبۆئامرۆڤایەتی دڵنیابکاتەوەوجەخت بکات لەسەرئەم مافانە: مافی ژیانەوە هات بۆئەوەی حورمەتی خوێن ڕون بکاتەوەوفەرمویەتی:(لن يزال المؤمن في فسحةٍ من دينه،مالم يصب دماحراما) (بخاري ومسلم)واتەکەسی ئیمانداربەردەوام والەنێو فراوانی دینەکەیدا، تاوەکو خوێنێکی قەدەغەکراونەڕێژێ،دینەکەی پاکەتانەوکاتەی کەسێ بەناحەق دەکوژێ، پێغەمبەری خواﷺ

فەرموویەتی:(قتل المؤمن أعظم عندالله من زوال الدنیا)واتە:کوشتنی ئیماندارێك لای خواگەورەترە لەڕوخان ونەمانی دونیا، تەماشای حورمەتی خوێن بکەلەدینی خوادابۆهەمو مرۆڤێك،بەڵێ لەم ڕۆژگارەدازۆربەی ئەو بکوژانە نازانن بۆدەکوژن؟، زۆربەی کوژراوەکان نازانن بۆکوژران؟ئەی ئەوانەبۆخەڵکیان کوشت لە پێناوی نەوتدا خەڵکی دەکوژرێتلیان لەپێناوی باوەڕێکی دەمارگیری بۆگەندا خوێن دەڕێژن ولاشەکان پارچە پارچەدەکەن وشارستانیەت لەناودەبەن وشارووڵات وێران دەکەن،ئایابۆچی مرۆڤ وابەمرۆڤ دەکات؟

## لەپێناوئاشتی وپێکەوەژیان:

١/٩/ی هەمووساڵێ بەڕۆژی جیهانی ئاشتی دانراوە،بەڵام لای ئێمەی موسڵمان هەموو ڕۆژێ ڕۆژی ئاشتیەوهەردووجەژنەکەشمان سونبولی ئاشتی وپێکەوەژیانەبۆتازەکردنەوەی خۆشەویستی ویەکێ لەناوەکانی خوای گەورەش(السلام)سەلام وئاشتیە،وەپێناسەی موسڵمانیش سەلامەتی وئاشتیەبۆغەیری خۆی وەك پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی: (المسلمُ من سَلِمَ المسلمونَ من لسانِهِ ویَدِه)،بەپێچەوانەی قسەی دوژمنانی ئیسلام کەبەتیرۆروتۆقاندن تۆمەتبارمان دەکەن،چونکەخۆیان تیرۆریست وخوێن ڕێژن وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد،پێشینانمان جوانیان وتوە:( لەدزوایەهەموکەس دزە)،بۆئاشتی بڵاو ناکەنەوە؟بۆئەوەی مرۆڤەکان بەئاشتی بژین وەك پێغەمبەری ئاشتی ﷺ فەرموویەتی: (افشوا السلام واطعموا الطعام وصلواوالناس نیام،تدخلون الجنة بسلام)(رواه الترمذی وصححة الالبانی) واتە:ئاشتی بڵاوبکەنەوەو سەلام لەیەکتر بکەن ونانی خەڵکی بدەن ولە کاتێکدا نوێژبکەن خەڵکی خەوتبن وئەوابەئاشتی وئارمیەوە دەچنەبەهەشتەوە).لەکۆتایدا: ئیسلام ئاشتی وپێکەوە ژیانە.. دژی تیرۆرو تۆقانە.

---

* (ئەم وتارە بۆئازارەکانی مانگی ئازارە کەلەمێژوی کوردازەق وبیارە زۆر تیاچونی خەڵکی هەژارە پاشانیش درابەپوڵ وپارە!)

# كڕين وفرۆشتن بـازرگـانـى.. بەمرۆڤەكان !

لــــــەژێردروشمی مــــــافی مرۆڤــــــە..كــــــالاّی بازرگــــــانی مرۆڤــــــە!! بازرگانیكردن بەمرۆڤ مێژویەكی كۆنی هەیەكەجۆرێكی مەترسیدارەلەستەم وچەوساندنەوە، مرۆڤ بكرێتەبەندەی بەندەكان وەك كالاّیەك كڕین وفرۆشتنی پێوەبكرێت وبەهەمووشێوەیەك دەست درێژی بكرێتەسەر!دەستدرێژی ئابوری وسێكسی وبكرێتەكالاّی بازرگانی،!كەهۆكاری سەرەكی ئەم ستەمە هەژاری ونەداریە..نزمی ئاستی هۆشیاریە،لەراپۆرتێكدا هاتبولە ئەفریقیاخێزانێك دوومندالّی بووەتەنها مەسرەفی یەكیان پێكراوە،ناچارئەوی تری بە(٦٠٠) دۆلارفرۆشتوەبەباندی مافیاكانی ئەوروپا!هۆكاری دووەمی نزمی ئاستی هۆشیاری گشتی بەتایبەت هۆشیاری ئاینی چونكەلەخواترسان سەرچاوەی هەموخێرێكە دورت دەخاتەوە لەحەرام وستەمكاری،بەپێچەوانەیشەوەوەكوفروبێدینی سەری هەموخراپەیەكەولەوەبترسێ لەخواناترسێ وەك لەفەرمودەداهاتووە:(اذالم تستحِ فاصنع ماشئتَ)،لەگەلّ هۆكاری تریش..

**شێوازوجۆرەكانی ئەم بازرگانیە:**

١ـ چەوساندنەوەی كرێكاروزیادەكارپێكردنی یان دەبینی لەبەرامبەر(٢٠٠) دۆلاری مانگانەبەهەموجۆرێ بۆهەموكارێ بەكاریان دێننلوەك (عەبدو خزمەتكار)

٢ـ بازرگانیكردن بەئافرەتانەوەلەرێگەی دەست درێژی سێكسی وبەكار هێنانیان بۆگەرمكردنی بازارەكانیان لەبەرامبەرموچەیەكدا،بۆنمونە دەبینی (٤٠٠)مالّی لەشفرۆش ئەوەی دیاروئاشكرایە بۆنیوملیۆن خێزانی سلێمانی گەلێك زۆروئابەرامبەرونەگونجاوەبەهیچ پێوەرێك رێگەنەدراوەیان دەست درێژی سێكسی لەبەندیخانەكانداوسەرهەلّدان ویانگەشەو بەیاساكردنی نێر بازی زەلیل ورسواكردنی مرۆڤەكان بۆبولّوپارە!

٣ـ چەكداری وسەربازیكردن بەمندالّ وهەرزەكاری خوارتەمەنی (١٨)سالّ، یان بەكار هێنانیان بۆخۆتەقاندنەوە!

٤ـ دەرهێنان وفرۆشتنی ئەندامی لاشەی مرۆڤ لەلایەن باندی مافیاوەکەمنداڵ ئەفڕێنن دوای دەستدرێژی کردنەسەری گورچیلەی دەردێنن ودەیفرۆشن! دیارەئەونەشتەرگەریەش هەرلەلایەن پزیشکی تایبەتی مافیاوەئەنجام دەدرێ کە خاوەنی بڕوانامەیەویەناو ڕۆشنبیرە وکارەکەی ئینسانیە!(ئەگەردین نەمازین نەما دنیانەما..کەئیمان نەمائەمن وئەمان نەماوچاوەڕێی هەموخراپەیەك دەکرێت) .

**بازرگانەسەرەکیەکان کێن؟:**

١ـ حوکمەتەکان کەشایستەی فەرمانڕەوای نین ومافی مرۆڤ پێشێل دەکەن .

٢ـ پلەی وەزیفی وکاربەدەستان،بەڕێوەبەرستەم لەخوارخۆی دەکات،بەرپرس پاسەوانەکەی بۆمەبەستی تایبەتی خۆی دەکاتە خزمەتکار،واتە:فشاری کاربەدەستان بۆپلەی خوارخۆیان.

٣ـ باندی مافیا،کەلەولاتەهەژارەکانەوەمناڵ وهەرزەکارئەدزێ وئەیفڕێنێ وئەیخەڵەتێنێ وئەیبات لەولاتێکی دووربەکاریدێنێ وئەمیش هیچ چاری نامێنێ.

٤ـ بازرگانی بەگەلان بەتاڵان بردنی سەروسامانیان لەلایەن زلهێزوداگیرکەران (الاستعمار) یان بازرگانی سیاسی کەسامانی ولات بۆبەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاردینێ،بازرگانی ومامەڵەی زۆریش کراوەبەکوردایەتیەوە، هەندێ جاریەناوی دینەوەبەقورئانەوە!

چارەسەرنبێ‌گومان خۆپاراستن باشترەلەچارەسەرکردن،ئەوەش بەپراکتیزە کردن وڕاستکردن وپابەند بون بەبنەماکانی بیروباوەڕەوە،موسڵمان لەگەڵ دینی خۆی،ئەوانەش کەبانگەشەی مافەکانی مرۆڤ دەکەن باڕاست بکەن لەگەڵ دروشمەکانیان،بەزەییمان بێتەوەبەوانەی بونەتە قوربانی وسوتەمەنی ئەم دیاردەیە،وەك تاوانبارسەیرنەکرێن بەڵکولێکۆڵینەوەلە هۆکارە کانیان بکرێت،چارەسەری ڕاستەقینەش گەڕانەوەیەبۆیاساکانی ئیسلام،نەك کۆمپانیای بیانی ژوری بازرگانی..ڕێکخراوەکانی مەدەنی..،چونکەمرۆڤ ئەگەرخۆی بناسێ کە سەر تۆپ وبەرێزترینی دروستکراوەکانی خودایە(ولقد کرمنابنی ادم..)ڕێز لێ گیراوەبەوەی کە خوابەدەستی خۆی دروستی کردووەبەجوانترین شێوە(..فی احسن التقویم)لەڕۆحی خۆی

فوی پێدا کردوەوگیانی بەبەرداکردوەوبە نیعمەتی عەقڵ جیای کردۆتەوەلەدروستکراوەکانی تر،بەوەیش شایستەی ئەوە بوەکەفریشتەکان سوژدەی ڕێزی بۆببەن ویکرێتەجێنشین لەسەر زەوی، لە ئیسلامدادادگەری واجبە(انَ اللهَ یأمُرُبالعَدلِ والاحسان ..)(النحل :٩٠)وەلە بەرانبەر داستەمکردنیش حەرامە،لەفەرمودەی قودسیداخوای گەورە فەرمویە : (انی حَرَمتُ الظُلمَ علی نفسی وجَعَلتُهُ بَینَکُم مُحَرماً فلاتَظالموا)(مسلم) واتە: ستەم کردنم لەسەرخۆم حەرام کردوەولە نێوان ئێوەشداحەرامم کردوە،کەوابو ستەم لەیەکتری مەکەن،وەلەقورئاندا فەرمویەتی:(لاتَظلمون ولاتُظلمون) واتە:نەزوڵم بکەن وەنەزوڵمیش قبوڵ بکەن،پێشەواعومەر (خ)بەدەسەلاتدارێکی فەرمووکەستەمی لە هاولاتیەکی هەژارکردبوو: (ئەوەلەکەیەکەوە خەڵکتان کرددوەبەکۆیلە!کەبەئازادی لە دایك بوون؟!) ئەوەتا کەپەیامی ئیسلام هات سیستمی کۆیلایەتی وبەکوڕکردن باوبو، بۆیەهەنگاو بەهەنگاونەیهێشت،وەك گەورەیی پاداشتی ئازادکردنی کۆیلەوزۆرێك لە کەفارەتی تاوانەکانی کردە ئازادکردنی بەندەوەك کەفارەتی(جوتبون لەرۆژی ڕەمەزاندا،شکاندنی سوێند، کەفارەتی نەزر،زیهار،کوشتن..) ، چونکەستراتیجی پەیامەکەی خوابۆئازادی مرۆڤەکانە،بۆڕزگاربونیان لەبەندایەندتی بەندەکان بۆبەندایەتی خوای میهرەبان وەك (رەبعی کوری عامر)وتی بەروستەم:(لنخرج الناس من عبادة العبادالی عبادة ربِ العباد) هەمووبرابن بەندەی خوابن، نەمەلەکوێ و ئەوسوکایەتی وبێ ڕێزیەلە کوێ کەبەمرۆڤەکانی ئەم ڕۆژگارە دەکرێ !؟ڕوباری خوێن دەڕوا! سەرەڕای دروشمەکانی مافی مرۆڤ،بەلام کە ئیمان لەدلانەبێ وئیسلام حاکم نەبێ ڕێزو و یژدان ورەوشتی جوان لەکوێ دەبێ،لەوتاری پێشوداباسی گەورەیی تاوانی کوشتنمان کردلە ئیسلامداویاسای تۆڵە سەندنەوەلەبکوژتاکومافی مرۆڤەکان پێشێل نەکرێت وبەئارامی بژین.

## ئەنفال: لەقورئان وسیاسەت ومیدیا..

**پێناسە**:(الانفال)زاراوەیەکی قورئانیەوکۆی(نفل)واتەزیادە،کەمەبەست لێی(غەنیمەتە) ئەومالەزیادەیەکەبۆتەدەسکەوتی موسلمانان لەشەڕی بێبڕوایاندا،

**لەقورئاندا**:

ئەنفال سورەتێکی قورئانەوباسی شەڕوکوشتن وبڕین ناکات بەلکوباس لەیاسای بەشکردنی (غەنیمەت)دەکات،ئەومال وسامانەی لەشەڕی بێ باوەڕاندابوە دەستکەوتی موسلمانان، نەك کۆمەلکوژی مرۆڤەکان،پاشان لە شەڕی دژبەبێباوەڕان نەك باوەڕداران،یامیللەتێکی موسولمانی وەك کورد!لە بەرئەوەدروست نیەبەوتراژیدیایە بگوترێ ئەنفال یان ئەوەدینەئەو کارەساتەی بەرەوادانا‌وەلیان بەدەستەواژەکەبگوترێ بەدناوە ئەنفالەکان ئەمانەهیچیان دروست نین،بەلکودەبێ بگوترێ بەناوئەنفال،چونکەبەبەلگەی ئەقلی ونەقلی نابێتەئەنفال، زۆرنابەجێیەئێمەقسەی دوژمنەکەمان دووبارەبکەینەوە و سوکایەتی بەشەهیدەکانمان بکەین!!،

**لەسیاسەتدا**:

مەرگەساتی بەناوئەنفال پرۆسەیەکی سیاسی بونەك ئاینی،سیاسەتی حیزبی بەعسی سیکۆلاری بەشێوەیەك پلان وپیلانی دادەڕشت کەتاوان وکارەدزێوەکانی بەدروشمی ئاینی پەردەپۆش دەکردلوەك ئەنفال و شەڕی قا:سیەوهێزەکانی بەناوی بەدرو سعد وقعقاع و هێرشەکانیشی بە(الله اکبر)جۆش دەدا.بەلام لەبەرانبەرداکارە خزمەت گوزاریەکانی بەناوی خۆی وحیزبەکەی ناودەنالوەك (نەخۆشخانەی صدام، شاری هاوچەرخی صدامی) لەگەل زۆرێك لەشەقام وشوێنەگشتیەکان،کەلەونێوەندەدا دینەکەنەبووە قوربانیی! ئەینانەوە پرۆسەیەکی سیاسی بووبەناوی ئاینەوەبۆلێدانی ئاین، لە هەندێ سەردەمدا مێژووخۆی دووبارەدەکاتەوەوبەپراکتیزەکردنی هەمان پلان لەژێردروشم وناوی جۆراوجۆر! هێنانەوەی ڕوفاتی بەناوئەنفالکراوەکان وناشتنیان لەگۆڕستانی تایبەت بەمەراسیمی شایستەو

شکۆداردادجێی خۆیەتی و زیاتریان قابیلە،بەڵام پرسەومەراسیمەکەئەوەندەی سیاسی وروکەشوبازرگانیە بەوئەندازەیەدڵسۆزی وپەرۆشی لێناخوێندرێتەوە!بێگومان بێ دەنگی لە ئاست جینۆسایدی بەناوئەنفال بێ دەنگیەلەکارەدزێوەکانی بەعس،بۆیە پێویست بوو دادگایی ئەنفالچیەکانی ناوخۆمان بکرایەوبەتایبەت فایلدارەکانوکرابانەپەند و نامۆژگاری بۆئەوانەی کەبازرگانی بەم میللەتەوە دەکەن،نەك پلەیان پێ بدرێ وخەڵات بکرێن لەبەر مەنسوبیەت ومەحسوبیەت چاوپۆشیان لێ بکرێت چون ئەگەرلەئەنفال تێنەگەین،کەواتە لەبەعسیش تێنەگەیشتووین،دیارەسوپاس بۆخواکەسەرئجامی صدام و داروەستەکەی بینراکەچیان کردبەخەڵك هەمان شت هاتوەرێگەیان لەخۆی وماڵ ومناڵی، کەئەوە سەرەئجامی ستەمکارانەوخوا غافڵ نیەلەستەمی ئەوانەوتاماوەیەك وەك تاقی کردنەوە مۆڵەتیان دەدەات وپاشان بەتوندی دەیانگرێت،پاشان ئەپرسین ئەرێ گەلۆکەس وکاری بەناوئەنفال چیان بۆکراوە؟وەچیان ماوە؟ ئەوەی ساڵانەلەدیمانەی هاوڵاتیانی گەرمیان دەبینرێ گلەیی وگازندەیە!دڵگەرمیەلەشێوەی وتاری بەرپرسەکان! ئەبوو کەسو کاری شەهیدەکانی بەناوئەنفال شارێکی مۆدێرن یان گوندێکی ئەمریکی وئەوروپی هاو شێوەی گوندی ئەڵمانی سلێمانیان بۆدروست بکرایە،لەناو کەلاوەکانی گەرمیاندا،نەك موچەیەکی کەمی مانگانەیامۆنۆمێنتێك،ئەوشارە هاوچەرخەئەنهابەئەندازەی بودجەی تەلاری چەندبەرپرسێکی تێدەچو! کە عەدالەتومافی مرۆڤ دەبوبۆهەموان بوایە،وەبەجدی هەوڵ بدرایە بۆبەجێهێنانی داواکانی پاشماوەی ئەنفال،بەڵام وەك چۆن خودی پرۆسەکە سیاسی بوکاربۆکردنیشی سیاسیانەیە!کەدەبودڵسۆزانەبوایە،لەکۆتاییدابالەبیرمان نەچێتەوە تادوبارە نەبێتەوە،منیش ئەڵێم: پرۆسەی بەناوئەنفال..دژی دین بو بێ قیل وقال.

لەمیدیادا:

ساڵانەلە(٤/١٤)بەولاوەبرینەکان نەکولێنەوە،خەمەکان وەبیر دێنەوەپەیمانەکانی خزمەتو وەفاداری چەندبارەئەکرێنەوە!بەڵام زولەبیرئەبرێنەوە بەداخەوەکەهەندێ لەدەزگای ڕاگەیاندن ئەوەندەی بەخەم گەرمکردنی بەرنامەوبازاڕی خۆیانن ئەوەندەلەخەمی شەهیدەکان نین! لەجیاتی خزمەتی پرسەنەتەوەییەکان بەیەك دەنگودروشم،ئەوانیش بونەتەدووبەرەوەك حکومەت وئۆپۆزسیۆن!ئەمیان خزمەتگوزاریەکان ڕادەگەیەنێ بۆپرسەکە،ئەویان دەڵێ هیچ نەکراوە!کەدەبولەوڕێگەیەوەبزانرێ چیان بۆکراوەوچی نەکراوە؟ وەبە نەتەوەیی بکرێ نەك بەحیزبی،بەجیهانی بکرێ وبەجینۆسایدبناسێنرێ،وەك لە پەرلەمانی سویدکرا،جێگەی نیگەرانیە هەندێ لەڕاگەیاندنەکان بەباگراوندی سیاسی یان فیکری بەناڕەوالەویادەدا ناڕاستەوخۆتانەلەدینەکەمان دەدەن و تۆمەتباری دەکەن!بەوەش ڕەسەنایەتی ومتمانەی خۆیان لەدەست دە دەن!.

---

(ئەم بابەتەلەگۆڤاری پەیامی زانایان ژمارە/٨١ی ساڵی ٢٠١٢بڵاوکراوەتەوە)

# سوکایەتی بەدین بە پاساوی ئازادی!

دژایەتیکردنی پێغەمبەران وشوێنکەوتوانیان پرۆسەیەکی لە مێژینەی بەیەکەوە بەستراوە لەئادەمەوە هەتاخاتەم(سەلامی خوایان لەسەربێت)بەتایبەت پێغەمبەری خۆمان کەتۆمەتبار کرابێت بەشێت وجادوگەروشاعیر،لەزێدی خۆی شاربە دەریانکردبۆزیاترلەکەدارکردنشی بوختانیان بۆعائیشەی خێزانی کردسەرەتای ئەودژایەتیە(ئەبولەهب)بوپاشان عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب کە تفێکی هەڵدا بوبەڕوی حەزرەتدا،هەردووکیشیان بەزەلیلی لەناوچون،بەڵام مخابن ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانەکەلەسەردەمی بانگەشەی مافی مرۆڤدا وبە ناوی ئازادی ڕادەربڕین لێرەولەوێ لەهەندێ گۆڤاروڕۆژنامەدادژایەتی بیرو باوەڕی ٩٠./. ی ئەم گەلە موسڵمانەدەکرێ وسوکایەتی بەپێغەمبەروشوێنکەوتوانیان دەکرێ بەفڕێدانی کتێبە ئاینیەکان لەشوێنە پیسەکان!بەدەرکردنی فلیم وکاریکاتێر، لەژێرناوی ئازادی سەربەستیدا خەتی سوردەبەزێنن ومافی گەلێك پشێل دەکەن!کەئەوەش بەئاشکراسنوربەزاندنەو ناچێتە چوارچێوەی ئازادی تاکەکەس چونکەپێشێلی مافی بەرانبەرەوەپێچەوانەی ماددەی(١٨) بنەماکانی جاڕنامەی نامەی گەردونی مافی مرۆڤە،وەدژی بڕیاری(٢٥،٢٦)ی نەتەوە یەکگرتوە کانی ساڵی(٩٧٠)کەتییانداهاتوەئەبێ ڕێزلەئاینی هەموکەس بگیرێ ونابێ سوکایەتی پێبکرێ!(بێگومان ئەوەلە ئیسلام وەرگیراوە)تەنانەت لە بەریتانیا جوێندان بەپیرۆزیەکان قەدەغەکراوەبە یاسایەك بەناوی(فاجبۆ)، ساڵی (٢٠١٢)پەرلەمانی کوەیت یاسایەکی دەرکردلەوبارەوەکەهەرکەس سوکایەتی بەخواوپێغەمبەریکات لەسێدارە دەدرێ ، خۆئەگەر موسڵمانان وەلامێکی بەرگریکارانەیان بوبێ لەبەرانبەردایەکسەر بەتوندو تیژی وتیرۆرو تۆقاندن تۆمەتبارکراون!لەکاتێکداکەلایەنی بەرانبەریش دەسپێشخەربووەو ئەو هێرشی کردۆتەسەرئیسلام وتاوانباری سەرەکیەچونکە(البادیءبالشرهوالاظلم) ئەوان بەکردەوەدژی ئاشتی کۆمەڵایەتی وپێکەوە ژیانن! بەپێچەوانەی دروشمە کانیان،بەڵام کەس باسیان ئەوناکات چونکە بەناونوسەروڕۆژنامە نوسن! بێگومان ئازادی مافی ڕەوای هەمە..

کەسە بەمەرجێك سنوردار بێت،چونکە ئازادی ڕەها زیان بەخشەوبێ سەروبەری وبەرەڵایی لێدەکەوێتەوە،وەك چۆن سەیارەیەك بەناوی ئازادیەوەلەڕێگەلابدات یاسای هاتو چۆپەیڕەو نەکات،یان شەمەندەفەرێك لەسکەی خۆی لابدات، ئەوە سەرەنجام سەرنشینەکانی لەناو دەبات،ئەوەش بەکورتی پێناسەی ئازادی کەلەکتێبی(الاخلاق /احمدامین ص٢٠٠ وەرگیراوە بەم شێوەیە،یەکەم پێناسەی ئازادی لای ڕۆژئاوا ییەکان:(چی حەز دەکەی بیکە بەمەرجێ زیان بەکەسانی ترنەگەیەنیٚ)ڕێزلە بەرانبەر بگریٚ و مافی پێشێل نەکەی ئەمەئەڵێن بەلاّم واناکەن ئەوەتاخۆیان سەپاندووە بەسەر جیهانداوئەوەی لەگەڵ بیروبۆچونی ئەوان نەبێت تیرۆر یستەیان دواکەوتووە!

دووەم: پێناسەی ئازادی لەئیسلامداواتە:(هەرچی حەزدەکات بیکات بەمەرجێ زیان بەخۆی وکەسانی ترنەگەیەنیٚ)،(لاضررولاضِرار)واتە:خۆی بپارێزێ لەزیان گەیاندن لەخۆیوخەڵکیش زەرەروزیان لەکەسانی تر نەدات وەك کوشتن ولێدان ومالّ داگیرکردن وبوختان ودرۆو تاوان، زیان لەنەفسی خۆیشی نەدات کەئەویش دووجۆرە: زیانی دونیایی: وەك خۆکوشتن وخۆسوك کردن ومالّی خۆبەفیڕۆدان...،

زیانی قیامەتی: وەك بیٚ فەرمانی خواوپێغەمبەر(ﷺ)،ئەنجامدانی خراپەوتاوان کە دەبنەئەگەری سزای دوارۆژ، لێرەدادەپرسین دژایەتیکردنی ئیسلام چ خزمەتێ بەگەلی کورددەکات؟ جگەلەدژایەتی ئەمنی قەومی وناچارکردنی موسڵمانان بەکاردانەوە و سەرەنجام دروستبوونی پشێوی،جگەلەوەش دژایەتی کردنی پیرۆزیەکانی ئیسلام سەلماندن وبەڕاست گەڕانی قسەی ئەنفالچیەکانی ڕابردووەوخزمەتێکە بەدوژمنانی کوردکە دەیان گووت کوردلە ئیسلام پاشگەزبۆتەوە،

کەواتە ئەم سوکایەتیەبۆ؟:

١) ئیفلاس بون وبیٚ دەسەلاّتی ئەوانەدەگەیەنیٚ لەبەرانبەرگەورەبون و گەشەسەندنی ڕابون وڕاستیەکانی ئیسلام.

٢) بۆئەوەی ناویان بێتەناوناوانەوە،چ وەك تاك یان وەك دەزگایەكی میدیا،وەك پێشینان وتویانە:كەچەڵ بۆئەوەی ناوی بێتەناوناوانەوە باسی بكەن كانیاوی گوندەكەی پیس دەكرد!

٣) بۆوەرگرتنی خەڵات وبەرات وئیقامەلەدەرەوەلەلایەن بێبڕوایانەوە!

٤) یان داپۆشین ولەبیربردنەوەی كێشەیەك بەكێشەیەكی ترلەوجۆرەسیناریۆیانە دروست دەكرێت!.

٥)زۆرجاربەپیلانی جولەكەئەنجام دەدرێت بۆئاژاوەنانەوەلەنێوان موسڵمانان ومەسیحیە كان وكاردانەوەی توندوتیژی لەلایەن توندڕەوەكانەوەوخۆشیان دەبنەتەماشاكەر،وەڵام دانەوەی موسڵمانانیش بەپێی كات وسەردەم دەگۆڕێ،كاتی وابوەكەس نەیتوانیوە بەرگری لەپێغەمبەری خوابكات!كاتێ لەكەعبە ورگوپیسایی ئاژەڵیان بەسەرداكردله كڕنوشدا ، لەكاتی دەسەلاتیشدانەوەلەجەنگی بەدرداوومێرمندالێ هەڵدەكوتنە سەر پیاوێكی ناوداری وەك(ابوجهل) ودەیكوژن،یان خوالەقورئاندافەرمویەتی(هەركەس تەعەددای لێ كردن وەكوخۆی وەڵامی بدەنەوە)(البقرە/١٩٤) ئەوەبۆ ئەوانەی دژی ئیسلامن،بەڵام ئەوانەی نازانن وبێئاگان دەبێ بۆیان ڕونبكرێتەوە(اقامەحوجەیان) لەسەریكرێ، لە كۆتایدا:ئەگەرئێمەحەكیمانەمامەڵەلەگەڵ ڕوداوەكاندابكەین و هەڵەكانی ئەوان دوبارە نەكەینەوە،ئەواوەك صوڵحی حودەیبییەوبوختانی (افك)بەخێر دەگەڕێت بۆبانگەوازی ئیسلامی،كەبەهۆیەوەزۆرجارنەیارانی دەكەونەبەدوا داچونی ڕاستیەكان وسەرەنجام موسڵمان دەبن،وەك پەیامنێری كەناڵی (العربیە)دوای بلاوبونەوەی فلیمەكەلەبەریتانیا وبەرپرسی سەنتەری ئۆكسفام ڕایگەیاند(٠٣٠/٠)بازاڕی كتێب ونامیلكەئیسلامیەكان زیادی كردوە،جگەلەبەئاگاهێنانەوەی موسڵمانان لەخەوی غەفلەت.

---

* لەگۆڤاری پەیامی زانایان ژمارە(٨٦)ی ٢٠١٢ بلاوكراوەتەوە.

# ئاو سەرچاوەی ژیانە...

ئاوگەورەترین خەلاّتی ماددیەخوابەئێمەی بەخشیوەلەسەرزەوی خوای گەورە فەرموویەتی: (وجعلنامن الماء كل شي حي) واتە:لەئاویش هەموشتێکی زیندومان فەراهەم هێناوە ئایا ئەوانەهەرباوەڕناهێنن؟(والله خلق كل دابةمن ماء)،الله هەموو گیان لەبەرێکی لەئاو دروستکردووە،لەبچوکترینیان وەك كرمێك تاگەورەترین ئاژەڵ كەلەسەرزەوی دەڕوات، ئەوە تاجەستەی ئەوكۆرپەلەی كە تەمەنی سێ مانگە٩٣.\.ی ئاوە،كەلەدایك دەبێت ٨٠./.ی ئاوە،خوێن ٨٠./.ی ئاوە، مرۆڤی باڵغ ٧٢./. ی ئاوە،ئاوهۆكاری ژیانەبۆسەرجەم زیندەوە روڕوەكەكان، تەنانەت ئاوپێویستەبۆشتەبێ گیانەكانیش،بۆنمونە ئەگەرلم وچیمەنتۆ تێكەڵ بكەین بەبێ ئاوهیچی لێ پەیدانابێت،كەواتە ئەوكۆشك وباڵەخانانەی كەبە ئاسمانداچوون گەرئاونەبێ ناكرێت،لەوانەیە بلێی خانوەكانی ئێمەلەتەختە دروستكراون،ئەپرسین ئەی تەختەلەكوێوەهاتوە؟ لەدارودرەخت،دیارەكە دارودرەختیش بەئاودەڕوێت وگەشەدەكات، هەرچی شتەلەكەل وپەلی دەورو بەرمان گەرئاونەبایەنەدەبوون بۆیەنایەتەكە موعجیزەیەكی گەورەیەوجێگەی سەرنجدانە كەفەرموویەتی: ئاوسەرچاوەی ژیانە،

**سەرچاوەوجۆرەكانی ئاو:**

١)ئاوی باران،وأنزلنامن السماءماء طهورا...،خوای گەورەفەرموویەتی:لەئاسمان ئاوێكی پاكەرەوەمان ناردوەتەخوارەوە،لاشەوژینگەوژیانت پاك دەكاتەوە، زانایان دەڵێن:ئەودڵۆپە ئاوەی كەلەهەورەكەوەدادەبەزێ پاكترین ئاوەپێش ئەوەی بەرئەوبەرگەهەوایەبكەوێت وپیسی دەكات ولەبەرانبەرداژینگەت بۆ دەشواتەوە زەوی وئاسمان خاوێن دەكاتەوەپاشان زەوی ولاشەت،بۆیەدەبینی ئاسمانی دوای باران چەند ساف وجوانەئەم ئایەتەبەڵگەیە لەسەرئەوە كەسەر چاوەی ئاولە ئاسمانەوپاشان بەهۆی كرداری بەهەڵم بون لەدەریاورووبارەكان بەپێی بەرزی ونزمی پلەی گەرماوهەڵكەوتەی جوگرافی دەبارێت،وسروشت و پێكهاتەی ئاویش

بەشێوەیەکەنەقورسەوەك زەیت تابەرزنەبێتەوەونەسوکە وەك بـەنزین تاهیـچی نەمێنێتـەوە، بەڵکوشلەیەکی خێراجولاوە وگونجاوەبۆ ناو هەواوژینگەو ژیانی مرۆڤ.

٢)ئاوی کانیاوکارێزەکان بۆخواردنەوە،خوای گەورەفەرموویەتی: (واسقیناکم ماءً فوراتـاً..) واتـە ئـاوێکی سـوك وشـیرین وخۆش،شـەربەت دەخۆیـەوە ٩٨./.ئـاوە بـەلام پاکەرەوەنیـە بۆیەلێرەنەیفەرمووە(طهوراً) وەقەت بەشەربەت تینوێتیت ناشکێنێ ئاونەبێ.

٣) ئاوی تفت وسوێر، وهذاملح اجاج...،سێ لەسەرچواری دنیائاوەبەڵام زۆرینەی هەرەزۆری سوێرەوناخورێتەوە،تەنانەت ئەوئاوەشیرینەی کەبەکەڵکی خواردنەوەدێت ناگاتە ١٠./.، ئەوەش بێ حیکمەت نیەکەزوۆرینەی ئاوی زەریاکان ودەریاکان سوێرەتاوەکوئاوەکەبۆگەن نەبێت،پاشان یاقوت ومەرجان ودورووومرواری وسەدەف لەئاوی سوێردانەبێت نامێننەوە وپەروەردە نابێت! ئەوەموعجیزەی قورئانەوتازانست پێش بکەوێت ڕاستیەکانی زیاتر ئاشکرادەبێت،ئەینائەوەی نازانێ هەردەڵێ جائاوی سوێربۆچی باشە؟، ئەم خەڵاتەخواییە هەندێ جاردەیگرێتەوە(لعلهم یتذکرون)تامەغرورنەبن بیرلەدەسەلاتی خوابکەنەوەبیرلەخالق بکەنەوەنەك حکومەت،تاقەدروگرنگی ئاوبزانن ولەخوا بپاڕێنەوەونوێژەبارانەبکەن وبەخۆتاندابچنەوەولەخواغافڵ نەبن وتەوبەو(أستغفرالله)بکەن(اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا، يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا..) تابزانن دەسەلات دەسەلاتی خوایە،بۆئەوەی خێروخێرات بکەن وزەکاتی ماڵەکانتان بدەن،لەفەرموودەیەکداهاتوەکەپێشەوامسلم گێڕاویەتیەوە: لە چۆڵەوانیەکداکابرایەك گوێی لەدەنگێك بوکەبەپەڵە هەورەکەی دەگوت(اسقِ حديقة فلان) ئەی هەوریچۆلەباخی فلان کەس ببارێنەدەڵێ ڕێك لەوێ هەڵی ڕشتوکەچوو پرسیاری لێکردتۆفلان کەسی؟بەڵێ،توخوانهێنی ئەوەچییە؟خاوەن باخیش وتی:من بەرهەمی

باخەکەم دەکەم بەسێ بەش،بەشێکی بۆماڵ ومناڵم بەشێکی بۆمەسرەفی باخەکەو بەشەکەی تریش دەکەم بەخێروخێرات و زەکات ! دەوڵەمەندی چاکوپاك فریشتەلەئاسمان ناوی دێنێ ودەبێتەخێرو بەرەکەتیش بۆ خەڵك وخاك،بەپێچەوانەوەئەوکەسانەی نابەخشن وزەکاتی ماڵەکانیان نادەن وخراپەبلاودەکەنەوە دەبنەهۆی نەبارینی باران،ئەوەش پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویە :(ولم يمنعوا زكاةَ اموالِهم الامُنعوا القَطرمن السماء ولولاالبَهائم لم يَمطروا، واتە: ئەگەرزەکاتی ماڵەکانیان نەداخوداش بارانیان لێدەگرێتەوەوئەگەرلەبەر ئاژەڵانی بێزمان نەبوایەئەوانەوەندەبارانەش نەدەباری،بەزەیی نەماوەودەو لەمەندی بەخیل ورەزیل بەلایەوەقورسەلە(١٠٠)دەفتەردوونیوبدات،بۆیەخوای گەورەبەرەکەتی ئاسمانت لێ دەگرێتەوە،یان جاری وایەبەباران کەرەحمەتە دەیکاتە غەزەب بەلافاویان لەکاتی خۆیدا نابارێت،تاقەدری بزانن تابەئاگا بێنەوە لە دەسەڵاتی خوا،بەتایبەت لەئاخیرزەمانداقەیرانی کەم ئاوی دەبێتە کێشەیەکی مەترسدارولەنێوان دەوڵەتاندابەهۆی ناعەدالەتی لەدابەش کردندا شەڕی ئاوسەرهەڵدەدات بەتایبەت کوردستان دەکەوێتەمەترسیەوەبەهۆی گرتنەوەی سەرچاوەئاوییەکان ودروستکردنی بەنداوی زۆرلەلایەن ولأتانی دراوسێوە، لەوکاتەداهەست بەگرنگی وگەورەیی نیعمەتی ئاودەکرێ ودەردەکەوێ کە دیناروودۆلارومادددەهەمووشت نیەو ئاوپەیداناکات،

## بەکارهێنانی ئاوومەترسی کەم ئاوی:

لەشەریعەتی ئیسلامدازیادەڕەوی لەهەمووشتێکداحەرامەورێگەی پێنەدراوە، زیادبەکار هێنانی ئاویان لێدانی بیری ئیرتیوازی لەرادەبەدەروبێ بەرنامەزیان لەبەرژەوەندی گشتی دەدات ومافی ئەوانی تریێشێل دەکات،بەپێی ئامارێکی بەرێوبەرایەتی ئاوی هەولێروتبوی

بەشێوەیەکی گشتی نزیکەی (٢٠)مەترناستی ئاودابەزیوە،چونکە(٣٥٧٤١)بیری ئیرتیوازی لەکوردستان لێدراوەو (٢٥٠٠)یان بێ مۆڵەتەواتەلەشوێنی پێویست نیەوبۆکەسی تایبەتە! بۆکەرت وکۆمپانیای تایبەتە!بەداخەوەلەبەرانبەرئەونیعمەتەناشکوری زۆرەوزیادەڕۆی تێدا دەکرێ وزۆرێك لەماڵەکان لەبەکارهێنانی ئاودازیادەڕەوی دەکەن بەلوعەکەناگرنەوەو ماتۆڕی تێدەگرن ویان تانکی سەربانی لەسەری دەڕوات وتەوافەی نیەویان جاری وایەبۆری سەرەکی دەشکێت وچەندرۆژنەوئاوە خەساردەبێت وتێکەڵی زێراب دەبێت وپیس دەبێت کەڕاستەوخۆنەخۆشی بلاۆدەکاتەوەولەولاش لەدروشمەکانیان دەڵێن(خۆپاراستن باشترەلەچارەسەر کردن) شتێکی ڕاستەوجوانەبەلاَم کاری پێناکرێ،وەك قەدرزانینی ئەونیعمەتە لە فەرمودەی پێغەمبەرداهاتوەکەنابێ پیسایی بکرێتە ئاوەوەبەتایبەت ئاوی ڕاوەستاوئاودان بە خەلکی زۆرخێرە،لەمەدینەتاکەبیرێ کەئاوی شیرینی هەبو بیری رۆمە بوو کەهی جولەکەیەك بوو‌ئاوەکەی دەفرۆشت پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی هەرکەس بیری (رۆمە)بکرێت ئەوەبەهەشت بۆئەوە،پێشەواعوسمان بە نرخێکی زۆرگران کری و بەخشی لەرێی خوا،بۆبەرژەوەندی گشتی تەنانەت لەفەرموودەداهاتوەکەبەهۆی ئاودانی سەگێک لەبیابانێکی چۆڵ بە پێلاوەکەی ئاوی بۆدەرهێنالەناوبیرکەسێك چوەبەهەشت دەیان ئایەت وفەرمودەلەبارەی ئاوباران هاتووەئەی بۆچی باسناکرێ لەزانکۆوپەیمانگاکان لێکۆڵینەوەی لەسەرناکرێ؟تاخالقی خۆیان بناسن،تا موعجیزەی ئەوقورئانەی بۆدەرکەوێ،تازانست وعەدالەتی ئەم دینەی بۆئاشکرابێ

# پاراستنی ژینگەی ژیان پێویستەلەسەرهەموان

لەبەرپرسەیاسیەکان وململانێی خواستەماددیەکان زۆربێ ئاگابوین لە پارێز گاری ژینگەو ژیان!بەداخەوەکەپێشبڕکەی ماتریالیستی وماددەگەرایی وای کردوەبێ ئاگابین لەدوارۆژمان تەنهابیرلە بەرژەوەندی تایبەتی وماددی بکەینەوەلەسەرحیسابی بەرژەوەندی گشتی کە بە هۆیەوەژینگەو ژیانی مرۆڤەکان کەوتۆتەمەترسی وهەڕەشەی لەناوچون!،دژایەتی سێ شتی گرنگ دەکرێ کەژیانی خۆمانی لەسەربەندە ئەوانیش(ئاو- هەوا - خاك )بە پیس کردنیان لەجیاتی پاراستنیان،کەئەوەش پێچەوانەی بەهابەرزەکانی ئیسلامە، ئەوەتا پارێزەری ژینگەوژیان پێغەمبەری پێشەوامانﷺ فەرمویەتی(الطهور شطرالایمان) واتەپاکو خاوێنی نیوەی ئیمانەئەگەرئیمان بکرێتەدووبەش ئەوە بەشێکی بریتیەلەپاکوخاوێنی، جالەپاکی دڵ ودەرونەوەتاپاکی جەستەلاشەوجل وبەرگ کرداروگوفتاروژینگەوژیان، نەتەوە یەکگرتوەکان ٦/٥ی هەمو ساڵێکی دیاریکردوەوەك ڕۆژی جیهانی ژینگەساڵی( ٩٧٢)، بەلاّم ئیسلام (١٤٣٣)ساڵ بەرلەئێستاەوەی ڕاگەیاندوەکەدەبێ پاك وخاوێنی ژینگەوژیان بپارێزرێ وئیسلام پاکوخاوێنی بەنیوەی ئیمان داناوە،لەمێژووی شارستانیەتی ئیسلامیدا نمونەی سەرسوڕهێنەردەبینی لەسەرپاك وخاوێنی ژینگەوژیان، ئەوەتا زانایەکی ئیسلامی وەك(شیزەری)لەدەزگای(حسبة)کاریکردووەساڵی(٥٩٠) کۆچی،ئەوکاتەئەم جۆرەفەرمانانەی دەرکردوەبۆنانەواکانی شار:

١)لەکاتی هەویرشێلان پەڕۆلەنێوچاویان ببەستن تائارەقی نێوچاویان نەکەوێتە ناوهەویرەکە

٢)لەکاتی هەویرشێلاندا دەمامك ببەستن تاهەناسەیان نەچێتە ناوهەویرەکە.

٣)کاتی هەویرشێلان یەکێ باوەشێن بکات تامێش ومەگەزنەکەونەهەویرەکە!

٤)دەبێ دوکەڵ کێش (ساحیبە)لەدوکانەکەدا هەبێ.

ج دەزگایــــــەکی چــــــاودێری نـــــاواگرنگی دەدات بـــــەپاکوخاوێنی گـــــشتی.

**ڕاگرتنی هاوسەنگی ژینگە:** ئەگەرسەرنجی لێکۆڵینەوەزانستیەکان بدەین بۆمان دەردەکەوێ کە هیچ زیندەوەرێ بێ حیکمەت وبێ سود دروست نەکراوەلەبونەوەرداویە هەموبانەوەهاوسەنگی ژینگەڕادەگرن گەڵای درەخت لەگەڵ هەناسەی مرۆڤەکان ئاڵوگۆڕی نۆکسجین ودووەم ئۆکسید دەکەن، چۆلەکەکان کەچەنددەنکەگەنمێ دەخۆن بەلام لەگەڵیدا کرمێك لەناودەبەن کەزیان بەخشەبۆدانەوێڵە،جرج کەئێمەزۆرقێزی لێ دەکەین بەلام زێرابەکان شی دەکاتەوەنایەڵێ زۆربگیرێن،بۆیەدەبێ لە پێناوپاراستنی ژینگە پارێزگاری لەهاوسەنگی بونەوەرەکان بکەین هەمووشمان لەوەبەرپرسیارین وپاراستنی ژینگەئەرکی سەرشانی هەموانەولەسەرجەم نیعمەتەکان لێمان دەپرسرێتەوە، وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیتە)بەتایبەت حکومەت لەڕێگەی دەزگا پەیوەندیدارەکانیەوەوەك فەرمانگەی ئاووئاوەڕۆ وشارەوانی•وکارگەوکۆمپانیاکان کەڕاستەو خۆ پەیوەندیان هەیەبەپیسبوونی ژینگەوە.

**هۆکارەکانی پیسبوونی ژینگەوچارەسەری:-**

١)**پیسبوونی هەوابەهۆی** زۆربوونی دانیشتوان هۆکارێکەبۆپیس بوونی ژینگە زۆرکردنی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەبەرگەهەوادالەکاتێکدا ئێمەهەموومان پێویستمان بەهەوای پاکەزیاترلەنان وئاو،بێ هەواناژین،کەهەوای پیسیش هەڵدەمژی ئەوەدەرەنجامەکەیەتی کەهەمومان نەخۆشین وژیانمان بوەبەژان و لەگەڵ ئەوەیشدابیرلەهەوای پاك ناکەینەوە هەرلە هەوڵی دیناورودۆلاردایین!

٢)**پیسبونی ئاو:**گرفتی سەرەکی ژینگەیەچونکەئاوسەرچاوەی ژیانە،هەموو زیندەوەرێك پێویستی بەئاوەوبەبێ ئاوناژی تەنهاکەنگەری کێوی نەبێ لە ئوسترالیانەویش خوای گەورە لەناوجەستەیدا کۆئەندامێکی بۆدروستکردوە ئاودروستدەکات،جاپیس بونی ئاوهۆکارێکی سەرەکیەبۆپیس بوونی ژینگە، پیس بوونەکە فیزیای بێت کەتام وبۆن ورەنگی دەگۆڕێ .

پیسبوونی کیمیایی بەهۆی تێکەڵبونی پاشەڕۆی مرۆڤەکان وئاژەڵان وکارگەکان بەئاو، بۆنمونە: ئەوسەوزەی کەبەناوی زێراب ئاودەدرێ پیسیەکەدەچێتە پێکهاتەی سەوزەکە لێرەدابەرپرسیاریەتی سەرەکی دەکەوێتەسەرفەرمانگەی ئاوی شارەکان، کە ئاوی پاك بدەنەهاولاتیان کەبۆری شکازووفریای بکەون وبائاوی زەرداوی زێراب نەدرێ پێمان،وەك دەزانن کەخۆپاراستن چاکترەلەچارەسەرکردن و کەمتریشی تێ دەچێ .

٣)پیسبوونی خاك بەهۆی پاشماوەی ئاوئاوەڕۆی زێرابەکان،وەبەهۆی فڕێدانی خۆڵ وخاشاکی ڕۆژانەی ناوشارەکان کەتەنهاشارەوانی سلێمانی ڕۆژانەزیاترلە(١٠٠٠)تەن پاشەڕۆوپیسی فرێدەدات ودەیخاتەسەرزەوی،وەدیاردەی بە بیابان بووشکەسالّی کەخەڵك ناتوانێ لەو شوێنەدابژی وکۆبونەوەشیان لە شوێنێك هەرمەترسیەبۆژیان وەك لەقەرەبالّغی شارەکان دەیبینی،وەهەروەهاپاشماوەی بەکارهێنانی چەکەکوشندەکانوپەینی کیمیاوی زیان بەخشن بۆزەوی بۆسەلامەتی خاك پاشماوەی ئاژەلآن چاکترین پەینەچون دورەلەمادەی کیمیا یی

٤)پیس بوونی ژینگەبەهۆی سوتان ونەمانی دارستانەکان وکەمبونی سەوزایی تەنانەت بڕینەوەی دارێك واتەتێکدانی لانەی (٣٠٠)زیندەوەر،جگەلەوەی کەهەوای پاك وسروشتی جوان وبەروبومی زۆرمان دەداتێ،ئیسلام بەجۆرێ هانماندەدات بۆکشتوکاڵ وچاندنی دارودرەخت،تەنانەت جارێکیان پرسیارکرا لەپێغەمبەرﷺ وتیان ئەگەریەکێك دارێکی بەدەستەوەبوووتیان دنیاخەرابوونە چی بکات؟فەرمووی بادارەکە بنێژێ!،لەفەرمودەیەکی تردافەرمویەتی: (هەرکەس درەختێ یان کشتوکاڵێ بچێنێ جامرۆڤ یان باڵندەیان هەر گیانداری لێی بخوات ئەوەبۆی دەبێتە خێروپاداشتی ڕۆژی دوایی)کەواتەجوتیاری باوەڕ دارخێرەکەی نەبڕاوەوبەردەوامەجگەلەوەی بەوکارەی خزمەتی خۆی و ژینگەش دەکات.

٥) ڕاوی بێبەزەیی،ڕاوی خۆشی ڕاستەقینەهەریوەورێگەپێدراوە،بەلاّم ئەوەی ئێستالەهەندێ شوێن دەکرێ جینۆسایدەوکارەساتەولەناوبردنی بەروبومی ولاّتەکەمن ناومناوە ڕاوی بێ ویژدانی بۆدەستکەوتنی دووسێ ماسی گەورە(TNT)دەخاتەئاوەکەوەوهەزاران ماسی

بچوك لەناو دەبات لەنەی لەرۆژی دوایدا کەحسابی مسقالەزەرەمان لەگەڵدادەکرێ چی وەلامی خوادەدەیتەوەبەرامبەرنەوستەمە،لەکاتێکدالەفەرمودەی پەیامبەری پێشەوادا ﷺهاتوە:(چۆلەکەیەك شکات دەکات ودەڵێ خوایەفلان کەس منی کوشت تەنهابۆخۆشی وکات بەسەربردن گۆشتەکەمی نەخوارد)خۆشتان دەزانن (کێشکەی کوریوچەندبەتامە).

## ٦) دیاردەی وشکەسالی وخۆڵبارین:

یەکێکی لەدیاردەوپێشهاتەنوێیەکان وشکەسالی وخۆڵبارینەکەقسەوباسی سەردەمەو لە تەمەنی ئێمەدابەوشێوەیەپێشترنەبینراوە،دیاردەی خۆڵبارین لەولاتە عەرەبیەکان بەشێوەی ناوچەیی وکەموزۆرڕویداوەلەبیابانەوشك وچۆڵەکانیدابەهۆی ڕەشەباوگەردەلولی بیابانیانەوە بەلایانەوەئاسایی بوە،بەلام لەکوردستانداتازەیەولەدوای هاتنی هێزەداگیرکەرەکانی ئەمریکابۆعێراق واتە:لە(٢٠٠٣)بەدواوەزیاترسەری هەڵداوە کەژیان وژینگەی لێ پیس کردین وهەرلەزیادبوونیش دایە لەبەشێوەیەك ژمارەیەکی زۆرلەوانەی دوچاری(ڕەبوە)و تەنگەنەفەسی بون دەبرێنە نەخۆشخانەتادێت خەڵکانی تریش لەداهاتوودا تەنگەنەفەس دەبن،وەلەلایەکی تریشەوەناچاربوین هاوینانیش لەزوری زستانان بخەوین!کاتێ کارەباش لەنیوەی شەودا بۆماوەیەك ئیسراحەت ئەکات و ئەخەوێ ئێمەگیانمان سەرئاوئەگەڕێتو ناخەوین لەئای بۆدڵی سافی باپیران بۆ ژینگەی پاکی جاران..بۆخۆشیەکانی هەواوباران، سالانی زووسالی ڕۆژێك دنیاغوباروزەردبوایە دەیانگوت پیاوێکی گەورەکۆچی کردووە یان غەزەبی خوایە یان...،بەلام واماوەی چەندساڵێکە بەردەوامەولەزیاد بوندایە ئەتەنها دەیگێڕنەوە بۆوشکەسالی،بەڵێ وشکەسالی هۆکارێکی سەرەکیەبۆ دیاردەی خۆڵبارین،بەلام هۆکاری لەوەلەپێشتروگرنگتربلاوبونەوەی فەسادوخیانەت و گەندەڵی ورژانی خوێنێکی

زۆربەناحەق لەعێراقداکەهۆی سەرەکیەبۆئەوەی خواوەرزەکانمان لێبگۆڕێ! بۆلادان وخراپە کاریەوەهاتونەتەکایەونوسەرانی ئیسلامیش پێیان عەیبەباسی لێوەبکەن لەبەرتانەی بەرانبەریان وهەرتەنهاباس لەوشکەسالیەکەی دەکەن، بەلگەیەکی تریشم بۆپشتیوانی قسەکەم ئەوەیەکە ئەگەرسالانی ڕابردووش وشکەسالی بوو بێ خۆسالی(٢٠٠٩)بارانێکی باش باری وگیاوگولی بەهاریش زۆربوو!لەگەل ئەوەیشدا لەم وەرزی تەڕی و توشی قوڕەدا خۆلبارین هەر لەزیادبوندابو!لەنوێژی نیوەڕۆداخۆردیارنە دەماو دنیا تاریك دەبو؟!ئەگەرئەلێ هی بیابانی خواروی عێراقەوشکە،دەی لەدێر زەمانەوەبیابانی ڕومادی وخواروی عێراق هەرئەولەوشکەبووەو هەرگیزڕەق نەبووەنەیشهاتوەبۆکوردستان،ئێستا بۆچی بەهۆی شەپۆلی هەواوە بەرزی دەکاتەوەودێتە ئاسمانی ناوچەکە لەئەگەرلەبەرگۆڕانی وەرزەکان نەبێت بەهۆی گۆڕانی خەلکەوەبەرەوخراپە!چارەسەریش گەڕانەوەیە بۆخاوەنی هەواوخۆل و باران کەخوایە، وەك ئەوپیاوەی وتی بەکورەکەی ئەگەرکۆمەلێ سەگت بۆهاتن چی ئەکەی؟وتی بەرەنگاریان دەبمەوە لێیان ئەدەم، باوك:ئاخر ئەوەزۆر دەکێشێ ولەوانەیەسەرنەکەوی، بەلام ئەگەرپەنا بەری بۆخاوەنی سەگەکان کەشوانەکەیە بەئاسانی لەکۆلت دەکاتەوە(**وَلِلَّهِ المَثَلُ الأَعلَى**)، ئێمەش ئەگەربەڕاستی پەنابەرین بۆخواولێی بپاڕێینەوەئەوا ڕزگاردەبین لە دیاردەی وشکە سالی وخۆلبارین کە بێزارین،ڕەحمەت لەپێشینان کەلە پاڕانەوەیاندا وتویانە: (خوایە فەسلمان لێ نەگۆڕی)

**معجیزەیەکی قورئان بۆپیسبوونی ژینگەی ژیان:**

لەکۆنفرانسێکدالەفەرەنسالە(٢ی فبرایری ٢٠٠٧)زیاترلە(٥٠٠)زاناەبەیەك دەنگ بڕیاریاندا یەکەم: ریژەی پیسبوونی ژینگە لەدەریاووشکانیداگەیشتوەتەرادەیەك لەمێژوو داشتی وانەبووە،کەدەبێتە مایەی بەرزبونەوەی پلەی گەرمای زەوی.

دووەم: مرۆڤەکان بەرپرسیاری یەکەمن لەشێواندنی هاوسەنگی ژینگە،بەهۆی جەنگەکان وپاشماوەی کارگەکان وئامێرەکانی وەك ئۆتۆمبیل...هتد،کەرێژەی کاربۆن ئێستالەهەوادا دەئەوەندەی کاربۆنەلە(٣٠٠)ساڵ بەرلەئێستا.

سێیەم: کۆنفرانسەکەداوای لەهەموودەوڵەتانی دونیاکردفریای ئەم حاڵەتە بکەون وزەوی لەتیاچوون رزگاربکەن،(کەنایکەن)!

بەراستی ئەوەش بەڵگەیەکی ترەلەسەرگەورەی قورئان کەئاماژەیەکی لەم جۆرەی تێدایەو دەفەرمویێت(ظَهَرَالْفَسَادُفِي الْبَرِّوَالْبَحْرِبِمَاكَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)،ئایەتەکە باس لەدیاردەیەك دەکات کەپێش ترنەبووە(ظَهر)بۆشتێ بەکاردەهێنرێ کەتازەپەیدابوبێ،وپاشان لەو کۆبونەوەیەدا پیسبوون وشێواندنی دەریاکانووشکانی دەخاتە پاڵ مرۆڤ،بەهۆی پاشماوەی کارەکانی دەستی مرۆڤ(بِمَاكَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ)دوایش ئینزاریان دەکابەسزایەك بۆتەوەی بگەرێنەوە(لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)،پاکی وگەرەیی بۆخاوەنی ئەم قورئانەکەخوایەتازیاترخوێندنەوەی زانستی ومەعریفی بکرێ معجیزەو گەورەیی ئەم قورئانەدەردەکەوێ کەلەلایەن خواوەیە.

---

*وتاری تایبەت بەرۆژی جیهانی ژینگە(٦/٥)هەموساڵێ

*ئەم وتارەم ساڵی(٢٠١٢)لەماڵپەری فەرمانگەی ژینگەی سلێمانی دابەزیوە.

# ئاسودەیی وئارامی هەوێنی ژیانە

گرنگـی ئـەمن وئـەمان ئـارامی وئاسایـشی ژیـان پێویـستەلەئاونان،بۆیەکاتێ حـەزرەتی ئیبراهیم بەفەرمانی خواچووبۆدروستکردنی کەعبەلەوشـوێنەی ئێستا کەچۆڵ ووشـك ویـێ ئاوبو،خێزان وتاقەکورەکەی جێ هێشت،لەپارانەوەکەیدا دووداواکاری سـەرەکی لـەخوداکرد، یەکەمیان: ئاسایش(وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا،خوایەداواکارم ئاسودەیان بکـەی دووەم/ (وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ..البقرة /١٢٦)رزق ورۆزی وبـەروبوم ببەخشەبەدانیـشتوانی، ئەگەرسەرنج بدەی حـەزرەتی ابراهیمﷺ لەسـەرەتاداوای شتێکی کردکەسەرچاوەی خـۆش گـوزەرانی ژیانەئـەویش ئـەمن وئەمانـە(نـەك بـەئاودانیرەی ئـەمن)هەرئەوەشـەکەنزاکەی وەرگیراوەلای خواوکەعبەی پاراستوە لـە ئاژاوەوئاسـراوەبەولاتی ئـەمین(بلدالامین)پاراستی لەهێرشی ئەبرەهەبەباڵندەی تایبەت ئێستاش ئەوراستیەوەك موعجیزەئـەبینی لـە ئاشتی وئاوەدانی مەککەی پیرۆز،تەنانەت لەئاخیرزەمانیـشداسوپایەك لەعێراقـەوە دەڕوابۆرووخـانی کەعبـە کـاتێ نزیـك دەبنـەوەخوای گەورەبەزەویدادەیانباتەخواربۆیـەخوای گـەورە جـەخت دەکاتەوەل سەرقورەیشیەکان وسەرجەم موسڵمانان کەتەنهابەندایەتی پەروەردگاری ئەو ماڵە بکەن(خودای کەعبە)(فليعبدوارب هذاالبيت)کەبەهۆیـەوە ترسـیان ئەماڵەبرسیەتی وشـەڕو ئاژاوە،(الذى أطعمهم من جوع وأمنهم من خوف) ئەوخوایەی کەتێری کردن لەپاش برسیەتی وئەمن وئەمانی پێدان وکەوتنە ژیـانی ئـارامی وئاسایـشەوەورزگاربون لـەترس وتۆقانـدن، بێگومان پێچەوانەی ئاسایش وئارامی ترس وتۆقاندن وتوندو تیژییەکەدەبێتە هـۆی رێگـری لەهاوردە کردنی بژێوی ژیان سەرئجام برسیەتی ونەمان،نمونەیەکی تری قورئـانی(وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًاقَرْيَةًكَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَارِزْقُهَارَغَدًامِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَاكَانُوا يَصْنَعُونَ) ١١٢/النحل،خـوای گـەورە وێنـەمان بۆدێنێتەوەبەشـارێکی ئاراموئاسودەکەبەهۆیەوەلەهەمولایەکەوەرزق و ڕۆزیان بۆدەهاتوزۆرلـەژیانێکی خۆشـدابون، تاناشـکوربوون بەنیعمەتـەکانی خـواو کەوتنەخراپـەکاری،خواش بـەرگی تـرس وبرسـیەتی

بەبەرداکردن بەهۆی کارو کردەوەی خۆیان،ئێمەی کوردی موسڵمان لەڕابردووناخۆشیمان زۆربینیوە (ترس وبرسیەتی ودەربەدەری)پاشان خوای گەورە دەروی لێکردینەوە، تاقی کردینەوە،دەبیالەبیرمان نەچێتەوە تادوبارەنەبێتەوە،باناشکوری وخراپەنەکەین تالەدەستمان نەچێت،چونکەنیعمەتەکان بەسوپاسگوزرای وشوکرانە زیاد دەکەن بەردەوام دەبن(لان شکرتم لازیدنکم...)باقەدری نیعمەتەکان بزانین لەئیمان وئیسلام لەئازادی وهەرزانی لەئارامی و ئاسودەیی ...هتد،ئەوەش بەپابەندبون بەئیمانداری وخواناسی دەکرێت کەسەرچاوەی هەمووخێرێکە، (وعد الله الذین امنواوعملوا الصالحات....)خوا پەیمانی داوەبەبڕواداران کە کردەوەی چاکەدەکەن،یەکەم:لەسەر زەوی دەیانکاتە جێنشین وکاربەدەست ودەسەڵاتدار، دووەم: وەترس و ناخۆشیان بۆدەگۆڕێ بەئارامی و ئەمن وئەمان، بەمەرجێ(یعبدوننی ولا یشرکون بی شیناً)خواپەرستن وشەریکی بۆبڕیارنەدەن کەواتەئاشتی و ئارامی دنیاودوا ڕۆژلەتەقواونیمانداریدایەکەهەستکردن بەنیعمەتەکانی خواشوکرانەی تێدایە،سەرەڕای ئەوەش دەبیستین بەنەزانی یان بەشەیتانی ئیسلام تۆمەتباردەکەن بەترس وتۆقاندن بەتوندو تیژی!کەیەکێ لە ناوەکانی خوای گەورە(السلام)ەواتەئاشتی وسەلامەتی،لەرێگەی دووهۆی سەرەکیەوە لەم ڕۆژگارەدادەتوانرێ ئارامی وئاسایش بۆگەلەکەمان دابین بکرێت ئەوانیش:

١)حکومەت لەڕێگەی پەروەردەوفێرکردن وسەروەری یاساوە،بەتایبەت پەروەدەیەکی ئیمانی،بەلاّم ئەگەروانەی دین پەراوێزخرابوو پەروەردەی ئیسلامی لەکۆمەڵگەی ئیسلامی نەبوونەوادزی وخیانەت وزیناومادده هۆش بەرەکان پەرەدەسێنێت وبەئازادی پێشکەوتنی دەزانن بەوەش وڵات وێران دەبێت وکۆنترۆڵ ناکرێ لەکاتێکدا هەمومان دەڵێین(خۆپاراستن باشترەلەچارە سەرکردن)وادەڵێین بەلاّم نایکەن!خۆهەمولایەك کۆکن لەسەرزیانی ماددە هۆشبەرەکان وجگەرەوقومارونەی بۆرەواجی پێ ئەدرێ زۆرهەرزان وئاسانە!

٢)میدیاوڕاگەیاندنەکان کاریگەری سەرەکیان هەیەبۆئاراستەکردنی کۆمەڵگا بەهەرلایەك بیانەوێ،بەداخەوەئەوانەی ئێمەزیاترهاندەری کلتوری ترس وبیم ونائارامین بەچەندبارە

کردنەوەوگەورەکردنی هەواڵی کوشتن وبڕینە،دراما دۆبلاژکراوەکانیش لەناویاندادژایەتی وشەڕەشمشێروتۆڵەسەندنەوەیەتادەگاتە فلیم کارتۆنی منالأنیش لەجیاتی پەروەردەوفێر کردنی جوان پڕیەتی لەڕاوەدونان وفێڵکردن وەك لەمشك وپشیلەدادەبینرێ لەوەش کاری گەری سلبی دەخاتەسەربینەرانی بەتایبەت هەرزەکاران بەچاولێکەری دوبارەکردنەوەی ڕاگەیاندنی چەواشەودرۆکۆمەڵگادوچاری لادان وهەڵدێردەکات،کەدەبینی پێشبڕکەدەکەن لەپیشاندانی ئافرەتی ڕووت وڕەواجدان بەحەرام بەوەیش ئاگرلەکۆمەڵگابەردەدەن، بەداخەوە زۆربەیان دورن لە شەرم وحەیا،گەنجێ پەروەردەنەکەن ئامادەیەخیانەت بەدایك وخوشکی خۆی بکات، لەجیاتی ئەوەی ڕاگەیاندنەکان بەئەمانەتەوەڕوداوەکان بگوازنەوەونوێنەری گەلەکەیان بن کە ٩٠٪ی موسڵمانە،بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاوبگرن نەك بەرژەوەندی حیزبی،جابۆبڵاوکردنەوەی ئاشتی ونارامی کەمکردنەوەی توندو تیژی پێویستە لەسەر حکومەت زیاترگرنگی بدات بەلایەنی ئاینی وکۆمەلأیەتی وسەروەری یاسا،چونکەکێشەکان تەنهابەهێزچارەسەرنابن وبگرەکاردانەوەی لێ دەکەوێتەوە،وەکاراکردنی زیاتری دادگاکان بۆیەك لایکردنەوەی زوتری کێشەکان،چونکە زۆرێك لەدۆسیەکان بەساڵ ودووساڵ دەمێننەوەو تەواونابن بەوەیش خەلکی بێزاردەکەن وناچاردەبن پەنابەرن بۆچارەسەری ترلەکۆتایدادەبێ لەوەدڵنیابین کە ئەوەی لەخواغافڵ بێت دوچاری سزای خوایی دەبێت،بۆهەموزاڵمێ زەواڵێك دەنێرێ،خوامۆڵەت دەدابەستەمکاربۆماوەیەك خۆیی وگەلەکەی تاقیدەکاتەوە بەلأم کەگرتی بەری نادا(ان الله يُمهل ولايُهمل)وەك لەبەهاری عەرەبیداولەعێراقیشدابینران چۆن سەرانی ستەمکاربونەپەندی زەمانە! خوایەداواکارین ئیسلام وئیمان،ئەمن وئەمان بەرجەستەبکەی لەکوردستان.

---

* ئەم وتارەم لەکەناڵی ئاسمانی پەیام بەرنامەی(بەرەوڕوناکی)پێشکەشکردلە(٢٠١٢/١١/١٨)

## خۆپاراستن لەدڵەڕاوکێ (چارەسەری وەسوەسە)

ڕاڕایی وقەلەقی ئەوهەستەیەکەبەهۆی خەموپەژارەوەتوشدەبێت،بەتایبەت لەکاتی ترسان و بیرکردنەوە لەکارێکی داهاتو:(ئەگەرشکستت هێناچی؟ئەگەرڕەتیان کردەوەچی؟ئەگەر ...) کۆمەڵێك خەیاڵات وبیروئەندێشەی خراپ خۆیان ئەکەن بەناوئەقڵدا،جاچۆن ژیانت ئاسودە دەبێت کەلەناختداڕاڕایی هەبێت؟سەرەنجام چەندین نەخۆشی جەستەیی وەك(بێ خەوی، ژانەسەر،پشت ئێشە)بەدوای خۆیدادێنێ،سەرەڕای ترس وبیم وشپرەزەیی وپەشۆکان و خەفەتباری وخۆبەکەمزانین لەناوهاوڕێ وخێزان وخراپ جێبەجێکردنی کارە کان،لێکۆڵەرە ئەمریکیەکان لەزانکۆیەکی کالیفۆرنیابۆیان دەرکەوتووە کە ئەوانەی دوچاری وەسوەسە و دڵەڕاوکێ بون زیاترلەخەڵکی تربەڕێژەی(٤٠ /٠)دوچاری نەخۆشیەکانی دڵ دەبن وەك جەڵتە،بۆخۆپاراستن وسەرکەوتن بەسەرئەم نەخۆشیەدەرونیەدا. بۆگەیشتن بەدڵێکی خۆش وژیانێکی باش تکایەئەم پێنج هەنگاووهۆکارەبەکردەیی بەکاربێنە:

١ـ لەهۆکارەڕاستەقینەکانی ئەم دڵەڕاوکێیەبکۆڵەوە.

بڕیاردانی هەڵەبوە،نەبونی کات بوە،نەبونی پارەبوە،پیریە،کارەکەت بەخراپی کردوە،خەفەت لەشتی ڕابردوە،یان ترسانەلەداهاتو؟یاترس وتۆقینە....!؟

٢ـ چارەسەرەکانی دەستنیشان بکە،پێشنیاری(بەدیل)ئەوجێگرەوانەبکەکەلە بەردەستدان، بیروبۆچونەکانت کۆبکەرەوە،پرس بەکەسی دڵسۆزوشارەزا وپسپۆڕبکە،لەهاوڕێی ڕاڕاودوودڵ دوربکەوە،کاتەکانت ڕێك بخەو بەرنامە و نەخشەڕێگادیاری بکە..

٣ـ بۆچون وتێڕوانینێکی دیاریکراوت هەبێت بۆتامانجەکانت،پشت بەستن بەخوا،متمانەبە خۆبون،متمانەبەخۆبوون واتە هەوڵدان بۆگەیشتن بەخەون وئاواتەکان،گەورەترین توانالەبڕوا بەخۆبوندایەبەپشتیوانی خوا،

٤ـ ئازایەتی بوێری خۆت بنوێنە دامەمێنە،بەگۆڕینی ڕێگاوشێوازی بیر کردنەوە

گۆڕینی کرداروگوفتارت،ڕەشبین مەبەوگەشبین بە.

٥ــ بەکێشەوگرفتەکانەوەسەرقاڵ مەبە،چونکەکاتێك دێت ئەوان بەسەردەچن،ئایادەگونجێ ئەوکێشەیەبەهەوڵدان نەگۆڕێت؟چارەسەرنابێت؟

سەرەڕای ئەمانەش لەبیرت نەچێت:کەسەرچاوەیەکی تری ئەمانە (شەیتانە) کەبەردەوامەلە دژایەتی خۆی بۆموسڵمانان،لەفەرموودەی پێغەمبەرداهاتووەکە {شەیتان دێتە لای کەسێکتان ودەپرسێ کێ تۆی دروست کردووە؟ئەویش دەڵێ:(الله)،پاشان دەپرسێ ئەی کێ خوای دروستکردووە؟جاگەر یەکێکتان شتی لەوجۆرەی هات بەخەیاڵداوئەوحاڵەتەی بینی بڵێ :(امنت باللهِ ورسلهِ) واتە ئیمانم هەیەبەخواو پێغەمبەر،بەوقسەیەشەیتان وازدێنێ} بڵێ:(اعوذ باللهِ من الشیطانِ الرجیم)،شیفای ئەم بارە دەروونیەتەنهالەبیروباوەڕی دامەزراو دایە (بیروباوەڕ ژیانە)جگەلەزیانی دەرونی وفیکری،ئەم حاڵەتەکاریگەری خراپی هەیە لە سەرتەندروستی لاشە،لەهەڵوێستەکانی پێغەمبەرﷺکاتێ بینی یەکێ لە هاوەڵان لە مزگەوت دانیشتوەوکاتی نوێژیش نەبو،پرسیاری لێکردبۆلێرەی؟ هاوەڵەکەش وتی بەدەست خەم وقەرزاریەوەدەناڵێنم..،پێغەمبەرجێی نەهێشت تاچارەسەری بۆدۆزیەوەوفەرموی:ئەم نزایەبخوێنە(اللهم انی اعوذبك من الهمِ و الحزن،والعجزِوالکسل،والجبنِ والبخل،ومن غلبةالدین وقهرالرجال)کەپەناگرتنەبەخوا لەخەم وپەژارەودەسەوستانی وقەرزداری، بۆچارەسەرروزگار بوون لەوەسوەسە ودودڵی وبیروخەیاڵی خراپ جگەلەوخاڵانەی سەرەوەئەم چەند هەنگاوەش بنێ بەسودوکەڵکن.:

* بەشتێکی ترەوەخۆت سەرقاڵ بکەودووریکەوەلەوبیروخەیاڵەچون ئەوە ڕێگەیەکی شەیتانە بۆدژایەتی کردن،لەژیانی هاوەڵانداخەمۆکی جێگەی نەبۆتەوەچونکەبەردەوام سەرقاڵبون و کاتەکانیان پڕکرد‌بۆوەبەگوێڕایەڵی ویادی خوای گەورەوهیوابون بەڕەحمەت وبەزەیی ورەزا مەندی خوا.

* بیرکردنەوەلەدروستکراوەکانی خوا،لەنیعمەتەکانی خوابەسەرمانەوە،نەك بیرکردنەوە لە

زاتی خوا،چونکەئەوەبابەتێکی زانستی وتایبەتەلەعەقیدەی ئیسلامیدا بڕاوەتەوەومەلەوانی خۆی دەوێ لەوبوارەدا .

* خوێندنی سورەتەکانی(اخلاص)واتە:(قل هوالله احد)وە(قل اعوذ)وەکان واتە سورەتی (الفلق ،الناس)وزۆریادی خوابکات،خۆسەرقاڵکردن بەئیش وکاری بەسود،وەك خوێندنەوەی زانست وزانیاری،چونکەزۆربەی گرفتەکانی ئێمە لەبێ ئاگایی ونەزانینەوەیە، هەرئەوەشە دەبێتەسەرچاوەی خەم وخەفەت وکێشە دەرونیەکان،مسوڵمان زانست وزانیاری وکاری ڕۆژانەی وهەرچی دوچاری دەبێت بەشێکە لەبەندایەتی وبەوەش دڵخۆش دەبێ وخەمەکانی دەڕەوێنەوە.

# بــــەکارهێنانی دیـــن بۆبەرژەوەنـــدی ژیـــن

بێگومان ئاینەکان بۆڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان هاتوون لەدنیاودوارۆژ، دنیاکێڵگەی دوارۆژە چی بچێنی ئەوەدەدوریتەوە(الدنیامزرعة والاخرة) بۆیەدەبێ موسڵمان بۆهەر دوکیان هەوڵبدات وپیاوی دنیاودوارۆژ بێت،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(لیس الرجل رجل الدنیاولیس الرجلُ رجل الاخرة،بل الرجلُ رجلٌ الدنیاوالاخرة)کەواتەپیاوی تەواو ئەوەیەکە پیاوی دنیاودوارۆژ بێت،تەنانەت بەرژەوەندی قیامەتیش لەرێگەی دنیاوە بەرجەستەدەبێت هەربۆیەوەك بەڵگەیەکیش گەرسەرنج بدەینەفیقهی ئیسلامی داوامان لێدەکا کەموسڵمان دەبێ پیاوی دنیاودوارۆژبن لەسەررێبازی ئیسلامی، بەڵگەمان ئەوەیەکەفیقهی ئیسلامی چواربەشەوسێ بەشی بۆڕێکخستنی کاروباری ژیانی دنیایە ئەوانیش بریتین لە(معاملات ومناکحات وجنایات) تەنهابەشی (عیبادات)بۆنهێنییەکانی قیامەتەکە ئەویش هەندێ بەرژەوەندی دنیای تێدایەوەك سودەکانی تەندروستی رۆژو بیرکەوتنەوەی هەژاران،یەکریزی و یەکترناسین و خۆشەویستی بەهۆی تێکەڵی بەردەوام لەنوێژی جەماعەت، ئەمەش وەڵامەبۆئەوانەی کە دەڵێن ئیسلام تەنهاشتێکی رۆحیەو لەنێوان بەندەوخوادایەوپەیوەندی بەژیانی دنیاوە نیەبەلاّم ئەوشێوازەدینداریەی کە ئێستاباوەتەنهاعیبادەتی شەخصیەولەبەینی بەندەوخواداولەناوچواردیواری مزگەوتدا، گوێ نادات بەدەرەوەی مزگەوت لەبەرێوەبردن وپەیوەندی مرۆڤەکان ئەوەرێك بەجێ هێنانی بانگەشەی عەلمانیەکانەکەدەڵێن:دین جیایە لەژین! پەنابەخوالەژیان ودەوڵەتی بێدین!بۆیەکەمن ئەووتاریێژانەی باسی چاکسازی کۆمەلایەتی وگرفت وقەیرانەکانی رۆژگاروپرسەچارەنوس سازەکان یان پرسەنەتەوەیی وگۆڕانەئیجابیەکان وپێش کەوتنە کان بکەن، رۆژگارێك بووەکە عەرەب وتورك لەرێگەی سیستمی ئیسلامیەوە پێشرەویان لەجیهانداکردوەودەوڵەتی گەورەبون، پاشان بەهۆی رەگەزپەرستی و قەومایەتی دور کەوتنەوەلەرێنمایەکانی ئیسلام

بۆعەلمانیەت ونەتەوەپەرستی هێزوپێزیان نەماوبچوك بونەوە تاناستی کەمترلەقەوارەی زایۆنی!لەکوردا بنەماڵەی ئەیوبیەکان توانیان(٨٠)ساڵ بەئاین خزمەتی گەلەکەیان بکەن و بمێننەوە،لێرەدادەپرسین ئەی بۆچی کوردنەیتوانیوە لە ڕێگەی دینەوەبە مافەکانی خۆی بگات؟کوردبەشی هەرەزۆری سوننەیەوسوننەش گەورەترین وڕاسترین تایفەی ئیسلامە،لەبەرئەوەی کەهەمودینەکەبچوك کراوەتەوەلە چەند دروشم و فەڕزەکانی ناومزگەوت وگرنگیدان بەفیکری تەسەوف ودەمارگیری نەتەوایەتی و عەشیرەت وبنەماڵە ئەوەندە گرنگی نەدراوەسوننەگەری،ئەوەتاشیعەکان بەهۆی شیعەگەری گەیشتنەدەسەلات بەلام ئێمەی سوننەخزمەتێکی ئەوتۆمان نەکرد بۆگەلەکەمان،چونکە کورد سوننەیەکی سۆفی مەشرەبەومام سۆفیش زیاترجەخت دەکاتەوەلەسەردور کەوتنەوەلەدنیاوباسی قەبروقیامەت کەهەرئەوەبووکاتی خۆی دەوڵەتی عەبباسی وعوسمانلی روخاند،ڕۆشنبیری سۆفیگەری دەڵێ دنیا پێنج ودوو ڕۆژێکەوسبەی قیامەتە پێویست ناکات ئەوهەموخەڵکەی بۆبەکوشت بدەین وشۆرش بکەین،دیارەئەوەیش لەبەرژەوەندی ومانەوەی دەسەلاتە ستەمکارەکانەوبۆیەئەوانیش بەردەوام پارەیان بۆهەڵڕشتون وپشتیوانیان کردون چونکەزەرەدیان نیەبۆپەزەکانی ئەوان،بەوەش خزمەت بەپرسی ڕەوای نەتەوە ناکرێت بۆرزگاربوون ومافی چارەنوس، بێگومان کەس لاری لەتەزکیەی نەفس نیەلەژێرهەرناوێکدابێت بۆتاکەکان پێویستەو بەسودە،بەلام فیکری سوننەگەری بەوشێوەنیەوبازنەیەکی فراوانەوئەوان شۆرش لەدژی ستەمکاران بەپێویست دەزانن وسەرکەوتن یان شەهیدی لەوپێناوەهەڵدەبژێرن هەردو کیان چاکن،بەلام ئێمەبۆخۆمان ڕۆشنبیریەکی وامان هەڵبژاردووەکەدژی بەرژەوەندییە کانی دنیامانە،بەلام خەڵکی تر ڕۆشنبیریەفقهیەکەی هەڵبژاردووەکەسوننەگەریە بۆیە سودی زیاتری لە ئاین وەرگرتووەبۆدنیاودواڕۆژ،ئێستاش ئەگەربەنیەتێکی ڕاست و دروست بێت هیچ ڕێگریەکی شەرعی نیەکەئاین بەکاربێنن بۆبەرژەوەندی کوردو

کوردستان وهەربەوەش سەردەکەوین چونکەلەناو خۆماندا هەموان دەکاتەبرای یەکتر بەپێچەوانەی ئەم پەرتەوازەییەی ئەمڕۆوەلەگەڵ تورك و عەرەب وفارسیشدا دەتوانین بەدەمی خۆیان بیانگرین کەئەوانیش خۆیان بەموسڵمان دەزانن برایەتی ئیمانی دروست بکەین، بەڵام بەدەمارگیری و نەتەوەپەرستی ناگەین بەهیچ،وەخۆشەویستی گەل و نیشتمان یان بڵێین کوردایەتی لەسەربنەماکانی شەرع بەشێکەلەدینداریمان هەرکەس لە سەر ماڵ وناموس وبەرگری لەخەڵك وخاك بکوژرێ شەهیدە گەربڕواداربێت ولەسنوری شەرعدا بێت،شتێکی ئاشکرایە ئەگەر دەوڵەت ودەسەلاتت نەبێت ناتوانی حوکمەکانی شەرع جێ بەجێ بکەی وستەمکاران دادگایی بکەی ئەگەرحوکم حاکمیەتت نەبێ دەستی ستەمکاری پێ ببەستی ناتوانی عەدالەت بچەسپێنی،ئامانجی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش پراکتیزەکردنی عەدالەتەوبەرجەستەکردنی ڕەوشتەجوانەکانە، کەبەوەش ئاشتی ئارامی بەرقەراردەبێت.

# جەژنی قوربان

## ڕۆژی ڕزگاری مرۆڤەکانە...هێمای خەبات وبەرخۆدانە

ئەگەرلاپەڕەکانی مێژووهەڵبدەینەوەوسەرنج بدەین لەحیکمەت وفەلسەفەی ئەنجامدانی قوربانی،دەگەینە ئەوڕاستیەی کەبەهۆی لادانوتاوانی مرۆڤەکانەوە بوە،بۆیەلەپێناو پاراستنی ژیانی مرۆڤەکان خوای گەورە فەرمانی داوە بەقوربانی کردن،ئەوەتا هەرلەسەرە تاوەچیرۆکی دووکوڕەکەی حەزرەتی ئادەم کە یەکێکیان ستەمکاربووبۆیەکەقوربانیشی کردخوالێیی وەرنەگرت چونکەتەقوا دارنەبوکارەکەی بۆخوانەبوتادواتر براکەی خۆی کوشت وستەمیکرد، لێرەدا خوای گەورەچەمکی قوربانی بەکارهێناوەبۆئەوبەسەرهاتە، کەواتە قوربانی زاراوەیەکی قورئانیەوەك لەسورەتی(المائدة/٢٧)فەرمویەتی:( وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ)،وشەی قوربانیش لە(قُرب..قَريب)داڕێژراوەواتەنزیك،ئەوەی کەقوربانی سەردەبڕێ دەیەوێت بەکارەی لەخوانزیك بێتەوە،لەعەرەبیشدابە (اُضحية)ناسراوەچونکەسەرەتای سەربڕین لەچێشتەنگاوەوەدەستپێدەکات،وەهەروەهانەگەربگەڕێینەوەبۆژیاننامەی حەزرەتی ابراهیم(سەلامی خوای لەسەر) کەلەوسەردەمەداخەڵکەکەبت ونەستێرەیان دەپەرست، عادەتیان وابوکە مرۆڤیان سەردەبڕی بۆخواکانیان وەك قوربانی! ئەویش بەفەرمانی خواو بە کردەوە تێیگەیاندن وپێیانی وت کەئەوەنابەجێیەوشیرکە،وەك لەباسی ئەوەی کەوتی ئەونەستێرەخوامەپاشان مانگ دەرکەوت وتی ئەوەیان چاکترەوپاشان ئەویش ئاوابو خۆر دەرکەوت وتی ئەمەیان چاکتروگەورەترە،کەئاوابوفەرموی ئەگەرخواهیدایەتیم نەدات ئەوەلەریزی سەرلێشێواوان دەبم بۆیە ڕومکردە خوای هەمونەوانەکە(الله)یەوەك لەسورەتی (الانعام/٧٥ــ٨٠)باسکراوە،پاشان لەشکاندنی بتەکانیش بەهەمان شێوەبۆی سەلماندن کەئەوانەخوانین وهیچیان پێناکرێ،ئەوانیش گرتیان وخستیانەناوئاگرەوە وبەفەرمانی خوانەسوتاوپاراستی چونکەهەرکەس بۆخوابێ خواش بۆئەودەبێ،بەوەش بووبەپێشەوای ...

خواناسی وتەقواداران،پاشان کەلەوپێناوەداولاتەکەی جێهێشت بەرەو مەککە لەوێش لە بەسەرهاتی سەربڕینی حەزرەتی اسماعیلی کوڕیدائەوەی بۆ سەلماندن کەنابێ مرۆڤ بکرێتە قوربانی بەلکوهەمووشتەکان لەخزمەتی مرۆڤە کاندایە،هەرچەندەئەو ئامادەبو چەقۆی نایەملی جگەرگۆشەکەی بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوابەلام فەرمانەکەبۆسەربڕین نەبو بەلکوبۆسەلماندن وپیشاندنی ڕاستیەکان بو،وەك لەبەسەرهاتی ئاوابونی ئەستێرەکان وبت شکاندنەکاندا نیشانیدابون ئیترلەوڕۆژەوەبەئایەتی(وفدَیناه بِذبح عظیم..)خوای گەورە کۆتایی هێنابە سەربڕینی مرۆڤەکان وئاژەلْ خرایەبری ئەوە،کۆتایی هێنابەو نەریتەخراپەی کەبێ بڕوایان دایان هێنابوولوەك دەبینی ئێستاش لەسایەی سیستمی بێ بڕوایاندارڕوباری خوێن دەڕوات وجارێکی ترمێژووخۆی دوبارەدەکاتەوەومرۆڤ دەکەنە قوربانی سیاسەتەکانی خۆیان لەجیاتی بتی جاران،تەنانەت نەریتی مرۆڤکردنەقوربانی تاکەمێك پێش ئیسلامیش مابووەك لە بەسەرهاتی عبداللەی باوکی پێغەمبەردا ﷺ کەلەقورعەداناوی دەرچووبوبۆ سەربڕین وپاشان(١٠٠)حوشتریان لەبری سەربڕی،ئەوەتاکاتێ(عەمری کوڕی عاص)لە سەردەمی پێشەواعومەردامیسری ڕزگارکردعادەتی خەلکی میسر وابووکەسالانەکچێکیان دەڕازاندەوەودەیانخستەناوڕووباری نیلەوەوەك قوربانی تائاوەکەی وشك نەبێت،پێشتریش ئاشوروعەشتارەکان لەعێراق قوربانیان لەمرۆڤ دەخستەناودیجلەوفورات،عەمرنامەی نوسی بۆپێشەوا عومەر لەوبارەوە،پێشەواعومەریش لەوەلامدانامەیەکی نوسی بۆڕوباری نیل فەرموی: گەربەفەرمانی خوادێیت بەردەوامبەونەگەربەفەرمانی شەیتانی نەوەنامانەوێت ونامەکەیان خستەڕوبارەکەوەبەوەش کۆتای هێنابەونەرییتەخراپەوڕوباری نیلیش هەر بەردەوامە،تەنانەت چونەسەرقەبرانیش لەجەژندا دەرەنجامی ئەو ستەمکارییەبووکاتێ بۆیان دەرکەوت کەئەوانەی کراون بەقوربانی بۆبتەکان خراونەتەڕوبارەکانەوەناحەقی بوەوستەمیان لێکردوون ئەمجارەچوون بۆسەرگۆڕەکانیان داوای لێبوردنیان لێدەکردن،ئەینالە ئیسلامیشدا دروست نیە جەژنان بچیتەگۆڕستان وجەژن وخۆشی بکرێتەگریان وناخۆشی،دوای ئەوەی

کەزانیمان جەژنی قوربان ڕۆژی ڕزگاری مرۆڤەکانە،حەجیش کەلەجەژنی قورباندایەبەهەماز شێوەپەیامی یەکسانی مرۆڤەکانە،لەمانگی حەرام ولەولاتی حەرامداکە مەککەیە پێغەمبەر(ﷺ)لەوتاری ماڵئاوایدادووبارە ئەوەی دایەوەبە گوێی مرۆڤایەتیداکەخوێن و سەروماڵتان بەیەکترحەرامە،کەواتەئەی منالەکان ئەی گەنج وهەرزەکارەکان بزانن ئەم جەژنەهی ئێوەیە،چونکەپێشەوائیبراهیم کۆتایی هێنا بەسەرڕبرنی ئێوەوکردی بەسەرڕبڕینی ناژەڵ، ئەی دایکان وخوشکان ئەوەجەژنی ئێوەیەکەکۆتایی هێنابەجەرگ سوتانی ئێوە،لەکۆتاییدادەرکەوت کە:

جەژنی قوربان جەژنی ژیانە

ڕۆژی ڕزگاری مرۆڤەکانە..

هێمای خەبات وبەرخۆدانە..

دژی شیرک وستەم وتاوانە..

دەی پیرۆزبێت لەهەرچی موسڵمانە..

بەتایبەت خەڵکی ئەم کوردستانە.

# پەندوئامۆژگاریەکانی جەژنی قوربان

مرۆڤی ژیرلەبەرانبەرسەرجەم ڕوداوەکان هەڵوێستەدەکات وسەرنج دەدات جەژنی قوربانیش ماناومەبەستی زۆری لێدەخوێندرێتەوە،دوای ئەوەی مێژووی قوربانیت بۆدەرکەوت ئیتر ناکرێ وناگونجێ وەك داستانێك وبەسەرهاتێك تاقیکردنەوەکەی حەزرەتی (ئیبراهیم و ئیسماعیل)ساڵانەبۆخەڵك بخوێندرێتەوە وسەرنج نەدرێ لەپەندوئامۆژگاریەکانی ئەوبەسەر هاتەکەبەکورتی ئەمانەن:

١ـ حەزرەتی ئیبراهیم نمونەی باوکێکی دڵسۆزەبۆمناڵەکانی پەروەردەیەکی ئیمانی کردن و خەمی نەوەکانی دوای خۆی دەخواردوەك لەپاڕانەوەکەیدادەبینی خوامژدەی ئیمامەتی پێغەمبەرایەتی پێدابۆنەوەکانیشی داواکرد(ومن ذريتي ...)وکاتێ لەدروستکردنی بەیت بونەوەبۆخۆی وبۆکوڕەکەیشی پاڕایەوە وداوای لەخواکردکەبەدورین لەشیرك وبت پەرستی (..وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ..،ابراهيم/٣٥)، رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي ../٤٠) ئایا ئێمەتاچەند دڵسۆزین بۆمناڵەکانمان کەرۆڵەی خۆمانن لەبواری پەروەردەو فێرکردن؟ئایائێمەمافی مناڵەکانمان داوە؟کە بەداخەوەهەندێکیان ناوی هەموو گۆرانی بێژویاریزانەکانی لەمێشك دایە بەڵام لەدینەکەی بێئاگایە!

٢ـ حەزرەتی ئیسماعیل نمونەی کوڕێکی گوێڕایەڵ،ئەوەلوتکەی گوێڕایەڵی و خۆشەویستیە کەباوك بەکوڕەکەی بڵێ:لەخەومدافەرمانم پێکراوەسەرتببڕم چی دەڵێی؟کوڕنەبێ دوودڵی ووەستان چی فەرمانت پێکراوەئەنجامی بدەوەدەمبینی ئارامگرەدەبم بەویستی خوا؟وەك لە قورئانداخودالەسەرزمانی ئەوفەرمویەتی(سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ)(الصافات ١٠٢ کەسەرەنجام لەتاقیکردنەوە دەرچوو،ئێمەش هەمودەزانین ڕەزامەندی خوا لەڕازی بوونی دایك و باوکمان دایە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەماڵەکان دووچاری کێشەو گرفت بون بە دەست مناڵەکانیانەوەتائەوەی دەڵێ:بریانەبایە وکوڕەکەمان بوەبە سەرەتانی ماڵ و ئاژاوەی گەڕەك لێتاکارگەیشتوەتەئەوەکەدایك وباوکیان بکوژن بەخەنجەر یان بەتفەنگ!

٣ـ هاجەرەخاتوون نمونەی ئافرەتێکی بەهیمەت وبلیمەت:ئافرەتان دایك یان خێزانی پێغەمبەرانن ئافرەتێك لەوچۆڵەوانیەبێکەس وبێنان وئاولەگەڵ جگەر گۆشەکەیداوڕاکردنی مێوان هەردووتەپۆلکەی(سەفاومەڕوە)دابەڵکو ئومێدێك ڕەچاوبکات ودەگەڕایەوە نەبادا گورگ کۆرپەکەی بخوات،کەتەنها بەئومێدی خوابووچون کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم جێی هێشتن هاجەرەپرسیاری لێکردئایانەوەبەفەرمانی خوایە؟ئەویش فەرموی:بەڵێ،ئەمیش فەرموی: کەواتە خوازایەمان ناکات وئاگای لێمانە،(سبحان الله) لەوئیمانە؟ لەکاتێکدا ئافرەتانی ئێمەلەخشەی مشك وماروميرووئەترسن بەلام زۆرێکیان لەخواناترسن،هەر بۆیە نەهەمووشت دەترسن ،ئەوسەروەریەبووکەئێستایەکێ لەبنەماکانی حەجی ماڵی خوا ڕاکردنی نێوان سەفاومەڕوایەکەشوێن پێهەڵگرتنی هاجەرەخاتونی تێدایە،بەڕاستی ئەوە ڕێزومافی ژنانەجێگەی سەرنج وتێڕامانە،نەك وەستای میکیاج ومۆدێل وخۆدەرخستن بەلام لەناوەڕۆکداوێرانە،وەك زۆرێك لە ئافرەتانی ئەم ڕۆژگارەکەنوێژوڕۆژوودەکات بەلام پانتۆڵ و بەرگی حەرام لە بەردەکات دەڵێ مۆدیلەیان بالاپۆشی بەبڕیارێکی حیزبی دەزانی! واتە ئیسلامێکی قبوڵەکە خۆی دەیەوێ نەك ئەوەی خوادەیەوێ!

٤ـ نمونەی خێزانێکی بەختەوەردەخاتەبەرچاومان کەتەسلیم بون بەفەرمانی خوای پەروەردگار..(إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ)،خەڵکانێك هەن دینداریەکەیان کاتیەوبەئارەزوی خۆیانە ولەدینەکەی لەبیانوەیان تەنها لایەکی گرتووە(وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ....(الحج/١٠)لە کاتێکدا بڕوا داری ڕاستەقینەگوێڕایەڵ وگەردن کەچ دەڵێ: (سمعناوأطعنا)

٥ـ بۆخواژیان نەك بۆخۆژیان،بەهێزی ئیمان کاریگەرەبۆهەموان،کاتێ سەرنج دەدەی لەو هەموورووبەڕووبونەوەیەی حەزرەتی ئیبراهیم دژی بت پەرستی گەلەکەی وکەلەئەنجامدا گرتیانوخستیانەناوئاگروپاشان ناچاری هیجرەتکردن بووبۆحیجازوجارێکی ترتاقیکرایەوە بەسەربڕینی کوڕەکەی وهەڵوێستەکانی لەبەربەرچدانەوەی شەیتانوهەمووشتێکی کردە

قوربانی لەپێناوبانگەوازی یەك خواپەرستی وتەوحیدودژایەتی شیرك کەهەموو ئەمانە نیشانەی هێزی ئیمانە بۆخواژیانە(ان صلاتی ونُسُکی ومحیای ومماتی لله رب العالمین..) بۆیە خوای گەورەلەقورئاندابەئومەتێك ناوی بردوەلەوانەی بۆخواژیاون ڕێبازەکەیان بەنەمری دەمێنێتەوەوخۆشەویستیان لەدڵی باوەڕدان بەردەوامە،ئەوەی بۆخوابێ خواش بۆئەوە، (من کان لله فقدکان الله له)دەگێرنەوەڕۆژێ پاشاوەزیرەکانی دەعوەتکردبووبۆناوباخەکەی، باخەوانەکەی ناوی(موبارەك)وتی مبارەك بچۆهەناری شیرینمان بۆبێنە،کەهێنای ترش بو، دووسێ جاری ترهێنانی هەترش بون،پاشاتوڕەبو،ئەم وت هی شیرین بێنە؟مبارەك وتی قوربان نازانم کامەیان شیرینن،تائێستالەباخەم نەخواردوە! چونکەکەبومەباخەوان تۆوتت خزمەتی بکەئاوی بدە،ئەت وت لێیبخۆ لەبەڕاستی سەیرە لەدوای ئەوەی پرسی لەباخەوانەکانی ترئەوباخەوانەڕاست دەکات؟وتیان بەڵێ چەندساڵەلێرەیەلەوباخەی نەخواردوە! بەڵێ پاشای موسڵمانیش یەکسەرشازادەی کچی دەداتێ وئیتربۆخۆی بویەهەموشتێ،جاهەرکاتێ هێزی ئیسلام وئیمان غائب دەبن هیچ شتێك لەشوێنی خۆی نامێنێ وپێوەرەکان سەرەوبن دەبن بەوەش کارە ساتی گەورە دروست دەبێت لەژیانی مرۆڤەکاندا،کەدین ئەمادنیامان نابێ کەئیمان ئەما ئەمن وئەمان ئەما،وەك دەبینی لەم ڕۆژگارەدادوچاری سەدان گرفت و کێشەی جۆراوجۆرهاتون کەدەستەسانن لەچارەسەرکردنیداگەرچی لەڕووی ماددی دنیاییەوە پێشکەوتون،چونکەشتەکان بۆدنیایە..بۆخورمایە..نەك بۆخوایە..بۆیەبەرەکەت نەمایە.

٦ـ سەرەڕای هەموونەوانەش قوربانی پێمان دەڵێ کەنابێ مرۆڤ بکرێتەقوربانی بەڵکو هەمووشت لەخزمەتی مرۆڤایەتیدایەومرۆڤیش بەندەی خودایە،وەپێمان دەڵێ دەبێ سەخی بن لەماڵ بەخشین داڕاست بن لەگەڵ خودابۆخوابژین وهەموشت لەپێناوی ڕەزامەندی خوادا ئەوکاتەژیانی هەردوودنیا مسۆگەرە.

# ئامانجە گەورەکە

مەبەست لەئامانجی گەورەوڕاستەقینە،ڕەزامەندی خوداوبەهەشتی بەرینە،

ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین... ئەوەی بردیەوە سەدجارئافەرین

ئەوەش ئاواتی هیممەت بەرزانە ... هەرگیز پێی ناگا ئەوەی نەزانە

**ـ ورەبەرزی نیشانەی هێزی ئیمانە:**

ورەبەرزی،پەیمان وسوربونی دڵە لەسەرشتێ پێش ئەنجامدانی کارەکە چاك بێ یان خراپ، ورەبەرزی لەدڵەوەیە،دڵیش کەس دەسەلاتی بەسەردا ناشکێ جگەلەخاوەنەکەی،جاوەك چۆن باڵندەبەباڵ ئەفڕێ،بەهەمان شێوەش مرۆڤ بە نیەت وهیمەتی ئەفڕێ بەرەوبەرزی بۆرزگاربونی لەکۆت وبەندی مادی و مەعنەوی،(ابن قتیبە)لەهەندێ کتێبی حیکمەتدا هێناویەتی(عیون الاخبار/۳ /۲۳۱)مرۆڤی هیممەت بەرزنەگەرکەوتیش نەفسی هەربەرزی دەوێ وکەوتن وژێردەستەیی قبوڵ ناکا،وەك بڵێسەی ئاگرهەرچەندە پێی پیائەنێ تا بکوژێتەوە بەلاّم ئەوڕازی نیەوهەربەرزدەبێتەوە،بەتایبەت موسڵمان نیەت وهیممەتی لە پێش کاروکردەوەیەتی هەرچەندە بۆیشی نەکرابێ چونکە ویستویەتی ومەبە ستی بووە بۆیە بۆی نوسراوە:پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی(من هم بحسنة فلم یعملها کتبها الله عنده حسنة کاملة..)(بخاری)واتە هەرکەس ویستی بوچاکەیەك بکات وبۆی نەکرا،خوای گەورە چاکەیەکی بۆدەنوسێ،خۆئەگەرویستی بیکات و ئەنجامیشدا،ئەوە یەك بە دەتایەك بە(۷۰۰)بۆی دەنوسرێ،هاوشێوەی قیامەت وەك لەسەرەتای سورەتی(الواقعە)هاتوەلەدنیاشداخەلکی سێ تاقمەن: لەدنیادابەشێوەیەکی گشتی بەپێی هەوڵ وتێکۆشانیان خەلکی دەکرێن بەسێ بەشەوە:(۱ـ خەڵکانی ماددی دونیایی (منکم من یریدالدنیا) ،۲ـ کەسانی قیامەتی (ومنکم من یرید الاخرة)،۳ـ پیاوانی دنیاودوارۆژ(رجل الدنیاوالاخرة)،کەدووەم وسێیەمیان لەئیسلامداپەسەندەوڕێزلێگیراون، لێرەدابەکورتی ئاماژەبەهەرسێکیان دەکەین وبزانەتۆ لە کامیانی:

یەکەم: خەڵکانی ماددی دونیایی کەسەرجەم هەوڵەکانیان بۆژیانی دونیایە بۆ تێرکردنی سەروبەری خۆیانەوبڕوایان بەزیندوبونەوەولێپرسینەوەی دوارۆژنیە،(إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ)بۆیەدەڵێ حازربەقەرز نادەم ئەوانەخەڵکانی بێبڕواو ماتریالیستی وسیکۆلارین،(دنیاکەلاکی بۆگەنیوەو شێرناچێتەسەرشتی بۆگەنیو) ڕقلێبونەوە لە مردن زادەی دنیاپەرستیەکەبەهۆیەوەماڵی قیامەتی وێران دەکات وتوێشوی بۆکۆناکاتەوە، پرسیارکرالە(ابراهیمی ئەدهەم)بۆچی حەزمان لەدنیایەوڕقمان لەمردنە؟ئەویش لەوەڵامیاندا فەرموی: چونکەدنیاتان ئاوەدانکردوەوقیامەتتان وێرانکردوە،کەس حەزناکات لە ئاوەدانی بچێتەکەلاوەوویرانە،خوای گەورە سەبارەت بەژیانی دنیا فەرمویە:(وماالحیاة الدنیاالامتاع الغرور)ژیانی دونیاماوەیەکەزۆرکەموکورتەهەمووکاتێك مەترسی مردنت لەسەرە، بەهەر هۆکارێك بێ بەکارە ساتێکی کوشندەوەك، ئاگرێك،خنکانێك، نەخۆشیەك خلیسکانێك، وەرگەران یان ڕوداوی ئۆتمبێل پێوەدانێکی ژەهراوی یان فیشەکێکی وێڵ..،بۆیەدەبێت هەموکات ئامادەبین بۆ مردن بەتەقواوکردارو گوفتاری چاك،دەسکەوتەکانی دونیا کاتیەو دەروات، پارە،ئافرەت،خانوو پلەو پایە،شەهادە، ناوبانگ..،بەتەنیاجێت دەهێڵن‌و کەلکیان نابێت بۆت،پەروردگاردەفەرمووێ(وماهذه الحیاة الدنیاالالهوولعب وإن الدارالآخرة لهی الحیوان) کەواتەبەئەندازەی مانەوەکاربۆدنیابکە کەدیارە تەمەن کورتەوزووڕادەبری، وەهەوڵبدەبۆ قیامەتت بە ئەندازەی ژیان ومانەوەت تیایداکەلەچاودنیا(قەترەبە دەریایە) زەمانەدێت وڕادەبری وەکی بادی سەباوایە ..حەیف بۆوعومرەسەرفی کەین بەبێ هودەلەدنیایە،بۆتەماعی دنیاهەموی بە پەلەیەوکەسیش بەتەواوی نەیگەیشتێ،سەرنج بدەلەم بەسەرهاتەوخۆت بریار بدە لە ژیانی خۆت،ئاخۆڕاکردن بەدوای دونیا چ سودێکت پێ دەگەیێنێ، جگە لەماندوبون وبێئاگابون لەدین‌وژین...! دەگێرنەوەکوڕێك بەباوکی دەڵێت:دەمەوێت فلان ئافرەتەم بۆبخوازی کە شەیدای جوانییەکەی بووم باوکیشی وتی: ئەوکچەلەکوێیەهەتا بۆتی بخوازم کوڕی خۆم ؟کاتێك ڕۆشتن‌و کچەیان بینی باوکەکەخۆی

حەزی لێکردبۆیە بەکورەکەی وت: کوڕی خۆم ئەوکچەلەئاستی تۆدانیەوبۆتۆیاش نیە،ئەوە شایستەی پیاوێکی شارەزاوبە ئەزمونی وەك منە،کوڕەسەری لەقسەکانی باوکی سووڕما، بۆیەوتی ئەخێرشتی وانیەتەنها من دەیخوازم،ناکۆکی کەوتەنێوان کوڕو باوك! بۆچارەسەری کێشەکەیان پەنایان بردە لای مەرکەزی پۆلیس چیرۆکی خۆیان گێرایەوە بۆ ئەفسەرەکە، ئەویش وتی کچەکە بهێنن هەتا لێی بپرسین کامتانی دەوێت، کاتێك زابتەکەکچەی بینی زۆرسەرنجی راکێشابۆیە وتی:ئەوە تەنهاشایستەی کەسێکی وەك منەوبۆمن باشە کە بیخوازم! ئەوجارەکێشە کەوتەنێوان هەرسێکیان کوڕوباك و ئەفسەرەکە،هەریەکەوبۆخۆی هەولی بۆدەدا لناچار چوونەلای وەزیر،بەهەمان شێوەکەوەزیرکچەی بینی پێی باش بووبۆخۆی بێت‌وکەسی تر باسی نەکات تا لەکۆتاییداچونەلای بەرپرسی ولات‌ومەسەلەکەیان تێگەیاند هەروەك ئەوانی ترکەچاوی بەکچەکەوت حەزی لێکردوپێی وتن تەنها شایستەی کەسێکی بە دەستەلاتی وەك منە بۆیە ئەم کچە بۆمن دەبێت‌ودەیخوازم!کێشەکە زیاترگەورەبوو مشتومڕەکە زیادی کردلەبەرئەوە کچەکەوتی :تاکەچارەسەر ئەوەیە،من رادەکەم ئێوەش بە دوام داراکەن ئەوکەسەی توانی بمگرێت ئەوامن دەبمە نسیبی وئەو دەمخوازێت بەلێ ئەوە بووکچەکە رایکرد وهەموورایان کردبەدوایدا،لە پڕێکداکە بەدوای کچەکەوە بوونورایان دەکردهەرپێنجیان کەوتنەچالێکی قوولەوە،پاشان کچەکە سەیرێکی کردن‌ووتی زانیتان من کێم ؟من دونیام !!! من ئەوشتەم کە هەموخەلکی بە دوامدا رادەکەن‌و پێش برکێ دەکەن تاپێم بگەن‌و بە دەستم بێنن،لە دینەکەیان بێئاگادەبن،لە قورئان‌وسونەتەکانی پێغەمبەربێئاگا دەبن، هەتادەکەونەچالی گۆڕەوە،بەلام ناشتوانن پێم بگەن، ئیتر بیربکەوە،

بەدوای دنیادارامەکەمردن بەدواتارادەکا...ناقل کەسێکەبراکەم تەنهاکردەوەی چاك دەکا مالی دنیات گەلێ زۆرەبەردەوام کۆیدەکەیتەوە..گۆڕت تەنگوتاریکەبۆیری لێناکەیتەوە!

دووەم: پیاوانی دوارۆژدۆستانی ڕاستەقینەی خودا،پیاوچاکان کەبۆخواژیان نەك بۆخۆ،قال الامام الشافعی رَحِمَه الله،ان لله عباداً فُطَنـا..طلقـوا الـدنیاوخافوا الفتَنـا..،قـال تعـالی: (فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِوَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ،(١٨٥/ال عمـران) ئەوەی لەئاگرڕزگاری بو خرایە بەهەشت ئەوە براوەیەوسەرکەوتوە،ئەوانەکەمینەن(ثُلَّـةٌ مِـنَ الْأَوَّلِينَ، وَقَلِيلٌ مِنَ الْآخِرِينَ)زۆرێك لەپێشینان وکـەمێکیش لەپاشـینان،ئەوانەن کەهـەوڵ و هیممەتیان بۆئامانجە گەورەکەیەکەبەهەشت ورازیبیونی خودایە(ورضوان من الله اکـبر.. ) وەك لە پاڕانەوەداهاتوە(اللهم انی اسئلك رضاك والجنـة) بڕوادارانـی ڕاسـتەقینە بـەدوای شتی بەرزوبەنرخ دادەگەڕێن،بەدەسکەوتەکانی دونیای کەموکورت ناخڵەتێن،خوای گـەورە لەقورئاندابۆجومعەوعیبادەت کەتوێشوی قیامەتە فەرمویەتی: (فاسعَوا..سابقوا..) واتە: بەهەڵـەداوان پەلـە بکەن،پێـشبڕکەبکەن،کەهاغان دەدات بۆقیامـەت بەتـەماع بین،بـەلاّم بۆدنیـا دەفـەرموێ:(فامـشوا..) بەڕۆیـشتنی ئاسـایی بـۆی بـچن پەلەمەکەن،بۆئەوانـەی خەمی دوارۆژوسەفەری قیامەت دەخۆن،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمورویەتی(من کانت همه الاخره جمع الله شمله..،واتە:(هەرکەسێ خەمی دوارۆژی بێـت خـوای گـەورەکارەکانی کۆدەکاتـەوە بۆی ڕێك دەخات،دەوڵەمەندی وقەناعـەت دەخاتەدڵیـەوەو دنیابـەرەورووی دێـت وئـەویش گوێی پێ نادات، وەهەر کەسیش هـەوڵی تـەنیا بۆدنیـا بێـت خواکارەکـانی پـەرش وبـلاّو دەکات وچاو برسی دەبێت وتێرنابێ(ابن ماجە)،بۆیـە ئەوانـەدوای مردنیـشیان بەزینـدویی لەناودلاّندا دەمێننەوەو ڕێگاوڕێبازیان بەردەوامە،تەنانەت لەپاڕانەوەدا پێغەمبـەرمان(ﷺ) فێرمان دەکا بۆبەهەشـتیش داوای شـوێنی بەرزبکـەین، لەئـەبوهورەیرەوە(خـوای لێ ڕازی بێت)پێغەمبەری پێشەوامان فەرمویەتی:( لەبەهەشتدا سەدپلە هەیە،کـەخوای گـەورە بـۆ موجاهیدانی ڕێگەی خوای ئامادەکردووە،نێوانی هەریەکەیان بەئەندازەی ئاسمـان وزەویـە، ئەگەر پاڕانەوە لەخواداوای (فیردەوس )بکەن کەلە ژێرعەرشی خوایـە ئاوەکـانی بەهەشـت

لەویَ دەتەقنەوە)(بخاری)گێڕاویەتیەوە، جگەلەوەسەرنج بدەنەئەم فەرمودەیە کەلەفرسەت ا بەماندوبونێکی کەم و نیەتێکی چاکوپاك پیرەژنێکی بڕواداری (بنی اسرائیل)ئامانجێکی گەورەی بە دەست هێنا،(ئەبوموسای ئەشعەری) ئەگێڕێتەوەکەپیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئەویش ڕێزی تەواوی لێگرت،پێغەمبەرﷺوەك ڕێز گرتن،پێی فەرموو‌پێداویستیت چیەبیلێ؟ئەویش وتی:حوشترێك بەبارەوە هەندێ بزنیش کەخێزانەکەم بیدۆشێ،پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی: ئەوە ناتوانن وەك پیرەژنەکەی ناوبەنی ئیسرائیل بن؟ هاوەڵانی پرسیان:ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)!مەسەلەی پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل چۆن بووە؟ ئەویش فەرمووی: کاتێك حەزرەتی موسا لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیل ویستی لە میسردەربچێت ڕێگەکەیان ونکرد، موسافەرمووی:ئەوەچیە(بێ حیکمەت نیە)وچی بکەین بۆدۆزینەوەی ڕێگاکە؟زاناوشارەزاکانی ناویان وتیان:ئێمە شتێکت بۆباس دەکەین لەم بارەوە،(ئەویش گوێی بۆگرتن) وتیان:کاتێك یوسف وەختی مردنی هات،پەیمانی لێ وەرگرتوین کەلەمیسردەرنەچن بەبێ ئەو، (جەستەکەی) لەگەڵ خۆیان بەرن وجێی نەهێڵن،موسا(سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی:جاکێ ئەزانێ گۆڕەکەی لەکوێدانێژراوە؟ ئەوانیش وتیان: کەسمان نازانین گۆڕەکەی لەکوێدایەجگەلەپیرەژنێك؟موساپێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)ناردی بەدوایداوپێی فەرموونشوێنی گۆڕەکەی یوسفمان پێ بڵێ، پیرەژنەکەوتی:بەڵلاهی پێت ناڵێم تاپاداشتەکەیم نەدەیتەوە موسافەرموی پاداشتەکەی چیە؟پیرەژنەکەوتی:داوام بۆبکەیت کەلەبەهەشتدا ببمەهاوڕێت ولەگەڵ تۆدابم!بەلاّم پێغەمبەرموسائەمەی پێناخۆش بوو،نەیتوانی وەعدی بەهەشتی پێ بدات،بەلاّم خوای گەورەنیگای بۆناردکەپەیمانی بدەرێ (ئێمە بۆت جێبەجێ دەکەین)ئەویش داواکەی بۆجێبەجێکرد،پیرەژنەکەش بردنی بۆلای دەریاچەیەك،کەگۆماوێکی بچوکی لێبوو ئاو تیایداوەستابو پێی وتن: ئاوەکەی خاڵی بکەن وئەوانیش دەستیان کردبەخاڵی کردنی ئاوەکە تا چالاّوەکەیان وشککردەوە،پاشان پێی وتن:زەویەکەهەڵکەنن ولاشەکەی

دەربهێنن،ئەوانیش دەستیانکردبەبەهەڵکەندن وتاگەیشتنەگۆڕەکەی ودەریان هێنایەوە هەرکە دەریان هێنایەسەرزەویەکەیەکسەردنیاوەك ڕۆژی ڕۆشناڕوناك بویەوەوڕێگەی بۆ ڕوناك کردنەوە!

پەندوئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

١- ئەبێ سەرکردەئەوەی لەتوانایدابێت بیکات،وەڕێزی خەڵك بگرێت و بەخشندەبێت،وەك ئەوڕێزەی پێغەمبەرﷺنواندی بەرامبەرکابرای دەشتەکی.

٢- سەرکردەئەبێ ورەی شوێنکەوتوانی بەرزبکاتەوەوهانیان بدابۆداخوازی چاك،وەك ئەوەی کەپێی وتن بۆچی ناتوانن وەك پیرەژنەکەی ئیسرائیل بن.

٣- سەرکردەئەبێ سەرکردە نەرم ونیان ولەسەرخۆبێت وخەڵکی تەریق نەکاتەوە،وەك ئەوەی کەپێغەمبەرﷺرویکردە هاوەڵان بۆئامۆژگاری تاکابرای دەشتەکی تەرق نەبێتەوە.

٤- ئەبێ سەرکردە(واقع بین بێ)وپرس وڕابەچواردەوری بکات وەك حەزرە تی موسالەگەڵ زانایانی قەومەکەی کردی بۆدۆزینەوەی ڕێگاکە.

٥- سەرکردەوگەورەکان دەتوانن پارەوماڵ ببەخشن بەلاّم ناتوانن وەعدی بەهەشت بەکەس بدەن وەك ئەوەی حەزرەتی موساتاخوائاگاداری نەکردەوەنەیتوانی وەعدی پێبدات،ئەمەش پێچەوانەی کاهینەکانی ئەوروپایەکەپسولەی بەهەشتیان دەفرۆشت بەگاورە داماوەکان ، لای خۆیشمان هەندێك جاردەڵێن:فلان وفیسارتان خۆش بوێت(تالویەیتە)دەچیتە بەهەشت باچاکەشت نەبێت!

٦- لەدەوڵەتی قورئانداڕێزی گەورەوپیران گیراوەپرسیان پێکراوە،ئەوەی ئێستالەئەمریکا باوەئەنجومەنی پیرانی بۆدانراوە(١٣٣٤) ساڵەلەئیسلامدا پێشتربڕیاری لەسەردراوە.

٧- جێبەجێکردنی وەسیەت،وەك بەجێهێنانی وەسیەتەکەی حەزرەتی یوسف بە گواستنەوەی تەرمەکەی.

٨ـ لەدەوڵەتی قورئاندا نابێ بنەماشەرعیەکان بۆکەس فەرامۆش بکرێت، نابینی یوسف (سەلامی خوای لەسەربێت)ڕازی نابێ ئەهرام وگومەز بەسەر گۆڕەکەیەوەدروست بکەن وەك فیرعەون وکاربەدەستەگەورەکانی ئەو سەردەمە،ئەوەی پێغەمبەری خۆشمان دوای دەوڵەتی خیلافە،پاشاکان دروستیانکردوە.

سێیەم: وەپیاوانی دنیاودواڕۆژ،ئاینی ئیسلام بۆبەرژەوەندی مرۆڤەکان هاتووە لە دنیاو دواڕۆژبۆیەداوامان لێدەکات پیاوی دنیاو قیامەت بین وەك پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:(لیس الرجل رجل الدنیاولیس الرجلُ رجل والآخرة بل الجلَ رجل الدنیاوالاخرة)واتە پیاوی تەواو ئەوەیەکەپیاوی دنیاودواڕۆژبێت،دەبێ دینی خوا بەرپابکەین،ئاین دژی ژیان وژیاری دنیانیە،چونکە قیامەت بەرهەمی دنیایە دینیش بۆبەرژەوەندی مرۆڤەکانەلەدنیاوقیامەت، کەواتەپێویستە لە سەرمان پیاوی دنیاودواڕۆژبین لەسەرینەمای دینەکەمان، جگەلە فەرمودەکە،ئەگەر سەرنج بدەینە فیقهی ئیسلامی چواربەشەوسێ بەشی بۆڕێکخستنی کاروباری ژیانی دنیایەئەوانیش بریتین لە:بەشی(معاملات ومناکحات وجنایات)،تەنها بەشی(عیبادات)بۆنهێنیەکانی قیامەتە،کەئەویش هەندێ بەرژەوەندی دنیای تێدایەوەك سودەکانی ڕۆژولەبواری تەندروستی وبیرکەوتنەوەی هەژاران و یەکریزی ویەکترناسین و خۆشەویستی لەئەنجامی تێکەڵی بەردەوام لەنوێژی بەکۆمەڵدا...،ئەمەش وەڵامەبۆئەوانەی کەدەڵێن ئیسلام تەنها شتێکی ڕۆحیەو لەنێوان بەندەوخوادایەوپەیوەندی بەژیانی دنیاوە نییە!!

# پێناسەوگرنگی چەمکی پەروەردە

**پێناسـە:** پەروەردەلەلایـەن فەیلەسـوف وبیریـاران پێناسـەی جۆراوجـۆری بـۆکراوە چـونکە چەمکێکی فراوانەبەقەدحەزەکانی مرۆڤ ورەهەندەکانی ژیانی،دەکرێ بڵێین پـەروەردە واتـە: گونجاندنی مرۆڤ بەژینگەکـەی یابریتیەلەپرۆسـەی وشیاربونی عـەقڵی ودەرونـی، کەهـەموو ئەمانەلەپێناسەکەی(ابوحامدالغزالی)بـۆ پـەروەردە جێـی دەبێتەوەکەفەرمویـەتی:پـەروەردە بریتیەلەچاکەفێربون وچاك جولآنەوە بە جۆرێك کەنزیك بونەوەبێت بـەرەولای خوا،پـەروەردە پرسی فێربونوفێرکردنە،

ئەگەرسەرنج بدەینەبنەماکانی رێبازی پەروەردەلەقورئاندالەم سێ خاڵدایە:

١) گفتوگۆلەگەڵ عەقڵدا،بەناساندنی مرۆڤ بەزاتی خۆی(اقرا باسم ربك الذی خلق)

٢) پەندوەرگرتن لەداستان ومێژوو..،حیکمەت لەچیرۆکی گەلانی رابردوو..

٣) هەڵنان وخرۆشاندنی هەستوویژدان،بەسەرنجدان لەشتەکانی دەوروبەرمان..

**ئامـانج ومەبەسـت لەپـەروەردە:**(لتغیرالسلوك)بۆگـۆڕینی هەڵـسوکەوتی مرۆڤـە لەخراپەو بۆچـاك لەچاکەوەبۆچاکترسـەرەنجام دەبێتـەزامنی پێـشکەوتنی تـاك و خێزانوکۆمەڵگا،لەوێوەئاراستەکانی گەشەکردن وبەختەوەری سەرهەڵدەدەن.

**گرنگی پەروەردە:** پەروەردەیەکێکەلەکایەگرنگەکانی پێکهاتەی ژیانی مـرۆڤ کـە بەهۆیـەوە گەشەبەخودی خۆی دەداتوپێداویستیەسەرەکیەکانی ئابوریودەرونی و کۆمەڵایەتی بەدەست دێنێ ،کەرتی پەروەردەیی هەرخێزان وکۆمەڵگایەك گرنگترین کەناڵەبۆچـاکبون ولـەباربونی ڕەوشی ئارامی وئاسایشی ودەرونی ونەتەوەیی،بۆیەلەقورئاندا پەروەردەلەپێش فێربون هـاتوە (یُزکیهم ویُعلمُهُم)،وە پەروەردەی منالّ لەتەمەنی حەوت سالّیەوە دەست پێدەکات،وە دەبـێ ئەوەلەخودی خۆتەوەدەست پێبکات﴿إِنَّ اللَّهَ لاَيُغَيِّرُ مَابِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْمَابِأَنْفُسِهِمْ﴾ (الرعد/١١)

واتە:بێگومان خوانازونیعمەتی لەهیچ گەل وکۆمـەڵێك نـاگۆڕێ ولێیـان تێـك نـادا تائـەوان خۆیان نەگۆڕن بەرەوخراپە،کەواتەپێویستەخۆمان هەولّ بدەین بۆگۆڕانوچاکسازی لەخراپـەوە

بۆچاك ولەچاكەوە بۆچاكتر،بۆگەیشتن بە بەختەوەری،بەلاَم بیرت نەچێ ئەبێ سەرەتا لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین وپاشان دەگوازرێتەوەبۆدەوروبەرتاهەموکۆمەلگادەگرێتەوە، کاریگەریوبەرهەمی پەروەردەی ڕەسەن وپەسەنەکەموسلمانی ڕاستەقینەدرۆ وغەش وفێلّ وخیانەت ناکات ولەحەرام خۆی دەپارێزێ،وەك هەزاران نمونەی سەردەمی جوانی پێغەمبەر (ﷺ)وهاوەلاَن چونکەپێشەواکەمان بەکردەیی فێریکردبون هەرکەس فێلّ بکات لەئێمە نیە (من غشنا فليس منا)وەدرۆودووڕوویی وبێ وەعدی و خیانەت لەنەمانەتدا سیفەتی دوڕوو دەغلەکانە،کەئێستا ئەوسیفەتانەبونەتە گرفت وقەیرانی سەرەکی زەمانە! ئەوپەروەردە ئیمانیەبوهاتنی بوبەخالّی گۆڕان وەرچەرخان لەژیانی مرۆڤەکان،کەقۆناغی جاهیلی گۆڕی بۆدەولەتی مەدەنی مەدینە،لەوخەلکەخراپەی پێشترنمونەی مرۆڤایەتی لێدروستکردن! هەمویان خۆیان بەبەرپرسیاردەزانی لەسەرجەم بوارەکانی ژیانیاندابەهەموجۆرەکانی بەر پرسیاریەتیەوە(بەرپرسیاری تاك وخێزان وپیشەیی تابەرپرسیارێتی بالاَ)چونکەپێشەوامان ﷺئاگاداریکردوین هەمومان بەرپرسیارین(كلكم راع و كلكم مسؤل عن رَعيتهِ)، وەبە پێچەوانەوە ئەوپەروەردەوتێگەیشتنەلاروخوارەیەکەبەناوی دیموکراسیەوەتاکرەوی دیکتاتۆری دەکرێت ولەژێر دروشمی مافی مرۆڤداجینۆسایدوکارەساتی مرۆیی دەکرێت! پیشەی دکتۆری ومامۆستای وئەندازیاری. .هتد،بۆبەرژەوەندی خودی خۆیان بەکاردێنن! وخوێندن بۆبڕوا نامەیەوبڕوانامەش بۆدامەزراندن ودامەزراندنیش بۆموچەلیان موسلمانەودرۆدەکات غەش دەکات چونکەپەروەردەی لاروخواروعەقیدەی نقصان موسلمانی نقصانی لێدەردەچێ، دینداریان عادەتەنەك عیبادەت،بۆیەکردەوەی لەگەلدانیە،سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا وزۆربونی بڕوانامەی بەرزی ماستەرودکتۆرابەلاَم بەگشتی مرۆڤەکان ئاسودەنین وژیان بوەبە ژان! ئەوەی دەیبینیی لەجوانیەکانی ژیان زیاتردروشم ودیکۆروڕوکەشە(فۆرمالیزم)ناوی بێ ناوەڕۆکە!پێشەواعلی فەرمویەتی:بێ ئەدەبی هۆکاری هەموخراپەیەکەکەزادەی بێ پەروەردەییە،چارەسەریش تەنهاپەروەردەی ئیمانیەکەلەنهێنی و ئاشکرادا یەکسان ویەك

ڕوودەبێ بەهۆی هەستکردن بە چاوەدێری خوایی (هێزێکی نەبینراو) بەسەرتەوە،بۆیەکەسێ لەگەڵ خواراست نەبێت قەت لەگەڵ خەڵکی خواراست نابێت(وَمَنْ أعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا)، ئەگەر سەرنج بدەین حیکمەت وفەلسەفەی بەندایەتی دەبینین بۆچەسپاندنی ڕەوشتەجوانەکانەکەزادەی پەروەردەی ئیمانە،عیبادەت ئەگەرکردەوەی لەگەڵ نەبێت وەرزشێکی بێگیانەعادەتەنەک عیبادەت،بەندایەتیەکان ئامانج نین بەڵکوهۆکارن بۆ گەیشتن بەئامانجێ کەبەرجەستەکردنی ڕەوشتە جوانەکانە لە دونیادا وڕەزامەندی خودایەلەدوارۆژبۆنمونەئەگەرسەرنجی نوێژ بدەی بەردەوام لە مزگەوتدا کۆمان دەکاتەوە ئەوەش مانای یەکگرتن وبرایەتی وخۆشەویستیە،خوای گەورە فەرمویەتی ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾نوێژنەونوێژەیە خاوەنەکەی لەخراپەکاری بپارێزێ، واتەببێتەخاوەنی ڕەوشتی جوان،بەهەمان شێوەزەکاتیش خوافەرمویەتی:﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾ مەبەست لەوەرگرتنی صەدەقەوزەکات پاك بونەوەیەلەحەسودی ڕەزیلی و بەخیلی وهتد،فێری بەخشین وسەخاوەتمان دەکات ئەمانەش سەرجەمیان لە ڕەوشتە بەرزە کانن،ڕۆژوش بەهەمان شێوەقوتابخانەی(صەبروصحەت واخلاقە) ئەبێ ڕۆژوگر ڕەوشتی جوان بێتوسەرجەم ئەندامانی لاشەی بەڕۆژوبن لەخراپە تەنانەت ئەگەر یەکێ قسەی پێ وت یان شەڕی لەگەڵ کردبڵێ بەڕۆژوم لوە هەروەهاسەبارەت بەحەجیش قال تعالی﴿فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾واتەئابێ خراپەکاری ودەمەدەمەبکرێ ، لەوقەرەبالغیەی حەجداراهێنانەلەسەرڕەوشتی جوان،لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ)باسی ئافرەتێ کرانوێژورۆژوی بەردەوامە بەلام ئازاری هاوسێکەی دەدات پێغەمبەر فەرموی: (هی فی النار!)لەناوئاگردایە،سەرەرای نوێژورۆژوەکەی چونکە کردەوەی لەگەڵ نەبوەچوەتەناو ئاگر،بێگومان هەڵسوکەوتی جوان لەکرداروگوفتارومامەڵەی ڕۆژانەدادەبینرێ ودەردەکەوێ (الدین المعاملة)نەك قسەو دروشمی بێ ناوەرۆك،بۆیەوەك چۆن شەوو ڕۆژ،حوکم وحیکمەت،

زانایی ودانایی. پێکەوەن وبێ یەکترناتەواون،بەهەمان شێوە مزگەوت وبازاڕ،دین وژ من (دین ودەوڵەت) پێکەوەن وناکرێ لێك جیابکرێنەوە،تەواوکەری یەکترن.

## گرفتەکانی پەروەردەلەهەرێمی کوردستان:

بەداخەوەرێبازی پەروەردەی کوردستان لەگەڵ هەست ونەستی ئێمەی کوردی موسڵمان ناگونجێ،چونکەلەتیۆری ئەوروپاورۆژئاواوەبەقەرزوسواڵ هێنراوە!

بێگومان سواڵکەروقەرزاریش شەرمەزاریە،بۆیەبەردەوام ڕوبەڕی گرفت و کێشەوخۆ پیشاندانی خوێندکاران دەبێتەوە،چونکەئەورێبازانە ئەگەرپۆشوێنی خۆیان گونجاوبن مەرج نیەبۆئێرەش بگونجێ کە(٩٥٪)موسڵمانە،وەك سیستمە سویدیەکەبۆولاتێ کەتیایدادیواری قوتابخانەبەسەرخوێنکاراندانەڕوخێ! دیارە هەرشتێ بسەپێنرێ کاردانەوەی لێدەکەوێتەوە، حوکمەتیش زیاترگرنگی بە لایەنی سیاسی وسەربازی دەدات،لەکاتێکداپەروەردەکەسێتی مرۆڤەکان دروست دەکات،گرفتەکانی پەروەردە زۆرن بەئەندازەیەك حکومەت ناتوانێ تەواوچارەسەریان بکات بۆیە دەبێ خێزانەکانیش هاوکاربن،چونکە پرسی بەڕێوەبردن لای ئێمەزیاتر ڕێنمای وەزارەت ومیزاجی حیزبوتاکەکەسەلەجیاتی یاسا!بۆیە ساڵانە گرفتەکان دوبارەدەبنەوەیان بێ چارەسەردەمێننەوە بەتایبەت:

١ـ گرفتی دامەزراندن:ساڵانەناهەنگی دەرچونوخەمی دامەزراندن دەستەملان دەبن
٢ـ گرفتی خوێندنگای نمونەیی:بەناشکراجیاوازی وجیاکاری تێدابولەخزمەتکردندا.
٣ـ گرفتی خوێندنی ئێواران:لەسستی بەڕێوەبردن وپابەندنەبوونی خوێندکاران!
٤ـ گرفتی مەنهەجی زۆروبۆرویێ سەروبەر،وەنەبونی تاقیگەوپێداویستیەکانی
٥ـ گرفتی بینای قوتابخانەوکەمی خزمەتگوزاری ومامۆستای پسپۆڕ.
٦ـ نەبونی فەلسەفەیەکی پەروەردەیی دیاریکراوبۆمەنهەجی خوێندن لەکوردستان!
٧ـ نەبونی ستراتیجیەکی دیاریکراو،بۆیەهەروەزیروکابینەیەك لەسفرەوەدەسبەکارە!

## ڕەهەندەکانی کـۆچ:

(إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ )،التوبة/٣٩

پەندلە وانەکانی دوێنێ بۆ جوانیەکانی ئەمڕۆ...، هیجرەت وکۆچ: لەنزمیەوەبۆبەرزی ..لەخراپەوەبۆچاك..لەچاکەوەبۆچاکتر کۆچ ڕێبازی پێغەمبەرانە..دروشمی بڕوادارانە، سەرەتای هەمووساڵێکی کۆچی یادی هیجرەتەوسەری ساڵی موسڵمانانە،هیجرت بەمانا تایبەتیەکەی(لاهجرة بعدالفتح)بەلاّم بەماناگشتیەکەی(لكن جهادونية)،هیجرت گەورەترین وناخۆش ترین وبەنازارترین ڕوداوی پێغەمبەرمان بووﷺ،بۆیە پێشەواعومەرکردی بە سەرەتای مێژووی ئیسلامی،کەبووبەسەرەتای گەورەترین سەرکەوتن ولەبەری ئەوکۆچەدا مافەکان بۆسەرجەم مرۆڤەکان گەڕانەوەلەڕێگەی خۆشەویستی و خزمەتکردن وپەیمانی پێکەوەژیان وتاخاوەنی مێژووی ئیسلامی خۆمان بین، ئەوپەندانەی کەلەهیجرەت وەردەگیرێن:

**١ــ ڕەهەندی سیاسی:** هیجرەت قۆناغی بانگەوازی گۆڕی بۆدەوڵەت،کۆچ بۆدامەزراندنی دەوڵەت بونەك خۆپەنادان،ئەوانەی دەڵێن دین لەدەوڵەت جیایەئەوپێچەوانەی مانای کۆچ وفەرمودەی رسول الله یە،دینی بێ دەوڵەت زەلیلەواقعی ئەمڕۆگارەدەلیلە،گەرئیسلام بکەینەدووبەشی(عقیدەوتشریع) ئەوابەشی دەوڵەتداری وتەشریع لەکۆچەوەدەست پێدەکات.

**٢ــ سەرچاوەی تیرۆروتۆقاندن بێبڕوایانن نەك ئیسلام** کەپەیامبەروبڕوادارانیان ناچاری هیجرەتکردزێدی خۆیان جێبێڵن،سەرنجی(ئایەتی ٣٠/الانفال)بدەکە باسی پیلانی بێباوەڕان دەکات بەرانبەرباوەڕداران لەگرتن وکوشتن یان دەر کردن لەبەردەوامیش دوبارەدەبێتەوە،وەك لەبۆسنەوئەفغان وشیشان وفەلەستین وغەززەومیانماروبۆرما.

٣ـ دڵسۆزی سەرکردەبۆهاوەڵانی کەپێشترهەمویانی بەڕێکرد،بەپێچەوانەی سەرانی ئەم ڕۆژگارە

٤ـ دڵسۆزی هاوەڵان بۆپێشەواکەیان لەشوێنکەوتن وپارێزگاری لێکردنی بەسەروماڵیان، دەست هەڵگرتن لەوڵاتوخزم وماڵ لەپێناوشوێنکەوتنی پێشەواو پاراستنی عەقیدەکەیان، ...والمهاجرُمن هَجَرَمانهی اللهُ عَنه.

٥ـ دانانی پێشەواعەلی بۆپاراستنی ئەمانەتی دوژمنەکانی لەوکاتەناهەموارەدا

٦ـ ڕەهەندی ئیداری،نەخشەوبەرنامەی سەربازی وئیداری وردوگرتنەبەری هۆکارەکان (الاخذبالاسباب)لەهەڵبژاردنی ڕێگەی پێچەوانەی مەدینەودیاری کردنی ئەشکەوتەکەو سڕینەوەی شوێن پێکانیان بەڕانەمەڕەکەی عامری شوان وڕۆڵی عبدالله ی کوڕی ابوبکرو ئەسمای کچی وچاوساغی ڕێگاو..، واتەئێیش بکەبەتەمای خوا نەك پاڵدانەوە (...اعقلهاثم توکل علی الله)

٧ـ کۆچ گۆڕینی زەمینەوجێگەوڕێگەبووبۆئامادەباشی وڕووبەڕوبونەوە،نەك ڕاکردن، گۆڕینی(مۆقع بونەك مۆقف)کەبوبەخاڵی وەرچەرخان وسەلماندی کە ئیسلام ئیدارەو ئیرادەیەوئەم دینە بۆبەڕێوەبردنی ژینە.

٨ـ نیشتیمان پەروەری،ابن عباس دەگێڕێتەوەکاتێك پێغەمبەرمەککەی جێ هێشت بە مەککەی فەرموو:(واللهِ أنك لاحب الارض الِی لولا أخرجونی ما خرجت منكِ)واتەئەی مەککەتۆخۆشەویسترین شوێنی لای من ئەگەردەریان نەکردبام جێم نەدەهێشتی،کەواتە خۆشەویستی گەل ونیشتمان بەشێکەلە دینداریمان،کەدەڵێن کوردایەتی ودین جیایە ئەوە تۆمەتێکی ناڕەوایە!

٩ـ ڕەهەندی فیکری وفەلسەفی،پێغەمبەر(ﷺ)ئامادەبولەپێناوئازادیدابەڕۆز ترین شوێن جێبێڵێ(کەعبە)کەیەکەم ماڵی خوایەلەسەرزەوی فریشتەکان بناغەیان داناوەوحەزرەتی ابراهیم بەرزی کردۆتەوە،چونکەدەربڕینی ئازادی

بیروراله‌وه‌گه‌وره‌تره‌بۆیه‌کۆچیانکردله‌پێناوئازادی ئاینه‌که‌یان موسڵمان زه‌لیلی قبوڵ ناکات.

١٠ـ ڕه‌هه‌ندی په‌روه‌رده‌یی، کۆچکردن بوبه‌هۆی ده‌وڵه‌مه‌ندی وفراوانبونی تواناکان،توانای ماڵی توانای عه‌قڵی وکرانه‌وه،خوای گه‌وره‌فه‌رمویه‌تی:(ومن یهاجرفی سبیل الله یجدفی الارض مراغماکثیراوسعةً)(سعة)تواناوفراوانبون له‌عه‌قڵ وماڵ وحاڵدا،لای خۆشمان ده‌ڵێن:فلاّن که‌س گه‌ڕاوه‌ودنیادیده‌یه.

**کارسەرەکیەکانی پێغەمبەر(ﷺ)بۆدامەزراندنی بنەماکانی دەوڵەتی ئیسلامی**

ئامادەکردنی کەسانێك شایستەی ئەوەبن ببنەکاربەدەستی ئەودەوڵەتەلەڕوی:

- بیروباوەڕی چاك وپاك ......ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت

- خورەوشتی جوان........ اكمل المؤمنين ايماناً احسنهم اخلاقاً

- ڕاستی وڕاستگۆی...ان الصدق يهدى الى البروان البريهدى الى الجنة

- دوری لەغەش وفێڵ وخیانەت.....من غشنا فليس منا

- دڵسۆزی بۆمیللەت بەهۆی نیەت پاکیان بەرانبەرخوا)...فمن كانت هجرتُهُ الى اللهِ ورسولهِ فهجرتُهُ الى اللهِ ورسولِهِ، پیاوی وەك پێشەواعوسمانی پێگەیاندکە ساڵی گرانی(١٠٠) بار حوشتری بەخشی،نەك شت شاردنەوەوگرانفرۆشی بەکردەوەبونەخزمەتکاری گەل و نەتەوەو کۆشك و تەلاریان جێنە هێشت،

- دروستکردنی مزگەوت،کەلەڕێگەی مزگەوتەوەسوپایەکی دروستکردو بنەماکانی دەوڵەتی تیادامەزراند،وەبرایەتی لەنێوان مهاجرونەنصاروپاشان ئەوس وخەزرەج،واتەئیسلام ئاینی ئاشتی وبرایەتی وپێکەوەژیانە،بەداخەوە سەرەڕای هەمونەمانەحکومەتی ئەم کوردستانەهەموهەوڵ وخزمەتی بۆسەری ساڵی زاینی مەسیحیانە!کەکەمینەن لەم کوردستانەئەوەش پێچەوانەی پەیامی پێغەمبەرانە،کەحەزرەتی عیساش ڕازی نیەبەم جۆرە ئاهەنگانە،بەکورتی: قسەهەزارە دوانی بەکارە...شەوی سەری ساڵ بەزمە لەم شارە!

---

* پێشینان فەرمویانە: سەدحەکیم بەقەد دەردەدارێك نازانێ، خەم وئازارەکانی کۆچ لای ئاوارەکانە،بەندەش لەژیانداکۆچ وباری زۆربینیوەلەم کوردستانەلە(کفرەدۆڵ وگەرمکەداڵ وجافان ودواوەوگولەك تاهەڵبجەوهەورامان)شایەتن بۆمان،لەسلێمانیش گەڕەکی ئاشتی و کارێزەوشك ئاشنان پێمان،بەئومێدی شوێنکەوتنی کۆچەران،کۆتایشمان لای خودابێ بەئیمان.

## دیاردەی تەڵاقدان..هۆکارودەرەنجام

(دەقی چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی گۆڤاری(کلیل)ژمارە(٣٥)ساڵی(٢٠١٢)لەگەڵ مەلائەحمەدی قامیشی):

سەرەتاسوپاستان دەکەم وهیوادارم وەڵامی پرسیارەکان ببێتەمایەی بەرچاوڕونی خوێنەران مارەبڕین بریتیەلەوپەیمانەی کەلەگرێبەستێکی تایبەتدالەنێوان کوڕوکچداد ەبەسرێت بە ئامادەبونی دووشایەت وسەرپەرشتیاری کچەکەوبەمارەیی دیاریکراو وصیغەی تایبەت، کە لەقورئاندابە(میثاقاغلیظاً)ناوبراوە بەمانای پەیمانێکی تۆکمەوپتەو، جانەوگرێبەستە ئەو پەیمانەبەوشەی تەڵاق هەڵدەوەشێتەوەوکۆتایی دێت،

**١)لەئیسلامداتاچەندگرنگی دراوەبەخێزان ؟**

خێزان واتە:ژیانی خۆشەویستی نێوان ژن ومێرد..واتەپەروەردەی منداڵ.. ڕێزی دایك و باوك..ماڵداری وخزمایەتی وکەسایەتی..واتەڕەوشت وبەها بەرزەکانی ژیان..کەواتە خێزان واتە: ژیان ئەگەرخێزان نەمازیان دەبێت بەژان،بێگومان خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگایە جانەگەرخێزانەکانمان لەسەربنەمایەکی ڕاست ودروست بەیەکگەیشتن ئەوە کۆمەڵگایەکی نمونەی و تەندروست فەراهەم دەبێت،وەبەپێچەوانەیشەوە،بۆیەئیسلام هەر لە سەرەتاوە گرنگی داوەبە خێزان لەڕێگەی هەڵبژاردنی تەندروست ومامەڵەی دروست (حُسنُ الاختیاروحُسنُ المعاملة)،دیارەچاکترین بنەمایش بۆدروستکردنی خێزان تەقواولەخوا ترسانە،ئەگەرئەوکوڕوکچەکەلەتەمەنداولەبیروباوەڕولەپیشەدا هاوشان ونزیك بون لەیەکەوە وەتەقواولەخواترسان هەوێنی کارەکەیان بونەوەلەژیاندا پایەدارومایەداردەبن لەکۆشکی هاوسەریدابەختەوەردەبن چونکە تەقواسەرچاوەی هەموخێروچاکەیەکەبەرهەمەکەی ڕاستگۆیی و ڕەوشتی جوانەکەچاکترین دەستمایەن،بەڵام گەرهاوسەریەکەتەنهالەسەربنەمای دینارو دۆلاروکۆشك وتەلاروجوانی یارداممەزرا،کەئەمانەکاتین وتاسەرنین ئەوە دوای ئەوەی حەزەکانیان تێربوهۆکارەکان تەواوبون بایی دەبن دەمەبۆڵەولەیەك نەگەیشتن وتەلاق دێتە

ناراوه،لەبەرئەوگرنگیەیەکەخوای گەورەلە قورئاندا (٧٠)ئایەتی تایبەتکردوەبەخێزان وبەوهۆیەوەلەکتێبە فقهیەکاندابەشێکی تایبەتی بۆدانراوە لەژێرناوی(المناكحات)کە بەزاراوەی ئەمرۆیی دەوترێ باری کەسێتی.........

٢) )گرفت وکۆسپە سەرەکیەکانی خێزان کامانەن؟ :

١ـ شەیتان:کەدوژمنی سەرەکی موسڵمانەسوێندی خواردووەکەلەرێگە لایان بدات تەنها بەندەدڵسۆزەکان نەبێت(..ولأغوينّهم اجمين الاعِبادكَ منهم المُخلَصين) ٤٠/الحجر، لە فەرمودەی پێغەمبەرداﷺ هاتووە{شەیتان کۆشکەکەی لەسەرئاوەبەردەوام سەربازەکانی دەنێرێ بۆئاژاوە،کاتێ دەگەڕێنەوەلێیان دەپرسێ چیتان کرد؟ یەکەم دەڵێ:وام لەیەکێك کردتا کەسێکی کوشت!هیچ نیەتەوبەدەکات،دووەم:دزیم بەیەکێك کرد!ئەویش تەوبەدەکات سێیەم دەڵێ: ئاژاوەم خستەماڵێك تاژنەکەی تەلاقدا!شەیتان ئافەرینی دەکات وتاجی ئازایەتی دەنێتە سەر!}چونکە(نەگبەتی ماڵ ئاژاوەیە تێکشکانی کەژاوەیە) هەڵوەشاندنەوەی خێزانە،کەکۆمەڵێك کێشەبەدوای خۆیدا دێنێت وەك دەبینی رێژەی تەلاقدان لەزیادبوندایە!کێشەی سەرەکی لیژنەی فەتوایە!،٢ ــ تێگەیشتنی هەڵەلەمانای (قیوامة)وخراپ بەکارهێنانی لەلایەن پیاوەوە،٣ـ دەستخستنەناو ژیانی خێزان لەلایەن کەسی سێیەمەوە لەدەرەوەی خۆیان بەپاساوی هاورێیەتی وخزمایەتی بەنەزانی یان بە نیەتی خراپ یان بۆدژایەتی وتۆڵەسەندنەوە.

٣))هۆکارەکانی تەلاقدان چین؟

هۆکارەکانی تەلاق زۆرن هەمەجۆرن لەوانە:

یەکەم: هەڵبژاردنی نادروست لەدیاریکردنی هاوسەرداجاری وایەلەلایەن خزم ودایك و باوکەوەهەڵدەبژێردرێت لەجیاتی ئەوەی کورِوکچەکە خۆیان یەکتردیاری بکەن،

دووەم:جیاوازی تەمەن بەرێژەیەکی زۆرسەردەکێشێ بۆخیانەتی زەوجی و هەستکردن بەکەم وکورتی

سێیەم:گرنگی نەدان بەئەرك ومافەكانی یەكتر،وەیەكترنەخوێندنەوەولەیەك نەگەیشتن، چونكەژیانی خێزانی وەك شەمەندەفەرێك وایەكەلەسكەی خۆی لایداهەموولەناو دەچن، بەهەمان شێوەیش ژن ومێردكەهەریەكەیان ئەركی خۆی فەرامۆشكردومافی بەرانبەری نەدائاژاوەوكێشەدروست دەبێت سەر دەكێشێ بۆتەلاق،ماف لەبەرانبەرئەرك ئەدرێ.

چوارەم:هەژاری ونەداری بێ قەناعەتی بەتایبەت لەم ڕۆژگاری ماددەگەرایدا كەچاولێكەری زۆرەوقەناعەت كەم بوە،جا كەسێ بیەوێ سەری نەیەشێ.. لەقەدەربەرەكەی پێڕادەكێشێ.

پێنجەم:بەكارهێنانی تەكنەلۆژیای سەردەم بەشێوەیەكی خراپ بەتایبەت مۆبایل كەلە ئامارێكدا هاتووەتەنهالەساڵی(٢٠١١)بەهۆی كێشەی مۆبایلەوە لەهەولێر(١٩١٠)حاڵەت ولەسلێمانی (١٣٣٩)حاڵەتی تەلاق ولەگەرمیان (٥٥٥)حاڵەت لەدهۆك(٧١٢)حاڵەتی تەلاقدان بەهۆی موبایلەوەتۆماركراوە ئەی ئەوەی تۆمارنەكراوە؟،بەڕاستی كارەساتە! ئەمەش زیاتربەهۆی نزمی ئاستی هۆشاریەوە،ئەیناكەس نیە تەلەفۆنی هەڵەی بۆنەكرابێ.

**٤)ڕێژەی تەلاقدان لەكۆمەڵگەدینیەكاندازیاترەیان لەوخەڵكانەی كەپابەندنین**

بێگومان تەلاقدان لەناوئەوكۆمەڵگایانەدازۆرەكەپابەندنین بەدینەوەلەومالأنە كەمترە كە پابەندن بەدین ولەخوادەترسن چونكە(رأس الحكمة مخافة الله)سەرچاوەی حیكمەت ودانایی لەخواترسانەموسڵمانی ڕاستەقینەلەبەرامبەركێشەكان ئارامدەگرێت وبەوەفایەوستەم ناكات

**٥) لەچ تەمەنێكدا زەواج بكرێ باشە؟**

بەپێی هەل ومەرجی كەسەكان دەگۆڕێ،بەڵام بەگشتی دەستپێشخەری وزوو شوكردن یان زووژن هێنان باش نیە،بەڵكوهەوڵبدرێ پێشترزەمینەسازی بۆ بكرێ لەبواری مادی و مەعنەویەوەولەیەكگەیشتن وئامادەباشی تەواو بەرجەستەبكرێ.

**٦)لەڕوی شەرعەوەتاوانی ئەوانەی دەبنەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزان چیە؟**

هەركام لەژن ومێردكەدەبنەهۆكاری هەڵوەشاندنەوەی خێزان گەرپاساوی شەرعی نەبێت تاوانباردەبن لای خوا،لەناوكۆمەڵگەشدابەچاوێكی كەم سەیر دەكرێن،چونكە دەڵێین ئەگەر

ناتەویٚ بۆمارەی دەکەی؟ئەگەردەتەویٚ بۆتەلاٌقی دەدەی،چونکە لەئیسلامدا تەلاٌقدان کۆتا چارەسەرەوناچاریە،پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(أبغض الحلال الى الله الطلاق)واتە: ناخۆشترین شتی حەلاٌلٚ کە دروستەلای خواتەلاٌقدانە.

**٧)چارەسەری ئیسلام چیەبۆکێشەی تەلاٌق؟**

قورئان کۆمەلێ هەنگاوی دیاریکردوە بۆچارەسەری کێشەی نێوان ژن و مێرد پێش تەلاٌقدان بەمەبەستی چارەسەرکردن ومانەوەی خێزان،وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ..)النساو/٣٤، ئەگەر ئەوهەنگاوانەبنرێن رێژەی تەلاٌقدان زۆرزۆرکەم دەبێتەوەکەئەمانەن:

١)ئامۆژگاری ولەیەکگەیشتن وتوێژکردن(..فعِظُوهُنَ..)

٢) ئەگەرهەنگاوی یەکەم ئەنجامی نەبوونەوالەهەنگاوی دووەمداپشت تێکردنی لەکاتی خەوتندابەمەرجیٚ مالٚ وەمنالٚ نەزانن بۆئەوەی بەخۆیدا بچێتەوەلەکاتێکدا ئەگەربە جوانیەکەی دەنازیٚ وبایی بوە(واهجرُهُنَ..)

٣) لێدانێکی پەروەردەیی کەبەهیچ شوێنێکیەوەدیارنەبیٚ،(ضرباغیرمُبَرّح)

٤)کەکێشەکەلەمالٚ دەرچوونەوجاسولٚح ورێك کەوتن لەرێگەی حەکەم و کەسانی پسپۆرودلسۆزلەهەردووبنەمالٚە.

**٧)دوای جیابونەوە چ کێشەیەك روبەریان دەبێتەوە؟**

بێگومان لەناوکۆمەلگادائەگەریەکیٚ ژن تەلاٌقبدات خەلکی متمانەی پێناکەن بەچاوی کەم سەیری دەکەن،بەهەمان شێوەئافرەتیش پێی دەلێن: بەخۆرایی تەلاٌق نەدراوەوئەویش دوچاری هەمان کێشە دەبێتەوەئەمە وەك کێشەی کەسایەتی جگەلەکێشەی مالٚ ومنالٚ، کەمنالٚ دەبێتەقوربانی وبێتاوانیشە.

**٨)لێرە دائەرکی حکومەت وزانایانی ئاینی چیە؟**

بۆمانەوەی خێزانەکان ژن ومێردتاکەکان بەرپرسیاری یەکەمن، پاشان حکومەت بەرپرسەکە

دەبێ هۆکارەکانی تەلاق بنەبڕبکات بەدابینکردنی خزمەتگوزاریەکان وسلفەی زەواج و شوێنی نیشتەجێبونوسەروەربونی یاساو بەهیزکردنی وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی و چاودێری خیزان بەداخەوە کە لەبەرسیاسەتی درۆینەوقەیرانەکانی ڕۆژگارحکومەت ئاگایی لەخێزانەکان نەماوە،وەزانایانی ئاینیش ئەرکی سەرشانیانەکەناستی هۆشیاری خەڵك بەرز بکەنەوەولەمەترسی ودەرەنجامەکانی تەلاق ئاگاداریان بکەنەوە،چونکە هەڵوەشانەوەی خێزانەکان واتەهەڵوەشانەوەی کۆمەڵگاکەئەوەش کارەساتە.

**٨/چی بکرێت بۆسەرکەوتنی پرۆسەی زەواج؟**

تەقواولەخواترسان سەرچاوەی هەموخێرێکە جانەگەرلەسەربنەمای تەواودین بەیەك بگەن سەرکەوتودەبن،بۆئەوەی کوڕوکچەکانمان لەکۆشکی هاوسەریدا مایەداروپایەداربن بەختەوەربن بادەست گرتووبن بەڕەوشتەجوانەکان وهەرکام لەهاوسەران ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکات ومافی خۆیشی پێبدرێت.

**٩/ بۆچی ڕێژەی تەلاق ئێستازیاترە لەڕابردوو؟**

جێگەی داخەکەتەلاقدان زیادیکردوەسەرەڕای پێشکەوتن وکرانەوەی عەقڵەکان، جگەلەو هۆیانەی کەلەوەلامی پرسیاری سێیەمدا ئاماژەم پێدان، کۆمەڵێ هۆکاری تریش هەن کە بەلای منەوەهۆی سەرەکی لاوازی ئیمان و شەرم نەکردنەلەخواسەردەکێشێ بۆلەخۆبایی بون وبێوەفایی ونەخوێندنەوەی بەرانبەر،وەبەهەڵەتێگەیشتن لەچەمکی سەربەستی ونازادی کەلەوروپاوە زۆربەی ڕێکخراوەکانی ژنان وئافرەتان ومیدیاکان کاریگەری سلبیان بوەو هۆکاربون بۆزیادکردنی ڕێژەی تەلاق!

**١٠) دوا ئامۆژگاری بەڕێزتان؟**

ئامۆژگاریمان بۆموسڵمانان بەکورتی بریتیەلە:

یەکەم/ دورکەوتنەوەلەتوڕەبوون وسوێندخواردن بەتەلاق.

دووەم/ نابێت زەرەرلەخۆت وخەلکیش بدەی.**(لاضررو لاضرار)**.

سێیەم/ سەرنج بدەلەدەرئەنجامەکانی تەلاقدان کەبریتین لە:

١) خواپێی ناخۆشە وەك لەفەرمودەی سەرەوەداثاماژەمان پێدا.

٢) هەڵوەشانەوەی خێزانەکان.

٣) بێنازبوون وسەرگەردانی منالەکان کەنەوەی دوارۆژن .

٤) بەکەم سەیرکرانی ئەوژن ومێردە دوای جیابونەوە.

٥) کێشەی کۆمەلایەتی وئابوری وسایکۆلۆژی...هتد.

٦) بلاوبونەوەی زیناودامێن پیسی .

# ئەوەی لەئەوروپا بینیم وبیستم..!!

پێشینان وتویانە:ڕێویەکی گەڕاولەشێرێکی نوستویاشترە،منیش دەڵێم: ئەی ئەوەی دەگەڕا شێربووڕێوی نەبو؟دیارەباشتروچاکترە،لە(٢٥ /٩ /٢٠١٢ ) گەشتێك ڕێکخرابۆهەشت مەلا لەکوردستانەوەبۆولاَتی نەرویج لەڕێگەی ڕێکخراوی(NPA)نەرویجیەوەبۆگفتۆگۆکردن لە سەرمافەکانی ئافرەتان ومنداڵان بۆجالیەی کوردی لەنەرویج،لەسلێمانی بەندەدیاریکرابویۆ ئەوسەفەرە دوای ئەنجامدانی چەندکۆڕوسیمینارێك لەئۆسلۆ(١/١٠)گەڕاینەوەکوردستان لێرەدادەمەوێ بەکورتی بەئەمانەتەوە چەنددیمەنێکی ئەوگەشتە بخەمەبەردیدی بەڕێزتان لەوەی کەدیمان وبیستمان تاڵەنزیکەوەبەژیانی ئەوروپا ئاشنا بن:

**یەکەم:لایەنی ئیجابی:**

نەرویج بەولاَتی بەفرو ورچ ناسراوەوبەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیەوەکەلەباکوری گۆی زەویدایەبەردەوام بارانەوساردەوزۆربەی مانگەکانی وەك بەهارە وهەمیشەسەوزەوخاوەنی ژینگەیەکی پاکوجوانەئەوەش کاری خوای میهرەبانە بەدەست کەس نیە،لایەنی ئیداریان بەهێزەوبەجۆرێك پەروەردەکراون کە پابەندن بەیاساوە تەنانەت پۆلیسی هاتوچۆم نەبینی لای ترافیك بەڵکوهەمویان ڕۆڵی مروردەبینن،ولاَتەکەی خۆیان خۆش دەوێ بەهۆی سەروەری یاساوە،بواری خزمەتگوزاریان بەهێزە،پێکەنینی بەردەوامیان هەبو، کەهەموو ئەمانە شتی چاکن وەلە ئاینی ئیسلامیشدا بەرجەستە کراوەبەلاَم لە بەرئەوەی ئێستاحوکم ودەسەلاَتی ئیسلامی نیەبۆیەلای ئێمەبەوشێوەنابینرێ،لەوکاتەدا وتەکەی بیریاری ئیسلامی (محمدعەبدە)م هاتەوەیادکەوتبوی:لە ئەوروپاداگەڕام ئیسلامم بینی بەبێ موسڵمان،بەلاَم لەولاَتی خۆماندامسوڵمان دەبینم بەبێ ئیسلام،هاوشێوەی ئەوەش لەگفتوگۆی نێوان قەشەیەك ومامۆستا(محبوب عبدالرحمن)کەمامۆستایەکی ئاینیەلەنەرویج بەخزمەتی گەیشتین لەوسەفەرەدا سەبارەت بەبەراوردلەنێوان ژیانی ئێمەوئەواندا قەشەکەوتبووی: (ئێمەدین و خەڵکەکەمان گەندەڵە بەلاَم حکومەتەکەمان دڵسۆزەویاساسەروەرە،بەلاَم

نێوەدین وخەلکەکەتان چاکەبەلاّم حکومەتەکەتان خراپەوگەندەلّە)بەڕاستی بەویژدانەوە ئەوقسەیەی کردوەولەجێی خۆیەتی چونکە زۆربەی خەلکی ئەوروپایاساوغەرامەکردونی بەمرۆڤ،بەداخەوەلای خۆمان لەجیاتی حکومەتی یاسایی حکومەتی حیزبی وشەخصیە!!

**دووەم: لایەنی سلبی:**

لەئەوروپا ژن سالاریەوپیاونرخی نیە،لەجیاتی ئەوەی یەکسان بن وەك ئەوەی لەئیسلامدا هاتوە،بەلاّم لەوشوێنەپلەی ژیان بەم شێوەیەیەنیەکەم ژن ودووەم منداڵ سێیەم سەگ و پاشان پیاو !ئالودەبوون بەجگەرەومادەهۆشبەرەکان بە تایبەت شەوانی شەممەویەك شەممە لەسەرجادەوکۆلانەکان هەندێ جاربە نیوە ڕوتی لەپارکەکان کەوتون بێ هۆش،ئەبێ بەردەوام کاربکەی یان سەرقالبی ئەینافریاناکەوێ گوزەران سەختە،لەئۆسلۆشت زۆرگرانبو هەرچەندەلەبواری تەکنەلۆژیاداپێشکەوتوون بەلاّم لەبواری کۆمەلایەتیەوەسفرن،هاوشێوەی ژینگەکەیان ساردوسڕن(ئەعصابیان سارد)بو!لەوکاتەداسویدهەلمەتێکی ڕاگەیاندنی ئەنجامداوپارەی زۆری تەرخانکردبۆئەوەی دراوسێکان سلاّوبکەن ویەکتربناسن!لەئسلامیشدا بەبێ مەسرەف هەمومان مافی هاوسێ دەزانین چۆنە،خێزانەکانیان زۆربەی هەلّوەشاون (٧٠٪ )ی ژن وپیاوبەتەنیانەژین بۆیە نەخۆشی دەروونیان گەلێ زۆرەشێتخانەومەلبەندە تەندروستیەکان پڕن لە نەخۆشی دەرونی،بەلاّم جەستەیان ساغەبەهۆی ژینگەی پاکەوە، دیارەژیان بەتەنیایی زەحمەتەناچارئەبێ لەگەڵ سەگێ توتکەیەك کودەلّە بەرازێ بژیەت و ڕۆژانەسەگەکەی پێیەئەگەرلەبازاڕپیسایی کردئەبێ خێراپاکی بکاتەوەئەینا غەرامەدەکرێ، پردی(سدنی)لەنیوکاسل لەبەریتانیاکەلەسەرشێوەی پردەکەی سیدنی ئوسترالیادروستکراوەو زۆربەرزە لەسەر ڕوباری نیوکاسلە،یەکێ لەوانەی ڕۆژانەلەوپردەوەهاتوچۆی دەکردوسەردانی کردم وتی لەزۆربەی ڕۆژەکاندا چەپکەگولێك ونامەیەك لەسەرپردەکەدادەنراکەنیشانەی ئەوەیە کەسێك خۆی فڕێداوەلەوشوێنەوکۆتایی بەژیانی خۆی هێناوە!

خێزانەکانیان لەبەردەم سێ هەڕەشەدان:

١- سەمبور: واتەکوڕوکچ چەندساڵێك پێکەوەڕادەبوێرن دوای ئەوەئەگەر زانیان دەگونجێن ئەوجارخێزان دروست دەکەن لەدادگا،ئەگەرنائەیگۆڕن و منالیش هی ئافرەتەیان حکومەت بەخێوی دەکات،بۆیەئافرەت هەرساڵەوهەر مانگەبەدەست پیاوێکەوەیەوبەوەش جارێکی تربە ناوی ماف وئازادیەوە لە گێژاوی بەدڕەوشتیدادەبێتەقوربانی،سەڕەرای ئەوەی کەدەبێ وەك پیاولەخەم بژێوی ژیانی دابێت!چونکە تەنیایەودەبێ کرێ خانوپێداویستیەکانی ژیانی دابین بکات،واتەبەناوی ئازادی ومافەکانی ڕۆژانەکاری پیاودەکاتوشەوانەش ژنێتی،بۆیە ئافرەتان لەڕۆژئاوازۆرماندون،بەلاّم لە ئیسلامدا ئافرەت خانمێکی خزمەتکراوەنەفەقەی لەسەرپیاوەبۆکاری گونجاویش ڕێگەی لێنەگیراوە،

٢- هۆمۆ :لەدەرەنجامی ئایدیای فێمێنیزم وجەندەرداسروشتی پاك ورەوشتە جوانەکان دەبنەقوربانی،ئەرویج تاکەولاتەکەنێرلەنێرمارەدەکات!ئەوەش پراکتیزەکردنی یاسای جەندەرەکەجۆری کۆمەلایەتی ورەگەز ڕەتدەکاتەوە! بۆیەدوای لێکۆڵینەوەوپرسیاردەرکەوت کەپیاوانێك دوچاری نێربازی بون،ئەوەش کەسایەتی مرۆڤەکان لەناودەبات،ڕەوشتێکی قێزەونی هەزاران ساڵی بەرلەئێستای قەومی لوتەکەخواغەزەبی لێگرتن ولەناوی بردن و شوێنەکەیاز بویەدەریای مردولەئوردن،لادانێکی ئاشکرای جنسیەولەئیسلامدا حەرامەو نەفرەتی لێکراوە.

٣- بارنەڤانە: واتەمنداڵپارێز،یەکێکی ترلەکێشەسەرەکیەکانی جالیەی ئەو ولاتەکەخاوەنی کەلتوری جیاوازن ونامۆن بەیاساوڕێسای ئەوروپاکێشەی منداڵە،لەقوتابخانەیالەهەرشوێنێ منالەکەبلێ لێم توڕەبون لێیان داوم لەماڵەوەئەوەمنداڵپارێزبۆخۆی دەیبات!جەرگی ئەو دایك وباوکەبەزیندویی دەبڕێت!کاتێ دەیبیننەوەمێشکی شۆراوەتەوەوهیچ لەتۆوەرناگرێ بەهۆی پەروەردەیەکی ماددی بێ ڕۆح وبێگیان،لەگفتوگۆیەکماندالەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار پێمان وتن: ئێمەلەگەڵ ئەوەنین ستەم لەمناڵ بکرێت،بەلاّم ئایائێوە دڵسۆزترن لەدایك وباوك

بۆمناڵ کەجەرگی خۆیانە؟بێگومان هیچ شتێك جێی باوەشی دایك ناگرێتەوەلەسۆزو خۆشەویستی بۆرۆڵەکەی،ئەوان گوێت بۆ دەگرن بەلاّم هیچت لێوەرناگرن وبەپێکەنینێکی پلاستیکی کۆتایی پێدێنن! یەکیکی ترلەسلبیاتەکانی نرِوتی ئافرەتەکەسنوری مرۆڤانەی تێپەڕاندوە! هەندێکیان ئەوەندەڕوتن کەلکی باسکردنی نیەلەنانەت لەهۆلّی( Ankr Hotel )لەئۆسلۆکۆڕێکی گشتیمان بۆسازکرابودوای وتارەکەم ئافرەتێکی کوردی ڕۆژ هەلاّت پێی وتم:مامۆستائەم سفوریەپێشکەوتنەوناگەرێینەوەدواوە! منیش لەوەلاّمدا وتم:ئەگەرروتی پێشکەوتن بێت ئەواتاژەلاّن لەهەموان پێش کەوتوترن،کەواتەمرۆڤەکان بەتایبەت جالیەکان وبەتایبەترموسلّمان زەلیلەو خاوەنی خۆی نیەتاخاوەنی ماڵ ومناڵی بێت،پێغەمبەری پێشەوامانﷺ فەرمویە (لاینبغي للمؤمن ان يُذل نفسه)* واتەنابێ موسلّمان خۆی زەلیل بکات، لە بواری خەرجی وداهاتەوەشت گرانەوزەریبەپشتی خەلکی شکاندوەوتەنانەت لەنەرویج چریبەگەیشتۆتە( ٣٦./.) وکەسیش نالێ بۆ؟بەلاّم بۆخێرو زەکاتی ئیسلام دەلّێن:سەرانەوباج!بۆیەئەگەرپێویستی یامەبەستێکی شەرعی نەبێت بۆ موسلّمان دروست نیەژیان لەنێوبێباوەڕاندا،چونکەژینگەوژیان کاریگەری هەیەلەسەر هەموان،بەتایبەت پاراستنی بیروباوەڕوکەسایەتی ئیمانی زەحمەت دەبێت،لەفەرمودەیەکی هەرەشەئامێزداپێغەمبەری خەمخۆرودلّسۆزمان ﷺ فەرمویەتی:(اني بريءمن كل مسلم يقيم بين اظهرالمشركين)+، واتە:من بەریم لە هەرموسلّمانێك کەلەناو بێباوەڕاندابژیەت، کەنیشتەجێ بێت ومالّی لەناویاندا بێت،نەك سەفەروبەشێوەی کاتی، دوای هەفتەیەك گەڕاینەوە کوردستان،من زوولەوێ بێتاقەت بوم هەموودیمەنەجوانەکانی ئەورروپاجێگەی ئەوەیان بۆپڕنەکردمەوەکەئەوچەند ڕۆژەگوێم لەدەنگی بانگ نەبو،وەك ماسی بێ ئاووم بەسەرهاتبو،بەئەمانەتەوەئەوزانیاریانەم بەدیاری هێنایەوەبۆ کوردستان وەك دلّسۆزێك پێم گەیاندن،چونکەخەلّکانێك هەن زۆرسەرسامن بەدیمەنەکانی وخەوی پێوەدەبینن،بەلاّم زۆر بەی دروشمەوقسەی بۆشە..دەنگی دەهۆلّەولەدوری خۆشە،بۆخۆیان باشەوبۆئێمە ناشە،

ناخۆشەچونکە سەرەڕای غەریبی دەبێ خزمەتکاری بۆبێگانە،شایانی وتنەکەلەوسەفەرەدا نەجلی کوردیم دانا نەسمێڵم تاشی نەملوانکەم هەڵواسی‌لوەك شانازیەك بەوەی کەکوردێکی موسڵمانم،لەکۆتایی سەفەرەکەمدالەنەرویج وتم:

سروشتی ئەم ولاتەجوانە..ولاتی بەفرو ورچ وژنانە..

ژیان تیایداسەخت وگرانە.. حەیاوناموسیش هەرزانە!

---

* الحديث اخرجه احمد(٥/٤٠٥) والترمذى(٢٢٥٤)وابن ماجة(٤٠١٦)

+ حديث صحيح رواه الترمذى،كتاب السير(١٥٥/٤) وابوداود(١٠٥/٣)

- ئەم بابەتەلەماڵپەڕی ستاندەروهەندێ شوێنی تریش دابەزی ودەنگدانەوەی زۆری هەبوو

- ئەم وتارەڕاستەوخۆدوای گەڕانەوەم لەمزگەوتی گەرەی هەواری شارخوێندمەوەلە ١٠/٥

* ڕۆژنامەی باسك ژمارە(٤٩٣)١٤/١٠/٢٠١٢، وە ڕادیۆی دەنگی ئیسلام دایبەزاند.

* هەروەهالەچاوپێکەوتنێکم دالەگۆڤاری شەقام ژمارە(٢٣٩)ساڵی(٢٠١٢)بلاْوکرایەوە.

# زمانی ژماره..وەك لەقورئاندا دیاره

هاوسەنگی ژمارەلەقورئانیشداوەك موعجیزەبەرچاوودیارەکەجێگەی پەندوئیعتیبارە، هەرچەندەبەلای ئێمەوەدانراوەبۆحیسابی پارە!، بۆنمونە:لەقورئاندا وشەی مانگ(القمر) (١٢)جارهاتووە کەبەرانبەربە(١٢) مانگەی ساڵە!وشەی ڕۆژ(الیوم)(٣١٥)هاتووە کە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵە!هەردو وشەی (الحیاةوالموت)ژیان ومردن هەریەکەیان(١٤٥)جار وەك یەك دووبارەبونەوە! هەردووشەی چاکەکاری وخراپەکاری(الصالحات والسیئات) هەر یەکەیان (١٦٧)دووبارەبونەوە!هەریەك لەدنیاودواڕۆژ(الدنیاوالاخرة)(١١٥)جاروەك یەك هاتون!هەردوو وشەی (الصبروالشدة) تەنگانەوئارامگری (١٠٢)لە بەرانبەریەکتردا دوبارە بونەوە!وە(موصیبەت وشوکرانە)هەریەکەیان (٧٥)جاردوبارەبونەوە!وشەی نوێژ(الصلاة) (٦٣)جارهاتوەکەهاوتای ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی پێغەمبەرە ﷺ! وشەی سەجدە (٣٤) جارلەقورئانداهاتووەکە(١٧)ڕکاتی فەرزمان هەیەو(٣٤) سوجدەی تێدایە! ژیان ودنیا (الدنیا،الحیاة)کەپەیوەستن بە یەکەوەهەریەکەیان شەش پیتە!جگەلەوەش کە(٦)پیتەئەم دنیایەبەشەش ڕۆژ بەشەش قۆناغ خوای گەورەدروستیکردوە!ئەگەرسەرنجی وشەی (الانسان) بدەین لەحەوت پیت پێکهاتووە،دروست بونی مرۆڤیش بەحەوت قۆناغدا تێپەڕیوە! وەك قۆناغەکانی(قوڕ،تۆو، سەرەمێکوتە،گۆشتپارە،ئێسك،گۆشت وپاشان شێوەی ئادەمیزاد (ئایەتی/١٢،١٤/ سورەی المومنون)، بەهەمان شێوەیش وشەی(الشیطان)حەوت پیتەکە جەختکردنەوەیەلەسەردژایەتی شەیتان بۆمرۆڤ سەرەڕای جیاوازی بارودۆخەکانی!بەهەمان شێوەش سورەتەکانی قورئان پڕیەتی لەموعجیزەی ژمارە،ئەوەتایەکەم سورەتی قورئان کە فاتیحەیە بە(بسملة)وەحەوت ئایەتە،بەهەمان شێوەیش کۆتاسورەتەکەی کە(الناس)ە پێکهاتەی ئایەتەکانی هەمان ژمارەیە!لێرە جێی خۆیەتی سەرنج بدەی هەڵوەستەبکەی بڵێی: خۆئەگەرپێغەمبەرﷺ زانایەکیش بوایەنەیدەتوانی پەڕاوێکی وەك ئەم قورئانەدا بڕێژێت،ئەی چی دەڵێیت کەدەزانیت ئەو نەخوێندەواربوە!ئیترلەدوای ئەم هەموڕاستیە

جێگەیەك بۆگومان ودوودڵی نامێنێتەوەکەئەم قورئانە خەڵاتی خوای میهرەبانەوناردویەتیە خوارەوەبۆسەردڵی چاکترین کەس کەمحمدە ﷺ ،لەکۆتایی کتێبەکەداوەك داهێنانێکی نـاوازە بـە زمـانی ژمـارەو وەڵامـی کـورت وپوخـت هەنـدێ زانیـاری پێـشکەش دەکـەین وەك ئامۆژگاری بەوانەی بیرکاری بەهیوای هۆشیاری وبێداری...

## فێربون بەزمانی ژمارە..بۆتۆی ژیروهۆشیارە،تاژمارە(١٠)یە ئە مجارە

یەکەمەکان: یەکەمین کەس خودی خۆتە،ئەبێ لەخۆمانەوەدەست پێبکەین(علیکم انفسکم)

١)(ابن مسعود)(ر.خ)فەرموویەتی:هەرکەس دەرونی خۆی چاککردخوداش دەرەوەی چاك دەکات،هەرکەسێ بەینی خۆی وخوای چاککردخواش نێوانی ئەوخەڵکی بۆچاك دەکات، لە فەرمودەی پێغەمبەرداهاتووەکە(خوداسەیری شێوەوڕوخسارتان ناکات،بەڵکوسەیری نیەتی ناودڵیان دەکات)بەپێچەوانەی ئەم ڕۆژگارەکەزۆربەی دیکۆرو ڕوخسارەلەناخیشەوە بێزارە.

٢)وترابە(ابراهیم ئەدهم)ئەوەبۆچی دنیامان پێخۆشەوڕقمان لەمردنە؟ وتی:چونکەدنیاکەتان ئاوەدانکردۆتەوەودواڕۆژتان وێرانکردووە، بۆیەبەلاتانەوە ناخۆشەکەلەئاوەدانیەوەبچن بۆ شوێنێکی وێرانە(لەخۆشیەوەبۆ ناخۆشی،لەکۆشکەوەبۆکەلاوە)

٣) (الاحسان)چاکەکاری یەك بنەمای هەیەئەویش:بەوشێوەیەخوابپەرستی وەك ئەوەی ببینی،کەتۆئەونابینی ئەوتۆدەبینێ(کەئەوەش بەرزترین پلەی بەندایەتیە،چونکەئەم دینە سێ پلەی سەرەکیە:(ئیمان ـ ئیسلام ـ الاحسان)

٤)پرسیارکرالە(حەسەنی بصری) نهێنی دنیابەکم گرتنت لەچی دایە؟وتی: زانیم کەرزقی من کەس نایبات بۆیەدڵم نارامی گرت،زانیم کەس کارم لەبری ناکات بۆیەهەڵسام بە ئیش وکاری خۆم،دڵنیابوم کەخوای گەورە چاو دێرەبەسەرمەوەبۆیەشەرمم کردبێ فەرمانی بکەم، وەزانیم مردن چاوەڕێمەبۆیە خۆم بۆئامادەکردوتوێشوم بۆکۆکردەوەتابەخزمەتی خودابگەم.

٥)ئەگەردەتەوێ دواڕۆژی نەتەوەیەك بزانی سەرنجی گەنجەکانی بدە(بەداخەوە زۆرێکیان چەواشەکراون بەحیزبایەتی یان جگەرەیان بەردەوام لەدوای پارە گەل وولاتیش درابەپارە، یاگەنج وبەنج وبێهۆشە،سەرقاڵە بەرپاڵ وبەرشە! لە دین ودنیای بێ بەشە)

٦)دنیابفرۆشە بەدوارۆژهەردوکیان دەبەیتەوە،قیامەتی خۆت بەدنیای خەڵك مەدەچونکە گەرواتکرد هەردووکیان دەدۆڕێنی،شاعیروتەنی:

ئەی سەرقاڵ بە دنیاوەتەفرەدراوبەهیواوە مردن دلۆپەی ناکاوەچیت بۆگۆڕنەنجام داوە.

٧)یەکەمین شت کەلێی دەپرسرێتەوەلەرۆژی دوایی لەمافی خوا(نوێژە) نوێژ پێناسی موسڵمانە،سەیرەدڵێ موسڵمانم ونوێژناکەم!

٨)یەکەمین شت لەمافی مرۆڤەکان کەلێی دەپرسرێتەوەلەرۆژی دوایی خوێنە،وریابەخوێن مەرێژە.

**٩)یەکەم مرۆڤ ویەکەم پێغەمبەر(ﷺ) کەخوابەدیهێناباوکەئادەم بوو سەلامی خوای لەسەر** بێت، بۆیەپێمان دەوترێت(ئادەمیزاد)واتە نەوەی ئادەم، نەك نەوەی مەیمون،وەدەبێ شوێن کەوتەی ڕێبازی پێغەمبەران بین نەك ئەم و ئەوبۆیەوتراوە(کلیلی خۆناسین خواناسینە) .

**١٠)یەکەمین ماڵی خواکەلەسەرزەوی دروستکرا(کەعبە)ی پیرۆزبوەقیبلەی موسڵمانان،** تۆش ڕوبکە ماڵەکانی خواتاڕووت لەوماڵەکۆنەبێت،نەك ماڵی ئەم ئەوخواپەرست بە، نەك شەخص پەرست

**دووەمەکان:** دوان دوانە،پەندوئامۆژگاری جوانە،زیاتربۆگەنج ولاوانە،سەرنجیان بدەو بزانە:

**١)دووکەس فێری زانست نابن:** (شەرمن * خۆبەزلزان)

**٢)مەرجەکانی قبوڵ بونی بەندایەتی دوانە:** ئەویش زانایان فەرموویانە:

یەکەم:دڵسۆزی:واتە:کارەکەی بۆخوابێت نەك بۆخۆ ،یان بۆخورما.

دووەم: بەپێی شەرعی خوابێت واتە شوێن کەوتەی ڕێبازی پێغەمبەربێت(ﷺ) نەك مۆدێل وهەواونارەزووعورف وعادەتی خراپ.

٣)دووچاوبەرئاگرناكەون لەقیامەتداكەفەرمودەی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەوانیش:

(چاوێك لەترسی خوابگریەت * چاوێك لەپێناوی خوائێشككگربێت)

٤)پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی دوشتم بۆجێ هێشتون گومڕاوسەرگەردان نابن گەردەستیان پێوەبگرن ئەوانیش بریتین لە(كتێبەكەی خواو سوننەتەكانم)

٥) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:دوونیعمەت هەن زۆرێك لەخەڵكی لێیان بێئاگان (قەدریان نازانن)نازانن بیان قۆزنەوەئەوانیش(تەندروستی وكاتی بەتاڵی)

٦)فەزڵی سیواك كردن لەدووشت دایە:كەفەرمایشتی رسول اللەیە(ﷺ) ئەوانیش:

(پاك وخاوێنی ناودەم وزارە...جێگەی پەسەندی وڕازیبوونی پەروەردگارە)

٧)( ابن القیم) (خ) فەرموویەتی:هەموومرۆڤێك دوو وەستانی هەیەلەبەر دەم خوای پەروەردگارا(وەستانی لەنوێژدا * وەستانی لەڕۆژی دوایدا لە مەیدانی مەحشەر)

٨)( ابن عباس)(خ.ڕ)فەرموویەتی:خوای گەورە دووشتی مسۆگەركردوە بۆ ئەوكەسەی قورئان دەخوێنێ وكاری پێدەكات ئەوانیش:(لەدنیاداگومڕاوسەرگەردان نابێت* لەدواڕۆژبەدبەخت نابێت) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە(..فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ../طه١٢٣)

٩)دووكەس لەم دنیاكاریان تەواوە،چەرخ وەك خەرەك لایان سواوە(یەك خەبەرداریێ تەواو تێبگا،دووبێ خەبەریێ لەم بەندووباوە)

١٠)پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:دووشت لەناوخەڵكداهەن كوفری تێدایە، واتە: (ڕەوشتی بێبڕوایانە) ئەوانیش:( توانج دان وتانەوتەشەرلەنەسەبی، وەهات و هاوارو

لاواندنەوەی مردوو(وەك هەندێ لەژنان کەفریودراون فێرکراون بەسنگی خۆیان دەکێشن ودەڵێن هەیڕۆهەیڕۆ) .

سێیەکان :ژمارەی ئەمجارەمان سیانە،لەبەرکردنیان ئاسانەخێروبێریان فراوانە:

* پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی: سێ شت ئەکەوێتە دوای مردو، ئەویش تەنها لەیەکیان سودمەندبوو:(منالٚ وخێزان،ماڵەکەی کردەوەکەی)،ماڵ ومناڵی ئەگەڕێنەوە، تەنهاکردەوەکەی لەگەڵیدادەمێنێتەوە.

***نیشانەی مونافیق سیانە:** کەفەرمودەی پێغەمبەرمانە(ﷺ) خۆتیان لێدووربگرە گیانە،

أـ لەقسەکردندا درۆیان دەکات(بەداخەوەکەبەکەسی درۆزن دەڵێن سیاسیەوکراویەوە!، درۆبۆتەسیتمێکی نوێی جیهانی،ئەفرەتیشی لێکراوە.

ب ـ پەیمان دەشکێنی بەڵێن ناباتەسەر(لەبەڵێنداناسست بە،لەجێبەجێ کردنناچوست بە)

ج ــ خیانەت لەئەمانەت دەکات،(گەندەڵی ئەمڕۆژگارەوەك ماستی سەر لێوان دیارە.

* **پلەوپایەی دینەکەمان سیانە:**(ئیمان وئیسلام و ئیحسانە).

* **سێ شت هەر حسابی ڕاستیان بۆدەکرێ**(سوعبەت هەڵناگرن) ئەوانەیش:

(تەلاقدان ،مارەبڕین ،ئازادکردن) .

***سێ کەس نزاوپاڕانەوەیان گیرایەونادرێتەوەبەسەریاندائەوانیش:**

(ستەم لێکراو، نزای ڕێبوار ،نزای دایك وباوك بۆمناڵەکەی)

***دوژمنەکانمان سیانن کەبەردەوام لەگەڵمانن:**

أـ نەفس:  (کەدەبێ سەرکوتی کەی بەلاّم نابێ لەناوی بەری)

ب ـ حەزونارەزو: (دەبێ کۆنترۆڵی بکەی نەك گوێڕایەڵی بکەی )

ج ـ شەیتان: (دەبێ دژایەتی بکەی)

*ســـێ جۆرهاوڕێ هەیە:

أـ وەك خواردنە بەردەوام پێویستیت پێیەتی (ئەوەهاوڕێی چاك وبڕوادارە)

ب ـ وەك دەرمان وایە هەندێ جارپێویستیت پێی دەبێ،هاوڕێیەکی مام ناوەندە

ج ـ هەیانەوەك دەردونەخۆشی وایە،خۆتی لێ بەدوربگرەتکایە.

*سێ جۆر دڵ هـەیە:

أـ دڵی ساغ (کەدڵی چاك وساغ وبڕوادارە)

ب ـ نەخۆش (کەدڵی دوورو ودەغەڵەکانە)

ج ـ دڵی مردوو (دڵی بێبڕوایانە کەرەق وبێ ویژدانە)

* سێ جۆرخۆراکی سەرەکی هەیە:

أـ خۆراکی جەستەولاشە(کەخواردنی ژەمەکانی ڕۆژانەیە بۆورگ)

ب ـ خۆراکی ڕۆح (کە زیکرویادی خوایە) الابذکرِالله تطمئن القلوب.

ج ـ خۆراکی عەقڵ (کەزانست وزانیارییە).

*صبرو ئارام گرتن سێ جۆرە، کەزانایان پلەبەندیان بۆداناوە:

صبرلەسەرتاعەت وعیبادەت (٣٠٠) پلەی هەیە)

صبرلەسەرنەکردنی تاوان وخراپە(٦٠٠پلەی هەیە)

صبرلەسەربەلاّومصیبەت وناخۆشی (٩٠٠پلەی هەیە)

۳ شت زۆرخراپن : درۆکردن،خۆبەزلزانین،ڕیابازی

۳شت زۆرپێویستن:یادی خوا،ئارامگرتن،زمان پاراستن

۳شت پیرۆزوجوانن:پاراستنی ئەمانەت،وەفاداری،لێبوردەیی

۳شت خۆشەویستن:گریان لەترسی خوا،ئازایەتی،ڕاستگۆیی

۳ڕەوشت زۆرجوانن:خۆشەویستی لەبەرخوا،بێدەنگی،هاوکاری

۳شت قێزەونن : بەخیلی،سووخواردن،خواردنەوەی هۆشبەرەکا

چوارییەکان: (٤) : پەندوئامۆژگاری ئەم جارە..لەسەربنەمای ژمارەچوارە..

وەك دەشتی چوارقوڕنەبەرین ودیارە.

* پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:ئافرەت لەبەرچوارشت دەخوازرێ :

(ماڵ وسامانەکەی ـ خانەدانی بنەماڵەکەی ـ جوانیەکەی یان دینەکەی) خاوەندینەکەیان

هەڵبژێرە بۆدنیاودواڕۆژت خێرە.

*چوارشت نیشانەی بەختەوەرییە: (خانومالّی فراوان، خێزانی پەروەدەکراو وجوان،

سەیارەی مۆدیل بەرزی زەمان، جیرانی چاك وبەئیمان)

* چوارڕەوشتی بەرزدەبنەهۆی چوارپلەی بەرز: (بێدەنگی سەلامەتیە،چاکەبەرزی وڕێزە،

بەخشین هۆی گەورەبونە،سوپاسگوزاری زیادەوزۆربونە)

*پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:دووپێی هیچ کەس هەڵنایەت لەقیامەتدا تالەچوارشت

پرسیاری لێنەکرێت؟ (تەمەنت لەچیدابەسەربرد ؟گەنجایەتیت لەچیداتەواوکرد ؟! ، ماڵەکەت

لەکوێت پەیداکرد ؟ وەلەچیت سەرفکرد ؟ زانستەکەت چۆن وچەندکارت پێکرد ؟)

* کتێبەئاسمانیەکان چوارن:ئەوانەی نوسراوودیارن:(تەورات،زەبور،ئینجیل، قورئان)

**٭مانگەحەرامەکان چوارن:کەشەڕیان تێداناکرێ ورێزدارن:**

(موحەڕەم،ڕەجەب،ژوالعقدە،ژوالحجە)

**٭ ڕوکن وبنەمای حەج چوارن**(ئیحرام،تەواف،سەفاومەڕوە، وەستانی عەرەفە)

**٭ خەلیفەکانی ڕاشدین چوارن..**کەهاوڕێ وخۆشەویست ویارن:(ئەبوبکروعومەروعوسمان وعەلی)

**٭ مەزهەبی لای خۆمان چوارن..**کەلەکوردستاندا دیارن:(حەنەفی وشافیعی ومالکی وحەنبەلی)

**٭ چوارپێغەمبەرلەنەتەوەی عەرەبن:**کەخاوەنی پلەوپایەونەسەبن:

(هود،شوعەیب،صالح،محمد) (علیهم الصلاه والسلام).

<u>پێنجیەکان :</u>

ڕێنمای ئەمجارەمان پێنج پێنجە..بۆتۆی گەنجە بەری ڕەنجە:

**٭پێنجی یەکەم : بنەماکانی ئیسلام پێنجن:** (دووکەلیمەی شایەتمان، نوێژکردن زەکات دان، ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان، حەجی ماڵی خواگیان).

**٭پێنج ڕەوشت لەسروشتی مرۆڤەکانە..**سوننەتی پێغەمبەرانە..نیشانەی کەسی پاك وجوانە..کەبریتین لەمانە:(خەتەنەکردن، بەرتاشین،سمێڵی کورت، هەڵکێشانی موی بن هەنگڵ،نینۆك کردن).

**٭پێنج شت پێش پێنج شت بەهەل بزانە فەرمودەی پێغەمبەرمانە(ﷺ):**

(ژیانت پێش مردن،گەنجایەتی پێش پیربونت، لەش ساغیت پێش نەخۆش بوون،کاتی بێ ئیشی پێش سەرقاڵ بوون،دەوڵەمەنی پێش هەژاربون)

***پێنج شتەگرنگەکانی ژیان..کەپێویستن بۆهەموومان،کەژیان بێ ئەمانە ژانە..پارێزگاری** هەریەك لەمانەنامانج ومەبەستی شەریعەتانە..کە (مقاصدالشریعه) نازناویانە،ئەوانیش:

(دین،عەقڵ،نەفس ولاشەی مرۆڤ،وەچەی مرۆڤ،ماڵ وسامان)

*** پێنج نوێژی فەرزلەسەرمانە..نیشانەوپێناسی موسڵمانەکەبریتین لەمانە:**

(بەیانی،نیوەڕۆ، عەسر،مەغریب،عیشا)

*** پێنج مەرجەکانی تەوبەکردنی ڕاستەقینە..بیزانەوببینە:**

(واز هێنان لەتاوان،پەشمان بونەوەلەسەری،گەڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنیان، سوربوون لەسەرنەگەڕانەوەبۆتاوان،تەوبەوتاعەتی چاك وپاك وبەردەوام)

*** مافی ڕێگاویان پێنجن:**(چاوداگرتن لەحەرام،وەلاّم دانەوەی سەلام، ئازار نەدانی کەس،فەرمان بەچاکە،ڕێگری لەخراپە)

*** پێنج شت شیفای دڵانن:**(قورئان خوێندن بەتێگەیشتنەوە،شەونوێژ،دانیشتن لەکۆڕی پیاوچاکان،خاڵی بونی ورگ،پاڕانەوەبەکوڵ ودڵ لەکاتی بەیانیاندا)

*** مەرجەکانی واجب بوونی حەج پێنجن:**(ئیسلام بوون،ئازادبێت،ئەقڵ وژیری باڵغ بێت، توانای ببێت)

*** پێنج هەستەکان بریتین لە:**(بیستن،بینین،تام کردن،بۆنکردن،دەست لێدان)

<u>شەشیەکان:</u> ئامۆژگاریمان لەم بەشە بەژمارەشەشەبۆتۆدیاری وبەخششە:

*** بنەمای ئیمان شەشە..سەرگەردانە ئەوەی لێی بێ بەشە:**

(بڕوابوون بەخودا،بەڕۆژی دوایی،بە فریشتەکانی، بەکتێبەکانی، بەپێغەمبەرانی، وەبڕوابوون بەقەدەری خێروشەڕ)

*** مافی موسڵمان لەسەرموسڵمان شەشە..داماوەئەوەی بێبەشە:** (وەلاّمدانەوەی سەلام، کەپشمی نزای بۆبکەی،کەنەخۆش کەوت سەردانی بکەی،کەمردشوێن تەرمەکەی بکەوی،

وەلآمی بانگهێشتنەکەی بدەیتەوە، وە ئامۆژگاری کردنی.

(فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)

※ **شەش ڕێگابۆگەیشتن بەزانست**:(زیرەکی،سوربوون،هەوڵدان،زمان،مامۆستا،ماوەی ژیان)

※ **شەش حاڵەت بەسەردڵدادێت**:(ژیان،مردن،ساغی،نەخۆشی،بەئاگابوونی،بێ ئاگابونی و خەوتن)

※ **شەش بەشە میرات لە قورئاندافەرزن**: پێان بدەن لێیان مەدزن:

( نیوە،چواریەك،هەشت یەك،شەش یەك،سێ یەك،دوولەسەرسێ)

※**کتێبەناسراوەکانی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) شەشن**:( صحیح بوخاری، صحیح مسلم، سنن الترمڈی،سنن ابی داود،سنن النسائی،سنن ابن ماجه)

※ **داخوازی بەهەشت بۆچوونەناوی شەشن**:

(خواناسین بەگوێڕایەڵیکردن،شەیتان بناسی ودژایەتی بکەین،حەق بناسی و شوێنی بکەوی، ناحەق بناسی وخۆتی لێدوربگری،دنیابناسی وگوێی پێنەدەی،دوارۆژبناسی وهەوڵی بۆبدەی

※ **هاوڕێیەتی خاسان وخواناسان. .لەشەش شتەوە ئەتبا بۆشەش شتی تر**:

(لەگومانەوەبۆدڵنیایی،لەڕوپاماییەوەبۆدڵسۆزی،لەبێ ئاگاییەوەبۆبێداری و هۆشیاری،لەدنیاوەبەرەودوارۆژ،لەخۆبەزلزانین بۆخۆبەکەم زانین، لەنیەتی خراپەکاری بۆئامۆژگاری چاکەکاری).

※ **شەش بەخشش بەدەس دێنی بەهۆی بەندایەتیکردنت بۆخواکەئەمانەن**:

(ڕوگەشی بەهۆی نوروڕوناکی دەم وچاوانی،سنگفراوانی،دڵی کراوەوئارامە، ڕزق وڕۆزی فراوان وبەتامە،جەستەولاشەی بەهێزە،لەناودلآندا بەرێزە.

※ **شەش کەس بەردەوام خەمبارن. .شپرزوبێزارن**:

(هەژارێك لەهەلپەی دەولەمەندیدایە،ئەوخاوەن ماڵەی لەسامانەکەی دەترسێ بفەوتێ،

حەسـود،هەوڵی شتێ بدەی لەتوانای خۆتدا نەبێت، بێڕێزوبێ تواناڵەناوکەسانی بەڕێزوبەهێز،وەکەسی هیچ وپوچ) .

**حەوتیەکان :**

*** حەوت مەرجەکانی (لاالەالاالله)**:(عـیلم ویەقین گەردن کەچی وقبوڵ کردن وڕاستگۆیی ودڵسۆزی وخۆشەویستی)

*** حەوت ڕێگای شەیتان بۆهاتنەناوئینسان:**

(شیرك،بیدعە،تاوانەبچوکەکان،تاوانەگەورەکان،بەهۆی شتی ڕێگە پێدراو، پێشخستنی چاك لەسەرچاکتر،ترس لەهێزودەسەلاتی دوژمنان)

*** حەوت شت لەناوبەرەکەفەرمودەی پێغەمبەرە(ﷺ)ئەوانیش:**

(شیرك ـ هاوەڵدانان بۆخوا،نازاردانی دایك وباوك،کوشتنی بەناحەق،سیحرو جادوو، خواردنی ماڵی هەتیوو،پشتهەڵکردن لەڕۆژی ڕووبەڕوبونەوە،تۆمەتی بوختان بۆپاك وبێناگایان)

***پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:حەوت کەس خوادەیانخاتەژێرسێبەرلەڕۆژی دوایی داکەهیچ سێبەرێ نیە:**

١)پێشەوایەکی دادوەر

٢)گەنجێك لەبەندایەتی خواپێگەیشتبێ

٣)پیاوێك دڵی بەمزگەوتەوەهەڵواسرابێ.

٤)دووکەس لەبەرخوایەکتریان خۆش بوێت

٥)پیاوێك خێربکات بەنهێنی بەدەستی ڕاستی کردی لای چەپی نەزانێ چی بەخشیوە.

٦)پیاوێك نافرەتێکی جوان داوای خراپەی لێبکات ونەویش بڵێ من لە خوادەترسم.

٧) پیاوێك لەتەنیایدایادی خوابکات وچاوەکانی پڕبێت لەفرمێسك.

*** دۆزەخ حەوت ناوی هەیە:**

(جەهەننەم،سەقەر،سەعیر،حوتەمە،لظی ،هاویە،جەحیم)

*** منالّەکانی پێغەمبەر(ﷺ)حەوت بوون:**(عبدالله،ابراهیم،القاسم،فاتمە،ام کلسوم، زەینەب،روقیە)

* ئاسمانەکان وزەوی هەریەکەیان حەوتن:

* ڕۆژەکانی هەفتە حەوتن

* منالّ بەحەوت مانگی لەدایك دەبێ.

*سوڕانەوەی دەوری کەعبەحەوت جارە،سەفاومەڕوەوبەردەکانی ڕەجمی شەیتان حەوت حەوتن .

**<u>هەشتیەکان:</u>**

*** هەشت شت هەموو تێیدابەشدارن بەسەریان دێت ناچارن کەئەمانەن:**

(دلّخۆشی،خەم وخەفەت،کۆبونەوە،جیابونەوە،ئاسان،ناخۆش وگران، نەخۆشی،تەندروستی)

*** هەشتن ئەوانەی زەکاتیان پێدەدرێت(کەئایەتی قورئانە) ئێستاچواریان هەن لەم زەمانە:**

(مسکین،فەقیر،کرێکاری کۆکردنەوەی زەکات،نوێ موسلّمان،کۆیلەیەك کە خۆی دەکڕێتەوە، قەرزار،جەنگاوەرانی ڕێگەی خودا)

*** هەشت دەرگاکانی بەهەشت:** ئەوەی خاوەن ئیمان وکردەوەیە پێی گەشت.

(دەرگای محمد(ﷺ)کەدەرگای تەوبەیە،دەرگای نوێژ،دەرگای ڕۆژو (ڕەییان)،دەرگای زەکات،دەرگای خێرات،دەرگای حەج وعومرە، دەرگای جیهاد،دەرگای صیلەی ڕەحم)

**<u>نۆییەکان :</u>** ئەمجاسەرەی ژمارەنۆیە..ئامۆژگاریەوبۆتۆیە

* **نۆشت بۆدروستی نوێژمەرجن:**

(ئیسلام،عەقڵ،تەمەنی جیاکەرەوەبێت،نیەت،دەست نوێژ،لابردنی پیسی، داپۆشینی عەورەت،ڕولەقیبلە،کاتی نوێژەکەهاتبێت)

* **نۆئامۆژگاری لوقمانی حەکیم بۆکوڕەکەی:**

(هاوەڵ بۆخوابڕیارنەدەی، نوێژبکە، فەرمان بەچاکەبکە،ڕێگری لەخراپەبکە، ژن بێنە،ڕووت لەخەڵك وەرمەگێڕە،لەسەرزەوی بەفیزمەڕۆ،لەڕۆیشتندا مام ناوەندبە،دەنگ بەرزمەکەرەوە، ئارام بگرەلەسەرناخۆشیەکان)

* **نۆخێزانی پێغەمبەر(ﷺ)کەلەدوای خۆی جێیهێشتن، دایکانی ئیمانداران ئەوانیش:**

(عائیشەی کچی ئەبوبکر(ر.خ)،حەفصەی کچی امام عومەر،زەینەبی کچی جەحش، مەیمونەی کچی حارس،ئوم حەبیبەکچی ابی سوفیان، ئوم سلمەجویریەکچی حارس، صەفیەکچی حویەیەی،سەودەی کچی زەمعە، ماریەی قبتی)،بەلام خەدیجەوزەینەبی کچی خوزەیمە لەژیانی خۆیدامردن.

<u>ژمارە (دە) :</u>

* **(١٠) کەس لەهاوەلان مزگێنی بەهەشتیان پێدراوەئەوانیش:**

(ابوبکر،عمر،عوسمان،عەلی،عبدالرحمن بن عەوف،سعد بن ابی وقاص،سعید بن زید،تەلحە بن عبدالله،زبیربن العوام،ابوعبیدەعامربن جراح)خوالێیان ڕازی بێت.

* **(١٠)شت هەڵوەشێنەری ئیمانن،لێیان دووربن تادەتوانن.**

١)هاوەڵدان بۆخوا(شیرك)

٢) کەسێ شتێ بکەیتە(واسیتە)لەنێوان خۆت وخوادا

٣)کەسێ گومانی هەبێت لەکوفری کافران
٤)ڕق بوونەوەیابڕوانەبوون بەهەندێ لەوەی لەپێغەمبەرﷺهێناویەتی.
٥)بڕوابوون بەوەی کەڕێبازی چاکترهەیە لەئیسلام،وەك ئەوەی ئێستا دەیڵێن ولەدڵیاندایە..دیموکراسی تاکەڕێگایە!
٦)گاڵتەکردن بەدینی خوایان بەشتێك لەدینەکە.
٧) سیحر(جادووگەری)
٨)پشتگیری کافران لەدژی موسڵمانان.
٩)بڕوات وابێ کەهەندێ کەس بۆیان هەیە لەشەریعەت دەربچن وئەوانە تایبەتن!
١)پشت کردن لەدین وگوێ پێنەدانی .
* (١٠)**شت لەنیشانەگەورەکانی کۆتایی جیهانن:**(دووکەڵ،دەجال،دەرچونی گیاندارێك کەقسەدەکات،خۆرهەلاتن لەڕۆژئاواوە،دابەزینی حەزرەتی عیسا، دەرچونی یأجوج ومأجوج،سێ ڕۆچونی گەورە،ئاگرێك لەیەمەن دەردەچێت وخەلکی بەرەومەحشریان ڕاودەنێت، فوکردنی یەکەم بەکەڕنادا،فوکردنی دووەم).
* **(١٠)شت بێ (١٠)شت بێ سودە!**
(زانستی بێکردەوە،کردەوەی بێ دلسۆزی،جەستەیەك بەندایەتی نەکات بۆ خوا، خولیاوخەیاڵ لەبەتاڵدا،بانگەشەی خۆشەویستی بێ گوێڕایەڵی،ماڵ و سامانێ کەخێری قیامەتی پێ بەدەست نەهێنا،بەسەربردنی کات بەبێ چاکە کردن،دڵێك خالّی بێ لە خۆشەویستی خوا،کاروکردەوەیەك لەخوانزیکت نەکاتەوە،ترس وئومێدت بۆلای کەسێك کەبۆخۆی هیچی پێ نەکرێ)
* **(١٠) کەس لەپیاوان میرات دەگرن:** ئەوانیش (کوڕ،کوڕی کوڕ،باوك، باپیر،برا،کوڕی برا،مام،کوڕی مام،مێرد، ئازادکەری کۆیلەی مردوو)
* **پێشەواعلی فەرمویەتی:**مکارم الاخلاق عشرخصال:

ڕەوشتەبەرزەکان(١٠)شتن: سەخاوەت،حەیاوحورمەت،ڕاستگۆیی،ئەمانەت شەهامەت،نازایەتی،هێمنی ولەسەرخۆیی،صەبر،شوکر، خۆبەکەم زانین.

* پیرەشاعیری کوردیش جوانی وتوە:

(١٠)شتم هێند لاگرانەڕاستی پێی سەختم تەواو
نازی عاشق، نوێژی فاسق،کیبروخۆبادانی پیاو
دەردی بەرتیل،ڕوی بەخیل،گاڵتەی ڕەزیل،دەنگی ناسازی مونەزین،
برسیەتی هەورازودیل،نازنوزی تازەپیاکەوتولەگەڵ ئەم عالەمە!.

* ئەم بابەتە(فێربون بەزمانی ژمارە)لەگۆڤاری پەیامی زانایان ژمارە(٨٤ )ی ساڵی٢٠١٢ بڵاوکراوەتەوە.

# کاریگەری وره بەرزی .. بۆگۆڕان وچاکسازی

ورەبەرزی:پەیمان وسوربونی دڵە لەسەرشتێ پێش ئەنجامدانی کارەکە چاك بێ یان خراپ، ورەبەرزی لەدڵەوەیە،دڵیش کەس دەسەلاتی بەسەردا ناشکێ جگە لەخاوەنەکەی،جاوەك چۆن باڵندەبەباڵ ئەفڕێ،بەهەمان شێوەش مرۆڤ بەنیەت وهیمەتی ئەفڕێ بەرەوبەرزی بۆرزگاربونی لەکۆت وبەندی مادی و مەعنەوی،(ابن قتیبە)لەهەندێ کتێبی حیکمەتدا هێناویەتی(عیون الاخبار/٣ /٢٣١)مرۆڤی هیممەت بەرزئەگەرکەوتیش نەفسی هەربەرزی دەوێ وکەوتن وژێر دەستەیی قبوڵ ناکا،وەك بڵسەی ئاگرهەرچەندە پێی پیانەنێ تا بکوژێتەوە بەلام ئەوڕازی نیەوهەربەرز دەبێتەوە،بەتایبەت موسڵمان نیەت وهیممەتی لەپێش کاروکردەوەیەتی هەرچەندە بۆیشی نەکرابێ چونکە ویستویەتی ومەبەستی بووەبۆیەبۆی نوسراوە:پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی(**من هم بحسنة فلم يعملهاكتبها الله عنده حسنة كاملة...**)(بخاری)واتە هەرکەس ویستی بو چاکەیەك بکات وبۆی نەکرا،خوای گەورە چاکەیەکی بۆدەنوسێ،خۆئەگەرویستی بیکات و ئەنجامیشدا،ئەوە یەك بە دەتایەك بە(٧٠٠)بۆی دەنوسرێ،لە فەرمودەی تردا هاتووەکەپێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(هەرکەس بە ڕاستی داوای شەهیدی بکات خوای گەورە دەیخاتە ڕیزی شەهیدان گەرلەسەرجێگەی خۆیشی مردبێ)(مسلم وابوداود والنسائي وابن ماجه)،ئەوەهەموی پاداشتی نیەت و هیمەتی بەرزوبڵندەکە بەڕاستی ویستویەتی وهەوڵیشی بۆداوەهەرچەندەبۆی ئەنجام نەدراوە چونکە هێزی موسڵمان لە نیەتی دڵەوە سەرچاوەی گرتووە،وەك خۆشەویستمان سەبارەت بە تەقوا فەرموویەتی(التقوی هنا)دەستی خستە سەرسنگی پیرۆزی وفەرموی تەقوا لێرەوەیە جا کەسی ژیروئازابەهۆی ورەبەرزی وحەزوئارەزوی ڕاستی نیەت پاکی بۆکارەکەی گوێ بەئازاری دڕك ودالی سەرێگە نادات،چونکە هێزوژیانەوەی دڵی بەسراوەبەهێزی هیمەت ونیەتی دڵی، کەهاندەرە بۆخۆشەویستی کارەکەی وئارامی دەرونی وسەلامەتی لەدوودڵی وخەمۆکی وبێ هێزی و بێزاری.،بۆیە ورە بەرز ماندونەناسەو پیری نازانێ ،پێشەوا بوخاری

ڕەحمەتی خوای لێبێت لە(صحیح)ەکەیدا دەڵێ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)بەپێی فێری زانست وزانیاری بون(ابن معاذ) دەڵێ پرسیم لە(أبا عمرو)تاکەی گونجاوەمرۆڤ فێربێ و بخوێنێ ؟ووتی: تاله ژیاندابێ چون ورەبەرزماندونەناسەومتمانەی بەخۆیەتی،بۆیە سەرەنجام بونەڕابەرلەسەرجەم بوارەکانی ژیانداوجوانترین نمونەی ژیانیان پێشکەش بەمرۆڤایەتی کرد وەبەپێچەوانەیشەوەدیارەخەڵکانی بێ هیممەت لەناخدارِوخاوترساوداماوجێ ماوو شەرمنن چونکەمتمانەی خۆیان لەدەستداوەوناتوانن هەنگاوبنێن وبارن بەسەر کۆمەڵگاوە (ڕەبیعەی کوری کەعب)کەخزمەتی پێغەمبەری دەکرد،ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموو: داواکاریت چیە تابۆت ئەنجام بدەم؟ئەویش پاش کەمێ بیرکردنەوە بێتەوەی داوای دنیابکات وتی:ئەمەوێت لەبەهەشتاهاوەڵت بم،بەڕاستی ئەوەیە هیمەتی بەرزکەتەنهاچاوی لەبەهەشتە ئەبوهریرە(ر.خ)کەیەکێ بوولەئەهلی صوففەلەمزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەمایەوە لەگەڵ هاوەڵانیدارۆژێ پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموونبۆچی تۆش وەك ئەوخەڵکەبۆدوای دەستکەوت ناکەی؟ئەویش وتی:ئەی پێغەمبەری خوامن تەنها یەك داوام هەیە،فەرموی چیە؟وتی: دەمەوێت ئەوەم فێرکەی کەخوافێری کردویت،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: شتێکی تر داوا ناکەی؟وتی:هەرئەوەم دەوێت،بەراستی ئەوبوهریرە چاك تێگەیشتبووچونکە زانست و زانیاری بەرزی وگەورەیی دنیاوقیامەتە میراتی پێغەمبەرە وەڕێگای بەهەشتەهەروەك پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت (من سلك طرقا يلتميس فيه علما سلك الله له به طريقا الى الجنة)،پێغەمبەر(ﷺ) دوعای فێربون ولەبەرکردنی بۆئەبوهریرە کرد،ئەوەتازیاترلە (٦٠٠٠) فەرمودەی لەپێغەمبەرەوەگێراوەتەوەلئیبن قیم لەبارەیەوەدەڵێ:چەندە هیمەتێکی بەرزەو چەندەخەڵکی جیاوازن لەهیمەتدا،ئەوەتا(ئیبن ام مکتوم)نابینابوونایەتی(عبس وتولى ...) لەسەرهاتەخوارکەخوا لۆمەی پێغەمبەری کردلەسەرئەوکاتێك،پێشەواعمرویستی سوپا بنێرێت بۆشام (ئیبن ام مکتوم)یش خۆی ئامادەکرد،عمرپێی وت تۆعوزرت هەیەنابینای خواعوزری داویتێ کەنەچی،وتی:ئەی کوری خەتاب ڕێگەی شەهادەتم لێبگری؟! عمر

وتی:باشە چی دەکەی لەگەڵیان؟وتی ژمارەیان زیاددەکەم بۆیەچوەناوەڕاستی گۆڕپانەکە و ئالاکەی بەدەستەوەگرتبوودوای کۆتای جەنگەکە بینیان شەهیدبوەو ئالاکەلەباوەشیدایەو زەردەخەنەش لەسەرلێویەتی! بەڵێ ئەم پیاوە دەرچووی قوتابخانەکەی پێغەمبەربوە ﷺ بۆیە لەسەرهیمەت بەرزی وخۆنەدزینەوە پەروەردەی کردبوو.

## هیممەت بەرزی پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل:

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ)دەبێتەمیوانی عەرەبێکی دەشتەکی،زۆرڕێزلەحەزرەت دەگرێ و خزمەتی دەکات،ئەویش پێی دەفەرموێ:چیت دەوێ داوابکە،کابرا وتی:ئەی نێراوی خوا، حوشترێك بەپێداویستیەکانیەوەوبزنێك کەخێزانم بیدۆشێ،ئەمەی دوو جاردوبارە کردەوە، حەزرەت(ﷺ)پێی فەرمو(ئەت توانی وەك پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل بیت)هاوەڵان وتیان پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل چییە؟فەرمووی:کاتێ موسی(س)ویستی لەگەڵ بەنی ئیسرائیل شەودەرچێ،ڕێی لێ تێك چوو،زاناکانیان وتیان:ڕەنگە حیکمەتی تیابێت ونبوین وڕێمان لێ تێك چووە، بۆئەوەی هەر خۆمان نەڕۆین ودەمانەوێ پێت بڵێین کەحەزرەتی یوسف پەیمانی لێوەرگرتوین ئەگەرلەمیسردەرچوین لاشەی ئەویش لەگەڵ خۆمان ببەین،موسی فەرموی: کامتان دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە؟وتیان:تەنها پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە،ناردی بەدوایداوکەهات پێی فەرموو:قەبری(یوسف)م نیشان بدە،وتی پیشانت نادەم هەتاوەکونەبمەهاوەڵت لەبەهەشتا لەویش پێی ناخۆش بو(ڕەنگە لە بەرئەوەبێ کەداوای چونەبەهەشت بەدەست ئەونیەیان لەبەرئەوەی ئەوپرسیارەی بۆپیشاندانی قەبرەکە، کەی ئەوەدێنێ ونەوەندە گەورەیەبەرامبەربەهەشت بێ؟) خوای گەورەشروشتی بۆنارد، کە پەیمانی بەهەشتی بدەرێ..کەپەیمانی چونەبەهەشت وهاوەڵیەتی دایە،ئەویش شوێنێکی پیشاندان کەئاوی تیاوەستابوو،وتی:ئاوەکەلابدەن کەلایان بردوتی دەی ئێرەهەڵکەنن، کە هەڵیان کەندلاشەی حەزرەتی یوسف دەرکەوت،لاشەکەی هیچ تێك نەچوبو!کەدەریان هێنا دەدرەوشایەوەوڕێگای بەوشەوە بۆڕوناك کردنەوەوڕێی خۆیان دۆزیەوە.

## لەهەموو شتێ بەهێزتر هێزی ئیمانە :

لەم ڕۆژگارەدا موسڵمانان بێ سەروبەری و بێ هێزیان پێوە دیارەکە دەگەڕێتەوە بۆلاوازی بیروباوەڕوچۆك دادانیان لە بەرامبەردوژمنان! بێگومان بیروباوەڕی بەهێزسەرچاوەی هەموو خێروبنەمای سەرکەوتنە، لەمەسنەدی ئیمام ئەحمەدا هاتووە (دوای ئەوەی خوای گەور: زەوی دروست کرد،زەوی ئەجولاونەدەوەستا بۆیەچیاکانی پیاداکوتین و ڕاوەستا، فریشتەکان وتیان ئەی خوایە چ شتێك لەچیاکان بەهێزترە؟ فەرمووی ئاسن،وتیان ئەی چیت دروست کردووە لە ئاسن بەهێزتر؟ فەرمووی ئاگر، ئەی چی لەئاگر بەهێزترە، فەرمووی ئاو(چونکە ئاسن چیادەبڕێت ئاویش ئاگر دەکوژێنێتەوە) ئەی لەناو بەهێزتر،فەرمووی با، ئەی لەبا بەهێزتر؟فەرمووی: هێزی ئیمانی بڕوادار).

## فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە

### هەنگاوی گۆڕانە بۆچاکسازی وپاکسازی

یەکێ لەبنەماسەرەکیەکانی ئیسلام فەرمان بەچاکەوڕێگری لەخراپەیەکەلەپێناو گۆڕانی ئیجابی وبۆچاکسازی وپاکسازی کۆمەڵگایە وفەرمانی خواوپێغەمبەرەو بەداخەوەکەئێستا لە ناو مانداکەم بوەبەهۆی لاوازی ئیمان وسەرهەڵدانی نەفامێتی ئەم ڕۆژگارەکەدەڵێن(دەست بەکلاوەشرەکەی خۆت بگرە)ودەنگ مەکە یان بەپاساوی ئازادی وسەربەستی کەس حەقی کەسی نیەوماف پێشێلکردنەلەکاتێکداخوای گەورە وەسفیئومەتی محمد دەکات بەچاکترین گەل و نەتەوە چونکەفەرمان دەکەن بەچاکە و ڕێگری دەکەن لەخراپەوباوەڕدارن،چون باوەڕداری ڕاستەقینەیەکەبەخەم گەل ونەتەوە وهەولێ گۆڕانی ئیجابی دەدات وخیانەت لە گەل و نیشتمان ناکات، (كنتم خير امة اخرجت للناس تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكروتؤمنون بالله) (ال عمران /١١٠) کاتێ پێشەواعمر ئەوئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: کێ حەز دەکات لەو ئومەتەبێت بامەرجەکانی خوابەجێ بێنێ،واتە فەرمان بکابەچاکەو ڕێگری بکالەخراپە،بەداخەوە

کەهەندێ کەس ئەگەر ڕاستی نیشان بدەی دەڵێ:من ئازادم..تۆحەقت چیە خۆناچمە قەبری تۆوە.. ئەمەو چەندین وەلاٌمی تری نابەجێی نەفامی! هەر لەبەر پلەوپایەی ئەوبنەماگرنگەیەکەپێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:(**من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبلقبه وذلك اضعف الايمان** ) (مسلم وابوداودوالترمذي والنسائي وابن ماجه) واتە:هەرکەس لەئێوە خراپەیەکی بینی بابیگۆڕێ ولای بدات بەدەستی،ئەگەرنەیتوانی بابەزمان پێیان بڵێ،ئەگەرئەوەش نەکرا بابەدڵ پێی ناخۆش بێ،کەئەوەش لاوازترینی ئیمانە.کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمان لەپێناوکۆمەڵگەیەکی چاکوپاك وناسودە وبەختەوەربەپێی توانای خۆی فەرمان بکابەچاکە وڕێگری بکاله خراپە،بەلاٌم خۆی لەبیرنەکات ودەبێ لەخۆیەوە دەست پێبکات، زەرەدوزیانی کەمتەرخەمی کردن لەفەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپەماڵ وێرانیەبۆهەموان وەك پێغەمبەر(ﷺ)لەفەرمودەیەکداکەئەمەماناکەیەتی وتیایدا کۆمەڵگای بەسەرنشینی کەشتیەکی دوو قات چواندووەوبڕواداری دڵسۆز فەرمان دەکات بەچاکەوکەشتیەکە دەپارێزێ ونایەڵێ خراپکارکونی بکات چونکە هەموویان بەچاك وخراپەوە لەناودەچن،بەلاٌم لەناو کەشتیەکەدا خراپ کاری تێدایە وهەوڵی کون کردنی دەدات،جائەگەر لێ گەڕێن وهەرکەسەیان بێدەنگ دابنیشن ئەوەهەموویان لەئاوەکەدا دەخنکێن، بەڕاستی وێنەیەکی جوانە وئێمەش هەموومان پێکەوە دەژین ولەسەر یەك نیشتمان ودەبێ بەخەمیەوە بین وڕێگری بکەین لەوانەی بازرگانی بەسامانی ئەم گەلەوە دەکەن وخیانەت و گەندەڵی بلاٌودەکەنەوە وگەل بە ئاڕاستەیەکی خراپدا دەبەن،بێگومان ئەوانەدژی بنەمای فەرمان بەچاکەوڕێگری لە خراپەن وگۆڕان بەدژی خۆیان دەزانن و شەمشەمەکوێرەیش حەزی لەتاریکیەوبە تیشکی خۆر قەڵسە .

# نەفامێتی هاوچەرخ

**ئەگەر نەزانین چۆن بگۆڕین .......بەدڵنیاییەوە ئەدۆڕێین ؟!**

جێگەی داخ وسەرسوڕمانەکەلەسەردەمی تەکنەلۆژیاومافی مـرۆڤ و جیهانگیریدامێـژوی نەفامی لەبەرگێکی تازەونوێداسەری هەڵداوەتەوە! لەڕێگەی شوێن کەوتنی نەزانانەو چاو لێکەری کوێرانەبۆمۆدێلی بێگانە نەریتەخراپەکانی پێش ئیسلام کەئەمڕۆ بونەتە هێمـای پێشکەوتن وباوی سەردەم لەئەوەی پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)(١٤٣٣)ساڵ بەر لەم کاتـە فڕێی دانوخستیەژێرپێیەوە تازەخەڵکانێك ئەیخەنەبانی سەریان! لەوەش سەیرتردینەکەمان بەکۆنە پەرست ناودەبەن بەلاّم گەڕانەوە بـۆپێش ئیـسلام بەلایانـەوەتازە گەریەپێغەمبـەر (ﷺ)لەبەشێکی وتارەکەی (حجة الـوداع)دافـەرموی:(**ألا کـل شـيء مـن امـر الجاهلیـة تحت قدمي موضـوع**)، واتـە:ئاگـاداربن کەهـەموکارێکی سـەردەمی نـەفامی خـستمەژێر پێوە،(نابێ دووبارە ببنەوەخرانە زبڵدانی مێژووەوە چونکەچەمکی(کلّ شيٍ) گشتیە بـەلاّم تایبەت کراوە بۆئەو شتەخراپانەی کە لەو سەردەمەدابلاوبووە وبەهاتنی ئیـسلام نـەمان و کۆتاییان هات ئێستاش بۆیان گەڕاندوینەتەوە وەلەبەرگێکی تازەونوێدا!! بۆنمونە:

**یەکەم:. کوشتنی منالْ:**

لەسەردەمی نەفامیداهەندێ لەبێ باوەڕەکان منالّەکانی خۆیان ئەکوشت لەترسی هەژاری ونەداری یان کچەکانیان زیندەبەچاڵ ئەکردلەبەرئەوەی بەلایانەوەعەیب وعاربووشو بکات کەئیسلام هات ئەوەی لێ قەدەغەکردن ولەچەندین ئایەتداباس لەوە دەکات کەرزق و ڕۆزی هەمووان لای‌خوایەوکوشتنیان ستەمە وتاوانە،وەك فەرمویەتی:(**ولاتقتلوا اولادکم من املاق**) ألانعام/١٥،یان سەبارەت بەکوشتنی کچان فەرموویەتی:(**بأي ذنبٍ قتلت** ) واتە:بەچ تاوانێك کوژراوە ؟! ئێستاش هەمان دیاردەی کوشتن و لەناوبردنی منالْ بە شێوەیەکی تردووبارە بۆتەوە بەتایبەت لەباربردنی منالّی زیندو، ئەوژنانەی کەدەچنەلای

پزیشکی ئافرەتان بۆسۆنەری سکەکەی ئەگەربەدڵی نەبووزۆرجارلەناوی دەبات کە ئەوەش تاوانی کوشتنی نەفسێکە.

دووەم:. **چەپڵەلێدان وفیکە کێشان**:زۆرباوبووەلەسەردەمی نەفامی داو تەنانەت لەکاتی پەرستش ودینداریەکانداکەبەدەوری بەیت دا ئەسورانەوە! وەك خوای گەورەلەبارەیانەوە فەرمویەتی:﴿وماکان صلاتهم عند البيت الامکاءَوتصدية.. ﴾ الانفال/ ۳۵ واتە: نوێژکردنی ئەویت پەرستانەلەکەعبەدا هیچ نەبووجگەلە فیکەوچەپڵە لێدان نەبێت کەژن و پیاویان بەڕووتی و تێکەڵاوی بەدەوری کەعبەدا دەسوڕانەوە!خۆیان بەڕاست وچاك دەزانی(وەك ئەوانەی ئەمڕۆ)وبەتایبەت ئەگەرموسڵمانێکیان بدیایە لە تەوافی کەعبەدابەفیکەو چەپڵە گاڵتەیان پێ دەکرد!بەداخەوە کەدوای چواردە سەدە ئێستا چەپڵە لێدان فیکە کێشان دوبارە سەری هەڵداوەتەوە وبەتایبەت پیاوەگەورەکان دەبێ بەچەپڵە پێشوازیان لێ بکرێ وبەلایانەوە نیشانەی پێشکەوتن وڕێزلێنانە!تەنانەت هەندێ لەئیسلامیەکانش لەدوای کۆڕوئاهەنگەکان چەپڵە لێدەدەن !کەلەڕاستیداچەپڵەلێدان بۆدڵ خۆشکردنی منالآنەیان بۆتێك بەردانی دوو (هینانە)،وەبەچەپڵەوفیکە هیچ گۆڕانوپێشکەوتنێك بەرجەستەنابێت جگەلەهەرزەیی و سوکایەتی .

**سێیەم: گومانی خراپ بردن:**

لەسەردەمی نەفامیداگومانیان خراپ بووبەرانبەرخواوپێغەمبەروقەناعەتیان نەبووبەسەر کەوتنی پێغەمبەرودینەکەی،لەکاتێکدا دەیانزانی محمد(ﷺ)ڕاستەو درۆناکات وڕاست و ناڕاستیان تێکەڵ دەکرد،وەك خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرموویەتی:﴿ ...يظنون بالله غير الحق ظن الجاهلية﴾ (ال عمران /١٥٤) واتە:(هەندێ لەوانەی کە ئیمانیان لاوازبوو هەرخەمی خۆیان بوولەکاتی شکانی لەشکری موسڵمانان لەجەنگی (ئوحود)داگومانی خراپیان دەبردو هێشتا ئیمانەکەیان ئاسەواری نەفامی پێوە دیار بوو...)بەداخەوە کەئێستاش بەهۆی لاوازی ئیمان وزاڵبوونی جیهانی ماددەگەرایی‌بەسەر ڕوحداگومانی خراپ زۆربووەبەرانبەربەئیسلام و

تەنانــەت بەرانبەربەیــەکتریش وکەبەهۆیەوەمتمانەوخۆشەویــستی یــان بــۆ یــەکتر لەدەســت داوەوبەچــۆك داهــاتوون بەرانبــەردوژمنان چــونکە خــوای گەورەلەگــەڵ گومــانی بەندەکــەی ئاگادارەچۆن بیردەکاتەوەهەرواش دەبێت .

**چوارەم: حوکم بەیاسا دەسکردەکان .!**

لـەبیروڕای ئیـسلامداحوکم وفـەرمان ڕەوایـی بۆخوایەودەسـەلآت بۆخەلکەلەدانانی‌بەرپرسی شـیاو،واتەدەبێ بەیاساوشـەرعی خـوا کاربکرێت،نـەك مرۆڤـەکان بـەئارەزوی خۆیـان حـەلأڵ وحـەرام دیـاری بکـەن یـان کـەم وزیـاد لەیاسـاکان دابکـەن بـۆ بەرژەوەنـدی لایەنێك،یاسـای مرۆڤکردنەفامیــە چــونکە مــرۆڤ عــیلم وعــەقڵی سـنوورداره وهەواوئارەزوبەســەری زاڵە،بۆیــە دەبینی بەردەوام لەبەرکەم وکورتی سـالآنە تعـدیلات دەکرێـت لەبڕگەیاسـاکانیاندا بـەلآم لـە ئیسلامدا هێڵە گشتی یەکان دیـاریکراون ولەوچوارچـێوەیەدا پـرس وڕاومەشـوەرەت دەکـرێ، جگەلەوەی کەهەندێ لەحوکمەکانی نەگۆڕن. لەسەردەمی نەفامیدا بەئارەزوی خۆیان یاسـایان دادەنا،جیاوازیان دەکردلەنێوان منالەکانیان‌لیاساکان بۆدەسـەلآتداروەولەمەندان جیـاواز بـوو لەجێ بەجێ کردنیدا لەچاو هەژارەکان لەوەتا ئێـستاش لەبـەرگێکی تـردا خـەڵکی بۆخۆیـان یاسـادادەنێن ولـەدادگاکان کاربەشـەریعەتی ئیسلامی نـاکرێ وحـەددی زیناودەست بـڕین و قصاص بەدۆنەپەرستی ودواکـەوتویی لەقەڵـەم دەدەن وبانگـەوازبۆپیادەکردنی شـەریعەت بـە جۆرێك لەدیکتاتۆری دەزانن وبەئاشکرا ڕەخنەلەقورئان و سوننەت دەگـرن! لەکاتێـکدا خـوای گەورەفەرمویەتی:﴿**ومن لم یحکم بماانزل الله فألئك هم الظالمون .. الکـافرون.. الفاسـقون** هەرچەندە ئێستاموسڵمانان بەوحاڵەتە ڕازی نین بەلآم حوکمی واقیعەودەبێ لەهـەوڵ دابـین بـۆ گۆڕینی.

**پێنجەم: سفوری ئافرەتان :**

لەسەردەمی نەفامیـدا دابونـەریتی ئافرەتـان بەشـێوەیەك بووکـەخۆیان رووت دەکـردەوە و جوانیەکانی خۆیان نیشانی بێگانە دەدا بەلارو لانجـەو بـۆنی خـۆش ودەنگـی بـازن وخرخـاڵ

سەرنجی پیاوانیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا،ئەوەلە کاتێکدا ئافرەت جوانیەکەی تەنهابۆ پیاوی خۆی بێت نەك وەك تاکسی گشتی بێت،بەڵێ جارێکی ترلەسەردەمی بەناو پێش کەوتن دا ئەونەریتە خراپە دوبارە گەڕاوەتەوەناومیللەت وبۆتە نیشانەی پێشکەوتن و ئازادی وسەربەستی ئافرەتان ئەوەتاخوای گەورەفەرمویەتی:﴿...ولا تبرجن تبرج الجاهلية الاولى﴾(الاحزاب /٣٣) واتە:وەك ئافرەتانی سەردەمی نەفامی خۆتان مەڕازێننەوە و جوانیەکانی خۆتان دەرمەخەن،چونکەئەوان کەدەچونەناوبازاڕوتێکەڵی پیاوان دەبون بەنازو نوزەوە قسەیان لەگەڵ پیاواندا دەکرد،لەکاتێکدا یەکێ لەجیاوازیەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ بەرگ وپۆشاکەوبالاپۆشیش بۆ ڕێزو حورمەت وپاراستنی کەسایەتی ئافرەتانە،نەك کۆیلەیی وسوك سەیرکرانی(سبحان الله) لەگەورەیی ئەم ئیسلامەوبچوکی ئێمە،کەمتر بیرلەیاساکان دەکەینەوە،دەرەنجام و سەرەنجامی سفوری وڕوتی بزانە چ فتنەیەکی لێکەوتۆتەوەو کە قوربانیەکەمیش لەوفتنەیەدائافرەتان بۆخۆیانن کەوەك بوکەشوشەیاریان پێدەکەن وبۆ مەرامی خراپ بەکاریان دێنن.

## شەشەم: دەمارگیری ورەگەز پەرستی :

دەمارگیری وڕەگەزپەرستی بۆلایەن وتیرەوتایەفەورەنگ لەسەردەمی نەفامیدا باوبووکەلەلوت بەرزی وخۆبەزل زانینەوە سەرچاوەی گرتبوو، هەریەکەیان خۆی وتیرەکەبەگەورتروچاکتر دەزانی لەبەرانبەرەکەی ولەخۆیان بایی ببووهەرئەوەش بووەهۆی ئەوەی کەسوربن لەسەربت پەرستی یەکەیان ونەیەنە ناوئیسلامەوە،خوای گەورە فەرمویەتی﴿اذجعل اللذين كفروا فى قلوبهم الحمية حمية الجاهلية...﴾ واتە:بێباوەڕەکان بەدەعیەوغیرەتی نەفامیان ڕێگریان کرد لە پێغەمبەروریارانی کەسەفەری عەمرەبەجێ بێنن، ئێستاش بەداخەوە لەجیاتی عیززەت و غیرەتی ئیمانی وتەعەصوب بۆئیسلام !دەبینی دەمارگیری ولایەنگیری بۆلایەن وحیزب و ڕەگەزو ڕێکخراوعەشیرەت ونەتەوەپەرستی لەجیاتی نەتەوە ویستی و خواپەرستی ئەمانە وچەندین دەمارگیری ڕەگەزپەرستی وشتی تردوبارە بونەتەوەلەم ڕۆژگارەداکەڕێگرەلەسەلماندنی

حەق وڕاستیەکان وتەنها کۆمەڵی خوی بەچاك وپاك دەزانیٚ وبەهەمووشیٚوەیەك پشتگیری لیٚدەکات چاك بکایان خراپ ! ئەوەلەکاتیٚکدا لەئیسلامدا حیساب بۆ هەموونەمانە کراوە لەسنوری خۆی دا،هەرئەوەش وای کردووە کەمیللەتیٚکی مسوڵمانیوەك کورد کە٪٩٥ خاڵی هاوبەشیان هەیە و یەك ڕیزیان لەدەست داوەو کوردایەتی وئیسلامەتیان پەراویٚز خستووەو (هەرکەسە بەیاری خۆی هەڵدەڵیٚت) .

**حەوتەم:. مەی خواردنەوە :**

لەسەردەمی نەفامی دائارەق خواردنەوەئاسایی بوووەك چۆن ئیٚستاچایی خواردنەوە ئاساییە، کەئیسلام هات پلەبەپلە بەهیٚواشی بنەبڕی کردوو حەرام کراوسزای دادکاری بۆداناچونکە زیان بەخشە بۆسەروماڵ و دایکی خراپەوتاوانەکانە وهەمووکەس ئەوڕاستیە دەزانیٚکەمادده هۆش بەرەکان سەرچاوەی ماڵ ویٚرانی دنیاودواڕۆژن،سەیرلەوەدایەکەدوای چوارده سەدەبە جۆریٚك ڕەواجی پیٚدراوە کەئیٚستابە مەشروباتی ڕۆحی ناودەبریٚ وخەڵکانی خاوەن پلەوپایەو ڕۆشنبیردەیخۆنەوەونیشانەی پیٚشکەوتن وکرانەوەیە!ئەنانەت ئەوەندەشانازی پیٚوەدەکەن کەلە ڕۆژانی هەینی لەسەرڕیٚگاکان میٚزدەڕازیٚننەوە!!بەموسڵمانانیش دەڵیٚن ئەوانەدواکەوتون! بەلاٚم وەك گوتراوەکەس عەیبی خۆی نابینیٚ،ئەیناخۆیان گەڕاونەتەوەبۆ(١٤٣٣)ساڵ بەرلە ئیٚستا بۆسەردەمی نەفامی نایانەوەپیٚشکەوتن وگۆڕانەیان پاشکەوتن ودۆڕانە؟

**هەشتەم: قومارکردن :**

بەهەمان شیٚوەیش لەپاڵ ئارەق داقومارکردنیش باونەریتی سەردەمی نەفامی بوونیسلام هات پیٚکەوە حەرامی کردن بەئایەتی:﴿ انما الخمر والميسروالانصاب... ﴾چونکە ماڵ خواردنی بە ناهەق وفیتنەوئاژاوەی تیٚدایەو جگەلەزەرەدوزیان هیچ سودی نی یە، ئیٚستابەهەمان شیٚوە لەم سەردەمەدا بەگەرمی سەری هەڵداوەتەوەبەتایبەتی کاربەدەست وزلە زلەکان شەوانی خۆیان بەئارەق وقوماربەسەردەبەن تاکوهەیان بووە ژنەکەی وکچەکەی دۆڕاندوە!!

نۆیەم: بت پەرستی :

بت پەرستی یەکێ بوولەنەریتە باوەکانی سەردەمی نەفامی لەنیوە دورگەی عەرەبیدا،بتیان دەپەرست بۆئەوەی لەخوایان نزیك بکاتەوە! کەلەدارو بەرددایان ئەتاشی،بەلاّم ئێستالەم سەردەمەدا بت پەرستی بەشێوەیەکی ترە بزانن یان نەزانن دوبارە بۆتەوە بەناڕاستەوخۆ، بتی ئێستاهێزودەسەلاّتی هەیە،پارەی هەیە،دەنگ ورەنگی هەیەوخاوەنی بەرنامەیە،خەلکانێك هەن بێ ئەوەی هەست بکەن بۆنەتە عەبدی عەبدان! کۆیلەی ئەم وئەوبەشەخص پەرستی و حیزب پەرستی پەڕۆپەرستی(پەنابەخوا) لەنەفامیتی هاوچەرخ کەخەلکانێکی زۆرپێشبڕکەی بۆدەکەن وشانازی پێوەدەکەن!چونکە بە پێشکەوتن وشارستانی دەزانن! ئەمەودەیان دەردو نەخۆشی تری وەك (مامەلّەی سودوڕیباو فێلّکردن وخیانەت ونێربازی وکوشتنی بەناهەق) کەلەناوبەری مرۆڤایەتین وتێکدەری شیرازەی خێزانەودەرەنجامی ئەوانەدەیان نەخۆشی وەك:ئەنفلۆنزای حیزب وبەراز وئایدزی لێکەوتۆتەوە کە بەملیارەها دۆلاری بۆسەرف دەکرێ بنەبڕیش نابێ، چارە سەری ڕاستەقینە گۆڕانی ئیجابیەکەگەڕاونەوەیە بۆبنەماکانی ئیسلام کەیەکێ لە مەبەستە کانی شەریعەتی ئیسلام هاتووە بۆپاراستنی پێنج شتەگرنگەکانی مرۆڤ کەئەوانیش(دین وعەقلّ ومالّ ونەفس ووەچە) بۆپاراستنی دینەکەت جیهادی داناوە، بۆ پاراستنی عەقلّ مەشروباتی حەرام کردووە وسزای بۆداناوە،بۆپاراستنی نەفسی مرۆڤ تۆلّە سەندنەوەی بۆداناوە وکوشتنی ناهەقی حەرام کردوە،بۆپاراستنی وەچەی مرۆڤەکان زینای حەرامکردووە، بۆپاراستنی مالّ و سەروەتی هاولاّتیان غەش و فێلّی حەرام کردووەودەستی دزدەبڕێت. وەپێغەمبەریش(ﷺ)فەرمویەتی:(انما بعثت لاتتم مکارم الاخلاق)واتە:من بۆیە هاتوم کەڕەوشتەجوانەکان وبەهابالاّکان تەواو بکەم،سەرجەم فەرزەکانی ئیسلام بۆڕەوشتە جوانەکان،بۆنمونە نوێژبۆبەرجەستەکردنی ڕەوشتی جوانە،ئەگەرنوێژێ لەدرۆودوو ڕوی وحەرام و خراپە نەیگێڕایەوە کەواتەئەوەنوێژی ڕاستەقینەنیەوچاولێکەریە،لەبەرئەوەیەئیسلام داوای گۆڕانی ئیجابی ونوێ بونەوەدەکاچونکە جیهان بەردەوام لەگۆڕان دایە،بەلاّم سورەلەسەر

دژایـەتی کردنـی نـەفامی وزیندوکردنـەوەی ڕەوشـتەکانی،وەك پێغەمبـەر(ﷺ)فەرموویـەتی:
**(ابغض الناس الى الله ثلاثة:ملحدفی الحرم، ومبتغ فی الاسلام سنة الجاهلیـة،ومطلب دم امریء بغیرحق لیهرق دمه}** (رواه البخاری) سێ کەس هەن خوازۆر ڕقـی لێیانـە(پەنابـەخوا لەتوڕەیی خوا)بێ بڕوالەحەرەمی کەعبـەدا، کەسـێ لەناوموسڵمانانداڕەوشـتەکانی سـەردەمی نەفامی زیندوبکاتەوە وبەشوێندا بگەڕێ و هەوڵی بۆبداوپیا هەڵداو شیرینی بکات لەبەرچاوی خەڵك وەکەسێکیش بگەڕێ بەدوای ئەوەی کەخوێنی بەناحەق بڕێژێ .

## جۆرە کانی نەفامـی

نەفامی وەکوکات وسەردەم زەمانەکەی بەسەرچووە ونەماوە، بەڵام وەکو ڕەوشـت وڕەفتاریـان مۆێلی ڕۆژگار لەناوکۆمەڵگادەبینرێ لەسەرئاستی تاکەکان :ئەوەکەهەنـدێ کـەس ئەوشـتانە دەکەن کەپێشترهەبون وئیسلام پوچەڵی کردنەوەجارەوشتێ یـان چەندشـتێ لەوانـەدەکات وەك: بەحەلاڵ زانینی ڕیبایان سوجدەبردن بۆبـت کەئێـستاش لەهەنـدێ ولاَت هەیەئەمانـە دەچنـە خانەی بێ باوەڕیەوە، بەڵام هەندێکی ترلەو ڕەفتارانە هەر چـەندە کـەهی سـەردەمی نـەفامین بەڵام مرۆڤ پێی لـەدین دەرناچـێ،وەك : تانەوتەشەرلەنەسـەبی یەکترویەخنەداڕنین ودەم و چـاو ڕنینەوە لەکاتی شین وپرسەدا، بـەلاَم تـاوان وحەرامن،چـونکەتاوانکاری وبـێ فـەرمانی خـوا نەفامییە وهی پێش ئیسلامەجالەهەرسەردەمێکدا ئـەنجام بـدرێ هـەر تاوانـە ونەفامیە،بۆیـە پێویستەلەسەرموسڵمان سـیفەتەکانی جاهیلیـەت بناسـێ وبیـان زانـێ تـا نەکەوێتـە ناویـان، چونکە هەرکەس جاهیلیەت نەناسـێ دووچـاری دەبێـت .بـەڵام نـەفامێتی کۆمـەڵگاکان ئـەو سیستم و فەرمانڕەواییە کەبەڕێوەیان دەبات وئیسلامی نییە وبڕوای بە حاکمیەتی شەرع نیە، ئەوە کۆمەڵگایەکی نەفامیە،وەبەتاکە موسڵمانەکانیش کەلەناویاندادەژین دەوترێ موسڵمانن لـەناو کۆمەڵگایـەکی نەفامیـدا دەژیـن، وەهەنـدێ لـەو کۆمەڵگایانـە زۆربـەی یاسـاکانیان لەئیـسلامەوە وەرگرتـووە، ئـەوەدەتوانین بلـێین کۆمەڵگایـەکی ئیـسلامییەوبەڵام جـاهیلی تێکەڵکردووەوەك زۆرێك لە ولاَتەئیسلامیەکانی ئەمڕۆ .

# پرۆسەی خوێندن ..هەڵوێستە وسەرنج

**بەشی یەکەم: فەلسەفەی خوێندن...**

وێڕای پیرۆزبایی ساڵی تازەی خوێندن وهیوای سەرکەوتن بۆسەرجەم خوێندکاران،پێویستەفەلسەفەی خوێندن ئیمانی بێت تاکوفێری پەروەردەوزانستیێ ببن کەلە یەکتاپەرستی نزیکیان بکاتەوەوببنەنەوەیەکی باش لەداهاتودا،ئێستا بەهۆی سیستمی پەروەردەی سیکۆلاریەوەوانەی ئاین ستەمی لێکراوە! پەراوێزخراوە! بۆتاقیکردنەوەی گشتی داخل نەکراوە!لەگەڵ عەرەبیدا(٢٠) نمرەی بۆدانراوە!بۆیە دەبینی خوێندن بۆمەبەستی بڕوانامەیە وبڕوانامەش بۆ مەبەستی ماددەوژیانە!لەسەرەنجام ئەوپزیشکەی لێدەردەچیێ کەلەعیادەکەی بەڕوی خۆشەوەدیان پرسیارت لێدەکا بەلاّم لەنەخۆشخانە بەپەلەیەووەلاّمت ناداتەوە!یان لەعیادەکەیدا دەتنێرێ بۆسەرجەم پشکنینەکان بۆسۆنار وتاقیگەو تیشك چونکەپشکی تێدایە،ئەوئەندازیارەی لێدەردەچیێ کە پاش ماوەیەکی کەم سەقفی بیناکەی درزی بردووە(تەقیوە) ئەو مامۆستایەی لێدەردەچیێ کەلەگەڵ بەڕێوەبەر ‌کەی ڕێدەکەویێ چۆن دەوام بکات یان نەکا ،یان ناپاکی لەگەڵ قوتابیەکچەکەی دەکات!ئەو ‌فەرمانبەرەی لێدەردەچیێ کەسەرەڕای موچەکەی بەرتیلیش وەردەگریێ!چونکە تەنهابیرلەبەرژەوەندی مادی خۆی دەکاتەوەودەڵیێ(هی خۆم بۆخۆم هی تۆش دەخۆم)! کەسەرە نجام لەجیاتی خزمەت وئاوەدانی ولاّت پڕدەبێت لەگەندەڵی وویرانی،چون کەسیێ لەگەڵ خوا ڕاست نەبیێ لەگەڵ خەلکی خوا ڕاست نابیێ، هەرچەندە بڕوانامەشی بەرزبێت! بۆیە دەبینی زۆرێك لە سەرکردەو وەزیرومدیروکاربە دەستان دوای مردنیان فایلی گەندەڵیەکانیان ئاشکرادەبیێ،(دیارە نالێم کەلابران یان خانە نشین کران چونکەلەولاّتی ئێمە ئەوبڕیارەنایان گرێتەوە)پەراوێزخستنی پەروەردەی ئیمانی کاریگەری سلبی ئەوتۆی لێکەوتۆتەوە کەخوێندکارلە زانکۆوتویەتی: وانەی ئاین نابیێ ببیێ چونکە زانکۆ مەڵبەندێکی ڕۆشنبیریە بێئاگالەوەکە(جامیعة)لەجامیع وەرگیراوە واتەمزگەوت کەدەبیێ

(جەمیعی علومی) تێدا بێت،وەبەهەمان شێوەکوردیەکەیشی کەزانکۆیە واتە:کۆی زانستەکان سەرەڕای ئەوهەمووڕۆڵەگرنگانەی ترکەمزگەوت بینیویەتی،کە بە داخەوە بەلای هەندێکەوەکراوەتە پێشانگای جلوبەرگ!لەگەڵ ڕێزم بۆ حەرەمی زانکۆلەئیسلامدا فێربوونی زانست وزانیاری واجبەبۆنێرومێ بۆبەئاگا بون لەژیان بۆپێشکەوتن وداهێنان لەسەرڕێگای ڕاستی خۆمان بۆڕزگاربونی خەڵك وڕازی بونی خوا(**طلب العلم فريضة على كل مسلم**) ئیسلام بە ئوممەتی(اقرا)ناسراوەکەیەکەم فەرمانی خوایەکێشەکەلەکەمتەرخەمی دایە.

**بەشی دووەم: مەرجەکانی سەرکەوتنی خوێنکار:**

بۆسەرکەوتنی پرۆسەی خوێندن دەبێ ڕەچاوی ئەم سێ خاڵەبکرێ:

یەکەم: سەرپەرشتیاری قوتابی کەدایك وباوکەدەبێ لەقۆناغی سەرەتاییدا چاودێری بکات لەخوێندنی ولە هاوڕێکانی سەردانی قوتابخانەکەی بکات، بە تایبەت دایکان کەیەکەم قوتابخانەی پێگەیاندنن ئەگەرلەخواترس بن کاریگەریان زۆرە،پێشەوا(ئەحمەد)ڕەحمەتی خوای لێبێت دایکی پەروەردەی کردبو بەیانیان هەڵی دەستاندبۆنوێژونەیدەهێشت بخەوێتەوەوهانی دەدا بۆ سەعی کردن وبوبەوئیمامەبەڕێزەکەیەك ملێۆن فەرمودەی شیرینی حەزرەتی لەبەربوو!پاشان نمونەی باوکی دڵسۆزحەزرەتی ئیبراهیمە ﷺکاتێ خوامژدەی ئیمامەتی پێغەمبەرایەتی پێدا بۆ نەوەکانیشی داواکرد(ومن ذريتي ...)وکەلە دروستکردنی بەیت بونەوەبۆخۆی وبۆکوڕەکەیشی پاڕایەوە وداوای لە خوا کردکەبەدوربن لەشیرك وبت پەرستی(...واجنبني وبني ان نعبدالاصنام ....)

دووەم: خودی خوێنکارەکە،کەدەبێ تەنها پەیوەندی بەخوێندنەوەهەبێت، نەك یاری وڕابواردن ومۆبایل و t.v.و ...هتد، بۆنمونە(ابن الجوزي )تائێوارە لەسەر لێواری دیجلە سەعی دەکرد بەنان وئاو،کولێرەکەی ئەوەندەڕەق ببووکە نەیخستایەتە نێوئاوەکە نەدەخورا!،(امام مالك)مامۆستای مەدینەبوو(٤٠٠ ـ ٥٠٠) قوتابی لە خزمەتیابوون جارێك لەکاتی دەرسا وتیان فیلێکیان هێناوە بۆمەدینە هەموویان چوون بۆسەیری فیل

کەنەیان دیبوو تەنها قوتابیەکی ئەفریقی نەبێ امام فەرمووی بۆنەچوی بۆسەیری فیل؟وتی قوربان من بۆ خوێندن هاتووم،لەسەردەمی ڕژێمدا لە دواناوەندی بوم وتیان وەرە ببەبە بەعسی وتم:من بۆخوێندن هاتووم ونامەوێ سەرقاڵی شتی تربم، بەلاّم دوای شۆڕش زۆربەی ئەوانەی بەعسی وفایلداربون ئەوانەبونەوە بە شت وچونە پێشەوە ئێمەیش هەروەك جاران ماینەوە!بەداخەوەئێستاله بەر ێشبڕکێی خۆشگوزەرانی ومادده حیزبایەتی قوتابیان ناخوێنن، لەبیرمە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لەحەوشە گەورەکەی مزگەوتی گولەك لە چوارقوڕنە ڕاڕەوێکی سەعی کردنم دروست کردبوو ئەوەندەبەسەریا گەڕا بووم بۆسەعی بەهاران شوێنەکەی من وەك خەتێکی دیاری کراو گژو گیای لێ شین نەدەبوو،هاوکات بەهەژاری ونەداری توانیمان بچینە کۆلێج بەلاّم نەك هەر نەکەوتم بەڵکو ئیکمالیش نەبووم،هەندێ لە قوتابیە دەوڵەمەندەکان مامۆستای تایبەتیشیان بۆدەگرن بەلاّم کەمترسەرکەوتودەبون لەچاوقوتابیە هەژارەکان،ئەمەش بەهۆی سەرقاڵیان بەخۆشگوزەرانیەوە.

**سێیەم ماموستا**،ئەومژدەگەورەیەبەسەبۆمامۆستای بڕوادارکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(انمابعثت معلما)،سەرەتای بانگەوازسەرجەم پلەوپایەکان لەوانە وتنەوەی مامۆستاوە،دەستپێدەکات،کاری مامۆستا ئەمانەتەوپیرۆزە وکاری پێغەمبەرانەکە فێرکردنە تێگەیاندنە پێگەیاندنە، نەك حیزبایەتی وجیاوازی کردن لەنێوان قوتابیان وڕێزی لەچك لەسەرنەگرێ ویان تانەلەدین بدات وکوڕوکچ تێکەڵ بکات کەئێستا بۆتە کێشەی سەرەکی ئەوروپا لەبەر زۆر بونی منالّی ناشەرعی ولای خۆشمان بە پێشکەوتنی دەزانن!بەداخەوەکە پەند لەهەڵەی ولاّتان وەرناگرن وئارەزوەکانی خۆیان دەسەپێنن لەجیاتی دڵسۆز بون بۆ ئەوەی داهاتووڕێزگرتن لەئاینی نەتەوەکەیان!مامۆستا دەبێت بەکردەوە مامۆستابێت وپێشەنگی ڕەوشتەجوانەکان بێت،نەك بە قسەی زۆر یان بە دیکۆر،وەك امام شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: ان الفقيهَ هوالفقيه بفعلهِ..ليس الفقيهُ بنطقه ومقالهِ.

**لەکۆتایدابەکورتی:**

١ـ وانەی ئاین کە(عیلم ونەدەب وتەربیە)یەبێ نازەو پەراوێزخراوەکە ئەوەش جۆرێکە لەبێ ڕێزی بەرانبەرئاینی نەتەوە،(ئەنشتاین)دەڵێ:(زانستی بێ دین وەك شەل وایەبەلاّم دینی بێ زانست وەك کوێروایە)ئێمەگیرۆدەین بەهەردوولایانەوە!،

٢ـ لەڕوی چەندایەتی وچۆنایەتی وانەکان، کتێبەکان گەلێك زۆرن وهەزم ناکرێن بەتایبەت بۆبنە ڕەتی،بۆنمونەپۆلی بێنجی بنەڕەتی چوارکتێبی بیرکاری وچواری زانستیان پێدراوە جگە لەوەی کەتەواوناکرێن باری سەرشانیان قورس دەبێت مەگەرجانتای تایەی بۆبکرێ ئەینا هەڵناگیرێ!

٣ـ خوێندنی بێ پەروەردەوەك نوێژی بێ کردەوەیە،گرنگی نەدان بەلایەنی پەروەردەو رەوشتی جوان ناوی بێناوەرۆکەوگوفتاری بێکردارە،

٤ـ تێکەڵی کوران وکچان بەسەرجەم پێوەرەزانستیەکان زیان بەخشەلوکاریگەری خراپی داناوەلەسەررەوشت وئاستی دەرچون،ساڵی(٢٠١٠)ڕێژەیدەرچون(٢٠/٠ )! بووە، جگە لەوەش کەوەپێچەوانەی ئاینی کوردە

٥ـ وەك سەرەتایەك بۆبەرجەستەکردنی زمانی ستانداری کوردی باچەمکی (قوتابی یان خوێنکاریان فێرخواز)یەکلای بکرێتەوە،لەگەڵ هەردوشێوەزاری کرمانجی سۆرانی وبادینی کەتێکەڵ کراوەوسەری لەهەموان تێکداوە.

---

* کورتەوسەرەقەڵەمی وتاری سەرەتای ساڵی خوێندن،کەبەدرێژی لەگۆڤاری دوانگە ژمارە(٤٢)بلاّوکراوەتەوە.

# سیستمی پەروەردەی ئیسلامی یان ڕۆژئاوایی ؟!

هەرکەسێك ئەرکی گەورەی چاکسازی بگرێتە نەستۆدەبێ گرنگی بدات بە کاروباری پەروەردە،هەوڵبدات بۆگۆڕینی ئیجابی لەژیانی کۆمەڵگادا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی پڕلەخۆشی وکامەرانی وگونجاو،پەروەردەش ماناومەبە ستی گەورەی هەیەوبوارولایەنەکانی فراوانن،وەك پەروەردەی تاك پەروەردەی خێزان،پەروەردەی کۆمەڵگەوپەروەردەی مرۆڤایەتی...هتد،

ستراتیجی پەروەردەی ئیسلامی بۆگۆڕینی مرۆڤەکانەبەئاڕاستەیەکی ڕاست ودروست وپرۆفیشناڵ،وەك نمونەی هاوەڵاَن لەپێش ئیسلام و ودوای ئیسلام عومەری پێش ئیسلام وپێشەواعومەری دوای ئیسلام چەند جیاوازبوون! پەروەردەی ئیسلامی لەناو منداڵدانەوە گرنگی بەمرۆڤ دەدات تا لەدایك دەبێت وسوننەتی هۆزەبانەی منالّ وبانگ دان بەگوێیداو پەروەردەی خێزانی وپاشان قوتابخانەوپێگەیشتن ودامەزراندن وپیری ومردن ودوا ڕۆژی. ..هتد، بۆسەرجەم قۆناغەکانی ژیان ومردنی بەرنامەی بۆداناوەوژیانی بۆڕێك خستووە بەلاَم لە بیری ڕۆژئاواییدا نرخی ژیانی مرۆڤ سنورداره بۆیە دەبینی لەلوتکەی زانستدا بێزاردەبێت وخۆی ئەکوژێ!دەڵێ بەرهەمم نەماوە!چون بەلای ئەوانە وەپیری ومردن دواقۆناغی ژیانە،بەلاَم لای ئێمەمردن قۆناغێکی تری ژیانی مرۆڤە،بۆیە لەتێڕوانینی فەلسەفەی ماددی ستاتەروهاوبیرەکانیدا بۆژیان دەڵێن ئێمە نازانین لەکوێوە هاتووین بۆکوێ دەچین!؟بۆیەسەرەنجام دووچاری بێزاری و سەرلێشێوان دەبن،بەلاَم لە ئیسلامدا ئەم پرسە یەکلای بۆتەوەهەرلەهاتنە دنیاوە تادواهەواری لەبەهەشت یان لە دۆزەخ، سیستمی پەروەردەی ئیسلامی هاوسەنگی ومیانڕەوی ڕاگرتووەبۆدنیاو قیامەت(...ربنا أتینا فی الدنیا حسنة و فی الاخرة حسنة ...)پاشان پەروەردەی ئیسلامی گرنگی سەرەکی داوەبە زانست وزانیاری کەووشەی(عیلم)وهاوشێوەکانی(٧٧٦)جارلەقورئاندا هاتووەخواسوێندی بەقەڵەم خواردووە ویەکەم فەرمانی پەیامی ئیسلامی(اقرا) واتە:بخوێنە نەك نوێژو ڕۆژوو

ئیسلام کلێسانیە تادژایەتی زانست بکات و گالیلۆلە ناوببات بەڵکوبەپێچەوانەوە،بۆیە بەپیلانێکی پلان بۆدارێژراوی نێو دەوڵەتی ساڵی(١٩٠٧)لەکۆبونەوەیەکی قەشەکانی میسروپاشان لەفەلەستین ساڵی (٩٣٥)(زوەیمر)ووتی: گرنگ ئەوەیە بتوانین موسڵمانان لەپەروەردەی ئاینی دوربخەینەوەوهەربەناو موسڵمان بن هەرچەندنەبنەمەسیحیش! ئیترلەو ڕۆژەوە لەکاردان بۆپەراوێزکردن ونەهێشتنی پەروەردەی ئیسلامی بەهۆی دەیانی وەك :ساتع عومەری ومسس بیرلەعێراق وگلول پاشا لەئوردن وکرۆ مەرلە میصرونەلەنبی لە سوریا،تاکوتوانیان هەموو پەروەردەی ئیسلامی بکەنە کتێبێکی بچوکی (٢٠)لاپەڕەیی کەبۆتاقیکردنەوەش داخل ناکرێ‌بەلام دوای ئاشکرابونی زیانەکانی پەروەردەی لائیکی بەتێکەڵاوی کوڕان وکچان لەدامو دەزگا وقوتابخانەکان کەبۆیان بوبەکێشەیەکی گەورە لەڕۆژئاواوئەوروپا،وەك نوسەری بەناوبانگی ئینگلیزی(دیکۆك)دەڵێ: تێکەڵی ژن وپیاو منالی بێباوك و گەندەڵی ئیداری وفەسادی ئەخلاقی زۆری لێکەوتەوە،بۆیە خەڵکی ئێستا بەرەوئیسلام دەگەڕێنەوە ویاساکانیشیان هەرهی ئیسلامە بەلام بەناوێکی تری خۆیان،وەك لەمحمد عبدە دەگێڕنەوە کەوتوویەتی:لەئەوروپا ئیسلامم بینی بێ موسوڵمان بەلام لەڕۆژ هەڵات موسڵمان دەبینم بەبێ ئیسلام‌زانایان پێشبینی ئەوایان کردوە کەلەسەدەی (٢١) دا ئیسلام لەئەوروپاوە بۆمان دەگەڕێتەوە! چونکە ئەوان لەدیدێکی مەعریفیەوە بۆسستمی پەروەردەی ئیسلامی دەڕوانن،بۆیەکەسێکی وەك(مایکل وڵف)لەڕۆژنامەی(میدیامۆناتۆ ریس)لە ٢٠٠١/٦/١١ بابەتێکی نوسیوە بەناونیشانی( islam the next amrkan relegon) واتە:ئیسلام ئاینی داهاتوی ئەمریکایە،وەڕۆژنامەی (sandey times)ی بەریتانی لە ٢٠٠٤/٤/٢٢ نوسیویەتی کەزیاترلە(١٤) هەزار سپی پێستی بەریتانی موسڵمان بوون بەهۆی بێزاری ونائومێدیان لەبەها ڕۆژ ئاواییەکان کەلەناوئەواندا کەسایەتی ناوداری(جۆناسان بێرت)ی تێدایە کە کوڕی(لۆرد بێرتی)بەڕێوبەری پێشوی(B.B.C) سەیروسەمەرەیەکە تازە دەیانەوێ بەری خۆربەبێژنگ بگرن ولێرەولەوێ دینەکەمان

بەکۆنەپەرست ودواکەوتوو تۆمەتباردەکەن!جگەلەدەیانی وەك زانای مەجەڕی (جرمانۆس) کەهەشت زمان دەزانێ و(١٥٠)کتێبی نوسیوە لەلوتکەی زانستەوە موسڵمان دەبێ،ئەم دینە خاوەنەکەی خوایە بۆیە هەرگیزلەبن نایە ئەینا دەبونەمابایە،سیستمی پەروەردەی ولاتی ئێمەلەخزمەت گەنج ولاوەکاندان نیەچونکە دامەزراندن لەدامودەزگاکاندالەسەر بنەمای تەزکیەی حیزبی بووە لەجیاتی پسپۆڕی و دڵسۆزی وهاولاتی بوون کەئەوەش ڕێگربووە لە خستنە گەڕی تواناکانیان لەشوێنی شیاوی خۆیان،جێگەی سەرسوڕمانە کەلە کوردستان پەند لە هەڵەی ولاتانی ئایدزوەرناگرن وتازەبەتازە سیستمی سویدی دەسەپێنن بەسەر گەلێکی موسڵماندا کەپێچەوانەی بیروباوەڕی کوردانە!لەتێکەلاوی کوڕان وکچان وپەرایزکردنی دینەکەوتەنانەت زەمینەو زەمانیشیان بۆنەڕەخساندووە وچەندقوتابخانەیەکی نمونەییان قوتکردۆتەوە بۆ ڕاگەیاندن ودنیایەك قوتابخانەی بێنازوبێ خزمەتمان هەیەوکێشەی بیناوکەمی مامۆستای پسپۆڕ وگۆڕینی مەنهەجیش سەری لەقوتابی و مامۆستا تێکداوە! لە ڕاپرسیەکی ڕادیۆی نەوادا ساڵی( ٢٠٠٨)ئەنجامی دابوولەهەرێمی کوردستان سەبارەت بەهەڵبژاردنی سیستمی ئیسلامی یان عەلمانی؟سەرەڕای ئەوهەموو چەواشەکاریە(٠/٠٨٣) دەنگیان بۆسیستمی ئیسلامی دابوو،دواترئەوسیستمە مۆدێرنە بویەجێگەی ڕەخنەی زۆری پسپۆڕانی لەگەڵ خۆنیشاندانی بەردەوامی خوێندکاران هاواری میدیاکان ڕوبەڕووبویەوە! بەنمونەپاشکۆی ڕۆژنامەی دەستووربەناوی(جیهانبینی پەروەردە) ژمارە (٢٩)ی٢٦ /٤/ ٢٠١٠بەمانشێتی گەورەنوسیبوی:مەترسی هەڵوەشاندنەوەی سیستمی نوێی خوێندن دەکرێت، بۆئەومەبەستەبیروڕای زۆرلەزانایان وپسپۆڕانی بواری پەروەردەی تێدا وەرگیرابوکەڕەخنەوگلەیی زانستی وئیداریان کردووە و زۆرنارازین لەوسیستمە نامۆونەگونجاوەبەکوردی موسڵمان،بێگومان هەموار کردنی مسۆگەرەودەبێ هەربکرێ، ماوەتەوەبڵێین:تاچەندکوڕان وکچانی موسڵمان پەروەردەکراون وئامادەنەبن کەبەتێکەلاوی بچنەپۆلەکانەوە.

# تێکەلاوی کوران وکچان لە پێناوچی؟!

خوێندکارکەدێت بۆزانکۆبۆچی دێت؟خۆئەگەرمەبەست لـەهاتن بۆزانکـۆ ئـەو هـەراوهوریاو زەردوســوروئالۆوالآیەبێت ئـەوادەکرێت مـرۆڤ لەشـوێنی لـەوە چـاکتربگەرێت بۆئـەوکارە، تۆکاتێك دەلێیــت(زانکـۆ)کەسـی بەرانبـەر یەکسەر گوێـت بۆدەگرێـت لئێمەلـەدەرەوەدەلێین زانکۆمان هەیەولاتان سەریان سورِ دەمێنێ چون ئەمەکارێکی گەورەیە،بەلاّم ئاخۆناوەرۆکی زانکۆلەئاست ناوەکەیدایـە یـان خەریکەببێتـەجێگای (کەپلاّنـدن)تێکـەلّی کـوران وکـچان لەوەدانەماوەمن بلێم باشەیان خراپە چونکەپلانی بۆدارِێژراوەودەبێت وابێت! ئـەم نوسـینەبۆ کەسێکە کەدەبیستێ وگوێدەگرێ(لمن كان له قلب أوألقى السمع وهوشهيد):

**یەکەم/** کورِوکچ دوومەخلوقی خوان کەبێیەك نایانکرێت بۆتەواوکردنی ژیـانی یەکتردروسـت کراون،یان دەبێت ئازادبکرێن لەگەلّ یەکترچی دەکەن بیکەن لـە دوای مـارەبرِین وەکوشـەرع رِێگەی داون،یان نابێت پێکەوەبن لە شوێنێك داوەك لە شەرعدا هاتووە،ئەمەتەنها ئەوەنیە تۆبلێیت ئەمە شەرعەو کۆن بوە، بەلکونەمـەناخی مرۆڤـەکان وادەلێـت ئەوانـەی کـەدەلێن ئازادی و سەربەستی ئافرەت.. وهتـد،ئایا ئامـادەن کـچ وخوشـکی خۆیـان بـدەن بەدەسـت کەسێکەوە چی دەکات بیکات؟ دلنیام کە کەسیان وەهانین.

دووەم/ئەم تێکەلاّوییە بێ یاساورِێسایە ئازارەبۆدەروونەپاکەکان خەم زیاد کردنیشەبۆدەرونە پیسـەکان،تۆلەکۆمەلگەیەکدا دەژیـت بـەهاوغیرەت و شـەرەف وناموسـی تێدایە،کەسـی ئیدیعاکـەری ئـازادی ئـافرەت لەهەمووکـەس زیـاتر پێـوە پابەندە،بـەلاّم تەنهاوەکوخوشـك وبرایەکی خۆی نەك هی من وتۆ .!

سـێیەم/ هـیچ قازانجێـك لەتێکـەلکردنی کـورِوکچ دانییەلـە شـوێنێکی وەکـو زانکـۆ وپەیمانگاکاندا رِەنگەیەکێکی (سۆپەرمان) بلێت ئەوەنیەزانست پێشکەوتوە؟ دەکرێت بلـێین زانکـۆلای ئێمـە تـەنها کـات بەسـەربردنە،نەك فێربـونی زانـست، دەلّـێ ئەوتەمەنـەی مـن لەزانکۆدەیبەمەسەرنیوەشـی زیـادە بۆئەوعیلمـەی کـەمن پێویـستمە چـونکەمن کـارم

موحازەرەلەبەرکردنەوبەس!بۆیەدەبینین بەوهۆیە وەناستی زانستی فێرخوازان لەدابەزینداییە،بۆزیاتردڵنیا بونت لەوبۆ چونەم کتێبێك تایبەت لەوبارەوەنوسراوەبەناونیشانی(نەخوێندەواری لە زانکۆدا ...!)لەنوسینی هێمن خورشید بخوێنەوەوزیاترلەسەری نارۆم، بەدەردی فاروق رەفیق ووتویەتی: زانکۆتەنهابووەتە جێگەی شەهادە بەخشین!.

## خوێندکار یان قوتابی ؟!

لەرێبەری وەرگرتنی(خوێندکار/قوتابی)دا

لەکاتێکدا هەوڵی یەکگرتنەوەی دووئیدارەیی ویەکخستنی ماڵی کوردی و بانگەشەی هاولاتی بون ورێزی بەرانبەرویەکپارچەیی زمانی ستانداری کوردی دەدرێت،بەلاّم تائێستاودوای زیاترلە(١٩)ساڵ لەتەمەنی حکومەتی کوردی وەزارەتی خوێندنی بالاّوتوێژینەوەی زانستی کەدەبوا لوتکەی مەعریفەو ناوەندی رۆشنبیری وپارێزەرو،سەرچەعی زمان وئەدەبی خۆمان بوایە،جێگەی سەرنجەکەنەیان توانیوەلە سەرەتاکانی زمانی خۆیاندا یەك بگرنەوە چۆن دەتوانن لەپرسە گەورەو چارەنوسسازەکان بەراستی یەك بگرن!؟سالاّنە ئەگەرکتێبی رێبەری وەرگرتنی (قوتابیان/ خوێندکاران) لەزانکۆو پەیمانگا کانی هەرێمی کوردستان دەبینی، سیستمی خوێندنی ئەم ولاّتەشت بەرچاو دەکەوێت،جگەلەوەی کەئالۆزی ورۆتینی زۆری تێدایەبۆخوێندکارهەر لە سەرەتاوە ناهەنگی دەرچون وخەمی وەرگرتن ودامەزراندن دەست لەملان دەکات،لەسەرجەم رێبەرەکەداوتەنانەت لەناونیشانی کتێبەکەشدا ئەگەر خوێندکارنوسرابێ خەت مایل / قوتابیش نوسراوە،ئەگەرخوێندنگا نوسرابێ ئەوە قوتابخانەش لەگەڵیا نوسراوەتەنانەت لەبەررێزی بەرانبەر یان(لەبەر نەوروژاندنی بەرانبەر)لەتایتڵەکاندا خۆیان لەرەنگی زەردوسەوزپاراستووەو هەربەشین وسورنوسیویانەخۆزی بۆپاراستنی یەکرێزی ناوماڵی کورد

لــە جیــاتی وشــەی(خوێنــدکار/قوتــابی) نــاوێکی ســێیەمیان بهێنایــەوەك فێرخوازیــان بەرێکــەوتنێکی ســتراتیجی یــان تــەوافوقی ببــورن(زانــستی )یــەکێ لەودووانــەیان هەڵبژاردایــە(قوتــابی یــان خەێنــدکار)(ژن یــان ئــافرەت)لەوکاتــەش دوای (٢٠) ســاڵی ترکەتەمەنی من وتۆتەواو دەبووئومێدیان دەبووکێشەی هەرەگەورە کانی وەك{ناووکارەبـاو رێگــەی گــەڕەکی کــانی ســپیکەو خەتەنــەی نافرەتــان وتێکــەڵکردنی کــچان وکــوڕان و...هتد}بۆنەوەی داهاتومان ئەگەر زلهێزەکان مانەوە،ئـەوکات لەوانەیـە پرسـە وردەکـانی وەك کەرکوك وناوچە دابڕاوە کانیش چارەسەربکرێن! تەمەنی من وتـۆش بەشـی ئەوهـەموو هەنگاوەسیاسیانە ناکات،تەوەرەی ئەم باسەمان وەك ئەو کەسەی بەســەر هاتوەکەنەخۆشـی دڵی هەبوو بەڵام جوانکاری لوتیان بۆدەکرد! ئەو بارەناهەموارەهۆکارە بۆ نەمان ولاوازبونی ئینتمای گەنج ولاوی کورد بۆنیشتمانەکەی،لەکاتێکدا پێشەوا قازی محمد سەرەرای ڕەوشـی ناهــەمواری ئەوکاتــە وبــاری خراپــی ئــابوری تــوانی لــەماوەی چــەندمانگێکدا کۆمــاری کوردستان دابمـەزرێنێ لـە مهابـاد کەتـەنها شـەش مانگیـشی خایاند،لەکۆتاییـدا لـەڕووی دلسۆز بیـەوە بـۆ کوردوکوردسـتان دەڵـێم بابەخۆمانـدا بـچینەوە،ئەگەرخەلکانێك لەسزای خودا ناترسن وهەست بە لێپرسینەوە ناکەن بائەوەبزانن کـە مێـژوو ڕەحـم بەکـەس ناکـات، بامێژوویەکی سپی تۆمار بکەین،چونکەدوای نەمانی خۆمـان وگـۆڕانی ئـەم ڕەوشـە،ئەوەی داهاتوو سەرجەم ئەو هەلآنەمان بەچاودا ئەدەنەوەودەبن بە لەکەیەکی ڕەش بۆمێژوو.

# گەنجانی دوێنێ و ئەمڕۆ

مـــادام لاوان ڕۆڵـــی ســـەرەکی دەبیـــنن لەگۆڕانکاریـــەڕامیاری وکۆمەڵایەتیـــە کانداوجڵەوی کۆمەڵگـە بەدەستیانەوەیە بەرەوهەرئاڕاستەیەکی بـەرن ئیجـابی یـان سلبی وئەوان لـەناو جـەماوەردا ئالیـەتێکی دیـارو بـەر چـاون لـەجێ بـەجێ کردنـی ئایـــەتی گـــۆڕان وهـــەنگاونان وداهێنـــان(إنَّ اللّــــهَ لايُغَيِّرُمـــاَ بِقَــوْمٍ حَتَّـــى يُغَيِّرُوامَابِأنفُسِهِمْ)بۆیەناحـەزانی دیـن بـەردەوام لەسـەنگەری لادان وچەواشـەکردنی گەنجاندان،ئەوەش لەمێژووی دوورونزیکدادیاروبەر چاوەکاتێ سوپای فەرەنسا هـەوڵیان دەدابۆگەڕاندنـــەوەی (ئەنـدەلوس) کەدەکاتەئیـسپانیای ئـەمڕۆ جاسوسـیان نـارد بۆئاگـاداربوون لەهەسـت و نەسـتی موسـڵمانەکانی ئـەوێ،ڕۆژێکیان جاسوسـێك مێردمنداڵێکی بینی بێتاقەت بووپرسی بۆچی وابێتاقـەت وداماوی؟ئـەویش ووتـی ویستم بـە دارلاسـیکەکەم دووچـۆلەکە بکـوژم بـەڵام هەریـەکیان بەرکەوت،جاسـوس ووتـی جانەوەچـی یەوخـەمی بۆچیـە،ئەمیش ووتـی:بۆئـەوەی لـەداهاتوودا ڕابـێم کەهەرکا نێ سوپای دوژمن دای بەسەرمانا بەیەك تیردووسـەرباز بکـوژم!جاسوسـەکە لـەڕاپۆرتی مانگانەیدانوسـی بـووی لـەم کاتـەدا هـەر چـی بکـەین سـەرکەوتوونابین چـونکەگەنجەکانیان خـاوەن پـەیام و بەرنامـەن،دوای بیـست سـاڵ هـەمان جاسـوس گەڕایـەوە بۆئەوشـوێنە بـۆ پرسیاروڕاپرسـی وئاگـادار بـوون، سـەرنجی دا هـەرزەکارو گەنجەکانیان ،سەرقاڵی خۆش گوزەرانی وڕابواردنن،چوویەلای گـەنجێك داکەلـەپارکێك دا دانیشتبوو خەمبارو بێتاقەت،جاسوس پرسی خێرەوابێ تاقـەتی لـەم جەوەخۆشـە؟ ئـەمیش ووتـی مەوعیـدێکم بوولەگـەڵ یارەکـەم بـەڵام کاتەکـەی لایداوەوچـاوەڕوانم ودیارنیـەلسـالانی پێـشوو خـەمی چـیان بـوو ئێـستا خـەمی چـیانە لئـەمجارەیان لەڕاپۆرتەکەیـدا نوسـی بـۆ فەرەنـسا کـە بەدڵنیایەوەسـەردەکەوین بەسـەریاندا وئەندەلوسـیان لـێ وەردەگرینـەوە ،چـونکە هەسـت ونەسـتی گەنجـەکانیان

گۆڕاوەبۆڕابــواردن وخـــەمی دیـــن و نەتـــەوەیان کـــەم بـــووە وهەرکەســـەخەمی خۆیـەتی لێەوەبووسـەکەوتن،جا ئەگەرئـەم ڕوداوە بەراوردبکـەین لەزۆربـەی گـەنجانی ئەمڕۆژگارەبەئاشـکرا بۆخـۆی دیـارە ...هەرکەسـە چـاوەڕێی یـارە...گـەل وولاتـیش درابەپارە!، سـەرنج بدە پەندودربگرەلەبەسـەرهاتی حـەزرەتی یوسـفعليه السلامکـە پێشـەوا وسەر مەشقی گـەنجانی خواناسـە،گەردەتەوێت خوابتخاتەژێرسـێبەری عـەرشـی خـۆی لەڕۆژی قیامـەت بکەویتـە بـەر فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ) (...**شـاب نـشاء فـی عبـــادة الله**) ئـــەوا گـــەنجێکی دەســـت ودامـــێن پـــاك بـــە،بێئا گاولـــەخۆیایی مەبە،بیربکەوەلەچیرۆکی ئەو کۆمـەڵەگەنجەی کەلە سورەتی(کهـف)دابـاس کراون،یـان ئەوگەنجانەی کەلەدەوری پێغەمبەر بون(ﷺ)چ جۆرەگۆڕانکاریـەکیان بەسـەرڕۆژگاری خۆیاندا هێناوبونە جێگەی شانازی دنیاودوارۆژ.

# چاولێکەری دەردێکی کوشندەیە:

پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)فەرموویەتی(مَن تشبّه بقوم فهومنهم)(رواه ابوداود) واتەهەرکەسێك خۆی بەقەومێك بچوێنێ ئەواتەو کەسەلەوانە،چاولێکەری دەردێکی کوشندەی کۆمەڵگای کوردەواریمانە،هەرشتێك لەدەرەوەی خۆمان ناردیان بێ چەندو چون وەری دەگرین بێ لێکدانەوەی چاك وخراپی، نازانم ئەم کارەناوبنێم چی؟زاڵ بونی فەرهەنگی بێگانەویستی؟یان لەشتی خۆماڵی وەڕەزبوون؟یان تەنها چاولێکەری کوێرانەیە وبەس یان بڕوابەخۆنەبون! ئەوەی زیاتر جێگای داخە ئەم دەردەکوشندەیە بەنیشانەی پێشکەوتن و شارستانی دەزانن لیان بەکوردایەتی لەقەڵەم دەدەن کار گەیشتۆتە ئەوەکە چاولێکەری بێ بڕوایان هەموو بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە،جارێك بەمۆدێلی چاك یان بەناوی مۆدێرن و نوێخوازی وبەناوی سیستمی نوێی جیهانی وهەر جارەبەناووڕەنگێ ئەینەخشێنن لەوەی کەجێگەی سەرسورمانە داب ونەریتی ڕەسەنی کوردییە کەزۆربەی لەئیسلامەوەسەرچاوەی گرتووە،بەرەوتوانەوەیە بەتایبەت جل وبەرگی کوردی پیاوان وژنان کەساڵانە تەنها بۆ نەورۆزوبۆنەکان ئەیکەنە بەریان،لەکاتێکدا لاف کوردایەتی لێدەدرێ،حکومەتی کوردی و شۆڕشی کوردی ، بەڵام لەسەر دین و داب و نەریتی بێگانە،لەکوێ عەرەبێك جلی کوردی کردە بەری، لەشارەکەی خۆشمان بەرگی کوردی نامۆیە و بە چاوێکی سوك سەیری دەکرێ، ئەگەر کار ئاوا بڕوات پاش چەند ساڵێك هەر کەس جلی کوردی لەبەربکات منداڵ ئەکەوێتە شوێنی!جگەلەکاتی نەورۆز، ڕۆژێك بۆشاهیدییەك چومە دادگای سلێمانی بە جامانە وجلی کوردییەوە ئافرەتێکی سفور دانیشتبوو بەفیزێکەوە وتی حاجی پەنجەوبێنە منیش وتم قەڵەمەکەو بێنە کاتێ ئیمزام کرد وتی ببورە دیارە مامۆستای،وتم ئەرێ تۆ وادەزانی هەرچی ئەم بەرگەی لەبەربوودوا کەوتوونەخوێندەوارە؟ئەمە بەرگی ڕەسەنی باوك وباپیرانتە پاشان وتم من بڕوانامەی بکالۆریۆسم هێناوەلە بەغدا وبەم بەرگەوە شانازی دەکەم،بەڵام توخوا ڕاست پێم بڵێ تۆ سێی ناوەندیت بڕیوەلێرەی یان واستەیە..،پاشان

داوای لێبوردنی کرد،لێرەدافەرمودەیەکی پێغەمبەرتان(ﷺ)یادبخەمەوە کەوەك موعجیزە ئێستا بەرجەستەبووە(لَتَتَبعن سُبلَ الذین من قبلکم شبراًبشبر ..،کەئەمەکوردیەکەیەتی (لەمەودواشوێن ڕێبازی قەومی پێش خۆتان دەکەون،بست بەبست وگەزبەگەز،تەنانەت ئەگەریەکێکیان بچێتە ناوکونی سەرمازەڵەوە،ئێوەش دەچنە ناوی )(حاکم گێڕاویەتییەوە)ئەو ڕاستییەحاشا هەڵنەگرەئێستا هەموومان بەچاوی خۆمان ڕۆژانەلەناویدادەژین، هەر مۆدێلێ لەکەناڵە ئەوروپی و غەربییەکان نیشان درانەوارِاستەوخۆ لێرە پیادەی دەکەن،بێ ئەوەی بیرلەئەنجامە خراپەکەی بکرێتەوە،خۆچواندن ولاسایی کردنەوەی بێگانە کەسایەتی ئەومرۆڤە وون دەکات چونکە بەچاوی خۆی نابینێ و بەعەقڵی خۆی بیرناکاتەوە،بەڵکو بەچاوو عەقڵ وبیری ئەوان کار دەکات،لە لایەکی ترەوە ئەم دیاردەیە نیشانەی لاوازییە چونکە لاوازوبێهێز لاسایی بەهێز دەکاتەوە،لاسایی کردنەوەی بێ بڕوایان لەجل و بەرگ و داب ونەریتیانداسەردەکێشێ ولاسایی کردنەوەیان لەبیروباوەڕوبیرۆچکەکانیاندا،بەڵام فەرمودەکە لاساکردنەوەی بێگانە لەپیشەسازی وزانستە بەسودەکان ناگرێتەوە،چونکە (الحکمةُضالةُالمؤمن..،حیکمەت بزربوی بڕوادارەلەهەرشوێنێك پێیگەیشت ئەوشایستەترە بەهەڵگرتنەوەی)ئەرێ گەنجانی موسوڵمان(لەکوڕان وکچان)ئەمرۆلەکوێی ئەم فەرمودەیەن؟ بەداخەوە کەهەندێ لە گەنجەکانمان چونەتە سەرداب ونەریتی ئەوروپی وغەربیەکان تەنانەت لە بێگانەپەرستیدا ئەوەندە پێش کەوتون لەبەرگی ڕەسەنی خۆیان تەنها لە بەهارونەورۆزدا بۆ سەیران ووێنە گرتن لەبەردەکەن!هەندێ لە ئافرەتانیش لەجل و بەرگ و جوانکاری ونینۆك درێژ کردن خۆیان بەئافرەتانی بێگانە دەچوێنن،کە نەخشەسازی جولەکەی جیهانییە بۆلادان ومالّ بەفیڕۆ دان وباری کردن بەعەقڵی مرۆڤەکان ...،بۆچارەسەرکردنی ئەم دەردەکوشندەیە دەبێ موسوڵمانان جارێکی تربەخۆیاندا بچنەوەو بەناگابن بەناوی پێشکەوتن و تازە گەری یان بەناوی کوردایەتی فێڵیان لێ نەکرێ ودوچاری لاسایی کردنەوەی کوێرانەنەبن بەڵکو پێویستە: بەعەقڵی خۆمانەبیربکەینەوەلەجیاتی عەقڵی بێگانە،بەچاوی خۆمان بڕوانین نەك

بەچاوی بێگانە،ڕەسەنایەتی خۆمان لەدەست نەدەین ودەست گرتوو بین بەڕێبازی باپیرانمان کەئیسلامە، چون پابەندیمان بەئیسلامەوە ژیان ژیارو پێشکەوتنە،دین ڕێگرنیە لە کوردایەتی وپێشکەوتن، لەهەمان کاتدا سود لە تەکنەلۆژیاوشتەباشەکانیان وەر بگرین، بەڵام نەك توانەوە لەناویاندا .

## کلتوری بێگانەوخۆمانە کامیان لەتۆی کوردجوانە

لێرەولەوێ بەگوێمان دەکەوێت خەڵکانێك بەناوی ڕۆژنامەنوس یان چالاکوان لەبواری کۆمەڵگای مەدەنی تانەوتەشەرنەدەن لەڕابردووڕەسەنایەتی ئەم گەلە وەلەوڕێگەیەوە دژایەتی دینەکەش دەکەن،پێیان دەڵێین ئەگەربڕواتان بەڕێنمایەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام نیەهەرچۆنێك بێت ئێوەکوردن(هەرچەندەزۆریەیان هیچیان لەکوردایەتی ناچێت) پێشینانی خۆمان فەرمویانە:(ڕێوی لەکونی خۆی هەڵگەڕێتەوە.. گەرولەڕنەبێت پێی نەتوێتەوە)

پێناسە:کلتوربریتیەلەشێوازی ژیان وبیرکردنەوەوهەڵسوکەوت ونەریتی هەرگەل ونەتەوەیەك کەدواجاردەبێتەجێگەی شانازی بۆنەتەوەیە،بەهەردولایەنی(سلبی وئیجابی)کەدەبێت لایەنە جوانەکانی کلتورپەرەپێ بدرێت ولایەنەخراپەکانی لابرێت.

بەداخەوەئەوەی لەئەمرۆی کوردستانداەبینرێت بریتیەلەسڕینەوەی هەموداب ونەریتی نەتەوەکەمان بەچاك وخراپەوە،لەبەرئەوەی گوایەکلتوری ئێمەوەحشی گەرانەیەوخێلەکیەو هیچی لەگەڵ دونیای مۆدێرن ناگونجێ،خەڵکیەنەئەمەچ جۆرەعەقلیەتێکەئەم جۆرە قسانە دەکەن؟! لەکاتێکداولاتێکی وەکوسویدکەلەلوتکەی ئاشتی ودیموکراتی وپێشکەوتودایە تا ئیستاش شانازی بەدیاردەیەك دەکەن کەلەکۆنداپیرەویان لێکردوەئەویش دیاردەی(چەتەی دەریا)یە! ئەوان دەڵێین ڕاستەچەتەی دەریاکارێکی خراپەبەلام ئێمەوەك کلتورڕێزی لێ دەگرین! ئەی بۆئێمەرێزنەگرین لەکلتوری کوردیمان کەپڕەلەبەهای بەرزی مرۆڤایەتی و ئەخلاقی و ئاینی کەچی پێمان شەرم بێت باسی بکەین وبچین بۆکلتوری بێگانەوشانازی بکەین بەشەڕە پەڕۆوشەڕەئاووشەڕەقسە! ئێمەچەندساڵ بولەشەڕەپەڕۆبێزاربوین ئەمجارەیان

شەڕێکی تریشیان وەك داهێنان یاکلتورێکی داسەپاوی بێگانەبۆزیادکردین ئەویش شەڕە ناوە! پێمان بڵێن شەڕەناولەدورونزیك چ پەیوەندی بەکوردوئیسلامەوەهەیە ؟هیچ،چ خزمەتێکی تێدایە ؟هیچ، بۆلەبیرخۆمانی بەرینەوە ئەوهەمووهاوکاری وخۆشەویستیەی خەڵکی گوندەکانی کوردستان لەگەڵ میوان وخزمەتی پێشمەرگەوئازادکردنی سەرجەم ئەو سەربازانەی ڕژێمی پێشووساڵی(١٩٩١)کەبۆلەناوبردنی ئێمەهاتوون،بۆدەبێت ئەم ڕەوشتە جوانانەبەفێڕەوون وخێڵەکی لێك بدرێتەوە ؟ئەگەرنەتوەیەك نەریت وکلتوری نەما چی دەمێنێتەوەشانازی پێوەبکات ؟ئەگەرئێمەڕێزلەحوجرەیەك نەگرینکەچەندین کەڵەپیاوی پێگەیاندوەکەئێستانامەی ماستەرودکتۆرالەسەرژیان ونوسینەکانیان بەدەست دێنن ئەی بڵێن ئەوزانابەرزانەمان لەکوێوەهاتووە ؟ئەگەرپشتمان کردلەجل وبەرگی کوردی ڕەسەنایەتی گەلەکەمان هەرگوتمان(ئۆکەی،بای‌بای...) چی لەکەلتوردەمێنێتەوەبەتایبەت کلتوری ئێمەی کورددووجارجێگەی شانازیمانەکەلەئیسلامەوەسەرچاوەی گرتوەکەپریەتی لەگیانی لێبوردەی وخۆشەویستی وڕێزگرتن،بەلاّم بەداخەوەئەمرۆهەندێ دەروێشی ورۆژئاوابێ گوێدانەهیچ بەهایەك دەیانەوێت سەراپانەوکلتورنەریتەی هەمانەفرێی بدەن وبەناوی پێش کەوتن ومۆدێرنەوەبەدروشمەکانی ڕۆژئاواخڵەتاون،نازانن کەدروشمێکی بۆشەدەنگی دەهۆڵەو لەدوری خۆشە،بەڵێ هەرچەندەئەوان لەڕوی تەکنەلۆژیاوەپێشکەوتوون بەلاّم لەڕوی کۆمەلاّیەتیەوەسفرن،لەجەنگی جیهانی یەکەم ودووەمداچی نەمابەیەکتری نەکەن،ئێستاش ئەوکۆمەڵکوژیەی جینۆسایدکوردوفەلەستین وبۆرماومیصرونەفغانستان هەمووی بەپیلانی ئەوانەوبەندینخانەکانی وەك(ئەبوغریب وگوانتانامۆ)شایەتن بۆئەم ڕاستیەکە هەموو دروشمەکانی ئازادی ومافی مرۆڤ بەدرۆدەخاتەوە،خۆئەگەرمەبەست لەپێشکەوتن مەسەلە کۆمەڵگەی مەدەنی بێت ئەواپێغەمبەر(ﷺ)نزیکەی هەزارساڵ پێش فەیلەسوفەکانی وەك (جون لۆك،جانجاك ڕۆسۆ)بنتیاتنەری کۆمەڵگەی مەدەنی بوەلە شاری مەدینەی پیرۆز لە سایەی دەستوری وەسیقەی مەدینەدامسیحی وجولەکەوبتپەرست وموسڵمان پێکەوەدەژیان

کەپێشتر(یثرب)بوبە(مدینـە) شـاری پێغەمبەر،مدینەلـە مەدەنیەتەوەوەرگیراوەلەبەرانبـەر (بَدَوي)،بەدەویـیـەت)دەشـتەکی، واتـە نشارسـتانی وسـەروەری یاسـاوپێکەوەژیان لەبەرانبـەر دەشـتەکی وخێڵـەکی وسـادەژیان وتەنیاژیان،لەکۆتایـدابۆدەبێت ئەمرۆبـەفیتی خـەلکانێك کەهەست بەپرسیاریەتی ناکەن یان بەکرێگیراون تـف لـەرابردوی خۆمـان بکـەین کەبـەوەش شەرمەزاری دنیاودوارۆژدەبین،ئەوکلتورەجوان وپەسـەندەدەپیارێزین لەتوانەوەوشـوێنکەوتنی بێگانەوبێباوەڕان ئەوەی خراپیشەیان چاك بکرێ یان لابرێ.

---

* وتاری تایبەت بەکلتوری داسەپاوی شەرەئاوکەلەناوەراستی مانگی(١١)لەپارکی ئازادی کرا،شەرەئاوی پەرلەمان گەیشتەپارك وکۆلان! !

* ئەم وتارەم لەرۆژنامەی(بەیان)ژمارە(٤٩) بلاوکراوەتەوە

# ڕۆژی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژبەئافرەتان

(۱۱/۲۵)ی هەمووساڵێ بەرۆژی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی ئافرەتان دانراوە، کەلەو ڕۆژەدایان لەوهەفتەیەدا هەندێ چالاکی ئەنجام دەدەن و دروشمەکانی دژبەتوندوتیژی و چەوسانەوەی ئافرەتان بەرزدەکەنەوە،سەرە ڕای ئەمانەیش بەپێی ئامارەکانی بەڕێوبەرایەتی توندوتیژی دژبەئافرەتان کارەتوندوتیژیەکان دژبەژنان زیادی کردووە!ئەوەش ئەوڕاستیە دەسەلمێنێ کەدورکەوتنەوەلەبەهارەوشتیەکانی ئیسلام هەڵوەشانەوەی خێزان وتوندو تیژی بەدواوەیە،چونکەئیسلام توندوتیژی خێزانی رەتدەکاتەوە،بۆیەلەوە بترسێ کەلەخوا ناترسێ، هەندێکیشیان لەبۆنەدابەمەبەست یان بەبێ ئاگایی ناڕاستەوخۆئیسلام تۆمەتباردەکەن بەوەکە سەرچاوەی توندوتیژیە!لێرەدا ئێمەش بەکورتی تیشك دەخەینە سەرچەندمافێك لەوبارەیەوە، پەروەردگار لەفەرمودەی قودسیدافەرمویەتی:{ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسەرخۆم حەرام کردووە،دەی ئێوەیش ستەم لە یەکترمەکەن.. فلاتظالموا}ئەوە کۆمەڵگایە ستەمی لە ئافرەت کردوەنەك ئیسلام،بەنەریتی لاروخواری(ژن بەژن وشیربایی وکچ لەبری خوێندان وبەزۆر بەشودان ومیرات پێنەدان و ئاڵتون پێفرۆشتن وکاری دەرەوەومالەوەیشی پێبکەی یان نەدرێتە هاوشانی خۆی)!فەرمانی خوای پەروەردگارە کە پێویستە لەگەڵیاندا باش بین (وعاشروهن بالمعروف)،هەریەکەیان ئەرك ومافی بزانێ و ئافرەت خۆشەویستی دەوێت وپیاویش ڕێزی گەرەکە بەوەیش خێزان بەختەوەردەبێت.

_ هەرکام لەناوی ژن وپیاو(الرجل والمرءَ)(۲٤)جارلەقورئاندوەك یەك هاتوە.

_ ئافرەتان لەمیانەی کارکردنیاندالەدەرەوە ڕوبەڕوی دەستدرێژی دەبنەوە،ئەوەش لە ڕاپۆرتێکی گۆڤاری(الطب النفسی الامریکی)دا هاتووە کە(٤٢./.)ی ئافرەتانی فەرمانبەر لەئەمریکاڕوبەڕوی دەستدرێژی سێکسی دەبنەوە(۹۰./.)لەئەنجامی ئەوحاڵەتوشی نەخۆشی دەرونی دەبن،ئەمەلەوڵاتێ کەبەحیساب لوتکەی پێشکەوتن وشارستانی ومافی مرۆڤە!.

*** بەشودانی زۆرەملێ وبەزۆرستەم وناڕەوایە:**

لەشەریعەتی ئیسلامیدا هاتووەکەبەزۆرنەمارەیی دێ ونەتەلاَق دەکەوێ ،وەك لەنەریتی کۆندا باوبوەبەزەبری خەنجەر!(هەرچەندەئێستا ئەوە زۆرکەم بوەتەوەوبۆتە حالەت نەك دیاردە)،(عبداللەی کوڕی بریدە) لە باوکیەوەگێڕاویەوەکە(کچێك هاتەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ)وتی:باوکم منی داوەبەبرازاکەی‌تاسوکایەتی لەسەرخۆی لاببات، پێغەمبەر (ﷺ) کچەکەی سەرپشك کرد،ئەوجارکچەکەوتی واباوکم مۆڵەت دا،ویستم ئافرەتان بزانن کەباوکان شتی لەوجۆرەیان بەدەست نیە.

***چارەسەری خۆشەویستی هاوسەرگیریە:**

(ابن عباس)دەڵێ:پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر(ﷺ)وتی:کچێکی هەتیوم لایەودەوڵەمەندێك وهەژارێك هاتون بۆخوازبێنی،ئێمە حەزدەکەین بیدەین بە دەوڵەمەندەکە،خۆیشی حەزی لە هەژارەکەیە،پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی:(لم یُرللمتحابین مثل النکاح)واتە:نیەلەهاوسەرگیری چاکتر بۆدووخۆشەویستان،بەپێچەوانەی ئەوەجاران دەیانگوت مادام حەزی لێدەکا نایدەینێ حەیامان دەچێ!بەداخەوەکەئەوەیش هەرلەسەرئیسلام حسابکراوە،زۆرێك لەنیش وکارەکان بەدابونەریتی کۆمەلاَیەتی ئەنجام دەدرێن(عادةلاعبادة) وهەرلەسەر دینیش ئەژمارکراوە! لەکاتێکداهەندێ لەودابو نەریتەکۆمەلاَیەتیانەلەئیسلامدا ڕێگەپێنەدراوە،بۆیەپێویستە بخوێنینەوەو لەدینەکەمان ئاگاداربین بۆئەوەی تێکەڵی نەکەین وتفەنگ بەتاریکیەوەنەنێین وهەمووشتێ مافی خۆی بدەینێ، نەریتەکۆمەلاَیەتیەکانیش ئەگەرستەم وتاوانی تێدا نەبێ ڕێگە پێدراوە.

---

(لەتەوەرەکانی سیمیناری(٥/١٠/٢٠١٠)سلێمانی کەبەشداربوم ولەلایەن ڕێکخراوی:PDA ئامادە کرا بووسێ ڕۆژبەردەوام بوو)

***زۆربەی ئافرەتانی ئەمڕۆژگارە قوربانی لەدەستدانی کەسایەتین!**

کەسێتی ناسنامەی خودی مرۆڤە،هەندێ لەژنان چونکەخۆی ناناسێ بۆیە ڕێزوقـەدری خـۆی نـازانێ! بڕیارەکانیـان بەپەلەوسـەرپێین ولەسـۆزو عـاتیفـەوە دەردەچـێت وزوودەخلـەتێ،وەك ئەوانەی شووبە هاوتەمەن وهاوبیروباوەڕو هاو شانی خۆیان ناکەن لەبەرسـەروەت وسـامان و هەندەران!کەلەوپێناوەدا زۆرژن خەساربون!پەشیمانیش بێهودەیە!(تۆم سولەیم)یـەکێ بوولـە موسڵمانە پێشینەکان کاتێ(ابوتەڵحە)هاتەخوازبێنی،پێی وت:هەرچەندە تۆ دەوڵەمەندو لێ هاتوی بەلاّم هاوشانی من نیـت چـونکە بـت پەرستی،تاموسـڵمان نـەبی شـووت پێناکـەم! موسڵمانی کردوکەسایەتی خۆیشی پاراست وبوبە جێی متمانەی پیاوەکەی،بەداخەوەئێستا تەنها لە دەوڵەمەندی دەپرسن!نەك ڕەوشت وبیرو باوەڕ!لەکاتێدازانایان وتویانـە:لەوئافرەتـە دوربەکەهەموو سامانەکەی تـەنها جوانیەکەیـەتی،وە لـەوپیاوەش دوربکەوەکەسـامانەکەی تەنها پارەکەیەتی،جا بۆنەوەی خانمـان بـەدوربن لـەدیاردەی لێـدان وخۆسـوتان وتەلاّقـدان و هەراوکێشە ودەمەبۆڵـە،با سـوربن لەسـەربەختەوەری خێـزان کەبـە هـەردوولادەکرێ بـە لـە یەکگەیشتن،ژن خۆشەویستی دەوێ وپیاویش ڕێزگرتن،ئەینادروشم و ئۆفیس وسـاڵی ڕۆژێـك تیماری برینەکان ناکات،لەگەڵ ڕێزمان بۆهەرهەوڵێکی باش.

*** خەتەنەکردن لەدیدگای ئیسلامەوە:**

وەك هـیچ کێـشەمان نـەمابێ تـەنها خەتەنـە نـەبێ!ماوەیـەك ئەوبابەتـەیان زەق کردبـۆوە! بەندەلەمقابەلەیـەکی (٤.٧)جەماوەردالـە(٢٠١٠/١٠/٣١) کـە لـەوبارەوەبو وتم:وەك ئـەو کەسەتان بەسەرهاتووەکەنەخۆشی دڵی هەبوو جوانکاری لوتیان بۆدەکرد!،بێگومان ئیـسلام وەلاّمی سەرجەم پرسیارە کانی تێدایە،لەفـەرمودەی پێغەمبـەردا(ﷺ)هاتووەکـە:{خمس من الفطرة،واتە:پێنج سیفەت لەسروشت وفیترەتی مرۆڤن وڕێبازی پێغەمبەرانن ئـەوانیش: خەتەنەکردن،بەرتاشین،هەڵکێشانی موی بن باڵ،نینۆك کردن وبەرسمێڵ کردن} ،خەتەنـەکردن ڕەوشـتێکی جـوانی مرۆڤەودروشـم و نیـشانەی ئیـسلامەتیە،حوکمی شـەرعی: زۆرینـەی

زانایانی شەرع لەسەر ئەوەن کەبۆرەگەزی نێرواجبە،بەلآم بۆئافرەت سوننەتەبکرێ لەگەڵ رەچاوکردنی مەرجە تەندروستیەکان لەلایەن پزیشکی پسپۆرەوەئەنجام بدرێ وبۆئافرەت کەمی لێببرێ وەك دروشمێکی ئیمانی بەتایبەت لەناوچە گەرمەکان پێویسترە، ئەگەر نەکراتاوانبارنیەچونکەئیختیاریە،وەبۆجەخت کردنەوەیەلەپاك وخاوێنی وکاریگەری راستەو خۆی هەیەلەسەر رەگەزی نێربۆلایەنی تەندروستی وسێکسی،وەکاریگەری ناراستەوخۆی هەیەبۆ ئافرەت،بۆزیاتربەئاگابون لەوبارەوە سەیری کتێبی(**حياتنا الجنسية،صبري القباني**) کە،سەیرلەوەدایەکەختەنەبەتوندوتیژی دادەنێ کەوەك ئاماژەمان پێداگەربەشارەزایی بکرێ سودی هەیەوسوننەتە،بەلآم باسی ئەوشتانە ناکەن کەبەراستی توندوتیژیەولەهەموو رویەکەوەزیان بەئافرەت دەگەبەنێ بۆنمونە وەك لەکتێبی(ئۆقیانوسێك لەتاوان)دا هاتووەکە سلێمانی(١٠٠٠)ماڵی لەشفرۆش هەیە ئایانەوە توندوتیژی نیە؟ئەی ئەوژنەی رۆژی(١٠) پیاوبەرێدەکات بەناوی ئازادییەوەتوندوتیژی نیە؟ئەوپاپوچە بەرزەی کەلەپێیەتی زیان بەلاشەی دەگەیەنێ یان ئەوبۆیەی لەدەموچاوی ئەسوێ کەزیانی بۆپێستی هەیە توندوتیژی نیە؟بۆباسی رۆژئاواناکەن کە پیاوبۆی نیە دووژن بێنێ بەلآم ئاسایە لە دەرەوەی خێزانەکەی (١٠) خۆشەویستی هەبێ بەناوی هاورێیەتی ولەگەڵیان رائەبوێرێ وخیانەتی زەوجی ئەکات کەپێ ی ئەوترێ(my girl friend)!!،

## ڕۆژی جیهانی خۆشەویستی ..(ڤالانتاین)

سالانە(٢/١٤)یان دیاریکردوەبەناوی ڕۆژی عاشقان وخۆشەویستان!کەلەو ڕۆژەداهەندێ لەگەنجان سەرقاڵ دەکەن بەگۆڕینەوەی گوڵی سوروخۆشە ویستی ناردروست وحەرام کە زیاتربۆڕابواردن وکات بەسەربردن وفریودانی کچانە!کەڕەنگی سورهێمای خوێن ڕژانە و دەبوپرسەی بۆبگێڕن،سەرەڕای ئەوەی کەلەگەڵ کەلتوروئایینی کوریدانامۆیە،لەهیچ ڕویەکەوەدورونێزیك پەیوەندی بەئێمەوەنیەوبێگانەپەرستیە،وەك لەناوونا وەرۆکدا دەبینرێ، مێژووە کەیشی دەگەڕێتەوەسەردەمی(کلودیۆم)قەیسەری ڕۆماپرۆسەی هاوسەرگیری بۆ ماوەیەك قەدەغەکردتاکولاوەکان بچن بۆسەربازی،قەشە ڤالانتاین بەنهێنی وناشەرعی لەکلێساکەیدا هەردووڕەگەزی بەیەك دەگەیاندن،بۆیەلە (٢٧٠/٢/١٤)ز لەسێدارەیان داودواترنەورۆژەکرایە ڕۆژی عاشقان وبە ناوی خودی قەشە ڤالانتاینەوە،لێرەدەپرسین ئەوەچ پەیوەندی بەکوردایەتیەوە هەیە؟جگەلەبلاوکردنەوەی زیناوبەدڕەوشتی نەبێت،وەبە هەموو ڕەهەندەکانیە وەهی بێگانەیەپێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)فەرموویەتی:(مَن تشبَه بقَوم فهومِنهم) (رواه ابوداود) واتە:هەرکەسێك خۆی بەقەومێك بچوێنێ ئەوا ئەوکەسەلەوانەو حسابی ئەوانی بۆدەکرێ، لەلایەکی ترەوەبۆ زیاتر بێئاگاکردنی گەنجەکان لەپرسە چارەنوسازەکانی گەل ونەتەوەکەمان ونەمانی هەستی ئاینی ونەتەوەیی بەوەیش ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەدەست دەدەین،دەڵێم بەداخەوە کەستەم کراوەلەچەمکی خۆشەویستی، بۆ مەبەستی خراپ بەکارهێنراوە،ئەینا خۆشەویستی حەلاڵ لەسنوری خۆیدا ڕێگەپێدراوە، بەلام دلداری حەرامە،ژیان بێ خۆشەویستی بەردەوام نابێ چونکەخۆشەو یستی ژیانە، سەرەتا خۆشەویستی خواوپێغەمبەرکەبێ سنورە وپاشان خۆشەویستی گەل وولات وماڵ ومناڵ و...هتد کە سنورداره،بەلام لێرەدا ئەم چەمکەلەم ماناومەبەستە فراوانەوەکورت کراوەتەوەبۆپەیوەندی نادروستی پێش هاوسەرگیری وبۆ دلداری کەبەوەیش کوڕوکچەکانمان لەدەست دەدەین وحەیاوئابڕویش کە نیوەی ئیمانەلەکەداردەبێت،چارەسەری خۆشەویستی

هاوسەرگیری شەرعیە ئەگەر کوڕوکچێك دڵیان بەیەکەوەبوباهاوسەرگیری بکەن وڕێگیری یان لێنەکرێ وەك پێشترناماژەمان پێکرد(ابن عباس)دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)وتی کچێکی هەتیوم لایەو دەوڵەمەندێك و هەژارێك هاتون بۆخوازبێنی،ئێمە حەز دەکەین بیدەین بە دەوڵەمەندەکە،خۆیشی حەزی لەهەژارەکەیە،پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی: (لم یُرللمتحابین مثل النکاح)واتە:نیە لەهاوسەرگیری چاکتربۆدووخۆشەویستان،بێگومان خۆشەویستی بنەمایەکی گرنگە بۆخێزان وهاوسەرەکان بەلاّم ئەوەی لەم ڕۆژەدا بانگەشەی بۆ دەکرێت حەرامە چونکە مەبەستی خراپی لە پشتەوەیە،پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمویەتی:(ئەگەر کوڕوکچێك بە تەنیا پێکەوە بوون ئەوە شەیتان سێیەمیانە)دیارە شەیتانیش بۆخراپەلە گەڵیانە،کوڕوکچ چەند مانگێك بەناوی خۆشەویستی وهاوڕێیەتی پێکەوە دەبن ولەیەك وەڕەزدەبن ویەکتریان لەپێش چاودەکەوێ بۆیەکوڕەکەیارێکی تر دەگرێت وکچەکەیش لەبارێکی دەرونی خراپدا دەمێنێتەوەجگەلەوەی کە کوڕەکە وێنەو یادگاریەکانی بلاّودەکاتەوەئەگەربەسەری نەکاتەوەدوای مێردکردنیشی !وبەیانەکانیش کەبە یەکیاندابوودەبنەبلّقی سەرئاوونافرەتانیش دەبنە قوربانی سەرەکی ئەم عەشقەدرۆینە،بەپێی ئامارێك دەرکەوتوەکە (٩٠./.)ی ئەوکچانەی کەخۆیان دەسوتێنن پەیوەندی بەدڵداری درۆینەو بێوەفای ئەوکوڕانەوە هەیە،(١٠./.) ی کێشەی ئابوری وکۆمەلاّیەتیەو(٤٠./.)ی پەیوەندی ناشەرعی ژن وپیاوە نەك کوڕوکچ!کەپێش پرۆسەی هاوسەرگیری فێری خیانەت بووە بەناوی عیشق و دڵداری ودوایش دەست بەرداری نابێت!عشقی ڕۆنسای خەیاڵیە و سەرناگرێ، بۆیە(٧٠./.)ی ئەوخۆشەویستیانە بەخیانەت کۆتاییان پێهاتووە! بەماچ ودەستبازی وڕابواردن تادەگاتە زیناکردن!دیارە خۆشەویستی ڕاستەقینە نابێ ڕۆژێك بێت بەڵکودەبێ بەردەوام بێت ئەوەیش لەهاوسەر گیریدایەو خۆشەویستی واقعیەکە: جعل بینکم مودەورحمە، پەیامبەری خۆشەویست فەرمویەتی:(بڕواتان دانامەزرێ تاوەکویەکترتان خۆش نەوێت ...) بۆیە ئێمەی موسڵمان دەبێ یەکترمان خۆش بوێت،دایك وباوك وخوشك وبراوڕۆڵە وخێزانمان خۆش دەوێت هەموو ڕۆژێکمان خۆشەویستیە نەك ساڵی تەنیا ڕۆژێك ئەویش ڕوکەش ودیکۆرە بۆمەبەستی

خراپە کاری هەمەجۆرە، دیارە جگەلەزیانی فەسادی وبەدڕەوشتی، شیرازەی خێزانە کانیش هەڵدەوەشێنێتەوە ، سەرەڕای زیانی ئابوری تەوهەمووگوڵی سوروقسەو نامەی مۆبایل و..هتد، سەرداروپیشەوای چاکان ودامێن پاکان حەزرەتی یوسفە کەنیوەی جوانی دنیای پێدرابوویەلاّم بەندیخانەی هەڵبژارد بەسەرداواکاری نابەجێ دا،هەزاران سلاّولەوحەزرەتەوسەرجەم کەسانی ڕەوشت بەرز.

# خوێندنەوەیەك بۆ رۆژی جیهانی ئایدز

ئایدز دەردێکی بێدەرمانە،کەلەرێگەی ڤایرۆسی(HIV) مرۆڤ توشی دەبێت و بەهۆیەوە سیستەمی بەرگری لەش لەبەرانبەر نەخۆشیدا تێك دەدات،ئەم پەتا کوشندەیە لە (١٩٨١/١٢/١)لە ئەمریکا دۆزرایەوە،(لەولاتی نێربازو زینا کاران)ڤایرۆسی ئەم پەتایە ساریەو زووبلاودەبێتەوەونەمانی بەرگری لەشی لێدەکەوێتەوە،بەپێی ئامارێکی(٢٠٠٩) توشبوانی لە(٤٠)ملیۆن تێپەڕیکردوە و(٢٥)ملیۆن گیانیان لەدەستداوەکە(٢٦)ملیۆن لەوچلەلەکیشوەری ئەفریقا یە و(١٥)ملیۆن منالی هەتیوکردووەلرۆژی (١٤)هەزارکەس دەیگرێتە وە کەزۆر بە یان منالّ وهەرزەکارن،(٨٠٪)ی توشبوانی ئەم نەخۆشیەلە رێگەی سێکسی ناشەرعیەوەدوچاری بوون بەتایبەت کرداری سێکسی لەگەلّ کەسان ی جیا جیاوجوتبوونی پیاو لەگەلّ پیاو (نێربازی)یان پیاولەگەلّ ئافرەت لە رێگەی کۆمەوەیان جوت بوون لەگەلّ ئالودەبوانی مادەهۆشبەرەکان،سەیری کتێبی (تەندروستی وژیان) لاپەڕە(٩٦،٩٥)بکەلە بلاوکراوەکانی یونسێفە و کە هیچ پەیوەندیشی بەئیسلامی ودینەوەنیە بەزمانی حالّ ومەقالّ هاواردەکات ودەلێت ئەوەدەرهاویشتەکانی پەتای عەولەمەودامێن پیسیەوگەرلەناوم نەبەن لەناوتان دەبەم،خۆتان دەلێن خۆپاراستن چاکترە لەچارە سەرکردن، ئەی بۆچی واناکەن؟بۆ لەپێناوهەواو ئارەزوو بازرگانیدا مرۆڤەکان قڕدەکەن؟ لێرەدا ئەگەرسەرنج بدەین لەهۆکارەکانی توشبوونی ئەم پەتایە کە لەناو ئەو کتێبەدایە،گەورەترین وانەوپەندە بۆسەلماندنی راستیەکانی دین وگەورەیی ئیسلام،کە سەرجەم ئەو شتانەی حەرام کردووە کەدەبنە هۆکاری توشبوون بەم پەتایە لەوکتێبەدا باسی لێکراوە!خوایگەورەفەرمویەتی:(وَلَا تَقْرَبُواالزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا)الاسراء/(٣٢)، ئاگادارمان دەکاتەوەکە دوربکەوینەوە لەپێشەکیەکانی زیناودامێن پیسی چ جای زینا کەلەتاوانە گەورە کانەوسزای رەجم وحەددی بۆداناوە،تاوەکو شیرازەی خێزان تێك نەچێت و کۆمەلّگا پاك وحەیاوناموس پارێزراوبێت،دەیان ئایەت وفەرمودە لەوبارە هەن کە هانمان

دەدەن بۆنـەوەی بەڕاسـتی وبەکردەوەمرۆڤانـە بـژین جیاوازلـە ژیـانی ئـاژەڵان کـە بـەرپرس نین،تەنانەت غیرەتی ئاژەڵانیش زیناوتێکەڵاوی نادروست قبـوڵ ناکـەن جگـە لەبەرازکـە ئـەویش حەرامکراوە،خۆتان زۆرجارکۆتر وچۆلەکە تان بینیوە کە پارێزگاریان لە مێینەکەی خۆیان کردووە لەوەی کە یەکێکی ترلە گەڵیدا جوت بێت! سەرجەم حەرام کراوەکان بۆبەرژەوەندی ژیـان وژیـاری مرۆڤـە کانـە وەك (مـاددە هۆشـبەرەکان، بـەراز،زینا..)ڕۆژگارسـەلماندی کـە دەردوبـەلاو پـەتا کوشندەکان لەئەنجامی بێفەرمانی خوایە،ئەنفلۆزای بەرازوئایدزو خۆڵبـارین وشکەسـاڵی لەدوایـە ،سەرچاوەی گرفت وقەیرانەکانیش ئەوروپاوڕۆژئاوایە، ئیترکاتی ئەوەهاتووەکە دڵنیـابین لەراسـتی وچاکی وپاکی ئیسلام وگەڕانەوە بۆ گوێڕایەڵی فەرمانـەکانی پەروەردگار،نـەك بەندایـەتی هـەواو ئـارەزووی نابـەجێ، بەخوێندنـەوەی وردوزانـستی بۆهـەرکام لەئایدزونـەنفلۆنزای بەرازوقەیرانـە سیاسی وکۆمەڵایەتیەکان دەردەکەوێ کە ئیسلام ئارامی و تەندروستی وپـێش کەوتنـەوپارێزەری ژیانی مرۆڤەکانـە،(اسلِم تَسلِم) ئەگـەر بەڕاسـتی تەسـلیمی ئیـسلام ببـی ئەوەلـە دنیـاودواڕۆژ سەلامەت دەبی.

# مافی کرێکارلەئیسلامدا

ئاینی ئیسلام ڕێزی لەسەرجەم مرۆڤەکان گرتووەوبانگەوازی لێکردون بە(یاایهاالناس..) واتەئەی خەڵکینە،وەخوای گەورەبەگشتی ڕێزی لەئادەمیزادناوە(ولقدکرمنابنی ادم..) بە (ل،می تاکیدو،قد،ی تحقیق)چ جای کرێکاروجوتیار،ئەوەی ئێستادەبینرێ لەدژایەتی ومل ملانێی ڕێکخراوەکان ئەنجامی فەلسەفەی ڕیالیزم وماتریالیستیەکەخەڵك ئەکەن بەگژیەکدا وبونەتەمایەی ئاژاوە،لەجیاتی تەبایی وهاوکاری یەکتری،کێشەدەخەنەنێوان کرێکاروخاوەن کار!جوتیاروسەپانوخاوەن مڵك تەنانەت نێوان ژنوپیاو!ڕێکخراوە ژنانیەکان بەتایبەت (فینیمیزمی ڕادیکاڵی)حساب بۆ ڕەگەزی بەرانبەرناکەن لەکاتێکدا تەواوکەری یەکترن، بێینەوەسەرکرێکار، پێغەمبەرمان(ﷺ)دەستی زبری کرێکارێکی گرت لەکاتی تەوقەکردندا فەرموی: ئەوەدەستێکەخواو پەیامبەرەکەی خۆشیان دەوێت،بەڕاستی ئەوەمژدەیەکی خۆشە بۆ کرێکاری موسڵمان وکارەکەیشی بەندایەتیە لوەك پێشترئاماژەمان پێدا،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(اعطواالاجیرأجرته قبل ان یجف عرقه)واتە:کرێی کارەکەی بدەرێ پێش ئەوەی ئارەقی ناوچاوانی وشك بێتەوە!ئەوەیەمافی ڕاستەقینە،کەلەکاتی دیاریکراوی خۆیدا پارەکەی و.رگرت هەست بەئارامی دەکات وماندویی نامێنێ،ئەی ئەگەردەستی دەستی پێ بکرێتودەرماڵەی ببرێت ناچاربۆمافی ئاسایی ویاسایی خۆیان دەبێ مان بگرن!خۆنیشاندان بکەن! ئەوەش ناوزەدکراوەبەئازادی!بێگومان کەسێ ستەمی لێنەکرێ هاوارناکا،دیارە کرێکاری بڕواداركەسێکەکارەکەی بەچاکی وپاکی ئەنجام دەدات وغەش وفێڵی تێداناکات چونکەدەزانێ پێشەواکەی فەرمویەتی:(من غشنا فلیس منا)واتەئەوەی فێڵ بکات لەئێمە نیەو خوای گەورەئەوکەسانەی خۆش دەوێت کەکارەکانیان بەچاکی وبە پاکی ئەنجام دەدەن، ئەگەرکرێکارو خاوەنکار دڵسۆزبون وهەستیان بەئەرکی سەرشان کردئەوکات کوردستان ئاوەدان دەبێت وپێش دەکەوێت،جێگەی نیگەرانیە بەم هەموو سەندیکاوڕێکخراوەبە دروشمەکانیشیانەوە تائێستاش وەك پێویست مافەکانی کرێکاردابین نەکراوە.

# ڕۆژی جیهانی کرێکاران...تەنها دروشمە وەك جاران

کرێکاران چینی زەحمەت کێش وخزمەت گوزاری وڵاتن ،جێی خۆیەتی کە ماف وڕێزی خۆیان بەکردەوە بدرێتێ،نەك تەنهابەدوبارەکردنەوەی دروشمەکانی ساڵانەیان لە( ١/٥ )دا، چونکەقسەودروشم ناچێتە باخەڵەوەو پێشینانیش وتویانە(بەحەڵواحەڵوادەم شیرین نابێ ) وبە پێناسی سەندیکاش باخەڵ گەرم نابێ،ئەمڕۆ جیهان لەڕۆژگارێکدا دەژی کەناوی زل وشاری وێرانی تیادا زۆر بووە،قسەی ڕازاوەودەستەواژەی پڕباق وبریق لە هەمووکەناڵ و ئامرازەکانی ڕاگەیاندنەوە مێشکی خەڵکی پێ پڕکراوە وعالەمێکی زۆری پێوە سەرقاڵ کراوەلە کوردستانیشدا ئەمڕۆ دەیان وسەدان دەستەواژەی نامۆودژبەهەموداب ونەریتێکی ڕەسەنی کوردەواری وهەموو بنەما ئاینیە پیرۆزەکان خراوەتەسەر زاری گەنج و لاوی ئەم میللەتەکە هەریەکەیان تەعبیرلە فیکر وڕێچکەو ڕێبازێکی تایبەت دەکات بە هیچ جۆرێك مۆرکی ئیسلامەتی و تەنانەت کوردایەتیشی پێوە دیارنیە! بەڵکو هەریەکەیان زادە وهەڵقولاوی کەسێك یا کەسانێکی بەناوفەیلەسوف وڕۆشنبیرن،کە لەووڵات ومەملەکەتێکی ئەوسەری دونیاوەلەکەش وهەوایەکی تایبەتدابۆیەدەست هێنانی چەندبەرژەوەندیەکی سیاسی تایبەت ئەو فیکرەو بەرنامەیان داڕشتوە.لە کاتێکا نەلە دوورونە لەنزیکەوە پەیوەندیان بە واقیعی گەلێکی وەك گەلی کوردی موسڵمانەوە نیەلەبەهیچ جۆرێك تەعبیر لەواقیعی گەلەکەمان وگیرو گرفتەکانی وکێشەڕەواکەی ناکەن وناتوانن چارەسەری گونجاو یان بۆ بدۆزنەوە.لەو ڕۆژەداکە بەڕۆژی جیهانی کرێکاران ناودەبرێن لە بری ئاهەنگ و زەماوەند ودروشمی گەورەوبێ ناوەڕۆك بۆزیاتر هەڵخەڵەتاندنی کرێکاران ! لە بری ئەوانە هەق وایە دادگایی ئەوحیزب وکەس ولایەنانەبکرێت کەبەناوی مافی کرێکارەوەبە درێژای (٧٠- ٨٠)ساڵ کرێکاریان چەوساندەوە وە لەژێرئەم ناوە پیرۆزەداحیزب و ڕێخراو دروست دەکەن خۆزگە چەندکرێکارێکامان لەناو ریزەکانیان دا ببینیایە هەرلە سەرەوە تا خوارەوە، یان بەرپرسەکانیان ماوەیەك ئەگەرکەمیش بێت بەکرێکاری ژیانیان بگوزەراندایە تا خەڵك

دڵنیا بونایە کە ئەمانە بە ڕاستی کرێکارن وبەڕاستیش داکۆکی لە مافی کرێکاران دەکەن، داواکارین لەم ڕۆژەدا لایەك لەهێزوبازوی کرێکاران ورەنجدەرانی کوردستان بکرێتەوە، بەسنوردانان بۆ گرانی بازاڕ ،وە ڕێکخستنی کرێ وماوەی کاری ڕۆژانەیان وچارەسەر کردنی دیاردەی بێ کاری ،کەبە هاتنی ئاوارە عەرەبەکان قورەکە خەستر بوو بۆ کرێکاران .ئەوەش تەنها بەسەروەری یاسایەك چارەسەر دەکرێت کە لێوان لێو بێت لەدادگەری کۆمەلآیەتی کە تەنها لەپەیامی ئیسلام دا بەدی دەکرێ ،پەیامبەری ئیسلام دەستی قلیشاو وبریننداری کرێکارێکی بینی وماچی کردو فەرموی:ئەم دەستەخواو پێغەمبەرخۆشیان دەوێ،هەروەها فەرمویەتی:(کرێ بدەنەکرێکار پێش ئەوەی ئارەقی ناوچەوانی وشك ببێتەوە)وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا.

## ڕەنگدانەوەی بێکاری لەسەرگەنجان (بەتاڵە..سەرەنجامەکەی تاڵە )

دەست بەتاڵی..کات بەتاڵی..هێلانەی وەسواسە..یاخی بوونە،چینی یەکان (بەتاڵە)یان بەماڵی شێت داناوە،د.ئەمیراڵ(براید)لەکتێبەکەیدا(وەحیدا)دەلی: ڕۆژانی بەتاڵی تاریکە وەك شەوبەتاڵە ئاگری ئاشوبوو پڕوپاگەندەخۆشتر دەکات بیروباوەڕی خراپ دێنێتەئاراوە، بۆیەمانای ژیان لە دەست دەدات و نرخی کات وزەمان بەفیڕۆنەڕوات،جاکەواتە بەچەقۆی کارملی بێکاری ببرە، خۆژیان تەنها بریتی نیەلەماددەوبەس وەك هەندێ لەگۆڤاورێکخراوەکان بانگەشەی بۆدەکەن،دەی باکاتی بێکاری وەك هەلێك بقۆزینەوەوتیایدا لایەنی ڕۆحی ودەروونی خۆمان تێربکەین ویەکاری چاکەوە سەرقاڵی بکەین وەك خوێندنەوە وسەردان وپەیوەندی خزمایەتی وهاوکاری یەکتری وبەجێ هێنانی بواری بەندایەتی وکۆمەلآیەتی، وەك لەفەرمودەی پێشەواکەمان دا کە ئەمە کورتەی واتاکەیەتی وفەرموویەتی(دوونیعمەت هەن زۆرێك لەخەلکی لێیان بێئاگان ئەوانیش نیعمەتی تەندروستی وبێکاری) چۆن ئەگەرتۆنەفست سەرقاڵ نەکەی بەشتێکی

چاکەوەنەوتۆسەرقاڵ دەکات بەخراپەوە،بێگومان بەتاڵە خەمێکە و هەژاری وهەندێ گرفتی بەدواوەیە و ئومێدی چارەسەرکرانی هەیە ،بەلام خەمی گەورەئەوەیەکەمرۆڤ بەوهۆیەوە خۆی بدۆڕێنێ،کەواتەبەخۆ داچونەوەوخۆپێگەیاندن چاکترین دەسکەوتەلەکاتی بێکاریدا،بەپێی ئاماری وەزارەتی کاروکاروباری کۆمەلایەتی عێراق زیاترلەملیۆن ونیوێك بێکارناو یان تۆمار کراوەبێگومان ئەوەندەی تریش هەن کەتۆمارنەکراون،وەبەپێی ئامارەکانی وەزارەتی پلاندانان بێکاری لەزیادبووندایە چونکەگرفتی کشتوکاڵ زیاد دەکاوگوندەکان چۆڵدەبن و بەوەش بێکاری پەرەدەسێنێ وپشکی شێریش لە بێکاران توێژی گەنجانە، کاتێ گەنج بێکاردەبێت ناچاردەبێت بۆدەربازبوون بیربکاتەوەبیروخەیاڵی خراپ،کە سەرەنجام گەنجان بەهۆی بێزاری ونائومێد یاڵ دڵسۆزیان بۆنیشتمان کەم دەبێت وئەم دۆخەکاردەکاتەسەردەروونی گەنج ودەیکاتەمرۆڤێکی ڕەش بین ونائومێدپاشان دووچاری خەمۆکی ولادانی کۆمەلایەتی وئەخلاقی دەبێت وەك دەبینین زۆرێك لەو گەنجانەی مودمین بون بەخواردنەوەکحولیەکان دواجاربۆدابین کردنی ئەو ماددانە پەنادەبەنە بەرکار ی دزین ومرۆڤ کوشتن بۆ پەیداکردنی بڕێك پارە، بەڵگەش ئەوەیە کە زۆربەی گەنجانی ناوگرتووخانەکان ئەوانەن کەبەوتاوانانە گیراون ئەمەش کۆمەڵگە دوچاری گرفت وقەیرانی گەورە دەکات بۆیەئەرکی حکومەتە هەوڵ بدات بۆدۆزینەوەی هەلی کارتا گەنج ببێتە کەسێکی بەسودو کاراوخاوەن ئایندەیەکی گەش،چونکەلەدەستدانی گەنج لەدەستدانی پاشە ڕۆژە،پەندی پێشینان زۆرجوانیان وتوەلەوبارەوەچونکەخاوەن ئەزمون بون فەرموویانە:(ئەگەرنوێژکەری نوریني، ئەگەر ئیشکەری شیریني)

## ڕۆژی جیهانی بەساڵاچوان :

پەیامی پیری ...هەگبەی ئەزموون وژیری

(١/١٠)ی هەموو ساڵێ بەڕۆژی جیهانی بەساڵاچوان ناسراوە،کەلەبەردنیای سیاسەت ومادده ئەوتوێژەپەراوێزخراوە!لەورۆژەدا خێرخوازێ یان میدیایەك سەردانی خەڵوەتگەی پیری دەکەن بۆنیشاندانی ڕەوشی خراپی پیران و سەرەنجامی هەمووان،لەسایەی ئیسلامەوە خەڵوەتگەی پیری لەووڵاتی ئێمە کەمەئەوچەندپیرەش کەچوون یان بێکەس یان کوڕەکانیان پابەندنین بە ئیسلامەوە،سوننەتی ژیان وایە وسەرەتالەدایك بوون وگەشەو نەشونمایە، پاشان پیری ومردنی لەدوایە،دوای مردنیش نوێبونەوەی ژیانێکی تری لە شوێندایە،پیرلەڕووی جەستەولاشەوەبێهێزەونەخۆشی دەوری داوە،بۆیە وتراوە(پیری وهەزار عەیب) بەلام پیر خاوەنی ژیری وئەزمونی زۆرە،وەك نیشانەی ژیری لەسەردەمی پیریدا وتویەتی: ئای بۆ هێزی جوانیم وئاقڵی پیری،لەفەرمودەی پێشەواماندا هاتوەکە لاشە پیردەبێ بەلام تەماع و ئارەزوەکان بەگەنجی دەمێننەوەوپیرنابن بۆیەسروشتی مرۆڤ وایە تاپیربێت بەتەماع دەبێت هەرچەند لەبەربێدداني پێشی ناخورێ!لەولاتانی ئەوروپاو ڕۆژئاواو سەرجەم ولاتانی بێبڕوادا تاکە ئومێدی پیرەکان خەڵوەتگەیە وهەر چەندەلەڕوی ژیانەوە خزمەت دەکرێن بەلام بەهۆی دوریان لەسۆزوخۆشەویستی کەسوکاریان وبێ ئومێدی لەدوارۆژیان ڕێزیان لێناگیرێ، چونکەلەدیدی ماددەگەرایی ئەواندا بەرهەمیان نەماوە بۆیە زۆرهەست بەبێزاری دەکەن و هەندێکیان بەناچاری خۆیان دەکوژن،بەلام لەئیسلامدا دایك وباوك و باوە گەورەیە و پێویستەلەسەرڕۆڵەکان کەرێزیان بگرن ومافی خۆیان پێ بدەن ئەینا پەروەردگار لێیان ڕازی نابێ،وەبۆ دەسکەوتنی پاداشت وتراوە:ئەوەی پیرێکی نیە با پیرێك بکڕێ،وە لەفەرمودەی قودسی دا هاتوەکەخوای گەورە فەرمویەتی: من شەرم دەکەم کەموسپی سزابدەم، موی سپی ئەوەندە بەڕێزەلای خودا بۆیە دەبێ خاوەنەکەشی ڕێزی بگرێ و دوری بخاتەوە لە حەرام بۆئەوەی ئاخر خێربێ، وەك لە فەرمودەیەکی تری پێشەوامان هاتوە کەچاکترینتان

ئەوەیە کەتەمەنی درێژوئاخر خێربێ،لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەبێ جیاوازی ڕێزلەهەموو پیرێ گیراوەومافی بۆدابین کراوە،لەکتێبی (الخراج)ی ئەبویوسف دا هاتووە کەجارێکیان پێشەوا عومەرجولەکەیەکی پیری ڕیش سپی بینی سواڵی دەکرد، لێی پرسی ئەوەبۆچی سواڵ دەکەی؟ووتی قوربان نیمە وئەبێ جزیەش بدەم، فەرمانی دا هەرچی پیری لەوشێوەیە موچەیان بۆ بڕیەوەو جزیەشیان یان لەسەر لادان، ئەوەبۆپیری جولەکە!موی سپی زەنگی ئاگادارکەرەوەیە بۆئەوانەی کەلەدەریای حەزو ئارەزوەکانیان نقوم بوون وئاگایان لەحوزن ودوارۆژیان نەماوە،بەزمانی حاڵ پێت ئەڵێ میوە ئەگەر گەیشت ئەبێ لێبکرێتەوە وتۆش کاتی مردنتە وفریای خۆت بکەوە،موی سپی ویقاروحورمەتە،ئەومووسپیەی کەبەداخەوە زۆرێك لەخەڵك ڕقی لێەوبەیانیان زووکرکرنەیتاشێی وخێرا خێرا سەرووسمێڵی تەزویردەکات ورەشی دەکاتەوە!! بەلاّم ئەوهەولاّنە بلّقی سەرئاون، بەندە لەخزمەتتانە زۆرسودم لەموە سپیەکانم وەرگرتوەهەرزوئاگاداریان کردمەوەولەحەرام پاراستویانم بۆیەمنیش هەرگیز نەم تاشیون و ڕەشم نەکردونەوە وڕێزیان دەگرم تاکورێزدارىم،جابۆئەوەی لەکاتی پیریدا خەفەت نەخۆین ونەتلێینەوەلەترسی تاوانەکانی ڕابردووبافریای خۆمان کەوین وهەلو فرسەتەکانی ژیانمان بقۆزینەوەودووربین بین، ئەوهەلانەش کەپێشەواکەمان بۆی دیاری کردوین:( اغتنم خمسا قبل خمس...) واتەبێنج شتان پێش پێنج شتان بقۆزنەوە: ژیانت پێش مردنت، تەمەنی گەنجی بقۆزەرەوە وفریا ی خۆت بکەوەو پێش ئەوەی پیرببی، لەش ساغیت پێش نەخۆش بوونت، دەوڵەمەندیت تا هەژارنەبوی کاتی بێکاری تاسەرقاڵ نەبویت چونکە سەرجەم ئەوهەلانە کاتین وزوو بەسەردەچن،(بەینی خۆمان بێ نەمزانی چۆن پیربوم وناشزانم کەی دەمرم)بەتایبەت لەم ڕۆژ گارەدا بەرەکەت لەتەمەندا نەماوەوهەندێك هەر بە گەنجی پیردەبن! قەدری زێڕیش لای زێڕینگەرە، تەمەنی گەنجی لای پیرەکانە کەلە دەستیان چووە وگەنجەکەش لەشتی بێهودەدا بەسەری دەبات،هیوادارم هەمومان پیری ئاخرخێر بین،

خەم مەخۆ کەپیری...بەلکو خەم بخۆ بۆپیری.

## تەمنی پڕبەرەکەت:

پێشەواعلی فەرمویەتی: خوایەداواکارم تەمەنێکی پان وپـۆڕم بـدەیتێ نـەك درێـژو باریـك، کەسانێی زۆرهەن لەژیان بێئاگان ونازانن چۆن تەمەن دەگوزەرێنن هیچیان نـەکرد، پێـشەوا عمردوعـای دەکرددەیفەرموو(اللهم انانـسالك صـلاح الـساعات والبرکـتفی الاوقـات )واتـە خوایەچاکی وپاکی وخێروبەرەکـەت بخەیتـەکات وساتی تەمەنمانەوەوهەروەهالەبەرامبـەردا خەڵکانێك هەن زۆرسودیان لەتەمەنی خۆیان بینیوەبۆنمونە(ئیمامی نەوەوی )کە (٤٥) ساڵ ژیاوە بەلاّم بەدەیان کتێبی جێهێشتووەوە لەسـەردەمی تازەشـدا(حامـد رەبیـع، د.مـستەفا زەڵمی،مامۆستا عـبدالکریم مودەریس)خزمەتی زۆریان جێهێـشتووە،(د.عبـدالکریم بکـار) دەڵێت: کەسی بەتواناوسەرکەوتوونەوەیەکەبەلای کەمەوەسـاڵی (٥٠)کتێـب دەخوێنێتـەوە، ئەی چی ئەڵێی بەوانەی کەساڵی کتێبێکیش ناخوێننەوە!

حەزرەت(ﷺ) دەفەرموێت:(اَعذرَ الله الی امریء اخر اجله حتی بلغهٔ ستین سنة) واتـە: خوابیانوی کەسێکی نەهێشتوە کەشەست ساڵ تەمەنی داوەتـێ ...لەشەست سـاڵدا نەگـەر بیـست ساڵیشی لـێ لابـەی بەڕاسـتی (٤٠) سـاڵ کـەم نیە،یـەکێکی وەکوسـەعدی کـوڕی معاژتەنها ،حەوت ساڵ ئیسلامەتی گەیشتە پلەیەك کەکاتێك وەفـاتی کردحـەزرەت(ﷺ) فەرمووی: عـەرشی خوابـۆی لەریوەتـەوە(اهتزلهُ عـرشُ الرحمـان)..سـبحان الله ..چ پلـەو پایەیەکی بەرزە!...تەنانەت هاوەڵان کەجەنازەکەیان هەڵگرتبووسووك بووبەدەسـتیانەوە، حەزرەت(ﷺ)فەرمووی:مەلائیکەتان لەگەڵیان هەڵگرتوون..(خۆزگەمـان بەخۆی).

## ڕۆژی جیهانی هەژاری

### ئەگەرهەژاری پیاوێك بوایەئەمكوشت (پێشەوا علی)

١٨/١٠/ی هەموساڵێ بەڕۆژی جیهانی هەژاری ناسراوە،سەرەڕای پێشكەوتنی ماددی تەكنەلۆژیاوبونی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی وڕێكخراوی مافەكانی مرۆڤ، ڕۆژی جیهانی هەژاریشمان هەیە!بەپێی ئامارێكی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكان دانیشتوانی سەرزەوی بەشەش ملیاردانـاوە زیاترلەچوارملیاری ژمـارەی وڵاتەدواكەوتوەكانەولەونێوەندەدا(٢) ملیاری لەخوار هێڵی هەژاریـدان نەك هەژارلزۆرینەی ئەوانەش لەئەفریقیان وكۆنگۆی دیموكراتیش لە پێشەوەی وڵاتەهەژارەكانەلڕۆژانە هەزاران منداڵ لەجیهاندالەبرسان وبەهۆی بەدخۆراكیەوەدەمرن!لەبەرانبەرئەوەدا سەرمایەی (٣) دەوڵەمەندترینی جیهان بەئەندازەی خەرجی (٤٨) وڵاتی هەژارە! لای خۆشمان بەپێی لیژنەی بالای دژەهەژاری لەعێراقداو لە ڕاپۆرتی مانگی(٤/٩٠٠٢) نوسیویەتی: ڕێژەی هەژاری لە عێراقدا (٢٣./.)وهی گوندەكانیشی(٣،٣٩./.)یە!بەحیساب لەسەر دەریای نەوتین!، بەوپێیەزۆرینەی مرۆڤایەتی قڕن كەمێكیش پڕن!سەرەڕای ئەودروشمە بریقە دارانەی بەرزیان كردۆتەوە تادەگاتە وێنەی گوڵەگەنمەكەی ئالای نەتەوەیەكگرتوەكان سەلماندیان كەدروشمی سیاسیەوبێناوەرۆك و بۆشە دەنگی دەهۆڵەولەدوری خۆشە،وەكوئەزانن دوای نەمانی فەرمانڕەوای ئیسلامی ئەوە زیاترلە سەدەیەكەدوو ڕژێمی گەورەخۆیان سەپاندووە بەسەر جیهاندا ئەوانیش: سەرمایەداری ڕۆژئاواوسۆشیالیستی ڕۆژهەلاتەوهەریەكەیان خۆی بەباشترئەزانێ لەویتر ئەوەش ژیان وگوزەرانی زۆرینەی مرۆڤایەتیەكە یەكپارچەبۆتەقەیران!لەسایەی بیری ئەوان! سەرەڕای ئەوەی كەكێشە كانیان خستۆتەولاتانی ئێمەوەلەپێناوتالانكردنی پێشمان ئەڵێن خەتای ئیسلامە ئێوەپێش ناكەون!لەكاتێكداپێچەوانەی ئەوەڕاستەبەشایەتی مێژوی ڕابردو مان،زۆرلەزانایا نی جیهان گەیشتونەتەئەوڕاستیەی ئیسلام تاكە سیستەمەكەلەتوانای دایە مافی سەرجەم مرۆڤە كان بدات لەسنوری دادگەریدا ونابوری ئیسلامیش تاكەڕژێمێكە

کەمامناوەندەلەنێوان سەرمایەداری و سۆشیالیستی دا ومافی هیچ کام لەتاك وکۆمەڵگای پێشێل نەکردووە لەسەر حیسابی ئەویتر وهاوسەنگی لەبەرچاوگرتوە،چون لەلای ئەوان هەمووشتێ لەسەربنەمای ماددەدانراوە گوێ بەڕەوشت وناخی مرۆڤ نەدراوە!بەلاّم لە ئیسلامدا هەولّدان بۆدنیاودوارۆژلەیەك کاتدابەیەك چاو سەیرکراوە پێکەوە هەولّیان بۆدراوە،وەك لەفەرمودەداهاتوە:(هەولّبدەبۆدنیا کەقەت نامری،وەئیش بکەبۆدوارۆژ وەك سبەینێ بمری)!ئیسلام زۆرهانی داوەبۆکاروهۆ کارەکانی بەرز کردنەوەی ئاستی بژێوی دەولّەمەندبون،بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا سەروەت وسامان تاکە ئامانج و مەبەست نیە بەلّکو هۆکارە بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی گەورەئەویش بەختەوەری دنیاو دوارۆژە بەڕازی بونی خوای پەروەردگار،چونکەلای موسلّمان دنیاکێلّگەی دوارۆژە،وەك خەلّکانێ نالّێت (هی خۆم بۆخۆم هی تۆش دەخۆم!)،هەرئەوەش بوووایکرد لەسەر دەمی شارستانی ئیسلامی داو لەرۆژگاری(عُمَری عبدالعزیز)دا کەسێ نەبوو خێرو زەکات وەربگرێ!چونکەیەکسانی هەبولەدابەش کردنداوبیروباوەڕەکەی ڕێگەی نادات خۆی تێربێ وجیرانەکەی برسی،بەلاّم ئێستاکە یتمی ئابوری ئیسلامی لەئارادانیەهەندێ شوێن لەبەرهەژاری لەبرسان دەمرن وکۆگانی هەندێ ولاّتیش پڕن وخواردنەکانیان بەسەردەچێت ودەیسوتێننلوەك بلّێی تەنها ئەوان مرۆڤ بن!،ئەوەدەسەلاّتی ئەوانەلەئێستاداوئەوەیش کەڕابرد لە مێژوی ئیسلام تێکستەکانیشی بەلّگەی ئەوڕاستیەن،لەئیسلامدا هەژار ڕێز لیّگیراوەبەلاّم هەژاری دژایەتی کراوەهەولّی لەناوبردنی دراوە،وەك لەپێشەوا (علی)یان گێڕاوەتەوەکەفەرمویەتی (ئەگەرهەژاری پیاوێك بوایەئەمکوشت و لەناوم ئەبرد)چونکەهەژاری وبرسیەتی مرۆ تووشی لادان دەکات وبێبڕوایی پێوەیە هەربۆیەپێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ)پەنای بەخواگرتووە لە هەژاری و بێبڕوایی پێکەوە!(اللهم انی اعوذبك...ومن الكفروالفقر..)ئەمەجێگەی سەرنج ورامانە خەلّکێکیش وادەزانێ کەموسلّمان بوی دەبێ هەژاربی..!هەندێ لە هاوەلاّن دەولّەمەندبون بەلاّم بۆکەمکردنەوەوبەرگری لە هەژاری بەخشیویانە بەهەژاران لەڕێی

خوا،دیارەجیاوازی ئاستەکان بەپێی جاوازی تواناکانە، هەژارودەوڵەمەندیش هەروەو هەردەبێ سوننەتی ژیانەبۆمەبەستی تاقی کردنەوەیانە،گرنگ هاوسەنگی وپێکەوەژیانە، بەئومێدی دەرچون لە تاقیکردنەوەی دنیاودوارۆژبۆسەرکەوتنی یەکجاری کەدورەلەهەژاری. زۆرنامرادان دەبینی لەکۆڵآن... لەم لایش پارەسەرف دەکرێ بەکۆڵآن!

(هەژار)

# ڕۆژی جیهانی کەمئەندمان

بــەپێی ئامــارێکی نەتەوەیــەکگرتوەکانی(٢٠٠٩) ژمــارەی کەمئەنــدامان بەهــەموو جۆرەکانیەوەلەجیهاندازیاترەلە(٦٠٠)ملێۆن(٩٠)هەزاریان لەهەرێمەکەی خۆمـانن،(٦/٦)ی هەمووســالێ ڕۆژی کەمئەنــدامانی کوردســتانەو(١٢/٣)یــش هــی کــەم ئەنــدامانی جیهانە،لەوڕۆژەداچەندساتێ بەهەندێ هەڵپەڕکێ وشایی ولۆغـان، ئـەویش بۆبـەزمی خۆیـان کەناونراوەبـە(چـالاکی هونـەری)کـات بەسـەر دەبـەن و یادیـان دەکەنـەوە!کەبـەوەش هـیچ لەخەمـەکانیان کـەم نابێتــەوە،بێگومـان ئـەم ژیانەبۆتاقیکرانـەوەی مرۆڤەکانەوهەریـەك بەجۆرێ،سوننەتی پەروەردگارە لـە بونـەوەرداوبێ حیکمـەت نیە،لێرەدامەبەستم لەوەیکـە ڕۆژی کەمئەنـدامان ئـەبێ چـۆن بگوزەرێ؟چـۆن دڵیـان خـۆش بکـەین لەژینیاندا،نـەك بۆچەندساتێ، شـایی وهەڵپـەڕین بەئەوانـەوەك بـەبێلێو فیتولێدانـە!لـەجیاتی ئەوەباخـەمی ڕاسـتە ڤینـەیان بخـورێ بەناردنـەدەرەوەیان بۆچارەسـەر،یان پێـدانی سـەیارەی تایبـەت وماتۆڕسـکیلی تایبــەت،یان ئەگەرخانوشــیان بۆناکــەن بــا پارچــەیەك زەویــان بدرێتێ،کەئەمانەمافی سەرەتایی وسروشتین ولە ولاَتـەکانی ئـەورووپاوڕۆژئـاوا بـۆ یـان دابـین کراوەوهــەرماڵێ کەمئەنـدامێکی تێـدا بێـت لەسـایەی ئـەودا ژیانیــان باشـە،لەکاتێکدا حکومـــــەتمان شـــــانازی بەدروشمـــــەکانی ئەوانـــــەوەدەکات بـــــەلاَم وەك ئـــــەوان ناکات،هەرشتەخراپەکانیان لێوەردەگرن!لەجیاتی هەموئەم خزمەتانـە مووچـەیەکی کـەمی نـەمری ونـەژی یـان دەدانـێ وەك یارمــەتی نـەك فـەرمی! کـە بەشـی میـوەی ژەمێکـی کاربەدەستانە،بۆئەوەش زۆرجارلـەم ڕۆژەدا ناچـاردەبون کـەمان بگـرن خۆنیـشاندان بکـەن تالەکاتی خۆیداپێیان بدەن یان بۆیان زیاد بکەن! لەکاتێکداپێیان دەڵێن خـاوەن پێداویـستی تایبەت،کەدەبێ ڕێزی تایبەتیان لێبگیرێ،دوای خزمەت کردنیان دەتوانراسەرقاڵ بکـرێن بـە کارێکەوە و سودلەبەهرەوتواناکانیان وەربگیرایە ،ئەوکاتە لەدوولاوەدڵخۆش دەبـون وخەمـە کانیــان زۆرکــەم دەبویەوە،لەســەردەمی ســەددامی دیکتــاتۆردا کــە ئۆتۆمبیــل زۆرکــەم

بوو،ئەوسەیارەی تایبەتی(معوق)ی زۆر بەهەرزان پێدان، بەلاّم لەسەردەمی بەناو مانی مرۆڤ وعەولەمەدابەمانگرتنیش وەلاّمی شایستەو دلّخۆشکەریان نادرێتەوە! خەم و ناسۆرەکانی کەمئەندامان زۆرن،رەحمەت لە پێشینان کەوتویانە: (سەدحەکیم بەقەد دەردەدارێك نازانیّ)چون هەرماڵێك دانەیەکی تێدابێت ئەوخێزانە هەمویان لەئازارومەینەتی دان،بەختەوەریش ئەوەیە کەپەند لەکەسانی ترودەریگرێت، تۆبێنە بەرچاوی خۆت کەتۆلەشوێنی ئەو نابینایە بیت یان وەك ئەونابیستەبیت(کەرولاڵ) بی یان بیّ دەستوقاچ بی یان..یان،تۆیەکی لەش ساخ وتەندروست هێشتا هەست بەبێتاقەتی وبێزاری دەکەی لەولاّتی خەمان،دەی بیریّ بکەوەلەئەمان؟بۆیەسەردانی نەخۆش و پیرو پەککەوتەوداماوخێری ئەوەندەزۆرەچونکەئەوکات هەست دەکەی بە نازونیعمەتی تەندروستی وبەئاگادەبیەوەلەبایی بون ولوت بەرزی غەفلەت ،لە رۆژی کەمئەندمانندا پێویستەهەمومان هاوکاروهاوخەمیان بین وپشتیوانی لەماف و داواکانیان بین،بەوەش دەگەینە پاداشتی دنیاودوارۆژ،وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە(هەرکەس گرفت ونارەحەتیەکی دنیالەسەرموسوڵمانیّ لاببات ئەوە خوای گەورەلەپاداشتیاکۆسپ وگرفتی قیامەتی لەسەرلادەبات)بەراستی مژدەیەکی خۆشە، (والله فی عون العبدمادام العبدفی عونِ اخیه).

# ڕۆژی جیهانی تەندروستی دەرونی

٧/١٠/ی هەمووساڵێ بەڕۆژی نەخۆشیەدەرونیەکان ناسراوە،وەك هێمای زیاتر گرنگی دان بەچارەسەرکردنی ئەوانەی دوچاری نەخۆشی دەرونی بون،لێرەدا ئەوەی شایانی ئاماژەبۆ کردنە ئەوەیە کەسەرەڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو کرانەوەی عەقڵەکان،لەگەڵیدا پەتاو نەخۆشیە کوشندەکان لە زیادبوندان! تەنانەت زۆرێك لەوانەی کەلەشیان ساغەدڵەڕاوکێ وخەمۆکی دایگرتون وچێژ وەرناگرن لەکۆشك وتەلارودیناردۆلاروجوانی یاروچەوری پارو، هەرچەندە بۆچارەسەری پەتا جەستەییەکان هەنگاوی باش نراوە،بەلاّم بۆنەخۆشیە دەرونیەکان شتێکی ئەوتۆبەدەست نەهێنراوەکەشایانی باس بێت، لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستیەی کەچارەسەری ڕاستە قینەی نەخۆشیە سایکۆلۆ جیەکان تەنهالەبیروباوەڕی ئیسلامی دایەبەچێژوەرگرتن لەئیمان و تێگەیشتنی دروست لەقەزاوقەدەروگوێگرتن لە قورئان،دیارە هەوڵەکانی مرۆڤ زۆرن بۆ دەربازبون لە خەمەکانی هەژاری ونەداری ونەخۆشی وناخۆشی،بەلاّم موسڵمان دەبێ دڵنیا بێت کەبڕیاری خوادەبێ هەربێتە جێ،ئەوەیش بڕوابونە بە(قەزاو قەدەرە ) کەپایەیەکی بیروباوەڕەکەیەتی،تۆ کەنەخۆشی یان کەمئەندامی یان هەژاری بێ حیکمەت نیەوبەشی تۆناوایەونهێنیەکەی لای خوایە،لەفەرمودەی حەزرەتا هاتوەکە:(خوای گەورە ماڵ وحاڵی دنیا ئەدا بەوەی کەخۆشی ئەوێ وخۆشی ناوێ،بەلاّم ئیمان تەنهائەداتەئەوکەسانەی کەخۆشی ئەوێ)،کارەکانی خوایەکەچارچە ڕەحمەت وعەدالەتە کوڕنەدابەحەزرەتی ابراهیم وکچ نەدابە حەزرەتی لوت ویەحیا پێغەمبەریش منالی ناداتێ وحەزرەتی محمدیش کورو کچی ئەداتێ(سەلامی خوایان لەسەر)،وەك وتراوە(خواکاری نا بەجێ ناکا تا کێونەبینێ بەفری تێناکا)خێرلەوبەشەدایە کەخواپێی داوی،گەر تۆهەژاری ونەودەوڵەمەندەعەدالەتە،لەوانەیەتۆی هەژار گەردەوڵەمەندبی بایی بیت وبەرەوبێدینی بڕۆیت وخراپەکاری ئەنجام بدەیت یان ئەودەوڵەمەندە گەر هەژاربێت دان بەخۆیدانەگرێت ودوچاری شیرك وکوفربێت،پاشانیش دەبێ ئەوڕاستیە بزانین کە زیکرویادی خوادەرمانی

دلآنەو بە ئەنجامدانی بەندایەتی ڕاستەقینە دڵەکان ئارام دەبن،حوزەیفەبۆمان دەگێڕێتەوە: هەرکاتێ پێغەمبەر (ﷺ)بەهۆی ڕوداوێکەوەخەمبارد‌ەبووپەنای بۆنوێژدەبردودەیفەرموو: بیلال قامەتی نوێژبکەوتابەهۆیەوە دڵمان شادو بەختەوەربێت،چون مرۆڤ هەرچەندە لەڕوی ماددیەوەپێشکەوتوبێت بەلاّم بۆشایی ڕۆحی پڕناکاتەوە،خوای گەورە بەحیکمەت وزانایی ودانایی خۆی ئاسودەیی وبەختیاری نەخستۆتە پارەو سامان وناوبانگەوەچونکە ئەوانە خۆشی ڕوکەشی دنیان ورۆحی مرۆڤ ئاسودە ناکەن،تەنها ئیمان وبڕوایە کە مرۆڤ بەڕاستی ئاسودە دەکات،بۆسەلماندی ئەوڕاستیەش سەدان نمونەمان لەبەر دەست دایە کەزاناو دانا و دەوڵەمەندوناودارانی ڕۆژئاوا وئەوروپا لە لوتکەی ژیانی ماددیانەوەبەدەستی خۆیان کۆتاییان بەژیانی خۆیان هێناوە،وەك ڕۆماننوسی ئەمریکی(ئەرنست همنگوا)وەدیل کارنجی کەخاوەنی کتێبی(دع القلق وابدا الحیاة،وەفان چوخی هۆڵەندی،کریستینان ئۆناسیس ملیۆنەری یۆنانی،دکتۆرە(دوڕیەی شەفیق)کەدکتۆرای لەپاریس هێنابو..هتد) لەزانکۆی ئایوای ئەمریکی لێکۆڵینەوەیان لەسەر(٥٥٠)کەس کرد،دەرکەوت کەئەوانەی بڕوادارن وسەردانی پەرستگادەکەن زیاتردڵیان ئارام وئاسودە یەلەچاوئەوانی تر،دیارەئەوەش فەرمانی خوایەکەلەسورەتی(تەها/١٢٤)فەرمویەتی:(ومن اعرض عن ذکری فان لە معیشة ضنکا....)واتە: هەرکەس پشت بکاتە یادی من وبەرنامەکەم ژیانێکی تەگ وتاڵی دەبێت نوسەری فەرەنسی (ئەندریەمۆرۆ)ئەڵێ:{مرۆڤ کاتێ بەهەمووئاوات وئارەزوەکانی گەیشت هەست دەکات کەدڵتەنگترین کەسەلەجیهاندا!چونکەئاواتی تری نەماوە تاهەوڵی بۆبدات } بۆیەتاکە چارە سەرودەرمان بۆنەخۆشیە دەرونیەکان گەڕانەوەیەبۆیادوپەیامی خوای میهرەبان،بەتێگەیشتنی ڕاست ودروستی پایەکانی ئیمان وبەتایبەت قەزاو قەدەر.

تەندروستی پاشایەتیە..

قەناعەت دەوڵەمەندیە..

دینداری بەختەوەریە

# ڕۆژی جیهانی لێبوردن

## جوانترین دیاری لێبوردنە

١١/١٦/ی هەمووساڵێ بەڕۆژی جیهانی لێبوردن دانراوە،کەئەم ساڵی ڕابردهاوکات بوولەگەڵ جەژنی پیرۆزی قوربان،لای ئێمەی موسڵمان جەژن ڕۆژی جیهانی لێبوردنە، جەژنیش لەناوەرۆکداهێمای خۆشی و لێبوردنە،دینەکەشمان یەکپارچە سۆزوبەزەیی ولێبوردنە،لێبوردنی ئێمە سەرچاوەکەی لەپەیامی خواوەیەوبەکێ لەناوە پیرۆزەکانی خوا(العفو) کەلەتاوانی بەندەتۆبەکارەکانی دەبورێ،چاوپۆشی ولێبوردن فەرمانی خواو پێغەمبەرەودەیان ئایەت وفەرموودەی لەسەرەکە پێمان دەڵێن: ئەگەردەتانەوێ خوا لێتان ببورێ لەخەڵك ببورن،لێبوردن هەستێکی دەروونی جوامێرانەیە وبریتیەلە چاو پۆشی ووازهێنان لەحەقی خۆ هەر چەندەدەست درێژکەرستەمکاربێ بەمەرجێك ستەم لێکراوتوانای تۆڵە سەندنەوەی هەبێت ودەست درێژیەکەش بۆسەرکەرامەتی دین و پیرۆزییەکانی ئیسلام نەبێ چونکەئەوکاتەلێبوردەیی دەبێتەزەلیلی وملکەچی، لێبوردەیی بەومانایەوبەومەرجە ڕەوشتێکی ئیمانی پەسەندودامەزراوە، خوای گەورە فەرموویەتی﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾واتەئەوانەی ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوەولە خەڵکی دەبوورن خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت، دەگێڕنەوە کە بەندەیەکی (زین العابدین) نەوەی پێشەواعلی مەسینەگڵە کەی لەدەستی بەربووەوە قاچی زین العابدینی برینداركرد، بەندەکە خێرا وتی گەورەم خوا دەفەرموێت( والكاظمين الغيظ)واتە ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنەوە(زین العابدین)گوتی ئەوا ڕقەکەم خواردەوە..پاشان بەندەکە وتی: (والعافين عنِ الناس)واتە ئەوانەی لێبوردەن بەرامبەر بە خەڵك، گوتی ئەوە لێت خۆش بووم،بەندەکە وتی: (واللهُ يحب المحسنين) خواچاکە کارانی خۆش دەوێت زین فەرمووی: ئەوا لە ڕێی خوا برۆ ئازادم کردیلعوبادەی کوری صامت گێراویەتیەوەکە

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:(**ألاانبئکم بما یشرف الله بە البنیان ویرفع بە الدرجات؟ قالوا نعم، قال**... واتە:ئاگادارتان بکەمەوە لەوەی خوای گەورە پایەتان بەرز بکات،وتیان بەڵێ فەرمووی:لێبوردەبە بەرامبەربەوکەسەی نەزان ونەفامە بەرامبەرت، خۆش ببەلەوەی ستەمت لێدەکات،ببەخشە بەوەی پێت نابەخشێت ولێت دەگرێتەوە سەردانی ئەوخزمە بکەکەسەردانی تۆناکات.ئەوە پەیامی ئیسلامەبۆ چاو پۆشی ولێبوردن وخۆشەویستی ومرۆڤ دۆستی کەبەشێکە لەدینداری،بەلآم ئەوەی ئەوان زیاتردروشمی بێناوەڕۆکە،ئەینالەکوێ زل هێزەکان داوای لێبوردنیان لەوگەلانەکرد کەچەوساندویاننە وەک:وەك گەلی کورد و فەلەستین و کشمیروشیشان وبۆسنە ...هتد، وەك بلێی ئەوانە مرۆڤ نەبن مادام موسڵمانن تیرۆرستن! دیارەلەمامەڵەی ڕۆژانە لەگەڵ یەکترداوشەی لێبوردن زۆرجوانە ڕێزدانانەبۆبەرامبەروخوابەوەڕازیە،لە کۆتایدا: ئەوەندە بەسە بۆ گەورەیی ئەم دینەکە نەیارانیشی دانیان بەوەدا ناوەکەئیسلام لەمامەڵەی ڕۆژانەیدانەرمونیانە،وەك(جۆن ئیسپۆزیتۆ)مامۆستای زانکۆی(جۆرج واشنتۆن ) دەڵێ:{ئیسلام ئاینی میهرەبانی وپێکەوەژیانەودورەلەتوندوتیژی..} .

# خوێندنەوەکی مێژویی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ

**ماف لەبەرنامەی مرۆڤداگەر نەسەنرێ..نادرێ، کورد بەنمونە:**

١٠/١٢/ی هەمووساڵێ دروشمەکانی جاڕنامەی مافی مرۆڤی نێودەوڵەتی بەرز دەکرێنەوە،کەئەنجومەنی ئاسایش بۆیەکەم جارلە(١٩٤٨/١٢/١٠)لەکۆشکی (شابو) لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا ڕایگەیاند،بێگومان مافی مرۆڤ بۆهەموان پێویستەوڕاست ودروستە،بەلاّم تەمەنی درێژی زیاترلە(٦٠) ساڵی ئەو جاڕ نامەیەئەوەی سەلماندکە: هەرگیزمافی مرۆڤ لای مرۆڤ دەست ناکەوێ ،ناچار دەبێ مافی خوراوی لەستەمکار بسێنێ،ئەوجاڕنامەیە هەرچەندە دەق و تێکستەکانی بۆهەموانە بەلاّم لەپراکتیزەدا تەنها بۆخۆیانە!تەنها بۆمرڤی ئەوروپاوڕۆژئاوایەوبۆگەلانی چەوساوەمەرەکەبی سەرکاغەزە وهیچی تر!چون ئەوان خاوەنینی وبۆبەرژەوەندی خۆیان دروستیانکردوە،بەبەڵگەی:(ڤیتۆ) بۆهەبێ؟پاشان بۆدەبێ تەنها بۆدەوڵەتە زلهێزەکان بێ؟مەگەردەوڵەتەکانی تر ئەندامی ئەورێکخراوەنین؟مرۆڤ نین؟لەلایەکی ترەوەمێژوودیارەئەوانەی ستەمیان لەئێمەی کورد کرددوەودابەشیانکردوە خاوەنانی بەناومافی مرۆڤن، جگەلەشەڕەکانی کوردکوژی وخیانەت وگەندەڵی لەبەرچاوی مەکتەبی مافی مرۆڤ لەکوردستان!وەلەسەرئاستی نێودەوڵەتیش بەنمونە ساڵی (٢٠٠٩) کە ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکاخەلاّتی نۆبڵی ئاشتی پێدرالەوکاتەدا بڕیاریدا بە ناردنی(٣٠٠٠٠)سەربازی زیادەبۆئەفغانستان!بێگومان ئەوانە بۆمرۆڤ کوشتن دەچن،سەیرەپیاوکوژخەلاّتی ئاشتی وەردەگرێ لەوڵاتی سەرکردایەتی مافی مرۆڤ!، ئەوەکوشتاری مرۆڤەکانی(بۆسنەو چیچان وکشمیروئەفغان وپاکستان وفەلەستین وعێراق وکیماوی وئەنفالی کوردان و...هتد)بجەلاوەکەهەموی بە بەرچاوی ئەوان ئەنجامدراوە! لەکۆتایی(٢٠١٠)داماڵپەڕی (ویکلیکس)هەزاران بەڵگەی پێشێلی مافەکان وکوشتن وبڕینی لەعێراق بلاّوکردەوە کەهێزەداگیر کەرەکان ئەنجامیان دابو!مافی مرۆڤیش لە خەودابو!بەلاّم بۆتاکە سەربازێکی دیلکراوی جولەکە بەناوی(جەلعەت شالێت)نامادەن

کەرتی غەززەبکەنە سوتماگ وبانگی مزگەوتی ئەقسای پیرۆز قەدەغەبکەن ونزیکەی هەزار دیلیش ئازاد بکەن!ئیتر کاتی ئەوەهاتووەبەخۆماندا بچینەوەوچیترخۆمان بەهەڵە نەبەین بەچاوەڕێکردنی بریقەی سەراب تینویەتیمان ناشکێ، دڵنیابین کە مافی مرۆڤ لای خاوەنی مرۆڤەکانە،لەناوپەیامەکەی پەروەردگاری جیهانە، ئەگەر: پەیامەکەی پراکتیزەبکرێت، ئەوەمافی ڕاستەقینەی مرۆڤ کەزیاتر لە (١٤٣٢) ساڵەلەقورئانەدا ڕاگەیەنراوەبە (یاایها الناس..) بانگی سەرجەم مرۆڤەکان دەکات،تیایدا هاتووە کوشتنی مرۆڤێك بەناحەق وەك لەناوبردنی سەرجەم مرۆڤەکانە ورزگارکردنی مرۆڤێکیش لەمردن وەك رزگار کردنی سەر جەم مرۆڤەکانە،وەهەروەها لەئایەتی(١٣حجرات)دا فەرموویەتی(ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەنێرومێ دروست کردووە،پاشان گێراومان بەگەل وهۆزبۆ یەکترناسین وپێکەوە ژیان،.. لتعارفوا ) نەك بۆیەکترلەناوبردن،وە هەروەها پەیامبەری ئیسلام لەحەجی ماڵئاوایدا فەرمووی: فەزڵی عەرەب نیە بەسەر غەیری عەرەبا وەسپی پێست گەورەتر نییەلەڕەش پێست تەنها بەتەقوا نەبێت،وەفەرموویەتی خەڵکی یەکسانن وەك دانەکانی شانە،چونکە هەمومان لەنادەم پاشەکەوت بووین وئادەمیش لەخۆڵ،وەلەئیسلامدا ڕووخانی کەعبە ئاسانترەلە لەناوبردنی مرۆڤێك بەناهەق چون هەرکەسێ مرۆڤێ لەناو بەرێ ئەوەبیناودروستکراوی خوای ڕوخاندووە،بۆیەلەپێناوپاراستنی ژیانی مرۆڤەکان(قصاص وقود)ی داناوە کەمەبەست تۆڵەوکوشتنەوەی بکوژە، سزای دواڕۆژیش بەئازاروسەخترە، دیارەئەوەی بەرانبەرزیندانیەکان کراوە لە بەندیخانەی دەزگا ئەمنیەکاندا هەرباس ناکرێ بەتایبەت بەناوی یاسای دژە تیرۆر!کەهیچ مامەڵەیەکی مرۆڤانە نایان گرێتەوە لبۆ؟ئەی مافی مرۆڤ لە کوێی؟(لەبەردرێژنەبونی باسەکە خۆم بواردووە لەنوسینی دەقی ئایەت وفەرمودەکان)

# مافی ڕێگاوبان

پێغەمبەر(ﷺ)لەفەرمودەیەکدامافی ڕێگاوبانی بۆدیاری کروین،فەرمویەتی: (ایاکم والجلوس علی الطرقات....،فەرموی خۆتان دوربگرن لەدانیشتنی سەر ڕێگە، ئەوانیش وتیان پێویستمانەوناچارین،فەرموی مادام وایەمافی ڕێگە بدەن،وتیان مافی ڕێگەچیە؟ئەی ڕەسولی خودا،فەرموی:چاولەحەرام بپارێزن ووەلامی سەلام بدەنەوەوئازاری خەڵك مەدەن وفەرمان بکەن بەچاکەو ڕێگری بکەن لە خراپە)(متفق علیە)ڕێگاوبان هەمومان پێویستمانەو بەرژە وەندی گشتیەوپاراستن ورەچاوکردنی ڕێنماییەکان ئەرکی سەرشانی هەموانە لابردنی ئازارێکی سەررێگابەشێکی ئیمانە(اماطةالاذی عن الطریق) وەك نەریتێکی ساڵانەی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی سلێمانی لەمانگی نیساندا هەفتەی هاتوچۆی ڕێك دەخست لەژێردروشمی(سەلامەتی بۆنێوەوسەروەری یاسا ئامانجمانە)لەو ساڵەشدا هەفتەکەیان تێپەڕاندوبەگەلێ کارو چالاکی باش ئەنجامدرا هەرڕۆژە لەگەڵ چین .توێژێك کۆدەبوونەوە،بۆهەمان مەبەست لەگەڵ تیمەی مامۆستایانی ئاینینی لەمزگەوتی مەولەوی شاری سلێمانی کۆبوونەوە، بەئامادەبوونی بەڕێوەبەروچەندئەفسەرێك و ڕێکخراوی گەشەپێدانی مەدەنیەت لەگەڵ نوێنەرانی ئەوقاف وزانایان،کە تیایداباس لە گرنگی و پابەندی ڕێنماییەکانی هاتوچۆ.کرا بۆ سەلامەتی هاوڵاتیان بەتایبەت سەر وەری یاسا،کە بەپێی ئاماری ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ساڵی پار (١,٢٠٠,٠٠٠) کەس لە جیهاندا بەڕوداوی هاتووچۆ تیاچوون! وە (٤٠,٠٠٠,٠٠٠) کەس کەمئەندام بوون.لەو ساڵانەش لەپارێزگای سلێمانیدا (٢٠٠-٣٠٠)کەس ئەبنە قوربانی ڕووداوەکانی هاتوچۆ،کە ئەمەوەك جەنگێکی جیهانی بەردەوام وایە،جا بۆ کەمکردنەوەی قوربانیانی ڕوداوی .ڵتەزێنی سەیارەو لە پێناو سەلامەتی هاوڵاتیان پێویستەلەسەر هەموولایەك کە پابەندی ڕێنماییەکان بین وبەئەرکێکی ئاینی بزانین چونکەبەرژەوە ندی گشتی یەو هەوڵ بدەین کە یاسا سەروەربێت، ئەوەیش بە بەرز کردنەوەی هۆشیاری تاکەکان لە شوێنە گشتیەکانی

وەك مزگەوتەكان ودام ودەزگاكان، پاشان لەكۆتایی كۆڕەكەدا هەموویەیەك دەنگ جەخت كرایەوە لەسەرگرنگی ڕێنماییەكان و سەروەری یاساله پێناو بەرژە وەندی گشتی وژیانێكی شارستانی پێشكەوتوو، دواتردەرگای پرسیارو وەلاّم كرایەوە،لەپرسیارێكی بەندەدا وتم: نەبێت یاسا دەسەلاّت پالّپشتی لیّ بكات و لێپرسینەوە بۆهەموان هەبێت،بەلاّم بۆچی سەیارەجامرەشەكان لەسەروی یاساوەن ؟بۆیاسا تەنها بۆخاوەن تەكسی هەژارە؟دیارە هەموومان دەزانین كە جام ڕەشەكان هی كێن ولە كوێیان هێناون ولەولاّتی ئێمەش ژمارەیان گەلیّ زۆرەوهەندیّ پۆلیسی هاتو چۆكە پرسیارم لیّ كردوون سەبارەت بە گرفتی كارەكەیان لەوەلاّمدا دەلّێن گیرمان خواردووە بە دەست سەیارەی زلە زلەكانەوەوترافیك لایت بۆئەوان هەر سەوزەوحیساب بۆدووڕەنگەكەی ترناكەن وپۆلیسەكەش ئەگەرهەلّو ستێكی یاسایی بیّ یان زووریێگاكەیان بۆنەكاتەوە ئەوە داماوەدووچاری نەقلّ وفەصل و ێدان دەبێت، ئیترئەویش گیری خواردووە لەنێوان بەرداشی جام ڕەشەكان ویاسادا جا هەر ئەوبەرێزانەش كاتیّ باس لە سیستمی ئەوروپاوسەروەری یاسا دەكەن دەم پڕدەبیّ لەئاو!كە دەبوو پابەندی یاسا لەوانەوە سەرچاوەی بگرتایە،بەلاّم بۆهەموو شتەكان ئاوە كە لەسەر چاوەكەوە لێلّە بۆیە ڕوون نابێتەوە وسەرپێچی وخیانەت وگەندەلّی بەردەوام لەزیادبووندایە (گەورە ئاویّ دەڕێژیّ وگچكە پێی لیّ دەخشێنیّ).

# بازرگانی ڕاستەقینە..دڵسۆزی ژیارو ژینە

بەرنامەی ئیسلام گشتگیروهەمەلایەنە دەستوورویاسای بۆ هەمووشتێ دیاری کردوە، لەومیانەدا هەرشتێ سودی هەبێ بەحەلاڵی داناوەوهەرچی زیانیشی ببێ بۆکۆمەڵگاحەرامی کردووە،لای موسڵمان کۆکردنەوەی سەروەت وسامان ئامانج نییە بەڵکوئەوەی گرنگە بەلایەوە لەڕێگای دروست وحەلاڵ بەدەستی هێنابێ چونکە دەزانێ ماڵی حەرام ژەهرێکی کوشندەیەوبەندایەتیشی لێوەر ناگیرێ، بەپێچەوانەی خەڵکانێکی بەرامبەرکەتەنها بەرژەوەندی خۆیان لەبەرچاوە ودەڵێن(الحلال ماحل بالجيب )،بەلام لای موسڵمان ئەوەیەکەخوا حەلاڵی کردبێ،بەهەڵە تێگەیشتن لەدین سەرگەردانیەبۆ ژین، چاکەو خراپە تێکەڵ دەکات ،موسڵمانی ڕاستەقینە لەشتەحەرامەکانی وەك غەش وفێڵ خیانەت دوردەکەوێتەوەوبەوەیش دەبێتەهاولاتیەکی ئەکتیڤ وئیجابی و دڵسۆزی گەل ونیشتمان چونکەدەزانێ کەپەیامبەری پێشەوامان فەرموویەتی (هەرکەس فێڵمان لێ بکات لەئێمە نییە،وە فەرموویەتی:(التاجرالصدوق مع النبيين و...)واتە: بازرگانی ڕاست ودەستپاك لەدوارۆژدا لەریزی پێغەمبەران وڕاستگۆیانە...،کەئەوەش مژدەیەکی گەورەوگرانەبۆباوەڕداری بازرگانە، چونکە کەسێ لەگەڵ خوا ڕاست نەبێ قەت لەگەڵ خەڵکی خوا ڕاست نابێ وئەگەرشەرم لەخوانەکەیت هەموکارێکت پێ دەکرێ،دوای ئەم پێشەکییە دێمە سەرڕووداوێکی واقیعی سەبارەت بە تێگەیشتنی چەواشەلەدین ودنیا، چەند بازرگانێکی لای خۆمان پێکەوە دەچن بۆولاتی چین بەمەبەستی بازرگانی،دیارەلەوێ کارگەوکۆمپانیای ئەهلی وحکومی هەیە،کارگە حکومیە کان لەبەرپابەندیان بەیاساوە بەرهەمەکانیان چاکترە،بەلام کارگە ئەهلیەکان بەو شێوە یەنین،لەو ولاتە بینیان کۆمەڵەشتێکی زۆر لەناودەبەن لەبەر ئەوەی بە سەرچوبون ،ئەمانیش دەڵێن مەیان سوتێنن بەنرخێکی ڕەمزی دەیکرن، پاشان کۆمپانیا چینیەکە پێیان دەڵێن: مادام ئەوچاکەتان لەگەڵ ئێمەدا کرد بەیانی لای ئێمە میوانن و بەچکەبەرازی ناسکمان لایە پێکەوەدەیخۆین،

ئەمانیش دەڵێن: ئێمەموسڵمانین و ئەوەبۆ ئێمەحەرامـە لـەوانیش دەڵـێن سـەیرە ئەوشـتەی دەیبەنەوە بەحەرامی نازانن بەلاّم لەخواردنی ئـەوەخۆدەپارێزن، لەکاتێکـدا خـواردنی بـەراز زیانی تەنها بەخۆی دەگەیەنێ بەلاّم هێنـانی کـەل وپـەلی بەسەرچـوو تـەزویر وعـادی زیـان لەبەرژەوەندی نەتەوەیەك دەدات، ئەوە رێك ئەوپەندەی بەسـەردا دەچەسپێت کـە پێـشینان وتویانـە :(گۆشـتی دەخـوات بـەلاّم گۆشـتاوێ نـاخوات)، بـۆ موسـڵمان وکردەوەسـەنگی مەحەکە، ئەوەتا ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەکاریگـەری ودەسـتپاکی بازرگانەکانیـەوە کـ

خۆی گەیشتە ولاّتی هیندستان ئەینا سوپای ئیسلام نەگەیشتە ئەوولاّتـە لەدەبێ ئەوراسـتیە بزانی کەقیامەت بەرهەمی دونیایە وچی بچێنی ئەوە ئەدوریتەوە وهەموو کـەس بارمتـەی کردەوەکـانی خۆیـەتی لـەرۆژی دوایدا،وەلـەرۆژی قیامـەتا هەموشـتێ یـەك پرسـیاری لێدەکرێ،بـەلاّم دووپرسیارلەسەروەتوسـامان دەکرێ،لـەکوێت پەیـدا کردولەچـیت سـەرف کرد؟بۆیـە پێویـستەلەسەردوکانداروکاسبکاران وبازرگانـانی موسـڵمان دورکەونەوەلـە گرانفرۆشی وحەرام وسنورەکانی خوا نەشکێنن،چونکە ئیسلامەتی ئیمانداری لەشین وشـایی وکـڕین وفرۆشـتن و تەماعدادەردەکـەوێ، ئـەینا کـەموکورتی لەبیروباوەڕەکەیدایـەتی و موسڵمانێکی ڕوکەشە وئیسلام لەو کەسە بەرییەولەکارەکەیدا خودی خـۆی بەرپرسیارەنەك ئاین .

# ئیسلام عیلم وعەقڵ وپێشکەوتنە:

یەکێکی ترلەقسەکانی سەردەم ئەوکاتەهەندێ لەبێئاگاونەیاران دینەکە یان بەوە تۆمەتباردەکردکەگوایەدواکەتن وکۆنەپەرستیەلوەك وتراوەمێژوخۆی دوبارەدەکاتەوە هەمان قسەی بیبڕوایانی سەردەمی پێشین دەڵێنەوەکەدەیانگوت (اساطیرالاولین..) ئاینی ئیسلام هێڵەگشتیەکانی بۆدیاری کردوین وبواری زۆری هێشتۆتەوە بۆپرس و ڕای لۆژیکی و هەڵهێنجانی یاساکان بەپێی پێداویستی ڕۆژگاروهەرگیزلەگەڵ دۆگما بون وچەق بەستن دا نەبووە،ئەگەرسەیری دەیان ئایەت بکەین سەبارەت بەگرنگی و گەورەیی دروست کراوەکان لەکۆتایی ئایەتەکاندادەفەرموێ:﴿لعلكم تتفكرون، لعلكم تعقلون،عبرةً لاولِي الالباب کەمەبەست لەسەرجەمیان پەندوئامۆژگاری و تێڕامان و بیرکردنەوەوبەگەڕخستنی ژیری مرۆڤەکانە ومیراتی پێشەواکەشمان دیناورودرهەم و کۆشك وتەلارنەبووە بەڵکو زانست وزانیاری بووەکە هۆی سەرەکی پێشکەوتنە،وەبە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەندێ لە ئایەتەکان ئاماژە یانکردوە بۆگەڕان بەناوبۆشایی ئاسمانداو،بۆنەوت وفڕۆکەوسەیارەوکۆپیکردن(استنساخ)وسەرجەم پێشکەوتنەکانی سەردەمیان لێ دەخوێندرێتەوە،ئەوەندەبەسەکەیەکەم فەرمانی پەیامی ئیسلامی (اقرأ)بووە،ئەفەرمانکردنەبەخوێندن وزانیاری ودەیان ئایەت وفەرمودەکەهاندەرمانن بۆزانست وزانیاری ووشەی عیلم زیاتر(٣٤٥)جارلەقورئاندا دوبارەبۆتەوەبەلاّم ئەگەر کاریان پێنەکەین ولێیان بێئاگا بین سودی ئەوتۆی نابێ بۆمان وەك وتراوە(قەدری زێڕلای زەڕەنگەرە)ئێمەلێرە قورئان بۆمردوەکان دەخوێنین کەبۆزیندوەکان هاتوە! ڕۆژ ئاواییەکان بەعەقڵێکی مەعریفی سەیری دینەکەمان دەکەن بۆیەلەهەرولاتێ ڕوبەری ئازادی فراوانتربێ ئیسلام تیایدازیاترگەشەیکردوە وبلاّوبۆتەوە،لەهەرشوێنێ گرنگی بدرێ بەزانستوزانیاری ئەوەلەوشوێنەخەڵکی زیاتربەرەوئیسلام دێن چونکەمرۆڤەکان وێڵن بەدوای ڕاستیداومرۆڤیش بەبێ ئاین ناژی،وەك ئەنیشتاین دەڵێت:

(الانسان بلا دين كسفينة بلاملاح)واته:مرۆڤی بێدین وەك كەشتیەكی بێ كەشتیەوانە، بۆیەخەڵكانێك لە ئەوروپاونەمریكالەلوتكەی زانستەوە موسڵمان دەبن وەك كەشتیەوانی ئاسمانی ئەمریكی ئارمسترۆنگ كەلە ساڵی(٩٦٩)بەهۆی ئەوەی لەسەر مانگ گوێی لەبانگ بووە! وزانای مەجەری(جرمانۆس)كەهەشت زمانی زانیوەو (١٥٠)كتێبی نوسیوە! وەهەروەهادەیانی وەك(دیمیتری بۆلیاكۆڤ)كەدكتۆرای هەبولە فیزیا لەئۆكرانیاوە خاتوونی دكتۆرە(كاملاس داس)خاوەنی خەلاتی نۆبڵ،وەخاتوون (یۆڤۆن ریدیلی)،تەنانەت(مایكل ۆلف)لەرۆژنامەی(میدیامۆنا تۆریس)لە٢٠٠١ بابەتێكی نوسیوەبەناونیشانی(islam the next amrkan relegon)واتە:ئیسلام ئاینی داهاتوی ئەمریكایە،وەرۆژنامەی(sandey times)ی بەریتانی لە ٢٢/٤/ ٢٠٠٤نوسیویەتی كە زیاتر لە(١٤)هەزارسپی پێستی بەریتانی موسڵمان بوون بە هۆی بێزاری و نائومێدیان لەبەهایرۆژئاواییەكان كەلەناونەواندا كەسایەتی ئاوداری (جۆناسان بێرت)ی تێدایەكەكوڕی(لۆردبێرتی)بەڕێوبەری پێشوی(B.B.C) سەیرو سەمەرە یەكەتازەدەیانەوێ بەری خۆربەبێژنگ بگرن ولێرەولەوێ دینەكەمان بەكۆنەپەرست ودواكەوتووتۆمەتباربكەن!ئەگەرمەبەست لەكۆن بوون زەمەن وكات بێت؟ ئەوائاینی مەسیحی وجولەكە ومێژووی دیموكراسی زۆرلەپێشتروكۆنترن لەئیسلام و ئیسلام تازەیە لەچاونەواندا،خۆئەگەربێزاربوون بێت لەشتەكۆنەكان بۆئەوەی بەكاریان نەهێنین ئەواناووهەوا وخۆرومانگ وسەرجەم دروستكراوەكان كۆنن،ئەگەرمەبەست لەپێشكەوتنیش ڕوتی ئافرەتان وخیانەت ودرۆودوڕوی ومەی خواردنەوەودامێن پیسی وئەوڕەفتارەخراپەنا بێت ئەوەمێژووی ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی نەفامی پێش ئیسلام،كەواتە ئەوانە پاشكەوتوی بەناو پێشكەوتون! لەڕاستیدا پێشكەوتوو كەسێكەخاوەن ئەقڵێكی بەرهەم هێن وبەكرداروگوفتاری شایستەوجوانی سودبەخش بێت بۆمرۆڤایەتی ئەوەش تەنها لەموسڵمانی ڕاستەقینەدا بەرجەستە دەبێت، وەلە

حوكمی ئیسلامیش داكاتێ فەرمان ڕەوایی بەدەست بێت،وەك شارستانێتی ئیسلامی لەڕابردوداشایەتی ئەم ڕاستییەیە، پێشكەو تنیش بەدروشم ودیكۆرنابێت، ئێستا گەلێك پێشكەوتوی پاشكەوتومان هەیەبەلاّم نازانن كەنازانن .

## مجەوربانگدەری حكومی یان ئەهلی كامیان دلّسۆزترە بۆمزگەوت؟

مەبەست لەمجەوركارگوزاری مزگەوتەكانەلەگەلّ بانگدەروەك ستافی مزگەوت نزیكترین كەسن لەمامۆستای مزگەوت،بەهەمویان كاروبارەكە ڕادەپەڕێنن،مامۆستایش بەرپرسی یەكەمی ئەوكارەیە،بەلاّم بەداخەوە وەك تێبینی كراوەزۆربەی ئەوبانگدەروكارگوزارەی كە بەفەرمی دامەزراون لە ئەوقاف دلّسۆزی ولێبڕاویان كەمترە لەوانەی كەئەهلین ولەسەر ئەركی خەلّكی مزگەوت دیاریكراون! كەدەبوایە پێچەوانەبوایە (هەرچەندەئێستا زۆربەیان بەفەرمی دامەزراون)،موچە خۆرەكە بەكاروفەرمانی سەرەكی خۆی بزانیایە وەك ئەمانەتی دوارۆژ ودونیایە،پاشان بەحوكمی كارەكەیان دەبوایە بەئاگا تربونایەلەكاروباری دینەكەیان لەچوارچێوەی كاری خۆیاندا تاكوبەهۆ یەوە دلّسۆزی وئارامی ولەسەرخۆییان زیاتربوایە بەرانبەر نوێژخوێنان وگوێڕا یەلّی زیاتریان بۆمامۆستاكەیان بوایە،بەلاّم بەداخەوە بەهۆی لەیەك نەگەیشتن یان كەمی وشیاری ئایینی هەندێ جاردەبنە مایەی گرفت وكێشە بۆ مامۆستاو خەلّكیش گلەییان لێدەكەن وبەنمونەدەلّێن:(تورەن..منالّ دەردەكەن،زوو دەرگا ناكەنەوە..یان زوو دایدەخەن یان دەوام ناكەن...هتد)یان هەندێكیان بەحوكمی مەنسوبیەت ومەحزوبیەت دامەزراون بەلاّم لەبارێكی تەندروستی ناتەواودان ویان كەم ئەندامن! مزگەوتیش مەلّبەندێكی گشتیەوكەسانی گونجاو وبەتوانای پێویستەبۆیە سەرەنجام دەبنەگرفت وسەرئێشە بۆمەلاومزگەوت! وە هەندێكیشیان كەسێكیان بەپارەیەكی كەم بەكرێ گرتووەوبۆخۆی ئیشی تردەكات!وەهەندێ جاربانگدەركەپێشنوێژی دەكات ومەلای زانایشی بەدواوەیەو فەرموی ناكات!جگەلەوەی كەهەندێ لەبانگدەران بانگە كەیان ڕەوان و

سوننەتی نیەبەپێی عادەت وچاولێکەری ئەوشوێنەبەئارەزوی نەزانی خۆی دەبیێژێ !لەجیاتی گەڕانەوەبۆبانگەڕەسەنە شەرعیەکەی بیلال،هۆی سەرەکی سەرجەم ئەوگرفتانەش دەگەڕێتەوە بۆنەبونی لێپرسینەوەو بەدواداچون،تەنانەت مەلای مزگەوت توانای لێ پرسینەوەی مجەورەکەی نەدراوەتێ،وەك لەقوتابخانەکان بەڕێوەبەرلەکارگوزارو مامۆستاکان دەپرسێتەوە(هەرچەند فەرمانێکی لەو شێوە دەرچوبەلاّم هەرمەرەکەبی سەرکاغەزبوو) تەنانەت هەندێ جاربەپێودانگی حیزبی بانگدەریان کارگوزار چاودێری مامۆستایەلیان وەك بەگوێی ناکات! دژایەتی دەکات!بەلاّم ئەو گرفت وکێشانە لەمجەورو بانگدەری ئەهلیدا نابینرێ وزۆردڵسۆزولێبڕاوترەلە کار گوزاری فەرمی!کە موچەی ئەوقاف بێ منەتریشە، هاو کات هەموو ئەوڕاستیە دەزانین کەخزمەتکردنی مزگەوت چەندە خێروپاداشتی زۆرە بۆدنیاو قیامەت،کە لەدنیادا بەهۆیەوە وابەستەی مزگەوتەوسەرەنجامیشی لەدوارۆژدا بەگوێرەی نیەتە کەی ڕەزامەندی خوایە(ام محجن)ئافرەتێك بولەسەردەمی پێغەمبەرداص بەهۆی خزمەتکردنی مزگەوت چووە بەهەشت،بەلاّم ئێستابەپارەش هەرخۆیان دەدزنەوەو تەنانەت بەلای هەندێکیانەوە شەرمەپێیان بوترێ مجەور!کەلەخزمەت ئیسلام دایە، بەلاّم شانازی دەکات کەپێی بڵێن فەڕاشی مەکتەب کەدینی کەمتر تێدایە!بەکورتی وبەکوردی سەر چاوەی هەمووخێروچاکەودانایەك لە خواترسانە (راس الحكمة مخافة الله)، وەبنەمای هەموو خیانەت وگەندەڵیەك شەرم نەکردنە لەخوا(اذالم تستح فاصنع ماشئت) وەك دەبینین لەدونیای ماددە گەرایی(ماتریالیستی)داخیانەت هەموشوێنێکی گرتۆتەوە.

نوکتە: لەسلێمانی مزگەوتی شەفیق بەگ،مجەورێکم هەبومام عبداللە پیاوێکی زۆردڵسۆزوچاك بوو،بەلاّم خۆشی لەمنداڵ نەدەهات وزوولێیان توڕەدەبو،ڕۆژێ وتم: مام عەولاّ لەگەڵیان لەسەرخۆبە ئەوانە پیاوی دوارۆژن، ئەویش وتی:مـن لەپیاوی ئەمرۆ بێزارم حاشالەهی دوارۆژ!.

# ستراتیژو فەلسەفەی کـۆچ

## پەندلە وانەکانی دوێنیێ بـۆ جوانیەکانی ئەمڕۆ...

هییجرەت وکـۆچ: لەنزمیەوەبۆبـەرزی ..لەخراپەوەبۆچـاك..لەچاکەوەبۆچـاکتر کـۆچ ڕێبـازی پێغەمبەرانە..دروشـمی بڕوادارانە،سـەرەتای هەمووسـاڵێکی کۆچـی یـادی هیجرەتەوسـەری ساڵی موسڵمانانە،هیجرت بەمانا تایبەتیەکەی(لاهجرة بعد الفتح)بـەلآم بەماناگشتیەکە (لکن جهادونیـة)بانێمەش کۆچ بکەین لەخراپەوەبۆچاکە،هیجرت گەورەترین وناخۆشـترین و بەئازارترین ڕوداوی پێغەمبەرمان بو،بۆیەپێشەواعومەرکردی بەسەرەتای مێژوی ئیسلامی کەبووبەسـەرەتای گـەورەترین سـەرکەوتن کەلەبەرهـەمی ئـەودا مافـە کـانی بۆسـەرجەم مرۆڤەکان گەڕاندەوەلەڕێگەی خۆشەویستی وخزمەت کردن وپەیمانی پێکەوەژیان وتاخـاوەنی مێژووی ئیسلامی خۆمان بین.

**ئەوپەندانەی کەلەهیجرەت وەردەگیرێ:**

١ــ گەرئیـسلام بکەینەدووبەشـی (عقیـده وتـشریع) ئـەوا بەشـی دەوڵـەت داری وتەشـریع لەکۆچەوە دەست پێدەکات

٢ــ سەرچاوەی تیرۆرو تۆقاندن بێبڕواکانن نەك ئیسلام

٣ــ دڵسۆزی سەرکردە بۆهاوەڵانی کەهەموویانی بەڕێکرد پاشان خۆی.

٤ــ دڵسۆزی هاوەڵان بۆپێشەواکەیان لەشوێن کەوتن وپارێزگاری لێکردنی

٥ــ دانانی پێشەوا عەلی بۆپاراستنی ئەمانەتی دوژمنەکانی لەوکاتە ناهەموارەدا

٦ــ نەخشەی وردی سەربازی لەدیاریکردنی ئەشکەوتەکەوسڕینەوەی شوێن پێکانیان بەهۆی ڕانەمەڕەکەی ابوبکرەوە

٧ــ کـۆچ گـۆڕینی زەمینەوجێگەوڕێگـەبوو بۆئامادەباشـی وڕووبەڕوبونەوەنـەك ڕاکـردن، کەبویەخاڵی وەرچەرخان وسەلماندی ئەوەکەئیسلام ئیدارەوئیرادەیەوئـەم دینـە بۆبـەڕێوەبردنی ژینە.

لەکارەسەرەکیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆدامەزراندنی بنەماکانی دەوڵەتی ئیسلامی :

ئامادەکردنی کەسانێك کەشایستەی ئەوەبن ببنەکاربەدەستی ئەودەوڵەتە لەڕووی:

- بیروباوەڕی چاك وپاك .......ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت
- خوڕەوشتی جوان ........ اکمل المؤمنین ایماناً احسنهم اخلاقاً
- ڕاستی وڕاستگۆی ...ان الصدق یهدی الی البروان البریهدی الی الجنة
- دوری لەغەش وفێڵ وخیانەت.....من غشنا فلیس منا
- دڵسۆزی بۆمیللەت ...پیاوی وەك پێشەوا عوسمانی پێگەیاند کەلەساڵی گرانیدا(١٠٠) بار حوشتری بەخشی،بەکردەوەبونە خزمەتکاری گەل ونەتەوەو کۆشك وتەلاریان جێنە هێشت
- دروست کردنی مزگەوت وبرایەتی لەنێوان مهاجرونەنصارو پاشان ئەوس وخەزرەج،واتە ئیسلام ئاینی برایەتی وپێکەوەژیانە.

## عاشورا لەدیدی شیعەوسوننەدا:

مرۆی ژێردەبێ لەبەرانبەرڕوداوەگەورەکان هەڵوێستەبکات و وپەندیان لێوەربگرێت،نەك تەنهاگێرانەوەی چیرۆکێك وکات بەسەربردن بێت،(١٠)ی محرەمی هەموساڵێ بەعاشورایە

* لای سوننەکان: دەگەڕێتەوەبۆسەردەمی پێش ئیسلام ورۆژی ڕزگاربونی حەزرەتی موسایە لەدەست فیرعەون،وەك لەفەرمودەی پێشەواماندا هاتووەکاتێ خۆشەویستمان کۆچی کرد بۆمەدینە بینی جولەکەکان لەورۆژەدابەڕۆژوبون،پرسیاری کرد لەهۆی ئەو ڕۆژووە،ئەوانیش وتیان:ئەوەڕۆژی ڕزگاربونی حەزرەتی موسایەوخنکانی فیرعەونەلەڕوباری نیلدا، حەزرەتیش فەرموی: ئێمە لەپێشترین لەئێوەبۆموسا ،ئەوەبوکەبەڕۆژوبو،پاشان فەرموی ساڵکی تر(٩و١٠)ی دەگرین بۆئەوەی لەهی ئەوان نەچێت،ئەودورۆژەبۆمان بو بەسوننەت کەتیایدابەڕۆژوبین،ئەوەکورتەی چیرۆکی فەرمودەکەبو بەکورتی.

* لای شیعەکان : یادی شەهیدکرانی حەزرەتی حوسێنە،بەلاّم ئایاید کردنە وەبەوشێوەیە دروستە،کە لەخۆدان ویەخەدارنین دروست نیەوپێشەواکەمان فەرمویەتی:(لیس منا من ضرب الخدود وشق الجیوب ودعا بدعوی الجاهلیە). گەرسەرنج بدەین لەڕوداوەکە پەندوئامۆژگاری زۆری تێدایەوبۆمان دەردەکە وێت کە ئەم ڕۆژە:

١) ڕۆژی ڕزگاربونە،چونکە خوای گەورەبڕواداران‌ی تیا ڕزگار کردوستەم کارانی لەناوبرد...

٢) ڕۆژی جیهادوتێکۆشانە،شەهیدبوونی امام حوسێن لەکەربەلا ساڵی(٦١) کۆچی بەخۆی وحەفتاودووکەس لەلایەن سوپای (عبداللەی کوری زیاد) بە پیلانی ناحەزان کەژمارەی سوپاکە (٤٠٠٠) کەس بوو بەرانبەر حەفتاو دووکەس لەخێزان وبنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێ شەڕی غەدرو خیانەت وستەم لەعێراق سەری هەڵداوە خوێنی ناڕەوای تیارژاوە بۆیە تائێستاش ستەم هەربەردەوامە، ئەوحوسێنەی کەخۆشەویستمان لە بارەیانەوە فەرموویەتی: (الحسن والحسین سیدا الشباب الجنة)،لەوکاتەدا حوکمی خەلافەی ڕاشیدە نەمابوو، (٣٠) ساڵەکەتەواوببوو سیستمی پاشایەتی بوو چونکە مەعاوییە ووتویەتی من یەکەم پاشای عەرەبم ئەوەش لەسەرەتای شەستەکان بووە، بۆیەدەبێ لەورۆژەدا بەخۆماندا بچینەوەوبزانین تاچەند خۆشەویستی ڕاستە قینەمان هەیە بۆ(ئال وبەیت) وئایا بەکردەوە ڕێبازی ئەوانمان گرتوە؟ کە تێکۆشان بوەلەپێناوی ڕاستیدا، تاچەنددژی خیانەت وستەم بوینەوە؟، ئایا خۆشەویستی بەم شێوە دەبێ؟یان ئەبێ خۆشەویستی ساڵی ڕۆژێك بێ؟ کە بێگومان خۆشەوستی ڕاستەقینە پابەندبونە بەپەیام وڕێبازەکەیان کە قورئان وسوننەتە،بەکرداروگوفتارنەك بەهات وهاوار...!

# هەندێ لەماناومەبەستەکانی حەج

حەج یەکێکە لەپایە گرنگەکانی ئیسلام کەخوای گەورە لەتەمەندایەکجار پێویستی کردوە لەسەرکەسێ توانای هەبێ،بێگومان گشت فەرمانەکانی خودابۆبەرژەوەندی دنیاودوارۆژی ئێمەیە،حەجیش یەکێکە لەوفەرمانانەی کەماناومەبەستی زۆری لێ دەخوێندرێتەوەو کەسانی ژیرهەستی پێدەکەوەك:

**لەسەرئاستی تاك/** فێرگەیەکی پەروەردەیی ئیمانیە، سەفەرێکی مێژوییە بۆپیرۆزترین شوێن کەماڵە گەورەکەی خوایەلەمەککەی پیرۆز، لەکاتێکی پیرۆز داکەدەرۆژی سەرەتای مانگی حەجەولەبەرگرنگیان خواسوێندی پێخواردون (**ولیالِ عشر**)تێدافێری دڵسۆزی و یەکتاپەرستی دەبێن کەباشترینەدەستمایەن.

**لەسەرئاستی کۆمەڵگەی موسڵمان/**

١) کۆنگرەیەکی گشتی ساڵانەی بێ وێنەیە،ئیسلام بەردەوام جەخت لەسەر یەکرێزی و کۆبونەوەدەکات،بۆیەلەکۆبونەوەی نوێژەکانی ناومزگەوت رۆژانە موسڵمانانی گەرەك بەیەك دەگەن،لەکۆبونەوەی موسوڵمانانی شارهەفتانە لەنوێژی هەینی دابەیەکدەگەن وکۆبونەوەی ساڵانەیش لە حەجدایە.

٢) بەرجەستەکردنی برایەکی ئیمانی بەکردەوە،لەوشوێنەکەهیچ شیتێکی دنیایی وەك زمان ورەنگ وسنورنابنەبەربەست وسەرجەم جیاوازیەکان وەلانەنرێن!

٣) کۆچکردنی موسڵمانان لەدورونزیکەوەبۆ مەککەی سەرچاوەی ئاینەکەیان نیشانەی یەکتاپەرستی ودڵسۆزی وتازەکردنەوەی پەیمانی خواپەرستیە.

٤) یەکسانی راستەقینەتەنهالەوشوێنەدەبینرێ،کەدەوڵەمەندوهەژار..رەش وسپی.. وەزیروگزیر.. هەموویەك بەرگی سپی بێ باخەڵیان لەبەردایە،یەك دروشم دەڵێنەوە (لبیك اللهم لبیك...)

٥) حەجکردن قیامەتی بچوکە،دیمەنەکانی مەیدانی حەشروحیسابمان دێننەوەبەرچاو،بەرگی کفنی لەبەردایەوبێ ماڵ وحاڵەوکۆچەریە،ڕاهێنانە ئامادەباشیەبۆدوارۆژ،بۆیەجێگەی سەرنج وتێڕامانە کە خوای گەورەلە سەرەتای سورەی حەجداباسی دیمەنەکانی قیامەتمان بۆدەکات.

٦) شوێنکەوتن ویادکردنەوەی پێشینانی خۆمانە،لەتەوافی بەیتدایادی حەزرەتی(اسماعیل و ابراهیم) دەکەیتەوە کەدروستیانکردوە، لەسەفاومەروە شوێنکەوتنی ڕاکردنەکەی هاجەرەخاتونی دایکمانە،لەڕەجمدایادی هەڵوێستە بوێرانەکەی حەزرەتی ئیبراهیمەدژبەشەیتان کەویستی پەشیمانی بکاتەوەلە سەربڕینی کوڕەکەی،کەدەبێ موسڵمانیش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوابێت.

٧) حەج ڕاهێنانی دەرونەبۆخۆبەکەمگرتن ولێبوردن ومالبەخشین وڕاهێنانی جەستەولاشەیشە لەسەرخۆڕاگری وئارامگرتن بەرانبەرناخۆشیەکانی ژیان،چون سەفەرناخۆشی تێدایە، سەرەنجامەکەی:

* لەدایك بونێکی تازەیەوەك منالْ پاك دەبێتەوەلەتاوان(رَجع کیومِ ولدتهُ امهُ)
* حەجی چاك وپاك پاداشتەکەی بەهەشتە(الحج المبرورليس له الجزاء الا الجَنة)

لەکۆتایدا خوالێتانی وەربگرێت وبەنسیب هەمومانیشی بکات

(حَجاًمبرور وسعياًمشكور وذنباً مَغفور)

## حەج بەگەنجی یان بەپیری؟

حەج کەپایەی پێنجەمی ئیسلامەولەتەمەندایەك جارپێویستکراوەبۆکەسانێ توانایان ببێ، لێرەو لەوێ دەبیستین خەڵکانێك دەڵێن: تاپیرنەبین ناچین بۆحەج،حەج بۆتەمەنی پیری چاکەوبەگەنجی پێمان ڕاناگیرێلەوبیرۆکەیە هەڵەیەوپلانێکی گوماناویەولەگەڵ حیکمەت وفەلسەفەی حەج پێچەوانە یەو دروستکراوەبۆدورخستنەوەی گەنجەکان لەبنەمایەکی دینەکەیان ودابڕیان کەن لەجیهانی ئیسلامی وبێبەشیان کەن لەخێرو بێرە کانی ئەو کۆنگرە گەورەیەی موسڵمانان،گەرخوا بۆت بکات بەگەنجی حەج بکەی،چونکە تواناودانایی

گـەنج زیاترفەلـسەفەی حـەج دەخوێنێتەوەولـە مەبەسـتەکانی دەگـات وەك‌نیـەکریزی ویەکپارچەیی وبرایەتی ویەکترناسینی موسڵمانان وبینینی دیمەنەکانی قیامەت وبیرکردنـەوە لە سەردەمی دابەزینی وەحی وئەرك وخەباتی هاوەڵاّن لەپێناوی بانگەوازەکە یانداو،پاشـان بیرکردنەوە لە بـەڵێن ودەسەلاّتی خـودا وەلەسـەردەمی مەککـەی ئەوسـای وشـکی بێنـاوو مەککـەی ئێـستای پێـشکەوتوی قـەرەباڵغ کەجێگـەی سـەرنجی کەسـانی ژیـرە، دیارەئـەو سەفەرەماندوبونیشی تێدایەلەکۆچ وبارلەنێوان وتێل وخێوەتگاکاندا لەناو ئاپۆرەی ملیـۆنی حاجیاندا ،لە هەموونەمانەداهێزوتوانای گەنجانە پێویستە لە یارمەتی دانی نـەخۆش وپـیرو پەککەو تەکان،ئەمانە هەموی لە توانای حاجی گەنج دایەوچێژی ئیمانی لێوەر دەگرێ،وەك وتراوە(هەمووشت لەگەنج جوانە)،بەلاّم حەج بـەپیری مایـەی ناچاریەدەبێتەباربەسـەرئەوانی ترەوەوخۆیشی لەبەربێهێزی ونەخۆشی چێژی ئـەوتۆ لـەو سـەفەرەگەورەوگرنگەنابینێ،وێنەی ئەوانــە وەك ئەوکەسـەیەکە ڕەزیلـی دەکـات وسـەروەت سـامان کۆدەکاتـەوە بـۆ ڕۆژی تەنگانــەوپێش ئــەوەی هــیچ تەنگانەیــەك بێتــە ڕێــی بمـرێ ومالّەکــەی لــە دەســت بـچێ،ڕەنگدانەوەی ئەوبۆچـونە هەڵەیەبووکـەجاران ئەگەریـەکێ بـە گـەنجی بـچوایە بۆحـەج بەلایانەوە سەیربوو لێیان دەگوت خۆت پیرکردلیان جارێ گـەنج بـوی!کـاتی حـەجت نـەبو! ئەوەی کەبەپیری دەچێ فەرزەکەی بەجێ دێنێ بەلاّم سودمەندنابێ لەحیکمەت وفەلـسەفەی حەج وتێ ناگاو سەرەنجام هیچ گۆڕانکاری بەسەر ڕەوشتەکانی دانایەت بەرەو چاکە وهەندێ جاردەبنــە نمونــەی خــراپ وخــەتای حــەجیش دەگـرن!(لێـرەدا مەبەسـتمان ئـەو پـیرە نیەکــە(معــضوب)ە،بۆیــە هــەوڵ بــدەین بەگــەنجی بــچین تــاپیلانی نــەیاران پوچــەڵ بکەینـەوەوهاوکاری پـیرو پەککەوتـەکانیش بکـەین وماناومەبەستەکانیـشی بزانین وخێـری زۆرکۆبکەینەوە بۆدنیاو دوا ڕۆژو ببینەگەنجی خواویست وتەوبەکار.

# حاجیانی کوردزمانن بە جلی کوردیەوە جوانن..

عەلمانیەکانی لای خۆمان دەڵێن:بادین تێکەڵ بەسیاسەت نەکرێت،کەچی ساڵانەهەزاران حاجی بەئالآی کوردستانەوەڕەوانەی کەعبە دەکەن!ڕێك وەك گۆشت وگۆشتاوەکەیە لوێڕای پیرۆزبایی سەفەری حەج وسەلامەتی بۆهەموان لەڕێنماییەکانی ساڵانەکەبۆحاجیان دوبارە دەکرێتەوەپێیان دەڵێن:ئێوەلەو ولآتە نوێنەری کوردن بۆناساندنی ناسنامەی نەتەوەکەمان لەجیهانی ئیسلامیدا بەجلی کوردیەوەبگەڕێن وئالآی کوردستان بەرزبکەنەوە،دیارەکە ئەوە مافێکی شەرعی وئاسایی ویاسایی هەمووگەل نەتەوەیەکە،ئێمەش شانازی دەکەین بە کەڵچەروڕەسەنایەتی باوباپیرانمان،کوردایەتی ڕەسەن وڕاستەقینەبەبەشێك لەدینداریمان دەزانین،هەرچەندەئەوەی دەچێت بۆئەوشوێنەبۆئەنجامدانی بنەمایە کی ئیسلام دەچێت کە پێویست کراوەلەسەری ولەومیانەشدا کۆمەڵێ حیکمەت وفەلسەفەی تری تێدا دێتە جیّ لەوانە یەك ڕیزی ویەکترناسینی گەلانی موسڵمان،ئەوەی لێرەدا مەبەستی تەوەرەکەیە ئەوانەی کەڕێنماییەکە دەدەنە حاجیان بەپۆشینی بەرگی کوردی خۆیان نایکەنەبەر نەلێرەو نەلەویّ ! هاوکات لە کوردستان بەرگی کوردی بەرەو نەمانەو بەدواکەوتنی دەزانن! بەهۆی حوکمی واقیع کەلەکاریگەری سلبی میدیاو سەرانی ولآتەکەمانا ڕەنگی داوەتەوە! زۆرینەی سەرکردەکان و پەرلەمان و میدیاکانمان بەلایانەوە شەرمەودواکەوتنە بەرگی کوردی!جەماوەریش ناچار بوەکە بەرگی بێگانە لەبەربکات،وەك وتراوە:(گەورەناویّ دەڕێژیّ گچکەپێی لێدەخشێنیّ) هەرچەندە کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە بەلآم بەرگی کوردی زۆرجوانترە لەجل وبەرگی سەرۆکانی هیندستان و ئەفغان ولیبیاوعەرەب و ئەفریقا،ئەوان بەشانازیەوەلەبەری دەکەن بەلآم لای ئێمە بەپێچەوانەوە ! بەناوی جلوبەرگی ستاندەری جیهانی شانازی دەکەین بە جلو بەرگی بێگانەوە!پێشینانیش وتویانە:(کەلەسورت دۆڕاند لەلابای تێهەڵ ناهێنیەوە )کوردایەتیش دەبیّ لەکوردستانە وەتیشك بداتەوە،نەك لە عەرەبستان،چون بەهۆی سیاسەتی زلهێزەکانەوە کە دابەشیان کردوین و هەرگیز ڕێگەنادەن ببین بەدەوڵەت ،لەسعودیەش هەرلەژێرخێمەی بەناو برا عەرەبەکانداین وهاوڵآتی عێراقی، ناوەکەمان لەسەرچاوەولێڵەلەخواریّ پاك نابێتەوە.

# جل وبەرگی کوردی تەنها لە بۆنەکاندا...!

ئێمەی کورد وەك سەرجەم گەل ونەتەوەکانی جیهان،خاوەنی نەریت و کەلتوری تایبەت بەخۆمانین کە لەباوك وباپیرانەوەوەك ناسنامەیەکی نەتەوایەتی بۆمان جێماوە،جیامان دەکاتەوەلەگەلانی تر،دوای ئەوەی دەرومان لێکرایەوەورزگاربووین،چاوەڕێ بووین بەرهەمی ڕاستەقینەی خەبات و ڕاپەڕینمان بچنینەوەوئەندازەی دڵسۆزیمان بۆگەل ونیشتیمانمان بزانرێ، جێگەی داخەئێستا چەمکی کوردایەتی شێوێنراوەوبۆمەبەستی تربەکار دەهێنرێ ودوورلەگیانی نیشتیمان پەروەری، کوردایەتی بۆتەچاولێکەری کوێرانە وبێگانە پەریستی،حیزبایەتیش بۆتەئامانج وهۆکاری بازرگانی! هەر شتێکیش لەڕاڕەوی خۆی ترازا ئەواناسنامەی خۆی لەدەست دەدات ودەبێتە ناوی بێ ناوەڕۆك، تەوەرەی نوسینەکەم لەسەر جل وبەرگی کوردیە کە ناسنامەوشانازیە بۆمان!بەلاّم ئێستابوەتەهێمای دواکەوتوویی!بەجۆرێ گەر خاوەنی بڕوانامەی ماستەربی وجلی کوردیت لەبەربێ وەك نەخوێندەوارێ لەقەلّەم دەدرێی!لەمەلەکاتێکدا هەموگەل ونەتەوەیەك شانازی بەبەرگی خۆیانەوەدەکەن، گەرکەسێکی بیانی سەیری تیڤیەکانی کوردبکات یان پەرلەمانی کوردستان،نازانێ کەئەمە هی کوردە!چونکە دوورن لەمۆرکی نەتەوەیی ولەخزمەتی کەلتووری بێگانەدان!کار گەیشتۆتە ئەوەی کە بەرگی کوردی بەشێوەیەك نامۆ بووە،تەنها لەبۆنەکانی وەك نەورۆزوراپەڕیندا دێتەوەبیرمان ولەبەری دەکەین ئەویش بۆسەیرانوونێنەگرتن یان بۆگەرم کردنی پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندنەکان،جاکوردایەتیەك خالّی بێت لەڕەسەنایە تی کوردی ناوی چی لێ ئەنرێ جگە لە بێگانەپەرستی کە ئەوانیش هیچیان بۆنەکردین،پێشینانمان گوتوویانە:(ڕێوی لە کونی خۆی هەلّگەڕێتەوەگەڕ دەبێ)کاتی خۆی لەژمارە(٧٩٩)ی ڕۆژنامەی یەکگرتولەوبارەوەبابەتێکم نوسیبوبەناونیشانی(نوێنەری کوردلەبەغداجلی کوردی لەبەرناکا!) کەدەبوبەهەموشێوەیەك نوێنەری کوردبونایە، بەوئومێدەی کەچاو بە خۆماندابگێڕینەوە

# سەردانی مۆزەخانە بۆپەندو تێرامانە

وەك بیرەوەریـــەك بـــەیادی جـــاران چـــوم بۆســـەردانی مۆزەخانـــەی ئەمنەســـورەكە لەسلێمانی،دیارەكە خزمـــەتی بەرچـاوی تیاكراوەومەســرەفی زۆری لێكـراوە، دیمەنـەكانی سـەرنج ڕاكێـشن،بەتایبەت شـوێنەواری سـتەمی بەعـسی عـەلمانی كەجێگـەی پەنـدو ئامۆژگـاری وتێڕامانـەو بۆهەمووانـە بەتایبـەت بۆدەسـەڵاتی دوای ئەوانـە،وەئاشنابونیـشە بۆنـەوەی داهاتووتـا بـزانن كەئـەم شۆڕشـەبەم هـەموو زەحمەتـە هاتۆتەبەرورەسـەنایەتی وكەلتووری كوردیـشی تێـدا نیـشان دراوە،بـەڵام ئـەوەی سـەرەنجی منـی ڕاكێـشابوولەكاتی گەڕان بەناوژوورەكانیداوبۆی عەوداڵ بووم نـەمبینی هـیچ شـتێك كـە هێمـاو نیـشانە بێـت بۆئـاینی ئـەم میللەتـە،وەك بڵێـی پێـشمەرگە لەمزگـەوتی لادێكانـدا نەحەوابێتـەوە و مامۆستایانی ئایینی پێش ڕاپەڕین شۆڕش وخەباتیان نەكرد بێت لە ڕێگـەی ئیـسلامەوەبۆ گەلی كوردو شەڕی بەعسیان نەكردبێت وكـاتی خـۆی لەمینبـەرە كانەوەخـەڵكیان هـان نـە دابێت بۆشۆڕشگێری ورۆڵی ئەوهەمووئەدیب ونوسەر و سەركردە ئاینیانە بەزمانی حاڵ تیـا پەراوێزخراوە!چونكە مۆزەخانەی هەرنەتەوەیەك لە شارەكە یدابەشێكەلە مێژوورەسـەنایەتی ئەونەتەوە،كەبە داخەوەلەم ڕۆژگارەی حوكمی خۆماڵی وحكومەتی كوردی زۆرگرنگی دراوە بـە كلتورومـۆدێلی بێگانە،ڕەسـەنایەتی وسـەروەریەكانی باووبـاپیران لـەبیركراوە! تەنانـەت ئەوچاو دێرەی كە لەگەڵمان بووبۆچاوساغی ورێنمایی دەیگووت:كـە خـەڵكانی دەرەوە دێـن زۆریەپەرۆشن بەبینینی دیمەنەكانی مۆزەخانە،بەڵام هەندێ لەكار بەدەستانی خۆمـان كـەدێن بەچاوێكی كەم سەیری دەكەن ورۆژگاری جامانە شـڕەوپێڵاوە لاسـتیكەكەیان لـە بیرچـۆتەوە ولەخۆیان بایی بوون!لـە پێناوبەختـە وەری گەلەكـەمان وبۆنـەوەی ئێمـەش مۆزەخانەیـەكی سـپی ورەســەن وپەســەن تۆماربكـەین بۆنـەوەی داهاتومـان پێویـستە پەنـدوئامۆژگاری وەربگرین لەدەسەڵاتەكانی ڕابردومان وەك لەفـەرمودەداهاتوە(السـعیدمن اتعـض بغـیرە )

واتە: بەختەوەرئەوكەسەیەپەندلەخەڵكانی تروەردەگرێ، مێژوش ڕەحم بەكەس ناكات.

# وەفاداری .. لەسەردەمی بێوەفاییدا

وەفاداری وپێزانین وبەئەمەکی ڕەوشتێکی زێدەشیرین وجوان وخۆشە ویستە بەتایبەت لەسەردەمی بێوەفاییدا ،لەبەرانبەرداسپلەیی وبێوەفایی گەلێ ناخۆش ولەسەردلأن گرانە، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا بێ بەندوباری وبێوەفایی گەلێ زۆربووەومتمانەزۆرکەم بووەلە خزمایەتی وکەسایەتی،دەبێ سەرەتا بزانین کەسەرچاوەی بێوەفایی لاوازی ئیمانەیان لە بێ بڕواییەوەسەرچاوە دەگرێ، بۆیەئەوسیفەتەلەهەمووکەس ناشیرینەولەموسڵمان ناشیرینترە، چونکە خەڵکانی دنیایی وبێباوەڕتەنها بیرلەبەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەنەوەوبەناوی سیاسەتی ڕۆژگار،بەلأم موسڵمان دەبێ پابەندبێت بە بیروباوەڕییەوە وسنورەکانی حەلأڵ و حەرام بپارێزێ، هەرئەولادانەیەکەبوەتەهۆی ئەوەی خەڵکانێك تانەوتەشەر لەدینەکەمان بدەن،سەرەتاوبنەمای وەفاداری بیروباوەڕی یەکتاپەرستیەبۆیە دەبێ سەرەتاوەفادارین بەرانبەربەلێنەکانی پەروەردگار،چون کەسێ لەگەڵ خواڕاست نەبێ بێگومان لەگەڵ خەلکی خواڕاست نابێ،دواتر وەفادارین بەرانبەر بەلێنەکانمان لەگەڵ خەڵکی خوا،کوالەکوێن بەلێن ودروشمەکانی کاتی هەڵبژاردن لەکوێن بەلێنەگانی ڕۆژئاوابۆکورد،لەکوێن بەلێنەکانی تری سیاسی ونەتەوەیی،پاشان وەفادارین بەرانبەر خێزانەکانمان کە نزیکترین کەسن بۆمان،وەك پێغەمبەر(ﷺ)دوای مردنی خەدیجەش ڕێزی هاورێکانی دەگرت و خێری بۆدەناردن، جارێکیان زۆرلەگەڵ پیرەژنێ وەستا تاکوعائیشە فەرمووی ئەوەچی بوونەوەندە لەگەڵی وەستای فەرمووی:ئەوە هاورێی خەدیجەبوە! وەفادرین بەرانبەر دایك وباوکمان، تەنانەت دوای مردنیشیان وەك لە فەرمودەی پێشەواکەماندا هاتوە(ان من ابرالبربراصدقاء ابويه) وەهەروەها پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ڕێزی لەحلیمەی سعدییە دەگرت وکە دەهات عەبای خۆی بۆڕادەخست وبەدیاری زۆرەوە دەیناردەوە،وەهەروەها(ابن عمر) لەرێگادەشتە کیەکی بینی ئەوەندەڕێزی گرت لەگوێدرێژەکەی دابەزی، وتیان قوربان ئەوەبۆ؟فەرمووی ئەوەدۆست وخۆشەویستی باوکم بوەکاتی خۆی!کوا وەفاداری بەرانبەرمزگەوتەکان کەڕۆژگارێك شوێنی

حەوانەوەی شۆرش بون وئێستاش بەلایانداناڕۆن،کوانێ وەفای خزمایەتی و کەسایەتی وجیرانەتی و هاڕێیەتی؟!اجابەراستی دینداری لەکرداروگوفتارو مامەڵەی ڕۆژانەدا دەردەکەوێ وبەرجەستە دەبێ وەك وتراوە:(الدین المعاملة)،پێشەوا حەسەنی بەصری فەرمویەتی:موسڵمان وەك هەنگ وایە شتی چاك وپاك دەخوات وکەلەسەرچڵەکە نیشت نایشکێنێ ونایشەمژێنێ و بەروبومیشی شیرینە، جا وەفاداری وخۆشەویستی سیفەتی موسڵمانەوسپڵەیی وبێوەفایی سیفەتی بێبڕوایانە.

# سوکایەتی بە پیرۆزیەکان دژایەتی ئەمنی قەومیە

زۆرینــەی ڕەهــای میللــەتی کوردموســڵمانە،بەدژایەتی پیرۆزیــەکانی نیگەرانــە، بڕوابــوون بەپێغەمبەرانیش بنەمایەکی ئیمانی موسڵمانە،ئێمەهەمووئەوە دەزانین کەدژایـەتی کردنـی پێغەمبەران وشوێنکەوتوانیان پرۆسەیەکی لە مێژینەی بەیەکەوە بەسـتراوە هەرلەئادەمـەوە هەتاخاتەم (سـەلامی خوایـان لەسـەربێت) بەتایبـەت پێغەمبـەری خۆمـان کەتۆمـەتباریان کردبـە شـێت وجادوگـەرو شـاعیر، لەزێـدی خـۆی شـاربەدەریان کردبۆزیاترلەکەدارکردنـی بوختانیان بۆ عائیشەی خێزانـی هەڵبەسـت،بەلاّم مخابن ئـەوەی جێگـەی سەرسـوڕمانە کـە لەسەردەمی بانگەشـەی مـافی مرۆڤـدا لێرەولـەوێ لەهەنـدێ گۆڤـارو ڕۆژنامـەدا دژایـەتی بیروباوەڕی ٩٠./. ی ئەم گەلەموسڵمان دەکرێ وسوکایەتی بە پێغەمبەروپاشان بەمـەلاکان دەکرێ،یـان فڕێـدانی کتێبەئاینیـەکان لەشـوێنە پیسـەکان!لـەژێرناوی ئـازادی سەربەسـتی وداخـەتی سـوردەبەزێنن ومـافی گـەلێك پێشێل دەکەن،وەلەلایـەکی تریـشەوەئێمەی کـورد دنیایەك دوژمنی نەتەوە ییمان هەیە،ئەوانیش وەك دەسـتێکی ڕەش دەیانـەوێ بـەوکارەیان ئارامی کوردستان بشێوێنن وخـەڵکی ناچاری کاردانـەوە بکەن،هەنـدێکیان لەبەرفرۆشـی ڕۆژنامەکـــەیان!یـــان بۆئـــەوەی کەسەکەبناســـرێ وپاشـــان مـــافی پەنابـــەری لـــە دەرەوەوەربگرێ،نمونــەی هەنــدێ لەوانــەوەك پێــشینان وتویانــە: کەچــەڵ بــۆ ئــەوەی نــاوی بێتەناوناوانەوە باسی بکەن کانیـاوی گوندەکـەی پـیس دەکـرد!، لێـرەدا دەپرسـین دژایـەتی کردنی ئیسلام چ خزمەتێ بەگەلی کـورد دەکـات؟ جگەلەدژایـەتی ئـەمنی قـەومی وناچـار کردنـی موسـڵمانان بەکاردانـەوە و سـەرەنجام دروسـتبوونی پـشێوی،مەگەر مەبەسـت پـێ ئەوەبێ سـەرقاڵکردنی خـەڵکی بۆلەبیرچونەوەی پرسەچارەنوسـسازەکان ویـان بۆنەهێـشتنی بـەها بـەرزەکانی گـەل ونەتەوەیە،چـونکە شـوێن کـەوتوانی پێغەمبـەران کەسـانی دەسـت ودامێن پاکن وسەرمەشـقی ئـەدەبیاتی کـوردی ورەوشـتە بـەرزەکانی کۆمـەڵگان وبونەتـە جێگەی متمانەی هاولاّتیان لەڕۆژ گارێکدا کەخیانەت و گەندەڵی کەبەری داری بێ بڕوایـی

ودووڕوییە ولاتی لێوان لێوکردووە، دڵسۆزانی کوردوکوردستان ئەوانەن کەخەم ڕەوێنن نەک خەم ڕوێن، جگە لەوەش دژایەتی کردنی پیرۆزیەکانی ئیسلام سەلماندن وبەڕاست گەڕانی قسەی ئەنفالچیەکانی ڕابردووەوخزمەتێکە بەدوژمنانی کورد کەدەیان گووت کوردلەئیسلام پاشگەزبۆتەوە،ڕۆشنبیرو ڕوناکبیری ڕاستەقینە قەڵەمەکەی لەخزمەت گەلەکەیدایە، بەلاّم ئەم سوکایەتی بەهەموو پێوەرێک نالەبارو ناڕەوایە،وەپێچەوانەی ئاسایشی نەتەوەییە،خزمەتکردنی گەل و نەتەوە وپاراستنی ئەمنی قەومی بەشێکە لە دینداریمان.

## هەڵوێستەیەک لەمەڕ عەشیرەتگەری ...

هۆزوتیرەجیاوازەکان پێکهاتەی کۆمەڵگاکانن کەپێکەوە ژیان دەبەنەسەر،لە کۆمەڵگای خۆماندا عەشیرەتگەری نەریتێکی پەرەپێدراوە،ئیسلامیش لەسنوری خۆیدارێگەی پێداوە،پێشەواکەمان (ﷺ)فەرمویەتی:(خیرکم المدافع عن عشیرته مالم یأثم..)(رواه ابوداودوالبیهقی)واتە:چاکترینتان ئەوەتانەکەبەرگری لەهۆزەکەی دەکات بەمەرجێ تاوانبارنەبێت،تایەفەگەری هەندێ لایەنی باشی هەیە وەکو ژیانی بەکۆمەڵ وهاوکاری یەکتروخۆش ویستی پەیوەندی خزمایەتی،بەتایبەت گەرکراوەبن وداخراونەبن،بەلاّم هاوکات لایەنی خراپیشی هەیە وەک ستەم و ناعەدالەتی بەرانبەر بەئافرەتان ،چونکەلەنەریتی عەشیرەتگەریدا پیاوان بەشەڕ دەهاتن ویەکتریان دەکوشت ولەسوڵحەکەدا ژن دەبونەقوربانی وباجەکەیدەدا ! کەلەگەڵ شەرعدا نەگونجاوەچون خوای گەورەفەرمویەتی(ولاتزروازرة وزراخری) واتە:کەس تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ،سوڵح دەبێ لەسەرماڵ وسامان بێت نەوەک ژن تیا بکرێ بەکۆیلە،بۆیەئەم جۆرەداب ونەریتانەپوچ وبەتاڵن لەڕوانگەی شەرعەوە،لەنەریتە خراپەکانی عەشرەتدا ئەگەرکاری داوێن پیسی ڕویدا یەکسەرژنەکەتاوانبارەودەکوژرێ زۆرجار پیاوەکە وەک بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ ولەلایەن خزمانەوە دەپارێزرێ ! ئەوە لە کاتێکدا لەڕوی شەرعەوە هەردوکیان تاوانبارن،وەلە داب

ونەریتی عەشیرەتەکەدەبێ لەسەریەکتربکەنەوە حەق بێ یان ناحەق!بۆنمونە ئەگەرکەسێك لە عەشیرەتی خۆیان یەکێکی بەناهەق کوشت ئەوەپشتی دەگرن ولە سزای عادیلانە ڕزگاری دەکەن، کە ئەوەش دەمارگیری ورەگەزپەرستیەوپێچەوانەی شەرعە،یان لەبەرخاتری خزمایەتی شایەتی ناحەق بۆ یەکتر دەدەن و ڕاستیەکان دەشێوێنن!کەئەوەش لەتاوانەگەورەکانە،لەنەریتی هۆزەکەدەبێ ڕەش وڕوت وبێ دەسەلات لە خزمەت دەسەلاتدارەکە دابن..!،هەرعورف وعادەتێك بێ شەرعی بێت نادروستە و پوچ وبەتاڵە،ئەوەیش کە شەرعی بێت ڕێگەپێدراوە،زۆرلەستەم وگەندەڵیە کانی ناوحوکمەتیش ئەوانە دەیکەن کەپشتیان هەیەوناترسن لەسزای یاسایی ڕزگاردەکرێن وحساب بۆکەس ناکەن! هەرگەل ونەتەوەیەك بیری عەشیرەت گەری زاڵ بووبەسەریانەواهەستی نەتەوایەتیان لاوازدەبێت،چون ناکۆکی هۆزەکان بەردەوامەوهەرسەرقاڵی بەرژەوەندی عەشیرەتن،هەریەکەیان دەبنە میر نشینێکی سەربەخۆ!حیزبەکا نیش بۆبەرژەوەندی خۆیان بەکاریان دێنن، بە کردنەوەی سەنتەرو هاوکاری ماددی،دواتربەهۆی پارچە پارچە بونیانەوە دوژمنانیش بەسەریاندازاڵ دەبن،بۆیەئاینەکان دژی دەمارگیری ونەوجۆرە عەشیرەتگەریەن،گەلانی پێشکەوتوش عەشیرەتگەریان تواندۆتەوەلەناو بیری ئایینی ونەتەوایەتی دا،پێشەواکەیشمان (ﷺ) فەرمویەتی:لەئێمەنیەئەوکەسەی بانگەشەی عەصەبیەت دەکات یان شەڕی بۆبکات، ئەویش بەوەی کەپشتی قەومەکەی بگرێ لەسەرستەم وناحەقی(العصبية ان تعين قومك على الظلم)، لێرەدا گەیشتینە ئەو دەرەنجامەی کەعەشیرەتگەری بەوشێوەیە زیانبەخشە بۆ بەرژەوەندیەکانی گەل ونەتەوە چونکە یەکڕیزیان لەدەست دەدات، بەڵام لێمان تێکەڵ نەبێ ڕێزو خۆشەویستی بۆهۆزوبنەماڵەلەسنوری خۆیداوپاراستنی لەسەرحەق شتێکی فیتری وڕەوایە..وەك لە سەرەتا وەئاماژەمان پێدایە.

## ئایا كریسمس كوردایەتیە؟ (سەری ساڵی زاینی)

ساڵی(٢٠١٣) بەسەرجەم ڕوداوەكانیەوە ماڵ ئاوایی كردوساڵێك لەتەمەنمان كەم بویەوە كەدەبوخەمبارین لەجیاتی شادی! وایین لەپێشوازی سەری ساڵی (٢٠١٤)ی زایندا كەساڵانەبەگەرمی پێشوازی لێدەكرێت وبەڕازاندنەوەی ڕێگا سەرەكیەكان وگەرمكردنی یانەوهۆڵەكان بەخراپەكاری وبەپێی ڕاگەیەنراوێك ئەم ساڵ بۆمەراسیمی ئەویادە حكومەتی هەرێم(٥٠) ملیۆن دیناری سەرف كردووەلەوەتەنها لەبەر ڕەزامەندی نزیكەی ٥./. ی هاولاتیانی هەرێم وپشت گوێخستنی ٩٥./. ی كە موسڵمانن،كەبۆسەری ساڵی كۆچی هیچیان نەكرد،بەلام بۆمەراسیمی برامەسیحی ویەزیدیەكانیان، زیادلەپێویست لەخزمەت دان بۆئافەرینێكی دەرەوە!لێرەدا مەبەستم ئەوەنیە حساب بۆبەرانبەرەكانمان نەكەین،بەلام هەركەسەبەقەبارەی خۆی،جانازانم ئەوەچ جۆرێكەلەدیموكراسی ومافی مرۆڤ؟سەری ساڵی زاینی تایبەتە بە مەسیحیەكان وهیچ پەیوەندیەكی بەزۆرینەی كورردەوەنییە،چونكە كەلتوری كوردئیسلامیە،لەكاتێكداخەڵكانی بێگانە لەدەرەوە شانازی بەئیسلامەوە دەكەن وبەرەوئیسلام دێن،بەلام ئێمە پەندلەهەڵەكان وەرناگرین وشانازی بە بێگانەوەدەكەین لەسەرێ گەلۆلەكوێ جولەكەومەسیحی ویەزیدیتان بینی ئاهەنگ بگێڕن بۆبۆنەكانی ئێمە،لێرەدا دەسەلات بەرپرسیارەلە گرنگی دان بەوشتانەی كەنامۆن بەئاینی سەرەكی و زۆرینەی هاولاتیانن كەئیسلامە بە لە بەرچاونەگرتنی زەمینەوزەمان، خەڵكیش لەترسان ولەبرسان لەسەردینی پاشاكەیانن وەك ئەسەرێكی بەهێزدا هاتوە:(الناس علی دین ملوكهم) كە بەلای هەندێكیانەوەفەرمودەیشە،هێزی دەسەلات وپارە لەهەمووشتێ زیاتر بەكارە،پاشان یادكردنەوەی حەزرەتی مەسیح سەلامی خوای لەسەربێت بەم شێوەمەراسیمەڕازییە ؟كەپرپیەتی لە بێفەرمانی خواومەسرەفی زۆر كەجێگە ناگرێ، ئایا بابا نوئێل چ پەیوەندییێكی بە منالانی كوردەوە هەیە؟لەكاتێكدامنالانی كوردبەپلان وپیلانی سەرانی ئەوان بێناز كراون!ئایاكلاوەكەی بابا نوئێل مانای كلاولەسەرنانی ئێمەنیە؟ مەگەرئێمە

خاوەنی کـلاّو وجامانـەی خۆمـان نـین کەفرێماندـاوەلێتایـا هێنـانی گـۆرانی بێـژی بیـانی بۆکۆنسرێت وبەخەرج دانی دەیان دەفتەردۆلارچ خزمەتێك بە کورد ستان دەکات لەکاتێکدا زۆربەی شـوێنەکانمان هێـشتابەدەست گرفتـی خزمەتگوزاریـە سـەرەتاییەکانەوە دەنـاڵێنن و ناچـار خۆپێـشاندان دەکەن،بـەلاّم لەکۆنـسرێتی (نـەجوا کـەرەم)بلیتـی ڕیـزی پێـشەوە(٨٠٠)دۆلاربـو!گەرلەوشەوانەداسـەیری ئاسمـانی شـارەکەم بکـەیت لەشـاری کـاك ئەحمەدی شێخ ناچێت بەدەربڕینی شادی لەڕێگـەی هەڵدانی بـالۆنی ئاگرینـەوە بۆبەشـداری لەشـادیانەی مەسـیحیە کان،دەیانـەوێ پێناسـی شـارەکەم بگـۆڕن لەکوردایـەتی بۆمەسـیحیەت،کەنامۆن بەفیکروکـەلتوروئاینی هەرێمەکەم،لەکاتێکـدا بـەپێی کتێبی(دائرةالمعارف)ی بەریتانی مێژوی(١/١) هەڵەیەوقەیسەری ڕۆم دوای(٣٤٠)ساڵ لـە لەدایك بونی حەزرەتی عیسابەمەبەست ئەم ڕۆژەی دیاری کردبۆئەوەی ڕێك بکـەوێ لەگـەڵ بۆنـەی زۆرینـەی بـوزی وبـت پەرسـتەکانلابابەخۆماندابـچینەوەلەخزمەت ڕەسـە نایـەتی نەتەوەکەماندابین،چون هەر کەسێ ڕەسەنایەتی لەدەستدا ئەوەسەرە نجام خۆیـشی لەدەست دەدات وەك حەزرەتی مەسیح فەرموویەتی:(ئەگەر هەمودنیابەریتەوە بەلاّم خۆت بـدۆڕێنی بەهیچ ناچێ).

بۆئەوتەوەرەلەسەرەتای ساڵی(٢٠١٣)لەبەرنامەی(کەوانە)ی تلفزیۆنی گەلی کوردستان گفتگۆیەکی چڕوپڕوگەرموگوڕمان ئەنجامدالەگەڵ ڕۆژنامەنوسێکی عەلمانی،بۆمان سەلماند کەلەدورونزیك پەیوەندی بەکوردوئیسلامەوەنیە.

# کوردایەتی لەتەرازوی ئیسلامدا

لێرەولەوێ ئەبیستین وئەڵێن: ئیسلام وکوردایەتی جیاوازن،یان ئیسلام هی عەرەبەوومافی نەتەوەکانی تری نەداوە!کوردایەتی ودینداری ئەبێ لایەکیان بگری!...هتد،دیارەکوردنەتەوەکەیەوکوردایەتیش شۆڕشی کوردیە، هیوادرم بەکورتی ڕاستیەکان بیسەلمێنین وبۆچونەکانیان ڕاست بکەینەوە،خوای گەورەلەسورەتی (الحجرات) فەرمویەتی:﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ الحجرات١٣،ئەوەی کە عەرەبی زان بێت ئەزانێت کەوشەی (الناس)گشتگیرەعامە،بۆموسڵمان غەیرەموسڵمان،خودای گەورە (جل جلاله) بانگیان دەکات خودا ڕقی لەکەس نیە،مەگەر کابرا خۆی قێزەون بکات، ﴿یأیها الناس﴾ئەی خەڵکینە،﴿انا خلقنکم من ذکر وانثی﴾ (بۆبەربوونەتە یەکتر؟بۆعەسەبیەت ودەمارگیری، هۆشیار بن)﴿انا خلقنکم من ذکروانثي﴾ لەبنەڕەتدا لەدایك وباوکێکن، لەنێرومێیەك دروستمان کردون،وەك لەفەرموده دا هاتووە: هەمووتان لە ئادەمن، ئادەمیش لەگڵە ، سپی پێست لەگەڵ ڕەش پێستدا جیاوازی نیە!فەرقی زمانی عەجەم بەسەر عەرەبدانیە،ڕێزوماف بۆ یەکتر دابنێن،مافی سیاسی وکۆمەڵایەتی و ئابووری عەسکەری، چیت بۆ خۆت ئەوێ بۆ ئەویشت بوێ.بێگومان خودای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ لەهەمووومان، بۆچی هەموومان لەیەك عەشیرەت نەبووین ؟ بۆچی هەمووی یەك زمان نەبوو؟ بێحیکمەت نیە بەلاَم ئێمە ناتوانین دەستکارییان بکەین و لەبارەیانەوە خودا ئەفەرموێت: خۆم دروستم کردوون، (کورد، عەرەب، فارس، تورك بەربەری....هتد)ئینجادوای گەل ونەتەوە تیرەوهۆزە، هەر کەسێك کەوا زمانێکی تایبەتی هەبێ لەگەڵ خەڵکێکی تردا، ئەوە گەلە. بەلاَم لەناو گەلدا چەند تیرەوهۆز هەن ئەوە پێیان ئەڵێن "قەبیلە، میللەتی کورد کەخاوەنی ئەوهەموو زاناوموحەدیس وکەڵەمێرد و قارەمان و هەڵکەوتەو شۆڕشگێڕو جوامێرەیە کێ ئەتوانێ نکوڵی قەومییەت لەو گەلە

بکات و بلێت قەوم نین؟ بەڕێزان بائەو ئیسلامە وەك خۆی تێبگەین دوژمنانی دین کاتێك پێمان ئەڵێن:جنۆکەی شاخەکانن، یا تورکی کێوی ئەوە دژایەتی دینە. ئەبێ ئێمە بزانین سەرچاوەی ئێمە قورئان وسونئەیە. با برۆین هەموومان بگەڕێین، بزانین لەکوێدائێمەزەربی سفرکرابین وقەوم نەبین؟ ﴿وجعلنکم شعوباوقبائل ﴾کەوابوو میللەتی کورد یەکێکە لەو شەعبانە،کەس ناتوانێ نەفی قەومیەتی لێ بکات، وەکو عەرەب وایە، وەکو فارس وایە، وەکو تورك وایە،وەکو هەموو جیهان وایەو هیچ جیاوازییەکی نیە. هەمووجیهان چ مافێکی ڕەوای بۆ هەیە ،ئەویش ئەو مافە ڕەوایانەی بۆ هەیە.هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ لەقەومیەت ئەدوێن،واپێناسەی قەومیەت ئەکەن: کەزمانێکی تایبەتی خۆی هەیە.ئایا لە قورئانی پیرۆزدا هەیە باسی زمانی ئێمە بکات؟ بەڵێ﴿ومن ایاته خلق السماوات والارض واختلاف والسنتکم والوانکم﴾ئەو زمانەی کەوا تۆ پێی ئەڵێیت: بابە، ئەو ئەڵێت (اب)هەر ئەو پارچە گۆشتەیە، لەسەرجەم مرۆڤکاندا جیاوازی نیە. بەلاّم ئەوئەڵێت: (اب) ئەو بابە ئەو پدەر)ئەوە بەڵگەیە لە سەربون ودەسەلاّتی خودا (جل جلالە). بەڵێ، کەوابوو زمانیشمان خودای گەورە بۆی داناوین، هەرکەسێك هەوڵ بدات زمانمان بسڕێتەوە دوژمنی دینە، لەدین نەگەیشتووە. هەرکەسێك هەوڵ بدات فەرهەنگی کوردی کلتوری کوردی نەمێنێت ئەوە دوژمنی دینە، پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ئێستە ئەگەر خۆی وسوپاکەی لەئارادا بوایە، میللەتی کوردی ئاوا بدیایە بەرگری لێ ئەکردین.دیفاع لەزمانمان ئەکات، بەلاّم ئێستە چی بکەین جامانەکەت فڕێدراوە دەم وچاوت جل وبەرگت نامۆیە، ئەڕۆی بۆ بەغداد ئەبێ چاکەت وپانتۆڵ لەبەربکەی کێ وتی؟ ئیسلام وتی چاکەت و پانتۆڵ لەبەر بکە؟ کێ وتی؟ دینی ئیسلام وتی قاچاخ بە؟ بێگومان نەخێر، بڕۆ بۆ تورکیا، بڕۆ بۆ هەر ولاّتێکی تر، ئەو جل و بەرگەی کە جل و بەرگی سەلاحەدینە، کەخودای گەورە پێی داوین قاچاخە.هەموو عەرەب و فارس وتورك جل و بەرگی تایبەتی خۆیان هەیە،بۆ هی ئەوان بۆ دروست بێت وهی ئێمە قەدەغە بێت؟ باتفەنگ بەتاریکیەوە نەنێین، بالەئیسلام وردبینەوە

بزانین کێ زەرەری بە قەومییەتی ئێمە داوە،کێ خەتی ڕاست وچەپی لێداوین وخاکەکەی پارچە پارچە کردوین؟با گلەیی لەوە بکەین، با بەگژ ئەودا بچین، با هێزو پێز پێکەوە بنێین بڵێین ئێوە ستەمتان لە ئێمە کردووە. کەوابوو زمانەکەشمان کەبەکوردی قسە ئەکەین شانازی پێوە ئەکەین بۆچی؟ چونکەکەس پێی نەداوین، دوژمن پێی نەداوین، خودای گەورە پێی داوین﴿الرحمن *علم القرءان *خلق الانسن*علمه البيان* ﴾خودای گەورە مرۆڤی دروست کردووەو لەهەمان کاتیشدا هێزی لێکدانەوەی پێداویستییەکانی پێداوە."البیان" چیت پێویستە چیت لەتوانادایە، چیت پێویستە لەسەرجەم بوارەکاندا ئەبێ بەیانی بکەیت لە سەردەمی پێغەمبەروهاوەڵانیدا،لەسەردەمەکانی تری ئیسلامدا،دەقێکم بۆ بێنن، مێژوویەکی ڕاست، ئایەتێك کەواکوردێك ئاوارە کرابێت؟ لەمەجلیسدا دەرکرابێت؟ مافی ڕەوای خۆی نەبووبێت؟ مافی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی نەبووبێت؟لەبەرئەوەئێمە بە شانازیەوەیەکێکین لەوگەلانە،وەزمانیشمان خوای گەورە پێی داوین،ئایا هیچ کات خودای گەورە زوڵم ئەکات؟(پەنابە خوا) گەلێك خۆی دروستی بکات، لەژێر ئایەتی ﴿وجعلنكم شعوبا وقبائل﴾ڕازی بێت بەوەی کەتۆنەتەوەی، لەژێرئایەتی﴿واختلاف السنتكم والوانكم ﴾ ڕازی بێت بەوەی کەتۆ زمانت هەیە، ئایا قابیلە قایل نەبێت بەوەی وەتەنێکت هەبێت و تیایدا بژیت؟﴿والارض ورضعها للانام﴾ خودای گەورە(جل جلالە) زەوی بۆ بەشەرییەت دروست کردووە. کێ ئەتوانێت بڵێت عەرەب وفارس شایستەترن بەوەی کەوا ئەرزیان هەبێ، بەڵام قەدەغە بێت لەنەخشەی جیهاندا بنوسرێت "کوردستان" ؟؟!! کام ئایەت وا ئەڵێ؟ ئەبێ ئەوەشمان لەبیــــر نەچێت ئەسڵ لەئیسلامدا وەحدەت ویەك ڕیزییە. یانی کەس باسی ئەنانیەت و قەومییەت نەکات. بەڵام با هەموو کەسیش لەشوێنی خۆیدا، بەزمانی خۆی قسە بکات، بەزمانی خۆی بخوێنێ، دەرامەتی خۆی بۆ خۆی بێت وئیدارەی خۆی بەڕێوە ببات، ئیسلام نەیەوێت بەشەرییەت بکاتە یەك پارچە. بۆچی؟ بۆ ئەوەی یەکتـــر بناسن. (لتعارفوا) هاوکاری یەکتـــر بکەن لەهەر ئیشێکی خێردا کەمایەی پێش

بردنی وڵات بێت، بەشـەریەت هـەمووی بەرپرسیارە لـەوە. دەی ئەمـە چ کاتێـك ئـەبێت؟ کاتێك ئەبێ کەوا هەر هـەموو برایـەتی و تـەباییان لـەناودا بێـت، بانگەشـەی قەومییـەت نەکرێ، هەرمیللەتێك لەجێگەی خۆیدا کوردەفارسە عەرەبە،حوکمەتی مەرکەزی ئیسلامی ئەگەر مافی هەمووی بدا، ئەوکاتە نەکورد هاوارئەکا، نە فارس. ئەسڵ لـە ئیـسلامدا وەحدەتـە، پەڕاگەنـدەیی دەردی کوشـندەی هـەموو گـەلانی جیهانـە. بەتایبـەت ئـەمڕۆ کەزۆرپێویستە بۆ میللەت تەبایی و برایەتی. ئەسڵ لە ئیسلامدا یـەك ڕیزیە،بـەلاّم لەگـەڵ پێش چاو گرتنی ئەوە بازمانی خۆی بێت ،ئەوە با پەرلەمانی خۆی بێت، با وەکو ویلایـەت لەئیـسلامدا حـەق و مافـەکانی بۆدابنرێـت، بـەلاّم پێویـستە بۆهەمووگـەلێ وەك جـاران بنوسرێت (دەوڵەتی ئیسلامی) نەك نـاوی عـەرەبی بێ،تاکوردەکـە بـە ڕوو شـکاوی بڕواتـە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)بڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی مـافی مـن کـوا؟ تا تورکمانەکە بڕوات بڵێت ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) (الدولة العربية) نوسراوە،ئەی مـن چیم؟ تا باقی زمان و گەلەکانی تر کە لـەو ناوچـەو دەورو بـەرەدا بـوون. ئەنوسـرا (الدولـة الاسـلامية) عـەرەب هەسـتی نەئـەکرد عەرەبـە، کـورد هەسـتی نەئـەکرد کـوردە، فـارس وزمانەکانی تر هەستیان نە نەکرد بەچەوساوەیی. ئەسڵ لەئیسلامدا وەحدەتە،بەلاّم لەگـەڵ پێش چاو گرتنی مـافی هـەموو خـەڵکێك لەشـوێنی خویـدا. زانایـانی شـەرع ئەفـەرموون: دنکـێ گـەنم لەهـەولێردا تامیللـەتی هەولێرودەوروبـەری هەولێر،فەقیـرو هـەژاری هـەولێر پێویستیان بێ دروست نیە بینێریـت بۆسـلێمانی وشـوێنێکی تر،مامۆسـتایانیش باشتـــر ئەزانن، ئایا مامۆستا دروستە سەرفیتـرەکەم بنێـرم بۆ شارێکی تـر؟ هـەتا دروسـت نیـە لەگوندەکەی خۆتەوە بینێریت بۆ گوندەکەی تر کە نزیکتە. باشە چۆن دروستە لێـرەوە ئـەو هەموو سەروەت وسامانی کوردستانە باربکرێت، بە شاحنەو بەلۆری بنێردرێت بۆ ئـەورووپا، بەلاّم نەوتەکەمان لێرە بەرمیلی گەیشتە هەزار دینار؟!ئەمەعومەری کوڕی خەتاب کـردی بە ئێمە ؟ دین کردی؟ ئیسلام کردی؟ کێ کردی؟بێگومان سیاسەتی سیکۆلاری زلهێزەکـان.

لەسەر ئەوبنەمایە ئەسڵ لەبەشەریەتدا هەمووی یەکڕیزیە،بەلاّم مافی هەموو کەسێك ئەبێت بەجولەکەو گاوروخەڵکان ی تریشەوە بدرێت. چەندە ڕێز لەخۆیان بگرن، ئەبێ لەناو عالەمی ئیسلامیدا ئاوا فەرهەنگ و زمان و کەلتوری خۆیانیان هەبێت و پارێزراو بێت. خودا دروستی کردووە تۆ چۆن زمانی قاچاخ ئەکەیت؟ بەلاّم کاتێك کەوا (دەوڵەتی ئیسلامی) سڕایەوەو نەما، عەرەب بوو بەبیست و دوو دەوڵەتەوە، حوکمەتی تورکمانی دروست بوو، حوکمەتی فارس دروست بوو، وە هەموویان لەسەر نەخشەی جیهاندا هەن (ئەوە عیراقە، ئەوە لوبنانە، ئەوە جەزائیرە، ئەوە فەلەستینە، ئەوە عەرەبستانی سعودیە....هتد.) باشە بۆچی مەمنوعە لەونەخشەدا بنوسرێت کوردستان؟ ئەسڵ لەئیسلامدا (دەوڵەتی ئیسلامی)یە هەمووی بەیەکسانی بژی بێ جیاوازی، بەلاّم ئەگەر ئەو وتی: عەرەب، ئەو وتی:تورك، ئەو وتی: فارس، باشە ئێمە چل ملیۆن؟فەرهەنگ مان نیە؟زمانمان نیە؟ چۆن ئەبێ ئەرزمان نەبێت؟ چۆن ئەبێت زمانمان یاساغ بێت؟ یانی قابیلە خودا بفەرموێت: دروستم کردوون بەلاّم برۆن ئێوە دوژمنی منن، نابێ بە کوردی قسە بکەن؟ زۆرجار بیستراوە دوژمنان ئەیانوت : پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) فەرموویەتی: کورد یاخوا تاماوی هەر کورت بیت!! باشە ئەم درۆوبوهتانە گەورەیە لەکوێ کرا بەدەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ).؟ مەسەلەی نەتەوایەتی هەرکەسێك لەنوێژ جیای بکاتەوە، لەئیسلام حاڵی نەبووە، دڵنیابن. پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)کاتێك مەککەی بەجێهێشت، ئەو بە مەککەی فەرموو:(واللهِ أنك لاحب الارض الي لولا أخرجوني ما خرجت منكِ) خۆ هەموو مەدینەشی خۆش ئەوێت، باقی ولاّتانی تریشی خۆش دەوێت ،بەلاّم ولاّتی دایك خۆشەوسترە، کەس ناتوانێ لەدەروون و مێشکدا دەری کات. حزبی بەعس چەند ساڵ هەوڵی دا میللەتی کورد نەمێنێ، فەرهەنگ وڕەسەنایەتی نەمێنێ، ئەوەتا لە سێدارەدران وسەرنوگم کران،زیاتر لەچوار پێنج هەزار گوندمان وێران بوو، مزگەوت و قوتابخانەو مەلاو مامۆستاو ئەدیب و هەموو خەڵکەکە ویستی بمانفەوتێنێت،

بەلاّم چی کرد؟ سوپاس بۆخوا ئەبینی ئێستا میللەتی کورد لەهەموو جارەکانی تر هۆشیارترە، بۆچی؟ چونکە ستەمی لێکراوە، مافی خوراوە. ئەگەر(دەوڵەتی ئیسلامی) هەبێت، کوردیش ڕازیە بەبەشی خۆی. ئەگەر ناوی ئەو دەوڵەتانە هەبێت لەنەخشەو کاروباری ولاّتدا،باشە کام ئایەتی قورئان دژی ئەوەیە کەوا(الدولةالكوردية)ش هەبێت؟ ئێمە وەکوموسڵمان ئەمانەوێ پێشمەرگەی بەرەوشتی قورئان بە دەستی کوردبین، پێشمەرگەیەك کاتێك کەوا دراوسێکەی ئەڕوا بۆسەردان و سەفەرێك ژنەکەی بەجێ بهێڵێ لەگەڵ کچەکانیدا،یەك دانە مانگ نەیەتەوەو بەخەیاڵیشیدا نەیەت، چونکە ماڵێکی موسڵمان دراوسێیەتی. لەسەربنەمای تەقواو برایەتی ودەست پاکی ....هتد. ئەمە واقیعی ئیسلامە، کە قەومایەتی نەتەوایەتی لەئیسلامدا زۆر پیرۆزە،بەشێکە لەدینداری، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێندی خواردو فەرمووی بە مەککە: لەهەموو پارچەکانی تری سەر زەوی شیرینتری لەلام، وە ئەگەر قەومەکەم دەریان نەکردمایە قەت بەجێم نەئەهێشتی. کەوابوو سۆزی نەتەوایەتی لەگەڵ دەمارو خوێن وهەموو لاشەی مرۆڤدا تێکەڵ بووە. ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئیسلامی پیرۆز لەلایەکەوە بەرگری لە گەل وقەوم و زمان و فەرهەنگت ئەکا، بەلاّم لەولاشەوە لەگەڵێك جێگا ڕووبەڕوو بووەتەوە لەگەڵ مەسەلەیدەمارگیری ونەتەوە پەرستی، پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) کاتێك کەوا خودای گەورە ئەینێرێت ﴿وما ارسلناك الارحمة للعالمين﴾بۆ ئەوە هاتووە کەوا عەرەب خۆی هەڵنەکێشێ بەسەر فارس وتورکدا لەناو تیرەکانی عەرەبیشدا هەندێك خۆیان بە بەرێزتر نەزانن لەوانی تر.لەناومرۆڤەکانیشدا هیچ کەسێك خۆی بەگەورەتر نەزانێ. مافی هەموو کەس بدرێ،بەلاّم ئەگەر هاتوو کۆمەڵێك عەرەب دنیایان بە دەست گرت، خوێنی گەلانی تریان مژی، ئابووریت نەبوو ئەو خواردی، دەم و چاوت قاچاغ بوو،زمانی قاچاغ کردی بەناوی قەومییەتەوە،وەك لەئەوروپاو ڕۆژئاواوە ئەوپەتاکوشندەیە هاتووەتە ولاّتمانەوە، یا فارس قیت بوویەوە لێت،یا تورکمان خۆی قنج کردەوە لە بەردەمتا، بە

تەعبیری ئێستای ئەمانە مافی مرۆڤایەتی لێ داگیــرکردی، ئەوەیە پێغەمبەری ئیسلام فەرمووی:(من دعا الی العصبیة فلیس منا، ومن قاتل علی **العَصبیة فلیس منا، ومن مات علی العصبیة فلیس منا**) هەرکەسێك بانگەوازی قەومییەتی جاهلییەت بێت، هەر کەسێك بمرێت بە ئایدیای نەتەوەپەرستیەوە لەسەربنەمای دەمارگیری نەفامی فەمووی ئەوە لەئێمە نیە.بەناوی خۆیەوە قسە بکات بەناوی ئیسلامەوە قسە نەکات، پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) فەرمووی:لەئێمە نیە. خەڵکێك ئەڵێت: پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ ) ئەچێت بەگژ قەومییەتدا، مەبەست ئەو قەومییەتە خراپەیەکە لەناو عەرەبدا (مێشێل عەفلەق) پەیدابوو لەبەغداد ئەوەی کە بەعسی نەبووایە پێی بڵێی ماف نەیبوو. ئەی باشە هەقی خۆی نیە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)بفەرموێت:(**دعوها فأنها منتنة**)دەمارگیری قەومییەت وجاهلییەت فرێی بدەن بۆگەنە، چەپەڵە،خەڵکێك بێتە سەر حوکم، حوکم بە دەست بگرێ ئەوەی بەزمانی ئەوقسەنەکات، مافی نەبێت ! ئینجا هەوڵیش بدا هەرچی دەرامەتە بیکات بەقورگی خۆیدا،هەرلەبەر ئەوەی زمان و ڕەنگت جیایە. ئەمانەیە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) فەرمووی: فرێی بدەن بۆگەنە، عادەتی بەشەرە دەمیان تێك ئەگیرێ (ئەبوو زەڕی غەفاری) تەنهاجارێك بە بیلالی حەبەشی فەرموو: کوڕی ژنە ڕەشەکە!خۆتاساییە حەبەشییەکان ڕەشن، شتێکی واقیعیە ئەوەلای ئێمە وەکو بەخشش وخەڵات وایە، لەچاو ئەوهەموو جنێوو ناوو ناتۆرە لەنەسەب و نەژدادی یەکتر،ئەو بۆیە لەحەبەشەوە هاتووە، بۆیە ولاتی -ئۆی بەجێ هێشتووە،کەلێرە سەربەرز بێت، زمان وڕەنگی پارێزراو بێت، خەڵك تانەی لێ نەدا،خودای گەورە دروستی کردووە،(واختلاف السنتکم والوانکم) من چی بکەم خودای گەورە بەڕەشی دروستی کردووم؟بۆتانە لەخودا نەدەی؟ بەلاّم بیلالی حەبەشی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) چونکەلەدین تێگەیشتووە، هەستایەوەو یەکسەر چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی:(یارسول الله(ﷺ)ئەبوزەڕی غەفاری پێی وتوم:(**یاابنةَ السوداء**) باشە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) چی بکات؟ ڕەئیس عەشیرەتێکە، عەشیرەتی غەفاری

هەمووی لەژێر دەستی ئەودایە. چی بکات؟ هەروا سەری بنێتەوە؟نا، بانگی کردوو ێی فەرموو: (أنك امرء فيك الجاهلية) تۆ کەسێکی بەشێکی نەفامیت تێدا ماوە.ئەوە جاهیلیەتە پێی بڵێی کوڕی ژنە ڕەشەکە ئەوەنەفامیە بەتانەوە بڵێی تۆ کوردی یا عەرەبی، یا چیت. ئەی باشە چەند جار ئیمزا کراوە لەسەرپێشێل کردنی مافی میللەتی کوردو چەسپاندنی لەسەرگەلانی تر؟ چەند جارئێمە مافی سیاسیمان خوراوە،مافی کۆمەڵایەتیمان خوراوە؟ئەمەیە کە پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) فەرمووی فرێی بدەن بۆگەنە،ئومێدەوارم بەوردی لە حەقیقەتی ئیسلام تێ بگەین، ، ئەمرۆ کوردستان پێویستی بەوەحدەت و برایەتی هەیە،بەئیسلامی و غەیرە ئیسلامییەوە نەیاران لەکەمیندان بۆ خۆمان و بەروبوم وئەزمونەکەمان،باقەزیەکەی ئێمە بەشکۆمەندی بێنێتەوە ڕێزمان بۆدابنێن نەفرەتی خودا لەوانەکراوەوئاژاوەو فیتنەودوبەرەکی ئەنێنەوە، هەرکەسێك لەناو میللەتی کورداشۆڕشی کردبێت،غیرەتی جولابێت،لەمزگەوت وحوجرەکانەوە سەرچاوەی گرتووە.هەرچی سەرکردەی کوردهەیە،یا(شێخ محمود،یامەلامستەفایە، یا سەیدە،یا شێخ سەعیدی پیرانە، یاقازیە)، مەبەستم ئەوەیە ناوێکی وەك شێخ یا مەلای پێوەیەکەهێمای دینە. ئەدەبیاتی کوردیش هەموو خوێنەران و ڕۆشنبیران ئەمرۆ قەرزاری (مەحوی و، نالی و، بێخود)ن. ،بەدەیان ڕۆشنبیردانیشن ئینجادەتوانن هۆنراوەکانی مەحوی لێکبدەنەوە،کەوابوونەگەرئەوئیسلامە قاچاغ بووایە ئەوهەموو ئەدەبیات وفەرهەنگ و دەسەڵات وهێزەی نە ئەبوو. سەلاحەدینی ئەیووبی (ڕەحمەتی خودای لێبێت )، بەهێزی ئیمانەوە چۆن توانی ئیسپاتی کوردیەتی خۆی بکات، بەسەر هەموو جیهاندا. وەسەرکردایەتی عالەمیش بکات. کەسیش نەبوو پێی بڵێ تۆ کوردی.ئاینی ئێمە دینێکی عالەمیە لەهەموو بوارێکدا، بەومەرجە پسپۆڕو دڵسۆزی خۆی قسەی لەسەر بکات. ئێمە سەربەرزین، ئێمە خۆشحاڵین، دڵشادین،بەرنامەی خۆمان ئەناسین. ئەگەرکەسێکیش نەیتوانی حەقی خۆی بداتێ، ئەوە ئەوکەمتەرخەم بووە، بەرنامەکە تەواوەو ئەو شارەزای نەبووە،

## ئیسلام و عەلمانیەت کامیان خەتەرە بۆنەمنی قەومی...؟

لێرەولەویێ لە هەندێ ڕۆژنامە بەرچاومان دەکەوێ تیایدا ئیسلام تۆمـەتبار دەکـەن بـەوەی کە(بەشیروتیرسـەپێنراوە، ئـاین وزانـست دژی یـەکترن، ئیـسلام بـەدینی عـەرەب دەزانـن)! سەرەتا جێگەی سەرسوڕمانە کەسانێك خۆیان بەڕۆشـنبیردەزانن ولـەولاتێکی موسـڵماندا ژیابێـت وبەچکەموسـڵمان بـێ لـەدینی باوباپیرانی بێئاگـابێ، کـەدەڵێن ئیـسلام بـەزەبری شمشێرسەپێنراوە ئەوە ڕێك پێچەوانەی ئایـەتی قورئانـە قـسەی نەیارانـە، خوافەرموویەتی (لااکراه‌في الدين ..) واتە: زۆرکردن نییەلەوەرگرتنی ديندا،بەزۆرنابێت( سالح قەفتان)دەڵێ: (پشتاوپشت بۆمـان ماوەتـەوە کـەکورد بـەزەبری شیروتیرموسـڵمان بوە،ئەگـەر ئەمەڕاست بوایە دەبووعەرەبەکانی ئەوکاتەلەموسڵمان بەولاوەکەسی تریـان نەهێشتایە،وەك جولەکـە ومەسـیحیەکان کەلەسـەردینی خۆیـان مانـەوە/سـەرچـاوە (فتوحـات/ل١٩٦)،مێژوونوسـی ئەمریکی(ووڵ دیوڕانت) لەکتێبی تەرجەمە کـراوی (قصةالحضارة/ب ١٣ ل ١٤٥)دەڵـێ: {ئیسلام یەکەم ئاین وسیستمە کەمرۆڤ سەرپشك دەکـات لەسـێ شتدا،ئیـسلام بـوون یـان جزیەدان یان شەڕ، بەلاَم گەلانی تربەشەڕیەرانبەرەکانیان سەرشۆڕکردووە،دەوڵەتی ئیسلامی لەو (٣٠)ی ساڵەی دوای پەیامبەرکۆمارێکی دیموکراتی بـووە}ئەمەشـایەتی کەسـێکە کـە موسڵمانیش نیەبەلاَم ڕاستیەکەی نوسـیوە،تەنانەت کـوردپێش ئیـسلام وئیـستاش بووەتـە سوتەمەنی وقوربانی پیلانی ئەوانەکەدووربون لە دین،(ڕۆژبەیانی)لەمێژووی حەسەن وەیهـی وعەیاریـدا لاپـەڕە(١٥٦) دەڵێ: (کـوردە کـان لەسـتەمی سـاسـانیەکان بێزاربـوون شـەڕیان بۆنەکردن وپێشوازیان کرد لەسوپای ئسلام وبەئاشـتی شـارەکانیان دابەدەستەوە،بۆیەسـەعد کوردێك بـەناوی (قوبـاد)دەکاتـە سـەرداری(مـەلوان)لـە جیـاتی قـەعقاع...بۆیەلەشـارەزور ڕاپەڕین وهەرێمی جەزیرەش بەئاشتی ڕزگارکراو تەنانـەت شـاری (حـەڕان) کـە گەورەکـەی کوردبووهـەموویان موسـڵمان بـون وکەنیـسەکەیان کردەمزگـەوت وسـەرۆکەکەشـیان هەرلـە جێگـەی خـۆی مایـەوە چـونکەبێزاربون لەشەڕوسـتەمی هەزارسـاڵەی فـارس وڕۆمـەکان،

وەهەروەها(ڤاسیلتا)کەرۆژهەلاٌتناسێکی رِوسیەو پسپۆرِەلەکوردناسیدادەلێ: (کوردپالەوانن، ملیان نەداوەبۆدژەکانیان،بەلاٌم کاتێ ئیسلام هات باوەشیان بۆکردەوەوتەسلیم بون چونکە لەبەرژەوەندیان بووچون پێشترلەژێرستەمی فارس ورِۆمەکانداچەوساوەبون)ئەوەشایەتی رِۆژ هەلاٌتناسێکە کەنەکوردەونەموسلٌمانە،جگەلەدەیان بەلگەی تری مێژویی،لە بەردرێژی باسەکەنەمان نوسین. ئەوەحالٌی کوردبوە لەپێش ئسلام،وەدوای نەمانی حوکمی ئیسلامیش هەمووەدەزانین کەلەرِێکەوتنامەی(سایکس بیکۆی سالٌی/ ٩١٦)چۆن کوردستانی گەورەیان دابەش کردوەك گۆشتی خێربەسەرفارس وعەرەب وتورکدابۆئەوەی هەرلەکێشەدا بمێننەوە، خۆئەوە ئیسلام وای نەکردووەمەگەرئەوانە عەلمانی نەبون؟،لەسەردەمی فەرمان رِەوایەتی ئیسلام دا کوردخاوەنی دەیان میرنشینی سەربەخۆبون وەك(بابان وسۆران ئەردەلاٌن و. .. هتد) تەنانەت ئەودیکۆمێنتەی کەمام جەلال سالٌی(٢٠٠٥)بەرزی کردەوە لەمەجلیسی حوکم بۆسەلماندنی کوردستانی بونی کەرکوك هی سەردەمی عوسمانیەکان بوو،وەئێستاش کەدەبینین حکومەتی حیزبی وگەندەلٌی و قەیرانەکان لەزیاد بوندان وسالٌێ بۆسالٌێ خۆزگە بەپارە،جگە لەو هەموو خوێن رِشتنەی کورد بەدەستی کورد،هەمووی بەرهەمی سیستمی سیکۆلارە، لە لایەکی تریشەوە کەدەلێن ئاین وزانست دژی یەکترن‌لبۆیەئێمە دواکەو تووین ،ئەوەیش لە نەزانیەونازانێ کەنازانن،چونکەیەکەم ئایەتی قورئان کە دابەزیوە فەرمان دەکاتبەخوێندن(اقرا...) وشەی عیلم(٣٤٥)جارلەقورئاندا دووبارە بۆتەوە جگەلەدەیان ئایەت وفەرموودە،وەك دەبینی پەیامبەری پێشەوا مان(ﷺ) فەرموویەتی(طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) واتە: داوا کردنی زانست وزانیاری پێویستە لەسەر هەمووموسلٌمانێکی نێرومێ، بێ جیاوازی. بەلاٌم کە لەسەدەکانی (١٦و١٧)دا ئاینی شێوێنراوی مەسیحی دژایەتی زانست دەکات بۆبەرژەوەندی پیاوانی کەنیسە،زانایەکی وەك (گالیلۆ)کەرِاستیەکی زانستی دەرخست بودژایەتیان کرد،ناچارخەلکی لێیان رِاپەرِین کەمافی خۆشیان بو، ئەوەچ پەیوەندی بەئیسلامەوەیە،ئەوان ئەوکاتە ئەورِووداوەیان کردە

سەر چاوەی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ،ئەوانە بەدەردی ئەوکەسە چوون(دەمی بەشیر سوتابووفووی لەماستاوێ دەکرد) چونکە هەردووکیان سپین!،سەبارەت بەوەش کەدەڵێن: ئیسلام کەلتوری عەرەبە،ئەمەیان کاریگەری شۆڤێنیەتی قەومیە وادەکات ڕقت لەگەلانی بەرانبەربێت،ئێمە عەرەبی بەعسی عەلمانی ستەمی لێکردووین ناکرێ ڕقمان لەعەرەبی هەڵگری پەیامی ئیسلامی بێت کەپێشتررزگاریان کردووین وقەزای دیزەلەگۆزەبستێنین وەك ئاغاکەی پشدەر بڵێین( پۆلیس هەرپۆلیسە)، لە باسی(عەرەبی دوێنێ وئەمرۆ)دا ڕونمانکردۆتەوە خۆلەقورئاندا هیچ گوتارێکی تێدا نیەکەتایبەت بێت بۆعەرەب، بەڵکو بانگی کردبە:(یاالذین امنوا ....، یاایها الناس...)واتەئەی خەڵکینە یان ئەی بڕوا دارینە،وەلەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە فەرموویەتی:( عەرەب گەورەترنیەلە عەجەم وسپی پێست فەزڵی نیە بەسە ڕەش پێستامەگەربەتەقوانەبێت،ئەم ئایەتەش وەڵامگۆی هەموو ئەو بۆچونەلاروخوارانە یەکە دەفەرموێت( ان اکرمکم عندالله اتقاکم. واتە: بەڕێزترینتان لای خوا ئەوکەسەیەکەتەقوای هەبێ جاهەرگەلێك بێت، ئەوەتا دەبینی پێشترعەرەب بەم دینەگەورەبوون بەڵام کەلایاندابۆعەلمانیەت بچوك بوونەوە پارچە پارچە بوون وەك ئێستا،پاشان تورکەکان نزیکەی حەوت سەدەبەم دینەگەورەبوون ودەستیان بەسەر دنیاداگرت،بەڵام دوای کەدەستیان لێ بەردابچوك بوونەوە، ئەم دینەسروشتی وایە هەرکەس وگەل وکۆمەڵێك لە باوەشی بگرێت پێی گەورەدەبێت،وەبەپێچەوانەیشەوە. ئەوە چەند ڕاستیەکی مێژوویی کەم بوو وەك مشتێ لەخەرمانێ کەئیسلام ئاینی سەرجەم گەلانەو لەسەرینەمای زانست وزانیاری دامەزراوەوبۆهەمووسەردەمێ گونجاوە.جێی خۆیەتی گلەیی بکرێ لەموسڵمانان بەگشتی ئیسلامیەکان بەتایبەتی کەبۆ چی کەمتەرخەمن پابەند نین بەکردەوەئیسلام پراکتیك ناکەن،بەڵام تائێستا نەتوانراوەڕەخنەی بابەتی وزانستی لەئیسلام بگیرێ چونکە ئیسلام زۆرلەوە گەورەترە، هەر چەندەلێرەولەوێ بەگومانی خۆیان کتێب دەنوسن وڕەخنە لە قورئان دەگرن بەڵام لەڕووی زانستیەوەکارەکەیان بلقی سەرئاوەو پوچەڵ

کراوەتـەوە، ئـەو کوشـتاروتیرۆرەیش کەبـەناوی نایـنـەوە ئـەنجام دەدریٚ دوورە لەدین،ئـسلام حەزبەخویٚن ڕشتن ناکات مەگەر بەناچاری ،ئەوەتالەشەڕی ناو خۆی مەزهەبەکانی مەسیحی لەسەدەکانی ناوەڕاست لەئـەوروپا(٤٠./.) ی خەڵکەکـەیان کوشـت!بـەلاٚم لـە(٧٠)جـەنگی سەردەمی پیٚغەمبەر(ﷺ) بـە هـەردوولایان(٣٨٦)کـەس کوژراوە،ئەوتاوانانـەش کەبـەناوی دینـەوەدەکریٚ وەك کارەکـانی بەعـسی سیکۆلارەکەشەڕوسـتەمەکانی بـەناوی ئیـسلامەوە دەکردوخزمەت گوزاریەکانی شی بەناوی خۆیەوەئەنجام دەدا،لەهـەمان کاتـدا خـۆی هـاواری دەکرد بەدروشمی(حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی ) ، بیٚگومان پـلان وپیلانـی ڕژیٚمـە سیکۆلارەکان هەمویان یەك میتـۆدن بـەلاٚم بـە دەنـگ وڕەنگـی جیـاواز، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەندیٚك بەناو ڕۆشنبیری لای خۆمان ئیسلامیان بەبەعسی عەفلـەقی تۆمـەتباردەکرد !لـەوە زیاتر دریٚژە بەو باسە نادەم چونکەوتراوە:(ئەوکەسەکەسە ئەلفیٚکی بەسە)لە کۆتاییدا:

میٚژوودیارە درشت و ورد .......... تاشنای یەکن ئیسلام وکورد.

---

(کاتی خۆی لەڕۆژنامەی هەواڵ ژمارە کانی(٢٣٥،٢٣٣،٢٣٢ )بەدریٚژی لەچەندئاڵقەیەکدا بلاٚوم کردبۆوە)چەندکەسیٚکیش لەعەلمانیەچەپەکان وەلاٚمی نەزانی ونابەجیٚیان دایەوە.

# جیاوازیەکان بۆ گەشەی ژیانن.... بەدژی خۆتانی مەزانن

ئەگەرهەمووومان وەکویەك بیرکەینەوە کەواتەبیرناکەینەوە،ئەگەر هەموو مان یەك ڕەنگ بین یان وەکویەك زیرەك بین یان هەمووومان حەزمان لە یەك خواردن بێ ئەوەژیان هیچ مانایەکی نابێ،کاتێ قەدری زیرەکی دەزانی کەخەڵکانێ لەتۆ تەمبەڵ ترهەبوو ، کاتێ چێژی خواردنە کەدەزانی کەخواردنی ناخۆش ترهەبێ،بەهەمان شێوەش جیاوازی بیرکردنەوە ململانێ وپێشکەوتن دروست دەکات تۆکەمێشکت پرۆگرام سازکرابێت لە سەربۆچونێك وتەنها خۆت بەڕاست دەزانی وبەرامبەرەکەت نەخوێنیەوە! ئەوکات کێشەوکاردانەوە وتوندوتیژی دروست دەبێ،کە دەڵێن(تَطرف) واتە:( تەرەفێك)لایەکی گرتووە جاچەندخۆشەکە ناوەڕاستی بگرتایە نەك ئەو سەری (ئەمسەرونەوسەرهەردووخەتەرە..میان ڕەوی چاکەبەڵگەی لەسەرە) دیارەهەرکەسەبەشێکی ڕاستی لەلایە بەلآم مەرج نییە هەموو ڕاستیەکان لای ئەوبن، وەك(مەولانا)فەرموویەتی:حەقیقەت ئاوێنەیەکی گەورەبوو بەر بۆوەووردوپارچە پارچە بووهە کەسەی پارچەیەکی بەرکەوت، پێویستە سودلەشتەچاکەکانی یەکتر وەربگرین (وفی کل خیر)لێکۆڵینەوە گفتوگۆ بکەین ولەیەکتربگەین لەپێناوگەیشتن بەڕاسترین وتەواوترین، دەکرێت بیروڕامان جیاوازبێت وبرایەتیش بپارێزین ولەسەر خاڵەهاوبەشە کان کاربکەین،لەبەرنەوەڕێزی بەرامبەربگرەو بیخوێنەوەچونکە هەموومان بەیەکەوە بەستراوین ولەیەك کەشتی ژیانداین،تەنانەت لەبواری شەریعە تیش دادەبینی کە (ابویوسف ومحمد) دووزانای مجتهدن لەمەزەبی پێشەواحەنەفیداو هەندێ لەبۆچونەکانیان پێچەوانەی مامۆستاکەیان بووە،کاتێ لەوبارەوەپرسیاریان لێکرا، فەرمویان جیاوازیە کەمان هی سەردەم ورۆژگارەنەك ڕاستی وناڕاستی بەڵگەکان(اختلاف عصرٍوزمان ولیس اختلاف حجةوبرهان)،وەهەروەها(نووی)زانای بەناو بانگی مەزەبی پێشەوا شافعی دوای هێنانی قسەی پێشەواکەی بۆچونی خۆیشی دەڵێت وپاشان دەفەرموێت:

من دەڵێم ڕاسترین ئەوەیە(قلت الاصح)، بۆ نمونە دوعای نوێژدابەستن،بەچەند شێوە هاتوە(ان صلاتی ونسکی...،یان باعد بینی وبین خگایای...،یان سبحانك اللهم وبحمدك. ..) هەمویان ڕاستن و دەتوانی هەرجارەیەکیان بڵێی، ناکرێ بڵێی تەنهائەوەی من ڕاستە، بەداخەوەهەندێ لەموسڵمانان بەهۆی لە یەکنەگەیشتن وخراپ حاڵی بون لەسەرهەندێ مەسەلەجیاوازیەکانیان کردوەتە جیابونەوە لبا فێرخوازو زانایان بەشوێن بەڵگەکاندا بگەڕێن وڕیزبۆ بەرانبەریشیان دابنێن ، جەماوەرەکەش دەبێ (تابع)شوێن کەوتەبێت، با جیاوازیەکان نەخرێنە ناوخەڵك وجەماوەرچونکەسەری لێدەرناکەن وپیان هەزم ناکرێ و زانایانیش لەیەکتردەگەن.﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ... (١١٨)هود

## سەرنج بدەوبڕوانە..لەجیاوازی ئەمانە..تێڕوانینی بەندە یەویۆهەموانە

*جیاوازن ئەوکەسانەی بەدوای شادمانیدا وێڵن وەئەوانەی شادمانی دروست دەکەن

* جیاوازن ئەوکەسانەی بەشوێن دنیادا ڕادەکەن دەستیان لێی گیرنابێ وە ئەوانەی دونیابەشوێنیاندا ڕادەکات ئاوڕی لێنادەنەوە!.

* جیاوازن ئەوانەی پارەوسامان دروستی کردوون وەئەوانەی پارەوسامان دروست دەکەن.

* جیاوازن ئەوانەی خودی خۆیان فرمێسك دەڕێژن وەئەوانەی فرمێسکی چاوانی دەسڕن.

* جیاوازن ئەوانەی تەنها لە پێناوی خۆیاندا دەژین وئەوانەی لەپێناو کەسانی تردادەژین

* جیاوازن ئەوانەی بۆمردن دەژین وە ئەوانەی دەمرن بۆژیان.

*جیاوازن ئەوانەی دەخۆن بۆئەوەی بژین،ئەوانەی دەژین بۆئەوەی بخۆن.

*جیاوازن ئەوانەی نرخیان لەجلو بەرگەکەیان کەمترە وەئەوانەی بە هەموو گەنجینەی دونیابەراورد ناکرێن .

*جیاوازن ئەوانەی دڵیان لەکونی دەرزی بچوکترە وئەوانەی دڵیان لەنەخشی جیهان فراوانترە.

*جیاوازن ئەوانەی ئامادەن لەپێناوی خۆیاندا جیهان بسوتێنن وەئەوانەی وەك مۆم دەسوتێن لەپێناوی مرۆڤایەتی دا.

* جیاوازن ئەوانەی هیچ شتێکیان نییە جگە لەپارە وە ئەوانەی هەموو شتێکیان هەیە تەنها پارە نەبێت.

*جیاوازن ئەوانەی ورگیان لەسەریان گەورەترە وەئەوانەی عەقڵیان لەهەموو لاشەیان گەورەترە.

*جیاوازن ئەوکەسانەی هەزاریان یەکسانە بە سفر وە ئەوانەی سفریان یەکسانە بەهەزار.

*جیاوازن ئەوکەسانەی بەشێکن لە نەخشەی کەسانی تروە ئەوانەی جیهان بەشێکە لە نەخشەکانیان.

*جیاوازن ئەوکەسانەی کەتەنها  بۆخۆشەویستی خۆیان دەژین وەئەوانەی لەپێناوی خۆشەویستی مرۆڤایەتیدا دەژین.

*جیاوازن ئەوکەسانەی وەفایان سنوری نییەو وەئەوانەیش وەفایان بۆخۆشەویستەکەشیان نیە!.

*جیاوازن ئەوانەی خۆشەویستی خۆیان لەکەسێك دادەبینن لەگەڵ ئەوانەی خۆشەویستی دەبەخشن بەهەمووکەسێ .

* جیاوازن ئەوانەی خەم ڕوێنن وئەوانەی خەم ڕەوێنن.

* جیاوازن ئەوانەی مەلان لەگەڵ ئەوانەی بەلآن!

* جیاوازن ئەوانەی شێخن لەگەڵ ئەوانەی مێخن!

* جیاوازن ئەوانەی دکتۆرن لەگەڵ ئەوانەی دیکۆرن

* جیاوازن ئەوانەی پڕۆفیسۆرن وئەوانەی پەڕۆ فیسۆرن.

* جیاوازن ئەوانەی فەیلەسوفن لەگەڵ ئەوانەی کە فەیلەفلوسن.

**دیمانەی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ قامیشیدا:**

**یەکەم: دەقی چاوپێکەوتنی گۆڤاری نێوەند:ژمارە(٧٠)مانگی/١٢ی ٢٠٠٩، سەبارەت بەکاری زانایانی ئاینی وئیسلامیەکان/ (دیمانەکوردۆ)**

**پ١/ بەردەوام مامۆستایانی ئاینی کوردستان ڕەخنە لەشتە بچوکەکان دەگرن وخۆیان سەرقاڵی هەندێك کێشەی لاوەکی کردووە، ئەمەش ڕەخنەیەکی بەردەوامە کە لەمەلاکانی کوردستان دەگیرێت.دەپرسم بۆ چی مەلائاینییەکان هێندەی خۆیان خەریکی کێشە لاوەکییەکان دەکەن،بۆبیرلەپرسە گرنگەکان ناکەنەوە وەك مەلای عەرەب؟.**

وەڵام: سەرقاڵبون بەشتی بچوكو لاوەکی تا شتی گەورە وەستابێت هەڵەیەوڕاکردنە لە ڕاستیەکان، بەڵام هەندێ شت بەلای خەڵکانێکەوە بچوکەولای خواگەورەیە(تحسبونه هیناً وهوعندالله عظیم)بەتایبەت لایەنی بیروباوڕو(ولاءوبراء) پاشان تۆسەیری بچوکی تاوانەکە مەکە بەڵکو سەیری گەورەیی ئەوکەسە بکەکە بێفەرمانی دەکەی،ئەوەمەلای کوردە لەسەر منبەرەکان خەڵکی ئاراستە دەکەن بەدەستودامێن پاکی دوورکەوتنەوەیان لەدرۆوخیانەت وگەندەڵی کەئەمرۆ ژیانیان لێ کردوین بەژان و پێیان دەڵێن دڵسۆزی گەلو نیشتمان بن دەنگ بدەن بەکوردستان ...،خۆ ئەگەرهاوڵاتیان چاکەکارو و شیاربن ئەوە پێش هەموان حکومەت سوودمەند دەبێتوبەندیخانەکان چۆڵ دەبنو ژیانو ژیاریان پێش دەکەوێت، لەبەر ئەوەیەکەشوێن کەوتوانی مەلا واتە ئەهلی مزگەوتونەوەشی بەراستی مەلایە تائیستا بازرگانیان بەگەلو نیشتمانەوە نەکردووە،لەکاتێکدا مەلای کوردستان پەراوێز کروان بەڵام مەلای عەرەب بەتایبەت مەلای شیعە دەسەڵاتدارو پارە دارنو خاوەنی مەرجەعنو لە پەرلەمانیاندا پریەتی لەمێزەربەسەرنەوانی تریش هاو سۆزیانن ،بۆیە بەراورد ناکرێن لەگەڵ مەلای ئێمەدا بەتایبەت لەرۆژگارێکی ماتریالستی وەك ئەمڕۆداکەهێزی دەسەڵاتو پارە کاریگەرترەلەشتەکانی تر،لەگەڵ ئەوەشدا شارستانی ئیسلامی شانازی دەکات بەزانایانی کوردکەڵەزانایانی وەك(ابن ئادەم، ابن خەلەکان و شارەزووری و ابن مستەوفی وبەدلیسیو

مەلای گەورەی کۆیەو ومەلا عبدالکریم مودرس‌و عەلی تەرەماخی)شاعیرەکانی شمان هەرلە مەلایەتیەوە پێ گەیشتوون کەبونە قوتابخانەی ئەدەبیاتی کوردی وەك( نالی و مەحوی و مەلای جەزیری‌و ئەحمەدی خانی و...هتد) وهەریەك لەمەلا مەحمودی بایزیدی ومەلا سەعیدی نورسی کوردستانی ئەو دوو زاتە بوون کەبەشێکی زۆری کەلتوری کوردیان لەفەوتان رزگار کرد،یەکەم زانای سیاسەت‌ویەرقەرار کەری بیرۆکەی فیدرالیلیەت لە نێوان میرنیشەنەکانی کورد عوسمانیەکاندامەولانا ئیدریسی بەدلیسی بوو،وسەرجەم سەرانی شۆرشەکانی کوردیش لەبنەماڵەی ئاینی بوون قازی ئاسا لەپێناو گەلەکەیاندا گیانی خۆیان بەخشی‌و هیچ کۆشك‌و تەلاروفایل‌و باخیان بەجێ نەهێشت چونکە لەخوادەترسان‌و خزمەتکردنی گەل‌و نیشتمانیان بەشێك بووە لە دینداریان کە هەرواشە،زۆر بەداخەوە کەعەقلی سیاسی دەسەلاتی کوردی گرنگی بە عەقلی مەعریفی زانایانی خۆی نادات بۆیە ئیستا ناتوانن رۆڵی سەرەکی ببینن سەرە رای ئەو هەموو‌گرفتانەش هەربەردەوامن ولەسەرجەم قەیرانەکان هەلوێستیان بووە،بەتایبەت پرسی نەتەوەیی چونکە ئێمە کێشەی نەتەوەیمان هەیە نەك کێشەی(جگەرە کێشان خەتەنەی ئافرت‌وکۆنسێرتی فلان وفیسار) .

**پ٢/ یەکێتی زانایانی ئاینیی کوردستان، وەك رێکخراوێك کەمەلاکانی کوردستان لەخۆ دەگرێت،رێکخراوێکی پاشکۆولاوازە وگوتارەکانیشی پابەندی گوتاری دەسەلاتە،پرسیار تاکەی ئەمەئەدای ئەورێکخراوەدەبێت؟پاشان کاری ئەم رێکخراوە فەتوای سەیروسەمەرەیە یان رێکخستنی کاروباری ئاینیی؟.**

وەلام: یەکیەتی زانیانرێکخراوێکی پاشکۆیەو رێنمایی کراوەلەجیاتی پێشەوایەتی وسەر مەشقی،رێکخراوێکی لاوازەودووچاری شەلل بووە هۆیەکەشی دەگەرێتەوە بۆدەستی حیزب لەولاتی ئێمەدا حیزب حکومەتەو وحکومەتیش حزبەو دەستی حیزب لەهەموو شتێك دایە کەخوزیاوانەبایە،بەئاواتەوەبووین کەحکومەتێکی کوردیمان بوایەیاسای شەرع تیا سەروەر بوایە،چونکە حیزب تەنها بیرلەبەرژەوەندی خۆی دەکاتەوەئێمەش وەك مەلابەرژەوەندی

گشتیمان گەرەکەکەبەختەوەربونی کوردستانەکەمانە، ڕێکخراوی زانایان لە هەوڵی بەستنی کۆنگرەدان بون بۆ چارەسەرکردنی ئەوگرفتانە،چونکە کەسێ بۆخۆی نەبێت ناتوانێت بۆدەور و بەری بێت(من لم یکن لنفسه فکیف یکون لغیره)ئەگەرکەوتنەوەکار ئەوانەرکی ئەو ڕێکخراوە ڕێکخستنی کاروباری ئاینیەودەبوایە مەرجەعی زانایانی کوردستان بوایە، سەبارەت بەفەتوای سەیروسەمەرەش ئەوەهەرگیزناتوانن فەتوای لەوجۆرەبدەن‌ونەشیان داوە چونکە لیژنەی فتواتا ئەندازەیەك سەربەخۆیە وفەتوای شەرعیش لەگیرفان دەرنایەت و زانای زۆربەرزوبەڕێزی تێدایە،کەسانێکش بەناوی دینەوە فەتوای سیاسی دەردەکەن شتێکی ترە، ئەگەر مەلامەلابێ خۆی نەفرۆشێ بۆدونیا،مهندس ومحامی ملکەچن لەبەر دەمیا.

**پ٣/ مەلا ئاینییەکانی کوردستان بەهەمان ڕوانگەی ئیسلامی سیاسیی بیردەکەنەوەو دەیانەوێ ئیسلام بکەنە بنەمای حکوم و فەرمانڕەوایی،دەگمەنن ئەومەلایانەی بەمشێوەیە بیرناکەنەوە،من پرسیار دەکەم ئایا ئیشی مەلا ئاینییەکان بانگەشەکردنە بۆگووتاری ئیسلامی سیاسیی یان بەڕێوەبردنی ئەرکی ئاینیی دیاریکراو؟.**

بەڵی ئەرکی مەلای ئاینی ڕاستەقینە گەیاندنی ڕاستیەکانی دینە،دەبێت هەوڵ بدات بۆئەوەی ئیسلام فەرمانڕەوابێت،چونکە مەلا کادروچاوساغی ئاینەو ئەو ئەرکی خۆی دەزانێ وبانگەشەی بۆدەکات نەك خەڵکی نەشارەزا لەدین ڕێگای بۆدیاری بکەن ونامۆژگاری بکەن‌!پەیامی ئاینیش هاتووە بۆ ڕێك خستن‌وبەڕێوەبردنی ژیانی مرۆڤەکان لەسەرجەم بوارەکاندا،نەك تەنها لایەنی عبادەت ئەوەتا زانایان ئاگادارن کە فیقهی ئیسلامی چواربەشەووسێ بەشی بۆڕێکخستنی کاروباری دنیایەکە بریتین لە(معاملات ) واتەیاسای شارستانی و (مناکحات)واتە یاسای باری کەسیەتی‌و(جنایات)کەیاسای سزادانەو(عیبادات) کەئەویش هەندێکی سوودی دنیای تێدایە،کەواتە( ٣/٤ )ی شەریعەتەکە پەراوێزکراوەئەو ڕەوتەی کە ئێستا لەکوردستاندابراوەو بانگەشەی بۆدەکرێت ڕۆشنبیری سۆفیگەریە لەجیاتی سونەگەری کەبەشێکی کەمی دینەو جەخت دەکاتەوە

لەسەر تەزکیەودنیا نەویستیو قەبروقیامەت بەوەش لەدنیا دوور دەکەونەوەو پرسی کوردیش چارەسەرنابێت لەکاتێکدا ئاین بۆبەرژەوەندی مرۆڤ هاتووە لەدنیاوقیامەت داوامان لێدەکات کە پیاوی دنیاو قیامەت بین (رجل الدنیا والآخرة)ودینی خوابەرپا بکەین بەڵام زانایانی غەیری کورد زیاتر لایەنی فیقهی هەڵبژاردوەوبۆیە سوودی لەئاین وەرگرتووە لەهەموو بوارێکەوە دەی با ئێمەش دوای ئەوهەموولادانەبابگەرێینەوەبۆ پراکتیزەکردنی سیستەمی ئیسلام بێ زیادو کەم کە دەرمانی هەموو دەردانە بەتایبەت بۆچارە سەر کردنی پرسە هەنوکەییەچارەنوسسازەکان ئیترئەوەیە ئەرکی ئاینی راستە قینەو لەوچوارچێوەیەشدا دەتوانین ئەوئیسلامەتیە گشتگیرەکار بێنین بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی بۆ رزگاری کوردستان بۆ گۆرانی ئیجابیو پێشکەوتنو داهێنان بەئالیەتو میکانزمی سەردەم وەك چۆن عەرەبو تورك وفاس رۆژگارێك لەرێگەی دینەوە سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنابو،بەڵام کاتێك لایاندا لەدین بۆ شۆڤنیەتو ناسیۆنالستی بچوك بوونەوەو پارچەپارچە بوون،چونکە ئاین مافی هەموو گەلێکی داوەوکەس لەکەس زیاترنیەتەنها بە تەقوا نەبێت ئەگەر پیادە بکرێت، خوای گەورە فەرموویەتی(..لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ.)حجرات/١١ واتە: هیچ گەل کۆمەڵێك بۆی نییە گاڵتە بەوی تربکات چونکە دەگونجێت گاڵتە پێکراو لەگاڵتەکەر چاکتربێت لای خوا،دەنگو رەنگو گەلو نەتەوەی جیاوازبەڵگەی گەورەیی خودان ئیرادەی خوایە(وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا..)ئەوە ویستی خوایە من کوردم ئەویش عەرەبو تورکە دژایەتی کردنی هەرگەل نەتەوەیەك پێچەوانەی شەریعەتو ئیرادەی خوایە، پارێزگاری لەگەلو نیشتمان لە هێرشی ستەمکاران بەشێکە لە دینداری،بەداخەوە کەسانێك وادەزانن کە کوردایەتیو ئیسلامەتی دژو پێچەوانەن!!! بەڵام کوردایەتی باوەڕدار بەشێکە لەدینداریەکەی جا دەوڵەت کە دینت لێ دارنی چی دەمینێتەوە؟ کێشەی نەتەوەیشمان کەهەیە بێ دینان دروستیان کردووە وکوردیان دابەش کردووە نەك دین، ئیسلام یەك ئیسلامە باس لەسەر جەم بوارەکانی ژیان

دەكات لە(جَره تا مَجَرة) چەمكی ئیسلامی سیاسیش لە دەرەوەكەهێنراوەبە نارەوا بەسەر دینی ئێمەدا سەپێنراوە كە لەدینی كەنیسەوەرگیراوەچونكە ئەوە( قیاس مع الفارق) قیاسی كەشك لە مەشكە بۆئیسلام ناشێت،پاشان ئیسلامیەكان شتی مەلایەكان دەڵێنەوە ودەبێت شوێن كەوتەی ئەوانیش بن گەربەڕاستی ئیسلامی بن نەك بە پێچەوانەوە چونكە مەلاو پەیامی مەلا پێشترلەگۆرەپانەكەدا بووە،مادام هەردوكیان بانگەشەی یەك دین دەكەن ئاساییە كەشتەكانیشیان یەك بێت.

**پ٤/ هەڵبژاردنی(٢٠٠٩/٧/٢٥)سەلماندی كە هێزە ئیسلامییەكان ئەڵتەرناتیڤی دەسەلات نین بەڵكو بەپێچەوانەوە زەمینەی كۆمەلایەتی كۆمەڵی كوردەواریی چیترلەبارنیەبۆگەشەی رەوتە ئیسلامییەكان، هۆكارەكانی گەشەنە كردن وپوكانەوەی رۆڵی ئیسلامی سیاسیی لە كوردستان بۆچی دەگەڕێتەوە؟.**

سەبارەت بە هۆكاری گەشە نەكردنو سست بوونی ئیسلامی سیاسی لە كوردستان،ئەگەر بوترێ حیزبە ئیسلامیەكان گونجاوترە لە ئیسلامی سیاسی وەك پێشتر ئاماژەم پێداچونكە بەش بەش كردنی ئیسلام پیلانەو تاوانە، ئسلامیەكانیش لەگەشە وەستاون بەلام نەپوكاونەتەوە ئەویش بەهۆی پەرتە وازەیی ولێكترازانیان وزاڵ بوونی گیانی حزبایەتی بەسەر گیانی برایەتی ئیمانیداپاشان كێشەو قەیرانی ئیسلامیەكانی كوردستان سەركردەكانیان بوون نەك جەماوەركەیان كە ئەویش دەستی زۆری لەپشت بووە،بێحیكمەت نییەكە خوای كەورە پێوستی كردووە لەسەرموسڵمان كە رۆژی لانیكەم(١٧) جاردەبێت بڵێت(اهدنا الصراط المستقيم)واتە خوایە رێنمونیمان بكە بۆرێكەی ڕاست،خۆهەموو كەس خۆی بەڕاست دەزانێت بەلام كامەیان ڕاستە؟بێگومان ڕاست ئەوەیە لای خوا ڕاست بێت چاك ئەوەیە لەتەرازوی خوادا چاك بێت، بەداخەوە خەڵكانێگ(نازانن كە نازانن) نازانن كە ئیسلام سەرجەم مافو ئازادیەكانی لەسنوری بەرژەوەندی مرۆڤدا دابین كردووەنەك تیرۆرو تۆقاندن ،مامۆستایانی ئاینی ڕاسەقینەش رێبەروپێشەوای موسڵمانانن، وەلامەكانیشم

تەنها بۆخستنە ڕووی ڕاستیەکانە نەك بۆدژایەتی ئەم و ئەو،لەکۆتاییدابە ئومێدی یەك ریزی سەرجەم چینوتوێژەکان لەپێناو بەرژەوەندی گەل ولآتمان کە ئەوەش تەنها بە ئیسلام بەرجەستە دەبێت، ژیانیش بە جیاوازیەکانەوە جوانەوبەڕێزو مافی بەرامبەرجوانتردەبێت،با هەرکەسەمان بە کردەوە بیسەلمێنینو بزانین کاممان دڵسۆزی خەڵك خاکین جا ئەگەر وامان کردئەو کاتە لەدنیایەشدا کارەکانمان سەر دەکرێت لە قیامەتیش بەردەگرێت،ئەی نا هەزارقسە بەقوربانی کردەوەیەك بیبێت .

دووەم: **دیمانەی گۆڤاری شەقام** /ژمارە (١٥٨)لە(٢٠١٠/٥/٢٠)،سەبارەت بە ئاستی موسڵمانان و فرەژنی وعەلمانیەت لەکوردستان :

**مامۆستایەکی پەیمانگای زانستە ئیسلامیەکان لە سلێمانی پێی وایە بلآوکردنەوەی کتێبی وەرگێردراوی ئایەتە شەیتانیەکان باگراوندێکی سیاسی و فیکری لە پشتە،ئاماژەش بەوە دەکات کەئەوئیسلامەتیەی لەم ڕۆژگارەدا ئەنجام دەدرێت بەشێکی کەمی ئەودینداریەیە کەخواوپێغەمبەرداوایان کردوە.**

**مامۆستامەلا ئەحمەدی قامیشی مامۆستایەکی پەیمانگای زانستە ئیسلامیەکان لەودیدارە تایبەتەی (شەقام)تیشك دەخاتەسەردیاردەی قەیرەیی لە ناوکچانی کورد وئەوپێشنیار دەکات کەقەیرەکچەکان ببنە ژنی دووەم.**

**شەقام: ئەوئیسلامەی کەئێمە ئەمڕۆ لەکوردستان ڕوکنەکانی ئەنجام ئەدەین،وە لە چەند ڕکاتێك نوێژوچەند ڕۆژێك ڕۆژوکورتمان کردووەتەوە،ئایا هەرئەوئیسلامەیەکەخواو پێغەمبەرەکەی لەموسڵمانانیان ئەوێت..؟**

م.مەلا ئەحمەدی قامیشی:سەرەتا بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان سوپاستان ئەکەم بۆ ئەم چاوپێکەوتنە بەونومێدەی وەلآمەکان ببنەمایەی بەرچاو ڕوونی وزیاترو بەئاگابون لە ڕاستیەکان،ئە ونیسلامە تیەی کە لەمڕۆژگارەدا ئەنجام دەدرێت بەشێکی کەمی ئەو

دینداریەیەکەخواوپێغەمبەر داوایان لێکردوین،چون ئیسلام دینێکی گشتگیروهەمەلایەنە وبەرنامەی ژیانە، دەیان سەدە فەرمانرەوایی کردووە بەتایبەت حوکمی خولەفای راشیدین، ئەوەی ئێستا ئەنجام دەدرێ تەنها بەندایەتی تاکە کەسیە(عیبادەتی شخصی)یەوسێ لەسەر چواری پەیامەکە پەراوێز خراوە،بەبەڵگەی ئەوەی کە لەکتێبەفقهیەکاندا شەریعەتی ئیسلام کراوە بەچواربەشی سەرەکی ئەوانیش(عیبادات ومناکحات ومعاملات وعقوبات) **مناکحات:** ئێستا پێی دەوترێت باری کەسێتی ومعاملات مەبەست پێ باری شارستانی **وعقوباتیش** سزادانە ولێپر سینەوەیە،دەبینین کەزیاتر لەسێ بەشی فەرامۆش کراوەکەباس لە بەڕێوە بردنی ژیانی دنیادەکەن وچ وەك دەق وتێکست ویان وەك پراکتیك سەلماوە کەئەم دینە بۆ بەڕێوەبردنی ژینە،نەك تەنها نوێژو ڕۆژوو پێنج ڕوکنە کانی ئیسلام،ئێمەش پێویستەلەسەرمان بەپێی ی توانا لەهەمووبوارەکانی ژیاندا کاربەسیستمی ئسلامی بکەین وبەتەواوی بچینە ناوئیسلامەوە(ادخلوا في السلم کافة..)چونکە دەبێ بەوشێوەپەیڕەوی بکەین وەك خوادەیەوێ نەك وەك خۆت دەتەوێ، بەداخەوە کە بە پیلانێکی لەمێژینەی پلان بڕدانراو ئیسلامیان وەك گۆشتی خێری بەش بەش کردووە و بۆ ڕەزامەندی زلهێزەکان ئیسلامێکی چاولێکەری وڕوکەش پەیڕەودەکرێ!

**شەقام: هۆکاری چییە کە موسڵمانان ئەمڕۆ بەساردی دەبینرێن بەرامبەر بە دین وبەزۆری شوێن بەرژەوەندی ودونیا کەوتوون..؟**

م. مەلا ئەحمەدی قامیشی:من وای دەبینم کەموسڵمانان لەچاوخەڵکانی تر لە هەمووئایدیاکان گەرم وگوڕترو پابەندترن بەدینەکەیانەوە،ئەوساردی کەم تەرخەمیەش کە دەبینرێ بۆدووهۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:

یەکەم/ بەهەڵە تێگەیشتن لەدین، هەندێ جارئەم دینە لەخەڵکی نەخوێندەوار وەرگیراوە لەبەرگی دیندا لهەربۆیە پەروەردەی خراپ ولاروخوار موسڵمانی لاروخواری لێدەردەچێ،

دووەم/ دەسەڵات ودەستی دەرەکی وای کردووە کەموسڵمانان هەست بەترس بکەن نەتوانن

وەك پێویست پابەندبن بە دینەکەیانەوە وبکەونەبەرشەپۆلی(ماتریالیستی)وماددەگ. ڕایی وخۆشەویستی دنیاومادده زاڵبوە بەسەر لایەنی ڕۆحی وئیمانی دا،ئەوەش وەك معجیزەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)لەفەرمودەیەکی دا ئاماژەی بەوحاڵەتەکردووە (الوهن) خۆشەویستی دونیاو ڕق بونەوە لەمردن.

**شەقام: لایەنە ئیسلامییەکان لە چ ئاستێکدان..؟ وەئایا لایەنە ئیسلامییەکان بوونەتە پەرژینێك بۆپاراستنی دەستکەوتەکانی موسڵمانان،یان ئیسلام بۆ مەرام وئارەزووی خۆیان بەکاردەهێنن..؟**

م. مەلا ئەحمەدی قامیشی:وێڕای سەرنج و تێبینی وکەم وکورتی،لایەنە ئیسلامیەکانی کوردستان لەئاستێکی باشدا دەبینم،هەڵبژاردنەکانی ئەمجارە ڕاستی بۆچونەکەم دەسەلمێنێ سەرەڕای ئەو هەڵە سیاسیەی کردیان بەوەی کەئامادەبون لەگەڵ عەلمانیەکان دابەزن،بەلام ئامادە نەبون لەسەرئەوەی لەگەڵ برایانی خۆیان بەیەك لیست دابەزینایە ئەگەرهەمویان لەیەك لیستدا بونایەئەوکاتە دەردەکەوت خۆری کێ لەئاوابوندایە،لەگەڵ ئەوەشدا کە دەسەلاتدارنەبوون و دژایەتیان زۆرکراوە بەلام خزمەتی بەرچاویان بووە لە قەدەرخۆیان بەتایبەت لەبواری پەروەردەو بانگەوازی ئیسلامیدا، ئەوهەموو گەنج ولاوە کەپابەندی ئاینن بەرهەمی ڕابوونی ئیسلامیە.دیارە بەهۆی موسڵمانیەتی کوردەوەیەکەخەلکی لەدەوریانن بۆیە دەخوازین ئەوانیش وەفاداربن بۆئیسلام و حیزب بکەنە خزمەتکاری ئیسلام نەك بەپێچەوانەوە، ئەگەرئیسلام لەپێناوحیزبدابێ ئەوە جێگەی گومانە وخەتەرە ڕەنجی بێبەرە، دیارە کەم وزۆرئیسلام بەکارهێنراوە بۆمەرامی حیزبی،چون هەمووئەوە دەزانین کە پەتای بەحیزبی بوون سەرجەم کایەکانی گرتبۆوە هەرچەندە ئێستا بەرەوکاڵبونەوەیە،بەشێوەیەکی گشتی ئیسلامیەکانی کوردستان زیاتر جێگەی متمانەی خەلکی کوردستانن

**شەقام:بەشێوەیەکی گشتی عەلمانییەت لەکوردستان سەری هەڵداوەوگەشەی سەندووە، هۆکاری ئەوسەرهەڵدان وگەشەسەندنە بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

م. مەلا ئەحمەدی قامیشی:دیارە مێژووی عەلمانیەت کۆنەودەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی زانستی فەرەنسا(ڕێسانس)بەلاّم لەولاّتانی ئیسلامی لەدوای (١٩٢٤) وەسەری هەڵداوە بەپێی هەل ومەرجەکانی سەردەم کاری بۆکراوە، کوردستانیش وەك زۆربەی ولاّتانی دونیا عەلمانیەت حوکمی دەکا هەرچەندە بەلای زۆرینەی کۆمەڵگاوە نامۆیەونەگونجاوە بەلاّم بەهۆی زاڵبوونی دەسەلاّتی ڕۆژئاواوە سەپێنراوە بۆیە دەبینین کەعەلمانیەت بۆتە سیستمی باوی سەردەم ودەسەلاّتەکانیش لە پێناوبەرژەوەندیەکانی خۆیانداپەیڕەوی لێدەکەن بۆئەوەی لەدەرەوە پیشتگیریان لێبکرێ وبمێننەوە .

**شەقام: پرۆسەی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت بۆچی دەگەڕێتەوە، وە عەلمانییەت بۆچی ئەم هەوڵە ئەدات..؟**

م. ئەحمەدی قامیشی: بۆ وەلاّمی ئەو پرسیارە دەبێ عەلمانیەت بناسین و هەڵوێستەیەك بکەین لەسەرپێناسەی عەلمانیەت ئەوکات وەلامەکەیشی تیایدا ڕوون دەبێتەوە:وشەی عەلمانیەت تەرجەمەی سیکۆلاریزمی ئینگلیزییەو لائیکی فەرەنسیە کەبەمانای (دنیاپەرستی ودنیا گەرایی جیاکردنەوەی دین لەژین) دێت بەشێك ومەبەستێکی عەلمانیەت بریتیە لە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت کەئەوەش پەراوێز خستنی دینە لەکاروباری ئەم ژینە، بەپاساوی پیرۆزی دین و ڕێزدانان بۆدین بێ ڕێزی دەکەن لەژیان دایدەبڕن! وەلەلایەکی تریشەوە هەندێ کەس بەوە فریودراون کەعەلمانیەت لەعیلمەوە هاتووە کە هیچ پەیوەندی بەعیلمەوە نیە چونکە وشەی زانست لەزمانی ئینگلیزیدا (science )ساینس،ئەوەش تەنها بۆئەوەیە کەمانایەکی بریقەدارو فریو دەری بۆپەیدابکەن، چونکەئەگەربەماناڕاستەقینەکەی خۆی تەرجەمە بکرێ و بناسێنرێ لەناومیللەتێکی موسڵماندا بەوشێوەیە جێگەی نابێتەوە،لە پێناسە کەدا وەلاّمەکە

دەرکەوت کەبەبۆچوونی ئەوان هەردەبێ ئەوکارە بکەن ودین جیا بکەنەوەلەدەوڵەت لەلام لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوەئەویش ئەوەیەکە: دەوڵەتێك کە یاسا ورەوشتەکانی دینت لێ دارنی دەوڵەتی بێ دین چی لێ چاوەڕوان دەکرێ؟ جگەلەوەی کە ئێستادەبینی ودەبیستی لەکوشتارو پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ وخیانەت وگەندەڵی وقری وبڕی و...هتد، جیا بکەنەوەی دین لەدەوڵەت پەیوەندی بەئیسلامەوەنیەوکێشەی ئەوروپابوە و بەسەرئێمەی دا دەسەپێنن! ئەو شەرەما پێدەفرۆشن.

**شەقام: بلاوکردنەوەی وەرگێڕاوی کتێبی ئایەتە شەیتانییەکانی سەلمان ڕوشدی،کەپڕاو پڕە لەدژایەتی کردنی ئیسلام وپێغەمبەرەکەی، هۆکاری بلاوکردنەوەی ئەمەبۆچی ئەگەڕێتەوە؟ ئایا بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە لەبەرژەوەندی کێدایە؟ وە سوودبە چ لایەنێك دەگەیەنێت..؟**

م. ئەحمەدی قامیشی:بلاوکردنەوەی کتێبێکی لەوجۆرە کەنامۆیەودژ بەسەر جەم نەریتەکانی کوردە بۆخزمەتی نەیارانی کوردەو بۆسەرقالکردنی خەلکی موسلمانە بۆئەوەی بێ ئاگایان بکەن لەپرسە چارەنوسسازەکان،کتێبێك کە لەسەرجەم ولاتانی موسلماندا ڕەفزکراوەو هەلوێستی لەسەر وەرگیراوەدوای چەندین سال جارێکی تربیوروژێننەوە بەئاشکرا دیارە کەباگراوندێکی سیاسی وفیکری لە پشتە،موسلمانانیش کەدلنیان لەڕاستی ئایینەکەیان لەوجۆرە قەلەمانەو لەوهەلە ئەزۆکانە ناترسن و زۆرلەوە گەورەترن .

**شەقام: لەکاتێکدا لەعێراق وەکوردستانیش وەك بەشێك لەعێراق قەیرەیی زۆر لەناو کچاندا هەیە،بۆچی حوکمەتی هەرێم لەماوەی ڕابردوولە ئێستاشدا هەولی قەدەغەکردنی فرەژنی دا؟بۆ نەهێشتن وقەدەغەکردنی فرە ژنی مافی ژنان،یا پێشێل کردن و دژایەتی کردنی یاساکانی ئیسلام پێشچاو گیراوە..؟**

م. ئەحمەدی قامیشی:ئیسلام ڕێگەی داوە بەفرەژنی بەمەرجی عەدالەت، بەلام بەپێویستی نەگێڕاوە دیارە ئەوەش بۆ چارەسەری بەشێك لەکێشەکانی کۆمەلگاوکەسانی خاوەن هەست ونەست لەحیکمەتی ئەوکارە تێدەگەن و خەلکانی تریش بەچاوی گومانەوە سەیری دەکەن

وەك ئەونەخۆشەی ئاو لە دەمی داتالّەو نازانیّ خەتای ئاوەکە نییەوخۆی نەخۆشە بۆیە هەولّی قەدەغە کردن دەدەن جا هەندیّ لەوحیکمەتانەبەنمونە:

١)بۆپاراستنی ئەوانەی کەبەخێزانێك دابین نابن ئەوەچاکترە لە دامێن پیسی

٢) بۆپاراستنی ئابڕوی ئافرەتان تانەبنە بوکەشوشەی کەسانی ئارەزوباز، ئافرەت ئەگەرلە پەرژینی هاوسەریدابێ ومنالّی خۆی بگرێتە باوەش باشترە لەوەی کەلەبارێکی نائاسایی دەرونیدا بژیەت .

٣)هەندیّ ئافرەت نەخۆشەوناتوانیّ مافی پیاوەکەی بدات لێرەدا پیاوەکە ئەگەرئەودەرگایەی لێداخرا ئەوا دوچاری دامێن پیسی وحەرام دەبیّ .

٤) هەندێك لەئافرەتان نەزۆکن ومنالّیان نابیّ،چارەسەرچیە ئەگەرژنی دووەم نەهێنیّ ورێگری لێکرانەوەهی یەکەم تەلاّق دەدات بۆئەوەی یەکیّ تربێنیّ و بەوەش رێژەی تەلاّق زیاتردەبێت.

٥) زۆربونی رێژەی ئافرەتان ودیاردەی قەیرەیی،دیارەئەوانیش ئارەزویان هەیەو ئەگەربنبنە ژنی دووەم زۆرباشترەلەوەی دووچاری خراپەکاری وبیّ دوا رۆژو بیّ سەرەنجام بژین ...

جائەوانەی کەبەیەکجاری فرەژنی رەتدەکەنەوە بەرژەوەندی گشتی کۆمەلّ گایان لەبەرچاونەگرتووەتەنهابۆچون وئارەزوی خۆیان دەسەپێنن،جگەلەوەی کەپێچەوانەی ئایەتی قورئانە بەلاّم بابێین کارەکە رێك بخەین ومەرجی توندو تۆلّی بۆدابنێین ونەریتەخراپەکانی لابەرین لەپێناو بەختەوەری کۆمەلگاو پاراستنی مافی ئافرەتان بەتایبەتی لەم رۆژگارەداکەرێژەی ئافرەتان و قەیرەیی وبێوەژن زۆرە،ئەوانەی کەقەدەغەی فرەیی دەکەن بەدیلیان چیە بۆ چارەسەری حەزوئارەزوەکانی ئەوهەموو قەیرەو بێوەژن ورێژەزۆری ئافرەتان؟ئاياقبولّی دەکەن بۆکەس وکاری خۆیان بکەونە شوێن حەرام ودامێن پیسی؟ بێگومان نەخێر .

**سێیەم: دیمانەی گۆڤاری چاوگ ژ.(١٥)ی ٢٠١٠،لەسەرگەندەڵیەکانی ناومزگەوت:**

**وەزارەتی ئەوقاف بەرپرسیارەلەگەندەڵی وناپاکی مزگەوتەکان.....**

**خەڵکانێکیان بەمەبەست لەمزگەوتەکان داناوە کە خەڵکانێکی گەندەڵن**

بەپێی دوایین ئاماری وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئاینی لەئێستادازیاترلە (٤٥٥٩) مزگەوت لە هەرێمی کوردستان بونیان هەیەو(٢٨٠٠)وتاری هەینی هەیە، تەنها لەماوەی دەست بەکار بونی وەزیری ئەوقاف لەکابینەی شەشەمی حکومەتی هەرێمی کورستان (٤٧٠)مزگەوت کراونەتەوە،ژمارەی مزگەوتەکان لەسایەی خێرخوازانەوە رۆژبەرۆژلەزیادبوندان،بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەو زیادبوونە بەشێکی زۆرلە مزگەوتەکان رووبەروی پرسی گەندەڵی بونەتەوە،بەهۆی کەمترخەمی کارمەندانی ئەوقاف وموچەخۆرانی سەرمزگەوت،ئەمەش جۆرێك لەنیگەرانی لەلای هاولاتیانی کوردستان و مامۆستایانی ئاینی دروست کردووە.

م.مەلائەحمدی قامیشی ووتارخوینی مزگەوتی گەورەی هەواری شار لە سلێمانی دەڵێت: پێی وایەکە ئەوکەسانەی موچە لەسەرمزگەوتەکان وەردەگرن ودەوام ناکەن،لەروی شەرعەوە پارەکەیان حەرامە (هەرکەسێك موچەیەك وەربگرێت لەدام ودەزگایەك لەهەموشیان پیرۆز ترکەمزگەوتەوبەڵام دەوام نەکات یان غەش لەدەوامەکەیدا بکات،ئەوە بەرنەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوێت کەدەفەرموێ:(من غشنافلیس منا..)هەرکەسێك غەش بکات لەئێمە نیە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)لەبارەی هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی دەفەرموێ: (کلکم راع وکلکم مَسؤل عن رعیتهِ..)هەموتان شوان وبەرپرسیارن لەسەرئەوەی کەلەژێر دەستاندایە،بۆیەئەوانەی ئەمانەت ناپارێزن مانای وایە دینیان لاوازە،بەپشت بەستن بەفەرمودەی پیغەمبەر(ﷺ)کەدەفەرموێ(هەرکەسێك ئەمانەتی نەپاراست مانای وایە دینەکەی نەپاراست)مەسەلەی موچەخۆری بەرپرسیاریەتیە،چونکە بەرپرسیاریەتی جۆری

زۆره،وەك بەرپرسیاریەتی بەرامبەربەتاكەكانی كۆمەڵ،بەرپرسیاریەتی بەرامبەربە خیزان ، ئەوەی مەبەستی ئێمەیە بەرپرسیارێتی پیشەییە،كەنابێت خیانەت لەپیشەدا بكریت".

لەبارەی رووبەروبونەوەی دام ودەزگاكان بەگەندەڵی بەتایبەت مزگەوتەكان ئەوماموستا ئاینیە دەڵێت:(لەو رۆژگارەی ئێمەی تیادا دەژین، رۆژگاری ماددەگەراییە، تەنهابیرلە بەرژەوەندی ماددی دەكرێتەوە،ئەوگەندەڵیەولاتی لێوان لێوكردووە،تاشوێنە پیرۆزەكانیشی گرتۆتەوە،بەلام ئاوەكەلەسەرچاوە كەوەلێڵە،بۆیە پێوستەدام ودەزگاكان لێ پێچینەوەیان لەگەڵدابكرێت،دەبێت لەحكومەتدایاسا سەروەربێت،بۆئەوەی ئەو گەندەڵیە كەم بكریتەوە).

مەلا ئەحمدی ووتارخوێن پێشی وایە"تائەندازەیەكی بەرچاوگەندەڵی لە مزگەوتەكاندا دەبینرێت،چونكەخەڵكانێكیان بە مەبەست لەمزگەوتەكان داناوە،كەخەڵكانێكی گەندەڵن،بۆمەبەستی گەندەڵی داندراون، بۆمەبەستی حیزبی داندراون،چونكە ئەمرۆ دنیای سیاسەت هەمووشتەكانی گرتۆتەوە، زیاترلەوەوە سەرچاوەی گرتووە،چونكە هەركەسێك لە خوا بترسێت دوور دەبێت لەناپاكی وگەندەڵی،هەركەسێك لەگەڵ خوا راست بێت لەگەڵ نیشتمان وحكومەتەكەی راست دەبێت،من وای دەبینم خەڵكانێكی ناپاك لەمزگەوتەكان داندراون بۆئەوەی گەندەڵیەكە زیاتر بێت" هەروەهاقامیشی وەزارەت بە بەرپرس دەزانێت ودەڵێت(لەپێش هەموو شتیكەوە وەزارەتی ئەوقاف وكاروباری ئاینی بەرپرسیارەلە گەندەڵی وناپاكی مزگەوتەكان،دیارە وەزارەتی ئەوقافیش دەسەلاتەكانی سنوردارن، زۆر جار دەڵێن ئێمە هەرئەوەندەمان لەدەسەلاتدایە،لەسەروی ئەوانیشەوە حكومەت بەرپرسە بەلام مەسەلەی مزگەوتەكان تایبەتەبەوەزارەتی ئەوقاف)،

بەرێوەبەری راگەیاندنی وەزارەتی ئەوقاف لەبارەی چارەسەری گەندەڵی دەڵێت "هەوڵی زۆردراوە،چەندین گوشارخراوەتە سەربەرێوەبەرایەتیەكان وماموستای مزگەوتەكان، تاكوناچاریان بكەن ئەو كەسانەی لەسەر مزگەوت موچە وەردەگرن دەوام بكەن.

## پێشەکی: بەرگی چوارەم (ئافرەتانی خۆرئاوابەرەوکوێ؟)

بسم الله والحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه ..وبعد:

بێگومان ئەوئیسلامەی کەخوا بۆی ناردوین مافی هەموو مرۆڤەکانی تێدایە بێ جیاوازی بەتایبەت مافی ئافرەتان کەنیوەی کۆمەڵن ونیوەکەی تریش لەباوەشی ئەواندا پەروەردە دەبێت وپێدەگات، بەداخەوە کەخەڵکانێکی بێ ئاگا لەدین و لەژین! لێرەو لەوێ تەپڵی ئەوە دەکوتن کە ئافرەت لەژێر سایەی ئیسلامدا ستەم لێکراوو بەشخوراوە ! ئازادوسەربەست نین! وانیشان ئەدەن کەئازادی ومافەکانی ژن لەئەمریکاوئەوروپایە! وەکە سانی ئارەزوبازوهەلپەرست لای خۆمان بەودروشمەبێ ناوەرۆکانە بازاڕی خۆیان گەرمکردووە وە زۆرلەئافرەتانیان خڵەتاندووە ،وافێرکراون کەئازادی و سەربەستی ومافەکانیان تەنهالە سفوری وبێ بەند وباری دایە!جا بۆڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتەکان ودەرخستنی هەندێ لە ڕاستییەکان،مەبەستم لەم نوسینەدڵسۆزی و پەرۆشیە بۆئافرەتان، سەبارەت بەژیان و گوزەرانی ئافرەتانی خۆرئاواکەچۆن لەژێرسایەی دروشمەبریقەدارەکانی ئازادی وسەربەستیدا سەرگەردان بون و دەچەوسێنرێنەوە بەپێی ڕاگەیاندن وسەر ژمێری ساڵانە وئیعترافاتی پۆلیس وزاناو دانایانی خۆیان،بەڵگەکانیان دەدوێن ولەسەرچاوەکانی خۆیانەوە زانیاریەکانم بۆنەقڵ کردوون، هیچ شتێکم بێ بەڵگە نەنوسیوە وئاماژەم بە سەرچاوەکان کردووەلەگۆڤار ورۆژنامەکانیان جائەوەی ژیروخاوەنی هۆشە..دەزانێ تەنیادروشمی بۆشە..دەنگی دەهۆڵەو لەدوری خۆشە.. ئەوەی کەبوو بە هاندەرو هەوێن بۆنوسینی ئەم کتێبەم دەرسێکی هەفتانە بووبۆخوشکان لەساڵی(٢٠٠٥)لەسلێمانی،وەپەرۆشی ودڵسۆزیم بۆکوڕان وکچانی گەلەکەم، تالەهەڵەی بەرانبەرەکانیان پەندوەربگرن،ئەم کتێبەپێشترسێ جارچاپکراوە،داواکارم لەخوای گەورەلەکەم و کورییەکانمان ببورێت وئەم نوسینەشم بکات بە توێشوی قیامەت وە سودو کەڵکی ببێت بۆدایکان وخوشکانی بەڕێزبۆ زیاتربەئاگا بونیان لەجیهانی ئافرەتان .

واالسلام عليكم....، **قامیشی،، سلێمانی(مزگەوتی شەفیق بەگ)**

## ئافره تانی خۆرئاوا بەرەوکوێ ؟

### کێ ئافرەتانی ڕۆژئاوا دەپارێزێ ؟

### لەلێدان..کوشتن..بازرگانی پێوەکردن دەست درێژی سێکسی...!

لەجیهانی ئیسلامیدا بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەست کەوت وپێشکەوتنەکانی خۆرئاوا دەکرێ لەبواری تەکنۆلۆژیاوپیشەسازیدا،ئەمە ڕاستەیەکی بەرچاوەبەڵام لەبواری ڕەوشت و کۆمەڵایەتیدا یەکەمی دوای دواوەن! ئایابلوێری مافی مرۆڤ کەهەردەم فووی پێدا دەکەن (ڕاستیە یان سەرابەومرۆڤی تینوبەئاوی تێ دەگا) ئایا خێزانی غەربی لەژیانی بەختەوەری و خۆشەویستیدا دەژی یان لەبەدبەختی و نائومێدی و دڵە ڕاوکێدان ؟ئایا کچان وکوڕانیان لەژێر سایەی خۆشەویستی دایك و باوکیاندا دەژین یان بێ ماڵ و حاڵ و سەر لێ شێواون؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر ئامـاژە دەکـەین بەمافـەکانی ئافرتـان لـە خۆر ئاوا ،وەکو لەدروشمەکانیاندا بانگەشەی بۆ دەکەن ئایا ڕێزو مافی ئافرەت دابین کراوە ؟ لەسایەی یەکسانی و مافی مرۆڤدا ..، ئایا لەو یەکسانییەدا ڕێزی بـۆ ئـافرەت تێدایـە یـان لایەنی سایکۆلۆجی و بایۆلۆجی یـان وا دەخوازێت کەپێویستە چاوەدێری ئافرەتـان زیـاتر بکرێت لەئەرك و مافدا وەك لەئیسلامدا هاتووە ؟

### کێشەی باڵا پۆشی وململانێی شارستانێکان..!؟

جێگەی داخ و پەژارەیە کە ئێمەی خـاوەنی پـەیامی(لااکـراه فی الـدین) واتـە :زۆر لێکـردن نیەلەوەرگرتنی دین،دەبینی ڕۆژانەئامۆژگاری دەکرێین بەسنگ فراوانی وئازادی و یەکسانی وڕێزگرتن لەمافەکانی مـرۆڤ..بـەڵام لەلایـەن کـێ وە؟ئـەم ئامۆژگارییـە بەنرخانـە لەلایـەن شارستانییەتێك ناڕاستەمان دەکرێت کەبەتەنهالە جەنگی جیهانی دووەمدا شەسـت ملیـۆن مرۆڤیان لەناو برد لەپێناوی تاك جەمسەری و دەست گرتن بەسەر جیهاندا ،،بەڵام قـەیرانی باڵاپۆشی ئافرەتان لەفەرەنسا دەمامکی ئازادی ومافی مرۆڤی لـەڕوداماڵین وئەوگەلـەی کـە

دروشمەکەیان((ئازادی ویەکسانی وبرایەتی))بو،جێگەی ئەو پارچە قوماشەی تێدا نەبۆوە کە کچە موسوڵمانەکان دابویان بەسەریاندا لەقوتابخانە! هاوشێوەی دروشمە جوانەکانی تورکیاو رژێمی بەعسی رۆخاوبەرانبەربەکوردان،ئایا ئەوە بەس نیە بۆئێمە تێبگەین کەجارێکی کە ئامۆژگاریان کردین و دروشمە پوچەکانیان ئاراستە کردین لەدیموکراسییەت و مافی مرۆڤ و یەکسانی و ئازادی و مۆدێل و مۆدێرن و ...هتد بیدەینەوە بەدەمیاندا !؟دیارە شتێکی چاوەڕوانکراوە کەنەیارانی ئیسلام دژایەتی شارستانییەتی ئیسلامی بکەن لەهەموو جیهاندا بەتایبەت لەوڵاتانی ئەمریکا و ئەوروپادا ،بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کەئەوان لەگەڵ سیستم و ڕێبازی خۆیان پێچەوانە جوڵانەوە کە چەندین ساڵە بەو دروشمانە شانازی دەکەن و ململانێی بەرامبەرەکانیان پێدەکەن بەناوی شەڕی شارستانییەکان ، کەئەمجارەش موسوڵمانان بونە سوتەمەنی دروشمە بریقە دارەکانیان وەك ئەو بڕیارەی کەتیایدا حیجاب قەدەغە کرا.

**فەڕەنسا** : دەرگای بیروعەقڵ دادەخات!

بێگومان بڕیاری قەدەغەکردنی حیجاب هەروا سەرپێیی دەرنەچوو، بەڵکو پێشینەو ئامادەکاری بۆ کرابوو، هەر لەساڵی(٩٨٩)کاری بۆ کراوە کاتێ یاسای قەدەغە کرانی سەجەم نیشانە ئاینییەکان دەرچوو لەدام و دەزگاکانی میریدا مەسیحی بێ یان موسوڵمان،وەلەوکاتەوە دژایەتی ئەو بڕیارەش کراوە لەلایەن ڕێکخراوەکانی موسوڵمانانی فەڕەنسا،بەڵام زلهێزەکان تەنها بەرژەوەندی خۆیان لەبەر چاوە وبیروڕای خۆیان دەسەپێنن وهەرئازادی خوازوماف پەروەریشن!! دوای ڕاگەیاندنی بڕیارەکە سەرەك وەزیرانی فەڕەنسا (جان ڕافالان) پاساوی ئەو بڕیارەی بەوە هێنایەوە کە گوایە بۆ پارێزگاری کردنی ئافرەتە موسوڵمانەکانە لەپەلاماری توندڕەوە عەلمانییەکان،مەگەرئەوان بەبەزەیی ترن لەخوای پەروەردگار!! یان ئەوان دڵسۆز ترن لەدایك وباوکیان بۆ ئەوقوتابییانە...! بێگومان خەڵکانی هۆشیاروخاوەن ویژدانیش هەبون لەناو لیژنەی دەستورەکەدا بەم یاسایە ڕازی نەبون (ڕۆنی ڕیمون) مامۆستای زانستە سیاسییەکان ومێژوو نوسی فەڕەنسا کەوتی: ئەمە

ئەو عەلمانییەتە نییە کە بانگەشەی پاراستنی مافی مرۆڤی تێدا دەکرێ !! وەزیری ناوخۆی ئەوکاتی فەرەنساکەدواتربوبە سەرۆك(نیکولا سارکوزی) بەئاشکرا ڕایگەیاندکە ئەم بڕیارە پێشێلکردنی مافی موسولمانانە، باس لەجیاوازی وچەوساندنەوە دەکات ودەڵێ: شەش ملیۆن موسولمان لەفەرەنسادا لەو مافانە بێبەشن کەغەیری خۆیان هەیانە جابۆئەوەی بنەماکانی یەکسانی بچەسپێ. پێویستە ڕێز لەخواستە کانیان بگیرێ، وە دەڵێ موسولمانان شوێنی عیبادەتیان کەمە لەچاو ئاینە کانی تر، وەئەگەر ناوت (محمد) بێت ئەوە فایلی داواکارییەکەت دەخرێتە سەلەی خۆڵەوە لەگەڵ ئەوەشدا دیاردەی لێدانی ئافرەتان لەفەرەنسادا زۆر بڵاوە، بەجۆرێ ١/١٠ی ئافرەتانیان لێیان دەدرێت لەلایەن مێردەکانیانەوە لێدانی بێ بڕوایانە ! کەلەئەنجامدا زۆریان لێ دەمرێت !(ماری دۆمینیك سیرمان) سەرۆکی نیشتیمانی بۆ هاوکاری ئافرەتان دەڵێت: یەك ملیۆن ونیو لەئافرەتانی فەرەنسا دوچاری لێدان و ئەشکەنجە وئازاردەبن لەلایەن هاوسەرەکانیانە وە واتە ١/٥ملیۆن پیاو لەپشتی ئەم ستەم وچەوساندنەوەن ،وەئەم یەکێتیە کە لە(٥٤) کۆمەڵە وڕێکخراو پێکهاتووە ،ساڵانە (١٥) هەزار لەو ئافرەتانەی کە بونەتە قوربانی لێدان وچەوساندنەوە پەیوەندیان پێوە دەکەن ولەناوەڕاستی پاریس چەپکە گوڵی ڕێزلێنان دەخەنە سەرپەیکەری تایبەتی ژنان...، لەڕاستیدا ئەوە یە کارەسات، ئەوە تیرۆر وتۆقاندنە دژ بەمرۆڤایەتی!! بەڵام داپۆشراوە بەدروشمی ئازادی ومافی مرۆڤ ویەکسانی، دیارەئێمەش بێ کەم وکوڕی نین ولەو دیاردانەمان هەیە، بەڵام بەراورد ناکرێ لەگەڵ هی ئەواندا وەك قەترە بە دەریایە ،وەسەبارەت بە دەنگ لێهاتن وبێدەنگی کاری ئێمە و ئەوان وەك مەسەلەی (مەڕۆکە و بزنۆکە) وایە،بۆیە پێویستە موسولمانان تێبگەن وبزانن کەلەهەر جێگەو شوێنێ دینی خوا حاکم نەبوو ئەوە چەوساندنەوە هەیە، بەتایبەت ئەو وڵاتانە هەرداگیر کەرانی دوێنێن بەڵام ئەمڕۆلەبەرگێکی ترویەدروشمێکی تازەوڕا زاوە هاتونەتە پێش،وەهەر ئەوانە پشتوپەنای دوژمنانی کورد بوون، سەرەڕای ئەو هەموو تەنازول وچاکەی لەگەڵیان کراوە ..! ئەوەی کە بۆ بەڕێزتانم نوسیوە مشتێکە لەخەرمانی (مافی مرۆڤ و ئازادی و یەکسانی) عەلمانییەت کەتەنها دروشمی بێ ناوەڕۆکە وهیچی تر .

## ئیسپانیا : کێشەی باڵاپۆشی و دادگای پشکنین..!

پۆلیسی ئیسپانیا ساڵی زیاتر لە (٥٠٠)هەزار سکاڵا تۆمار دەکات لەسەر دەست درێژی سێکسی بۆ سەر ئافرەتان ! هەندێك لەوانەی کەبێ ئاگان لـە مێژووی ڕابـردوو لەوانەیـە وا گومان بەرن کەدژایەتی کردنی پۆشاکی ئیسلامی لەم ساڵانەی دوایـدا سـەری هەڵـداوە،یان پەیوەندی هەیە بەڕوداوە کانی(١١ سێبتمبر)وە،بەڵام مێژووی دژایەتی کردنـی شارستانیی ئیسلامی لەلایەن ڕۆژئاواوە زۆرلەوە کۆنترەپڕیەتی لەڕوداوی تیرۆروتۆقانـدن ومەرگەسـاتیان هێناوەبەسەرموسوڵمانانـدا ،ئەگەر سەدەی(١٦)بەنمونە بهێنمەوە بـەهۆی سیاسـەتی دوژمـن کارانەی ئیسپانیا چ مەرگەساتێکیان بەسەرموسوڵماناندا هێنا،بەدانانی دادگای پـشکنینی بیروباوەڕ(محاکم التفتیش)لەساڵی(١٦٠٩)زاینی وساڵەکانی دواتریش بەلەناو بردنی هـەزاران موسوڵمان و قەدەغەکردنی باڵاپۆشی لەدام ودەزگاکانی میریدا،دواتریش لەسـاڵی (١٥١٣) بڕیاری پاشایەتی دەرچولەلایەن(جان المجنونە)ژنەپاشای ئەوکاتە بەقەدەغـە کردنـی پۆشـاکی ئیسلامی بەیەکجاری لە وڵاتدادوای ١٣ساڵ ئەو بڕیارە یەکێك لەگەورە بەرپرسانی دادگـای پـشکنین بـەناوی (ونزۆمزیکـی)هەسـتا بەلێکۆڵینەوەیـەکیووردبـۆ بـن بڕکردنـی دیـاردە ئیسلامیەکان لە(غەرتانە)بڕیارێکی دەرکردبەگۆڕینی ناوە ئیسلامییەکان بۆ نـاوی قـشتاڵی و گۆڕینی جل و بەرگیان بەتایبەت حیجاب !! (تازەلە وڵاتی خۆشمان مێژوو خـۆی دووبـارە دەکاتەوە بە گۆڕینی ناوەکان و کەم کردنەوەی دیاردە یسلامییەکان تەنانـەت بـەکارهێنانی ووشەکانی لاتینی لەجیاتی ووشەکانی عەرەبی لەنوسینـدا هەریەشـێکەلەوهەوڵەگومانـاویانە بابگەڕێینەوە ئیسپانیاو لەساڵی (١٥٦٦) ز یاسایەك دەرچووکە بەو پێیە پێویسـتە هـەموو ئافرەتانی موسوڵمان بەرگی مەسیحییەکان لەبەربکەن وهەرکەس حیجاب بپۆشێت دوچاری توندترین سزای یاسایی دەبێت ،وەلەساڵی (١٦٠٠) زیاسایەکیان دەرکرد نابێ موسـوڵمانان مردووەکانیشیان بەشێوەی شەریعەتی ئیسلام بنێژن !! بەڵکو لەسەر شێوەی ئەوان بنێـژرێ، پاشان کار گەیشتە ئەوەی کەقوتابخانە ئاینییەکانیان قەدەغە کردوو مزگەوتەکانیان ڕوخاند

هەرلەو ساڵەدا (ئەنتۆنیۆ سوبەرینۆ) نامەیەکی نوسی بۆ پاشاکەیان (فلیپ) ی سێیەم تیایدا دەڵێ :سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ئێمە شێوەو ناسنامەی ئیسلامەتی لەموسوڵمانان دابڕنین وە لەهەمو شتێکدا بیان خەینە سەر شێوەی گاورەکان ، جائەگەر موسوڵمانان بەلاپەڕەکانی مێژوودا بچنەوە بەتایبەت ئەم چوار سەدەی کۆتایی دەبینین کەئەم دژایەتی کردنەی ئێستای باڵاپۆشی ئافرەتان هەمان کێشە ودژایەتی کۆنە! بەڵام لە بەرگێکی تازەی شارستانی وجیهان گیریدا،بەدروشمی مافی ژنان وئازادی وپێشکەوتن،لئاوا ڕوداوەکانی مێژو خۆیان دوبارەدەکەنەوە،ئێستابەپاساوی دژایەتیکردنی تیرۆردژایەتی دیاردەئیسلامیەکان دەکرێت وەبێئاگایی موسوڵمانان لەلایەك وناکۆکی و پەرتەوازەییان لە لایەکی تر ئەوەندەی تر قوڕەکەی خەست کردۆتەوە ،ئەوەلەکاتێکدا کە موسوڵمانان دەسەڵاتیان بوولە ئیسپانیا گەورەترین خزمەت و پێشکەوتنی زانستی بە خۆوە بینیوە کە پێیان دەگوت (ڕێنسانس) واتە : ڕاپەڕینی زانستی بەڵام لە بەنبەردادوای نەمانی دەسەڵاتی موسوڵمانان،نەسرانیەکان ئەوەی لەدەستیان هات لەتیرۆروتۆقاندن کردیان لەماوەی چوارسەدەدانۆملیۆن موسوڵمانیان شەهید کرد،دیارە چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە ،ئەنجامی یاسای جەنگەڵ و شارستانی دوورلەخوایی کۆمەڵگا بەرەوهەڵدێر وماڵوێرانی دەبات ئەو ژمارانی تۆمارکراوە لەسەر ژمێرییەکانی ساڵی (٩٩٧) لەئیسپانیادا سەبارەت بەچەوساندنەوەی ئافرەتان:-ڕێژەی ئەو کچانەی کەهێشتا شوویان نەکردووە و حەبی مەنع بەکار دێنن بەردەوام لە ٩٣٠/٠ یە !،-لەساڵی(٩٩٠) ز(١٣٠)هەزار ئافرەت سکاڵایان تۆمارکردووە کە دەست درێژییان کراوەتە سەروو لێیان دراوە لەلایەن هاوسەر و هاوڕێکانیانەوە !،-ساڵی (٩٩٧) ز ٥٤ هەزارسکاڵا تۆمارکراوە لەدادگاکە دوچاری دەست درێژی ولێدان بونەتەوە بەڵام پۆلیسی ئیسپانی دەڵێت ژمارەکەدەبەرانبەرە!هەرلەو ساڵەدا ٥٤ئافرەت بەهۆی ئەشکەنجەو ئازارەوەمردوون.

---

المصادر: (محاکم التفتيش /د.زکی علی)( الشباب المسلم في مواجهة التحديات/د.عبدلله ناصح)

## بەریتانیا : دیاردەی لێدانی ئافرەتان !

ئەجیهاندا بەریتانیا بەوە ناسراوە کە وڵاتێکی یاساییە و مافی مرۆڤی تێداپارێزراوە ، بەڵام ئەمیش دوچاری کێشەی زۆر بۆتەوە لەبارەی دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتان ، چونکە ئەو ژنە دەبێت چاوەڕوانی چی لەپیاوێك بکات کەلە خوا ناترسێ و دینی نییە بەردەوام سەرخۆش و مەغرورە .... جگە لە چەوساندنەوەو جیا بونەوە ؟.. لێکۆڵینەوە کان دەریان خستووە کەڕێژەی ٥٠٪ ی ئەو ئافرەتانەی کەلەناوبراون لەلایەن مێردەکانیانەوە بووە لوەتەنها لەساڵی (٩٩٢) ز ڕێژەی توند وتیژی لەماڵدا گەیشتە ٤٦٪وە پۆلیسی بەریتانی ساڵی (١٠٠) هەزار سکاڵا تۆمار دەکات کەدژی پیاوەکانیان تۆماریان کردووە ، (جین لویس) ئاماژەی بەوە کردوو کە٣/٢حاڵەتی جیابونەوە بەهۆی کێشە و هەرای ناو خێزانەکانەوەیە ، وەبەهۆی بەکارهێنانی مادە بێ هۆش کەرەکان بەهاو ڕەوشت بەردەوام لەدابەزیندایە ، لەراپۆرتەکاندا هاتووە کەپیاوی بەریتانی بەبێ هۆ لەژنەکەی دەدات و ئازاری دەدات کە ڕێژەی ئەو حاڵەتە گەیشتووەتە ٧٧٪حاڵەت،هەر لەو راپۆرتەدا هاتووە کە یەکێك لەژنەکان وتویەتی سێ ساڵ و نیوە پیاوەکەم لێم دەدات بەخراپترین شێوە ، هەر قسەیەکیش بکەم لێدانەکە دوبارە دەکاتەوە ، تەنانەت ئەوەندە بەچاوی سوك سەیری خێزانەکانیان دەکەن هەندێ جار جگەرە کانیان لەسەر لاشەی خێزانەکانیان کوژاندۆتەوە ، یان بۆ چەند کات ژمێرێك بەدەست بەستراوی لەژورەوە جێیان هێشتون ! ئەو حاڵەتەی کەباسمان کرد بەو ڕێژە زۆرە گەر لەوڵاتێکی ئیسلامیدا تۆمار کرابا ئەوا لەلایەن میدیاکانەوە زۆربەگەرمی دەهۆڵی بۆ دەکوترا و پێشوازی لێدەکراو چەند جار گەورەتر دەکرا،بەڵام بۆ زلهێزەکان و دەوڵەمەندەکان دەنگی لێ نایەت و هەر ئازادی و یەکسانی و مافی مرۆڤە !! پیاوان لەکاتی پێویستی مادیدا یان دوای تێر بونی ئارەزوی ژنەکەی خۆی دەفرۆشت تاساڵی (٩٢٠) بەپێی یاسایەك قەدەغە کرا بەڵام بنەبڕ نەبوو!! لەسەردەمی پاشایەتی (هنری) هەشتەمدا پەرلەمانی ئینگلیز بڕیارێکی دەرکرد بەقەدەغە کردنی

خوێندنەوەی کتـێبی (العهـد الجديـد) ی تايبـەت بـەدينی مەسـيحی لەلايـەن ئافرەتانـەوە، (٥٠ )لێکۆڵەرەوەی پسپۆڕ لەبواری ئافرەتان لـە ڕاپۆرتێکـدا ڕايـان گەيانـدووە کـەدياردەی جيـاوازی ڕەگـەزی و دەسـت درێـژی بـۆ سـەر ئافرەتـان ڕۆژانـە لـەزياد بوندايە،لـەتازەترين لێکۆڵينـەوەدا کەدامـەزراوەی پاشـايەتی بـەريتانی ئـەنجامی داوە ئامـاژە بەپێويـستی دامەزراندنی ڕێکخراوێـك دەکـات بـۆ گرنگـی دان بـەبوارەکانی ئافرەتـان و دامەزرانـدنيان لەپلەو پايەی هاوشێوەی پياوان ، چونکە زۆرێـك لەوانـە خـاوەنی بڕوانامـەن بـەڵام پۆستی شياوی خۆيان پێ نەداون چونکە لەڕەگەزی مێينەن ! هەر لەبەر ئەوە زۆربـەيان کارەکانيـان جێهێشتووە ، وەهەمان سەرچـاوە ڕايگەيانـدوە کەڕێـژەی دامـەزرانـدنی ئافرەتـان لەشـوێنە گرنگـەکان کـەم بۆتـەوە و لەدابەزينديـە، لەکۆمەڵـەی پاشـايەتی ڕێـژەی ٣٪ يـە وەلەئەکاديمیای ئەندازياری بەرێژەی ١٪ وەلەپەيمانگای زانـستی زينـدەوەرزانی بەرێـژەی٦٪ تيايدا کار دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا لەدام و دەزگاکانـدا سـوکايەتييان پـێ دەکـرێ لـە لايـەن پياوانەوە ،هەر لەبەر ئەوە بوو بەڕێوەبەری دامـەزراوەکە (بارونـە جرينفيلـد) کەمامۆسـتای (صەيدەلانی) يە لەزانکۆی ئۆکسفۆرد-داوای کـرد بەهانـدانی ئـەو ئافرەتانـە بـۆ گەڕانـەوە بۆسەر کارەکانيان وەلە بازنەی‌بێ هيوايی دەرچن !! بازنـەی بـێ هيـوايی دەبـێ چـی بـێ ! مـەبەستی پێ ماڵەوەيانە ! کەتيايدا دوچـاری لێـدان و چەوسـاندنەوە دەبـن ! لەبـەر ئـەوەی ژيانيان لەسەر بنەمای مادە و دونيا پەرستی دامەزراوە ماڵەوەيان هەر چەوساندنەوەی بـێ پسـانەوەی بێ حەسـانەوە !! لـە فەرمانگـەکانيش سـوکايەتی پـێ کـران و ناچـار کردنيـان بەکارێ کەلەگەڵ سروشتيان ناگونجێ، سـزای دوا ڕۆژيـش چـاوەڕێيانە ، جاخوشـکی بـەڕێزم تۆش سەرنج بدە و بزانە ، تەنها ياسای ئيسلام بۆمان دەرمانە ،جگە لـەوە نـاوی گـەورە و شاری وێرانە .

## ئەمریکا.. ئەوەی لەسەرژمێریەکانیدا تۆمارکراوە !

(لەهەرسێ چرکەیەکدادەست درێژییەکی سێکسی دەکرێتە سەرئافرەتێك شەش ملیۆن ئافرەت لێدراوەوچوارهەزارئافرەتیش کوژراوە !!)

زۆر لەناوەنـدە زانـستییەکان و لێکۆڵـەرەوە ئەمریکییـەکان ڕەخنـەی توندیان گرتـووە لـەو حاڵەتەی کەکۆمەڵگای ئەمریکی تێیدادەژی لەبواری کۆمەڵایەتی و لەبەر یەك هەڵوەشانی خێزانـی ئـەمریکی کەسـاڵانە لەزیادبوندایـە و بـێ چارەسـەر ماوەتـەوە ، بـەپێی ئـەو لێکۆڵینەوانە ئەم ژمارانەی لای خوارەوە تۆمار کراوە :

*- لەساڵی ٩٨٠ ز (١،٥٥٣،٠٠٠) حاڵەتی لەبار بردن ئەنجامدراوە بۆئەو ئافرەتانەی کەتەمەنیان لەبیست ساڵ کەمترە،بەڵام پۆلیس دەڵێ ژمارەی ڕاستییەکەی سێ ئەوەندەیە !

*- ساڵی ٩٨٢ ز ٨٠٪ ئەوکـچانەی کەتەمـەنیان لـەخوار ١٥سـاڵی دایەوشـویان کـردووە تەڵاق دراون .

*- ساڵی ٩٨٤ ز هەشت ملیۆن ئافرەت لەگەڵ منداڵەکانیان بەتەنیا دەژین بـێ یارمـەتی کەسانی تر !

* ساڵی ٩٨٦ڕێژەی ئەوپیاوانەی کە لەسەرحسابی ژنەکانیان دەژین ٢٧٪

*_ سـاڵی ٩٨٢ ز (١٠/٠٠٠) حاڵـەتی ئیغتیـصاب تۆمـار کـراوە ،٨٠٪ دەسـت درێژییەکان لەچوار چێوەی خێزان و هاوڕێیەتیدا بووە

*- سـاڵی ٩٩٧ ز هـەر لەسـێ چـرکەدا ئافرەتێـك ئیغتیـصاب کـراوە ،٦ملیـۆن ئـافرەت دوچاری ئـازاری جەسـتەیی و دەرونـی بـوون ،بـەهۆی مامەڵـەی خراپـی مێردەکانیانـەوە ٧٠،٠٠٠ لەلایـەن مێردەکانیانـەوە لێیـان دراوە ، ٤هـەزار ئـافرەت لەسـەر دەسـتی مێردەکانیان و نزیکەکانیان لەناو دەبرێن !! + ٧٤٪لـە بێوەژنـەکان هـەژار کـەوتون و بـێ سەرپەرشتیارن + ٨٥٪ لەپیرەژنەکان بەتەنیا دەژین و کەس یارمەتییان نادات

*-ساڵەكانی (٩٧٩-٩٨٥) نەشتەرگەری نەزۆكی ئەنجامدراوە بۆ هیندە سورەكان بێ ئەوەی بزانن !

*- ساڵەكانی (٨٠-٩٠) یەك ملیۆن ئافرەت لە تاترۆخانەكان كاریان دامێن پیسی بووە بەرەسمی !

*- ساڵی ٩٩٥ ز (٢٥٠٠) ملیۆن دۆلار بەرهەمی مەلهاو ڕێكخراوە سێكسییەكان بووە .

لەلێكۆڵینەوەیەكی ئەمریكیدا دەركەوتووە كەئەو ژمارانەی لای پۆلیسی ئەمریكی تۆمار كراوە زۆر لەوە زیاترە كەڕاگەیاندنەكان بڵاویان كردۆتەوە بەڵام بەشی زۆری لەڕاگەیاندنەكان دەشاردرێتەوەو ئاشكرا ناكرێت بۆ ئەوەی كۆمەڵگەی ئەمریكی ڕیسوانەبێت بەتایبەتی لەبواری مافی ئافرەتانەوە، ئەوە مشتێكە لەخەرمانێك، لێرەوە تێدەگەین كەمرۆڤ هەر چەندە لەبواری زانست وتەكنەلۆجیادا پێشكەوتو بێت بەڵام بەبێ پەیامی خوایی بەختەوەر نابێت، وەلەهەر شوێنێ دینی لێ نەبوو ئەوا ستەم و پێشێلكاری لێیە ، وەئافرەتانیش بەر لەهەموان دوچاری چەوسانەوەو ئابڕوتكان دەبن،(ئەنشتاین) لەوەدا جوانی پێكاوە كەدەڵێ: مرۆڤی بێ ئاین وەك كەشتییەكی بێ كەشتیوانە. ..

(مجلة الاسرة/ العدد ١٢٩ السنة ١٤٢٤)ھ

**ئەو سەربەستییەی لەئەمریكایە — لێمانی لادەی خودایە:**

سوپاس بۆخوا كە بەئەمریكی دروست نەكراوین و شانازی بە موسوڵمانییەتی و كوردایەتی خۆمانەوە دەكەین ،زۆر باسی سەربەستی دەكرێ لەئەمریكا بەڵام كام سەربەستییە ؟ لەڕاستیدا گەلی ئەمریكی ڕای نییە،بەڵكو جولەكە حوكمی وڵات دەكەن ! هەر كەسێكیش بەرانبەریان بوەستێت لەناو دەبرێت و كۆتایی پێ دەهێنرێ ئەگەر نەشكوژرێ ، وەك نمونەی (مارلۆن براندۆ) ی ئەكتەر كەدەربارەی جولەكەی (هۆلیود) شتی وتبوو پاشان بەدەردێكی وایان برد كەبەگریان و پاڕانەوە لەبەردەم —حاخامانی-جولەكە چۆكی داداو پاڕایەوە ....، جولەكە ئەمریكاییەكان زاڵن بەسەركارو باری ئەمریكییەكانداكەچی باقی گەلی ئەمریكی

زۆرینەن کاریان تەنها دابینکردنی ژیانی ڕۆژانەیە ، کەواتە گەلی ئەمریکی ناچار کراون کەهەمیشە چاویان لەدەستی جولەکە بێو لەژێر ڕەحمەتی ئەواندا بژین . سەبارەت بەمنداڵانی ئەمریکا دایك و باوکیان ناتوانن بەمنداڵەکانیان بڵێن بێدەنگ بە ! ئەگینا منداڵکە پۆلیس بانگ دەکات و دایك و باوکی سجن دەدات ! بەتۆمەتی باش هەڵسوکەوت نەکردن لەگەڵ منداڵ ، ناچار دایك و باوك دەکەونە ژێر هەڕەشەی منداڵەکانیان ! ئەمریکا بەرانبە بەدەرەوە وڵاتێکی بەهێزو زاڵە بەسەر جیهانداو لەڕوی ئابوریشەوە وڵاتێکی دەوڵەمەندە ، بەڵام ئەوانەی کەزاڵن بەسەر لایەنە ئابورییەکەیدا جولەکە و کۆمەڵێکی کەم لە گەلی ئەمریکییە وەگوزەرانی زۆرینەی خەڵکی ئەمریکا گرانە ، لەبواری کۆمەڵایەتییەوە بێ هێزو هەڵوەشاوە ، شیرازەی خێزان زۆر بەکەمی ماوە ، هاوڵاتی واهەیە لەسەر ڕێگەو بانەکان دەمرێ و کەس لێی ناپرسێتەوە ، شۆستەکان پڕن لەسەرخۆش و بێ ماڵ و حاڵ ، گەر سەیری تەلەفیزۆنەکەیان بکەی بەزۆری هەواڵی کوشتن و تاوان و گیروگرفتی ژن و مێرد و دایك وباوکە لەگەڵ منداڵەکانیان ، یان بەرنامەی (توك شۆو) کەکۆمەڵێك لەخێزانەکان کۆدەبنەوە پسپۆڕێکی کۆمەڵایەتی قسەیان بۆ دەکات سەبارەت بەچارەسەرکردنی گرفتەکانیان ،وەك دوو خوشك حەزلە پیاوێك دەکەن پیاوەکەش چاوی لەخوشکی سێهەمە، ئایا حەزدەکەی لەگەڵ کۆمەڵگای ئەواندا بژی کەهەموو شتێکیان لەسەر مادەو دنیا بنیات نراوە ؟ هیچ حەیاو ئابڕوی بەش نەدراوە ، بێ گومان هەمو کۆمەڵگایەك سلبیات و نیجابیاتی تێدایە، ئەگەر کۆمەڵگای خۆمان بەراورد بکەی لە کۆمەڵگای ئەوان ،ئەوا ئاسمان و ڕێسمانی بەینە وکۆمەڵگای ئیسلامی ئێمە بەهەزاران جار چاکترە، وەباوەڕناکەم هیچ مرۆڤێکی ژێرخواستی ئەوەبێ کچ وکوڕەکەی بەخێوبکات تا ١٨ساڵی دوایش وازی لێبێنێ و بڕێت و میراتگرەکەی سەگ و پشیلەبێت !! لەکۆتایدا دەڵێم ئێمەی موسوڵمان پاراستنی خێزان و پەروەردەی ڕۆڵەکان و ئابڕوی کوڕو کچەکانمان لا گرنگترە لە سیاسەتێکی درۆینە .

## بەڵام کێ لەئەمریکادە پرسێتەوە؟

دوای قەدەغــەکردنی بالاپۆشــی لەفەرەنــسابۆهاوسەنگی تــەرازووی سیاســی ئــەمریکا ،بەرپرسی ڕێکخراوی (ئازادیەئاینیەکان)لـەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکارەخنـەی لـەوبڕیارەی فەرەنــــساگرت وبەپێــــشێل کردنــــی ئـــایینی لەقەڵـــەم دا،ئەمەهەڵویـــستێکی جوامێرانەوبوێرانەیە،بـەڵام سـەیرلەوەدایەناو وڵاتەکـەی خـۆی نـابینێ..! ئەوئەمریکایـەی کەسەرچـــاوەی مـــاف-وئـــازادی یەکانـــە-چـــیرۆکی دەرکردنـــی ئەوکچەمـــسوڵمانەی لەبیرکردوەلەقوتابخانـەی (ڕیجینـا) ی شاری کلـیفلاد لەویلایـەتی ئۆهایۆتـەنها لەبەرئـەوەی پۆشـــاکی ئیـــسلامی لەبەربووئـــەوەش دومـــانگ دوای بڕیارەکـــەی فەرەنـــسا...،ئـــەی ئەوبەرپرسەئەمریکیەچـــۆن بـــیری خـــۆی بردەوەکـــاتێ کاتێـــك ئـــافرەتێکی جولەکـــە لەتەمەنی(٤٠) ساڵی دامسوڵمان بووبەهۆی بەرگەکەیەوەلەناوبازاڕگـەنجێك لێـی داو ووتـی بەرازێکی تیرۆریستم لەناوبرد!ئەمەوبەهەزاران نموونەلەبەردەست دان سـەبارەت بەمێـژووی ڕەشـــیان بەرانبـەربەمـــسوڵمانان،لەخۆرئاواکچ کـــەبالغ بووبـــەپێی یاســـاکانی وڵاتـــانی بەناوپێـشکەوتولەڕاستیدا دواکەوتو،مەسـرەفی لەسـەردایك وبـاوك نامێنێـت دەبـێ خـۆی بکەوێتەمشوری نان پەیداکردن ! ئیدی چۆنی پەیدا دەکـات گـرنگ نیـە،دەبێت هەرپـەیدای بکـــات بۆژیـــانی خـــۆی ،وەهـــەروەهاژنی خۆرئـــاوایی چـــونکەکاردەکات وخـــاوەنی پارەیەومێردەکەی بەزۆرپارەی لێ دەستێنێ!بەڵام ژین تـاڵی وبەدبـەختی لەوەدایەکـەبێوەژن وپـــیرەژن وپەککەوتـــەکانی تێـــدادەژین ،ســـەرەنجامیان بۆخەڵوەتگـــەی پـــیری وپەککەوتەخانەکانـــەوجاری واهەیەبـــە(١٠)ســـاڵ جارێـــك کوڕوکـــچەکانیان ســـەردانیان ناکەن،ئەوەکانیـشیان هـەرباس مەکـە!دیارەباسـی شـتەگەورەکان لەکوشـتاری وداگیرکـاری نابینێ..

## هەڵوەشانەوەی خێزانی ئەمریکی....!*

بێگومان خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگایە بۆیە ئیسلامیش زۆرگرنگی پێدایە،چونکە خێزان واتە:ژیانی خۆشەویستی وخزمایەتی وپەروەردەی منداڵ ورێزی دایك وباوك و....،کەخێزان نەماواتە ژیان نەما،ژیان دەبێتە ژان واتە هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا،ئێمە ئەمسایەی ئیسلامەوەدەزانین کوڕی کێین ولەچ هۆزوبنەماڵەیەکین،خێزانەکانی ئەوروپاورۆژئاوا بەرەوهەڵوەشانەوەن، سەرەڕای خیانەتی هاوسەری منداڵیش ئەخەنەوە!لەجیاتی ئەوە هاورێیەتی سەگ وپشیلە دەکەن!چونکە دەڵێ منداڵێك بۆمن نەبێ بەهەرنەبێ،چون کەگەیشتە(١٨)ساڵ نەبێ بڕوا خۆی بەخێوکات،جاکچی داماوچی ئەکات بیکات لەپێناوی پارە بۆژیان! بۆیە لەوڵاتێکی وەك فەرەنساکە(٥٧) ملیۆن کەسە نۆملیۆن سەگی تیابەخێونەکرێ وئەندامی خێزانن بەفەرمی!کەدین لەئارادا نەبوومرۆڤ ئەخرێتە ئاستی سەگ وپشیلە،دیارە کەلەبواری ماددەوتەکنەلۆژیادا لەپێشن،بەڵام لەلایەنی خێزان وبواری کۆمەڵایەتیدا لەدوای دواوەن،ئەوەش هەندێك لە گرفت وقەیرانەکانی خێزانی ئەمریکی کەبەرەولێکترازانیان دەبات.

یەکەم: نەمانی ڕێزوخۆشەویستی ووەفای ژن و مێرد بەرانبەریەکتر ، زۆربونی تەڵاق وپەیوەندی جنسی بەخیانەت کردن لەمێردەکەی وەنەمانی ڕەحم ولەیەکتربێزاربونیان.بۆنمونەلەئەمریکارێژەی تەڵاق ولەیەك ترازان گەیشتۆتە(٧٠%) وەبەپێی سەرژمێریەکی مەرکەزی١/٣ ی منداڵانی ئەمریکی بێبەشن لەسۆزی دایك یان باوك!

دووەم: منداڵەکانیان توشی چەندین گرفت وکێشەبونەتەوەوەك (سیلان وئایدز)کەبەهۆی پەیوەندی ناشەرعیەوەپەیدادەبن بەپێی سەرژمێریەکان ساڵانە ١٠% ی منداڵان تەعەدای شەرەفیان لێکراوە،بۆنموونەسەرۆکی شارەوانی شاری(ئاموجرد) لەویلایەتی مەکسیکۆ ئەدادگاتۆمەتی دەست درێژی کردنەسەرشەش کچۆڵەی بچوکی لەسەرئیسپات بوو! وەلەشاری (بیتسبرگ)سێزدەمنداڵ کەفەحس کرابوون .حەوتیان دوچاری نەخۆشی ببون

وەساڵانەنزیکەی (ملیۆنێك وهەشت سەد)هەزارمنداڵ بزردەبن کە(٩٠٪)یان لەوانەن کەلەماڵەکانیان رادەکەن وپاشان دەفرێنرێن .وەسەرژمێرەرەسمیەکان دەریان خستوەکە (٣/١) تاوانەگەورەکان لەلایەن ئەوهەرزەکارانەوەئەنجام دەدرێن کەتەمەنیان لەخواربیست ساڵیەوەیەلەوەحاڵەتی هۆگربوون بەخواردنی ماددەسڕکەرەکانەوەگەیشتۆتەڕێژەی زیاتر (١٥٪)ی گەنجەکانی قوتابخانەئامادەییەکان ! وەساڵانەزیاترلەملیۆنێك کچی هەرزەکار بەبێ مێردوشوکردن منداڵیان دەبێت ولە(٨٠٪)یان کچی قوتابخانەئامادەییەکانن ومەبەستیشیان لەهێشتنەوەی کۆرپەکانیان ئەوەیەکەدەوڵەت هاوکاریان بکات ودەوڵەتیش ساڵانەزیاترلەملیارێك دۆلاربۆهاوکاری دایکانی هەرزەکار خەرج دەکات!
سێەم: کەمبونەوەی حاڵەتی ژنهێنان وشوکردن لەزۆربونی دیاردەی ڕیزپەڕی جنسی(الشذوذ الجنسي) واتە:جووتبونی نێرلەگەڵ نێرومێ لەگەڵ مێ ئەمەش چەندزانیاریەك لەوبارە و چەند وێنەیەك تەنهالەئەمریکا:دیاردەی ژن هێنان لەنەوەتەکاندالەچاوحەفتاکاندا١٧٪ کەم بۆتەوە،پەیوەندی جنسی یەناشەرعیەکان لەسێبەرانبەرزیادیان کردوەگۆڤاری (نیوزیك)ی ئەمریکی لەساڵی ١٩٧٧ دابلاوی کردۆتەوەکەئەوکاتەژمارەی ڕێزپەڕێ جینسی نزیکەی بیست ملیۆن بووەلەهەموولایەك ئاگادارن کە(بیل کلنتۆن)سەرۆك کۆماری پێشوتری ئەمریکالەساڵی(١٩٩٢)لەکاتی هەڵبژرادنی لەشاری (کالیفۆرنیا)لەکۆنگرەیەکدا بەئاشکرا بانگی نێربازەکانی کردبەڵێنی پێدان کەلەبەرانبەردەنگ پێدانی دائەویش بەرگریان لێبکات وخزمەتیان بکات...
چوارەم: پەرەسەندی تاوان وتوندوتیژی نوەك دەروونناس و کۆمەڵناسەکان گوتویانەهۆکاری سەرەکی بڵابونەوەوگەشەکردنی دیاردەی تاوان وتوندوتیژی ولەیەك ترازانی ژن ومێردوهەڵوەشاندنەوەی خێزان وپەرتەوازەبوونی منداڵەکان وئەوکەسانەش کەخەریکی تاوان وتوندوتیژی دەبن وەك قەتل ودزی وتەعدای جنسی بەزۆری کەسانێکن کەلەباوەشی خێزانێکی ساغ ودایك باوکایاندابەخێونەکراون ولەسۆنگەی ئەوەوەدوچاری نەخۆشی دەرونی

وعەقلی بوون وکینەورقیان لەسەرجەم کۆمەڵگایەودەیانەوێت بەهەرشێوەیەك بێت ڕقی خۆیان بڕێژن

پێنجەم: سەرباری هەمووشتێکیش تەشەنەکردنی چەندین نەخۆشی ترسناك بەهۆی بڵاوبونەوەی پەیوەندیە جنسیە ناشەرعیەکانەوە هەر لەزیناویگرەتانێربازی و،خۆلێکخشاندنی ئافرەتان وجوت بون لەگەڵ گیاندارانداب‌ەتایبەتی سەگ!!دیارەبڵاونەوەی ئەونەخۆشیەکوشندەو پیسانەش (ئایدز)لەهەمویان تازەتروپیستروکوشندەترەخواوپێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەیان بەئەنجامی خراپی ئەوبەدڕەوشتیەکردوە،خوای دادگەرفەرمویەتی (ولاتقربواالزني انه كان فاحشتوساءسبيلا)واتە:تۆخنی زینامەکەون چونکەتاوانێکی ناقۆڵایەخراپترین شێوازوو ڕێبازە وەك پێغەمبەرلەفەرمودەیەکداکەئەمەکوردیەکەیەتی فەرموویەتی:(هەرکاتێك داوێن پیسی بەشێوەیەکی زەق وئاشکرا لەنێوهەرکۆمەڵگەیەکدا بڵاو بویەوەبەجۆرێك نەیشارنەوە،ئەوەبەتەکیدنەخۆشی وئازاریان لەنێودا بڵاودەبێتەوەکەلە خەڵکانی رابردویاندانەبوون )! ئەوەتالەڕاپۆرتی (ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی)دا لەکۆتای ساڵی (٢٠٠٠) ١٠ ملیۆن ئافرەت دووچاری ئایدزبووەدیارەهەربەوەندەش ناوەستێ چونکە هەر کەسێ کاری جنسیان لەگەڵدابکات ئەویش توشی دەبێ ومنداڵەکانیشیان بەنەخۆشی دەبن.،بەڵی خوێنەری سەنگین لەم شوێنەرەوارەشوم و نەگبەتەبەهۆی ماڵ بەجێهێشتنی ئافرەت ولەیەك هەڵوەشێنرانەوەی خێزان پەیدابوون ،کەبەدڵنیایەوەزۆری تریش هەن ،بەڵام ئێمەوەك نمونەومشتێك لەخەرمانێك ئەمانەمان لێرەداتۆمارکردوە، لای خۆمان دەڵێین ئەوکەسەکەسەئەلفێکی بەسە،ئایائەمانەجێگەی پەندوعیبرەت نین بۆکەسانی ژیرومرۆڤ دۆست؟

---

* سەرچاوە: (مجلة الاسرة/ العدد ١٢٩ السنة ١٤٢٤) هـ

# بازگانی کردن بەئافرەتانەوە

هەرکاتێك دینداری ڕاستەقینە لەئارادانەبوولەپێش هەموانەوەئافرەتان زەرەرمەند دەبن ودەچەوسێنرێنەوە،ئەگەرسەیرێکی مێژووبکەین لە سەر دەمی عەرەبەنەفامەکاندابازاری (عکاز)بەناوبانگ بووبەفرۆشتنی کەنیزە ، لەیاسای حامورابیدامادەی (١١٧)پیاوبۆی هەیەژن ومندالەکانی بفرۆشێت ، یان ژنەکەی بدات لەبری قەرزلێەنانەت لەدوای ئیسلام بەدوای شار ستا نیەتی ئەوروپاوئەمریکاتا(سەدەی نۆزدە)بازرگانی کردن بەکۆیلەی ڕەش وسپی باوبو!لەولاتی خۆشماندابەهۆی سیاسەتی داگیرکردن وشەڕی ناوخۆوبرسی کردن بەهەزاران ئافرەت لاشەی خۆیان فرۆشت لەپێناوی پارەنانێك ،دیارەجۆرەکانی بازرگانی کردن بەئافرەتان هەرسەردەمەو بە شێوەیەکەولەگۆڕاندایە،ئێستابەهەزاران ڕۆژنامەوگۆڤار بەوێنەی لەش ولاری ئافرەت دەڕازرێنرێتەوە،یان لەژێرناوی چالاکی هونەری دەیان هەزار فلیمی سێکسی وسینەمایی وتەلەفزیۆنی تۆمارکراوەولەبازارەکانی جیهاندابازرگانیان پێوەدەکرێت،یان هەزاران شریت بەدەنگ وڕەنگی ئافرەت تۆمارکراوە،وەسەدان پێشانگای جل وبەرگ بۆئافرەتان کراوە تەوەبۆمەبەستی بازگانی ،وەدەیان(یانە)ی سێکسی کراوەتەوە جگەلەوەی هەزاران کارگەبەووزەوتوانای ئافرەتان بەکرێ یەکی کەم بەڕیوەدەچێت لەکاری سروشتی خزی کەدایکایەتیە دوورخراوەتەوە،ئایالەمەزیاتردەبێت چی بێ؟بەداخەوەئەم هەمووپێشێلکاری یەلەژێردروشمی ئازادی وسەر بەستی ویەکسانی ئەنجام دەدرێت، چەوسانەوەلەوەزیاتردەبێت چی بێ کەئیشی پیاویشی پێ بکەیت وکاری خۆشی لەوێ بۆستێ جێگەی بەزەییەکەئافرەتان زۆربەم شێوەیەسەرگەردان بوون ودواڕۆژێکی تاریك لەبەردەمیاندایە،کورتەی قسان ئەوەیەکە:

١-ئـافرەت کاتێـك لەبەرنامــەی خـوالادەدات بــەدروشمی بریقەدارفریودەخوات،دوچـاری چەوسانەوەوئابرووتکان وزەبوونی دەبێ!

٢-زۆرجار بەناوی دینەوەبێدین کراوە!موسولمانی دوورلەئیسلام بەناوی دینەوەستەمیان لەئافرەت کردوەلەمافەڕەواکانی بێبەشیان کردوە(لەهەلبژاردنی هاوسەردا،لەدەربڕینی بیرورا،ڕێگەندانی بەخوێندن فێربوون،بەسوك سەیرکردنی و...)

٣ــ لەم لاشەوەبەناوی ئازادی ویەکسانی ومافی ئافرەتان وچی وچیەوەئافرەت کلۆلّ گیرۆدەی دەردی لەئافرەت شۆران وچەوساندنەوەوئابڕوتکان بووە،بەمەردی ئەوکەسەچوەکە(لەکۆلکەی ڕەیەوەبەسەری بەرزای داکەوت)

٤-لەکاتێکداحکم وبەرنامەی ئیسلامی بەشێوەیەکی ڕاست بەڕیوەببرێ،مەسەلەیەك بەناوی (کێشەی ئافرەت)لەئارادا نابێ.هیوادارم گەنجەکانمان لەنافرەتان بزانن ئەودروشمانەی کەئێستابانگەشەی بۆدەکرێ(سەرابەیان ئاوە)!بەرەوکوێیان دەبات؟لەسۆنگەی ڕێزودلسۆزیمەوەبۆرۆلەی مسولمانان بەپێویستم زانی بەکورتی ئاماژەبەومەسەلەیەبکەم چونکەبەناوی کێشەی ئافرەتانەوەزۆرێك لەگەنجان فریودراون بۆئەوەی بزانن کەمەسەلەکەبازگانیەبۆتێرکردنی ئارەزوەکانیان بەناشەرعی پاشان بۆبەدەست هێنانی مالّ وسامان

# ئافرەتان دەبنەسوتەمەنی بازرگانی بەدڕەوشتی

بازرگانی بەمرۆڤ لەشێوەی کەلوپەلی بازرگانیداوەکومەڕوبزرن کڕین وفرۆشتنی پێ بکرێت گەورەترین سوکایەتی کردنەبەمرۆڤایەتی !!بەڵام سوکایەتی وبێڕێزی لەوش گەورەترنەوەیە کەئەوبازرگانیەبۆمەبەستی کاری سێکسی وبەدڕەوشتی بێتلئافرەت بکڕدرێت وبفرۆشرێت بۆ ماوەیەك تەنهابۆتێرکردنی ئارەزووی ئاژەڵانەبێت...!دوای هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران ساڵی ۹۸۹ زاینی شوێنەوارێکی ئابوری خراپی جێهێشت،کە بویەڕێخۆش کەرکەرێك بۆئەوبازرگانیەی،کەئارەزومەندانی سێکسی ئەوروپی ئەوهەلەیان قۆستەوەو بەبردن وکڕینی کچانی سۆڤیەت بۆبازارەکانی سێکسی لەئەوروپائەم بازرگانیەبەشێوەیەك پەرەی سەند کەڕێژەی کارەکەلەئەوروپای خۆرئاوالەسفرەوەبەرزبۆە(۸۰-۰۰۰) تاساڵی۹۹۵ زانینی تەنهالەماوەی شەش ساڵ دا دوای ڕوخانی بلۆکی ڕۆژهەڵات!!وەبەردەوام لەبەرز بونەوەدابوتاگەیشتەزیاترلەنیوملیۆن لئەوەی سەیروسەمەرەیەلێرەداکەئەم بازرگانانە پۆلیسیش ڕێگریان لێ ناکات وکارەکەیان زۆرفراوان بوەوچەندین کۆمپانیاکاریان بۆدەکات لە پایتە-تە کانی ئەوروپا!!..(بۆهۆلس) کەسەرۆکی لەناوبردنی ئەم بازرگانیە بوو ساڵانی (۹۹۷بۆ۲۰۰۲) لەستکۆتلاندەدەڵێ:پێنج ساڵ پێش ئەم بەروارەئەم بازرگانانەلەلەندەن کەم بوو،بەڵام ئێستالەگەڕەکەسورەکانی لەندەن (۸۰٪) ناوچەکەپیك دێنن کەپڕیەتی لەمەهاو شوێنی بەدڕەوشتی بازرگانی کڕین وفرۆشتنی ئافرەتان:لئەم بازرگانیەئەوەندەفراوان بوەکە داناپۆشرێت تەنانەت پۆلیسی نێودەوڵەتی (ئینتەرپوڵ)ڕایگەیاندوەکەخێراترین جۆرەکانی تاوان لەجیهانداکەبەزۆری گەشەدەکات وبڵاودەبێتەوەئەم بازگانیەیە!!وەڕێکخراوی نێو دەوڵەتی دەڵێت:ئەمەبۆتەبازرگانیەکی جیهانی کەنرخەکەی دەگاتەمەلاین دۆلار!دوای هەست کردن بەمەترسی زۆری ئەم بازرگانیەلەماوەی دوساڵ ونیوی ڕابردودا(چل دەوڵەت لەئەمریکاوئەوروپاپەیمانی لەناوبردنی ئەم کارەیان واژۆکرد کەبەوپێیە ئابلۆقەیەکی ئابووری دەخەنەسەرئەوحکومەتانەی کەهاوکاری بازرگا نەکان دەکەن وەبەندکردن بۆماوەی هەشت

ساڵ بۆهەرتاوان بارێك لەوبازرگانانە،بەڵام فریای هیچ ناکەون،بەجۆرێك کەوەك مەسەلە کوردیەکەی خۆمان یان بەسەرهاتوەکەدەڵێت:(تاخاوان ماڵ دزی گرت،دزخاوەن ماڵی گرت).سێ ڕێگەی سەرەکی هەن بۆئەم بازرگانانە یەك ڕێگەی بەلقان بۆئیتاڵیاویۆنان دووڕێگەی بەلتیق کەلەڕوسیاو ئاسیا درێژدەبێتەوەتافیلەنداوئەڵمانیا،سێیەم: ڕێگەی دەریای سپی ناوەراست کەلەباکوردی ئەفریقاوەبۆئیسپانیاوئیتاڵیا..پسپۆڕی (ئینتەرپوڵ) لە بازرگانی بەدرەوشتیدا(هامش ماکۆلۆ):دەڵێت:تۆرەکانی ئەم بازرگانیە لەتوانایاندایە داواکاریەکانی هەرئافرەتێ جێبەجێ بکەن لەماوەی دوو ڕۆژدالەوڵاتی بەڵقانەوەبۆلەندەن. تۆرەکانی ئەم بازرگانیەدەڵالی زۆرچاك ووریایان هەن بۆهاندانی وهەڵخەڵەتاندنی ئافرەتان، لەیەکێك لەفێڵەکانیان (٥٠٠)دۆلار دەدەن بەسەربازەکانیان لەبری هەرئافرەتێك کەبۆیان حەواڵە دەکەن،بەتایبەت ئەوسەربازانەی کەلەوڵاتەهەژارەکانی وەك مۆڵدافیایان لەوڵاتی شەڕوکارەساتی وەك کۆسۆڤا.چالاکی سەربازیان هەیە (هیلفاکۆنداد)کەماوەیەك سەرپەرشتیاری لەناوبردنی ئەم بازرگانیەبوولەیەکیەتی ئەوروپادەڵێ:تەنهالەمۆڵدافیاسەدان نوسینگەو بریکاری خلەتاندن وناردنی ئافرەتان هەیەبۆئەم بازرگانیەلوەدەڵێ:جوانی هۆکارێکی سەرەکیەبۆجموجۆڵی ئەم بازرگانیە،وەهەندێ جارکچە جوانەکان دەڕفێنن لە تۆردوگاکانی پەنابەران وەلەگوندەکانیش دەگەڕێن بۆکچی جوان! وەئەوەی زیاترکارئاسانی کردوەبۆئەم بازرگانیەوپێشی خستوەنەوەیەسنوری ولاتەئەوروپیەکان زۆربەی کات کراوەیە دەتوانی بەگوزەرنامەیەکی تەزویرپێیداتێپەڕی،یان وەك کوردێکی لای خۆمان فانیلەی عەلاگەودەرپێ قۆڵەیەکی لەپێ کردبووتوتکەسەگێکی لەباوەشی دانابوولەناوشەمەندەفەرکە ئیترکەس لێی نەپرسی بوولیان بەپارەو بەرتیل دەردەچێ یان لەخاڵەسنوریەکان کابینەی پەیوەندیەکان هەن کەبونەتەمەڵهاوتاترۆخانەلەرێگەی ئەوانەوە دەرچون زۆرئاسانەلەنێوان وڵاتەئەوروپیەکانندا!لوەئێستائینتەرنێت بەکاردێنن بۆڕاگەیاندنێ ناوی کچان وسەرنج ڕاکێشانی کڕیارەکان ، ئینجالەبەرانبەرگەیاندنی ئافرەتە کەبۆئەوروپاجگەلەلەش فرۆشی

ئەبێ زۆرخۆی ماندووبکات بۆپڕ کردنەوەی قەرزەکانی گەیاندنی بۆئەو شوێنە، دیارە ئەوکات زۆرپەشیمان دەبێتەوەبەڵام تازەسوودی نیەپەشیمانی ، جالەکۆتایی فلیمەکەدا تەنهائافرەتان دەبنەقوربانی کارەکەوسوتەمەنی بازرگانی یەکە، وەمەڵهاو شوێنەبەد ڕەوشتیەکانیش زۆرترین سەرمایەو قازانجیان دەست دەکەوێت،۰۰۰، کارەساتێکی تری ئازادیە ڕەهاکانی خۆرئاوایە کەکار بەدەستان ئەوراگەیاندنانەی خۆیان دەسەپێنن کەگوایە ئەوئافرەتانەی بەئازادی خۆیان لەش فرۆشیان هەڵبژاردوەپێش ئەوەی بێن بۆئێرە! لەدان نانێن بەبازرگانی ئافرەتان ولەش فرۆشی...! ئەمەلەکاتێکدا کەئەمریکاو ئەوروپالافی پێشکەوتن ودروشمی(یاساومافی مرۆڤ)جیهانی پڕکردوەبەڵام ناتوانێت زاڵ بێت بەسەرئەم بارە ناهەموارەدا کەهەرچەندەزۆرهەوڵی بنەبڕکردنیشی دەدەن،تەنانەت ساڵێ ۹۹۸ لە ئیتاڵیابەرنامەیەکیان دانابۆپاراستن وچاودێری ئەوئافرەتانە،بەڵام لەئەنجامداکێشەی یاسایی زیادیان کردبۆچوارئەوەندەی جاران!! دوبارە(ماکۆلو)دەڵێ لەم دوساڵەی دوایدابەرزبونەوەی کتوپڕوبەرچاوی بەخۆوەبینی لەهاتنی ئافرەتان تەنانەت خۆشاردنەوەیان لەماڵ و خێزانیان کەپێشترلێوەی هاتون پەیوەندیەکانیان پچڕاندوە چونکە کارەکەیان ئەوەندە قێزەونەناتوانن پەیوەندی بەکەس وکاریانەوە بکەن ئیتربانەوەوڵاتەچاوێك بگێرن بەوڵاتی خۆیاندالەوەی کەڕوودەدات...، زورناکانیان لەدەمیان بکەنەوەدەمیان داخەن لەتۆمەتبار کردنی وڵاتانی ئێمەناوچەکانی ئێمەپاکن لەوجۆرە نەخۆشیانە،ئەوەندەی کەهەشەئەوان ناردویانەبەدروشمە درۆینەی مافی مرۆڤ وئازادی دەست دەخەنەکاروباری وڵاتانەوەورێزی ئافرەتیش ئەوە بووکە تامـــــــــــــــــــاژەم پێـــــــــــــــــــــــــــدا!!!

(گەل کەبێبەش بوولەڕوشتی بەرز...گەرلەئاسمان بێ ئەگاتەسەرئەرز)

## ئەگەرمام گورگ شوان بێت...حاڵی پەزەکان دەبێ چۆن بێت..؟

پۆلیسی نێودەڵەتی (ئینتەرپوڵ)بێزاری خۆی دەربڕیوە،سکاڵادەکات لەپەرەسەندنی بازرگانی بەدڕەوشتی لەئەوروپاکەبۆتەبازرگانیەکی جیهانی ساڵانەخەرجیەکەی حەوت مەلاین دۆلارەوکۆنترۆڵکردنی ئەستەمە..! (ماکسپیتەر)گەورەلێپرساوی پۆلیسی هۆڵەندا-بەشی لەناوبردنی تاوان —دەڵێت:سزای بازرگانی سێکسی هەندێك جار دەگاتە (١٠)ساڵ بەندکران لەگەڵ ئەوەشدالەسەرژمێری ساڵی (٩٩٧) داچواربەرانبەر بازرگانیەکە زیادی کردوە،تەنانەت لەساڵی رابردودا(١٨٦)ئافرەت بونەتەقوربانی تاوان بارانی سێکسی، لەدرێژەی دان پێدانەکانی دەڵێت کۆنترۆڵکردنی ئەم دیاردەیەزۆرئەستەمە چونکەتاوانەکە لەناوخودی دەرگای پۆلیس لەزیادبوندایە!!!بەڵام کام پۆلیس؟ئەوپۆلیسەی کەئەرکی چەسپاندنی دادوەریەو بەرگی یاسای لەبەرەودوورەلەهەمووبیروڕایەکی ئاینی، درور لەڕەوشت وبەهای مرۆڤایەتی چونکەبەدرۆخستنەوەی دین لەژین ،ژیان دەبێتەمەرگەسات ،بۆیەئەوپۆلیسە(گورگەو لەپێستی مەڕدایە) هەر لە درێژەی قسەکانیدا(پیتەر)دەڵێ بەهۆی نەبوونی هۆکاری ئاینی کۆنترۆڵ کردنی دیاردەکەزۆرگران بووەوبەندیخانەش چارەسەری نیە...،ئێستاش سەرنج بدەن لەکچەقوتابیەکی جوان کەبەم شێوەیە بەسەر هاتەکەی بۆمان دەگێڕێتەوە،لەقوتابخانەهاتمەوەدەرەوە بەرەو ماڵ، لەڕێگا سەیارەیەکی (مافیا)ی بەزۆر فڕاندمی وبردمیەشوێنێکی تایبەت وماوەی(١٥)ڕۆژ لە ژورێکدابەندی کردم وبەردەوام بەدڕەوشتی لەگەڵ ئەنجام دەدام...، لەو ماوەیەداتوانیم لەڕێگەیەکەوەپەیوەندی بکەم بەبنکەیەکی پۆلیسی ناوچەکەوهاتن دەوری ماڵەکەیان داورزگاریان کردم،ئیتربردیانم بۆبنکەی پۆلیس و وامزانی کەڕزگارم بوو بەڵام کوردواتەنی( لەکۆلکەی ڕویەوە بە سەر بەرازی داکەوت) پۆلیسەکان بەپێی یاسا(١٥)ڕۆژی ترمنیان هێشتەوە بەبیانوی لێکۆڵینەوەوبەدواداچاون لەشوێنێکی ترپێشتریەك دووکەس دەست درێژیان دە کردەسەرم، بەڵام لەبنکەی پۆلیس سەرجەم (یاساپارێزەکان)بەواتایەکی ترپاسەوانانی یاسابەدڕەوشتیان

لەگەڵ ئەنجام دەدام !!بەم شێوەیەماوەی مانگێکی خایاندبەنیوەژیان ودامـاوی تاگەیشتمە ماڵــەوە...!لێرەدادەرکـەوت کەتاکەچارەسەرئیسلامەکەقەدەغەی کردوەئـافرەت بەتـەنیا بگەڕێ،کەسێ ترسی خوای لەدڵدانەبێ لەگورگ دڕنـدەترە...حـەڵاڵ وحـەرام نـازانێ لـەهیچ خراپەیـەك سـڵ ناکاتـەوە(گـەردڵێك ترسـی خـوای تێدانـەبێت کەلاوەیـەکی وێرانەیـە)بـەڵێ خوێنەری بەڕێزوخۆشەویست گەرلەخوانەترسی ئەوەدەتوانی هەمووخراپەیەك بەئەنجام بدەیت وەك لەفەرمودەیەکی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە(اذالم تسح فاصنع ماشئت) واتـە: ئەگـەر شـەرم لەخوانەکـەی چـیت حـەزلێ بـێ دەیکەی،ئـەی کوانەوگوتەیـەی دەڵـێن ئەورووپیـەکان ڕۆژئاواییـەکان لایـەنی مرۆڤایـەتیان بـەهێزە...یـان مـرۆڤ دەپـارێزن..هتد،ئـەی بێجگەلـە دارمانی بـواری ئـەخلاقی وکۆمەڵایـەتی ،مەگەرئـەوان نـین داگیرکـەرانی جیهـان ولـەڕووی سەربازی وبەتاڵان بردنی سەروەت وسـامانی وڵاتـانی ئیسلامی ،سـەرباری بـەتاڵان بردنـی سەروەت وسامانی وڵاتانی ئیسلامی ،بەداخەوەکەزۆرێك خڵەتاون بەودروشمەبۆشە--دەنگی دەهۆڵەولەدووری خۆشە.

## کۆتـایی سەدەی بیستەم وزیاترچەوسانەوەی ئافرەت...!

ڕاپۆرتەکان وادەگەیەنن کەساڵانی کۆتـایی سـەدەی بیـستەم پڕبـون لەچەوساندنەوەوپێشێل کرانـی مافـەکانی ئـافرەت ،چـونکەئافرەتان بەهەمووچین وتوێژەکانیەوەتوشـی ڕاوەدونـان وتوندوتیــژی بونەتەوە،ئەوەلــەوڵاتانی خۆرئاوائەیـنـــەلای خۆمـــان ڕێـــزی تایبـــەتیان هــەبوە(منظمةالعفوالدولیــە)لــەڕاپۆرتێکی (١٣٥)لاپــەڕەیی دا داوالەوڵاتانــە دەکــات کەچـیترئافرەت نەچەوسـێننەوەوتوندوتیژیان بەرانبەرنەکـەن مـافی ئـافرەت لـەوڵاتێکی وەك ئەمریکاکەساڵانەتەپڵ وزورنای بۆلیدەدات وخۆیان بەلێپرساوی ئەم داخوازیانەدەزانن،بەڵام چـــەندین تیمــی ســـەربازی دروســت بــوون کــەکاریان دەســت گیرکردنــی ئافرەتــانی تازەپێگەیـشتوەلەنێوانی(١٥-٢٠)سـاڵیدابەکاریان دێـنن بۆکـاری بازرگـانی وسینەمایی فلیمی جنس...،وەك ئـەوتاوانبارەی کەسـاڵی (٩٩٣)لەئەمریکادەستگیرکراکە(١٣)کـچی

منـدالكاری ڕفاندبولەشـەقامەكانی ئەوولاتەلەشـوێنێكی تایبـەتی خـۆی لەدارستانەكانی ویلایـەتی(كالیفۆرنیـا)ودوای بـەكارهێنانی لـەفلیمی سێكـسی داكوشـتبونی لاشـەكانیانی فڕێدابوون...ئەم كارەوچەندین كـاری لەوجۆرەكـەخۆی بەشـای شارستانێتی ودیموكراسیەت دەزانێ وەخۆی بەپارێزەری مافەكانی مرۆڤ دەزانێ!ئەوخوێن ڕشتن وداگیركاریەی ولاتـانیش بابوەستێ كەبەناوی شـەڕی تیرۆرەوەدەیكـات بۆپـاوەن كردنـی جیهـان،وە هـەمان ڕاپـۆرت دەڵێ ئەوئافرەتانـەی كەلەشەڕدابەشـداری ناكـەن بـێ پـشتیوان دەمێننەوە،لایەنەشـەڕەكان دەست گیریان دەكەن ودەست درێژیان دەكەنەسەروپاشان ئاوارەدەبن وپۆلیسی سەرسنورەكان هـەمان كاریـان لەگەڵدائـەنجام دەدەن!دیـسانەوەتوشی بـێ كـەس وبرسـیەتی دەبنـەوە،وەك ئافرەتـان ومنـداڵانی بۆسـنی وكـشمیركەلەلایەن ڕژێمـی سـتەمكاری صـربی سـیخی هیدنیەوەچـی نەماڵەگـەڵیان نـەكرێ ڕاپۆرتەكـەی ڕیكخـراوی لێبـوردنی نێودەوڵـەتی دوبارەدەڵێ ٨٠٪ی ڕێژەی ئاوارەئافرەت ومنـداڵن چـونكەئەوان نـاتوانن بـەرگری لـەخۆیان بكەن ناچارهەڵدێن وئـاوارەدەبن لـەكۆتایی ڕاپۆرتەكـەدادەڵێ ئەگـەرولاتانی جیهـان پابەنـد نـەبن بەپاراسـتنی مافـەكانی ئافرەتـان ئەواسـزای ئەولاتانـەدەدات كەمافـەكانی پێـشێل دەكـەن،وەدەبێت ئەمریكاسـزای خـۆی بـدات لـەپێش هـەموان چونكەسەرچـاوەی تیرۆرودەسـتگیركردنی ئافرەتانەلەجیهانـداو وەیەكـەم سەرچـاوەی بازرگانیەبەئافرەتەوە،وەیەكـەم بەرهـەم هێنـەری فلیمـی جنـسی وداهێنـانی كـاری فاحیـشەولەجیهانداكە(٥)ملیـۆن ئـافرەت تیایداسـەرگەرمی كـاری خراپـەكاری ولـەش فرۆشـین!سـەیرلەوەدایەكەحكومەت بـەكارێكی ئاسـایی ویاسـایی ئـازادی لەقەڵـەم دەدات چـونكەئابوری ولـات بـەرەوپێش دەبـات!ئەمەیەبەرهـەم ودەرهاویـشتەكانی پێـشكەوتن وشارستانیەتی ئەمریكا، سەرلێشێواوانی لای خۆمـان بـەناوی مـافی ئافرەتانەوەبانگەشـەی بۆدەكەن!لەكۆتایدادەڵێم ئاقڵ ئەوكەسەیەپەندلەغەیری خۆی وەردەگرێ ئێوەش سەرنج بـدەن لەسەرەنجامەكانی ئافرەتانی خۆرئاواتاخۆبەرەوكوێیە؟

## سفوری ( ڕوتی ئافرەتان )

سفوری کەزادەی ڕۆژئاوایە بۆموسڵمان نەگونجاوە ونارەوایە،بەداخەوە بۆ ئەوانەی موسڵمانن کەشوێنکەوتەی ڕێبازی بێباوەڕانن!بەناوی پێشکەوتن ومۆدیل وچاولێکەری،بێئەوەی بیربکەنەوە لەوەی بۆیانگونجاوەیان نا،حەلاڵە یان حەرامە،چون ئەوەی پێچەوانەی شەرع بێت ڕەتکراوەیە وەك چۆن لاشەی تەندروست وساغ میکرۆب وشتی نامۆقبوڵ ناکات،دەبێ کەسێتی موسڵمان بەهێزوپێشەنگ وسەرمەشق وسەربەخۆبێت،نەك پاشکۆوکارلێکراوبێ،جێگەی داخ وسەرسوڕمانە بۆونافرەتەی موسڵمانە هەڵگری شێوازی بەرگی بێباوەڕانە! بەبەرگی ئاڵووالای سەرنج ڕاکیش یانکورت وتەنك وتەسك وەکپانتۆڵ شەنتۆڵ وتەنورە وسێچارەگ...،کەوێنەی ئەندامی جەستەیان دەردەخات،یان ئەوەندە تەنکە گۆشت وپێستی دیارەلیان تەقەی قۆندەرەوخرینگەی ئاڵتون بۆئەوەی لابکەنەوە بەلایدا جگەلەبۆن وبەرامەی لەڕادەبەدەر،کەئەمانە بۆبێگانە حەرامە، بەداخەوە کەئەوانیش بەزۆری بۆبێگانە خۆیان ئارایشت دەکەن بەپێچەوانەی سوننەت!کەئەوەش دورە لەنەریتی کوردایەتی وئیسلامەتی کەلەڕاستی دا کوردایەتی بەشێکەلە ئیسلامەتی، سەیرە بۆخەڵك ئەئی وخۆی بۆئەڕازێنێتەوە لەجیاتی ئەوەی بۆپیاوەکەی بێت، لەلۆمەی خەڵك ئەترسێ لەجیاتی ئەوەی لەخوابترسێ،خەڵك ڕازی دەکات لەجیاتی ڕەزامەندی خوا...! ئەوانەن کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبارەیانەوە فەرموویەتی(کاسیات عاریات) داپۆشراون بەلام ڕوتن لەبەرتەسك وتروسکی جلەکەی یان کەموکورتی وەك تەنورەوپانتۆڵ یان لەبەرتەنگی وەك جلەکوردیەکانی ئەمڕۆ..بەڵێ فیتنەی ئەوانەگەلێکەورە وگرانەبۆتێك دانی کۆمەڵگاوبۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی ئەوانە ناچنە بەهەشت(لایدخلن الجنە...) وەبۆنیشی ناکەن کەبۆنی بەهەشت ئەوەندەساڵ ڕێ دەڕوات(پەنابەخوا)

**زیانەکانی سفوری :**

١ــ دەبێتە فیتنەبۆپیاوان کاتێ لەش ولاری جوانی دەردەخات ..،دڵی پیاوتێك دەدات وناچارپێکەنین ولاوانەوەو تێکەلاوی تادەگاتە مەوعیدوتەسلیم بوون بەشێوەیەی ناشەرعی

٢ــ نەمانی شەرم حیالای ئافرەت، لەکاتێکدائافرەت بە جل وبەرگ وشەرم وحەیاورێزە وە جوانەو نمونەی پێ دەهێنرێتەوە کەوتراوە: (وەك بووکی ناوپەردە بەشەرم وحەیایە) نەمانی شەرم وحەیاش واتە نەمانی ئیمان ودەرچوونی لەسروشتی مێیینەی خۆی.

٣ــ لەکاتی ڕوتی وتێکەڵی ئافرەت لەگەڵ پیاواندا خۆی بەیەکسان دەزانێ وهەرچی ئەوان بیکەن ئەمیش دەیکات ئەوکات فیتنەوفەسادی وخراپەکاری دروست دەبێت،هەرچەندەلەمرۆڤایەتیدا یەکسانن بەلاَم دوورەگەزی جیاوازن .

جانەی سەرپەرشتیارانی ئافرەتان: ئەوەتاخوای گەورە بانگەوازدەکات لەباوەڕداران کە خۆتان وماڵ ومناڵتان بپارێزن لەئاگرێك کەسوتەمەنیەکەی خەڵك وبەردە﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ..﴾پێشەواعەلی(ڕەزای خوای لێبێ) لەراڤەی ئەم ئایەتەدادەڵێت:(علموا انفسكم واهليكم الخير)واتە:خۆتان وخانەوادەتان فێری خێربکەن،چاکترین خێروچاکەش ئەوەیەکەلەسەرڕەوشتی بەرزو جوان پەروەردەیان بکەین،فێری یاساکانی شەرعیان بکەین تاکو ڕۆشنبیروتێگەیشتوبن،بۆئەوەی لە ئاگری دنیاودوارۆژپارێزراوبن.

**ئەی باوکانی موسڵمان :**

ئایادەتەوێ کچی جگەرگۆشەت بچێتە ناوئاگر؟

ئایاحەزدەکەی کچەکەت جل وبەرگێکی لەبەردابێت کەشەرم وحەیاو ئابڕوی تیانەبێت وحەیاوحورمەتیش نیوەی ئیمانە ؟

ئایارازی دەبی کچەکەت ببێتە پێشانگای جل وبەرگ وەك کالآی بازارلە بەردەستی هەمووکەس دابێت وسەیری بکەن وبەکاری بێنن؟

ئایـارازی دەبـی لـەرێبازی ئـاینی بـاوك وباپیرانـت دەربـچێ وبـەناوی مۆدێـل وئـازادی ودیموکراتییەوە بچێتە سەرێبازی گاوروجولەکە وببێتە کەسێکی ڕۆژئـاوایی یـان ئـەوروپی؟ کەئەوان دژی تۆن؟

ئایانازانن کەلەڕۆژئاوا ئافرەتانیان بەهۆی شەپۆلی لافاوی بەرەلآییەوە بونەتـە بوکەشوشـەی دەستی منالآن ووەك سەرئاوبونە شـوێنی خۆخـالّی کردنـەوە وسەرچـاوەی نەخۆشـی ئایـدزو زوهری ژیانییان لیّ بووە بەژان؟

كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ.

شاعیرجوانی وتوە:

میوە گەرتوێکلّی نەبێ مێش ومەگەزدەوری دەدەن

پرتەقالّم خۆش دەویّ پاك وخاوێن و گـولّ بـەدەن

ئافرەتیش، هەروایە بەرگی عیففەتە جوانی دەکا

مەریەمەی لێدەردەچیّ یان فاتیمەی دایکی حەسەن

# زیانەکانی تێکەڵاوی کوڕان و کچان

شاراوەنییە لای مرۆڤی ژیر کەتێکەڵاوی ڕەهای نێر و مێ زیان بەخشە ومەترسیدارە بۆ هەردولا ،وڵاتانی خۆرئاوا تازە بە تازە هەست بەو زەرەر وزیانە دەکەن کەلەئەنجامی تێکەڵاو کردنی کوڕان و کچان لەدام و دەزگاکان بەتایبەت لەقوتابخانەکان بەدابەزینی ئاستی زانستی خوێندکارەکان ،بەناچاری ئێستا هەوڵ دەدەن کەجودایان بکەنەوە لەزانکۆ و پەیمانگاکاندا ،زۆر لەو کەسانەی کەسەفەریان کردووە ئەم جیاکردنەوەیان بینیوە ، لەوانەمامۆستای پەروەردەیی (ئەحمەد مەزهەر )کە وەك نوێنەری پەروەردەی سوری لەسەردانێکی زانستیدا بۆ وڵاتی بەلجیکا هەندێ لەقوتابخانەکانی ئەو وڵاتەی بەسەرکردەوە،لەیەکێك لەقوتابخانە سەرەتاییەکاندا پرسیاری لەبەڕێوەبەرەکەی کردبووبۆچی لەم قۆناغەدا جوداتان کردونەتەوە ؟ لەوەڵامدا وتی پێشتر دوچاری زیانی زۆر بوین بەهۆی تێکەڵاوییەوە ،لەئەمریکا زیاتر لە (١٧٠) بەشی زانکۆی ئێستا کوڕو کچ بەجیا دەخوێنن ، ئەمەش لەئەنجامی ئەو ماڵ وێرانیەی کەبەهۆی تێکەڵاوی ئاژەڵیانەوە دوچاری بوون ! بەگونجاوی دەزانم کەئەو پەندە کوردییە بهێنمەوە کەدەڵێ : (ئەوەی کەبەبێوەژنی دەیکەی بەکچی بتکردایە )..، گەورەیی لەوەدایە کەدوژمنان شایەدی بۆ ئەم ڕاستییە دەدەن :- نوسەری ئینگلیزی (الدیکوك) دەڵێ : تێکەڵاوی ژن و پیاو لەدام و دەزگاو قوتابخانەکاندا منداڵی بێ باوك و گەندەڵی ئیداری و فەسادی ئەخلاقی زۆری لێ کەوتۆتەوە،چونکە سروشتی کوڕ و کچ وایە لە منداڵیدا حەز بەتێکەڵی یەکتر ناکەن ، کەگەورەش بوون بەهۆی حەزوو ئارەزویەکەوە گەر کوڕێ تێکەڵی کچان بێ پێی دەڵێن کچانی یان ژنانی وە بەپێچەوانەشەوە،ئەوەیش نوسەری بەناوبانگی عەرەبی (ئیحسان عەبدول قودوس) کەسەردەمێك بەنوسینەکانی دنیای پڕکردبوو بە بانگەشەی ڕووت کردنەوەی ئافرەت و هاندانیان بۆ تێکەڵاوی ژنان و پیاوان لەیانەو ئاهەنگەکان ودامودەزگاکان..،ئێستا لەچاوپێکەوتنێکی دالە ڕۆژنامەی (الانباء)ی کوێتی لە١٨/١/٩٨٩ لەگەڵیدا ئەنجام

درابووده‌ڵێ: کاری هەرە گرنگی ئافرەت بەڕێوە بردنی ماڵ ومنداڵە، وەدەڵێ ئەگەر خێزانەکەم نەبێ ، من ناتوانم پاراستنی خێزان و ئارامی و سەرکەوتن بەدەست بێنم چونکە خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆکاری ماڵەوە پاراستنی خێزان وتی:حەوانەوە بۆ هەموان ،واتە پەروەردە کردنی نەوەی دوارۆژ.، ئەمەو دەیان لەزانایان و دانایان دانیان بەمەترسی تێکەڵاوی دا ناوە کەچۆن کۆمەڵگا دەڕوخێنێ دوچاری سەدان نەخۆشی دەکات کە ئایدز ئاسانەکەیانە پێشینانیش وتویانە (سەد حەکیم بەقەد دەردەدارێ نازانێ) لێرەدا گەورەیی یاساکانی ئیسلام دەردەکەوێ کەئەم دیاردەیەی حەرام کردووە ، تەنها لەکاتی پێویستدا نەبێ ئەویش بەمەرجەکانی خۆی ،لەپێناوی پاراستنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەفەسادی ئەخلاقی...دوای ماڵ وێرانی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا لەبواری کۆمەڵایەتیەوە بەداخەوە تازە لای خۆمان خەڵکانێکی ئارەزو باز و کەم ئەزمون بانگەشەی تێکەڵاوی کورو کچ دەکەن لە قوتابخانەکان، وادەزانن مافی مرۆڤ ویەکسانی لەوەدایە!!گەر لەناخەوە قەناعەتیشیان بە ئاینی ئیسلام نەمابێ با پەند لەو ڕوداوانە وەربگرن و بەقسەی زانایان ودانایان بکەن و بەرژەوەندی گشتی نەتەوەیی بخەنە سەروی حەزو ئارەزوی تاکە کەسییەوە یان سەپاندنی ئایدیای حزبێك .

# خوێندنەوەك بۆرۆژی جیهانی ئەیدز......AIDS

ئەیدز دەردێکی بێدەرمانە،کەلەرێگەی ڤایرۆسی(HIV) مرۆڤ توشی دەبێت وبەهۆیەوە سیستەمی بەرگری لەش لەبەرانبەرنەخۆشیدا تێك دەدات،ئەم پەتاکوشندەیەلە(١/١٢/٩٨١)لەئەمریکا دۆزرایەوە،(لەولاتی نێربازوزیناکاران) ڤایرۆسی ئەم پەتایەسارییەوزووبلاودەبێتەودونەمانی بەرگری لەشی لێدەکەوێتەوە،بۆیە توشبوانی لە(٤٠)ملیۆن تێپەری کردووەو(٢٥)ملیۆن گیانیان لەدەستداوە کە(٢٦)ملیۆن لەوچلەلەکیشودری ئەفریقیایەو(١٥)ملیۆن منالی هەتیوکردووەلرۆژی (١٤)هەزارکەس دەیگرێتەوەکەزۆربەیان منال وهەرزەکارن، (٨٠./.)ی توشبوانی ئەم نەخۆشیەلەرێگەی سێکسی ناشەرعیەوە دووچاری بوون،بەتایبەت کرداری سێکسی لەگەل کەسانی جیا جیاوجوتبونی پیاولەگەل پیاو(نێربازی) یان پیاولەگەل ئافرەت لەرێگەی کۆمەوە یان جوت بون لەگەل ئالودەبوانی ماددەهۆشبەرەکان،سەیری کتێبی (تەندروستی وژیان)لاپەرە(٩٥ــ٩٦)بکەلەبلاوکراوەکانی یونسێفەوکەهیچ پەیوەندیشی بەئیسلامی ودینەوە نیە بەزمانی حال ومەقال هاواردەکات ودەلێت ئەوەدەرهایشتەکانی پەتای عەولەمەودامێن پیسیەو گەرلەناوم نەبەن لەناوتان دەبەم،خۆتان دەلێن خۆپاراستن چاکترە لەچارەسەرکردن،ئەی بۆچی واناکەن؟بۆلەپێناوهەواوئارەزووبازرگانیدامرۆڤەکان قردەکەن؟!،لێرەدا ئەگەرسەرنج بدەین لەهۆکارەکانی توشبونی ئەم پەتایە کەلەناوئەوکتێبەدایە،گەورەترین وانەوپەندە بۆ سەلماندنی راستیەکانی دین وگەورەیی ئیسلام،کەسەرجەم ئەوشتانەی حەرام کردووە کەوەك هۆکاری توشبون بەم پەتایە لەوکتێبەداباسی لێکرایە!قورئانی قسەلەجێ لە سورەتی ئیسرا/ئایەتی(٣٢)ئاگادارمان دەکاتەوە کەدوربکەوینەوەلەپێشەکیەکانی زیناودامێن پیسی چ جای زینا کەلەتاوانەگەورەکانەوسزای رەجم وحەددی بۆداناوە،تاوەکوشیرازەی خێزان تێك نەچێت وکۆمەلگا پاك وحەیاوناموس پارێزراوبێت،دەیان ئایەت وفەرمودەلەوبارەهەن کەهانمان

دەدەن بۆئەوەی بەڕاستی و بەکردەوە مرڤانەبژین جیاوازلەژیانی ئاژەلآن کەبەرپرسیارنین، تەنانەت غیرەتی ئاژەلآنیش زیناوتێکەلآوی نادرووست قبولٚ ناکەن جگە لەبەراز کەئەویش حەرامکراوە،خۆتان زۆرجارکۆتر وجۆلەکەتان بینیوە کە پارێزگاریان لەمیینەکەی خۆیان کردووەلەوەی کەیەکیکی ترلەگەڵیداجوت بێت!سەرجەم حەرامکراوەکان بۆبەرژەوەندی ژیان وژیاری مرۆڤەکانەوەك (ماددەهۆشبەرەکان،بەراز،زینا،...) ڕۆژگار سەلماندی کەدەردوبەلآو پەتا کوشندەکان لەئەنجامی بێفەرمانی خوایە، سەرچاوەی گرفت وقەیرانە کانیش ئەوروپاو ڕۆژئاوایە،ئیترکاتی ئەوە هاتووەکەدلٚنیابین لەڕاستی وچاکی وپاکی ئیسلام وگەڕانەوەبۆ گوێڕایەلٚی فەرمانەکانی پەروەردگار،نەك بەندایەتی هەواوئارەزوی نابەجێ، بە خوێندنەوەی وردوزانستی بۆهەرکام لەئایدزوئەنفلۆزای بەرازوقەیرانەسیاسی وکۆمەلآیەتیەکان دەردەکەوێ کەئیسلام ئارامی وتەندروستی وپێشکەوتنەوپارێزەری ژیانی مرۆڤەکانە.

**موعجیزەیەکی زانستی:**

**(ئۆرالٚ سێکس) دەبێتەهۆی توشبون بەشێرپەنجەی گەروو!**

ئەوەناونیشانی لێکۆلٚینەوەیەکی زانستیەکەلەزانکۆی ئۆکسفۆردئەنجام دراوەولەگۆڤاری شێر پەنجەناسیدابلآوکراوەتەوە،کەئەنجۆشیەکەلەمژینی ئەندامی ڕەگەزیەوەدەگوازرێتەوەوبەهۆی ڕەگەزیازیەوەدوچاری دەبن،وەك دەبینن ودەبیستن لەبانگەشەی ئێربازی کەدەرهاویشتەی فیکری(جێندەرە)وسیفەتی قەومی لوتەوهی سەردەمی نەفامیە! کەهەمونەمانە ئیسلام حەرامیکردوەبەخاتری بەرژەوەندی دنیاودوارۆژیان،(سبحان الله) لەگەورەیی ئەم دینەلەهەر بوارێکەوەسەرنجی بدەی موعجیزەیە! سەنج بدەکەئێستابەمەلاین خەلٚك دوچاری شێرپەنجە بون ویان لەناوچون،خۆنەگەرنەگەڕێنەوەهەرخۆیان زەرەد دەکەن(فلاتاس على القوم لفاسقين)

---

سەرچاوەکتێبی تەندروستی وژیان/ یونسێف HEAITH AND LIFE..

# داپۆشینی عەقڵ یان جەستە..!؟

ئەوەی کەئیسلام داوای دەکات حیجاب وداپۆشینی جەستەیەنەك داپۆشین وداخرانی عەقڵ، کەسانێکی زۆردەبینی کەعەقڵیان داپۆشیوەوجەستەولاشەیان ڕوتە(سفورە)! لەبەرئەوە بانگەشەی دامالینی بەرگی حەیاوحورمەتیان بۆدەکردبۆئافرەتان،وەك شوێن کەتوانی ئەتاتورك وشای ئێران محمدئەمانی ئەفغانستان وئەحمەدزۆغۆوئەنوەرخۆخەی ئەلبانیا و هوداشەعراوی وفەهمی وقاسم لەمیسر...،ئەمانەزۆری تریش کەبانگەشەی بەڕۆژئاوایی بوونی ئافرەتیان دەکرد،بەڵام دوای تێگەیشتن وکرانەوەی عەقڵیان هەندێ لەشوێن کەتوانیان پەشیمان بونەوەلەهەڵوێستی ڕابردوویان،ئەوەتادکتۆرەنەوال سەعداوی کەسالانێکی زۆردژایەتی حیجابی کردوەبانگەشەی دەکردبۆسفوری ئافرەتان ...دوای پاشگەزبونەوەی لەوهەڵوێستانەی دەڵێ:ئێمەسەرەوبن حالّی بوین!پێویستەجەستەولاشەمان داپۆشراوبێت عەقڵمان ڕووت وکراوەبێت!وەدەڵێ:من لەسەرجادەوشۆستەکانی لەندەن ئافرەتانی نیمچە ڕووت دەبینم وەك کەل وپەل لاشەی خۆیان ڕادەنوێنن،وادەزانن پێشکەوتن وشارستانی لەوەدایە،بەڵام حیجاب قەت ڕێگرنەبووەلەتێگەیشتن وپێگەیشتنی ئافرەتان، ئەوەتاعائیشە شەرع زان بووەڕەفیدەدکتۆرەبووەنوسەیبەش موجاهیدەبووەو...،

حیجاب چەندمەترە قوماشێکەوەك باقی کوتاڵەکانی ترهیچ زیرەکی وتەمبەڵی ناگۆڕێ، وەڕێ لەبیرکردنەوەناگرێ،بەڵام داپۆشەری عەورەتەولەچاوی خراپکاروچاوچنۆك دەتپارێزێ ئەوان عەقڵیان داخراوەوبۆچونەکانیان ناتەواوە،جێگەی سەرنج وسەرسوڕمانە کەپێشکەوتن و دواکەوتنی گەلان ببەسرێتەوە بەچەند مەترە.قوماشێ ! لە کاتێکدا ئەو باڵا پۆشییە تەنها نیشانەی پاکی و ڕەوشت بەرزییە ،وە ئەو کەسە خوا لەخۆی ڕازی دەکات و خۆی دەپارێزێ لەخراپە و بەرزکردنەوەی دروشمی دامێن پاکی و وابەستەییە بەدینەوە . پۆشاك جگە لەوەی کە یەکێکە لەجیاکەرەوەکان لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا ، لاشەدەپارێزێ لەهۆکارە سروشتییەکان ، جائەگەر ئافرەت خۆی وەکو مرۆڤ سەیربکات ئاوا خۆی ڕوت نەدەکردەوە

وەدەڵێ : زۆر لەڕۆشنبیرو خوێندەوارەکان دەبینم کەلاشەو سەریان ڕوتە بەڵام تێگەیشتن و ژیرییان داخراوەو داپۆشراوە ! دوچاری دەردو نەخۆشییەکانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بوون ئایا ڕۆشنبیری و پێشکەوتن لەمۆدێل و سفوری و چاو لێکەری کوێرانەدایە؟ یان لەهونەرو سەماو گۆرانی دایە !؟ کەئەمانە دەردو نەخۆشییەکانی پێشکەوتنن ، بێ ئاگان لەوە کە میللەتی ئێمە تایبەت مەندی و ڕەسەنایەتی خۆی هەیە ولەسەرجەم بوارەکانـدا کەجیای دەکاتەوە لەگەلانی تر . وەلەوەڵامی پرسیارێکداکەلەڕۆژنامەی (الوطن) ی کوێتی ئاراستەی دکتۆرە نەوال کرابوو : ئایا ئافرەتانی ئەوروپا نمونەی پێشکەوتنن ؟ وتی نەخێر ، هەرچەندە ئەوان لە چەند ڕویەکەوە پێشکەوتون بەڵام لەزۆر بواردا زۆر ترین ستەمیان لێدەکرێ و دواکەوتون ، ئەوەتا یاساکانی هاوسەرگیری زۆر ستەمی لەئافرەتان کردووە ، بۆیە دەبینی بەردەوام لەجموجوڵی ڕێکخراوەیدان بۆ گێڕانەوەی ماف و ئازادییەکانیان وەهەروەها لەئەمریکاش جموجوڵ وکاردانەوەی بەهێز سەر هەڵدەدەن ، چونکە ڕێچکەو بیردۆزەکان کە هەڵقوڵاوی ئارەزوی مرۆڤەکانن حەتمەن لایەنگیری چین و کۆمەڵێك دەکەن لەسەر حسابی خەڵکی دیکەو پاشان لەژێر فشارو گوشاردا نەبێ مافی ئەوانی تر نادەن دیارە هەرکەس بەرژەوەندی خۆی دەبینێ،وەك پێشینان وتویانە:(سەرچۆپی بدە دەست گامێشێ بۆ لای کادێنێی دەکێشێ ) . بەڵام لە وڵاتی موسوڵمانانـدا بەدرێژایی مێژووی ئیسلام مادام شەریعەت پیادەکرابێ ، ئافرەت کێشەیەکی وای نەبووە کە ناچاربێ کۆبونەوەوخۆنیشان دانی لەپێناو بکات ، وەك هی ڕۆژئاواییەکان ،کەچەوساندنەوە نەبێ کاردانەوەش نابێ وکەسێ ستەمی لێنەکرابێ هاوارناکات.

# بێ بڕوایانیش ناچار هەندێ جار دان بەڕاستیەکاندا دەنێن

موسوڵمانانی بەڕێز وخۆشەویست لێرە دەمەوێ چەند قسەو دان پێدا هێنانێکی ژمارەیەك نەنوسەرو ناودارانی بێ بڕوایان دەخەینە ڕوو تاکو بەپێی یاسای (مِن فَمِك ادينُكَ) کەئەو نیعترافانەش ببنە بەڵگەیەکی تری ڕاستی مافەکانی ئافرەت لەئیسلامداو گەورەیی ئیسلامیش لەوەدایە کەناحەزانیشی شایەدی ڕاستی بۆ دەدەن ، بۆ بێدەنگ کردنی کەسانێك کە قسە و دان پێداهێنانی زانایەکی ڕۆژئاوایی لا بەهێزترو کاریگەرتر بێ نەبەڵگەی زانستی ، نەك بۆ موسوڵمانان کەپەکیان لەسەر شایەتی ئەوان کەوتبێ !

بێگومان زانا و ناودارانی بیانی زۆر هەن کەدانیان بەڕاستییەکانی ئیسلامدا هێناوە ئێمە تەنها چەند نمونەیەکیان لێ باس دەکەین :

١-(میخایل گورباتشۆف) ی سەرۆکی سۆڤیەتی جاران وتویەتی : کارێکی هەڵە و خراپمان کرد لەساڵی ٩٢٤ بەدواوە هەوڵی زۆرمان دا بۆ یەکسان کردنی ژن و پیاو لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا و ئافرەتمان لەماڵ هێنایە دەرەوە وەك پیاو ، لەئەنجامدا ماڵەکان وێران بوون مندالی بێ دایك و باوکی لێ کەوتەوە کەعیناد وبەرەڵاو خراپ بوون چینێکی بێ پەروەردە و بێ کەس دەرچون کە بۆمان چارەسەر ناکرێن ....، چونکە سروشتی ئافرەت وایە کە سۆز و عەتف و ئارامی لەپیاو زیاترە بەشێوەیەکە کە گونجاوە بۆ دایکایەتی وپەروەردەکردنی مناڵ ،جا لەبەر ئەوە ئافرەت بەکار وسیماوجل وبەرگ وسروشتی خۆیەوە جوانە ، پیاویش لەبواری خۆیدا سەرکەوتووە .

٢-گۆستاڤ لۆبۆن:کەئیسلام هات مافەکانی ئافرەتی چەسپاندو شیرازەی ماف و ئەرکەکانی دامەزراند ... وەئەوەی ئافرەت لەسایەی شارستانییەتی ئیسلامدا پێی گەیشتوون خوشکە ئەوروپایەکانیان تازە چنگیان کەوتووە ، وەئیسلام گەلێك کۆت وبەند کەلەسەردەمی نەفامیداباو بوون ئافرەتی لێ ئازاد کرد کەلە میراتدا بەشدار بێت وە لەڕووی ئابورییەوە بوو بەخاوەنی سامان و ئەوەی هەیەتی مێردەکەی دەسەڵاتی بەسەردا نییە و سەربەخۆیە ،

وەلەڕوی کارو باری کەسێتی چاکسازی زۆری کرد چونکە هەم تەڵاق و فرە ژنی پێشتر نارێکی زۆریان تێدا بوو ڕێکی خست و مەرجی زۆری بۆ دانا .
٣-هیملتۆن : یەکێکە لەناودارانی ئینگلیز ، سەبارەت بەڕێز و حورمەتی ئافرەت لەسایەی ئیسلامدا گوتویەتی : (بێگومان یاساکانی ئیسلام بە ڕاشکاوانە گرنگییان بەپاراستنی ئافرەت داوە لەهەر شتێ کە ببێتە مایەی ئازار دان و ڕوشاندنی کەسایەتی ، هەندێك لەنوسەران واگومان دەبەن ئیسلام تەنگی بەئافرەت هەڵچنیوە بەهۆی فەرمان کردنی بەباڵا پۆشی ، بەڵام ئەوەندە هەیە داخوازییەکانی جوامێری و پاراستنی ناموسی ڕەچاو کردووە )
٤-بەرتراند ڕاسل : فەیلەسوفی ناوداری ئینگلیز کەسەرجەم ئەوروپا شانازی پێوە دەکات ئەویش گوتویەتی : خێزانی ڕۆژئاوایی بەهۆی بەکار هێنانی ئافرەتەوە لەکارو بارە گشتییەکاندا لەبەر یەك هەڵوەشاوە ، وەبەئەزمون دەرکەوتووە کە ئافرەت تەنها لەکاری خۆیدا تەواو سەرکەوتووە .
٥-جان جاك ڕۆسۆ : ئەمیش کەباوکی ڕۆحی شۆڕشی فەرەنسایی (١٧٩٠) دادەنرێ لەکتێبی (ئەمیل) دا بۆچون و هەڵوێستی خۆی لەبارەی ئافرەت بەم شێوەیە خستۆتە ڕوو -پێویستە ئافرەت لە ڕێی سەر گەرم بوون بەئەرکی سروشتی خۆیەوە خزمەت بە کۆمەڵگا بکات ، کە بریتییە لە گرنگی دان بە مێرد و منداڵەکانی ..- دەبێ ئافرەت لەجیاتی لاسایی کردنەوەی پیاو هەوڵ بدات مێینایەتی و ئافرەتایەتی خۆی تۆخ بکاتەوە و لەدەستی نەدات .- پێویستە ئافرەت ماڵ و حاڵ بەجێ نەهێڵێت بەبیانوی کاسبی و ئیشکردنەوە بەملاو لادا بڕوات ، دەبێ وریا و هۆشیار بێت و پیاوانی چڵێس و نیاز خراپ بەناوی مافەکانی ئافرەت ویەکسانی لەگەڵ پیاودا نەیخەنە تەڵە وداوی خۆیانەوە .
٦- میشێل فوج :کەئافرەتێکی سەماکەر و ڕاقیێەی فەرەنسییە لەچاوپێکەوتن و دیدارێکی گۆڤاری (الاسبوع العربی) لوبنانی دا باسی ئیش و ژان و بێدەرەتانی خۆی و خوشکە ڕۆژ ئاوایەکانی کردووەو دەڵێ: پاش ئەوەی بابم و خێزانەکەمان دەست بەردارم

بوون ، ناچار بووم نیشێك بدۆزمەوە تاوەکو ژیان و گوزەرانی خۆم دابین بکەم ! بابم یەکێك بوو لەگەورە پیاوانی پیشەسازی دەوڵەمەند لە (پاریس) ، جا بەبەڵگەی ئەوە کە ئەویش خۆی لەتەمەنی شانزە ساڵیدا چۆتە نێو گۆڕەپانی ژیان و گوزەرانەوە ، ڕازی نەبوومەسرەفم بکێشیێ ! چونکە دەبێ منداڵەکانیش خۆیان کار بکەن و بژێوی پەیدا بکەن و نەبنە بار بەسەرییەوە ، وەدەڵێ : باوکم لەگەڵ دایکم زۆر دڵڕەق بووبەخراپی لەگەڵی دەجوڵایەوە ، چونکە جارو بار هاوکارییەکی کەمی منی دەکرد !) لە
درێژەی قسەکانیدا دەڵێ :(دایکم چاکەتێکی (فیزۆن) ی لەبەردا بوو کەبایی (٢٠/٠٠٠) لیرە زیاتربوو،منیش دەبێ یان بەتارەقەی نێوچەوان پەیدای بکەم یان بەکاری بەدڕەوشتی! بۆیەسەرەنجام خۆمم لەمەڵهەکانی شەودادیتەوە کەبەهۆی سەما کردنەوە بژێویم چنگ دەکەوت ! میشێل لەدرێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتە پڕ کارەساتەکەی خۆی دا گوتی : (نانەمەیە ژیانی خێزانی لەپاریس ..)سۆزو بەزەیی لەدڵی دایك و باوکاندا چۆڕەبڕبووە ئەوەندە خۆپەرستن هەر پارەیەك کەدەیدەنە منداڵەکانیان وەك پارچە گۆشتێ لەجەستەیان ببڕی ! ئێمە لەپاریس هیچ نرخێك بۆ خێزان دانانێین ، باوك و دایك هەر یەکەیان بۆ خۆی دەژی و نامۆن بەیەکتر بۆیە زۆربەی زۆری کچان لەماڵ و خێزانەکانیان بێزارن و هەندێکیان دەبنە سکرتێرە و مامۆستاو فرۆشیار لەلای بازرگانەکان ، وە هەندێکیشیان ناچار بەلەش فرۆشی خۆیان دەژێنن ، ئەویش ناڵێم ژیانێکی خۆشگوزەران ، بەڵکو بژێوییەکی سادە و هەرزان ! وەکچ بە چەندین ئەزمونی تاڵیدا تێدەپەڕێ و لەمیانەیاندا نارەحەتی زۆر و مەینەتی جۆراوجۆر دەچێژێ ! ئەوەیە ڕاستی ژیان و گوزەرانی ئافرەت لەپاریس). بەڵێ خوێنەری خۆشەویست : ئەمانە چەند دان پێدا هێنانێکی کەسانی (بیانی) بوون کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پێیان لەو ڕاستییە ناوە کەئافرەت و خێزان تەنها لەکاتێکدا کەسایەتی و حورمەت و مافیان پارێزراو دەبێ کەلەژێر سایەی شەریعەتی دادگەرانەو وردبینانەو دور بینانەی خوای پەروەردگاردابن

## مافی ئافرەت.. ئەبێ چۆن بێ ؟!

کاتێك بمانەوێ سەبارەت بە ئافرەت بدوێین و بنوسین ئەوا مەبەست پێ لە (دایك و خوشك و ئەو قوتابخانەیەی کەپیاوان و ژنانی تێدا دەردەچن ،باسی قوربانی دانی بێ سنور وسۆزو خۆشەویستی جوانییە . جا لەبەر ئەوە زۆر تاوانبارن ئەو کەسانەی کەڕێزی تەواوی لێناگرن و مافی خۆی پێ نادەن تەنها سالّی دوو ڕۆژ نەبێت کەئەویش (ڕۆژی دایك و ڕۆژی ژنانە) کەچەند کاتژمێرێك بەشان و بالّیاندا دەدەن و چەپکە گولّیان پێشکەش دەکەن و هیچی تر !! ئەلّێم بەو ئافرەتانەی کەئەیانەوێت ڕێزداربن و بەچاوی ڕێزەوە سەیر بکرێن لەدونیاو دوا ڕۆژدا بەچاوێکی ڕون و زانستەوە سەیری بنەماو یاساکانی ئاینی ئیسلام بکەن سەبارەت بەئافرەتان لەقورئان و فەرمودە پیرۆزەکاندا لەمێژووی هاوەلّان و پێشیناندا چەندە ڕێز گیراوە لە مافی ئافرەتان و دەبینی خاوەنی چ پلەو پایەیەکی بەرزن کەبەراورد ناکرێن لەگەلّ ئافرەتانی ڕۆژئاوا و ئەوروپادا کەچۆن بەناوی ئازادی و سەربەستییەوە دەچەوسێنرێنەوە و بازرگانیان پێوە دەکرێ ! لەئیسلامدا ئافرەت وەك پیاو ڕێزدارە و وەبنەمای ئەو ڕێزەش لەسەربنەمای ڕەگەز نییە بەلّکو لەسەر ئەساسی تەقوا و لەخوا ترسانە وەك خوای گەورە فەرمویەتی (ان اکرمکم عندالله اتقاکم..) ئیسلام وەك هاوسەری ژیان ئافرەت بە لەتکی پیاوان سەیردەکات پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) فەرمویەتی:(انماالنساء شقائق الرجال) واتە: ئافرەتان لەتکی پیوانن نیوەی ژیانن وەك چۆن سێوێك ئەگەر بکەی بەدوو کەرتەوە بەهەریەکەیان دەگوترێ لەتکە سێو بەهەردو بەشەکە سێوێکی تەواو پێك دەهێنن بە هەمان شێوەیش ئافرەتان و پیاوان بەهەردوکیان ژیانی تەواو دروست دەکەن ، ئاوا ئیسلام ماف و ڕێزی بۆداناون بەلاّم ئافرەتانی ڕۆژئاواتەنانەت بێبەشن لەوەی کەبەناوی باوکیانەوە لەقەلّەم بدرێن و بەلّکو ڕاستەوخۆ بەناوی مێردەکانیانەوە بانگ دەکرێن (کەئەمەش جۆرێکە لەتیرۆری کەسێتی و ناسنامە.. وەکودایك خوای گەورە جوانترین ڕێزی بۆ داناوە کەهیچ کەسێکی ترناتوانێ ئەو مافەی بداتێ کە بەهەشتی خستۆتە ژێر پێی دایکەوە،

نەك ساڵی دوو ڕۆژ ڕێزی بگرێ ویادی بکاتەوە لوەك بانگ خوازانی ئـازادی بانگەشـەی بـۆ دەکەن وتەنها بەدروشم و لافیتەی بریقەدار کاری بۆ دەکەن کەبەوەش هیچ سـودمەند نـابێ وەك وتراوە:(بە حەڵواحەڵوا دەم شیرین نـابێ) ئـەوەتا لەئیـسلامدا ڕەزامەنـدی خـوا لەگـەڵ ڕەزامەندی دایکدایە بۆڕۆڵەکانیان:لەفەرمودەی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـاتووە کـە هەرکەسـێ سێ کچی هەبن یان دوو کـچ جـوان بـەخێویان بکـات و فێـری ئـەدەب ودینیـان بکـات تـا بەشوێنی خۆیان دەگەیەنێت ئەوە پاداشتەکەی بەهەشتە ! لەگێڕانەوەی تردا دەڵێ تەنانـەت ئەگەر یەك کچیش: تەنانەت ئیسلام ڕێزی لەئافرەت ناوە لەو کاتەی کە کچۆڵەو منداڵیشە بەوەی کەزیندە بەچاڵ کردنی حەرام کرد وەك خـوای گـەورە فەرمویـەتی (واذاالمؤدة سئلت باي ذنب قتلت)(التكوير٨-٩) وەکو خێزانیش ژنی لـەبیر نـەکردووە و فـەرمانی داوە بـەخۆش ویستنی و چاودێری و ئامۆژگاری وبەخێوکردنی لەلایـەن مێـردەوە..،نـەك ئیـشی دەرەوە و ماڵەوەشی پێ بکەی ...، بەناوی یەکسانییەوە کـاری پیاوانیـشی پـێ ئـەنجام بـدەی لەگـەڵ کاری سروشتی خۆی کە دایکایەتی و ماڵدارێیە ... ئایا ئافرەتـان هەسـتیان بـەوە کـردووە کەئەوان وەك دایك و خێزان ئامادەکار و بەخێو کـەری نـەوەکانی داهـاتوون ؟ لەئیـسلامدا ئافرەت مرۆڤەو نابێ بازرگانی بەجەسـتەیەوە بکرێـو بکرێتـە کاڵـای بازرگـانی و ئیعلامـی لەسەر ڕۆژنامەو تەلەفیزیۆن و بـەرگی تایـت و سـابون و عـەلاگـەی دەسـت بـەڕوتی نیـشان بـدرێن وبکرێنـە ئـەداتی سێکسی ونێـچیری مرۆڤـە دڵنەخۆشـەکان! کەئەمانـە لەڕاسـتیدا چەوسـاندنەوەی ئافرەتانـەو تـیرۆری کەسـایەتییە ، چـون ڕێزومـافی ئـافرەت بەسـوکایەتی پێکردنی بەرجەستە نابێ،بەڵکو ئەو ماف و ڕێزە لەڕێگـەی پـەروەردەو فێرکـردن وپابەنـدی بەڕەوشـتە جوانـەکان دابـین دەبـێ، دەمانـەوێت بێـت لـە کـۆت و زنجـیری نـەفامی ونـەزانی و دواکـەوتن، نـەك ئـازابێ بـۆ ژیـانی ئـاژەڵی و بـێ ڕێـزی و ئابڕوتکـان ! دەمانـەوێ لـە سـەرجەم بوارەکانی ژیاندا ڕۆڵی شیاو و گونجاوی خۆیان ببینن .

# مافی ئافرەت لەئیسلامدا

لەبەر ئەوەی نەیارانی ئیسلام لەڕێگەی فریو دان و بەکارهێنانی ئافرەتانەوە گەنجەکانمان سەرگەردان دەکەن ، گوایە ئافرەتان لەئیسلامدا چەوساوەن و ئەوان خەم خۆریانن ! بەپێویستم زانی بەکورتی ئاماژە بۆ مافی ئافرەتان بکەم لەئیسلامدا . بۆئەوەی بەراوردێ بکەی لەنێوان ژیانی ئافرەتانی خۆرئاوا و ژیانی ئافرەتان لە ناو موسولّماناندا ، وەبزانی کە سەربەستی و ئازادی ڕاستەقینە لەکام لایە ؟ بەرنامەکەی خوا ئافرەت و پیاوی بەیەکسانی داناوە لەبنچینەی دروست بوون و بەهای مرۆڤانە ، هەردوولا دەگەڕێنەوە سەر یەك بنەڕەت ، وەکو دەفەرموێت (الذي خَلقكم مِن نَفسٍ واحِدة ...) وەلەپاداشتی ڕۆژی دواییدا وەکو یەکن و هیچ جیاوازییەکیان نییە وەك دەفەرموێت (اني لا اضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثي) وەلە بەرانبەر ئەرکدا مافیشیان بۆ دیاری کراوە (ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف) (البقره ٢٢٨)لەڕاستیدا ڕێز و مافی ئافرەتان تەنها لەدینی خودادا دابین کراوە ، بەڵام چی دەڵێی لەبەرانبەر ئیسلامێکی بێ حوکم و دەوڵەت ! ئافرەت لەئیسلامدا وەکو دایك زۆر گەورەیە ئەگەر دایکمان لێمان ڕازی نەبێ خواش ڕازی نابێ ! وەکو خێزان هاوسەر و ڕەفیقی ژیانە ، وەکو خوشك ڕێزی خۆی لێدەگیرێ .. کەسێ ڕێز لەئافرەتان نەگرێ بەگێل و نەفام دادەنرێ وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی **(ما اكرم النساء الا كريم و ما اهانهن الا لئيم)** (مسلم) واتە: ئەوەی ڕێزیان دەگرێ چاك و بەڕێزە ، وەگێل و نەفامەکانن ڕێزیان ناگرن و بەکەمیان دەزانن ،لەبەر ئەوەیە ناحەزانی ئیسلام بەناوی ڕێزەوە بێ ڕێزیان دەکەن ،بەناوی ئازادییەوە ئازاریان دەدەن بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆیان ڕوتیان دەکەنەوە ، دەیان بەنە ریزی ئاژەڵان ، چونکە یەکێ لەبەها مرۆڤایەتییەکان بەرگ و لیباسە کەجیامان دەکاتەوە لەئاژەڵ ، ئیسلام زۆر گرنگی دەدات بە پاراستنی کەسایەتی ئافرەت ، بەوەی کەتێکەڵی پیاوانی بێگانە نەبن و خۆیان داپۆشن ،وەکو

ماڵێکی بەنرخ پێویستە بپارێزرێن ،چونکە چاکی و پاکی کۆمەڵگا بەستراوە بە چاکی و پاکی ئافرەتەکانیەوە ،.گەر ئەوان ڕۆشنبیر بن لەخواترس بن ، ئەوا کاریگەری زۆری دەبێت بۆ سەر ئەو کۆمەڵگەیە، بۆیە ناحەزانی دینەکەمان کاتێ دەبینن ژنان دەچنە مزگەوت یان بۆ کۆڕو سیمیناری ئیسلامی کێچ دەکەوێتە کەوڵیان ، چونکە ئەگەر ئافرەت لەدینەکەی تێبگات پێ بگات خێر بۆ ئەوان نادەنەوە و دروشمەکانیان دەبنە بڵقی سەر ئاو . زانایەك دەڵێ : ئەگەر پیاوان سەیارە و تەیارە و موشەك و تەکنەلۆژیا بەرهەم بهێنن ، بەڵام ئافرەتان مرۆڤ دروست دەکەن ، چونکە یەکەم قوتابخانە کە مرۆڤی تێدا پەروەردە دەبێ باوەشی دایکە . تەنانەت پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) لەدوا ساتەکانی ژیانی پیرۆزیداو لەکۆتا وتاریدا فەرموی :(اصتوصوا بالنساءِ خَیرا)واتەئامۆژگاریم ئەوەیە کەلەگەڵ ئافرەتان باش بن و قسەی خێریان بۆ بکەن ، سەرنج بدە چەندە لەخەم ئافرەتانی ئومەتەکەی بووە ، تادور بن لە ئاگری دنیا و دوا ڕۆژ . ئێوەش دایکان و خوشکانی بەڕێز مادام خۆتان بە موسوڵمان دەزانن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی شەرع بن ، بۆ ئەوەی ڕێزدار بن و حەیا و ئابڕوتان پارێزراو بێت ، شوێن کەوتەی عائیشە و فاتمەو خەنسا بن ، نەك مۆدێل و هەواو ئارەزوو...

---


سەرچاوەکان

١ــ محاكم التفتيش / د .زكي علي

٢ــ الشباب المسلم في مواجهة التحديات / د. عبداللة ناصح

٣ــ امريكا : (السقوط و الحل) مختار خليل ص /٢٥-٥٠

٤ــ گۆڤاری /(الاسرة)ژمارە ١٢٩-ساڵی١٤٢٤ هـ

# گه نجه‌کانمان به‌ره‌وكویٚ..؟

الحمدالله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والاه...وبعد:

مادام لاوان ڕۆڵی سه‌ره‌كی ده‌بینن له‌گۆڕانكاریه ڕامیاری وكۆمه‌لایه تییه‌كانداوجلەوی كۆمه‌ڵگه به‌ده‌ستیانه‌وه‌یه به‌ره‌وهه‌رمه‌نزلێكی به‌رن به‌خته‌وه‌ری بێت یان به‌دبه‌ختی،ئه‌وان له‌ناوجه‌ماوه‌ردا ئالییه‌تێكی دیاروبه‌رچاون له‌جێبه‌جیٚ كردنی گۆڕانكاری وه‌ك خوای گه‌وره فه‌رمویه‌تی:(ان الله لايغيرما بقومٍ حتى يغيرمابِانفسِهِم)ئیتر ئه‌وگۆڕانكاریه‌به‌ره‌وچاكه بێت یان خراپه ئه‌وان پێشڕه‌ون.وه‌كو چۆن شۆڕشه ئیمانییه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)هه‌رله‌سه‌ره‌تاوه كۆمه‌ڵه گه‌نجێكی خوا ویستی وه‌ك(بیلال وسوهه‌یب وخه‌باب وعه‌مار وسومه‌ییه)له‌ده‌وری كۆبونه‌وه‌وبونه پێشه‌نگی كاروانی ئیمانی وگۆڕانی ئیجابی به‌پشتیوانی خواگه‌وره‌ترین گۆڕانكاریان به‌رپاكردله‌ناوگه‌لێكی دواكه‌وتودا! ،وه‌ك پێشه‌واكه‌مان فه‌رمویه‌تی هه‌رله سه‌ره‌تای ئاشكراكردنی په‌یامه‌كه‌وه(حالَفَنی الشباب وخالَفنی الشيوخ) واته:گه‌نجه‌كان بونه‌هاوپه‌مان وپێشوازییان لێكردم به‌لاٚم پیره‌كان سه‌رپێچیانكرد،كه‌واته ده‌بێت بایه‌خێكی زیاد به‌نه‌وجه‌وانان ولاوه‌كانمان بده‌ین كه‌نومێدی نه‌ته‌وه‌كه‌مانن،به‌رنامه‌ی دروستیان بۆ داڕێژین،ڕێ نه‌ده‌ین بیٚ ئامانج له‌ژیانیاندا بسوڕێنه‌وه،یان خه‌ڵكێكی ده‌روون نه‌خۆش به‌بیروبۆ چونی لاروخواربه‌ره‌وهه‌ڵدێریان ببات وه‌هه‌روه‌ها ده‌بێت لاوه‌كانمان له‌سه‌ره‌تاوه فێری ئیسلام بكه‌ین, به‌جۆرێك دڵنیابن له‌وه‌ی كه‌ئیسلام چاره‌سه‌ری سه‌رجه‌م كێشه‌كانی تێدایه، وه‌ئه‌م دینه بۆبه‌ڕێوه‌بردنی ژینه،وه‌هۆشیاریان بكه‌ینه‌وه تاوه‌كو به‌ئه‌ندازه‌ی پێویست له‌دین ودنیایان به‌ئاگابن وه‌فه‌رمان بكه‌ن به‌چاكه‌وڕێگری بكه‌ن له‌خراپه ئه‌وه‌ش ئه‌ركی سه‌رشانی هه‌موانه،ڕێنمایی ونامۆژگاری پێشه‌وا كه‌مانه:(كلكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعيتهِ ...) و (من راى منكم منكراًفليغيره بيده...)،ئه‌وپه‌روه‌رده ئیسلامیه‌وئه‌وهه‌سته‌ئیمانیه‌بوكه جۆره‌گه‌نجێكی پێگه‌یاندله‌سه‌ره‌تای ته‌مه‌نیاندابونه‌سه‌ركرده‌وپێشه‌وا،هه‌ربه‌منالی گه‌وره بون! وه‌ك قورئان باس له‌حه‌زره‌تی ابراهیم ده‌كات به‌(سمعنا فتى يذكرُهم يقال له ابراهيم )

(فتـی)بەگـەنجێکی هەرزەکاردەگوترێ،لەوتەمەنەداشۆڕشـێکی ئیمـانی دژبەبتـەکانیان بـەر پاکرد،بەهەمان شێوە ئەوکۆمەڵەگەنجەی هاوەڵانی ئەشـکەوت(اصـحاب الکهـف)،تەنانـەت هاوەڵی بەڕێز(ئوسامەی کوڕی زەید)تەمەنی حەڤدەساڵ بوکەکرایەسـەرکردەی سـوپایەك بـۆ شەڕی ڕۆمەکان لەوسوپایەدائەبوبەکروعومەرسەربازبون! (محمد الفـاتح)تەمـەنی (٢٤)سـاڵ بوسـەرکردەی سـوپایەکی کردکەگـەورەترین ئیمپراتـۆری بێزەنتـی تێکـشکاند،ئێمەش هـەر خۆمان بەمناڵ وکەم دەزانین،ئێستاگەنج لەوڵاتی ئێمەدا لەقەیراندایەو بوەتەقوربانی،چونکە سیـستمی بـەڕێوەبردنی وولات حیزبیـەو لـەجیاتی پێـوەری زانـستی و هـاوڵاتبوون، هێـشتا گەنجەکانیش لەئاستی گۆڕان دانین تابەگژگەندەڵیەکاندابچنەوە،وەزۆرێك لەگەنج ولاوە کاتمان بەهەندێ دروشمی بریقەدارچەواشە کراون ولەجیاتی گرنگیدان بەزانست وبەهابـەرزەکان،خۆی سەرقاڵکردووە بەدیکۆرورووکەشی دەرەوە! نرخی وەرزی جوانی خۆیان نازانن وتا کاتێ زانـی کەلەدەستی چوو ئەوکات پەشیمانیش دادنادا.

## گرنگی ڕۆڵی گەنج

گرنگترین قۆناغی تەمەنی ژیانی مرۆڤ سـەردەمی گـەنجی وهەرزەکاریە،چـونکە ئەوبـەهرەو هێزوتوانایەی لای گەنجەلای منداڵ وپیردەست ناکەوێ،لەبـەر ئەوەیەکەئەرکـە گرنگـەکانیش زیاترڕوولەگەنج دەکات بەرانبەربەخواو پاشان لەخزمەت گەل و نیـشتیمان،ئەو گەنجیـەتی و لەش ساغیەش کاتییە وبەهارئاسا زووتێدەپـەڕێت ودەڕوات ،کەلەدەسـتت چـوو بەخۆزگـەو ئاوات خواستن ناگەڕێتەوە،قەدرو ڕێزی گەنجایەتی ئێستا لای خاڵـە پیرەکانـە بـەلام لـەدوای چی، شاعیرە پیر جوانی بۆ چـووە کەوتویـەتی:(لَیتَ الـشبابَ یعـود یوماًفـأخبرهُ بِمافَعَـلَ المشیب) خۆزیا گەنجایەتیم تەنیا ڕۆژێ دەگەڕایەوەوتاکوهەواڵم پێدەدا کەپیری چـی لێکـردم بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ)لەفەرمودیەکی پیرۆزیدا ئاگدارمان دەکاتەوە کەئەوهەلە زێرینەی تەمەن بقۆزنەوە پێش ئەوەی لەدەستتان بچێت فەرموویـەتی:(إغتَنم خمـساً قبـل خمسٍ..)پێنج شت پێش پێنج شتان بەفرسەت بگرن،مەیەڵن بەهەوانتەو بەلاش لەدەستتان

دەریچن لەوانە: ژیانەکەت بەفرسەت بزانە پێش ئەوەی مردنت بگاتێ وەلەناو هەمو قۆناغەکانی تەمەندا کاتی گەنجی و لاوی جیاکردۆتەوە وفەرمویەتی:(وَشَبابِكَ قَبل هَرَمِكَ) واتە:گەنجایەتییەکەت بەهەل بگرە پێش ئەوەی پیر ببی ..! وەکاتی لەش ساغیت بەهەل بگرە تانەخۆش نەبوی وەدەوڵەمەندییت بەهەل بگرە تا هەژار نەبوی ، وەکاتی بێ کاری بە فرسەت بزانە تا سەرقاڵ نەبوی.چونکە ئەم پێنج هەلانەی کە خۆشەویستمان بۆی دیاری کردوین زۆر گرنگ و بایەخدارن وەلەگەڵ ئەوە شدا کاتین و نامێنن ، جا ئەو گەنجەی تەوبەکاروچاکەکارە،بۆگەلی موسوڵمانی خزمەتکارە،پلەوپایەی بەرچاوودیارە،لەقیامەتدا سەربەرزوسەرداره،بەڵگەشمان فەرمودەی پێغەمبەری نازدارە،کە فەرموویەتی لەو بارە: (لەڕۆژی دوایدا حەوت دەستە و تاقم یان حەوت کەس هەن لەژێر سێبەری عەرشی خوادا حەشر دەکرێن کەلەو ڕۆژەدا خەڵکی لەگەرماو ئارەقی خۆیاندا ڕۆدەچن وهیچ سێبەرێك نییە، جا یەکێ لەوحەوت کەسانە (شاب نَشأ في عبادة الله) واتە: گەنجێك عیبادەتی خوا پەروەردە بوبێ، بۆیە ئەو ڕێزەی دراوەتێ چونکە گەنج زیاترحەزو ئارەزوی زاڵە، نەفس و شەهوەتی بەهێزە،جا ئەونەفس وئارەزوەی لەبەرخوا کۆنترۆڵ دەکات وبەدوای حەرام ناکەوێ و بەرگی تەقوادەپۆشێت،بێ فەرمانیی خوا ناکات،ئەوا خوای گەورە پاداشتی بەوەدەداتەوە کەلەژێر سێبەری عەرشی خۆی ڕایدەگرێت، ئەگەر گەنجەکانمان ڕۆشنبیروچاو کراوە بوون ئەوا گەلەکەشمان پێش دەکەوێ ،ئەگەرئەوان خووڕەوشتیان جوان بوودەست ودامێنیان پاك بوو،ئەوا کۆمەڵگەکەشمان چاکوپاك وبەختەوەردەبێت،ئەگەرئافرەتان خواناس وتێگەیشتوو بوون ئەوا کاریگەری ئیجابیان دەبێت لەسەر مێردو منداڵەکانیان، بەڕاستی هەرگەنجی خوا ناسە کەدەبێتە دارێ بەری بۆکەس وکاری، میللەت لەبەری دەحەسێتەوە(ابن عباس) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە بەگەنجیەتی نەبێ، ئێستا ڕێزی گەنجایەتی لای پیرانە،هەر وەك قەدری چاو لای کوێرانە،کەئێستا بۆی پەشیمانە ، تۆش سەرنج بدە وبڕوانە،لەدەست تۆش دەڕوا بەمزوانە،جا تکایە قەدری بزانە

# هۆشیاری گه نجان بەرانبەرپیلانی نەیاران

ئەمرۆموسوڵمانان لەرۆژگارێکی ئاڵۆزدا دەژین،بەهۆی کاریگەری شارستانیەتی رۆژئاوا لـە جیهاندا،چ لەبواری پێشکەوتنی زانستی ودەستکەوتەمادیەکان یان لەبواری بواری هونـەری ورۆشنبیری جۆراوجۆر،کەبانگەشەی بەرەلاّیی دەکـەن بـەناوی ئازادیـەوەنرخی مرۆڤـەکانیان دابەزاندووەتە ئاستی ئاژەڵـەکان !! بێگومـان ئـەم گۆڕانـەش لـەناکاووبێ پێشەکی نـەبوو، بەڵکو بەهۆی بێ ئاگایی ولاوازی بیر وباوەڕو پشت گوێ خستنی یاسـاکان وچەوسـاندنەوەی سیاسی وکۆمەلاّیەتی لەناوخۆدا،وەپاشان داگیرکرانی ولاّتانی ئیسلام لەلایەن بێ بڕواکانەوە وەدارشـتنی بەرنامەیـەکی ژەهـراوی بۆپـەروەردە وفێرکردن،تـا ئەندازەیـەکی بـاش توانیـان موسوڵمانان ناچاربکەن بەئیسلامێکی رواڵەتی بەناوێکی بێ ناوەرۆك رازی بـن،وەك دکتـۆر (زوەیمەر)سەرۆکی زانکۆی ئەمریکی لە کۆبونەوەیـەکی مەسـیحیداله قودسـی پیرۆزسـالأنی سییەکاندا وتبوی(بەهۆی کاری بەردەوامان لەوولاّتە ئیسلامیەکانداتوانیمان چینێکی تـازە لەموسوڵمانان دروست بکەین کە موسـوڵمانن بـەلاّم دورن لەئیـسلام !)ئیـسلام لـەدۆڵێك و ئەوان لەدۆڵێکی ترلئێرانی گوتەنی ئیسلامێکی دیموکراتی وەك بینیمان یەکـەم سـوتەمەنی ئەوبیرەپوچە ناو مـاڵی موسـوڵمانان بوو،ژیـان لەناومالّەکانـدا گـۆڕا لـەدینێکی ڕاسـت بـۆ ئیسلامێکی کەم وکورت وبێگیان حەیاوحورمەتیان نەهێشت،ئارەق خواردنـەوەو تێکـەلاّوی هەردووڕەگەزلە یاریگاکان سەیرانگاکان وهۆڵی ئاهەنگەکان،بەیەکگەیشتنی کـوڕان وکـچان بەناوی هاورێیـەتی ودڵپاکی ویەکسانی! لەبەرکردنی جل وبەرگی تەنك وتەسـك و فریـودەر! بەکار هێنانی بۆن وبەرامەی لەڕادە بەدەرو زۆر کاریگەر٠٠،بەسەر بردنـی زۆربـەی تەمـەن بەبەرنامـەکانی سینەما وتیڤی وسەرجەم ڕاگەیاندنەکان کەتەواوسەرقاڵیان کردوین لەژیان.. لەسەرجەم بوارەکانەوە ژیانیان ئاڵۆزکردووە،زۆربەشیان لەخزمەت بێ دین یدان ! لەبەرانبەر ئەوەدا ڕابونی ئیسلامی هاتە کایەوە ،موسوڵمانان کەوتنە خۆ بۆ بەربەرچ دانەوەی نـەیاران و هەوڵدان بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕەسەنایەتی ، بەرەو یەکتا پەرستی ، لێـرەدا کـوڕانی ڕابـونی

ئیسلامی کەوتنە قۆناغێکی سەخت و گران،نامۆ بون لـەناو گەلـدا لەناوئیـسلامدا شـادابی ئیسلامی غەریب بوو،لەماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ ئەنـدامانی خێزانەکـەی کێـشەی بۆدروسـت دەبـوو! لەکاتێکدائەوبانگخوازانـەزۆریش دڵـسۆزبون بەرانبەربـەدین ونەتەوەکەشـیان بـەڵام لەبەر :

- گرتنی لایەنێکی ئیسلام بەتوندی وفەرامۆش کردنی لایەنەکانی تر.

- پەلەکردن لەچاك کردنی خێزان،چونکە ئەونازانێ پێشتر چۆن لادراون کراون

- بێ ئاگایی لەبەکارهێنانی شێوەی پـەروەردەیی ئیـسلامی تـازە ، کـە دووچـاری تونـد و تیژی دەکردن .

- نەشارەزایی لەیاساکانی ئیسلام وبێ ئاگایی لە دەوروبەرو لە رۆژگار .

- جا بۆ ئەوەی خۆی ودینەکەشی ناشرین پیشان نەدات،بۆ ئەوەی کارەکانی لـەدنیادا سـەر بگرێ و لەقیامەتیش بەر بگرێ پێویستە دینەکە وەکو خۆی بناسێ و بزانێ، پاشان پێکەوە گرێدانی شارەزایی شەرعی و ڕۆشنبیری هاوچـەرخ ،بـەکارو کـردەوەی حەکیمانـە ورەوشـتی موسوڵمانانە خزمەت بکات ، واتـە بـەکردەوە رۆشـنبیر بێـت نـەك بەقـسەو ووتـار ، جابۆ ڕزگار کردنی گەلەکەی و ڕازی کردنی خوا پێویستە ڕۆشنبیری و چـاکی و پـاکی لـەکردار و گوفتاری گەنجانی موسوڵمان ڕەنگ بداتەوە و جیـاواز بێـت لـە بـەناو سـەقافەتی غـەربی و ئەورووپی



يأيها الذين أمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون




# چەمكێك لە ووتارەكانى

# ( ٣٠ )

# ڕۆژى ڕەمـــەزان

## پێشـەکی:

الحمدلله ...والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه ...

شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ

خوێنەرانی بەڕێزوخۆشەویستم،ئیسلامخوازانی کوردستان! سەلامی خواتان لەسەر هەمودەزانین کە ئێمەلەچەرخێکی لاروخواری ئاخیرزەمان داین،بەرنامەی خواکاری پێ ناکرێ جگەچەندبڕگەیەك نەبێ،کەئەویش بۆخزمەتی بەرژەوەندی یەکانیانە ( پەرلەمان)وڕێچکەدەستکردەکان کراونەتەیاساوڕێساو ئەلتەرناتیڤی پەیامی خوا! سوپاس بۆخواکەلەبەرامبەرکاروانی دنیاویستەکان کاروانی ڕابوونی ئیسلامیش گورج وگۆڵ وبوێرانەلەڕێگەدایەوهەنگاوی زۆری ناوەلەسەرجەم بوارەکاندابەتایبەت لایەنی نوسین وڕاگەیاندن،کەیاندن وسەرخستنی ڕاستیەکان(ئەمربەچاکەوڕێگری لەخراپە ) ئەرکی سەرشانی هەمومانەبەتایبەت زانایان،لەمزگەوتدادینداری دەکرێ، بەلام لە دەرەوەی مزگەوتداچاولێکەری کوێرانەبۆمۆدیلی بێگانە! بەهۆی زاڵبونی زلهێزان و داگیرکەران، ئێمەجاران مەلایەتی میللەتێکمان ئەکرد،کەئاستی ڕۆشنبیری نزم بو، یاسای بێگانەی تێدانەبو،بەلام ئێستاکاری مەلایەتی گرانتربووە(صەبری ئەیوب و فیداکاری ابراهیم وجیهادی محمدی دەوێت)کەوتوینەتەجیهانی تەکنەلۆژیاوە سەر دەمی ململانێی شارستانی وبیروباوەڕەکانە)جیهان بووەتەگوندێکی بچوك،ئێمەش لەبەرامبەرخەڵکێکی بێ ئاگاودوژمنێکی فێڵبازداین،دەستی ڕەشی بێگانەلەناومانە، نەخشەوپیلانی زۆرلە ئارادان دژبەئیسلام،جا ئێوەش مامۆستایان.. خەمخۆرانی ئیسلام،پێویستەلەم کاتەدابیرتیژوچاوکراوەبن،بزانن لەکام بەرەخۆتان دەبیننەوە ئیسلامی یان عەلمانی کامەیان لەگەڵ عەقیدەتاگونجاوترە؟(ڕەببانی یان نەفسانی) هەوڵ وجولانت بۆخوایەیان بۆخورمایە! جابێدەنگی وخۆمات کردن وبێ هەڵوێستی دورلەخواییە،بابەدەردی(قسیس وئەحبارەکان)نەچین،بەهەڵوێست وکردەوەت

بیسەلمێنەکەئەم دینە بۆرێکخستنی ژینەلەکاروان جێ نەمێنێ،ئەم نوسینەی بەردەستت،کورتەی ئەو وتارانەن کاتی خۆی لەڕەمەزانداخوێندومنەوە لەشارۆچکەی چوارقوڕنە،بەتایبەت لەمزگەوتی(گولەکیان)ودواتریش لەهەڵەبجە وسلێمانی،بە شێوەیەك دامڕشتوەکەبۆهەرڕۆژێکی رەمەزان باسێکی تایبەت بەورۆژەم دابەزاندوە، هەرڕۆژە وتاری خۆی،تامانگەکەتەواودەبێ،ئینجابەباشم زانی لەدووتوێی ئەم کتێبەدا پێشکەشی گەلەموسڵمانەکەمی بکەم.

شایانی باسەکەئەم کتێبە: نۆبەرەی نوسینەکانم بولەساڵی(٢٠٠٠)سوپاس بۆخوا پێشوازی گەرمی لێکراوچوارجارچاپکرایەوەو ئەمەپێنجەم جارەبەدەستکاری وزیاد کردنەوە،هیوادارم جێگەی سودوکەڵك بێت بۆهەمولایەك بەتایبەت بۆدەنگی مینبەرو میحرابەکان،وەبۆشاییەك پڕبکاتەوەلەکتێبخانەی کوردی،خوابیکات بەتوێشوی دوا ڕۆژمان،دیارەنوسینەکەش بەزاراوەیەکی سادەنوسراوە،تاهەموکەس تێیبگات، بۆیە بەپێویستم زانی بۆزیندو ڕاگرتن وپاراستنی بیخەمەسەرخەرمانی کتێبی وتارەکانی هەینی بەناوی وتاری سەردەم،بێگومان لەقسەووتاری خوابەولاوەهەمو کتێب ونوسراوێك کەم وزۆر لەهەڵەوپەلان خالی نابێ،چاکی وپاکی تەنهابۆخوایە ، لەکۆتایداسوپاسی ئەوانەئەکەم کەهاوکاروهاندەرم بوون بۆبەچاپ گەیاندنەوەی، بەهیوای سودو دوعای خێر.

**قامیشی**

**سلێمانی/پێشنوێژلەمزگەوتی شەفیق بەگ**

**وتاربێژی مزگەوتی گەورەی هەواری شار**

**٢٠١٤/١٤٣٥ هـ م**

# له پێشـوازی ڕەمـەزاندا

**بەهاتوچۆی هەموساڵێ میوانێکەوبەڕێوەیە..میوانی من میوانی تۆمیوانی ئێمەوئێوە یەنەومیوانی هـەرماڵێکی موسـڵمانەبێ جیاوازی .. بەڵام کەهات وا پێت نەڵێم سستی نەکەی لە پێشوازی**

**بەرنامەی موسڵمان.. لەپێشوازی ڕەمەزان**

ڕەمەزانی پیرۆز ئەومانگە پڕخێروفەڕەیە کەخوای گەورەڕۆژووی لەسەرئیمانداران تێدا فـەرز کردووە،مـانگی خێرورەحمـەت و بەرەکـەت ولێخۆشـبوونەبۆ بڕواداران،چـون لـە ومانگـەدا دەرگاکـانی بەهەشـت دەکرێنەوە،واتـە:دابـەزینی سـۆزوبەزەیی خوابۆبەنـدە ڕۆژوگـرو تۆیـە کارەکانی،وەلە بەرامبەرداحەوت دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شـەیتانەکان کـۆت و زنجـیر دەکرێن ووزەو توانایان زۆر کەم دەبێتەوە،لەبەرئەو هـەموو پاداشـتە زۆرە بووکـە هـاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەوەندە قەدری ئەو مانگەیان گرتـووە و ڕێزیـان لێ نـاوە ، بەچـەند مـانگی پێش هاتنی لە پێشوازی دابوون خۆشەویستی ڕەمەزان چەکەرەی دەکردلە دڵیاندا، وە دوای تەوا وبونیشی خەم و خەفتیان بۆ دەخوارد نەباداساڵێکی تر نەیبیننەوەو بێ بـەش بـن لـەو هەموو .خێرە،عن انس،قال رسول(ﷺ)**(اللهم بارك لنا فی رجب وشـعبان وبلغنارمـضان)** هاوەڵان ئاوا پێش هاتنی دوعایان دەکرد کە پێی بگەن و میوانداری بکەن وئامادە باشـیان بۆدەکرد،مـافی خۆیـان پـێ ئەدا،چـونکە دەیـانزانی چـەند گەورەوبـەڕێزە(قـەدری زێـڕ لای زێڕنگرە)بۆیەئێمەی شوێن کەوتوی ئەوانیش دەبێ خۆشحاڵ بـین بەهاتنی،جابۆئـەوەی خێـرو پادشتی زۆرە.سۆگەربکەین پێویستە بەرنامەی پێشوازیمان لەومانگەبەمشێوەیەبێت:

١)ئامادەباشی ئیمانی:بەهێزی ئیمان دەچینەخزمەت ڕەمـەزان بـەردەوام ئـەم فـەرمودە یـە دەخەینەبەرچاومان:**(من صام رمضان ایمانا واحتسابا غفرله مـا تقدم مـن ذنبـه)**(متفق علیە)واتە: هەرکەس بە بیرو باوەڕەوە ڕۆژوی ڕەمەزانی گرت بۆ خوا بـە ئومێدی پاداشـتی دوارۆژ ئەوە خوا لەتاوانەکانی ڕابردوی دەبوورێ،چ مژدەیەکی خۆشە!

٢)ئامادەباشی لەبواری جەستەولاشەوە،کە(١١)مانگ ورگمان هیلاکە بەدەست هەرس کردنی خواردنەوەبامانگی حەوانەوەی بێت،بەردەوام با ئەم فەرمودەیە لەبەرچاومان بێت:(صوموا تصحوا)(رواه الطبرانی) واتە:بەرۆژو بن تەندروست دەبن، رۆژوتەندروستیە..زۆر خۆری نەخۆشیە..لەش ساغی پاشایەتیە.

٣)ئامادەشی لەبواری رۆحی،بەداخەوەکەئەوەندەی بیرلەخواردنی لاشەمان ئەکەینەوە کە بۆ ورگە، ئەوەندەبیرلەخۆراکی رۆحی ناکەینەوەکەزیکرویادی خوایە،بۆیەلەومانگەدا بەردەوام ئایەتی:(الا بذکرالله تطمئن القلوب) لەبەرچاوولەناودڵمان دەبێت کەئاگادارمان دەکاتەوە لەخۆراکی دڵان کەیادی خوایە، بەو هۆیەوە بەرنامەی پێشوازی رەمەزان دەکەینە نەخشە رێگای خۆمان کە بریتیەلەخۆشەویستی پارشیوکردن، نوێژی بەکۆمەڵ،خەتمی قورئان، زیکرەکان، تەراویح وشەونوێژ...هتد،

**لەپێشوازیکردنی رەمەزاندا دەتوانین خەڵکی پۆلێن بکەین بۆدوویەش :**

یەکەم : ئەوانەن کەزۆرخۆشحاڵ دەبن بە هاتنی ئەم مانگە، کە بڕوادارانی ڕاستەقینە و تێگەیشت وپێگەیشتون لە دینەکەیان هاتنی رەمەزان بەلایانەوە و مایەی خۆشیەچونکە:

أ۔ نەفسی خۆیان بە ڕۆژووگرتن ڕاهێنانەوە لە مانگەکانی تردا،لەگەڵ ڕۆژوە سوننەتەکانی دەست لە ملان بوون وەك ڕۆژانی ۔ أیام البیض ، عاشوراء ۔ عەرەفە ۔ دووشەممە و پێنج شەممە،لانی کەم مانگی سێ ڕۆژویان تێداگرتوە و شوێن کەوتەی پێغەمبەر و هاوەڵان و سەلەفی صالح بوون لەبەر ئەوە ڕۆژوو گرتن بەلایانەوە ئاساییە ، وە نەفسی خۆیان لە گەڵدا ڕام کردووە و زاڵ بوون بەسەریدا ،وەك پێشینان وتوویانە ( نەفس بیگری مشتێکە و بەری دەی دەشتێکە ) بڕواداری ڕاستەقینە لە سەرەتاوە جیهادی نەفسی خۆی دەکات و دەیگرێت ، نابێتە بەندەی هەوا و ئارەزوەکانی

ب ـ ئەو موسڵمانانەخۆشی و ڕابواردنی خۆیان هەڵگرتووەبۆدوارۆژ کە( دارالقرار ) دەزانن کە دنیاکاتی یە وشوێنی تاقیکرانەوەیە،تەنها بەهەشتە کە جێگەی ئاسودەیی و حەسانەوەیە لە بەرئەوە بەفەرمانی خوا خۆی دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە بە ئومێدی پاداشتی دوارۆژ،بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی ڕۆچون لە ڕابوردن خۆشی ئەم دنیا و بوون بە بەندەی ئارەزوەکانیان ،لە دوارۆژیان بێ ئاگان ،جا لەبەر ئەوە ئەو جۆرە کەسانە لە خۆشی قیامەت بێ بەشن مەگەر تەوبە بکات وەك لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺهاتووە کە:(هەرکەس لەم دنیا شەراب بخواتەوە لە تۆڵەی ئەوە لە شەرابی دوارۆژ ناخواتەوە گەر تەوبە نەکات (مسلم)،وە لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی : (هەرکەس لەم دنیا جل و بەرگی ئاوریشم لەبەر بکات(کە بۆ پیاوان حەرامە)ئەوەلەدوا ڕۆژدالەبەری ناکات )(بخاری ومسلم) لەحەریری بە هەشتێ بێ بەشە،ئەگەر سەرنجی فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەر بدەین دەبینین زۆربەی ئەهلی ئاگر ئەوانەن کە لە دنیادا خۆش گوزەران بوون هەر خەریکی ڕابواردن و مەغرور بوون بۆیە لە ڕابواردنی بەهەشت بێ بەش بوون،جا بەدڵنیاییەوەئەو تینویەتی و برسیەتیو بێ تاقەتی ئەمرۆی ڕۆژوگر دەبێتەوە تێر وتەسەلی و گرو تینی ڕۆژی دوایی .

ج ـ لەبەر ئەوەی ئەو موسڵمانانە چاك دەزانن کەئەم مانگەگەورەی مانگەکانە،چاکترین کاتە بۆ پێشبڕکەو ئەنجام دانی بەندایەتی و نزیك بونەوە لە خوا،ئەو خێر و پاداشتەی کەلەم کاتەدا هەیە لە مانگەکانی تری ساڵدا بەو ئەندازەیە دەست ناکەوێ ،بەڕاستی مانگی خەلە و خەرمانی ئیمانە چ هەلێکی زێڕینە پاداشتی فەرزێك یەك بە حەفتایە،خێری سونەتێ بە ئەندازەی واجبێکە،لەبەر ئەم سێ هۆیانە بوو کە بڕوادارە ڕاستەقینەکانی بەشی یەکەم بەهاتنی ئەم مانگە زۆر خۆشحاڵ دەبن ، حاڵی ئەوانە وەکو کەسێکە کە یانزە مانگ بێ چاوەڕوانی دیداری خۆشەویستەکەی بێ و ئامادە باشی بۆ بکات کاتێ پەیدا دەبێ خۆشحاڵە بە هاتنی ،

دووەم :خەڵکا نێکن هاتنی ئەم مانگەیان بەلاوەناخۆشە!کاتێ کە ڕەمەزان هات ڕۆ°انی بۆدەژمێرن کەی لە دەستی ڕزگاریان بێ،خۆشیان بە موسڵمان دەزانن لئەوەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوەیە :

أ ـ لاوازی بیروباوەڕ،واتە:دامەزراوی عەقیدە و بیرو باوەڕ سەرچاوەی هەموو خێروچاکەیە کە،ئەگەر هەموئیسلام درەختێ بێت ئەوەئیمان ڕەگو ڕیشەیەتی بەندایەتی خواڕەوشتی جوان بەرهەم و میوەکەیەتی،جاهەر چەندەئیمانەکەت پتە وو ڕاست و پاك ودامەزرا و بێ بەو ئەندازەیە بەرهەمی دەبێت وبەهاتنی مانگی ئیمان خۆشحاڵەوەبە پێچەوانەوە،لاوازی بیروباوەڕەکەخەڵکانێکی موسڵمان دەبینی پابەندی شەرعی خوانین ،سارد وکەم تەرخەمن تەنها لە ڕەمەزانداڕولەمزگەوت دەکەن،مولتەزیم نین و دینداریان گڕوفڕێکە،ئەوانە موسڵمانی ڕەمەزانیلەن!

ب ـ زێدەڕۆیی کردن لە خواردن وخواردنەوە و خۆش گوزەرانی،چون ئەوانە گوێڕایەڵی هەوا وئارەزوی خۆیان کردوەوبونەتە بەندەی گەدە و گیپاڵ،بە پێچەوانەی کۆمەڵی یەکەم بۆیە ئەمانە لەم مانگەدا زۆر هیلاکی خواردن و خواردنەوەن ،سفرەی بەربانگیان ئیسرافی زۆر پێوەدیارە،جا بە داخەوە بۆدەستەی دووەم کە زۆر بەکەم و کورتی دینەکەیان گرتووە خۆشیان بە موسڵمان دەزانن بەلاّم دینداری بە کەیف و ئارەزوی خۆیان دەکەن ،نیوە لە نیوەی پشت گوێ دەخەن و پابەندی فەرمانەکانی خودا نابن بە تەواوی لە کاتێکدا ئیسلام مانای تەسلیم بوونە بۆ سەرجەم فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر بە پێ ی توانا ،چونکە ئەم دینە دەبێ بە وشێوەیە بیگری وەك خوا دەیەوێ نەك وەك خۆت دەتەوێ ! دەی تازووە با بەخۆمان دا بچینەوە ،بە گوێ ی نەفس و شەیتان نەکەین با تەزکییەی نەفسی خۆمان بکەین ، ئەو هەلە زێڕینە بقۆزینەوە و لە دەستی نەدەین ،بەدڵ و گیان بە بیر و باوەڕمان پێشوازی لێ بکەین ،لەو هەموو خێر و بێرە بێ بەش نەبین حیکمەت و فەلسەفەی ڕەمەزان تێ بگەین با هەمومان قەدری ئەو میوانە خۆشەویستە بگرین و مافی خۆی بدەینێ ،باڵە

کۆمەڵی یەکەم بین،دووبارە بەخێربێیتەوە ئەی مانگی فەتح و ئیمان ،ئەی مانگی قەدر و بەدر و صەبر،ئەی میوانی ساڵانە،ڕێزت لەسەر چاوانە چونکە مانگی قورئانە،مانگی گەش بوونەوەی ویژدانە، **اللهم بارك لنا رمضان،و وفقنا فيه للصيام والقيام**...




---

* ئەم بابەتەساڵانە وتاری سەرەتای ڕەمەزانە

* ڕۆژێك پێش ڕەمەزان تەوەرەی بەرنامەیەکی تلیبەتم بولەکەناڵی ئاسمانی پەیام لە(١٩/٧/٢٠١٢).

# گەورەیی ڕەمەزان

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ...﴾

واتە :مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتۆتە خوارەوە، کە ڕێنمونی و بەرنامە یە بۆ خەڵك خوای گەورە و کاربەجێ مەدحی ئەو مانگەی کردووە ، جیا لە مانگەکانی تر بەوەی کە ﴿أنزل فيه القرآن﴾قورئانی پیرۆز ،پەیامی سەرجەم مرۆڤایەتی لە شەوی قەدری ئەم مانگەدا بەیەك پارچە لە (**لوح المحفوظ**)وەدابەزی بۆ ئاسمانی یەکەم، لە کاتێکدا کەوەسفی دەکات بەوەی کە مانگی دابەزینی قورئانە، ئاماژەیە بۆئەوەی کە پێویستە زۆر گرنگی بدەین بەفێربون و خوێندنەوە وکار پێکردنی قورئان، جگە لە قورئان کتێبە ئاسمانیەکانی تریش هەر لەم مانگەدا دابەزیوە، وەکو پێشەوا ئەحمەد فەرمویەتی - صحفی ابراهيم و تەورات و ئینجیل - لە ڕەمەزاندا دابەزیون،وە عیسا(علیە السلام )لەو مانگەدا برایەوەبۆ ئاسمان وەزۆر ڕوداوی دیکەش ﴿**فمن شهد منكم الشهرفليصمه**﴾جا هەر کەس لە ئێوە ئامادەی ئەو مانگە بوو با بە ڕۆژوو بێت ،﴿**ومن كان مريضا مريضاأو على سفر فعدةمن أخر**﴾ گەر کەسێ لە ئێوەنەخۆش بوو یان کەوتە سەفەرەوە،دەتوانێ بیشکێنێ دوایی بیگرێتەوە، ئەمەش ڕوخسەت وئاسانکاری یەکە بۆ نەخۆش و ڕێبواران کە عوزری شەرعیان هەیە﴿ **يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر** ﴾ خوای میهرەبان ئاسان کاری بۆ کردوون و نایەوێ توشی ناڕەحەتی ببن،پەیامی خوا سەرجەم بڕگەکانی ئاسانکاری تێدایە ولەگەڵ سروشتی مرۆڤەکاندا گونجاوە،چون بۆبەرژەوەندی ئەوان هاتوە،بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین لە حوکمەکانی خوا و یاسای شەرع ، پڕیەتی لە ڕوخسەت و ئاسانکاری بە ئەندازەی وزە و توانای خۆت داوای ئەرکت لێدەکات ﴿**لايكلف الله نفسا الا وسعها** ﴾ واتە: خواشتێ داوا ناکات کەلەتوانای ئادەمیزاد دا نەبێ وعیبادەتەکانی لەتوانای هەموکەسدان

ئینجا لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمویّت ﴿ولتكملوا العدة ... ﴾ تا ئەو مانگە بەتەواوی بگرن ،خوا بەگەورەبزانن ،بەو شیّوەیە ڕیّنمونی کردون کە هەرسی ڕۆژەکەتەوا و بکەن ولە پاداشتەکەی بیّ بەش نەبن ، بەردەوام یادی خوا بکەن کە هیدایەتی داون بۆ ئەم کارە ﴿ولعلكم تشكرون﴾بەڵکوسوپاس گوزار وشوکرانەبژێر بن لەسەرنیعمەتی ئیمان و هیدایەتی خوا بۆ گرتنی ئەو مانگە... جا بەڕاستی ڕەمەزان گەورەی مانگەکانە ، مانگی قورئانە پێویستە لە سەرمان زۆر دیراسەی قورئان بکەین بە تایبەت لەم مانگەدا وە جبریل (علیه السلام )هەموو ڕەمەزانان دەهاتە خوارەوە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)دیراسەی قورئانیان دەکردوبۆی دەخوێندەوە، واتەمانگی قورئانە،دەی بائێمەش بیخوێنینەوەخەتمی بکەین، ماناکەی بزانین ئینجا کردەوەی پیّ بکەین،وە دەستور ویاسای ژیانمان بیّت،ڕەمەزان مانگی تەدریب کردنەبە نەفس،تا بتوانی لە(١١) مانگەکانی تردا لغاوی بکەی بۆ ئەوەی نەفست بەدەست تۆبیّ نەك تۆبەدەست نەفسەوەبی،مانگی صەبرگرتنە،چونکەڕۆژوصەبری دەویّ بۆیە ڕۆژوصبردەستلەملانن وپێکەوەن، پاداشتی ڕۆژودیاری نەکراوەبەهەمان شێوەپاداشتی صبرونارامگرتنیش دیاری نەکراوەوبیّ حسابەلای خوا(انما يوفى الصابرون اجرهم بغير حساب) وەبۆڕۆژوش فەرمویەتی:اناجزی بە..).

عن ابى هريره( )انّ رسولَ اللهِ(ﷺ )قال:(اذاجاء رمضان فُتِحَت ابوابُ الجنة وغُلِقَت ابوابُ النار وصُفِدَتِ الشياطين)(بوخاری بەژمارە(١٨٩٨)گێراویەتیەوە،مسلم بە(١٠٧٩) ریوایەتی کردوە)واتە:کە ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، واتە: دابەزینی سۆزوبەزەیی خوابۆیەندە ڕۆژوگروتۆیەکارەکانی وەك ئەوەیەلە گەراج سواری سەیارەی بەهەشت بیت، وەلە بەرامبەرداحەوت دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، لەفەرمودەی ترداهاتوە کەڕۆژوقەڵغانەو لەئاگردەتپارێزیّ، وشەیتانەکانیش کۆت دەکرێن ووزەو توانایان زۆرکەم دەبێتەوە، ئەوەش بەئاشکرادەبینریّ کەئەوهەموو خەڵکەڕولەچاکەدەکەن ومزگەوتەکان جمەیان دیّت،وەلەلایەکی تروەك(ابن حجرلەفتح البارى)دافەرمویەتی:ڕۆژوڕاستی وحەقیقەتی

ئەوكەسەدیاری دەکات،چونکەپێشترئەگەرپرسیارت بکردایەبۆچی ژنەکەت تەلاقدا؟یان بۆئەوکەسەت کوشت؟بۆزیناتکرد؟بۆئارەقت خواردەوە ..؟؟لەوەڵامدادەیوت:شەیتان پێی کردم!چاکەسێ لەرەمەزانداهەربەردەوام بێت لەخراپەئەوەخۆی بەدوپیسەو رۆڵی شەیتان دەبینێ،چونکەشەیتان لەومانگەداکۆتکراوەوئێستاهیچ پاساوت نەماوە،وەلەفەرمودەکە هاتوە،(ویُنادی مُنادي..)لەومانگەدا:جارچیەك بانگ دەکات:(یاباغی الخیراقبل..)واتە: ئەی چاکەخوازان پێشوازی بکەن لەچاکەکاری بەردەوام بن لەخێر،هەلێکی گرنگ وزێرینە بۆبەخشین وتەوبەکردن وتەقوا،(..ویاباغی الشر اقصر)ئەی شەڕخوازان بەسەودەستبەرداری خراپەبن،تەنانەت لەسەردەمی نەفامی پێش ئیسلام چوارمانگ هەبون بەمانگەحەرامەکان ناسرابون شەڕیان تێدانەدەکردن ئەگەردوژمنی خۆی بدیایەلێی نەدەدادەیگوت چونکە مانگی موحەڕرەمە،بەلاّم بێبڕوایانی ئەم سەردەمەهەرچەندەدروشمەکانیشیان جوانە لەمافی مرۆڤ وڕێزی بەرانبەر،بەلاّم لەومانگەشدابێ ڕێزی دەکەن بەرانبەرمانگی ڕەمەزان و سوکایەتی دەکەن بەموسڵمانان لەڕێگەی:میدیاکان کەهەندێکیان لەومانگەدا ڕیکلام بۆ خواردن دەکەن!لەکاتێکدا ڕەمەزان مانگی نەخواردن وبرسیەتیە، یان دابەزاندنی فلیم و درامای نابەجێ،یان گرانفرۆشی تەرازوبازی بازاڕ، یان دەسەلاّتەستەمکارەکان لەومانگە شدادەسبەرداری شەڕوئاژاوەوتەقینەوەنابن !لەفەرمودەیەکی ترداهاتوەکەپێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی چونەسەرمینبەرەکەی سێ جارفەرموی(امین)وتیان قوربان ئەوەچی بو؟فەرموی ئەوەجبریل بوسێ دوعای کردوفەرموی:(رغم انفة..)لوتی بشکێ خەجاڵەت بێ،میش ئامینم بۆکرد،یەکێ لەدوعاکان فەرموی:(من ادرك رمضان فلم يُغفرله)کەسێ بگاتە ڕەمەزان وکارێکی وانەکات بەهۆیەوە خوالێی خۆش بێت،سەنج بدەلە گەورەیی ڕەمەزان، حەزرەتی جبریل دوعابکات وپێغەمبەرگیان ئامین بکات!

بۆیەتازیاترئەومانگەبناسین زیاترگەورەیی دەزانین وخۆشمان دەوێت وبەتاعەت وعیبادەت لەخزمەتی دادەبین،کوردیش لەکۆنەوە وتویانە: ڕەمەزان هات و ڕەمەزان چوو..ئەوەی نەیگرت ڕوی ڕەش بوو.

*واتای ڕەمەزان :*

زانایان خوێندنەوەی جیاوازیان بووەلەسەر ووشەی ڕەمەزان بەڵام بە هێزترینیان قسەی امامی(قورطبي)یەکەدەڵێ:ڕەمچان لە(رمض)یە واتە (گەرم)جارڕەمەزانیش سەرجەم گوناهەکانی ڕۆژوگربەوتینەگەرمەی دەسوتێنێ،ئەمە ماناکەیەتی لە زمانەوانی داولەگەڵ مانا شەرعیەکەی دەگاتەوەکەڕەمەزان(مَحرَقَة)یەسوتێنەرەبۆگوناهوتاوانەکان.

# ڕەمەزان مانگی قورئانە....

ڕەمەزان قوتابخانەیەو خاڵی وەرچەرخان و گۆڕانە،چونکە مانگی دابەزینی قورئانە ،خوای گەورەمەدحی ئەم مانگەی کردوە وجیای کردۆتەوە لەمانگەکانی تر بەوەی کەقورئانی پیرۆزی تیا دابەزیوە،لێرەدا جیّ ی خۆیەتی لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بەگەورەیی قورئان بکەین :

١) بەهۆی خوێندنی قورئانەوە توێشە بەرەی دواڕۆژمان پڕدەبێت لەچاکە(ابن مسعود) کەقورئانێکی زیندوبولەسەرزەوی،بۆمان دەگێڕێتەوەکەخۆشەویستمان(ﷺ) فەرمویەتی **(من قراحرفا من كتاب الله فله به حسنة والحسنة بعشرامثالها،ولااقول(الم)حرف ولكن الف حرف ولام حرف وميم حرف )**(رواه الترمذي والطبراني وصححه الباني ) مانای وایە کەبەخوێندنی هەموو حەرفیّ(١٠) چاکەت بۆ دەنوسریّ وتەنها بەوتنی (الم) (٣٠) چاکەت بۆ دەنوسریّ ، ئەی ئەگەر هەموو قورئان بخوێنیتەوە کە (٦٢٣٦) ئایەتە و ٣٢٣٦٧٠) پیتە و دە چەندانەی بکەرە وە ، بزانە چ دەسکەوت و خێرێکی گەورەیە ، خۆش بەختی بۆ هەڵگرانی قورئان کە لە هەموو کەس دەوڵەمەند ترن لەقیامەتداوە هەروەها لە فەرمودەدا هاتووە کە (قورئان و ڕۆژوو)لە قیامەتدا شەفاعەت دەکەن بۆ خاوەنیان .

٢) هەرکەس لەخزمەت قورئانت دابیّ چاکترین کەسە ولەخوانزیکە وخۆشەویستمان هەواڵی پێداوین کە چاکترین کەس ئەوکەسە یە کە فێری قورئان دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات **( خيركم من تعلم القرآن وعلمه )**

٣) هەڵگری قورئان دەبیّ ڕەوشتی قورئانی بیّ کردەوەی پیّ بکات و دەستوری ژیانی بێت هەروەك پرسیارکرا لە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە لەڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرموی( كان خلقه القرآن )،پێغەمبەر(ﷺ) وێنایەکی جوانی بۆ کردوین لە وبارەوە فەرمویەتی :**(مثل المؤمن الذي يقرا القران ويعمل به مثل الاترجة ريحها طيب وطعمها**

حلو ،ومثل المؤمن الذى لا يقرا القران مثل التمرة لاريح لها و طعمها حلو ، ومثل المنافق الذى ...... ) وێنەی ئەو موسڵمانەی کە قورئان دەخوێنێ و کاری پێ دەکات وەك لیمۆ و پرتەقاڵە تام و بۆنیشی خۆشە ، وێنەی ئەوموسڵمانەی کە قورئان دەخوێنێ و کاری پێ ناکات وەك خورمایە،بۆنی نی یەوتامی شیرینە،وێنەی ئەو دووڕوەی کە قورئان خوێنەوەك ڕیحانە وایە بۆنی خۆشە وتامی تاڵە،وەئەومونافیقەی کە قورئان ناخوێنێ وەك کونەفسە و(گوژاڵك) وایە تامی تاڵە و بۆنیشی نیە.

٤) هەر گەل و کۆمەڵێ قورئانیان لەناو دابوو بەختەوەر و زیندون،خوای گەورە قورئانی بە (ڕوح) ناو بردووە ﴿ وكذلك أوحينا اليك روحامن امرنا ...﴾ مرۆڤ تا ڕوحی لە بەر بێ گەش و جوانە،گەر ڕوحی دەرچوو لاشەیەکی بۆگەن وبێ گیانە ، بە هەمان شێوە گەلی بێ قورئان دوچاری دەیان دەرد ونەخۆشی دەبێت وەك ( درۆوخیانەت و گەندەڵی و فەسادی ئەخلاقی و ناعەدالەتی و چەند ین قەیرانی ئابوری و سیاسی و کۆمەلآیەتی و ...هتد) وەك لەم ڕۆژگارەدا دەبینرێ .

٥) وەعدی خوای گەورەیە مەتنی قورئان دەپارێزێ و تا ئێستا بەزیاتر لە ( ١٣٠) زمان لێك دراوەتەوە ، پێغەمبەریش(ﷺ) دلنیای کردوین کەتادەست گرتوو بین بەقورئان و سوننەتەوە ئومراوسەرلێ شێوا ونابین فەرمویەتی:

{تركت فيكم شيئين ان تمسكتم بهما لن تضلوا بعدى : كتاب الله وسنتى} .

ساخوایە قورئان بکەیتە بەهاری دلمان.. نوری چاومان ..لابەری خەمان ..شەفاعەتکاری قیامەتمان .

## ماناومەبەستی ڕۆژوبزانە :

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿يأيهاالذين أمنواكتب عليكم الصيام كماكتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون *أياما معدودات .......﴾( البقره/ ١٨٣)ئەم ئایەتە پیرۆزەبنەماوبەڵگەی واجب بونی ڕۆژوی ڕەمەزانە،جالەبەر ئەوەزانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەرواجب بونی ڕۆژو ئیترهەرکەس بڕوای پێ نەبێ یان ئینکاری بکات کافر دەبێ﴿كتب عليكم الصيام ﴾ واتە:ڕۆژوپێویستکراوەنوسراوەلەسەرتان(كما كتب على الذين من قبلكم) هەروەکو لەسەر خەڵکانی پێش ئێوەش فەرزبووە،خوای گەورە دڵنەوایی موسڵمانان دەکات بەوەی کە لەسەرگەلانی پێش ئێوەش هەبووە،بەوە کارەکەگشتی وئاسانتردەبێ لەسەرموسڵمانان (لعلكم تتقون)ئامانج ومەبەست لە فەرزبوونی ئەنجامدانی تەقواوبەندایەتیە بۆخوا، تایبنە(مُتقی) کەئەوەش بەرزتین پلەیەچونکەبەرێزترین کەس لای خواتەقوادارتینە (ان أكرمكم عندالله أتقاكم)،(أياما معدودات)چەند ڕۆژێکی کەمودیارن لەچاو ڕۆژەکانی تری ساڵ،گەر بەراوردی بکەین،ڕۆژوو واتە:بەندایەتی و گوێڕایەڵی و سەرجەم ئەندامەکانی لەشەبۆ خوا،ڕۆژو زەکات وپاکەرەوەی جەستەی مرۆڤە .ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین، دەبینین ڕۆژوو وەکو بەزاهیری بنەما و سوننەت و ئادابی تایبەتی خۆی هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا لەناوەرۆکی دا چەند ماناومەبەستێکی لێ دەخوێنرێتەوە کەپێویستە بیان زانین و کاریان پێ بکەین،نەك وا بزانین تەنها عیبادەتێکی زاهیری یە و خۆگرتن بێ لە خواردن و خواردنەوە ، وەکو خەڵکانێکی بێ ئاگا وای بۆ دەچن !

# فەزڵ وگەرەیی ڕۆژوو

(٣٠)ی ڕۆژی ڕەمەزان سی دەرزی ئیمانیە بۆچارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی دەرونی و جەستەیی و هەواو ئارەزو،سودەکانی ڕۆژوو زۆرن لەوانە :

١) ڕۆژوگرتن لوتکەی بەندایەتی ودڵسۆزیە نەنجامدانی(اياك نعبد)کەبەردەوام لە نوێژەکاندا دوبارەی دەکەیتەوەودەڵێی خوایەتەنهابەندایەتی بۆتۆدەکەم،ئەوەش باوەڕی ڕاستەقینەو یەکلابونەوەیەبۆیەکخواناسی،ڕۆژوگرتن پەیوەستەبە ئیمانی پتەوەوە، چونکە عیبادەتێکی نهێنیەمرۆڤ دەتوانێ شت بخوابەنهێنی ولەناو خەڵکدابڵێ بە ڕۆژووم،کەسیش هەست ناکا، کەواتەبەڕاستی یەکلابونەوەوساغ بونەوەیە بۆخوای پەروەردگاری جیهانیان،هەربۆیە پاداشتی لای خوابێ حیسابە وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی:(كلُ عمل ابن ادم يضاعف الحسنة بعشر امثالها الى سبعماءة ضعف ،قال الله تعالى:الاالصوم فانه لي وانا أجزي به)(رواه البخاری)، واتە:هەموو کردەوەکانی ئادەمیزاد بۆخۆیەتی وپاداشتی دەدرێتەوە،یەك بەدەتا یەك بەحەوسەد ،خوادەفەرموێ: تەنها ڕۆژو نەبێ کەهەربۆ منەومن دەزانم چۆن پاداشتی دەدەمەوە.کەواتەلەبەرزۆری خێرەکەی پاداشتی دیاری نەکراوە! بە هەمان شێوەصەبریش پاداشتی دیاری نەکراوەلەقورئاندا(انمايوفى الصابرون اجرهم بغير حساب)لێرەدادەبینی ڕۆژوصەبردەستلەملان وپەیوەستی یەکتربون،بێگومان ئەوەی صبرو ئارامی نەبێت ڕۆژوی پێ ناگیرێت،ئەوهەمو خێرەی دەستگیرنابێت،وەڕۆژوصەبرهەردوکیان زادەی ئیمانی ڕاست ودروستن، وەڕۆژو بەندایەتیەکی نهێنی یەوبەسراوە بە ئیمانی ساغەوە وچاکترین دەرمانە بۆنەهێشتنی نیفاق ودوڕویی و خیانەت و گەندەڵی چونکە هەست کردنە بەچاودێری خوایی کەوات لێدەکات خۆت بگریەوەلەخۆشی ڕابواردنی دنیایی بۆماوەیەکی دیاری کراو.

٢) ڕۆژوو قەڵغانێکە لە ئاگردەتپارێزێ ..

قال رسول الله( الصوم جنه يستجن بها العبد من النـار )(رواه الطبرانـی)،واتـە:پێغەمبـەر (ﷺ)فەرمویەتی:ڕۆژوو قەڵغانێکەمەتالێکەخاوەنەکـەی لـەئاگردەپارێزێ ،وەکـو پـارێزەرێ دورت ئەخاتەوەلـەئاگری دۆزەخ،لـە ئەبوسـعیدی خـودری یـەوە( خـوای لێ ڕازی بێـت ) دەگێڕێتەوەکەپێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(هەرکەسێ یەك ڕۆژوو لەبەرخوابەڕاستی بـەڕۆژو بێت خوای گەورەحەفتاپایز واتەحەفتا ساڵ ڕوی دەم وچاوی ئەو کەسەدوردەخاتەوە لـەئاگر) (متفـق عليـە)ئـەی ئەوبڕوادارانـەی کەبـەمانگ بـەڕۆژوودەبن بۆخـوا،دەبێ بەخـشـش و پاداشـتیان چـەندە زۆر بێـت(انـە لفـضل عظـیم )،لەقاموسی (مختارالـصحاح)دا دەڵـێ: (الجنة:هوالسلاح الذی يستتربه المرء)،(جنـة)ئەوچـەکەیە کـەمرۆڤ خـۆی پـێ دادەپۆشـێ ودەیپارێزێ،وەك جل وبـەرگی گوللەنـەبڕی ئـەم ڕۆژگارە،بـەڵێ ڕۆژوونەوچـەکەیەکەنابینرێت ولە ناوەی مرۆڤداکاری خۆی دەکات ودەیپارێزێت لەهێرشی میکـرۆب وڤایرۆسـات، کەئـەم دەستەواژەیەش بەڕاستی معجیزەیەکی تری پێغەمبەرە(ﷺ) .

٣) ڕۆژوو قەڵغانە بۆڕزگاربوون لەهێرشی ئارەزوەکانی نەفس :

ڕۆژوکۆنترۆڵی نەفس دەکات،کەنەفست بەدەست تۆبێت نـەك تۆبەدەسـت بەفـسەوەبیت وەك بوکەشوشەی منالاَن یاریـت پـێ بکات،وەچـاکترین چارەسـەرەبۆدامرکاندنەوەی شـەهوەت و ئارەزوەکان،کەمرۆڤ بەهۆیەوەتوشـی شـەرمەزاری دنیـاو قیامـەت دەبێـت، چـونکەزۆرینەی خەڵك بەهۆی تاوانەکانی دەم ودامێنەوە،بەهۆی نـەفس وشـەیتانەوە دەچـنەئاگرەوە،ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی(اكثرماديخـل النـاس النـارالفم والفـرج...)، بەتایبـەت بۆئـەو گەنجانەی کەتواناى ژن هێنانیان نـی یـە ،(ابـن مـسعود) بۆمـان دەگێڕێتـەوە کەپێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویەتی:{ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەس لەتوانای دایەباژن بێنێ چـونکە باشـترە بۆپاراستنی دامێن وچاوتان،وەئەوەی توانـای ژن هێنـانی نیـە بـاڕۆژو بگـرێ دەیپـارێزێ } (متفق عليە)بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدازیاتر پێویستمانەکەڕۆژوە سـوننە تـەکانیش بگـرین بـۆ

دامرکاندنەوەی ئاگری دەرون ، چون هەر شوێنێ دەچی لە جادە و کۆڵان و فەرمانگەکان پڕیەتی لە ئافرەتی ڕووت و سەر لێ شێواو،پێویستە گەنجی بڕوادارعەقیدەو کەسایەتی خۆی بپارێزێ،بۆئەم مەبەستەش با فەرمانی پێغەمبەریەجێ بێنێ(**من لم یستطع فعلیه بالصوم**) کە نەیتوانی ژن بخوازێ با ڕۆژوو بگرێ ، بۆئەوەی توشی خراپەکاری نەبێت،تا لەسەر خوڕەوشتە جوانەکانی ئیسلامی بمێنێتەوە،لە ڕۆژودا فێری خواپەرستی دەبین لە جیاتی خۆپەرستی ... ئەبێ نەفست بەدەست تۆوە بێت ، نەك تۆ بەدەست نەفسەوە بی ئەوەیش بەرهەمی ڕۆژوو گرتنە،دەی بۆڕزگاربونمان لەخراپەکاری،بۆئەوەی کەسێتیمان لەدەست نەدەین،بۆئەوەی دوربین لە دەست و دامێن پیسی باپابەندی یاساکانی شەرع بین

**٤) ڕۆژوو شەفاعەت دەکات .**

لە گەورەیی وسودەکانی تری ڕۆژوو ئەوەیە کەشەفاعەت دەکات لای خوا بۆخاوەنەکەی وەکو پاڕێزەرێك وتکا کارێك بەرگری دەکات لە خاوەنەکەی،لە(امام احمدوحاکمەوە) ڕیوایەت کراوە لەبەشێکی فەرمودەیەکی درێژ داپێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(**الصیام والقرآن یشفعان للعبدیوم القیامة**)واتە: ڕۆژو قورئان لە ڕۆژی دوایدا تکادەکەن بۆ خاوەنەکەیان بەم شێوەیە:ڕۆژوەکە دەڵێ ئەی پەروەردگارمن بە ڕۆژخواردن وخواردنەوە وئارەزوم لێ قەدەغەکردوە تکایە بەمنی ببەخشە،قورئانیش دەڵێ خودایە منیش نەم هێشتوە بخەوێ تکام بگرە ولێی خۆش بە،شەفاعەتمان لێ وەرگر،بەم شێوەیە ڕۆژوو بە فەرز وسونەتەوە دێنە مەیدانێ بۆتکا و پاڕانەوەبۆ بەرگری لەخاوەنەکەیان.

**٥) بەهۆی ڕۆژو خوا لە تاوانەکانمان دەبورێ :**

ڕۆژووهۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانەخوای گەورەدەفەرمویّ(**ان الحسنات یذهبن السیئات**) واتە:کردەوە چاکەکان کردەوەخراپەکان ڕادەماڵن و دەیان سڕنەوە ڕۆژوش کە پڕیەتی لە خێر و چاکە دەبێتە هۆی سڕینەوە وداپۆشینی تاوانەکانمان دیارە هەمووشمان گوناهو تاوانمان هەیەدەبا بە چاکەکردن بیان سڕینەوە لەئەبو هورەیرە وە(خ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی :

(نێوانی پێنج نوێژەکان و نوێژی هەینی بۆ هەینی یەکی تر ڕەمەزان بۆ ڕەمەزانێکی تر دەبنە(کەفارەت)و داپۆشینی تاوانەکان گەر گوناهی گەورە نەکات )( رواه مسلم )چونکە تاوانەگەورەکان تەنها تەوبەی ڕاستەقینە ونەصوح دەیان سڕێتەوە ، لەئەبوهورەیرەوە (خ) پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:**(من صام رمضان ایمانا واحتسابا غفرله ما تقدم من ذنبه)** ( متفق علیه) واتە: هەرکەس بەبیرو باوەڕەوە ڕۆژی ڕەمەزانی گرت بۆخوا بە ئومێدی پاداشتی دوارۆژ ئەوەخوالەتاوانەکانی ڕابردوی دەبورێ ،زۆر لەئایەت وفەرمودەی تریش هەن کەئاماژە بەوە دەکەن کە ڕۆژو هۆکاری سڕینەوەی گوناهەکانە.

**٦) ڕۆژو خۆش بەختی دنیا و دوارۆژە:**

لە بەشێکی فەرمودەکەدا پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی:{**للصائم فرحتان ، فرحة عند فطره و فرحة عند لقاء ربه**} (رواەالبخاری)واتە:بۆڕۆژوەوان دووخۆشی هەیە،یەکێکیان ئێوارەکاتی بەربانگەو دووەمیشیان کاتێ بەخزمەت پەروەردگاری دەگات لەڕۆژی دواییی ، بەربانگی ئێوارانیش لەدوولاوە زۆر خۆشە،یەکەمیان ئەوەیە کەساتێکە هەموو بەفەرمانی خوا لەیەك کاتدا موسڵمانان دەست بەخواردن دەکەن لەدوای ئەوەی کە زۆر بۆی مشتا قن و ئارەزوو مەندن،دووەمیشیان دڵ خۆشە کە خوا هیدایەتی داوە ئەو ڕۆژەش فەرمانی خوای بەجێ هێناوە دیارە جگە لە و خۆشیانەی دونیا یە لە قیامەتیشدا سەربەرز و خۆش حاڵە بەو توێشوە چاکەی کەپێ یەتی .

**پیاوی بێ ڕۆژوو ئێوارەی لێ هات....کز دادەنیشێ پەشیمان و مات .**

**٧) بۆنی هەناسەی ڕۆژوەوان لە میسك خۆشترە:**

یەکێکی ترلەسودو بەخششەکانی ڕۆژوو ئەوەیە کە خاوەنەکەی زۆرخۆشەویستە لای خوا ، بەڕادەیەك ئەو بۆن وهەناسەی کە لەناو هەناوێکی خاڵی و برسی و تینویەتی دەردەچێت و لای خەڵکی ناخۆش و بێزراوە،ئەوبۆنە لای خواخۆشەویسترە لەبۆنی میسك و عەتروگوڵاو، کەمیسك لە گشت عەترەکان بۆن خۆشترە،وەك لە بەشێکی تری فەرمودەکە هاتووە، کە

فەرمویەتی:(والذی نفس محمدبیده ،لخلوف فم الصائم أطیب عندالله من ریح المسیك) (متفق علیه) واتە:سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژوەوان خۆشترەلای خواله بۆنی میسك،بەڵێ ئازیزان بۆنی ئەو دەمەی کەلەبەرخوا تائێوارە هیچ ناخوات ولەجیاتی خواردن وخواردنەوە سیواك و زیکر وقورئان خوێندنە لای خوا زۆر بەڕێزە کاتێ خوای پەروەردگار ویستی وابوو لەگەڵ موسا پێغەمبەردا بدوێت فەرمانی پێ کەوت کە (٣٠) ڕۆژ بەڕۆژوو بێت پاشان(١٠) ڕۆژی تریشی بۆ زیادکرد تا بوو بە(٤٠) ڕۆژئینجا چوەمیقات بۆخزمەت خوای پەروەردگار﴿فتم میقات ربه أربعین لیلة ﴾(الاعراف) ١٤٢) جا فەرموی ئەی موسادەزانی بۆنی دەمی ڕۆژوەوان چەندخۆشەویستەلای من بۆیەویستم وابوو بەوشێوەیە بێیتە میقات .لە دونیادا هەندێ شت لای ئێمە ناخۆش و بێزراوە بەلاَم لای خوا خۆشەویستەجگەلەهەناسەی ڕۆژوگر کەباسمان کردغونەی ترمان هەیە وەکو خوێن کەلای ئێمە بۆنی ناخۆشە وحەزلە بینینی ناکەین بەلاَم بۆنی خوێنی شەهیدی ڕێگەی خودا لە میسك خۆشترە ،وەك لە فەرمودەدا هاتوە کە : کەسێ لە ڕێگەی خودا پێکرابێ کاتێ لە ڕۆژی دو یی دا حیسابی لەگەڵ ئەکەن بەو شێوەی کاتێ لێدرانی زیندو دەکرێتەوە خوێن لە زامەکەی ئەتکێ،بەلاَم ڕنگ ڕەنگی خوێنە و سورە و بۆنیشی میسکە﴿اللون لون الدم والریح ریح المسك ﴾(بخاری ومسلم )جاچاکە ئەوەیە لە تەرازوی خوداچاك بێ نەفامیش بەخراپی بزانن،دەی چ کارێ لای خوا ڕێزدارە،بۆن دارە،با ئێمەش بەڕێزەوە ئەنجامی بدەین.

٨) هاندەری موسڵمانانە بەرەو ڕۆژی دوایی :

ڕۆژووگرتن واتە پەروەردەکردن وپێگەیاندنی بابای ئیمانداربۆکۆکردنەوەی توێشوی قیامەت وادەکات لە موسڵمان کەدوربین بێت و دوا ڕۆژی لەبەر چاو بێت،چونکە ئەومیزانەی کە کێشانەی کارەکانی خۆی پێدەکات مەعنەویە و قازانج و زەرەری دوا ڕۆژ دەخوێنێتەوە ، کاتێ کەخۆی دەگرێ لە خواردن و خواردنەوە بە ئومێدی پاداشتی ڕۆژی قیامەتە ،چونکە دەزانێ تێری و برسی یەتی ئەم دنیایەکاتیەلەبەرئەوە ئەم خۆشیە کەمەی دنیائەفرۆشێ بە

ژیانی خۆشی و سەر بەرزی یەکجاری قیامەت،موسڵمان دوربینەوخەمی دوا ڕۆژی خۆیەتی دەزانێ کەبەهەشت بەماندوبون وناڕەحەتی دەست دەکەوێت وجەهەننەمیش بە ئارەزووەکان دەورە دراوە،وەك پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(حجبت النارباالشهوات و حجبت الجنة بالمكاره )رواه الشيخان .

٩) ڕۆژوو مانای ڕاگەیاندنی بەندایەتیە بۆخوا :

ڕۆژو والەموسڵمان دەکات کە تەنها بەرنامەی خوا پیادە بکات و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بێت،بەوەش بەندایەتی خۆی دەسەلمێنێ،ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێ کە چۆن دەبینێ موسڵمانان هەموو لەیەك کاتدا دەخۆن ودەخۆنەوە بە فەرمانی خوا لە فەجری بەیانیەوە بە ڕۆژون تادوای خۆرئاوابون،وەك لەسورەتی بەقەدەردائایەتی(١٨٧)فەرمویەتی﴿كلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الابيض من الخيط الاسودمن الفجر ثم أتموا الصيام الى الليل ...﴾ بڕوادار بەم شێوەیە دەیسەلمێنێ کە تەنها بەندەی خوایە و لە هەمووبوارەکانی ژیاندا فەرمانی خوابە جێ دێنێ لە بچوکترین شتەوە تادەگاتەحاکمیەتی دینی خوا،بەڵێ ڕۆژووگر هەردەم لەفەرمانی خوادایە و وەلامی شەیتان ناداتەوە وهەواوئارەزوەکانی پشت گوێ دەخات، وەکو ئەو حاجیەی کەلەبەرگی ئیحرامدایەوگەلێ شتی حەلاڵیشی لێ قەدەغە کراوە تالەوبەرگەدابێ بۆی نیە ڕاوبکات وسەرجێ ی خێزانی بکات و ....بەو شێوەیە دەچێتە جیهانی فریشتەکان وسیفەتی مرۆڤەدنیایەکانی لەخۆ داڕنیوەو بەرگی قیامەتی لەبەرەبەفەرمانی خوا،بەهەمان شێوەڕۆژوەوانیش عەبدایەتی خۆی بۆ خوا ڕادەگەیەنێ و فەرمانی بەجێ دێنێ .

١٠) ڕۆژو تەندروستیە... زۆرخۆری نەخۆشیە

پێغەمبەر(ﷺ )فەرمویەتی:(صومواتصحوا)(رواه الطبراني)واتە:بەڕۆژوبن تەندروست دەبن،ئیسلام فێری کردوین بۆتەندروستی لاشەمان گرنگی بەپاکوخاوێنی بەدین،پێش خواردن ودوای خواردن دەستمان بشۆین کەبەچاکەش بۆمان دەنوسرێ ،پاشان زیادە ڕەوی

نەکەین لەخواردن و ورگ پڕکردن کەسەرچاوەی نەخۆشیە،یەکێك لەو شتانەی لە ڕەمەزاندا بۆی سەغڵەتوتەنگاوین ورگ پڕکردنە کە تەنها لەبەر نەخواردنی ژەمی نیوەڕۆیە،بۆئەو مەبەستە سەرەتادەچینەخزمەت قورئانی پیرۆز کە فەرمویەتی:﴿...کلوا واشربوا ولاتسرفوا انە لایحب المسرفین...﴾(الاعراف /٣١)واتە:بخۆن وبخۆنەوە(لەحەلاڵ) بەلآم زیادە ڕۆیی مەکەن چون خوای گەورە ئەوانەی خۆش ناویّ کە ئیسراف دەکەن،پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی (ماملا ادمی وعاء شرا من بطنە ......،خراپترین شت کەمرۆڤ پڕی کردبێت ورگیەتی،کە هەرپێویست بووپڕبێت باسێیەکی بۆخواردن بێت وبەشێکی بۆخواردنەوە وبەشەکەی تریشی بۆهەناسەی)(حدیث حسن/ رواه الترمذی )،دکتور(ابوماسیویە)دەڵیّ گەرئەم فەرمودەیەکاری پێبکریّ خەلکی لەش ساغ دەبن ونەخۆشخانەکان چۆڵ دەبن،یەکێك لە نەخۆشیەکانی ئەم ڕۆژگارە زۆر خۆری وقەڵەوی و ورگ لێهاتنە، دەرمانی ئەم دەردەش ڕۆژووە بەگشتی ، پێشەواعومەر(خوای لیّ ڕازی بێت) فەرمویەتی: {ایاکم والبطنة فی الطعام الشراب...، وریابن دوربکەونەوە لە ورگ پڕکردن لەخواردن وخواردنەوە، فانها مفسدە للجسد، .... چونکەجەستەولاشەت تێك دەدات،هۆکاری نەخۆشیە و دەبێتەهۆی تەمبەڵی وقالب گرانی لەنوێژەکان،وعلیکم بالقصد فیهما،فانە اصلح للجسد،وابعدمن السرف،وان الله تعالی لیبغض الحبر السمین ،وان الرجل لن یهلك حتی یؤثر شهوتە علی دینە،پێویستە مام ناوەند بن لەکاتی خواردن دا،کەباشترەبۆلاشەودورەلەزیادەڕەوی،خوای گەورەحەزی لەکەتەی ورگ زل نیەوخۆشی لیّ نایە، وە مرۆڤ کاتیّ لەناودەچیّ کە حەزو ئارەزوەکانی هەڵبژارد بەسەردینەکەیدا}بەداخەوە کە بەلای هەندیّ کەسەوە ورگی گەورەو زۆرخۆری ئازایەتی نیە!کەبەڕاستی جێگەی بەزەیین ،مەنفلوتی لەگێڕانەوەیەکدا دەڵیّ چومەلای هاوڕێیەکم سکی دێشا لەبرسان،چومە لای هاوڕێیەکی ترم دووچاری ئازارێکی زۆر ببو وبەهۆی زیادە خۆرییەوە!جا ئەگەرئەوەی دووەمیان زیادەکەی بدایە بەیەکەمیان هیچیان سکیان نەدێشا ، موسڵمان دەبیّ زۆر گرنگی بدات بەبواری تەندروستی لاشەی بەتایبەت وەرزش و پاك و

خاوێنی جەستە وخواردن و پۆشاك و ...هتد ،چونكە دەزانێ كە پێشەواكەی (ﷺ) فەرمویەتی:(المؤمنين القوى خيروأحب الى الله من المؤمن الضعيف)واتە:موسڵمانی بەهێز وتوانا چاكتروخۆشەویستره لای خوا لەموسڵمانی بێ هێزولاواز،

*دكتۆرێكی بەناوبانگی بیانی كە(موسڵمانیش نیە)لەرێگەی رۆژوی تەندروستیەوە نەخۆش چارەسەردەكات ودەڵێت:(رۆژووبریتیەلەكێشێكی كەمتر،پێستێكی جوانتر ،نەمانی ژەهر،كەمبونەوەی ئازاروئیلتیهابات،زیادبونی تەركیزكردن...)ئەمەش قورئان لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێكردووە(وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ).

* دیراسەیەكی ولاتی نەرویج ئاشكرای كردكەرۆژووچارەسەرێكی باشە بۆئیلتیهابی جومگەكان بەمەرجێ چوارهەفتەبخایەنێ،ئەمەش معجیزەوراستی دینەكەمانە كە هەمان ئەوماوەیەیئیسلام دایناوە.

* رۆژو(ئەنتی ڤایرۆسە)پزیشكەكان دەڵێن:برسیەتی ئەوژەهرەلەناودەبات كەلە ئەنجامی زۆرخۆری بەردام بەدرێژایی ساڵ لەخانەكانی لەشدادروست دەبێت.

*رۆژونەخۆشی شێرپەنجەرادەگرێ، لەگۆڤاری(علم النفس)دابلاوكراوەتەوە،بەپێی راپۆرتی تیمێكی زانایانی زانكۆی كالیفۆرنیالەتاقیكردنەوەكیانداتەوەیان سەلماندوەكەرۆژودەبێتەهۆی وەستانی دابەشبونی خانەشێرپەنجەییەكان.

* خۆپاراستن چاكترەلە چارەسەركردن ،كە ئەوەش لە رۆژودا دەبینرێ .

* كەمخواردن دڵ نەرم دەكات ،بیر وهۆش بەهێز دەكات، هێرشی شەهوەت و ئارەزوەكان لاواز دەكات وەك لە رەمەزاندا هەستی پێ دەكرێ ،

* زۆرخۆری خویەكی دزێوە هیچ پێوەرێكی باشی بۆنەكراوە،كوردیش بۆدژایەتی كردنی زۆرخۆری قسەیەكی خۆشی هەس،ێژێ:(كایەكە هی خۆت نیە،خۆكادێنەكە هی خۆتە) مانای ئەوەیە باخواردنەكەش هی خۆت نەبێ، نابێ ئەوەندە ورگت بئاخنی بێزار بی بەدەستیەوە .

* (ابی سلمانی دارانی)دەڵێ:ئەگەرویستت بیرلەنیشێك بكەیتەوەئەوەنان مەخۆتا بەرنامەی كارەكەت دادەنێی،چونكە تێری عەقڵ لاوازدەكا،هەندێ لەپیاوچاكان لەكاتی خوارن دا بەیەكتریان دەگوت:زۆرمەخۆن چونكە زۆریش دەخۆنەوە پاشان زۆردەخەون و زۆر زەرد دەكەن

* پێشەوا شافعی( ڕەحمەتی خوای لێبێت)دەڵێ:ماوەی(١٦)ساڵ تێرم نەخواردوە،چونكە تێری دەبێتە هۆی تەمبەڵی و لەش قورسی و زیرەكی لادەبات و خاوەنەكەی لە عیبادەت تەمبەڵ دەكات .

* گەرقەڵەوی كێشی خۆت دابەزێنە،هەمودوكتۆرەكانی دونیاجەخت لەسەرئەوەدەكەنەوە كەخۆگرتنەوەلەخواردن ئاسانترین وهەرزانترین چارەسەرەبۆقەڵەوی،كەئەوەش لەڕۆژودا بەرجەستەدەبێت،جائەوهەلەئالتونیەبقۆزەوەبۆخۆشبەختی دنیاوپاداشتی دوارۆژ،پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:{چاكترین سەردەم زەمانی منە پاشان دوای ئەوان،پاشان قەومێك پەیدا دەبن شاهیدی دەدەن بێ ئەوەی داوایان لێكرابێ،وەفابەنەزرناكەن( **ویظهر فیهم السمن**)وە دیاردەی قەڵەوی لەناویاندادەردەكەوێ} (متفق علیه)لەم فەرمودەیەدا خۆشەویستمان ورگی زل وقەڵەوی بەنیشانەی ئاخرزەمانی داناوە!هەردەڵێ ی لەم ڕۆژگارەدا ئەم ووتەیی فەرموە كەئێستابەچاوی خۆمان دەبینین(لەمەسنەداهاتوەبەگێڕانەوەیەكی لاواز)كەپێغەمبەر(ﷺ) كابرایەكی قەڵەوی ورگ زلی بینی فەرموی گەرئەو قەڵەویە لەناوسەری دابوایە چاكتربوو بۆی،واتەلەبیرو هۆشداقەڵەوبوایەمەبەستی عەقڵ وزیرەكیە،نەك لەورگ داكەپڕیەتی لە پیسایی،لەكۆتایدائەڵێم :

**لەش ساغی تاجی پاشایەتیە..قەناعەت دەوڵەمەنیە.. دینداری بەختەوەریە**

---

بۆزیاترئاگاداربون لەسودەتەندروستیەكانی ڕۆژوسەیری ئەم دووكتێبەبكە:

(موسوعة الطب البدیل،د.هانی محمدمرعی)،(ڕۆژوموعجیزەیەكی زانستیە،د.كاوە)

## کاریگەری ڕۆژوی ڕەمەزان..لەسەرکەسایەتی موسڵمان

١) گرنگی سات وکاتەکانی ژیان،کات وسات هەمو بەنرخ وگرنگن،چونکە پێکهاتە و دەستمایەی ژیانە،بۆیەپێویستەزۆرئاگاداری بێت وبزانێ چۆن وەلەچیدا سەرفی دەکات، بەتایبەت لەکاتی ڕەمەزاندا،یەکێ لە سوننەتەکانی خوا لەبونەوەردا ئەوەیە هەرشتێ لە دروست کراوەکانی زۆرگرنگ وبەڕێزبوو سوێندی پێ دەخواکە ئەوەش ئاماژەیەبۆ گرنگی وگەورەیی پێ خوراوەکە،بۆیە یەکێ لەوشتەسوێن پێ خوراوانە،چەرخ وزەمانەیە وە سورەتەکەشی هەربەوناوەیە،وەك فەرموویەتی:﴿ والعصر..،سەرنج بدەکاتی نزیك بونەوەی بەربانگ دێت هەرسەیری سەعاتەکەی دەکات بۆپێشتروانەبوو؟کە پێنج خولەکێکی دەمێنێ زۆرچاوەڕوانەوئاووخورماکەی ئامادەکردووە،تەنها لەبەرئەوەی تۆزێك تینوی بووە،ئەی ئەگەرسەرجەم ساتەکاتی ژیانمان بەوشێوەیەبگوزەرێنین چ گەورەیی وپێشکەوتنێ ڕودەدات!؟

٢) پابەندبون بەیاساوڕێساکانی ژیان،فێرمادەکات پابەندبین بەیاساوە،گوێڕایەڵ بین، نەخشەڕێگای ژیان بزانین،وەك دەبینی لەڕەمەزاندابەفەرمانی خواهەموولەیەك کاتدا بەیانیان دەست هەڵدەگرن لەخواردن وئێوارانیش لەیەك کاتداپێکەوەدەیشکێنن

٣)چێژوەرگرێن وهەستکردن،چێژوەرگرێن لەخواردن وخواردنەوەوخۆشیەکان،ئەودەبەئاوەی کەپێشتر بەکەمت دەزانی،ئەونانەی کەناشکوربوی بەرانیەری،وەهەستکردی بەئازاری تونیەتی وبرسیەتی هەژاران وناخۆشیەکانی ژیان،وەك وتراوە:قەدری ڕوناکی چاولای کویرونابینایانە،لەبەشێکی فەرمودەکەدا پێغەمبەرمان ﷺفەرمویەتی{للصائم فرحتان فرحة عند.فطره وفرحة عندلقاءربه}(رواه البخاري) واتە:بۆڕۆژوەوان دووخۆشی هەیە

یەکێکیان ئێوارەکاتی بەربانگەودووەمیشیان کاتێ بەخزمەت پەروەردگاری دەگات لەڕۆژی دوایی،بەربانگی ئێوارانیش لەدوولاوە زۆرخۆشە،یەکەمیان ئەوەیە کەساتێکە هەمووبە فەرمانی خوا لەیەك کاتداموسڵمانان دەست بەخواردن دەکەن لەدوای ئەوەی کەزۆر بۆی مشتاقن و ئارەزوو مەندن،دووەمیشیان دڵخۆشە کەخوا هیدایەتی داوە ئەو ڕۆژەش فەرمانی خوای بەجێ هێناوە دیارە جگە لە وخۆشیانەی دونیایەلە قیامەتیشدا سەربەرز و خۆشحاڵە بەو توێشوە چاکەی کەپێیەتی .

٤)قەناعەت وسنوردانان بۆخۆشی وناخۆشیەکان،ناسین وزانینی سنوری شتەدنیاییەکان بەوەی کە هەمووشتێ کۆتایی دێت،وەك جۆن ڕەمەزان وتەمەنی من وتۆکۆتایی دێت بەهەمان شێوەخۆشی وناخۆشیەکانیش لەدنیاسنوردارەوکۆتایی دێت،جا باخۆشیەکی کەمی سنورداری دنیایی نەگۆڕینەوە بەخۆشیەڕاستەقینەوبێ سنورەکانی بەهەشت، ڕۆژووگرتن واتە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی بابای ئیماندارێ کۆکردنەوەی توێشوی قیامەت،وا دەکات لە موسڵمان کە دوربین بێت و دوا ڕۆژی لەبەر چاو بێت ،چونکە ئەو میزانەی کە کێشانەی کارەکانی خۆی پێدەکات مەعنەویە و قازانج و زەرەری دوا ڕۆژ دەخوێنێتەوە، کاتێ کە خۆی دەگرێ لە خواردن و خواردنەوە بە ئومێدی پاداشتی ڕۆژی قیامەتە، چونکە دەزانێ تێری و برسیەتی ئەم دنیایە کاتیەجا لەبەر ئەوە ئەم خۆشیە کەمەی دنیا ئەفرۆشێ بە ژیانی خۆشی و سەر بەرزی یەکجاری قیامەت،موسڵمان دوربینە وخەمی دوا ڕۆژی خۆیەتی دەزانێ کە بەهەشت بەماندوبون و ناڕەحەتی دەست دەکەوێت و جەهەننەمیش بە ئارەزووەکان دەورە دراوە،وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(**حجبت النار بالشهوات و حجبت الجنة بالمكاره** )رواه الشيخان،لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووەکە(خۆشگوزەرانترین

کەسی دنیادێنن ویەکجار بەناودۆزەخدادەیبەن پاشان پێی دەڵێن ئایاخۆشیت بینیوە؟دەڵێ نەخەیرهەرگیزخۆشیم نەدیوە! (پەنابەخوالە سزای سەختی ناوئاگرکەهەموخۆشیەکانی دنیات بیردەباتەوە)،پاشان کەسێکی تردێنن کەلە دنیادالەناخۆشترین ژیاندابوەیەکجاریەناو بەهەشتدادەیبەن وپاشان لێی دەپرسن ئایا ناخۆشیت بینیوە؟دەڵێ نەخەیرهیچ ناخۆشیم نەدیوە،بۆیەهاوەڵانی پێغەر(ﷺ)خۆشیەکانی بەهەشتیان لەبەرچاوبوەهەرگیزگویان نەداوە بە ناخۆشیەکانی ژیان،چونکەدەزانی بەهەشت بەناڕەحەتیەکان دەورەدراوە.

٥) ڕۆژوگرتن :باوەڕی ڕاستەقینە ویەکلابونەوەیە بۆخوا،ڕۆژوگرتن پەیوەستە بەئیمانەوە چونکە عیبادەتێکی نهێنیە مرۆڤ دەتوانێ شت بخوابەنهێنی ولەناو خەلکدا بلێ بەڕۆژووم کەسیش نازانێ کەواتەبەڕاستی یەکلابونەوەوساغ بونەوەیەبۆخوای پەروەردگاری جیهانیان، هەر بۆیە پاداشتی لای خوابێ حیسابە وەك لەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێ(كل عمل ابن ادم يضاعف الحسنة بعشر امثالها الى سبعماءة ضعف، قال الله تعالى:الا الصوم فانهُ لي وانا أجزي به)(رواه البخاري) پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی:هەموکردەوەکانی ئادەمیزاد بۆخۆیەتی وچاکەی دەدرێتەوەیەك بەدە تایەك بە حەوسەد،خوادەفەرموێ: تەنها ڕۆژونەبێ کەهەربۆمنەومن دەزانم چۆن پاداشتی دەدەمەوە،چونکەکارێکی نهێنیەو بەسراوەبە ئیمانی ساغەوەوچاکترین دەرمانە بۆبنەبڕکردنی خیانەت و گەندەڵی ودووڕویی، چون هەستکردن بەچاودێری خواوات لێدەکات خۆت بگریەوەلەخۆشی ڕابواردنی دنیایی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو،کارەکە نهێنیەولە بەینی بەندەو خوادایە،بەوەش گەورەیی خوادەسەلمێنی کەهیچی لێ وون نابێ وئاگادارە بە نهێنی وئاشکرا لەسەرجەم بوارەکاندا.

# هەندێك لە ئەحكامەكانی ڕۆژوو

*** ڕەمـەزان بەچی دەچەسپێ ؟**

بەدیتنی مانگی یەك شـەوەی ڕەمـەزان یـان تـەواوكردنی سی ڕۆژەی مـانگی شـەعبان، ئەگـەر هەوربوو،شـایەتی عـەدلیش ڕاینەگەیاندبوو،لـە فەرمودەیەكدا - مـسلم و بخـاری - هێناویانەوئەمەش كوردی یەكەیەتی،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویـەتی:(بـە ڕۆژوبـن بـە بینینی مانگی ڕەمەزان وبیشكێنن بە دیتنی مانگی یەك شەوەی شەو وال، ئەگـەر هـەو وغویـار بـوو لاتـان ئـەوە سـی ڕۆژی شـەعبان تـەوا و بكـەن و ڕەمەزانـە ) .

* ڕۆژو وگرتنـی كۆتـا ڕۆژی مـانگی شـەعبان بەنیـەتی ڕەمـەزان دروسـت نیە،كەبـە (یوم الـشك )ناسـراوە،مەگەربۆ كەسـێ كـە ڕۆژوی خـۆی بـێ وبكەوێتـە ئـەو ڕۆژەوە ووەك كەسێك كەهەموودووشەمە وپێنج شەمانێك گرتبێ و بكەوێتە ئەوكاتەئـەوە دروسـتە،گەربۆ ئیحتیاتی ڕەمەزان نەبێ،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی (**لا یتقدمن أحدكم رمـضان بـصوم یوم أویو مین، الاان یكون رجل یصوم صومە فلیصم ذلك الیوم**)(بخاری ومسلم ) واتـە : كەس ڕەمەزان پێش نەخات بەگرتنی ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ مەگـەر واڕێ بكـەوێت ڕۆژی خـۆی بێ،چونكە هەندێ كەسی ناحاڵی ئەم پێش خستنە بە ئازایەتی دەزانن بەڵام حەرامە .

*** مـەرجەكانی ڕۆژوو گرتن :**

ڕۆژوی ڕەمەزان لەسەركەسێ واجبەكە ئەم مەرجانەی تێدا بێت :

(موسڵمان بێ ،تەكلیف،واتە گەیـشتبێ بـە ڕادەی داوالێكراو،دەبـێ عاقـڵ و بـاڵغ و لـەش ساغ بێت،عوزری شەرعی نەبێت،وەك لەهۆش خۆچوون لەسەرانسەری ڕۆژوەكەدا بێ ئاگابێ یان حەیز وزەیستانی بۆ ئافرەتان) .

* ڕوخسەتەكانی ڕۆژو: هەركاتێ ئەم عوزرانەی هەبون دەتوانێ بە ڕۆژوونەبێ وبیشكێنێ : نەخۆشیەك كە جێگەی مەترسی بو،دەتوانێ بیشكێنێ و دوایی بیگرێتەوە .

ـ سەفەرێك کە تێدا نوێژ کورت بکرێتەوە .

ـ کەسێ توشی نەخۆشی یەکی (موزمین) بۆبێ واتە: دائمی بێت ئومێدی چاك بونەوەی لێنەکرێ لەم حاڵە دا فیدیە ئەدا.

ـ وەهەرکەس لە ژن و پیاوکە زۆر پیر و پەك کەوتە بوو بن،لەم حاڵەتانەدا ڕۆژویـان لەسـەر لا دەکەوێت ولە جیاتی هەر ڕۆژویەك دەبێ (فدیە) بدەن واتـە خـواردنی هـەژارێ، ئەمـەش بەڵگەی ئایەتە﴿وعلـى الـذين يطيقونـه فديـة طعـام مـسكين ﴾ واتـە ئەوانـەی کـەتوانایی گرتنیان نیە با خواردنی هەژارێ بدەن ..

*** پایەکانی ڕۆژوو دوانن :**

١) نیەت هێنانی ڕۆژوو: بۆ ڕۆژوی فەرز پێویستە هەموو شەوێ پێش فەجری بەیانی نیەتی ڕۆژوبێنـی چـونکە هـەموورۆژووێ سـەربەخۆیەو(نیـەتی)خـۆی دەوێ ،ئەمـەڕای ئیمـامی (حەنەفی وشافعی)یەچاکتروایە نێـواران دوای شـکاندنی ڕۆژوەکەی،دوعاکـە بخوێنی و بڵـێ خوایە بۆ تۆیە ڕۆژوو بوم وە لەسەر ڕزقی تۆ شکاندم وە سبەیش بە ڕۆژودەبم ،نیەت هێنـان لەدڵدایە وپێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: انما الاعمال بالنيات ..)

٢) الامساك : واتە: خۆگرتنەوە لەخواردن و خواردنەوە وسەرجێی خێـزان و لـەو شـتانەی ڕۆژودەشکێنن لەفەجری بەیانیەوە تادوای خۆرئاوا بوون .

# ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن

١) ڕۆژوبەتاڵ دەبێتەوە بەخواردن وخواردنەوەی هەرشتێ بە ئەنقەست،باکەمیش بێ ، بەلأم گەر لە بیری چوو،بەنەزانی خواردی پێ ی ناشکێ هەر چەندێ بخوات تا ئەوکاتەی دێتەوە بیری کەبەڕۆژووە،ئەوەخوا نان وئاوی پێداوە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی( من نسي وهوصائم فأكل أو شرب فليتم صومه فأنما اطعمه الله وسقاه)(متفق عليه)واتە: کەسێ بەنەزانی وبیری نەبوو خواردی وخواردیەوەبارۆژوەکەی تەواوبکات،ئەوەخوانان وئاوی داوەتێ

٢) هەرشتێکی بینراولەشوێنێکی کراوەوە چووە ناو لاشەوە،وەك لەدەم ولوت وپاش وپێش کەئەمانە ڕێگەی سروشتین ، بەلأم سەبارە ت بەڕێگە ناسروشتیەکان وەك چاو وگوێ زانایان لەسەری یەك دەنگ نین ،بۆ نمونە ڕای بەهێزنەوەیە کەقەترەی گوێ ڕۆژو بەتاڵ دەکاتەوە،بەلأم ئەگەرمێشولەیەك یا تۆز و خۆڵ چووە ناوەوە پێ ی ناشکێ چونکە بەدەست خۆت نیەقوت دانەوەی تف ولیك ئاساییە،شرنقەی ئاسایی نایشکێنێ بەلأم کەراهەتی هەیە،ئاو هەڵواسین و خوێن وەرگرتن دەیشکێنێ . ئەگەر ڕشانەوە ناچاری کرد وتینی بۆ هینا پێی ناشکێ ،بەلأم خۆڕشاندنەوە دەیشکێنێ ،وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتوە کەمـاناکەی بەم شێوەیە:( کەسێ لەکاتی ڕۆژودا ڕشانەوە تینی بۆهێناوە،ئەوە قەزای لەسەر نیە،ئەگەر خۆی ڕشاندەوە باقەزای بکاتەوە)(رواه أبو داود و ترمذي )

٣) (جیماع)سەرجێی کردن باناویشی نەیەتەوە، ڕۆژوەکە بە تاڵ دەکاتەوە وکەفارەتیشی دەکەوێتە سەر،لە فەرمودەی پێشەوامانداا هاتوە کە(بخاری مسلم ) ولە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە بەم شێوەیە ماناکەی : ( پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی بەهیلاك چوم ئەی پێغەمبەری خوا ئینجا حەزرەت فەرموی : چی بە هیلاکی بردوی ؟ وتی سەرجێیم کردوە لەگەڵ خێزانمدا بە ڕۆژی ڕەمەزان ، پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ووت بەندەیەك ڕزگار بکە، کابرا وتی ناتوانم ،ئەی دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی لە کەفارەتی ئەم کارە ؟ کابرا وتی ناتوانم ،لەو کاتەدا پوشێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر

(ﷺ) پیّ ی ووت بچۆ ئەم خورمایە بکە بە خێر بۆ هەژاران ،کابرا وتی جا لە ـ ن هەژارتر هەیە ؟ دیارە هیچی نەبووە و زۆر هەژار بووە پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و بەزەردەوە تاکاکیلەکانی دەرکەوتن ،فەرموی:دەی بیبەرەوە دەرخواردی کەس وکارتی بدە) بەلاّم لەش پیس بون (احتلام) ڕۆژوی پیّ بەتالّ نابیّ .

٤) حەیز وزەیستانی ئافرەتان :

ئافرەت گەرکەوتەحەیز وزەیستانیەوە ڕۆژوەکەی بەتالّ دەبێتەوە،با ڕۆژیشی کەم مابیّ ، دەبیّ بیگرێتەوە ، بەلاّم نوێژەکان ناگێڕێتەوە .

لەئەبوسعیدەوە(خوای لیّ ڕازی بێت ) پرسیارکرا لەپێغەمبەر(ﷺ)سەبارەت بە نوقسانی دینی ئافرەتان لەوەلاّمدا فەرموی:ئەی ئەوە تا کاتیّ لەحەیزدابوو نوێژ وڕۆژوو ناکات (بخاري مسلم ).

٥) شێتی و هەلّگەڕانەوە لە دین :

هەرکەس شێت بووبەرپرسیارنیە،یان لە دینەکەی پاشگەز بۆوە کارەکانیان بەتالّە چ جای ڕۆژوو،بەم شێوەیە پێویستە لەسەر ڕۆژووگر خۆلەو شتانە دوربگریّ کە ڕۆژووەکەی بەتالّ نەکەنەوە ، لە فەجری بەیانیەوە تای دوای خۆرئاوابوون،با ئاگاداری ڕۆژوەکانمان بین و بیان پارێزین و ڕیسەکەمان نەکەینەوە بە خوری .

## بەچی ڕۆژوو بشکێنین باشترە ؟

قال تعالى﴿...وفاكهة مما يتخيرون ولحم طير مما يشتهون﴾(الواقعه :٢١)واتە:بەهەشتی یەکان لەمیوەجاتی بەهەشتیّ هەلّدەبژێرن وپاشان لە گۆشتی پەلەوەر دەخۆن لەوەی حەزی لیّ بکەن ، بێگومان قورئان بەرنامەی ژیانە لە سەرجەم بوارەکاندا ، وە خۆی لە خۆی دا موعجیزەیەکی گەورەیە کە بۆ پێغەمبەر هاتووە (ﷺ) ئەگەر سەرنجێکی زانستیانەی ئەو

ئایەتەی سەرەوە بدەین ! دەبینین خوای زانا و کاربەجێ لەباسی خواردنی بەهەشتیەکاندا ، میوەی پێش گۆشتی پەلەودر خستوە ! میوە پێك هاتوە لە شەکری سادە و هەرس کردنی ئاسانە ، مەمیلەکانی ناو ڕیخۆڵە زۆر بە خێرایی توانای هەڵمژینی شەکری سادەیان هەیەو بەم کارە لەماوەی نیو کاتژمێردا وزەی تازە دەگاتە خانەکانی لەش، مرۆڤەکە زوو هەست بەخۆشی و چالاکی دەکات . بەلاّم خواردەمەنی یەك کە ڕۆنی تێدایە وەك گۆشت و پاقلاوە لەنا و گەدە درەنگ هەرس دەبێت و ئەو کاتە درەنگ وزە و سوتەمەنی دەگاتەخانەکانی لەش کە پێویستی بەشەش کاتژمێر هەیە بۆ ئەم کارە . بۆیە ئەو ڕۆژوەوانەی کە لەسەر سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی بەربانگدا بە میوەی خورما دەیشکێنێ ئانوێژی مەغریب دەکات و دەچێتەسەرسفرەی خواردن لە ماڵەوە خانەکانی جەستەی وزەی تازەیان پێگەیشتوە بۆیەئەوکەسە هەست بەچالاکی دەکات،دیارەخورما تاکە میوەی مەدینە بووە بەلاّم ئەگەر لەسەر سوننەتەکە نەیشکاندو بەشیرینی وچەوری شکاندی وئاوی بەسەرداکرد خانەکانی لەشی درەنگ وزەی تازەیان پێدەگات چونکە چەوری گرانەو ئاویش کرداری هەرس کردن دوادەخات لەئەنجام دا هەست بەتەمبەڵی و گێژی و بێ تاقەتی دەکات وە لەسەر سفرەیش ئارەزوی خواردنی کەم دەبێتەوە ، جا هەر میوەیەك بێ، بەتایبەت کە پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆیە میوەی خورمای هەڵبژاردوە چونکە شەکری سادە و هەندێ لەوخواردەمەنیە سەرەکیانەی تێدایەوەك: فسفۆرو کالیسیۆم ومەگنیسیۆم وە هەندێ لەو ڤیتامینانەی کە لە ئاودا ناتوێنەوە . بۆیە گەر سەرنج بدەی یەکێ لەو شتانەی کەخوای گەورە وەسفی بەهەشتێ پێ دەکات کە بۆ بڕواداراني ئامادەکردوە ، میوەجاتی بەهەشتە ، کە هەمومیوە یەك دووجۆری تێدایەو،بەرەکانیان نزیکە وخواردنی ئاسانەو....هتد،بەوەدا دەردەکەوێ کە خواردنی میوە کەڵك و سودی زۆرە بۆ جەستەی مرۆڤ ،وە پزیشکەکانیش دانیان بەم ڕاستیەداناوە،ئەوەتا قورئان (١٤٣٥) ساڵ لەمەوبەر ئەم ڕاستیەی گەیاندوە وەك موعجیزەیەکی زانستی کە جێگەی سەرنجە .

# ئادابی ڕۆژوەوان

ئاداب و سوننەتی ڕۆژووگەلێ زۆرن کەلەخێروپاداشتی ڕۆژوەکەزیاد دەکەن،گرنگترینیان ئەم حەوت ئادابەن :

١ ) پارشێوخواردن :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (تسحروا فان فی السحور برکه )( بخاری ومسلم ) .واته : پارشێو بکەن چونکە بەرەکەتی تێدایە ، ابن تیمیه (خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ پارشێو بەرەکەتی دنیاو دواڕۆژە ، چون لە دنیادا هێزو گروتین دەدات بەلاشەی ڕۆژ گرەکە ، بۆ قیامەتیش خێری هەستانەوەی بۆ دەنوسرێ ، لەبەر ئەوە پارشێو بکەن گەر بە قومێ ئاویش بێ ، تا دوابخرێ بۆ نزیك فەجر باشترە.

٢) زوویەربانگ کردنەوە:

موستەحببەکە بانگ بووزوو ڕۆژوەکە بشکێنی و دوای نەخات،تا خۆمان دوربگرین لە ڕەفتاری گاور وجولەکەکان،چونکە ئەوان دوایان دەخست،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی : ﴿لایزال الناس بخیرماعجلوا الفطر﴾(متفق علیه) واته :خەڵکی باشن و خێریان تێدایە تاکو پەلە بکەن لە ڕۆژوو شکاندن ،لەمەسنەدی امام ئەحمەدا هاتووەکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:( ئومەتەکەم لە خێردان تا پەلەبکەن لە شکاندنی ڕۆژوەکەیان وپارشێویان دوا بخەن )باشتر وایە بە خورما بیشکێنێ و ژمارەی دەنکەکانیش تاك بن ، گەر خورما نەبوو بە ئاو بیشکێنێ ، وەك ئەنەس بۆمان دەگێڕتەوە،کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی نوێژی مەغریب بکات بەچەند دەنکە خورمایەك دەیشکاند،گەر خورما نەبوایە بە ئاو دەیشکاند چونکە پاکەرەوەیە .

٣)دورکەوتنەوە لە قسەی پروپوچ :

لەسەر ڕۆژوگرپێویستە واز لەلەوکردارو گوفتارانە بهێنێ کەلەگەڵ مەبەستی ڕۆژوەکەی دا ناگونجێ،وەك دورکەوتنەوە لە زمان شڕی و غەیبەت و درۆو گوێ گرتن لەو شتانەی

کەحەرامن ،بەتایبەت ڕۆژووگردەبیّ خۆی بپاریّزیّ و ڕۆژوەکەی سوك نەکات،ابوهریرە ( خوای لیّ ڕازیبێت)دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی{**من لم یدع قول الزور والعمل به فلیس لله حاجة في أن یدع طعامه وشرابه** }(بخاری )بەمانای کەسیّ واز لە خراپە و خراپەکاری نەهێنیّ ولەدرۆ دورنەکەوێتەوە،ئەوە خوای گەورە پێویستی بەوە نیە ، تەنها واز لە خواردن و خواردنەوە بێنیّ ، وەك لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:{ **رب صائم حظه من صیام الجوع والعطش**}( ابن ماجه والبیهقی ) واتە: ڕۆژوگری وا هەیە تەنها تونیەتی و برسیەتی بۆ دەمێنێتەوە،جا لەبەر ئەوە پێویستە بە هەموو ئەندامەکانی لاشەمانەوە بەڕۆژوو بین ، تا خێری تەواومان بۆ بنوسریّ .

**٤) غوسلکردن پێش فەجر :**

ئەو کەسانەی کە غوسڵیان دەکەوێتە سەر،چاکتر وایە پێش فەجری بەیانی خۆیان بشۆن ، تاکو هەرلەسەرەتاوە ڕۆژوەکەیان لەسەر پاکی بێت ،هەرچەندە بکەوێتە دوای فەجریش هەر دروستە وەکو پێشەوا بخاری هێناویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) بەجەنابەت ماوەتەوە تادوای فەجرپاشان غوسڵی کردووەو بەڕۆژوبووە .

**٥) سـیواك کردن ئپێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی(لولاأن أشق على أمتي لامرتهم بالسواك عند کل صلاة**)(رواه البخاری ) وفی روایه (....**مع کل وضوء** )واتە : ئەگەر نەبوایە بە نارەحەتی ئەوا سیواك کردنم واجب دەکرد لەسەر ئومەتەکەم لەگەڵ هەموو نوێژێکدا ،لەگێڕانەوەیەکی تردا ،لەکاتی دەستنوێژدا ، لەگێڕانەوەی (ئیمام ئەحمەد )دا هاتووە کە پێغەمبەر فەرمویەتی سیواك پاك و خاوێنی ناودەمە وخواش پێی ڕازیە، سیواك بەکارهێنان ،سوننەتێکی خۆشەویستی پێغەمبەرە (ﷺ) تەنانەی لەدواساتەکانی گیانی دا سیواکی خستە ناو دەمی، بائێمەش ئەم سوننەتە زیندوویکەینەوە جگە لەسودی دوا ڕۆژ سودی تەندروستیشی گەلیّ زۆرە،دەی با ئێمەی ڕۆژوگریش بە بەکارهێنانی سیواك خێری ڕۆژوەکە زیاد بکەین و شوێن کەوتەی پێشەواکەمان بین ، بەتایبەت لەم شەش کاتەدا:(

لەکاتی نوێژدا ،لەکاتی دەست نوێژگرتندا ،لەکاتی چونەماڵەوە،کاتی هەڵسان لەخەو،کاتی قورئان خوێندن،وە کاتێ تامی ناودەم ناخۆش دەبێ ) .

٦) **ناندان بە ڕۆژوەوان** : سەخاوەت و بەخشین لەڕەوشتی بڕوادارانی ڕاستەقینەیە، پێدانی خواردن بە ڕۆژوگران لەکاتی بەربانگدا خێروپاداشتی گەلێ زۆرە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:( کەسێ نانی ڕۆژوگرێ بدات و بەربانگی بۆ بکاتەوە،ئەوە پاداشتی وەك ڕۆژوگرەکە دەست دەکەوێ ،بێ ئەوەی لە خێری ڕۆژوگرەکە کەم ببێتەوە)( **ترمذی**) گێڕاویەتیەوە،بەڕاستی ڕەمەزان مانگی خێروپاداشتە،مانگی تەقواوعیبادەتە،مانگی سەخاوەت وبەخشینە،مانگی خوێندن و لێك دانەوەی قورئانە،کە هەموویان لەئادابی ڕۆژوگرانە .

٧ــ **نوێژی تەراویح**: ڕۆژووعیبادەتی ڕۆژانی ڕەمەزانەو تەراویحیش عیبادەتی شەوانیەتی نوێژی تەراویح سوننەتە،بۆ پیاوان و ئافرەتان کە لە دوای نوێژی خەوتنان لە ڕەمەزاندا دەکرێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: { **من قام رمضان ایمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه** }(متفق علیه) واتە: کەسێ شە و نوێژی ڕەمەزان بکات بە بیروباوەڕ بە ئومێدی پاداشت ، ئەوە خوای بەخشندە لە تاوانەکانی ڕابوردوی دەبورێ . سەبارەت بەرکاعەتەکانی ئەو نوێژە چەند ژمارەیەك هاتوە لەوانە (١١، ٢١، ٢٣، ) کە هەموویان ڕاستن ، بەلاّم لە هەمویان بە هێزتر وگونجاوتربۆخەڵکی ئێستا،یانزە رکاتەکەیە ، وەك عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت )دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)لە ڕمەزاندا جگە لە یانزە رکعەت زیاتری نەدەکرد ) ( متفق علیه)،ئەویش هەشتیان تەراویح و سیانیان و ویتر بوون کە دەکاتە یانزە . نوێژی تەراویح بەتاك و کۆ دەکرێ ، دیارە بە جەماعەت خێری زیاترە ، ئەوەش لە سەردەمی ئیمامی عمر (خوای لێ ڕازی بێت ) کە بینی خەڵکی بەتاك و کۆ ئەنجامی دەدەن و ، ترسی فەرز بوونیشی نەمابوو ، کۆی کردنەوە لەسەر یەك جەماعەت ، ئوبەی کوڕی کەعب پێش نوێژی بۆ کردن ، ئینجا بۆ شەوی داهاتوو کەبینی وا هەموویان

لە نوێژی تەراویح دان بەجەماعەت ، یەك قورئان خوێن ، زۆری پێ خۆش بوو فەرمووی (نعمت البدعه ) واتە: بەڕاستی چاکترین داهێنراوە ! (بخاری ) هێناویەتی . سەبارەت بە قورئان خوێندن لە نوێژی تە ڕویحدا ،ئەندازەی دیاریکراومان نی یە ، بەلاَم سەلەفی سالح زۆریان خوێندوە ، تاخەتمی تەواویان کردوە لەومانگەدا، امام ئەحمەد(خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ ( لەڕەمەزاندا ئەوەندە نەخوێنرێ کە نوێژ خوێنان بێ تاقەت بن ، بەتایبەت گەر شەوانی کورت بون)،هەڵبژاردنی مام ناوەندی و، ڕەچاوکردنی حاڵ و توانای خەڵکی باشترە. ئەوە بزانن کە نوێژەکە دوو ڕکعات دووڕکعەتە ، دەبێ ئاسانکاری و پشوی تێدابێت ، وەلەم نوێژانەدا گورج و گۆڵی و ڕوح سوکی تیا دەبینرێ ، دەرون پاك دەکاتەوە لە کینە و حەسودی ، جگە لەم هەموو خێرە وەرزشێکی ڕوحی و جەستەییە.

## دیاردەی هەڵەنابەجێ ..کەبۆرۆژوناگونجێ

بەداخەوە هەندێ لە ڕۆژووگرانی ڕەمەزان،لەبەرئەوەی لەواتاوناوەڕۆکی ڕۆژوو نەگەیشتوون کۆمەڵێ دیاردەی هەڵە ونابەجێ یان لێ دەبینرێ،کەلەگەڵ ڕۆژودا ناگونجێ ،لێرەدا ئاماژە دەکەین بۆ هەندێ لەو هەڵانە،بۆ ئەوەی ئاگاداربن ولێیان دووربکەونەوە :

١ـ کۆمەڵێ لە موسڵمانان تەنها لەم مانگەدا پابەندی ئیسلامن ، بەداخەوە کە دوای ڕەمەزان دەچنەوە ژێر باری نەفس و شەیتان، وادەزانن دینداریکردن بەتەنها لەم مانگەدایە بەڵێ ڕاستە موسڵمان لەڕەمەزاندا پێویستە زیاترخۆی ماندوبکات وتوێشوکۆبکاتەوە بەلاّم نابێ لە مانگەکانی تراسست بێت لە بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خودا ، وەکو دەبینی لەم مانگەدا مزگەوتەکان جمەیان دێ ، ئافرەتە ڕوتەکان خۆیان دەپێچنەوە، کە ئەمانە شتی چاکن ، بەلاّم بەداخەوە دوای ڕەمەزان دەچنەوە سەر خراپەکا ری جاران ، وەکو بڵێ ی دینداری بەلایانەوە چاو لێکەری و عادەتە ، نەك عیبادەت ،(خۆفێڵ لە خوا ناکرێ )!(پەنا بەخوا )لەدوای ڕەمەزان خۆڕوت دەکەنەوە،بۆنوێژی عیشا و بەیانیان مزگەوتەکان سارد وچۆڵ دەبن چون ئەمە نەفامیە وخۆگێل کردنە لە ڕاستیەکان ،پێویستە دینی خوا بەو شێوەیە پیادە بکرێ وەك خوادەیەوێ ،نەك وەك خۆت دەتەوێ ئەبێ خۆمان لەگەڵ یاساکانی شەرع ڕابێنین ، نەك شەرعی خوا لەگەڵ خۆمان بگونجێنین و بەکەیفی خۆمان بێت ،لەفەرمودەیەکی(صحیح)داعبداللە بن عمروبن عاص گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:(لایؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به) واتە: باوەڕی تەوا و نی یە یان ئیمانتان تەوا ونابێ تا ئارەزوەکانتان شوێن کەوتەی ئەوە نەبێت کەمن هێناومە .

٢ـــ هەندێکی تر دەبینی کە خۆیان گرتۆتەوە لە خواردن و خواردنەوەبەلاّم خۆیان نەگرتۆتەوە لەشتەحەڕامەکانی وەك(درۆوبوختان ،شایەتی بەناحەق،دوزمانی وغەیبەت کردن ،غەش و خیانەت،...هتد) کەئەمانە لەڕەوشتی خەڵکی دنیاییە ،نەك هی نوێژکەر و ڕۆژوگر سەیرە ئەوانە لە حەلاڵ بە ڕۆژون و لەحەرام دەم کراوەن وادەزانن خراپە کردن و

نوێژ پێکەوە بەستراون،کە ئەمە تەوا و پێچەوانەیە،هەرچەندە ڕۆژوەکە ، بەدرۆکردن و غەیبەت کردن،بەزاهیری ناشکێ بەلاّم هیچ خێر وپاداشتی نامێنێ و تەنها ماندووبونی بۆ دەمێنێتەوە،(جارێکیان دوو ئافرەتیان هێنایە لای پێغەمبەر(ﷺ)کەبەزمانی ڕۆژوگرتنەوە زۆر غەیبەتیان کردبووپێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : بڕشێنەوە،کاتێ کە ڕشانەوە کێم و زوخاویان هێنایە دەرەوە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : ئەوانە بە حەرام ڕۆژوەکەیان شکاندوە، لەڕاستی حەلاڵ بە ڕۆژون و لەحەرام دەمیان کراوەیە،(امام احمد ) گێڕاویەتیەوە . لەبەر ئەوە ڕۆژوگر دەبێ ئاگاداری کردار و گوفتاری بێت ، بەهەموو ئەندامەکانیەوە بە ڕۆژوبێ

٣ـ هەندێکی تر هەن کە لە ڕوانگەی سودە دنیایەکانەوە دەڕواننە ڕۆژوو :

بۆنمونەدەڵێن ڕۆژوو زۆر بە کەڵکە بۆ تەندروستی لاشەمان ، وە بۆ کەم کردنەوەی قەڵەوی .... هتد ، کە ئەمانە ڕاستن و سودی ڕۆژوو گەلێ زۆرە،هەرکەس بەفەرمانی خوا بکات دەگاتە سودی دنیا و قیامەت ، نەوەك ئەمانە کە تەنها سودە دنیاییەکانی دەبینن بۆ سەلامەتی جەستەیان،ئەم بۆچونە هەڵەیە، چونکە لەبەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوادا ، نابێ بیر لەسەلامەتی لاشەمان بکەینەوە ، چون جاری وایە موسڵمان بەفەرمانی خوا ، لەجەنگ و جیهادا جەستەیشی تێدا دەچێ و کەمایەی شانازی و سەربەرزی یە و وە تاعەت و بەندایەتیشە بۆ خوا، گرنگ ئەوەیە تۆ فەرمانی خوا بەجێ دێنی بە نیەتێکی پاك ،ئینجا بەهەمان شێوە لە ڕۆژووگرتندا،گرنگ ئەوەیە گەر ئێمە ڕاست بکەین ! ئەبێ سەر و ماڵمان لە ڕەزامەندی خوادا بەکاربێنین .

٤ ـ خراپ بوونی هەڵس وکەوت .

هەندێ ڕۆژوەوان هەن تەنها لەبەرژەمێ خواردن،تەبیعەتیان ئاڵۆز دەبێت ، تورە و گرژو مۆن دیارن،بەتایبەت لە کڕین و فرۆشتندا ، قسەی نابەجێ دەکەن وەکو دەڵێن: (لەگەڵ سێبەری خۆی شەڕ دەکا) وادەزانن هەر ئەوان بەڕۆژون یان بۆخەڵکی گرتویانە،ئەمەتەنها لەبەرئەوەی نیوەڕۆنانی لێ قەدەغەکراوە ،کە بینراوە خەڵکانێك بۆ شتێکی کەمی دنیایی چەند ڕۆژ لەبەردەرگای بێ باوەڕان مانیان لە خواردن گرتوە،جابە ڕاستی تێکچوونی خوڕەوشت لەگەڵ ڕۆژوو دا ناگاتەوە و لێك دورن ،چونکە ڕۆژوو قوتابخانەی ڕەوشتە ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:{ **الصيام جنة فاذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث ولا يصخب ،فاءن سابه أحد أوقاتله فليقل انى صائم**}واتە: ڕۆژوو قەڵغانە ولەئاگر و خراپە دەتپارێزێ ، کەبەڕۆژوو بووی نابێ جوێن دەرو زمان شڕ و تورە بی ، تەنانەت ئەگەر شەڕیان پێ فرۆشتی خۆت لادە و بڵێ من بەڕۆژووم ، وەلآمیان مەدەرەوە . لەبەرئەوە پێویستە ڕۆژوەوان ڕەوشتی جوان بێ کردا رو گوفتاری شیرین بێ ، ڕوو خۆش بێ ، چون خوای گەورە ئینسانی ڕوخۆشی خۆش دەوێت بیسەلمێنە کە ڕۆژوو یەعنی ئەو پەڕی خێر و چاکە ، مانای مرۆڤ دۆستی و خۆشەویستی یە ، تاکو بەهۆیەوە لە دەرگای (ڕەییان) بچینە ژوری بەهەشتەوە.

**٥ ـ هەندێکی تر ڕەمەزان دەکەن بەمانگی پاڵدانەوە وخەوتن،بەبیانوی ئەوەی کە نوستنی ڕۆژوگرعیبادەتە،ئەمەش وانیە ولاوازە ،یان دەڵێ هەردەخەوم تا غەیبەت نەکەم ،بەلآم پێویستە ئێمەی موسڵمان ، ئەو هەلە زێڕینە بقۆزینەوە بە خۆماندووکردن لە چاکەکاری دا نەوەك تەمبەڵی وخەوتن ،لە مێژوی ڕابردووی ئیسلام دا زۆرڕوداوی گەورە لەم مانگەدا بون وەك( فەتحی مەککە و شەڕی بەدر)کە ماندوو بوونیان زۆر ویستوە،ئەگەر هەر بخەوێ ، چۆن خێری شەوانی قەدرت بەنسیب دەبێ ،پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( لەم مانگە فریشتەیەك بانگ دەکات ـ ياباغى الخير أبْشر ـ مژدەتان لێ بێ ئەی خێر خوازان و چاکە**

کاران - ویاباغي الشر أقصر حتى ينقض رمضان - شەڕخوازان دەست بەردارین تا کۆتایی ڕەمەزان )ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە،دەی ئەگەرخۆت ماندونەکەی بە چاکە کاریەوە لەم مانگە دا بەر ئەم مژدە خۆشە ناکەوی ، جگە لەمانە باشترین خێر و صەدەقە ئەوەیە کە لەم مانگە دا بکرێ ، نوێژێ بە حەفتا نوێژە ، وەلآمی دوعا و پاڕانەوەی تێدا دەدرێتەوە ، جا ئەم هەموو خێرو پاداشتە لە کوێ بەنوستن و تەمبەڵی دەست دەکەوێ ؟.

** پێشەویەك :

دەگێڕنەوە کە جارێك (حەجاج) بانگی کابرایەکی دەشتەکی کرد وتی وەرە دەعوەتی من بەونانمان لەگەڵ بخۆ ،کابرا وتی لەتۆ گەورەتر دەعوەتی کردوم کە بەڕۆژوم و وەلآمی داوەتی خوام داوەتەوە ،حەجاج وتی :کاێکی باشت کردووە بەلآم ئەمڕۆ زۆر گەرمە ،وەرە نانەکە بخۆو دوایی بیگرەوە ،کابرای دەشتەکی لەوەلآم دا وتی :بەلآم ئاگری دۆزەخ زۆر گەرم ترە لەم گەرمایە !!!، حەجاج وتی بەڕاستی تۆ هیدایەت دراوی ڕاست دەکەی برۆ خوات لەگەڵ

# کات و ساتی موسڵمان لە ڕەمەزاندا

کات و ساتی بڕوادار هەمووی بەنرخ و گرنگن ، چونکە پێکهاتەی ژیانەکەی بریتیە لەو کات و زەمانەی کە تیایدا دەژی و دەستمایەی ژیانیەتی ، جاپێویستە زۆر ئاگاداری بێت و بزانێ چۆن؟ وەلەچیداسەرفی دەکات،بەتایبەت لەکاتی ڕەمەزاندا! یەکێ لە سوننەتەکانی خوا لە بونەوەردا ئەوەیە هەرشتێ لە دروست کراوەکانی زۆر بە ڕێز و پیرۆز بووسوێندی پێ دەخوا کە ئەوەش ئاماژەیە بۆ گرنگی و پیرۆزی سوێند پێ خوراوەکە ، بۆیە یەکێ لەو شتە سوێن پێ خوراوانە ،چەرخ و زەمانەیە، وە سورەتەکەشی هەربەو ناوەیە، وەك فەرموویەتی: ﴿والعصر،ان الانسان لفي خسرالاالذين امنواوعملواالصالحات،وتواصوابالحق وتواصوا بالصبر﴾واتە:سوێند بە کات و زەمان یان سوێند بەکاتی عەسر، سەرجەم مرۆڤەکان لە خەسارەتدان،جگە لەو بڕوادارانەی کە کردەوەی چاکە ئەکەن وئامۆژگاری یەکتر ئەکەن لەسەرحەق و ڕاستی و ئارام گرتن،مەبەست ئەوەیە کە تەنها ئەو موسڵمانانە قازانج دەکەن کە تەمەنی ژیانیان لە کاری چاکەدا بەسەر دەبەن ، بۆیە پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) فەرموویەتی : خەڵکی ئەم سورەتەیان بەسە ! گەر بە ڕاستی سەرنجی بدەن و کاری پێ بکەن ، بەشیان دەکات بۆ بەرنامەی ژیانیان . کات وەك تیغ وایە گەر نەیبڕی دەتبڕێ ، لەبەر ئەوە پێویستە موسڵمان بزانێ چۆن کاتەکانی تەمەنی ژیانی بۆ کاری چاکە دابەش دەکات،ئەگەرسەرنج بدەینە کاتەکانی ژیانمان دەبینین لە سێ بەش بەدەرنیە ، بەشێکیان ڕابردوە و لە دەست چووە ! واتە دوێنێ ئەوی تریان هی داهاتووە ، واتە سبەینێ کەموڵکی تۆ نی یە و نازانێ پێ ی دەگەی یان نا ، جا ئەوەی بە ڕاستی لە دەستی تۆدایە ئەمڕۆیە واتە ئەوسات و کاتەی،ئەو زەمانەی کەواین تیایدا ، واتە ئیستایە ، بەتایبەت کە ئیستاش لە ڕمەزانەکەیداین و چاکترین و پیرۆزترین سات وکاتی تەمەنمانی تیادا بەسەرئەبەین ، بزانە چۆن لە خێر و چاکەدا سەرفی دەکەی ، چونکە ئەو هەر ڕادەبری بە سەرتا جابە چاك بێ یا بەخراپ و لەدەستت دەرئەچێ ، وەلەو نیعمەتەش بەرپرسیاری

لەدوارِۆژدا، هەروەکو(ابن عباس ) لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی :
( نعمتانِ مغبون فیهما کثیرمن الناس ،الصحة والفراغ)(رواه البخاری)،واتە:خەڵکێکی زۆر هەن لەم دوو نیعمەتە بێ ئاگان و ڕێزیان ناگرن ، نیعمەتی لەش ساغی وکاتی بێ کاری، پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی : **(لاتزول قدما عبدٍ یوم القیامة حتی یسأل عن أربع :عن عمرهِ فیم أفناه ،وعن علمه فیم فعل به،وعن ماله أین اکتسبه وفیم أنفقه ،وعن جسمه فیم أبلاه)**(رواه الترمذی )،واتە: لە ڕۆژی دوایدا هەنگاو هەڵناهێنیەوە بەهیچ لایەکدا تا لە چوارشت پرسیارت لێ نەکرێ :
١ـ لەتەمەنت ، هەموو کات و ژیانی عومرت لە چیدا بەسەربرد ؟
٢ـ لە زانست و زانیاری ، چەندە کارت پێ کرد؟ بۆ دنیا و ورگ پڕکردن بەکارت هێنا یان لەبەر خوا خزمەتت پێ کرد .
٣ـ لە ماڵ و دارایی و سەروەتت ، چۆنت پەیدا کردوە ؟ وە لەچی دا سەرفت کردووە؟
٤ ـ وە لە جیسم ولاشەت ، لەچی داماندوت کردووە ؟ ئەندامەکانی جەستەت چۆن بەکارهێناوە ؟

**ئەوەتا یەکەم شت پرسیار لەکات و ساتی تەمەن و عومرەکەتە لەچی سەرفت کردوە ؟ دەبا لە ئێستاوە خۆمان بۆ وەڵامەکەی ئامادەبکەین ، با خەمی قیامەتمان بخۆین ، با ژیانی ئەم دنیا لەدوارِۆژ بێ ئاگامان نەکات ، قیامەتیش دەیەوێ !! دەی بەرێزان تا لەدەستمان نەچووە باکاتی ژیانمان ، لەش ساغیمان ، گەنجیمان ، دەوڵەمەندیمان ، بەفرسەت وەربگرین ، ئەو هەلانە بقۆزینەوە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) چونکە دەرچوی قوتابخانەی محمد بوون (ﷺ) ، هەردەم لەخەمی ئەوەدا بوون چۆن ساتەکانی تەمەنیان لە خزمەتی گەل و وولاتیان ، سەرف بکەن ، بۆ ئەوەی ڕزگاربوونی خەڵکی و ڕازی بونی خوا مسۆگەر بکەن ، ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە جارێکیان لەناو هاوەڵاندا فەرمووی**

١ ـ کێ ئەمڕۆ بەڕۆژووبوە ،هی سوننەت ، ٢ ـ وەکێ لە ئێوە ئەمڕۆ خێرێکی کردووە ،
٣ ـ کێ ئەمڕۆصولحێکی کردووە ، ٤ ـ کێ لەگەڵ جەنازەدا ڕۆیشتوە بۆ سەر قەبران ،
٥ ـ وەکێ لە ئێوە سەردانی نەخۆشێکی کردووە ؟ دیارە هەر جارە کۆمەڵێك وەلآمیان داوەتەوە ، بەلآم ابوبکر (خوای لێ ڕازی بێت ) کەلەو ڕۆژە پێنج کارەکەی کردبوو گشت جارێ دەیگوت بەڵێ من ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :گەر کەسێ لەشەو ڕۆژێکدا یەکێ لەم پێنج خێرەی ئەنجام بدات ، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا ، یەکێ لە دەرگاکانی بەهەشت بانگی دەکاو پێ ی دەڵێ فەرموو لێرەوە بچۆرە ژورەوە ، ابو بکر وتی ئەی ئەگەر یەکێ هەر پێنج کارەکە ئەنجام بدات ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : لە ئومەتی مندا پیاوی وای تێدا هەڵدەکەوێ کە لە ڕۆژی دوایدا سەرجەم دەرگاکانی بەهەشت بانگی دەکەن ، تۆ یەکێکی لەوان ئەی ا بو بکر . جا دەبێ موسڵمان هەموو کات ژیر و بیرتیژ و وریا بێ ، ئاگاداری کات و ساتەکانی تەمەنی بێ ، چاکەکار و تەقوا داربێ ، گرنگ ئەوەیە چۆن دەژی گرنگ ئەوە نی یە چەند دەژی . بۆ ئەوەی خێر و پاداشتی زۆرمان دەست بکەوێ لە ژیانماندا ، خوای گەورە هەندێ کاتی بۆ دیاری کردوین تاوەکو زیاتر خۆیانی تێدا ماندوو بکەن لەکاری چاکەدا و ئەو هەلانە بقۆزنەوە وەك (مانگی ڕەمەزان کە کە گەورەی مانگەکانە وەشەوی پیرۆزی قەدر ، ڕۆژی هەینی و سەعاتی جومعە و ..هتد )گرنگترین کارکەسوننتەکاتەکانی خۆمانی تێدابەسەربەرین ئەمانەن:
١ـ هەستانەوەی شەو بۆعیبادەت ، بەتایبەتی شەوانی قەدر .
٢ـ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە تەدەبورەوە ، کە خێری هەر حەرفێ یەك بەدەیە، ٣ـ زیکرو یادی خوا، لە هەموو کات وساتێکدا ،گەورەترین زیکر( لااله الا الله) یە کە هەموو کەس دەتوانێ گۆی بکات و لە ماناکەی تێ بگات ، زیکر خۆراکی دڵەکانە تەنانەت دەست نوێژیشی ناوێ ، بزانن کە دڵەکان تەنها بە یادی خوا ئارام دەگرن ﴿ ألا بذكر الله تطمئن القلوب ﴾ .

٤ ـ گەڕان بەدوای زانست و زانیاریدا ، کە ئەویش عیبادەتە و ڕێگای بەهەشتە، زانست و زانیاری یەکەم فەرمانی خوایە (اقرأ)،دڵە مردوەکان بەتیشکی زانست زیندوو دەبنەوە،وە ئاگادار دەبین لە دینەکەمان و لە تەکنەلۆژیای
سەردەمیش،بەداخەوەکەئوممەتی(اقرا،لایقرا) ! .

٥ـ سوربون لەسەر(صیلەی رەحم ) وسەردانی کەس وکارو هاوسێ و بەسەر کردنەوەیان وپرسیارکردن لەحاڵیان کە هەمویان بەشێکن لە بەندایەتی خوا،لەفەرمودەی خۆشەویستمانداهاتوەکەسەردانی خزمان وپەیوەندی خزمایەتی رزق وڕۆزی زیاد دەکات وبەرەکەت دەخاتەمەنەوە،بەتایبەت لەم سەردەمەداکەپەیوەندی خزمایەتی زۆرلاوازە! مەگەرخزمەکەدەوڵەمەندبێ یان لەحیزبی خۆی بێ!! ....دەی با لەخەم دەست مایەی تەمەنمان بین نەیەڵین بێ هودە وەك شنەبایی بەیانی ڕابرێ بەسەر مانا،باناگامان لێی بێ

شاعیرووتەنی :

زەمانە دێت وڕادەبری وەکی بادی سەبا وایە..

حەیف بۆ عومرە سەرفی کەین بەبێ هودەلە دنیایە .

# ڕەمــەزان مانگی نزاو پاڕانەوەیە

نزا وپاڕانەوە لە خـوای میهرەبـان بەندایەتیـە،وەك لـە فـەرمودەداهاتوە بەچـەندریوایەتێك : (الدعاءهو العبادة)( أبو داود والترمـذی)،پێویـستەموسڵمان تەنهالەخوابپاڕێتـەوەوداوای لێ بکەین وپشتی پێ ببەستین ،وە خوای گەورە زۆرحەزدەکات کەبەندەکانی داواکـاری لێ بکەن ، بەپێچەوانەی مرۆڤە،کەحەز ناکەن داوای شتیان لێ بکرێ ،بەتایبەت لـەم مانگـە پیرۆزەدا،ئایەتی(١٨٦)سورەتی(بقرە)لـەناوە ڕاسـتی ئایەتـەکانی ڕەمەزاندابـاسی دوعـا و پاڕانەوە دەکات کەجێگەی سەرنجە ودەفەرموێ:﴿ واذا سأ لك عبادي عــني فـا نــي قريـب أجيب دعوة الداعِ اذادعانِ فليسجيبوالي وليؤمنوابي لعلهم يرشدون﴾ واتە:کاتێ بەندەکانم داوام بکەن وە لێم بپاڕێنەوە،ئەوە من نـزیکم وئاگـادارم و وەڵامیـان دەدەمـەوە، ئێـوەش وەڵامی فەرمانەکانم بدەنەوە بڕوام پـێ بێـنن تاکوسـەرفراز و شـارەزابن،ئەم ئایەتـەش لـە وەڵامی پرسیاری کابرای دەشتەکی دابەزی،کەپرسی لەپێغەمبەر(ﷺ) ئایـا خـوا دورە تـا بانگی بکـەین،یان نزیکەتاچپەی لەگـەڵ بکـەین لەکوێیە؟پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمویـەتی : (لكل مسلم دعوة مستجا بة في رمضان )واتە: بۆهەرموسڵمانێك نـزا وپاڕانـەوەی وەڵام دەدرێتەوە لەڕەمەزاندا،لە گێڕانەوەیەکی تردائەگەرپەلەنەکەن.(مسند أمام أحمـد) .دیـارە هەرشتێ کەداوای بکەی لەخوادەبێ کردەوەشی بۆ بکەی و هەوڵی بۆ بدەی بـە پـشتیوانی خوا، نەوەك دوعـا وقسەی ڕووت بێ ، گەر پاڕانەوەکـەش گیرانـە بـوو ئـەوە بزانـە خەڵـەل هەیە وبزانە لە کوێ دایە ، بۆگیرا بونی دوعاکانمان دەبێ ڕەچاوی ئەم پێنج خاڵانە بکەین:

١) چاکترین کات هەڵبژێرن بۆپاڕانەوە، وەکو (بەیانی زوو دوای نوێژە فەرزەکان، لە نێوان بـانگ و قامەتـدا، لـە سـەعاتی جمعـەدا، وەلـەکاتی ڕۆژوو شـکاندن داپێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی:(ان للـصائم عنـد فِطـرة دعـوة مـا تـرد) واتـە: ڕۆژوەوان لـەکاتی ڕۆژوو شکانەکەیدا پاڕانەوەی گیرا دەبێت و بەسەری دا نادرێتەوە .

٢) هەڵبـژاردنی چـاکترین شـوێن بـۆنزاکردن،وەك لەناومزگەوتـەکان لەمەککـەو مەدینـە

٣) حاڵەتی ئەو کەسەی کە دەپاڕێتەوە .واتە ئەو کەسە لەوکاتەدا لە بارێك دابیٚ کە خوا خۆشی بوویٚ ویی ی خۆش بیٚ، وەکو ئەوەی کە (لەسەفەردابیٚ ، یا باوك ودایك بۆ رۆڵـەی بپاڕێتەوە، یامجاهیدی رێگەی خوا بیٚ، یابەرۆژوو بیٚ، یاسـتەم لیٚ کـراو بـیٚ ) ئەمانەپلـەو پایەیان لای خوا بەرێزە ووەلاّمیان دەدرێتـەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (**ثلاثة لا ترد دعوهم:الصائم حتى يفطروالامام العادل والمظلوم)(الترمذي أحمد وابـن ماجـه )** واتـەسـیٚ کـەس نزایـان لیٚ وەردەگـیریٚ و نادرێتـەوە بەسـەریانا، رۆژوەوان تـا بـەربانگ دەکات، پێشەوای دادوەر، ستەم لێکراو.

٤ ) **غافڵ نەبی ویەدڵ و بەگیان بپاڕێتەوە**،دەبیٚ بەڕاستی لەخوابپاڕێنەوە، نەوەك غافڵ وبیٚ ئاگابین ولەکاتی پاڕانەوەدا ڕوو لەقیبلە ودڵ لە بازاڕ بین ، پێشەوامان(ﷺ) فەمروویەتی: (**ادعوا الله وأنتم موقنون بألاجابة،واعلموا أن الله لايستجيب دعاه من قلبٍ غافـل لاه) (الترمذي والحاكم حديث حسن** )واتە: لەخوا بپاڕێنەوە و دڵنیابن لەوەلاّمەکەی، وە بزانن کە دوعای کەسێکی غـافڵ وبیٚ ئاگا لای خوا وەلاّم نادریتـەوە لەبـەر ئـەوە پێویـستە کـە بەدەم دەپاڕێنەوە دەبیٚ کردار و دڵیشی لەگەڵ دابیٚ ، لە (ئەسەری ئیـسرائیلی) دا هـاتوە: جارێکیان موسا پێغەمبەر(ﷺ) بەلای کەسیٚ دا ڕەت بوو کـە بینـی زۆر بـەجوانی و بـە غەریبی لە خوا دەپاڕایەوە، بەلاّم دیاربوولە مێژبوو وەلاّمی نەبوو ، موسا (عليه السلام) وتی: خوایە ئەگەر پێویـستی و داواکـاری ئـەو پیـاوە لای مـن بوایـە بـۆم بـەجیٚ دێنـا !! پاشان خوای گەورە فەرموی: ئەی موسا تۆ لە من بەسۆزتر نی بۆ ئەو، بـەلاّم ئـەو پیـاوە تەنها ڕووی لەمنە و دڵی لەلایەکی ترە! ئینجاموسا کابرای ئاگـادارکردەوە وخـواش لێـی وەرگرت .

**٥ ـ شێوه و سیفەتی دوعاکە :**

نزاوپاڕانـەوە چـەند ئـادابێکی تایبـەتی خـۆی هەیـە،وەك بەدەسـت نوێـژەوە بـێ ، دەسـت بەرزکاتەوە گەردن کەچی پێوە دیاربێ ، دووبارە و چەند بارەکردنـەوەی داخوازیەکـە، بـە دەنگی نزم و لەسەر خـۆبێ، دوعـای خـراپ و قـەتعی سیلەی ڕەحـم نـەبێ ، ئـەو وشـانە هەڵبژێرێ کەکورت و پرمەعنان، وە بە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەپاڕێ .

**٦ ـ نەبونی هۆکاری وەڵام نەدانەوە**، هەندێ شت هەیە کە نـاهێڵێ پاڕانەوەکـەت گیرا بێـت لای خوا، ئەگەر بەدڵ و گیانیش کردبێتت ، وەکوئەوکەسەی حەرام خۆر بێ، ماڵەکەی لـە ڕێگـەی غـەش و فێـڵ وخیانـەت وسـوێندی بـەدرۆوە دەسـتی کەوتبێ،ئـەوە دوعاکـەی وەرناگیرێ، لەفەرمودەی پێغەمبەرداهاتوە کەباسی کەسێك دەکات کەلە خوادەپاڕێتـەوەو خواردن وپۆشاکیشی حەرامە وچۆن وەڵامی دەدرێتەوە و(**ذكر رجل يطيل السفر أشعث و أغبريمدىديه الى السماء يقول يارب يارب مطعمه حرام ومشربه حـرام وملبـسه حـرام وغذي بالحرام فاني يستجاب لـذلك** )رواه مـسلم .پێـشەوا ابـوبکر خـوای لێ ڕازی بێـت بۆیەك پاروی حەرام خۆی ڕشاندەوە کەبەبێ ئاگایی خواردبووی وەفـەرموی لـە فـەرمودەی پێغەمبەردا هاتوە کە بەیەك پاروی حەرام چـل شـەو وەڵامـی دوعـات نادرێتـەوە، وە لـە گێڕانـەوەی بخاری دا فەرمویـەتی:( **كـل جـسد نبـت مـن سـحت فالنـار أولى بـه**) واتـە: هەرجەستە و لاشەیەك لە حەرام پێگەیشتبێ ئەوە ئاگر بۆوی چاکە.بەداخەوە ئێستا نـانی حەڵاڵ کەم بووە بۆیە وەڵامی دوعاکانمان نادرێتـەوە، لەبەسـەر هـاتێکی مێژویـدا هـاتووە جارێکیان خەڵکی پرسیاریان کرد لە ابراهیمی ئەدهەم کە یەکێ بوولە پیـاو چاکانی ئـەم ئوممەتە، وتیان بۆچی دەپاڕێینەوە و وەڵامان نادرێتەوە؟ لەکاتێکـدا خـوای گـەورە وەعـدی داوە وفەرمویەتی:﴿ أدعوني أستجب لكم ﴾ واتـە: لـێم بپاڕێنـەوە وەڵامتـان ئەدەمـەوە، ئـەویش پێـی وتـن لەبەرئـەم هۆیانـە وەڵامتـان نادرێتـەوە:{١ ـ بەڕاسـتی خواناپەرستن، ٢ ـ دەڵـێن پێغەمبـەرمان خـۆش دەوێ بـەڵام سـوننەتەکانی زیندوناکەنـەوە،

٣ـ قورئان دەخوێنن بەلاّم کردەوەی پیّ ناکەن،

٤ ـ لە نیعمەتی خوا دەخۆن وشوکرانەی ناکەن،

٥ ـ دەڵێن بەهەشت خۆشە بەلاّم خۆی بۆ ئامادە ناکەن

٦ ـ دەزانن دۆزەخ جیّ ی خراپەکارانە و کەچی خۆی لیّ ناپارێزن

٧ ـ دەزانن شەیتان دوژمنە بەلاّم دژایەتی ناکەن ،

٨ ـ دەزانن هەموو دەمرن بەلاّم خۆی بۆ ئامادە ناکەن

٩ ـ بەدەستی خۆتان دۆست و دوژمن دەنێژن بەلاّم پەند و عیبرەتی لیّ وەرناگرن

١٠ ـ عەیب و عاری خەڵك باس دەکەن بەلاّم عەیبی خۆتان نابینن

پاشان فەرموی: لەبەر ئەم (١٠) خاڵە دڵتان غافڵ بووە و وەلاّمتان نادرێتەوە، ئەوانیش تەوبەیان کرد و خۆیان چاك کرد و گەڕانەوە لە خراپە، خوای گەورەش ڕووی ڕەحمەتی تیّ کردن و وەلاّمی دانەوە. جاهەر کاتێك دوعاکەت وەلاّم نەدرایەوە بزانە خەلەلێك هەیە یان لە خواردن وخواردنەوەکەت دایە یان لەئیمانەکەت دایە یان لە خۆت دایە،دەی با ئێمەش بەڕاستی و بەچاکی وبەپاکی و ڕووبکەینە خواولیّ ی بپارێینەوە و تاکولێمان ڕازی بێت .

# ڕەمەزان مانگی بەخشینە

صـەدەقە ومـاڵ بەخـشین بەهەمووجۆرەکانیـەوە لـە واجـب و سوننەت،بەشـێکی گرنگەلـە بەندایـەتی کـردن بۆخوا،سـەخاوەت و مـاڵ بەخـشین سـیفەتێکی جـوانی بڕوادارانـی ڕاسـتەقینەیە هۆیەکـە بـۆ نزیکـی لەخوا،پەیوەنـدی وخۆشەویـستی زیـاد دەکـات لـەناو بەندەکاندا، هەروەکو بە ڕۆژووجەستە ولاشەمان پاك دەبێتەوە ،بەهەمان شـێوەبەزەکاتدان ماڵەکەمان پاك دەبێتەوە،جێگەی سەرنجەکە وشەی زەکات (٣٠)جارلە قورئانـدا هـاتوە و (٢٧)جاریان لەگەڵ نوێژدایە!،خوای گەورە فەرمویەتی :﴿ **مثل الذين ينفقون أمـوالهم في سبيل الله كمثل حبة أنبتت سبع سنابل في كل سنبلة مائـة حبـة والله يـضاعف لمـن يشاء والله واسع عليم** ﴾ ( البقره : ٢٦٢) واتە: وێنـەی ئـەو کەسـانەی مـاڵ وسـەروەتیان دەبەخشن لەڕێگای فەرمانبەرداری خوادا،بەخشینەکەیان وەك وێنەی ئەو دەنکە دانەوێڵـە وایە کە دەچێنرێت وبەحەوت لاسك دێتـە دەرەوە دەبێتـە حـەوت گـوڵ ،پاشـان هـەرگوڵێ سەد دەنك دەگرێت،(بەخشینەکە دەبێتە یەك بەحەوسەد)پاشـان خـوای گەورەپاداشـتەکەی چەند بارە زیاددەکات بۆ هەرکەسێ مەبەستی بێ،چـونکە بەڕاسـتی خـوا بەخـشندەیە لـە سامانی هیچ کەس کەم ناکات و زاناو ئاگادارە بەناخی بەندەکانی) ئەم ئایەتانـە دابـەزین بەهۆی زۆری ماڵ بەخشینی (عوسمانی کوڕی عەفان)و (عەبدولرەحمانی کـوڕی عـەوف) بـۆ غەزای(تەبوك)،بزانە بەماڵ بەخشین ماڵەکەت کەم نابێ بەڵکو بەرەکەتی زیـاد دەکـات و، وەکو ئەو دارمێوەی کە بەزاهیری لەبەرچاوتا دەیـبڕی وکـەم دەبـێ ! بـەلاّم لەڕاسـتیداپێی بەهێز دەبێ،ماڵەکەش بەهـەمان شـێوە پـێ ی زیاددەکـات و پـڕی دەکاتـەوە،وەك خـوای گەورەفەرمویەتی:﴿ وما أنفقتم من شيء فهويخلفه وهوخيرالرازقين﴾ (السباو/٢٩)خـوا ڕزق دەبەخشێ و وە تۆش هەرچی بیبەخشی بۆت پڕدەکاتەوە،کەواتە تا بیبەخشی خـواش دەی بەخشێت، وە بەپێچەوانەوە،وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: هەموو بەیانیەك دوو

فریشته دێنەخوارەوەدەپاڕێنەوە لە خوا یەکەمیان دەڵێ:(**اللهم اعط ممسكا تلفا**)خوایە ئەوەی ڕەزیلی دەکا و دەیگرێتەوە نایبەخشێ ماڵەکەی بفەوتێ ،دووەمیان دەڵێ:(**اللهم أعط منفقاخلفا**)خوایە ئەوەی دەیبەخشێ بۆی پڕکەیەوە(متفق علیه) بەماڵ بەخشین دەیسەلمێنێ کە ڕەزامەندی خوا دەخەیتە پێش هەموو شتێ،چونکە نەفس حەز لەتەماع وماڵ وکۆکردنەوە دەکات، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ )لەبەشێکی فەرمودەیەکی دافەرمویەتی: {والصدقة برهان }خێرو ماڵ بەخشین بەڵگەو سەلماندنە،هەرلەبەرنەوەیە خوای گەوەرە لەقورناندا جیهادی ماڵی خستۆتەپێش جیهادی نەفس ولاشە،چون کەسێ نەتوانێ پێشێ ماڵەکەی ببەخشێ لەپێناوی خوا قەت ناتوانێ خوێنەکەی ببەخشێ، دەی تۆش بە خشینەکەت پێش بخە تانەمردوی،ئەوانەی کەبەخشین دوادەخەن ودەڵێ:کەمردم ئەوە و ئەوەم بۆبکەن بەخێرنمونەی نەوانە وەك ئەوەیەکەسێك لەتاریکی شەوداچرای دەستی بۆ دواوە بگرێت وپێشەوەیشی تاریکەونابینێ!،(ئەنەس خ )ئەڵێ کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ لن تناوا البر حتى تنفقوا مماتحبون﴾ واتە: ناگەنەپلەی چاکەکاری تا ئەوەی خۆشتان دەوێ نەیبەخشن ،(ابوطلحة) چووەلای پێغەمبەر ﷺ وتی:نوەك وەلاًمێك بۆ ئەم ئایەتە،خۆشەویسترین سامانی من باخە خورمای (بەیرەحایە) ئەوابەخشیم لەرێی خوا، پێغەمبەریش(ﷺ)لەخۆشیان فەرمووی (بەخ .بەخ ) ئینجابەفەرمانی حەزرەت دا بەشی کردبەسەرخزمە هەژارەکانی دا.دەی با ئێمەش بۆ خزمەتی گەلە موسڵمانەکەمان شوێن کەوتەی پێغەمبەرو یارانی بین،بەئاشکراو نهێنی ببەخشین ،لەئەنەسەوە ئەڵێ:(وترا بە پێغەمبەر(ﷺ)کام خێروصەدەقە زۆرچاکە ؟ فەرمووی :خێرێك لە ڕەمەزاندا بکرێت) (ترمذی) لە(ابن عباس(خ)( **كان رسول الله ﷺ اجود الناس بالخير وكان اجود ما يكون في رمضان** )(بخاری) دەی بائێمەش لەخەتی پێغەمبەرمان برۆین کەلە ڕەمەزاندا سەخی تربووە لەبەخشین وچاکەدا،باکۆکردنەوەی سەروەت وسامان هۆکارو وەسیلە بێ ، نەك ئامانج و مەبەست، باماڵ و دارایی لە باخەڵماندا دابێ،نەوەك لەدڵ و هەناوماندابا

سەخی ودڵ فراوان بین بەتایبەت لەم مانگەدابەزەکاتدان وسەرفیترەوخێروچاکە تا بگەینە ڕەزامەندی خوا ...با خۆمان دور خەینەوە لەئاگرگەربەبەخشینی لەتەخورمایەکیش بێت (اتقوا النارولوبشق تمرةٍ )

## دوا ڕۆژی ئەوانەی کە نابەخشن :

دوای ئەوەی کەزانیمان خێر وپاداشتی ماڵ بەخشین لەلای خوا چەندە زۆرە،وە بە پێچەوانەوە ڕەزیلی وبەخیلی ئەنجامێکی خراپی لەدوایە لەدونیا ودواڕۆژ دا، وەلەچەند جێگەی قورئاندا خوای گەورە، هەڕەشەی توندی لەو کەسانە کردوەکەماڵ نابەخشن، وەکو لە سورەتی(همزە) دا هەڕەشەی سزایەکی سەختی کردووە لەو کەسانەی کە هەرماڵ کۆئەکەنەوە، حەقی هەژارانی لێ نادەن، بەوەی کەدەیانخاتە ناو ئاگرێکی تێکشکێنەرەوە (پەنا بەخوا) وەهەروەها لە سورەتی (التوبە)دا ئاشکرا ترباسی سزای ئەوکەسانەدەکات و دەفەرموێ:﴿والذین یکتزون الذهب والفضة ولا ینفقونها في سبیل الله فبشرهم بعذاب ألیم،یوم یحمي علیها فی نارجهنم فتکوی بهاجباههم وجنوبهم وظهورهم هذ ا ما کنزتم لانفسکم فذوقوا ماکنتم تکنزون ﴾ واتەئەوانەی سامانی زێڕ وزیوکۆدەکەنەوە،لەڕێگەی دینی خوانایبەخشن مزگێنیان بدەنێ بەسزایەکی سەختی ئاگر، لەناو دۆزەخ دابەوماڵە هەموو گیانیان پێ داخ دەکرێ، بەتایبەت ناوچەوان و لای تەنیشتی و پشتی پێ ئوتو دەکرێ، وەلەگەڵ ئەوەدا پێیان دەوترێ: بیچێژن ئەم سزا سەختە! ئەوە ئەوماڵەیەکە لەدنیا بۆخۆتان کۆتان دەکردەوە، بەشی کەستان لێ نەدەدا، وجێتان هێشت. (ابن مسعود) (خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ : خوای کاربەجێ کەلەم ئایەتەداناو چاوان وکەلەکە و پشتی بەتایبەت جیاکردۆتەوە لە بەشەکانی تری جەستە، چونکە دەوڵەمەندی ڕەزیل و بەخیل، کاتێ دەبینێ هەژارێ بەرەو ڕووی دێت ، سەرەتا یەکسەر ناوچەوانی گرژ دەبێ ، ئینجا وردە وردە تەنیشتی تێ دەکات، تابە تەواوی پشتی تێ دەکات، بۆیە خوای دادوەر ئەم سێ جێگایەی تایبەت کردووە بە سزاوە، هەموو ماڵەکەی دەکاتەپەڕەی سورکراوە

خاوەنەکەی پێ داخ (ئوتو) دەکات، تاکو پاداشتی خراپی کردوەکەی خۆی وەربگرێتەوە پڕ بەپێستی خۆی (الجزاء من جنس العمل) با ئاگامان لەهەژار و نەداری ولاتەکەمان بێت ، بالەم ڕەمەزانەدا دڵخۆشیان بکەین، بازەکات و سەرفیترەلەماڵەکانمان دەربکەین ، بەهۆی دنیاوە مغرور ومەشغولْ نەبین، خوای زانا و دانا دەتوانێ گشتمان دەوڵەمەند بکات، بەلاّم سوننەتی ئەم ژیانەیە دەبێ بەو شێوە بێ ، هەندێ هەبوو هەندێ نەدار، هەندێ لەش ساغ و هەندێ نەخۆش .ئەوانەش کەماڵی دنیا بێ ئاگای کردوون لەدوارۆژ،بەخیلی دەکەن ونایبەخشن،باپەند لەبەسەرهاتی (قارون)وهاوشێوەکانی وەربگرن ! بزانە لەدادگای خوایی دوو پرسیار لەماڵەکەت دەکرێ دەپرسن:لەکوێت پەیدا کردووە؟ لەچیت سەرف کرد ؟دەی بالە ئێستاوە خۆمان ئامادەبکەین بۆ وەلاّم دانەوەی ئەودووپرسیارە ، بادور بکەوینەوەلە ڕەزیلی و بەخیلی،بارەمەزان بکەینە مانگی سەخاوەت، بابەو سەروەت ماڵەمان خوا لەخۆمان ڕا زی بکەین وبەهەشتی پێ بکرین، مەولەوی دەڵێت:

**نەماڵ نەسەروەت نەفرزەندسویێ نەدارۆ...غەیرەزخەجاڵەت باری عەمەل مەشمارۆ**

## سەرفیترە ( زكاة الفِطر ):

بڕێکی دیاری کراوە لەماڵ ،واجبە لەسەرموسڵمان کەبیدات ،لەکاتی ئاوابونی کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزان واجب دەبێت لەسەر هەمووموسڵمانێکی(مكلف )وە ئەوانەش کەلە ژێرنەفەقەی ئەودان لەژن ومنداڵ ،بەڵگەی واجب بونیشی،ئبن وعومەر(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت :(پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی فیتری فەرز کرد لە ڕەمەزاندا و لەسەر هەموو موسڵمانێك ،کەدەفرێك (ساعێك) لەخورما یان جۆ لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان بەندە، نێر ومێ لەموسڵمان ) (بخاري و مسلم ) .

بەسێ مەرج واجب دەبێت :

١ ـ ئیسلامەتی ،لەسەر کافرنیە ، ٢ ـ ئاوابونی خۆری دوا ڕۆژی ڕەمەزان ( کەسێ مرد لەدوای ئاوابونی خۆری کۆتا ڕۆژی ئەو مانگە واجب دەبێت لەسەری) ٣ ـ دەبێت ئەوندەی هەبێت کەزیاد بێت لەبەشی خواردنی خۆی و خێزانی بۆ شەو ڕۆژی جەژن .

جۆر و بڕەکەی

زەکاتی فیتر: بریتیە لەساعێك (قوتی بەلەد)واتە دەفرێك خواردنی سەرەکی ئەو شارەی کە تێیدا دەژی،جگە لەوفەرمودەی سەردوە ،بەڵگەیەکی تریش، ابوسعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ:(ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی جەژن دەرمان دەکرد،دەفرێك خواردن ، کەخواردنمان جۆومێوژ وکەشك و خورما بوو)(بخاری )،ئەو دەفرەش بریتی یە لە چوارمشتی گەورە بەهەردوو دەست کە کێشەکەی (٤٠٠ / ٢)غرامەلەگەنمی پاك،یان برنجی خواردنی خۆت کەلەم سەردەمەداخۆراکی سەرەکیەلەجیاتی گەنم، دیارە بۆچونی تریش لەوبارە هەن،بەلاّم ئەمەیان بەهێز ترە،کاتی دەرکردنیشی ئاوا بونی کۆتا ڕۆژی ڕەمەزانە بەلاّم لەبەرپێویستی و بەرژەوەندی و هەژاران دروستە پێش بخرێ و لەنیوەی ڕەمەزان بەولاوە بدرێ،چاکترین کات دووڕۆژی پێش جەژن بدرێت،هەرکەس دوای بخات بۆ دوای جەژن تاوانبار دەبێت وقەرزدارەو دەبێ بیگێڕێتەوە،ئەم زەکاتە تایبەتە بە هەژاران و نەداران،وە ڕۆژو پاك دەکاتەوە لە قسەی هەڵە وپڕ وپوچ وە نان دانێکیشە بە هەژاران وەك لە فەرمودەکەداهاتوە:عن ابن عباس(رضی الله عنه )أن رسول الله ( ﷺ) قال : (طهرة للصائم من اللغو والرفث ، وطعمة للمساکین ).

# ڕەمەزان مانگی تەوبەیە

تەوبە کردن لە تاوان وخراپە واتە: گەڕانەوە بۆ باوەشی پڕ میهر ولێخۆشبوونی خوایی ، تۆبەکردن پێویستە بۆ بڕواداران ، زۆر لە ئایەت و فەرمودەکان هانمان ئەدەن کە تەوبە بکەین لەتاوان وخراپە﴿یاأیها الذین امنواتوبوا الی الله توبة نصوحا﴾واتە:ئەی ئیمانداران بەڕاستی تەوبە بکەن و بۆلای خوا بگەڕێنەوە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی : {یاأیها الناس توبوا الی الله واستغفره فانی أتوب فی الیوم مائة مرة} مسلم. واتە: ئەی خەڵکینە تۆبە بکەن و داوای لێخۆش بوون بکەن وە من ڕۆژی حەفتا جار (استغفر الله) ئەکەم ، لە گێڕانەوەیەکی تردا سەدجار،ئەمە لەکاتێك داوای کردوە کە خوای پەروەردگار لە پێغەمبەرخۆش بووە ،بەڵام بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە بەندەیەکی وەفادار و سوپاسگوزارە خوای بەخشندە زۆر حەز دەکات بەتەوبەکردنی بەندەکانی ،لەفەرمودەی پێغەمبەر دا هاتووە(بخاری مسلم) گێڕاویانەتەوە کوردی یەکەشی بەم شێوەیە:(خوا ئەوەندەی پێی خۆشە بەتەوبەکردنی بەندەکانی وەکو کەسێك کە وڵاخەکەی ونکردبێ لە بیاباندا و نان و ئاوەکەشی لەسەر پشتی وڵاخەکەی بێت و،بێ ئومێد بوبێت لەدۆزینەوەی،دوای گەڕانێکی زۆر لە ژێر سێبەری دارێکدا پاڵبکەوێ ، لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی مردنە،ئەبینێ وا وڵاخەکەی بەژورسەریەوە وەستاوە،کە پەلاماری وڵاخەکەی دەدات لەخۆشیدا توشی هەڵە دەبێت ،دەڵێت خوایە من خوای تۆم تۆعەبدی منی !)،وە هەروەها لە فەرمودەیەی تری قودسیدا هاتووەکە:(خوای گەورە فەرمویەتی گەر ئێوە بستێ لەمن نزیك بنەوە، ئەوا من گەزێ لێتان نزیك دەبمەوە،وە ئەگەرئێوە بەڕۆشتن بێن بۆلام ،ئەوا من بە هەروەلە دێمە پێشەوە بۆلاتان، واتە ئەگەر ئێمە ڕومان لەخوابێت خوای گەورە ڕووی ڕەحمەتی لێمانە، وە ئەگەر بە پڕی زەوی تاوانی کردبێ بەو ئەندازەش لێی خۆش دەبم بەمەرجێ شەریکی بۆ بڕیارنەدابم ) مسلم،دیارە تەوبە کردنیش تەنها بە قسەی ڕوت نابێ ، بەڵکو دەبێ ئەم مەرجانەی تێدابێت(١ ـ واز هێنان لەگوناهوتاوان،٢ ـ پەشیمان بونەوەلەکردەوە خراپەکان

٣ ـ دەبێ سووربێ لەسەر عیبادەت و نەگەڕێتەوەسەرتاوان وخراپە،ئەمەئەگەرتاوانەکە لەبەینی بەندە و خودادا بووبەلاّم ئەگەر حەقی خەڵکی تێدابوو واتە:( حق الناس )ئەوە دەبێ مەرجی چوارەمیشی تێدابێ کە گێڕانەوەی حەقەکان بۆخاوەنەکانیان،یان گەردنی خۆی پێیان ئازاد بکات} وە نیشانەکانی تۆبەکار ئەمانەن:( فرمێسکی چاوی ،حەزکردن لە تەنیایی وموحاسەبەکردنی نەفسی لەخەیاڵ کردنی بۆخراپە)دەی بافریای خۆمان کەوین تەوبە کردن دوانەخەین چونکە مردن لەنکا ودێت ونزیکە، وەدواخستنی تەوبەش تەوبەی دەوێ ! بەتایبەت لەم مانگەپیرۆزە کەمانگی لێبوردنی گشتیە،چون تۆبەکردن وگەڕانەوە بۆ لای خوا لەدایك بونێکی تازەیە ، بەزەیی و لێبوردنی خوا لەم مانگە دازیاترەلەهەموو کاتێ ،مانگی گەڕانەوە و قوتاربونە لە ئاگر/لەم مانگەداشەیتانەکان کۆت وزنجیر دەکرێن و وزە وتوانایان کەم دەبێتەوە، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، هەرحەوت دەرگاکانی ئاگر دادەخرێ،خوای بالآدەست مرۆڤەکانی وادروستکردووە کەتوانای ئەنجام دانی چاکە وخراپەیان هەیە،هەمومان تاوان بارین وەك پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی(**کل بني آدم خطاء وخيرالخاطئين التوابون**) چاکترین تاوان بارنەوانەن کەتەوبە ئەکەن، وە لەفەزڵی خوایەتاکاتی دنیاخەرابون و ڕۆژ گەڕانەوە دەرگای تەوبەداناخرێ،وەدڵنیابن گەربەڕاستی تەوبەبکەین خوای بەخشندە لێمان خۆش دەبێت وەکوفەرمویەتی﴿وانـي لغفـا رلمـن تـاب وآمن وعمل صالحا ثم اهتدى﴾ تەوبەی تەواو:تەوبەکردنی هەمونەندامەکانەنەك تەنها بە قسە،لەکتێبی(التوبة)هاتوە للمحاسبی) (تەوبەی چاوەکان وازهێنانە لەنەزەری حەرام تەوبەی گوێیەکان گوێنەگرتنەلەحەرام،تەوبەی دەستەکان دورکەوتنەوەیانەلەحەرام،تەوبەی قاچەکان نەڕۆیشتنەبۆحەرام، تەوبەی دامێن دوریەلەزینا،تەوبەی عەقڵ دورکەوتنەوەیە لەفیکروبیروباوەڕی حەرام،تەوبەی زمان پاراستنیەتی لەقسەی خراپ وتنی (استغفرالله)، سەد تۆبەت شکاند خۆت مەشێرەوە ..قاپی گوشادە باز هەم بێرەوە (مەولەوی)

## ١٧ـ ڕەمەزان مانگی جیهادە

جیها د و تێکۆشان دژی تاغوتان بۆ چەسپاندنی بەرنامەکەی خوا لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلامە،جیهاد بەندایەتیە وبەرهەمیشی بۆخەڵکە،چونکەبەهۆیەوەخۆمان و دینەکەمان دەپارێزرێت، وسەردەکەوێت وکۆمەڵگا ئاسودە دەبێت ، هەرکۆمەڵێك پشت لەجیهاد بکات ئەوە زەلیل و ژێردەستە دەبێت وەك لەم ڕۆژگارەدا دەبینی،عیززەتی ئەم دینە بەجیهادەوەیە، لەبەرئەوەیە لەخێروپاداشت دا وێنەی نیە،عن ابی هریرە،رضی الله عنه: **قیل یارسل الله مایعدل الجهاد فی سبیل الله ؟ قال :لا تستطیعونه،فاعاد مرتین ، او ثلاثة کل ذلك یقول لاتستطیعونه !وقال فی الثالثة:مثل المجاهد فی سبیل الله کمثل الصائم القانت بایات الله لایفترمن صلاة ولاصیام حتی یرجع المجاهدفی سبیل الله!**، ( رواه الخمسة )واتە :پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) چ شتێ هاوتای جیهادو تێکۆشانە لەڕێی خوادا ؟ دوو جار ئەم پرسیارەیان لێ کرد ، فەرمووی ناتوانن ئەنجامی بدەن ! تا لەجاری سێ یەمدا فەرموی : وێنەی موجاهیدی ڕێگەی خوا وەك کەسێ وایە بەردەوام بەڕۆژو بێت و شەویش بەردەوام نوێژ بکات و قورئان بخوێنێ بێ ئەوەی نوێژەکەی ببڕێت و ڕۆژوەکەی بشکێنێ تا ئەو موجاهیدە دەگەڕێتەوە .موجاهید کەسێکە کە ، پارێزەری دین و بیرو باوەڕ و خۆشەویستی گەلی موسڵمانە، ئەو موجاهیدەی کەناحەزانی ئەم دینە زۆر ڕقیان لێیەتی ، زۆر ناو و ناتۆرەی خراپیان بەناڕەوا بەسەر دا بڕیوە ، سەرنج بدەلای خوا چەند بەڕێزە،(لەئەبو هورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەری پێشەوامان فەرمویەتی :( لەبەهەشت دا سەد پلە هەیە ، کە خوای گەورە بۆ موجاهیدانی ڕێگەی خوای ئامادە کردووە ، نێوانی هەردوو پلە بە ئەندازەی ئاسمان و زەویە، ئەگەر پاڕانەوە لە خوا داوای (فیردەوس ) بکەن کە لەژێر عەرشی خوایە ، ئاوەکانی بەهەشت لەوێ دەتەقنەوە) (بخاری) گێڕاویەتیەوە . لێرەدا جێ ی خۆیەتی کەبپرسی ، جا چ پەیوەندیەك هەیە لەنێوان جیهاد و ڕەمەزان و ڕۆژوو دا ؟ سەرنج بدەلەوەلامەکەی جیهاد و ڕۆژوو

لەڕوانگەی دەقێکی قورئانیەوە دەگەنەوە، کە هەردوکیان بەوشەی (کتب) فەرزکراون، دیارە جیهاد زۆر شت دەگرێتەوە ، وەکو جیهاد بە زمان وبەماڵ، بەلاّم لەهەموویان گرنگتر جیهاد بەنەفسە کەلە (قتال) دا خۆی دەبینێتەوە ، کە بەم شێوەیە هاتوە ﴿کتب علیکم الصیام﴾ و ﴿کتب علیکم القتال وهو کره لکم ﴾ واتە: لەسەرتان پێویست کراوە نوسراوە ڕۆژوو وە پێویست کراوە لەسەرتان شەڕ و جەنگ کردن هەرچەندە پێتان ناخۆشە ، ڕاستە جەنگان و کوشتار گران و ناخۆشە ، بەلاّم پێشەکی زۆری بۆ داناوە تا کارەکەت بەلاوە ئاسان ببێت ئامادەبیّ بۆ مەیدانی ڕو بە ڕوبونەوە و خۆڕاگری ، یەکێك لەو پێشەکیانە ڕۆژوە کە فێری خۆڕاگریت دەکات بەرامبەر تینویەتی و برسی یەتی وبیّ تاقەتی ، پێشیّ فێری جیهادی نەفست دەکات پاشان جیهادی بیّ باوەڕان ، بەڕاستی ڕۆژوو قوتابخانەی بەر خۆدان و ئازایەتی و ئارام گرتنە ، ئەمە جگە لە پەرستشەکانی تری وەك ئەلّقەی زنجیر پەیوەستن بەیەکەوە،هەریەکەیان پێشەکی و ڕ یّ خۆشکەری ئەوی ترە ، تاپلە پلە موسلّمان تیّ بگات و پیّ بگات . ئینجا سەبارەت بەپەیوەندی نێوان ڕەمەزان و جیهادیش گەر پەڕەکانی مێژووی زێڕینی ئیسلام هەلّدەینەوە ، بچینە خزمەت ژیانی پێغەمبەر و هاوەلاّنی و سەیری ڕەمەزانەکانی ئەوان بکەین ! دەبینین کە ڕەمەزان ئەو کات مانگی ئازایەتی و بەرەنگار بوونەوە بووە بەپێچەوانەی ئێستای ئێمە ! کەلەسەردەمی بەناو ئازادی دا بە قسەکردنیش باسی حەقی ئیسلام بکەی قەدەغەیە و یان دەبیّ بیّ دەنگ بی و ببی بە (الساکت عن الحق . .) یان دەبیّ بەکەیفی تاغوتان بلّیّ ی !! هەندیّ لەو ڕوداوانەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بەکورتی باس دەکەین کە لەم مانگە پیرۆزەدابون ، لە کاتێکدا ڕەمەزان و دین و بەرنامەی ئێمە و ئەوانیش هەر یەك شت بووە کە قورئان و سوننەتە .

## شەڕی بەدری گەورە :

ئەم شەڕە لە (١٧) ی ڕەمەزاندا بووکە شەڕی یەکلاکەرەوە بوو لەنێوانی غوربەت و عیززەتدا،کاتێ موسڵمانان بۆپڕکردنەوەی پێداویستی خۆیان،بۆسەلماندنی هێزی ئیمان ، چونە پێش کاروانێکی قورەیشیەکان ،بەلاّم ویستی خوا وابووکەدەبێ لە کاروانەکەیان چاکتر ددست بکەوێ ئەویش شەڕێك بوو سەربەرزی حەق و ئیمانی تێدا سەلمێنرا جگە لە غەنیمەتەکەش ،لەشەڕێکی سەخت و خوێناوی و نابەرابەردا،سوپای بڕواداران سەرکەوت بەسەر لەشکری پوچی بێ باوەڕاندا توانیان شکۆمەندی یەکجاری لەمێژوی پڕ سەروەری ئیسلامدا تۆمار بکەن ، بەویستی خودای بالآدەست﴿ لیحق الحق ویبطل الباطل ﴾ئەو ڕۆژەمان لە یاد ناچێ کە ئەوەندە سەخت و ترسناك بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) دەپاڕایەوە لە خوا ، ئەوەندە دەستی بەرز کربۆوە تا عەباکەی سەر شانی بەربۆوە و دەیفەرموونسێ جار لە سەر یەك ( اللهم نصرك الذي وعدتني ...) خوایە ئەو سەر کەوتنەم بدەیتێ کە خۆت وەعدت داوە ، ئیسلام سەربخەی پاشان ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێ ) عەباکەی خستەوە سەرشانی پیرۆزی و پێ ی گوت دڵنیابە خوا وەعدی خۆی دەباتە سەر ، ئەوە بوو خوای میهرەبان سەری خستن ، مسڵمانان عەزیزو زاڵ بوون کە پێشترزەلیل و کەم ویێ تفاق بوون﴿ ولقد نصركم الله ببدر وانتم اذلة ....﴾ ( ال عمران١٢٣ )

## فەتحی مەککە :

ڕزگار کردنی شاری مەککەی پیرۆز لە (٢٢) ی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچی دابوو ،کەلەکارە سەخت وترسناکەکانی ژیانی پێشەوامان بوو ، دەتوانین بڵێین بە ڕزگار کردنی مەککە ماوەی غەریبی ئیسلام بەسەر چوو وسەرکەوت ،ئەم فەتحە گەورەو گرنگە لە ڕەمەزاندا کراوە ،وەهەروەها شەڕی(عين جالوت )کەموسڵمانان بەقیادەی مەمالیك تێدا سەرکەوتن بەسەرتەتارەکاندا،لە ڕەمەزاندا بوو ، هەردوو ڕوداوی سەرەوە بوونە ناسنامەی

ناسینی ئیسلام و موسڵمانان ، وپێمان دەڵێن کە ڕەمەزان مانگی تێکۆشانە، وەجێگەی شانازیە کەیادیان بکەینەوە لە(١٧) و(٢٢)ی ڕەمەزاندا وەلەتەمەنی خۆشماندا بیستومانە وبینومانەکەناحەزانی ئیسلام زۆرلەوشەڕوئاژاوەی کەبە موسڵمانان فرۆشراوە لەم مانگە دا ئەنجامیان داوە، تاکو ناشیرینی بکەن لەبەرچاوی خەڵك،تابڵێن خەتای ڕەمەزانە!! بەلاَم کورد وتەنی (بەری خۆربەبێژنگ ناگیرێ )ودورلەڕوتان،کاروان سەیش دەوەڕن)!! بۆ نمونە کاتی خۆی ڕژێم بەزۆری لەڕەمەزاندا هێرش وشەڕ وڕاگواستن وبۆردومان تێدا ئەنجام دەدا بەهەمان شێوەش عەلمانیە دیموکراتی خوازەکان !! لەشیشان و بۆسنە وکۆسۆڤا وکشمیر کاری خۆیان ئەنجام دەدەن ، دژایەتی پیرۆزیەکانی ئیسلام دەکەن . جا ئەگەر سەرنجی ڕابردومان بدەین و لەگەڵ ئێستادا بەراوردی بکەین دەبینین ڕاستیەکان سەرەوبن کراون لەناو ماندا ، ڕەمەزان لای ئێمە ئێستا بووەتە مانگی تەمبەڵی و بێکاری و بێ تاقەتی ...، با ڕەمەزان بکەینە هەنگاوێك بۆ زیندوکردنەوەی ئەم فەرزە فەرامۆش کراوە ، ئێمەی کورد بەبێ تێکۆشان زەلیل و ژێر دەستەین ، ئەوەتا لەسەردەمی بەناو ئازادی دا گەر داوای حاکمیەتی قورئان بکەین بە تیرۆرست و کۆنە پەرست تۆمەت بار دەکرێیت و بەئاگر و ئاسن وەلاَم دەدرێتەوە ، ئەگەر بەیاسای هەڵبژاردنیش سەربکەوی هەر ڕێگەت پێ نادەن مادام موسڵمانی، وەکو لەجەزائیرو تورکیا وفەلەستین میسر بینرا، لێرەدا دەرکەوت کە :. ڕەمەزان مانگی جیهاد و تێکۆشانە..مانگی خەبات وبەرخۆدانە ، بۆسەلماندنی هێزی ئیمانە..بۆ ڕەتاندنی بیری شەیتانە .

# ڕەمەزان مانگی تەقوایە

تەقوای خوا واتە: پارێزگاری و دورکەوتنەوە لە شتە قەدەغەکراوەکان،تەقوا ئامۆژگاری و فەرمانی خوایەبۆگشت بەندەکانی و ڕاسپاردەی گشت پێغەمبەرانەبۆگەلەکانیان،ئەو تەقوایەی کەپێشەوا علی (خ) تێی گەیشتوە و پێناسەی دەکات بەم شێوەیە ، تەقوا واتە ئەم چوارخاڵەیە،با خۆمان بخەینە ژێر تیشکی ئەو پێناسەیە بزانین کارمان پێ کردوە؟ وەچۆن تێی گەیشتوین ؟ !

١ ـ **الخوف من الجليل** : ئەوەیە کە بەڕاستی لە خوابترسی وخراپە نەکەی .

٢ ـ **العمل بالتنزيل** : ئیش کردن بەبەرنامەی خوا، تەنها ئەو بەرنامەیە یاسا و ڕێسای ژیانت بێ ، واتە هەوڵ بدە بۆحاکمیەتی دینی خوالە هەموو بوارەکانی ژیانتدا. جا بزانە کاربە(هودا)دەکەی یان بە(هەوا) ؟

٣ ـ **القناعةبالقليل** : ڕازی بوون بەوبەشەی کەخوا پێی داوی،سەرچاوەی هەمودەردەکانی ئەم سەردەمە دنیا خۆریە ، هەست و نەستمان بە دنیاوە شێلراوە ،دەرباز نابین مەگەر تەنها دەرمانی قەناعەت بەکاربێنین .

٤ ـ **والاستعداد ليوم الرحيل** :واتەخۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی کۆچ کردن و خەمی سەفەری قیامەتت بێ ، ئەمەیە پێناسەی تەواوی تەقوا . ئایا خۆمان ئامادە کردووە بۆ ڕۆژی کۆچ ؟ بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکانی ناوگۆڕ؟ ئایا وەکوماندو هیلاکی بۆ ئەم دنیا ، خەمی قیامەتت لەبەرە؟ کەواتە مانای تەقوا فراوانە،ئەوەنی یە کە خۆت فەقیر و زەلیل بکەی ، بەڵکو بە بەهۆی تەقوادبیە پیاوی دنیا ودوارۆژ! پێچەوانەی تەقوا (طغوى ) یە، واتە کەسێ تەقوای نەبوو ، توغیانی کردووە ولای داوە،بە هەوا و ئارەزوی خۆی دەکات . دوای ئەوەی کە لەمانای تێ گەیشتین ، پێویستە لەسەرمان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا تەقواداربین و جۆرەکانی تەقوا بزانین بۆ نمونە:(لەعیبادەت و بەندایەتیدا ) ئاگات لە تەقوا بێ بەدڵ و گیان بیکەی دورلە ڕیایی و ناپاکی ! لەبواری سیاسیدا بزانە لەبەرخوا

پشتیوانی له کیّ دەکەیت و ڕقت لەچ کۆمەڵێکە،کەبە (ولاءوبراء) ناسراوە، لەعەقیـدەدا لە بیروباوەڕتدا تەقوا وپارێزی ئەوەیە کە وریابە توشی شیرك نەبی،هەوا و ئـارەزوی خـۆت تێکەڵی نەکەیت ! تەقوای عەسکەری ئەوەیەکەلەکاتی شەڕدا،نەخشەو پیلانیّ دارێژی کـە بەزیانێکی کەم سەر بکەوی ژن و منداڵ و پیرە پیاو نەکوژی و ئاگاداری دیل و گیراوەکـان بی تەقوای ئابوری ئەوەیە لەکاتی کڕین و فرۆشتن دا تەقوات ببێت ، دور بە لەغـەش و فێڵ و خیانەت و درۆ..... وەلەبواری کۆمەلآیەتی دا تەقوا ئەوەیـە کەلەگـەڵ خـەڵکی دا هەڵسوکەوتت چاك و پاك بێت خورەوشتت جوان بێـت ، دوربـی لـە دووڕوی و دوزمـانی و درۆکـردن ، خـەڵکی لەدەسـت وزمانـت سـەلامەت بن،بـەم شـێوەیە موسـڵمانی پابەنـد و مولتەزیم دەبیّ تەقوا لەهەموو ژیانیدا ڕەنگ بداتەوە ، ئەوجا سود و گرنگی تەقوات بۆ دەردەکەویّ کە ئەمانەی لای خوارەوە هەندێکن لە گرنگی تەقوا

**گرنگی تەقوا لە ژیانی موسڵماندا**

أـ خوای گەورەلەگەڵ تەقواکارانەوپشتگریان لێدەکات﴿ان الله مع الذین اتقوا والذین هم محسنون﴾

ب ـ بەهۆی تەقواوە کارەکانمان ئاسان دەبێت و خوای گەورەناڕەحەتیمان لەسـەرلەبات، وە ڕزق و ڕۆزیمان دەدات ودەروی خێرمـان لێدەبێتەوە،وەکو دەفەرمویّ : ﴿ومن یتق الله یجعـل لــه مخرجاویرزقــة مــن حیــث لایحــسب﴾ومــن یتــق الله یجعــل لــه مــن أمــره یــسرا﴾

ج ـ بەهۆی تەقواوە زانـست و زانیـاری زیـاد دەبێـت ، وەك خـوای گـەورە دەفـەرمویّ: ﴿ واتقوا الله ویعلمکم الله ﴾ تەقوا نـوری عـیلم و زانیـاری دەخاتـە نـاو دڵـەوە و شـارەزا و زانست و زانیار دەبین

د ـ تەقواهۆکاری خۆشەویستی و دڵسۆ زیەکرێزی و تەبابیە، وەك دەفەرموێت:﴿ ان الذین امنوا وعملوا الصا لحات سیجعل لهم الرحمان ودا﴾

هـ ـ پێوەری قەدروڕێزلای خواتەقوایە،﴿ ان أكرمكم عند الله أتقاكم ...﴾بەڕێزترینتان لای خوا تەقوادارترینتانە ،نەك دەسەلاٌت و دەولٌەمەندی .

و ـ بەهۆی تەقواداری یەوە حەق وناحەق دەناسین لێت تێکەلٌ نابێت و سەرت لیٚ ناشێویٚ ، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿ ان تتقوا الله يجعل لكم فرقانا﴾ واتە ئەگەر تەقوا بکەن خوا حەق و ناحەقت پیٚ دەناسێنیٚ و ئەوکاتە ( هەموو زەردێك بەزێڕ نازانی ).

ز ـ بەهۆی تەقواوە ، عیبادەت و کارەکانمان لیٚ وەردەگریٚ . کرد و کۆششمان بەبیٚ تەقوا وەرناگیریٚ بازۆریش بیٚ وەك دووکوڕەکەی ئادەم (قابیل وهابیل )کە هەردوکیان قوربانیان کردوو لە قابیل وەرنەگیرا وخوای گەورە دەفەرمویٚ:﴿ انما يتقبل الله من المتقين ﴾ واتە : خوای گەورە تەنها کردەوەی تەقواکارانی ڕاستەقینە وەردەگریٚ .

ح ـ سەرەنجام سەرفرازی و دوارۆژ تەنهابۆ موسلٌمانانی(متقی) یەتەنها ئەوان براوەن ، جگە لەوان موفلیس و دۆڕاون ﴿ والعاقبة للمتقين ﴾،جا بەڕاستی تەقواداری ڕاستەقینە دۆستی خوایە ، سود و گرنگی تەقوا لە ژمارە نایە ، ئەوەندە بەسە کە خوای میهرەبان بە چاکترین توێشو پێناسەی کردوە ، وەك فەرمویەتی : ﴿ وتزودوا فا ن خير زاد التقوى واتقوني يا اولي الالباب ﴾،دەی باپارێزگاری و بەندایەتیمان بەڕاستی لە دلٌەوە بێت ، وەکو پێغەمبەر(ﷺ)لەحەجی مالٌ و ئاوایی دا فەرموی:(التقوى ها هنا )دەستی خستە سەر سنگی موبارەکی و فەرموی تەقوا لێرەوەیە ! جا وەکو ئامازەمان پیٚ دا با هەموو کاتیٚ لە تەقوای خوادا بژین بە تایبەت زیاتر لە مانگی ڕەمەزاندا کە مانگی زیاد کردنی تەقوایە،خۆشەویستان گرنگ ئەوەنی یە چەند سالٌ دەژی کەم یان زۆر ، گرنگ ئەوەیە چۆن دەژی ؟ تەقواداری یان هەواداری ، دەی با ئێمەش موسلٌمانانە لەسەر تەقوا بژین وبمرین تابکەوینەبەرئەم ئایەتە﴿ياأيهاالذين أمنوااتقواالله حق تقاته ولا تموتن الا وأنتم مسلمون

# ڕەمەزان مانگی شەرم و لەخواترسانە

پێویستە لەم مانگەدا زیاتر شەرم لەخوا بکەین و لێ ی بترسین ، یەکێك لەسیفەتی بڕواداران ڕاستەقینەشەرم و لەخواترسانە ، لەترسی خوا وەلەمولکی خوادا وەلەبەرچاوی خوا شەرم دەیگرێ کەتاوان وخراپەبکات،وەك فەرمویەتی﴿فلا تخافوهم وخافون ان کنتم مؤمنین ﴾(آل عمران :١٧٥)واتە: لەوان مەترسن لەمن بترسن گەربەڕاستی بڕوادارن ، ئەگەر لەخودا نەترسی و شەرمی لێ نەکەی هەموو خراپەیەکت پێ دەکرێ ، بۆیە بێ بڕوایان کاری وا خراپ ئەنجام ئەدەن کەهیچ دڕندەیەك نایکا ت، پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی : ئەوەی لەپاشماوەی قسەی پێغەمبەران جێ ماوە{...اذالم تستح فاصنع ما شئت } واتە: ئەگەرشەرم لەخوانەکەی هەموو شتت پێ دەکرێ بەئارەزوی خۆت ، ئەم هەمووفەسادو کوشتن و بڕین و خیانەت وگەندەڵیە بەرهەمی بێ دینیە ، جا پێویستە لەسەرمان بەڕا ستی شەرم لەخوا بکەین چونکە سەرچاوەی هەموو خێر و چاکەیەك لەخوا ترسانە ( رأس الحکمة مخافة الله )بەتایبەت لەم مانگە پیرۆزەداباخۆمان بۆخوا ساغ بکەینەوە و تەزکیەی نەفسی خۆمان بکەین ، بۆئەو مەبەستە دەچینە خزمەت فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) کە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەشەرم چۆنە و کێ بەڕاستی لەخوا دەترسێ کە ئەمە ماناکەیەتی و فەرمویەتی:{استحیوا من الله حق الحیاء .... ، واتە: ئەی خەڵکینە بەڕاستی شەرم لەخوا بکەن و لێ ی بترسن و فەرمانەکانی بەجێ بێنن ، وتیان سوپاس بۆخوا ئێمە زۆر شەرم لە خوا دەکەین،جاپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نەخێر شەرم کردن لەخوا بەو شێوەیە نابێ کە ئێوە دەیکەن ! تەنها بەقسەی ڕووت نابێ بەڵکو هەرکەس دەڵێ بەڕاستی شەرم لە خوادەکەم دەبێ ئەم سێ خاڵەی تێدا بێ ، یەکەم : باکەللەسەری بەهەمونەندامەکانیەوەلەخراپەبپارێزێ (واتەزمان وچاووگوێچکە و دووەم : باورگی لەخواردن و خواردنەوەی حەرام وپیسی وزێدەخۆری بپارێزێ.

سێیەم : زۆربیرلەمردن وقەبروقیامەت بکاتەوە،من فعل ذلك فقداستحیاءمن الله حق

الحياء} (رواه احمد)، ئینجا لـەکۆتایی فەرمودەکـەدا فـەرموی هەرکـەس ئـاوای کـرد و ئەوسیّ خالآنەی تیّدابوون ئەوە بەراستی شـەرمی لـەخواکردووە ، ئـەینا گـەر بەقـسەبیّت هەموو کەس پیاوی چاکە وە هەموو دەلّێن لەخوا دەترسین، بەلاّم هـەزار قسە بـەقوربانی کردەوەیەك بیّت ، گەر سەرنج بدەینـە فەرمودەکـە دەبیـنین خۆشەویـستمان بـۆ پیّناسـەی شەرم و لەخواترسان لەسەرەوە پیّداهاتوە چونکە سەر گـەورەی لاشـەیە ، گـەر سـەرەکەت چاك و پاك بوو ئەوا کردەوەی ئەندامـەکانی لاشـەت چـاك و پـاك دەبـن ، چـون سەرجەم هەلّسوکەوتەکان رِەنگ دانەوەی ئەو بیرو باوەرِەیە کەلە سەرت دایە ، بۆدنیاش هـەر وایـە گەر سەر و براگەورەکان کاربەدەستەکان رِاست و چاك بن خەلّکەکەشیان چاك وپـاك دەبیّ بەلاّم کورد واتەنی :گەر دار خواربوو سێبەریشی خواردەبیّت، ئێستا ئاوەکە لەسەرچـاوەوە لیّلە . بەهەمان شێوەش پاراستنی ورگ لەحەرام لەخواردنی پیس لەزیادە خۆری هۆکـاری قبولّ بونی عیبادەتە،بیرکردنەوەش لەمردن ونارِەحەتیـەکانی دوارِۆژچـاکترین ئامۆژگاریـە، هەرکەس بەرِاستی خەمی قیامەتی بیّت زۆرگویّ نادات بەجوانی دونیایەتەنهابەئەنـدازەی پیّویست لە دونیا دەچیّتە پیّشیّ ،دنیـا وەك سـۆبەی زسـتانیّ وایـە گەرلەبەرامبـەری بـی خۆشـە بـەلاّم کەباوەشـت تیّـوە ریّنـا دەتـسوتیّنیّ،جابا بەخۆمانـدا بـچینەوە ولەگـەلّ فەرمودەکە بەراوردیّکی خۆمان بکەین بزانین تاچ ئەندازەیەك ئێمە شـەرم لـە خوادەکـەین .هەندیّ نمونەی لەخواترسان : پیّشەواعومەر(خ) لەگـەلّ ئـەو هـەموو تـەقواو عـەدالەتـەدا شویّنی دوو خەتی فرمیّسك لەسەر رومەتی دیار بووبەهۆی گریـانی زۆری لەترسـی خـوا ! خۆزگە خاك وخۆلّ بـام دایکـم منـی نەبوایـە (ویلـك عمـر لیتنـی امـی لم تلـدنی...) وە هەروەهافەرمویەتی:ئەگەروترا هەموو خەلّکی دەچن بۆبەهەشت تەنهایەك کەس نـەبیّ بـۆ دۆزەخە ئەترسم ئەوکەسە مـن بم ،وە بەپیّـچەوانەوە ئەگـەر وتراهـەموو خـەلّك ئەچـن بـۆ دۆزەخ تـەنها یـەك کـەس نـەبیّ ئومیّـدم وایـە ئـەو کەسـە مـن بم ...،پیّـشەواعلی خ . فەرمویەتی : ئای لەکەمی توێشوو دوری رِیّگا..ئایَ لەوعومرە کەمە و لەو حیسابە وردە

(ابن سماك) محاسەبەی نەفسی خۆی دەکرد ودەی گوت:(**تقولين قول الزاهدين وتعملين عمل المنافقين ومع ذلك الجنة تطلبين ...**) قسەی پیاو چاکان دەکەیت وکردەوەی دوڕوەکان ئەنجام ئەدەین لەگەڵ ئەوەشدا داوای بەهەشت دەکەی ، ئەوە دورە خەڵکی بەهەشت کردەوەیان بەوشێوەیە نیە .

**هۆیەکانی لەخوا ترسان :**

١ ـ ئەوانەی زۆر لەدین و بەرنامەی خوا شارەزان و ئاگادارن لە دەسەلاتی خوا لە وەسفی ئەوان دافەرمویەتی:﴿انما يخشى الله من عباده العلماء...﴾ .

٢ـ یادکردنەوی تاوانەکانی ڕابردوی.

٣ ـ بیرکردنەوەلەمردن وحیسابی دواڕۆژ

٤ ـ بیر کردنەوەی لە دەسەلاتی خوای گەورەو لاوازی و بێ هێزی خۆی،

**بەرهەمی لە خواترسان :** گریانی زۆر،پێغەمبەر((ﷺ))فەرمویەتی(حەوت کەس لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا حەشردەکرێن لەوانە:.. **رجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه ...**، کەسێکەلەتەنیایا بیری کردەوەو لەترسی خوا چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسك ...}، وەلە فەرمودەیەکی تردا کە ئەمە کوردیەکەیتی پێشەوامان فەرمویەتی:(ئەوەی من دەیزانم ئەگەرنێوە بتان زانیایە ئەوا زۆر دەگریان و کەم پێ دەکەنین ،ئینجا هاوەلان هەموویان کەوتنە گریان)( متفق علیە)،بەرهەمی لەخوا ترسان کردار وگوفتاری جوانە،دەست و دامێنی پاکە، دورکەوتنەوەیە لەحەرام ، ،لەخواترسان سەرچاوەی خێری دنیاو دواڕۆژە ، لەدنیادا بەڕێزو گران و سەنگینە ...لە دواڕۆژجێگەی بەهەشتی بەرینە .

# ڕەمــەزان وئیعتیکـاف

ئیعتکاف واتە: مانەوە لەناو مزگەوتدا بەنیـەتی تایبـەت ،عائیـشەی دایکـی ئیمانـداران (خ) بۆمان دەگێڕێتەوە {کەپێغەمبەر(ﷺ)لە مزگەوتدا دەمایەوە وئیعتیکـافی دەکردلـە (١٠)شەوی کۆتای ڕەمەزاندا} (بخاري ومسلم)گێراویانەتەوە ئیعتیکاف سێ جۆری هەیە :

أ ـ ئیعتیکافی سوننەت کەلە هەموو کاتێکدا دەبێت .

ب ـ ئیعتیکافێ کە سوننەتی مونەکەدەیە ، ئەویش لە(١٠) شەوی کۆتای ڕەمەزاندایە ج ـ ئیعتیکافی واجب کەلەسەرخۆی نەزرکرد بێ .

**ئیعتیکاف پێویستە ئەم دوو مـەرجـەی تێدا بێت :**

١ ـ نیەت هێنان لە سەرەتاوە کەلە مزگەوتدا بمێنێتەوە تا ماوەیەکی دیاری کراو .

٢ ـ ئەوەندە بمێنیەوەکە لەعورفدا پێی بگوترێ ئیعتکاف،وە بەبێ عوزر نەچیتە دەرەوە.

**ئادابی ئیعتکاف کردن :**

أ ـ سوننەتە ئەوکەسە خۆی بەخوا پەرستیەوەخەریك بکات زیکر وفیکر ودیراسەی قورئان و زانستە شەرعی یەکان بکات .

ب ـ باشتر وایە بەڕۆژوو بێ گەرڕەمەزان نەبوو بۆکپ کردنەوەی ئارەزوە دنیایی یەکانی

**حیکمەت ومەبەست لەئیعتکاف** (سرالاعتکاف) :

لەڕاستیدا سەرجەم فەرمانەکانی خوا وپێغەمبەر پڕیەتی لەسود وکـەڵکی دنیـا ودواڕۆژ ، بەلاَم ئێمە پەی بە هەموویان نابەین ،یـەکێ لەمەبەسـتەکانی ئیعتکـاف پـاك کردنـەوەی دەرونی مرۆڤە و دامرکاندنـەوەی سەرکێشی شـەهوەت و ئارەزوەکـانی یـەتی . واتـە بـۆ (تەزکیەی نەفسەتا هـەوا و ئـارەزوی خۆمـان لەگـەڵ شـەرعی خـوادا بگونجێنین،نـەك بـە پێچەوانەوە !! وە یەکێکی تر لە فەلـسەفە وحیکمەتـەکانی ئیعتکـاف بـۆ چـاك و پـاك ڕا گرتنی دڵەکانە ، دڵ کـە بەشـێکی زۆر گرنگـە لـەناو لاشـەی مرۆڤـدا ، ئەگـەر دڵەکـەت سەلامەت بوو چاك وپاك بوو ، ئەوا سەرجەم ئە ندامـەکانی لاشـەت کـردەوە یـان چـاك و

[redacted]: [redacted] الجسدلمـضغة ، اذاصلحت صلح الجسدكله واذافسدت،فسدالجسدكله ألاوهي القلب} (رواه‌البخاری ومسلم)
واته:ئاگاداربن له‌ناولاشه‌داپارچه‌گۆشتێك هه‌یه گه‌ر ئه‌و پارچه‌یه باش بوو ئه‌وا هه‌موو لاشه‌ت باش ده‌بێ ، وه به پێچه‌وانه‌وه گه‌ر ئه‌و پارچه‌یه خراپ بوو ئه‌وا كرده‌وه‌ی هه‌موو لاشه‌ت خراپ ده‌بێ ، ئه‌و پارچه‌یه‌ش دڵه،خاوه‌نی ئه‌و دڵه چاكه درۆ ناكات ، ده‌ست و داوێنی پاكه ورەوشتی جوانه ، نه‌ك وه‌ك ئه‌وكه‌سه‌ی له‌حه‌رام ناگه‌ڕێته‌وه‌و تۆقه له‌گه‌ڵ ئافره‌تی نامه‌حره‌م ده‌كات وده‌ڵێ دڵم پاكه! وه شه‌یتانیش ته‌نهاده‌چێته‌ناو دڵه‌كانه‌وه، جا چاكترین ده‌رمان بۆ شیفای دڵه‌كان نیعتكافه،(ابن مسعود)ده‌ڵێ:هه‌ركاتێ دڵه‌كه‌ت لێ وون بوو شێوا،ئه‌وا له‌م سێ شوێنه‌دا بۆی بگه‌ڕێ :له‌گوێ گرتن وبیستنی قورئان،یان له كۆڕی زیكردا،یان له‌خه‌ڵوه‌تی نیعتكافدا،گه‌رله‌وشوێنانه‌دانه‌بوئه‌وا تۆبێ دڵ ماوی وله‌خوا بپاڕێوه‌دڵێكت بداتێ كه‌خوای پێ بناسی و له‌خوا ترس بێ ،خراپترین مردن مردنی دڵه ، خه‌ڵك بۆ مردنی لاشه‌ده‌گرین و له خۆیان ده‌ده‌ن ، به‌لاّم بۆ مردنی دڵه‌كانیان ناگرین.

**سێ زاره‌وه‌ی جیاوازوپه‌یوه‌ست به‌كتر:**

سه‌رنج بده‌له‌م سێ زاراوه(ڕیازه‌تكێشان،**ڕیاضه**،**ریاضیات**)

١) ڕیازه‌تكێشان:به‌وكاره‌ده‌ڵێن كه‌شێخ وپیاوچاكانی زوو،له‌خه‌ڵوه‌ت وته‌نیایدا ئه‌نجامیانده‌داله‌به‌خۆداچونه‌وه‌وته‌زكیه‌ی نه‌فس،بۆبه‌هێزكردنی ده‌رونیان.

٢) **ریاضه**: وه‌رزش یاری بۆبه‌هێزكردنی جه‌سته‌ولاشه زۆرباشه،كه‌له‌ته‌راویحداده‌بینرێ.

٣) **ریاضیات**: بیركاری،ماتماتیك،كه‌عه‌قڵ وئاوه‌ز به‌هێزده‌كات.

به‌ڕاگرتنی هاوسه‌نگی له‌نێوان ئه‌وسێ ڕیازه‌دا ده‌بیته‌خاوه‌نی كه‌سێتی به‌هێزوبه‌ڕێز، له‌دنیاوقیامه‌ت،تاریاچی به‌هه‌شت.

ئیعتکاف بەتاڵ دەبێتەوە بە :

١ ـ سەرجێ ی کردن لەگەڵ خێزاندا﴿ولا تباشرهن وأنتم عاكفون فی المساجد﴾

٢ ـ چونە دەرەوە لەمزگەوت بەبێ عوزر وبەهانە .

٣ ـ سەرخۆش بون و شێتی ولەدین هەڵگەڕانەوە .

٤ ـ گەر ئافرەتیش کەوتە حەیز و نیفاسەوە .

جابەڕێزان هەلێکی زێڕینە بۆ ئیعتکاف کردن وپاککردنەوەی دڵ و دەرونمان ، تا بەدڵ و دەرونێکی پاك بگەینە خزمەت پێغەمبەر و یارانی بۆ ئەو ڕۆژەی کە ماڵ و منداڵ هیچ سودی نابێ جگە لە دڵێکی پاك وخواناس﴿یوم لا ینفع مال ولا بنون الامن اتی الله بقلب سلیم﴾ .

## ٢١ـ شەوی قەدری پیرۆز

جێگەی سەرنج وتێڕامانەکەخوای گەورەلەهەموودروستکراوەکانیداگرنگترین وگەورەترین نوێنەری بۆدیاری کردوین وەك دەبینی گەورەی کێوەکان عەرەفەیە، گەورەی بەردەکان بەردە ڕەشەکەیە(حجرالاسود)گەورەی کانزاکان ئاڵتونە،گەورەی مرۆڤەکان پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لەسەر)وەپێشەوای پێغەمبەرانیش حەزرەتی محمد((ﷺ))، گەورەی مانگەکانی ساڵ ڕەمەزانە وگەورەی ڕۆژەکانی ساڵ ڕۆژی عەرەفەیەوجومعەش گەورەی ڕۆژەکانی هەفتەیەوشەوی قەردیش گەورەی شەوەکانە، مرۆڤ لەژیانیدا چەندسات وکات وهەلی گەورەو گرنگی بۆهەڵدەکەوێ جانەگەر بەژیرانە ئەوهەلانە بقۆزێتەوەدەبێتە خاوەنی توێشوو وسەروەت وسامانێکی زۆرلە دنیاودواڕۆژدا،ئێستاش واین لە خزمەت یەکێك لەوهەلەزێڕینەداکەلەوانەیەجارێکی تربەخزمەتی نەگەینەوەئەویش شەوانی قەدری پیرۆزە، بائەوهەلەش بقۆزینەوە بەمەبەستی زیاترنزیك بونەوەلەخوای پەروەردگار،لەبەر گەورەیی ئەوشەوەیە ڕەمەزان خاوەنی ئەو ڕێزەیە،خوارێزی لێناوەبەشەوی بەرێزناوی ناوە، خاوەنی سورەتێکی تەواوەبەناوو ناوەرۆکەوەبۆی تەرخانکراوە،کەسورەتی(قەدرە)وفەرمویە ﴿ انا انزلناه فی لیلةِ القدر،ومادراك ما لیلة القدر،...ئێمە لەشەوی قەدراقورئانمان ناردە خوارەوەلە(لوح المحفوظ)ەوە بۆ ئاسمانی دنیا،تۆئەی محمد((ﷺ))نازانی شەوی قەدرچەند گەورەیە،...لیلة القدر خیرمن الف شهر*خێری تاعەت وعیبادەت لەوشەوەدازیاترو چاکترە لەهەزارمانگ !کەدەکاتە(٨٢ )ساڵ وچەند مانگێ ،بۆئەوەی قەرەبوی تەمەنی کورتی ئەم ئومەتە بکاتەوە لەچاوگەلانی ڕابردوو،..تنزل الملائکة والروح فیهاباذن ربهم من کل امر*لەو شەوەدا جوبریل لەگەڵ فریشتەکان بەفەرمانی خوا دێنە سەرزەوی بۆ بە جێگەیاندنی فەرمانەکانی خوا،...سلام هی حتی مطلع الفجر﴾سەلامکردنی فریشتەکانە لە موسڵمانان ،شەوی دابەزینی ئاشتی و ڕەحمەت و بەرەکەتە تا بەری بەیانی،ئەم شەوە گەورەترین شەوە لەگەورەترین مانگدا،پێغەمبەری پێشەوا ((ﷺ)) فەرمویەتی:

{من قام ليلة القدرايماناواحتساباغفرله ماتقدم من ذنبه} (بخاري ومسلم )واته: هەر کەس شەوی قەدر زیندوویکاتەوە بەعیبادەتکردن باوەڕی پێ بێت و چاوەڕوانی پاداشتی بێت ،ئەوە خوا لە تاوانەکانی ڕابردووی دەبورێت، سەبارەت بەناوی قەدر : هەندێ لە زانایان و توێژەرەوان دەڵێن : لەبەر ئەوەی ئەندازە وقەدەری هەموو شتەکانی تێدا دیاری دەکرێت لە (لوح محفوظ ) وە دادەبەزێ ، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە ، هەندێکی تر وتویانە : چونکە قەدر و ڕێزی زۆرە ،پلە و پایەی بەرزە لای خوا بۆیە ناوی قەدرە.

**نیشانەکانی ئەوشەوە :**

١ ـ لەصحیحی مسلم دا هاتوە کەبەیانیەکەی تیشکی خۆرکزوزەعیفە .

٢ ـ (ابن عباس) لەپێغەمبەر((ﷺ)) دەگێڕیتەوە کە: شەوەکەی سافە ، نەساردە و نە گەرمە ، تیشکی ڕۆژەکەشی سورە .

عائیشە(خ )پرسی لە پێغەمبەر ((ﷺ)) کەلەو شەوەدا بوین چی بلێین ؟لەوەلامی دا فەرموی بلێ:(اللهم انك عفوتحب العفوفاعفوا عني)(أحمد وابن ماجة)واتە: بلێ خوایە تۆبەخشندەیی ولێخۆشبونت پێ خۆشە ،خوایە عەفوم بکەی،دەی باقۆڵی بەندایەتی لێ هەڵکەین وئەوکاتەزێڕینە بەفیڕۆ نەدەین ،نەبادا نەیبینینەوە،بەڵکو خوای گەورەخێری ئەو شەوەمان بەنسیب بکات لێمان خۆش بێت .

**سەرنجدان لە موعجیزەی قەدروقورئان:**

١ـ قەدروقورئا ن بەیەکەوەگرێدراون،چونکەقورئان لەشەوی قەدردابەزیوە

(انا انزلناه فی لیلةِ القدر)بۆیە ئەوشەوەئەوەندەبەڕێزە.

٢ـ سورەتی قەدر(٣٠) وشەیە،کەئاماژەیەبۆ(٣٠)جوزئی قورئان و(٣٠)ڕۆژی ڕەمەزان.

٣ـ سورەتی قەدر(١١٤)پیتە،کەیەکسانەبەژمارەی سورەتەکانی قورئان(١١٤) سورەتە.

٤ـ سورەتی قەدر(٥) ئایەتە،کەئاماژەیەبۆ(٥) فەرزەی نوێژ.

**گەڕان بەدوای ئەو شەوەدا:**

موستەحەببەکە لە(١٠)شەوی کۆتایدا بۆی بگەڕێین، لێرەبەدواوە،لەشەوە تاکەکاندا،بەلاّم بۆچونی بەهێزنەوەیە کەلەشەوی (٢٧)دایە چون پێغەمبەر فەرمویەتی:(من كان **متحريها فليتحرها ليلة السابع والعشرين**)(مسلم) هەرکەسێ بۆی دەگەڕێ با لەشەوی (٢٧)دا بیدۆزێتەوە،(ابن عباس)سورە لەسەرئەوەی کەلە(٢٧)دایە ،وەکو لەوەلاّمی پێشەواعمردا وتی: چونکە ئاسمان ، زەوی،حەوتن،منداڵ بەحەوت مانگی دەبێت ،لەحەجدا ژمارەی بەردەکانی ڕەجم و تەواف کردن و هات وچۆی سەفا ومەروا هەموویان حەوت حەوتن، گەرسەرنجی سورەتەکەش بدەی ووشەی(فيها)کە بۆ شەوەکە دەگەڕێتەوە بیست وحەوتەمین وشەیە،وەئەگەرحسابی بیرکاری بۆ بکەین (**ليلة القدر**) نۆحەرفە وسێ جاردووبارە بۆتەوە (٣× ٩) = ٢٧،لەبەر ئەمانە هەموویان لەشەوی (٢٧) دایە ،بۆچونەکان جیاوازن بەلاّم فەلسەفەی دیاری نەکردنی بۆ ئەوەیە تاکو سەرجەم (١٠) شەوەکانی عیبادەت بکەین، سەلەفی صالحیش هەر وایان کردووە، وە زۆرجاریش بەتەواوی لەژمارەی ڕۆژەکانی ڕەمەزاندا دڵنیا نین،بەڕاستی قورئان موعجیزەیەوتەحدای هەموومرۆڤایەتی کردووە کەیەك سورەت بەوێنەی ئەوبێنن، ئەگەرلەلایەن خواوەنەبێت پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لەوبیابانەدالەکوێ ئەو ڕاستیانەی زانی کەلەوکاتەدا ئەنتەرنێتیش نەبووە هەتا لەگۆگڵ سێرجێ بکات وزانیاری بەدەست بهێنێت .

# ڕەمەزان قەڵغانە بەرانبەرئارەزووەکانی نەفس

قال تعالى:﴿أفرأيت من اتخذ الهـه هـواه .....﴾واتـە:ئايانـەتبينی ئەوکەسـەی کـە هـەواو ئارەزووی خۆی کردەخوا بۆخۆی،(ابن عـباس )لەتەفسيری ئەم ئايەتەدا فەرمويەتی : هەوا و ئارەزووش خوايەکە دەپەرسترێ لەجياتی خوای گـەورە! مەبەسـت ئـەو کەسـانەيە کەتـەنها شوێن کەوتەوگوێڕايەڵی ئارەزووەکانيان،هەردەڵێ بەکەيفی خۆم دەکەم !حەلاڵ يان حەرام ! (٣٠) ی ڕۆژوی ڕەمەزان سی دەرزی ئيمانی يە بۆ چارەسەری نەخۆشيەکانی دەرونی ، بـۆ کۆنترۆڵ کردنی سەر کێشيەکانی هەوا و ئارەزوو ، فێرمان دەکـات کـە ئـەبێ نەفـست بـە دەست تۆوە بێ نەك تۆ بەدەست نەفسەوە بی ، خوای دانا و کاربەجێ لە بەرامبەر هەوا و ئارەزودا عـەقڵی پێداوين ، بۆ بەهێزکردنی عـەقڵيش پەيامی دينی بۆ ناردوە تاکو لـەتاقی کردنەوەکەدا سـەرکەوتوبێ ، بەمـەرەدی جـاری يەکـەم نەچـێت کـە لەبەهەشـت دا هـەوا و ئارەزوو زاڵ بوو بەسەرعـەقڵ داو ئادەم و حەوا دەرکران بـۆ سـەر زەوی ،هـەوا و ئـارەزوو ئەگەر عـەقڵی لەگەڵ دا نەبێ بەرەو هەڵدێران ئەچێ ، ئـەوەتا ئـاژەڵ چـونکە تـەنها حـەزو ئارەزووی زاڵە تۆ ئەی بەی بۆسەر برين ئەو پەلاماری خواردن ئەدا ! بەلام مرۆڤ گيرۆدەيـە بەدەست ململانێ ی هەردووکيانەوە(عـەقڵ و ئارەزوو)عـەقڵەکە ئەڵێ ئەمە خراپە نەيکەی هەوا و ئارەزوش ئەڵێ حەزم لێيەتی ئەبێ بيکەی،چون عـەقڵەکە سنورداره ئەگەر دينەکـە لەدەوری نەبێت و بەهێزی نەکات ئەوە بەروهەڵدێران دەچێت،بۆيە ئەو ياسا دەسـتکردانەی کە لەلايەن خەڵکانی عـاقڵـەوە دانـراون بـەلام لەبـەر ئـەوەی ئـەو عـەقڵـە بـەدين تەقويـە نەکراوە بڕيارەکانيان هەربەلای هەوا و ئـارەزوودا ئەشـکێتەوە و بـەردەوام دەبـێ تەعـديل بکرێن ، بۆيە هەر عـەقڵێ تەسليمی شەرع بێ سەلامەت دەبێ (اسـلم تـسلم ) . نـەفس و ئارەزوو بەگشتی و ڕەهايی خراپە چونکە مرۆڤ بەرەو لادان ئـەبات ئـەينا شـتی چاکيـشی تێدايە، نەفس داوای شتی جوان و ژن هێنـان و شـوکردن و خـواردن و خواردنـەوە دەکـات حەقی خۆيەتی و ئەبێ ئەو مافەی بدرێتێ (ان لنفسـك عليك حق ) بەومـەرجەی لەسـنوری

شەرع دابێ ، نەفس ئەبێ کۆنترۆڵی بکەی جیهادی بکەی بەلاّم نابێ بیکوژی . هەرچی زوڵم و ستەمێ کە کراوە هەرلە فیرعەون و نەمرود و تاکو ستەمی دیکتاتۆرەکانی ئەمڕۆ هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ حەزو ئارەزوی تاکەکەسێك ئەویش هەوا و ئارەزوەکەیەتی ئەم کارەی پێ ئەکات ، وەك (امام شافعی) فەرمویەتی : مرۆڤەکان چوار جۆرن : هەیە نازانێ کە ئەزانێ ئەوە بیری خەرەود ، بەلاّم هەیانە نازانێ کەنازانێ ئەوە زۆر خەتەرە ... ، بۆیە ئەبینی کەسی ئارەق خۆر و دامێن پیس و خراپکار پاڵنەرێکی هەیە ئەم کارەی پێ ئەکات کەهەوا و ئارەزوەکەیەتی بەلاّم نازانێ و هەر ئەڵێ بەدەست خۆم نی یە و حەزم لێ یەتی ! هەوا و ئارەزوو هۆکاری سەرەکی دژایەتی کرانی پێغەمبەران ((ﷺ)) بووە ، هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم کێشە و ململانێکە لەنێوان ئەهلی هەوا و ئارەزووکە مادە و زرق و برق و جنس و پلە و پایە کاریگەری لەسەریان بووە بۆدژایەتی ئەهلی حەق . (میسوەرەی کوڕی مەخرەمە ) خوشکەزای ابو جهل بوو ڕۆژێکیان میسوەرە خۆی ئەڵێ وتم بە خاڵم (ابو جهل) ئایا خاڵە درۆتان لە محمد بینی بوو لە پێشدا ؟ وتی نەوەلاّ ڕۆڵە گیان بە (صادق الامین ) ناسرا بوو ، ئەی ئێستا درۆتان لێ دیوە ؟ وتی جاکەسێ بەگەنجی درۆی نەکردبێ چۆن بەڕیشی سپی درۆدەکات ، وتی ئەی بۆ ئیمانتان پێ نەهێنا ؟ وتی وەلاّهی مونافەسەهەبوو لە نێوان تیرەی ئێمەوئەواندا لەسەر خزمەت کردنی کەعبە ،تا گەیشتە ئەوەی وتیان پێغەمبەر لەتیرەی ئێمە هاتووە ،ئەی ئێمە پێغەمبەرێك لەکوێ بێنین ؟ ناچار بۆ پاراستنی سومعەی خۆمان دژایەتیمان کرد لێتا ئەو ئاستە ئاگادار بوون لە ناسینی حەق دا بەلاّم ململانێ ی حەزو ئارەزوەکانیان کوێری کردبوون بۆ بینینی حەق و ڕاستی وەك لەم ڕۆژگارەی خۆشمان دا لەشەڕی کورسی و گیرفان دا دوبارە دەبێتەوە بەرامبەر بەحەق . سێ ووشە قوڕی کرد بەسەر سێ کەس دا (أنا) ی ابلیس ، (لی ملك مصر) ی فرعەون،( من عندی ) ی قارون کەنیشانەی خۆبەزل زانینە وشوێنی هەوا و ئارەزوە ، ئەم هەموو کینە و بەخیلی و حەسودی و خراپەکاریە هەموو بەهۆی

ئەوە وەیە ، بەلاّم ئەگەر یەکێکیان لەبەرخوا ڕاست کات یان خۆی بە کەم بگرێ یان عەفوی بکات ئەوە کێشەکە نامێنێ ، هەر لەقەدیم زەمانەوە هەوا و ئارەزوو لە کێشەو حرب دا بووە لەگەڵمان ئەگەر بەعەقڵی ئیمانی بەرەو ڕوی نەبینەوە ئەوە ماڵ وێرانمان دەکات ، سەد حەیف و مخابن کە سەرکەوتوە بەسەرمانا چونکە لەناخماندایەو دوژمنی ناو خۆش زەفەر دەبات ، هەر ئەوەش حەزرەتی ئادەم وحەوای بە هەڵە بردوو خستنیە تاوانەوە و پێ ی لە دارە قەدەغە کراوەکە خواردن ئەوە بوو لە ئەنجامدا ڕووت کرانەوە و دەرکران بۆ زەوی ، چونکە بەهەشت شوێنی ڕوتی و تاوان نی یە شوێنی پاکی یە عقوبەکەشیان نەفی کردنیان بوو بۆ سەر زەوی،( ئێمە لەوێ توشی عقوبە بوین لەسەر هەوا و ئارەزوو ئەوەتا لێرەش وامان لێ دەکات کە نەچینەوە ولاّتی خۆمان کە بەهەشتەو بەرەو دۆزەخمان دەبات ، لەبەر ئەوە ئەبێ داوا لەخوا بکەین لەشەڕی نەفس وشەیتان بمان پارێزێ کە خۆی خاوەنیانەولە نەفسی ئێمەدا دروستی کردون بۆ تاقی کردنەوەمان،(امام علی) خوای لێ ڕازی بێت ،دەڵێ :لەدوو شت لێتان دەترسم(...**اتباع الهوی وطول الامل** ١ـ شوێن کەوتنی هەواو ئارەزو ،٢ـ هیواوئاواتی دورو درێژ، چونکە هەواو ئارەزو لات ئەدا لە حەق وڕاستی ،هیواو ئاواتیش بێ ئاگات دەکات لە دوارۆژ .(ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ :(**وسطیة**) میان ڕەوی لەهەموو شتێك دا چاکەو خێرە ، هەلکشان و داکشان و زیادە ڕەوی خراپە چون پاڵنەرەکەی هەواو ئارەزوە ، تاکە دەرمانی بەخۆدا چونەوەوکۆنترۆڵ کردنی شەهوەت و ئارەزوەکان ڕۆژوی ڕەمەزانە . لەدوعاکانی پێغەمبەر((ﷺ)فەرمویەتی:{**اللهم لاتكلني الى نفسي طرفة عين** ...} واتە: خوایە چاوترووکانێك ئەم دەیتە دەست ئەفسم !{..**اللهم آت نفسي تقواها.. فزكها انت خير من زكاها** } خوایە پارێزگاری بخەیتە ناو دڵمەوە و ئەفسم پاك بکەیتەوە .

**طوبى لمن كان عقله اميرا وهواه اسيرا ........ وويل لمن كان هواه اميرا وعقله اسيرا .**

# ڕەمەزان مانگی تیژ کردنەوەی ئیمانە

بەڕاستی ڕەمەزان مانگی تیژکردنەوەی بیروباوەڕە،ئەوباوەڕەی کەلەناودلاَنداجێگیر دەبێ، وەچاکترین نیعمەتە لەم ژیانەدا،بەهۆیەوە پێ جیا دەبینەوە لەبێ بڕوایان،وە چاکترین شت لە ئیسلامدا ئیمانە،چونکە ئینسان گەر ئیمانی لێ تێك چوو،ئەمانیشی لێ تێك دەچێ ، چاك و خراپی بۆ جیانابێتەوە، ڕەش بەسپی ئەبینێ،لەبەرئەوە لەزۆربەی ئایەتەکاندا خوای گەورە بەسیفەتی ئیمان بانگی موسڵمانان دەکات﴿ يأيها الذين أمنوا اتقوا الله وكونوا مع الصادقين ﴾،موسڵمانەتی تەنها ڕوکردنە قیبلە ونوێژ و ڕۆژوونیەبەڵکو پێشی فیکرە و باوەڕە کە لەدڵدا جێگە دەگرێ،وبەزمان دەگوترێ وکردەوەش دەیسەلمێنێ،ئەگەر هەموو ئیسلام بە درەختێك دابنێین ، ئەوە بیر و باوەڕ ڕەگو ڕیشەیەتی هەڵس وکەوت و ڕەوشتی جوانیش بەرهەمەکەیەتی،سەبارەت بە بەشەکانی ئیمان زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە ، بەلاَم چاکترین پێناسە بۆئیمان قسەی ،( ئەبی عزی حەنەفی )یە لەشەرحی کتێبی (العقيدة الطحاوية )دا دەڵێت:(مالك و شافعی و ئەحمەد و ئەزاعی و اسحاقی کوڕی ڕاهویە و زانایانی مەدینە و وە کۆمەڵێك لە زانایانی کەلام ، ڕایان وایە کە باوەڕ بریتی یە لە ( الاعتقاد بالجنان ،والاقرار با للسا ن ،والعمل بالاركان)،واتە:( باوەڕ بڕیاری دڵەوقسەو شایەتمانی زمانە وکرداری ئەندامانی لاشەیە) واتە ئەنجام دانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار،امامی بخاری دەڵێ : (زیاتر لەهەزار زانام دیوە لەجێوڕێ ی جیاوازدا کەووتویانە باوەڕ:بڕیارو کردارەو زیادوکەم دەکات). بۆیە دەبینی لەقورئاندا ئیمان و عەمەل پێکەوە هاتوە،ئەگەر لەوبارەوە ئیسلام دابنێین بەچرایەك ،ئەوە شەوقی چراکە ئیمانەکەیە و نەوتەکەشی لە جێگای کردەوەیە ، چرا تا نەوتی زۆر بێ گڕو تینی زیاتر دەبێ،بەهەمان شێوەش بیروباوەڕ تازیاتر کردەوەی پێ بکەین پابەندبین پێوەی بەرهەمی چاکتر ودیارترە،کەواتە ئیمان بەکردەوەی چاکە زیاد دەبێت و بەخراپەکاری کەم دەبێت ، وەك (حافظی حەکەمی )ش دەڵێ : ( ايماننا يزيد بالطاعات ونقصه يكون بالزلاتِ ) .

واتە: باوەڕمـان بەتاعـەت و عیبـادەت زیـاد دەکـات و بەخراپـە و تـاوان کـەم دەکـات . ئیسلامەتی و دینداری بەقسەی ڕوتی بێ کردەوە قبـوڵ نـی یـە و ، دەعـوای بـێ دەلیـل وەرناگیرێ . حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) کاتێ ویستی وتارێ بدات لەسەر ئازادکردنی بەندەکان لەسەر داوای کۆمەڵێ عەبدماوەیەك وەستا تـا بۆخۆی بەندەیـەکی کڕی و ڕزگـاری کـرد، پاشـان چـوە سـەر مینبـەر و وتـارێکی کاریگـەری دا کـەبوە هـۆی ڕزگارکرانی زۆر لە بەندەکان چونکە کردار و گوفتاری یەك بوو . نـەك وەك ئـەو کەسـەی کە وتویەتی (بەقسەم بکە بەلاّم بەعەمەلم مەکە!) چون کەس گوێ بۆ قسەی بـێ کـردەوە ناگرێ ، ئیمان درەختێکی هەمیشە سەوزە ، هەموو کات بەرهەمی شیرینی خۆی دەدات ، کەبریتی یە لە سەرجەم ڕەوشتەجوانەکان و کردەوە چاکەکان ، هـەروەکو خراپـەو تـاوان بەرهـەمی بێباوەڕیـە هەرچـەندە بـەرگێکی جوانیشی بەسـەردا کرابێـت ، تـەنها بـاوەڕی ڕاستەقینەیە کە مرۆڤ دەگۆڕێ بـەرەو چـاکە ، ئیمـان بـوو کـەهاوەڵانی پێغەمبـەری والێ کردبوو کە پێشبڕکەیان دەکرد لە خێـر و چـاکەدا ، امـامی عمـر (خـوای لێ ڕازی بێـت ) پێش ئـسلام بوونی کـچی زینـدە بەچـاڵ دەکـرد و زۆر دڵ ڕەق بـوو ، بـەلاّم دوایـی یـاری لەگەڵ منداڵان دەکرد و دەیخستنە سـەر پـشتی خـۆی ، هـاوەڵان لەکەشـێکی ئیمـانی دا دەژیان کە پڕی بوو لـە ڕاسـتی و پـاکی و چـاکی و خۆشەویـستی ، بـەلاّم گـەر بـەراوردی بکەین لەگەڵ ژیانی ماددی ئێستاماندا ! ئاسمان و ڕێـسمانی بەینـە . ئیمانداری لـەکاتی شین و شـایی دا لـەکڕین و فرۆشتن دا دەردەکـەوێ کابرایـەك لای امـامی عمـر مـەدحی کەسێکی کرد پێشەوا عومەر پێی وت : مامەڵەو سەفەرت لەگەڵ کردوە ؟ وتی نەخێر ، ئەی هاوسێت بووە ؟ نەخێر ،کەواتە نایناسی ! ، ئیمان سێ دوژمنـی سـەرەکی هەیـە : یەکەم ـ نەفس : کە ئەبێ کۆنترۆڵی بکەی جیهـادی بکـەی چـونکە ئـەو هـەرداوا دەکـات حەلاڵ بێ یان حەرام ، بەلاّم نـابێ بیکـوژی و لـە سنوری شـەرع دا دەبـێ داواکاریـەکانی بـــــــەجێ بێنـــــــێ (ان لنفـــــــسك علیـــــــك حـــــــق ).

دووەم ـ دنیا : ئێمە دژی ماڵ و سامانی دنیا نین ، چاکترین هۆکار و وەسیلەیە ، نەك ببێتە ئامانج و مەبەست ، چارەسەری ئەوەش قەناعەت و دنیا بەکەم گرتنە ، امامی غەزالی جوانی فەرمووە : کە دەڵێ :

(خوایــــه دنیـــا بخەیتـــە باخەڵمـــەوە بـــەلام نەیخەیتـــە دڵمـــەوە) !.

سێیەم ـ شەیتان : ئەتوانین دژایەتی بکەین لاوازی بکەین بەلام ناتوانین بیکوژین .

هەرکەس ئیمانەکەی پاراست لەم سێ دوژمنە ، ئەوە ئیمانداری ڕاستەقینەیە ـ لە دوارۆژدا سەرفراز و بەختەوەرە و خوای گەورە لەتاوانەکانیان چاوپۆشی دەکات و بەچاکترین شێوە پاداشتیان دەداتەوە﴿..لنكفرنهم سيئاتهم ولنجزينهم احسن ماكانوا يعملون ...﴾دەبا ئێمەش لەم مانگە پیرۆزەدا ، کەمانگی خەلەو خەرمانی ئیمانە ، بەخۆماندا بچینەوە ، واتاو ناوەڕۆك ومەرجەکانی (لا الـه الا الله ) بزانین و لێ ی حاڵی بین و لە خۆماندا بیکەین بە حاڵ ، باعەقیدەمان پاك بکەینەوە لەشیرك وبیدعەت و ڕیاو ئەفسانە . باکوفر بەتاغوت بکەین و دەست بە ڕێسمانی تووندی خواوە بگرین و بادورکەوینەوە لەو شتانەی کە ئیمان هەڵدەوەشێننەوە ، (ڕیسەکەمان نەبێتەوە خوری ) ﴿ فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن باالله فقد استمسك بالعروة الوثقى...﴾ . با بەکردەوە بیسەلمێنین و نیشانی بدەین کە ئیمانەکەمان بەهێزو پێز بووە ،پێمانەوە دیار بێت لە دەست وزمان پاکی ودامێن پاکی ودڵ پاکی و دور کەوتنەوە لە حەرام ، دور کەوتنەوە لەمۆدیلی بێگانە و چاولێکەری کوێرانە ، با بەخۆماندا بچینەوە ، لەشەوانی قەدری پیرۆزدا ، بزانین تاچ ئەندازەیەك ئێمە پابەندین بەسیفاتی ئیماندارانی ڕاستەقینە ، بابەکردەوە نیشانی بدەین کە ئەم دینە بۆ ژینە ، ڕەوشتی موسڵمان شیرینە ، ڕەمەزان قوتابخانەی ژینە.

# ڕەمەزان خولی ئارامگرتنە

ئـارامگرتن لەبەرخوایەکێکـە لەڕەوشـتـەجوانەکانی موسـڵمانان ئـەم ڕەوشـتـەش بـەری درەختـی ئیمانە،وشـەی(الـصبر)(٩٠)جارلەقورئانداوبارەبوەتـەوە کـەخوا لەگـەڵ ئارامگرانەوخۆشـی دەون وئارامگرپاداشـتی نەبڕاوەیەوسـەرفرازی دنیـاو دوارۆژە...،بێگومـان هـەمومان دوچـاری گرفـت وکێشەدەبین لەماڵـەوە وەلـە دەرەوەلەمیانـەی کارەکانمـان ژیـان پڕیـەتی لەنەخۆشـی وناخۆشـی بۆیەلـە بەرانبەرداهـەمومان پێویـستمان بەصـەبروئارامگرتنە،بۆیەخوای گـەورەخولێکی پەروەردەیی یەك مـانگی بۆکردوینـەوە لەڕەمەزانداتافێری صـبروئارامگرتن بـین بـۆ(١١)مانگەکـەی تر،تابەختـەوەری دنیـاودوارۆژبین بـەهۆی ئارامگرتنـەوە، ئـارامگرتن لەبەرامبەرتینویـەتی برسـیەتی وبێتاقـەتی ڕەمـەزان تاهەسـت بکـەی بەئازاری هەموان،لەڕەمەزاندا کاتی خواردن وخـەوتن دەگۆڕێ،ڕەمـەزان فێرمـان دەکـات کەنەفـست بەدەسـت تـۆوەبێ نـەك تۆبەدەسـت نەفـسەوەبیت ویاریـت پێبکاتـ،ڕەمەزان وصـەبرپێکەوەن و جیانابنەوەچونکە ئـەوەی صـەبری نـەبێت ڕۆژوی ێناگیرێ،صەبرئەوەندەگرنگە(ابن مسعود)فەرمویەتی :ئیمان دووبەشەکە (صەبروشوکر)ە،چونکەئەوەی صبری نـەبێت لـەخێری دونیـاودوارۆژی بێبەشـە، پێغەمبەر (ﷺ) بەلای گۆڕستانێکداڕەتبووژنێك لەسـەرگۆڕی مردوەکـەی دەگریـا پێغەمبـەر(ﷺ)ئامۆژگـاری کردبـە ئارامگرتن،ژنەکـەش نەیناسـی ووتـی تۆنـازانی چـیم بەسەرهاتوە،پاشـان پێیـان وت ئەوەپێغەمبـەری خـوا بوونەوجاپەشـیمان بویـەوەوداوای لێبـوردنی کردپێغەمبـەریش(ﷺ)فـەرموی:(الـصبرعندصدمةالاولى) واتە:ئارامگرتن یەکەمجارلەسەرەتایی ڕودانی شتەکەدایەوخێری زیاترە،بێگومـان صەبرناخۆشـە وتاڵـە بـەڵام بـەری شیرینە،سـەرنج بدەنەبەسـەرهاتی حـەزرەتی یوسـف وسـەرکەوتنی بەسەرئەوهەموبیروسـجن وبوختـان و..،خـوای گـەورە

لەبارەیەوەفەرمویەتی(إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ)واتە هەرکەسێ تەقوای خوابکات وصبربگرێ ئەوەخواپاداشتی چاکەکاران ون ناکات وەسەرنج بدەنەئەوهەمووخەم وخەفەتەی درایە حەزرەتی یعقوب بەهۆی یوسفەوە،بەلاّم هەرصبری گرت وشوکرانەی کرد، خوالەبارەیەوە فەرمویەتی: (نعم العبد انه)واتە:چاکترین بەندەیەکەلەبەرانبەرناخۆشیەکاندادەگەڕایەوەبۆلای خوای گەورەهەرپشتی بەخوادەبەست، خوای گەورەفەرمویەتی: (انمایوفی الصابرون اجرهم بغیرحساب...) واتەبەدڵنیاییەوەئارامگران پاداشتیان بێ حیسابە پاداشتیان دیاری نەکراوەلەبەرزۆری خێرەکەی هەروەك چۆن ڕۆژووش پاداشتی دیاری نەکراوەوخوای گەورەفەرمویەتی هەرخۆم پاداشتیان دەدەمەوە،لێرەدا دەبینی(ڕۆژوصەبر)لەخێروپاداشتدایەکدەگرنەوەو هاوشێوەن، هەردوکیان پاداشتیان بێ سنورە،بۆیەخوای گەورەفەرمویەتی(ان اللە مع الصابرین)خوا لەگەڵ ئارامگراندایەوئارامگرانی خۆش دەوێ،یەکێ لەزانایان صەبری کردوەبەسێ بەشەوەونمرەشی بۆداناوە بەم شێوەیە:

١) صەبرلەسەرتاعەت،خواپەرستی کردن صبری دەوێوەك نوێژوڕۆژو،ئەم جۆرەیان (٣٠٠) نمرەی بۆداناوە.

٢) صەبرلەسەرنەکردنی تاوان،بۆنمونە سەیرنەکردنی ئافرەتێکی جوان لەبەرخواصبری دەوێ، یان بەهۆی درۆیەکەوەپارەیەکی زۆرت دێتەدەست تۆنایکەی صبری دەوێ ئەم جۆرەیان(٦٠٠) نمرەی بۆداناوە.

٣) صەبرلەسەربەلاّومصیبەت،ئارامگرتن لەسەرخۆشی وناخۆشیەکانی ژیان کەلەهەمویان ناخۆشترە بەئازارترەبۆیە(٩٠٠) نمرەی بۆداناوە

جانەگەرسەرنج بدەین ئەم هەمووخێروبێرەی کە لەئارامگرتن دایە لەمانگی ڕەمەزاندا دەستت دەکەوێ کەپێغەمبەر(ﷺ)ناوی بردووەبەمانگی صبر، وەلەبەرانبەردائەگەرصبرمان نەبووئەوە بەردەوام توڕەبوون وخوێن ڕژان و تەلآق دان ومالٚ وسامان وخۆلەدەست دان وبەوەیش ژیان دەبێتەژان و سەرگەردان دەبین لەهەردووجیهان، بەڕاستی ڕەمەزان قوتابخانەی ڕەوشتە جوانەکانە وفێرمان دەکات نەرم نیان بین وبەئارام بین بەڕەوشت بین، ئەوەش مەبەست وئامانجی بەنداتیەتی پەرستشەکانەکەبۆبەرجەستەکردنی ڕەوشتەجوانەکانە.

# ڕەمەزان مانگی بەهەشتە

ڕەمەزان گەراجێکە بۆ ڕۆیشتن بەرەو شارە شوشـویەکانی بەهەشـت ،چـونکە لەومانگـەدا دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە بەڕوی ڕێبـوارانی ڕۆژوگـردا کـەنێوانی دەرگاکـانی حـەفتا ساڵ ڕێگایە بەسواری !، ئەودتادەرگای (ڕەییان )تایبەتـە بـە ڕۆژوگرانـی ڕەمەزانـەوە وەك پێغەمبەر(ﷺ) لەفەرمودەیەك دامژدەی پێ داوین(ان فی الجنة باب یقال لـە الریـان... کەئەمەکوردی یەکەیەتی:{لەبەهەشتدا دەرگایەك هەیـە پـێ دەوتـرێ ڕەییـان تـەنها ڕۆژو گرانی پێدا دەڕۆنە ژورەوە،بانگ دەکرێن لەکوێن ڕۆژو گرانی ئومەت هەمویان لەو دەرگـا تایبەتەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە و کەسی تری پێدا ناچـێ }(متفـق علیـە)(ڕەییـان) یـش لـە(ری) ئـاودێری وەرگیراوەبـەمانای تێرئـاودێ لـەوێ تێرئاووگـەش وجـوانن کـەگونجاوە لەبەرامبەر تینویەتی و بێ تاقەتی دنیادا کاتێ کە بەگەرماو سەرما بەڕۆژو بووە

دەچـینەخزمەت چـەندیمەنێکی بەهەشـت،* یەکـەم کـەس کـەدەرگای بەهەشـتی بـۆ دەکرێتەوە پێغەمبەرمانە (ﷺ) کاتی کرانەوە هەرلە دورەوە چـی بـەرەو ڕویـان دێـت ..؟ (روح وریحان وجنات النعیم )، هەوای فێنك و بۆنی خۆش لەدوری حەفتا سـاڵەوە هەسـتی پێ دەکرێ ،دەبێ لەناوەوە چـۆن بێـت ...؟ * گـەروەیی بەهەشـت ... کعـرض السـموات والارض ... بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوی یە ! ...* اعدت للمتقین ، ئامادە کـراوە بـۆ تەقوا داران وچاکەکاران ،بۆیەپولەئاساکان کە عاشقی گولآنن،زۆربەی بەهەشـتیەکان بـڕوا دارانی هەژارونەدارو‌چەوساوەو زەحمەتکێشی دونیایەن! دەوڵەمەندوکاربەدەستانی کەم لێن

* یەکەم خواردنی بەهەشتیەکان جگەری نەهەنگە وگۆشتی نەوەنە،نانێکیش بەئەندازەی هەمووسەر زەوی پانەو(٧٠)هەزارکەس لێی دەخوات تەوا ونـابێ ! ..هـل جـزا الاحسـان الا الاحسان ، ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نیە؟ * اعددت لعبادی مـالا عـین رات ولا أذن سمعت ...، ئامادەم کردوە بۆ بەندەکانم نەچـاو شـتی وای بینیـوە نـەگوێ شـتی وای بیستوە * ادخلوها ،بچنە ناوی ... خالدین فیها ... تاهەتایـە ... بمـا کنـتم تعملـون ،

بەوەی کە کرتان لە دونیا ..،(خەیاڵی ژێر لێفە بەتاڵە ... ئەوەی ڕەنج نەدات گەنجی مەحاڵە )،خوا دەبینن سلاّوی لیّ دەکەن،خواش سلاّویان لیّ دەکات ...سلام قولامن رب رحیم ، پاشان سەلامی فریشتەکان ...،سەلامستانە بەلاّم سەلامی ئەویّ تەزویر نیە ، ❊ خواردن و میوەجاتی...ڕوبـاری شیروشـەرابی ...لەخواردنەوەیان تێر نابی... حۆریەکانی ... بەرگی ئاوریشمی ... ،دیمەنی باخ و ئاوەکانی ...،بەلاّم ئاوەکەی چۆن ئاوێکە ؟ وەك هی ئێرە تێکەڵی زێراب نابیّ لیّلّ نیە !،یا عبادی لاخوف علیکم ولا انتم تحزنون...خەموو ترس کۆتـایی هـات ،تۆمـەتی تـیرۆرو تۆقانـدن و گـرتن و بـردن نـەما ، خەمـەکان دەبنـە زەردەخەنـە و فرمێسکەکان دەبنـە بـارانی شـادی ، مرۆڤـەکانی ئـەویّ دەگۆڕێن لەهەموو ڕویەکەوە لە تەمەن و لاشەدا ...! من یزرع الخیر یحصد السلامه ... ومن یزرع الشر یحصد الندامه ، دنیـا کێڵگـەی دواڕۆژە چـی بـچێنی ئـەوە ئەدوریتـەوە ، ئەوە بەرهـەمی ڕۆژوی ڕەمەزانـە کەدەنخاتـە سـەر ڕێگـای بەهەشـت لـەدوای برسـیەتی و ماندوبون خۆشی وحەوانەوەیە،(وەیسی قەرەنی )(خ)فەرمویەتی: من حەفتا کەسم بینیـوە لەهاوەلانی پێغەمبەر(سەلامی خوایان لەسەر بێـت) ئەگـەر ئێـوە ئـەوانتان بدیایـە ئـەتان گوت ئەمانە شێتن ! ئەگەر ئەوانیش ئێوە یان بدیایە ئەیان وت ئەمانە هیچیان لە ئـەهلی بەهەشت ناچن ..!!(ابی ئومامە )ووتی : ئەی پێغەمبەرخوا کـارێکم نیـشان بـدە کـە زۆر بەسودبیّ وخوا لێم ڕازی بێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(**علیك بالصیام فانه لا مثل له**) واتە : ڕۆژو بگرە وێنەی نیە لەخێر وپاداشتدا .

**جابۆنەبینە ئەوانـەی کەوا .... ساتیّ غافلّ نین لە زیکری خـودا ،**
**خواش مژدەییّ وەای پێداون .... پێی دلّ ئارامن هەتاکو ماون**
**کاتێکیش مردن یەکسەربۆبەهەشت .... ئەوەیە سەیران ڕابواردن و گەشت**

# ڕەمەزان و ئافرەت

بەرنامەکەی خوا ئافرەت و پیاوی بەیەکسانی داناوە،لە بنـچینەی دروسـت بـون و بـەهای مرۆڤانەدا، بەشێوەیەك کە هیچ جیاوازی یەکی لە نێوانیانـدا نەهێـشتۆتەوە ،وە هـەردولا دەگەڕێنەوە سەریەك بنەڕەت،وەکودەفەرموێ:﴿ الذی خلقکم من نفس واحدة﴾(ال عمـران: وە لەپاداشتی ڕۆژی دواییدا وەکو یەکن و هیچ جیاوازی یـەکیان نیـە وەك دەفـەرمووێت : ﴿أنی لا أضیع عمل عامل منکم من ذکر أو أنثـی .....﴾ (آل عمـران : ١٩٠) واتـە: چ نێر و چ مێ مـن پاداشـتی کارەکـەی گـوم ناکـەم ... وە ئـافرەت لـە بەرامبـەر ئـەرك دا مافیشی بۆ دیاری کراوە﴿ ولهن مثل الـذی علـیهن بـا لمعـروف ﴾(البقـرە :٢٢٨)،جـا بـە ڕاستی ماف و ڕێزی ئافرەت تەنها لە ئیسلامدا دا بـین و پـارێزراوە ،ئـەوە ماوەکـە ئێمـە پیادەی بکەین و ئەو مافەیان بەکردەوە پێ بدەین و خۆمان لە فەرمانی خـوا بـە گـەورەتر دا نەنێین،ئافرەت زۆر ڕێز لێ گیراوە لە ئیسلامدا، وەکودایك لەلایەك ئەوەتا گەر دایکمان لێمان ڕازی نەبێ خواش لێمان ڕازی نابێ وە لەلایـەکی تـرەوە وەکوخوشـك ڕێـزلێگیراوە ، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(انما النساء شقائق الرجال)واتە: ئافرەتان لەتکی پیاوانن ، سێوێك گەرهەردولاکەی نەبێت، ناتوانی بلێ ی سێوە،بەلکو لەتەسێوە،بەهەمان شـێوەش مرۆڤایەتی لەژن و پیاوپێك دێـت وبەهـەردوکیان مرۆڤایـەتی پێـك دێـنن کەسێ ڕێـز لـە ئافرەت نەگرێ لە ئیسلامدا بەگێل ونەفام لەقەلەم دراوە،وەك لەفەرمودەی پێغەمبەرمانـدا هاتوە(ﷺ){ما أکرم النساء الا کریم وما أهانهن الا لئیم} (مسلم)واتـە ئـەوەی ڕێزیـان دەگرێت چاك وبەڕێزە،وەکوپێشەوامان کەخێزانەکانی زۆرخۆش ویستون،وەکەسێ بەچـاویی سوك سەیریان بکات ئەوەسوك وبێ ڕێزە و نەفامە،لەبەرئەوەیە ناحەزانی ئیسلام ،لەنرخ و ڕێزی کەم دەکەنەوە،بەناوی ئازادی وڕێزە وەبێ ڕێزیان دەکەن،بۆمەرامە گلاوەکانی خۆیـان ڕوتیان دەکەنەوە، دەیان هێننە ئاستی ئاژەڵ ،چونکە لیبـاس و حیجابەکـە مـرۆڤ لـەئاژەڵ جیادەکاتەوە و عەورەتی دادەپۆشێ ، وە ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە پاراستنی کەسـایەتی

ئافرەتان،بەوەی کە تێکەڵیێ پیاوانی بێگانە نەبن ، خۆیان داپۆشن ، وەکو مـاڵێکی بـەنرخ پارێزراو ، چونکە چاکی وپاکی کۆمەڵگا بەستراوەتەوە بـە پـاکی و چـاکی ئافرەتانـەوە ، ئەگەرئافرەتان پاك بن ڕۆشنبیربن، لەخوا ترس بن،ئەوە کاریگەری زۆری دەبێ بۆسەر ئـەو کۆمەڵە،بۆیە ناحەزانی دین کاتێ دەبینن ژنـان دەچنە مزگـەوت یـان بۆکـۆڕو سیمناری ئیسلامی کـیچ دەکەوێتـە کـەوڵیان،دەڵێن: ئـەوە کۆنـە پەرستیە! بـەڵام چـون بۆپـارك و شوێنەبەڕەڵلایەکان پێشکەوتنە!جابەتایبەت لەم مانگەپیرۆزەدالەشەوانی پـیرۆزی قـەدردا، پێویستە بە ئیمانەکەماندابچینەوە ،ئەو خۆداپۆشین وبەندایەتیەی کە دەستمان پێ کـردوە بـێ پـارێزین و بـەردەوام بـین لەسـەری،بالەگەڕەکەکاندا لەچـەندماڵێ دابنیـشین ونوێـژی تەراویح بکەین، لەدینەکە شارەزا بن،بەتایبەت لەیاساکانی پەیوەندی داربەئافرەتانـەوە،تا لەدینەکـەت ئاگـادار نـەبی ،نـازانی قـەدرو ڕێـزی ئـافرەت چـەندە ؟دەی بائـەم ڕەمەزانـە بکەینە قوتابخانەی زانست و زانیاری بۆهۆشیاری وئاگـاداری بـەرەو سـەرفرازی و ڕزگـاری تادەگەینە خزمەت باری،زانایەك دەڵێ(ئەگەرپیاوان سەیارە وتەیارەوکۆمپیوتەرو موشـەك دروستن بکەن،بەڵام ئافرەتان مرۆڤ دروست دەکەن،چونکە یەکـەم قوتابخانـەی پـەروەردەیی کەمرۆڤ تێدادەردەچێ باوەشی دایکە)وەپێشەوای مرۆڤایەتی(ﷺ)لەدواوتاریـشدافەرموی (استوصوا بالنساء خـيرا)ئامۆژگاریم ئەوەیە کە لەگەڵ ئافرەتان باش و چاك بن ،سـەرنج بدەچـەندلەخەم ئافرەتـانی ئوممـەتی بوە،تـادوربن لـەئاگری دنیـاودواڕۆژ،ئێوەش دایکـان و خوشکانی بەڕێز،دوربکەونەوەلەچاولێکەری کوێرانە بۆ مۆدیلی بێگانە،وەڵامی بانگەوازی خوا وپێغەمبەر بدەنەوە،بەندایەتی خوابکەن، حەیاو ئابڕوی خۆتان بپارێزن،شوێن کەوتـەی عائیـــشە وفاتیمەخەنـــسابن!تاکوبەهەشـــت وڕەزامەنـــدی خـــوا مـــسۆگەربکەن.

میوەگەرتوێکڵی نەبێ مێش ومەگەزدەوری دەدەن،پرتەقاڵم خۆش دەوێ پاکوخاوێن وگوڵ بەدەن ئافرەتیش هەروایە،بەرگی عیففەتەجوانی دەکا،مەریەمەی لێدەردەچێ،یافاتیمەی دایکی حسن

# ڕەمەزان و مزگـەوت

قال تعالى:﴿انما يعمر مساجد الله من آمن بالله واليوم الآخر وأقام الـصلاة وآتـى الزكـاة ولم يخش الا الله .﴾(التوبە: ١٨)واتە:ئاوەدان كردنەوەی مزگەوت تەنهالەوكەسانە دەوەشێتەوە كەبەڕاستی باوەڕيان بەخوا و دواڕۆژە،ونوێژكەروزەكات دەرن، ئەهلی مزگەوتن ،وەلە خـوا بەولاوە لەكەسی تر ناترسن،ئەوانە هيدايەت دراون و ئـەهلی بەهەشـتن، ئاوەدانكردنـەوەی مزگەوت بەهەردوو شێوەكەيەوە،يەكێكيان(حيـسی)يـە وەك دروسـت كردنـی مزگـەوت و دابينكردنی پێداويستی يەكانی وخزمەتكردنی يەتی ،كەزۆرخێرە، لەفەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ)هاتوەكە : كەسێ بۆ خوا مزگەوتێ دروست بكات ئەوە خوالەبەهەشـتدا قەسـرێكی بۆ دروست دەكات . وە جۆری دووەميان ،ئاوەدانكردنەوەی(مەعنەوی)يە واتە: هـاتو چـۆ كردنی ماڵی خوا بۆ عيبادەت و زيكر و فيكر ،لەفەرمودەی پێغەمبەرداهاتوە كە(ئەگـەر بينيتان كەسێ بەردەوام هاتوچۆی مزگەوتی دەكرد،ئەوەشايەتی ئيمانی بۆبدەن)(الترمذی) بەتايبەت لەم مانگە پيرۆزەدا كە جێگەی خۆشحاڵی يە دەبينـی مزگەوتـەكان جمـەيان دێ لە قەڵەباڵغيدا،گەر سەيرێكی كۆتای ئايەتەكە بكەين دەبينی : يەكێ لەمەرجـەكانی ئـەو كەسەی هاتوچۆی ماڵی خوادەكات ومزگەوت ئاوەدان دەكاتەوە،دەبێت﴿ولم يخش الا الله ﴾ لەكەس نەترسێ جگەلە خوا ! چونكە كاتێ لەمزگەوتدا ترسـێكی ترهـەبوو ئـەوا نـاتوانێ هەموو ئيسلام بـۆ خـەڵكی بـەيان بكرێـت ، هـەركاتێ ديـن بەنقـصا نـی ڕاگەيـەنرا ئـەوا موسڵمانی نوقصانيشی لێ دەكەوێتەوە كەناتوانێ حـەق و ناحـەق ، ڕاسـت و هەڵـە ، بـە تەواوی لێك جيابكاتـەوە كەئەمـەش ئاواتی دوژمنـانی مـاڵی خوايـە ،لـە كاتێكـدا كـە ناتوانن دەستكاری قورئان بكەن دەستكاری عەقيدەكەت دەكەن،لەڕاستيدامزگەوت مـاڵی خوايە،ئـەوەی لەمزگەوتـەميوانی خوايـە،ديارەميوانيش بەڕێزە،مزگـەوت مەڵبەنـدێكی گشتی موسـڵمانانە ، شـوێنی عيبادەتـە ، عيبـادەتيش ماناكـەی زۆر فراوانـە ، شـوێنی كۆبونەوەی موسـڵمانانە ، جێگـەی ئـازادی و يەكـسانيە : شـوێنی ئـارامی دڵەكانـە ، وە

جێگەی زانست و زانیاری یە ، واتە دەرس خوێندن وەکو لەفەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە : هەر کۆمەڵێ لەماڵێ لەماڵەکانی خوا دانیشن و ﴿ یتلون کتاب الله ویتداسونە بینهم ﴾ دیراسەی قورئان بکەن ئەوە ڕەحمەتیان بەسەردا دەبارێ،وشەی (یتداسونە) هاوبەشە لە نێوان قوتابی و مامۆستادا ! وە مزگەوت جێگەی ئیعتکافە و برایەتی و فەرمان ڕەوایی ئیسلامە ،نەوەك جێگەی (شین و شایی )،یەکەم کاری پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینە دروست کردنی مزگەوت بوو . ئەو خزمەتەی مزگەوت پێشکەشی دەکات بۆ جەماوەر هیچ دام و دەزگایەکی تر ناتوانێ بیکات ، ئەگەر مافی خۆی بدرێتێ !! ئازاد بێ ، وەکو شوێنەکانی تر ، بەلام زۆر بەداخەوە ! خەڵکانێکی بێوەفا بەرامبەر مزگەوت ـ کە پەروەردەی شوێنی ترن ! بەناوی بەرژەوەندی گشتی وپاراستنی حورمەتی مزگەوت دەیانەوێ نەخشەی ناحەزان بەجێ بێنن و لە ڕۆڵی مزگەوت کەم بکەنەوە بەناوی ڕێزەوە بێ ڕێزی دەکەن و چۆڵی دەکەن ، بیکەنە دائیرەی حکومی،کەنوێژی کرد خێرا دایخەن (کلمةحقٍ یرادبها الباطل )،یان بەبیانوی حەوانوەی ماڵەکانی دەوربەری بڵند گۆکانی کزو کەم بکەنەوە ! لە ولاتی ئیسلام دا ! هەرچەندە مزگەوت منارەی بەرز بێت و بۆیاغی جوان بێت ! بەلام گەر داخرا بێت لە قوتابی ، بەناوی مەنعی سیاسەتەوە ، لەکاتێکدا هەموو سیاسەتێ ئازاد بێ تەنها سیاسەتی ئیسلام نەبێ !!بەداخەوە کە لە شەڕو ئاژاوەی ناو عێراقیش دا بەفیتی داگیر کەران سوکایەتی زۆر کرا بەمزگەوتەکانی ناوەڕاست و خواروبە سوتاندن وتالان کردن وتەقاندنەوە !جا کێ لەو کەسانە زاڵم ترن کە ناوا بەماڵی خوا دەکەن !! یاسای کەنیسە دەسەپێنن بەسەر مزگەوتدا! ڕۆژوو گرانی ماڵی خوا با لە خەوی غەفلەت بە ئاگابینەوە،لەپیلانی ناحەزانی مزگەوت ئاگاداربین ، با مزگەوتەکانمان مزگەوتی دوای فەتح بن،نەك مزگەوتی حەرامی پێش فەتح کە (٣٠٠) بتی تێدابوو ، بزانن کە تاغوتەکان دەیانەوێت لە ڕێگەی مزگەوتێکی (ضرار ) وە ئیسلامێکی ڕواڵەتی بێ ناوەڕۆك بە خەڵکی بگەیەنن ، کە باسی جیهاد و حوکمی خوا و خەلافەتی ئیسلامی

تێدا نەکرێ ، بامافی مزگەوتەکان بدەین و غەریب نەبن لە ناو ماندا و لە دوارۆژدا شکاتمان لێ بکەن ، با لەدوای ڕەمەزان مزگەوتەکانمان بەچۆڵی جێ نەهێڵین ، باهەموو کات دڵمان بە مزگەوتەوە بەسراوە بێ تا لەژێر سێبەری عەرش و خوا و لەگەڵ مزگەوتان حەشر بکرێین .

## ڕەمەزان مانگی برایەتی و لێبوردنە

تەبایی وبرایەتی وخۆشەویستی وپێکەوە ژیان ئامانجی پەیامی خوایە،کە بەوهۆیەوە سەر زەوی ئاوەدان دەبێتەوە،بۆیەدەبینی زۆرلە فەرمودە ونایەتەکان داوای یەك ڕیزی و برایەتی و پێکەوە ژیانمان لێدەکەن،خوای گەورە دەفەرموێ:﴿واعتصموابحبل الله جميعا ولاتفرقوا ﴾ واتە: دەست بەرێسمان و پەیامی خواوە بگرن پەرتەوازە مەبن،پێغەمبەر(ﷺ) هانمان دەدات کە دورکەوینەوە لەوشتانەی کە هۆکاری ئاشوب و خراپەن و برایەتی لەناو دەبەن ، فەرمویەتی:**لا تباغضوا،ولا تقاطعوا،ولا تحاسدوا، ولا تدابروا، وكونوا عباد الله اخوانا}** (متفق علیه)واتە : ڕقتان لەیەکتری نەبێت ،پەیوەندیتان پێکەوە مەپچڕێنن ،حەسودی بەیەکتری مەبەن، چونکە هەریەك لەمانە ئەوی تری لێدەکەوێتەوە.ئاگاتان لەیەکتر بێت و پشت لەیەکتر مەکەن ، وەبەندەی خوا و برای یەکتر بن .وە خوای کاربەجێ فەرمویەتی : ﴿انما ا لمؤمنون اخوة﴾(حجرات)واتە:بەتەنهابڕواداران برای یەکترن،برایەتی ئیمانی گەورەترە لە برایەتی حیزبی یان نەسەبی ، چونکە برایەتی نەسەب ، بەهۆی خوێنەوە یە کە خوێن پیسە ، وە دایك و باوك لەسەری شاهیدە، بەڵام برایەتی ئیمانی لە ڕێگەی باوەڕەوەیە و باوەڕ پاکە ، وە خوداش لەسەری شاهیدە . تەنها بەرنامەکەی خوایە کە خەڵکی دەکاتە برای یەکتر ، بەپەرستنی یەك خودا و بونی یەك پێشەوا ، یەك بەرنامە و یەك ڕووگە ؛ کە بەو هۆیەوە دەنگ و ڕەنگمان یەك دەبێت و بەهێز و پێز دەبین بەختەوەری دنیا و دوارۆژ دەبین لە ڕاستی دا ووشەی ( ڕاستی و برایەتی و خۆشەویستی) هەموو لایەك

داوای دەکەن بەلاّم گرنگ ئەوەیە بەکردەوە ئەنجام بدریّ ! . لەزۆر جێگا دروشمی برایەتی بەرزکراوەتەوە ، بەلاّم لەکویّ ئەو ڕاستی یە بینراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دروستی کرد لەناو هاوەلاّنی دا ، لەنێوان مهاجر و ئەنصاردا ، لەنێوان ئەوس و خەزرەج دا، دوای ئەوەی کەچەند سالّ بوو شیر وتیریان لێك دەسو، بەنیعمەتی ئیمان بون بەبرا چەند دلّگیرە ئەو برایەتیە ! سەلمانی فارسی ایرانی بوو،صوهەیب ڕۆمی بوو، بیلال حەبەشی بو، کە هەریەکەیان لەولاّت و گەلێکی جیاواز هاتبون،وە هەموویان مەجلیسی شوراوئال و بەیتی پێغەمبەربون(ﷺ)،لەکاتێکدا(ئەبولەهەب)مامی بو،بەلاّم ئایەتی هەڕەشەی لەسەر دابەزی ﴿تبت يدا أبي لهب ﴾وە هەروەهاکوڕەکەی حەزرەتی نوح چونکە لەڕیزی باوەڕداران نەبوو خواپیّ ی گوت ئەو ئەهلی تۆنیەچونکە کردەوە و باوەڕی خراپە،خۆ ئێمە کوردی موسلّمانین،بەلاّم لەکویّ ئەوبرایەتی ویەك ڕیزیە، چون بەتەواوی پابەند نین بەیاساکانی شەرعەوە،چونکە قورئان فەرمان ڕەوانیە،دەی بائێمەش شوێن کەوتەی ئەو پێغەمبەرە بین کە ناونیشانەکەی﴿وماأرسلناك الا رحمه للعالمين﴾ڕەحمەتە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی نەك بۆ عەرەب،با کوردایەتیمان هەلّقولاّوی یاسای ئیسلام بیّ،بەدەردی عەرەبەکان نەچین کە عەرەبایەتی وئیسلامەتیان لێك جیاکردەوە بۆیە بوون بەزیاتر لە(٢٣)پارچە وزەلیل و ژێردەستەن بەهۆی جیاکردنەوەی دین لە دەولّەت ! ئێستاش کەکۆتایی ڕەمەزانە وبەرە و جەژن دەچین با چێومالّی نەفسی خۆمان بکەین،لەغەرەزوبوغز پاکی بکەینەوە ، ئێستا هەلێکەبۆچاوپۆشی لەیەکتروپاکردنەوەی دلّەکان،بۆدروستکردنی برایەتی و خۆشەویستی، بەکردەوە نیشانی بدەین کەسودمان لەم مانگە پیرۆزە وەرگرتوە،ڕاستی و لیّ بوردن و برایەتی هەوێنی سەرکەوتنی دنیاودواڕۆژە کەئەوانیش بەرهەمی تەقواو عیبادەتە ، بۆئەوەی کارەکانمان لەدنیادا سەربگریّ ولە قیامەتیش بەربگریّ با تەبا وبرابین .

**برایەتی ویەکگرتن تەنهالەئیسلامدایە..هەرگیزدودلّ نیم لەوەچونکەفەرمودەیخوایە**

# ڕەمەزان مانگی بەهێزکردنی پەیوەندیەکانە

ڕەمەزان قوتابخانەیە وخولێکی پەروەردەییە،تێدا فێری سەرجەم ئاکار وڕەوشتە بەرزەکان دەبین،چاککردن وبەهێزکردنی عیلاقە وپەیوەندیەکانمان لەگەڵ خواداو،نەفسی خۆماندا و لەگەڵ دەوروبەردا .چونکە لەو مانگەدا خەڵکی بەگشتی تا ئێوارە پێکەوە بوون لە مزگەوتەکاندا ، وەکو یەك خێزان ، وە بەسەرکردنەوەی یەکتری لەرۆژی جەژندا، وەپاك بوونەوەی دڵ و دەرونەکان ماوەیەدا ئەوانە هەموویان فاکتەری ئیجابین بۆ بەهێزکردنی سەرجەم پەیوەندیەکان،بۆئەم مەبەستەدەچینەخزمەت ئەم فەرمودەیەکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی{اتق الله حيث ماكنت،واتبع السيئةالحسنة تمحها،وخالق الناس بخلق حسنة}(رواه أحمد والنسائي والحاكم)

١ـ پەیوەندیت لەگەڵ خوای گەورەدا(اتق الله حيث ماكنت ) دەبێ لەسەر بنەمای تەقوا بێت ، لەهەموکات و شوێنێ هەردەم لەخواترس بە،گەردن کەچ وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەن ، هەموو کات هەست بە چاودێری خوا بکە،کار بەبەرنامەی خوا بکە ، ئەم بابەتە بەدرێژی باسمان کردوە.

٢ ـ پەیوەندیت لەگەڵ نەفسی خۆتدا (واتبع السيئة الحسنة تمحوها ) واتە : لەگەڵ خۆت دا بەم شێوە یە ڕەفتار بکە ، مەیەڵە دڵ و دەرونت ببێتە زبڵدان و شەیتان گەرای بیرو وەسوەسەی خراپی تیا دابنێ ، گەر کارێکی خراپ و نابەجێت کرد،خێرا چاکەیەکی بەدوا بکە و دەیسڕێتەوە،خوا فەرمویەتی:﴿ان الحسنات يذهبن السيئات﴾واتە: کردەوە چاکەکان کردەوەخراپەکان ڕادەماڵن و دەیان سڕنەوە ،دەبادڵ ودەرونمان هەردەم بەپاکی ڕابگرین بەهۆی چاکەکاری یەوە ، چونکە هەموو خراپەیەك خاڵێکی ڕەشە بەسەر دڵەوە ، بەڕاستی سەرفراز بوو ئەو کەسەی تەزکیەی نەفسی خۆی کرد ، ﴿قد أفلح من زكاها ﴾ .

٣ ـ پەیوەندیت لەگەڵ خەڵکدا:( وخالق الناس بخلق حسنة)پێویستەعیلاقە وتێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکی دەوروبەردا ، لەسەر بنەمای خوڕەوشتە جوانەکان بێت ، لەچوار چێوەی

بەرنامەکەی خوادا ، کە هەمووی مرۆڤ دۆستی و کردار و ڕەفتاری جوانە ، چاکە ئەوەیە کە لەتەرازوی خوادا چاك بێت ، نەك بە مۆدێل و قسەی خەڵك ، دەبێ سەرمەشقمان ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە بێت کە خواله وەسفی دا فەرمویەتی :﴿ وانك لعلى خلق عظيم﴾ بەڕاستی تۆ لەسەر جوانترین ڕەوشتی . کەسەرجەم هەڵس و کەوت و ڕەوشتەکانی قورئانێکی زیندوو بوو ، وەکو عائیشە (خ) دەڵێ: (كان خلقه القرآن) وە موسڵمان بەڕەوشتی جوان دەگاتە ڕۆژوگری شەو بێدار ، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : {ان المؤمن ليدرك بحسن الخلق درجة الصائم القائم } (رواه أبوداود) . وە لەتەرازوی دوارۆژدا خورەوشت زۆر قورس و گرانە و لەئامانج و مەبەستی پێغەمبەرانە ، وەك فەرمویەتی : {انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق } (رواه أحمد وغيره) . ڕەوشتی جوان و شیرین واتە ڕاستی و پاکی و چاکی کە بەرهەمی ئیمانە ، کۆمەڵ بەوەپێش دەبات ، ئاسودە دەبێ ، وە بە پێچەوانەشەوە ، با هەموومان بەخۆماندا بچینەوە ، بەتایبەت لە شەوانی قەدر ری پیرۆزدا ، بۆ دوای ڕەمەزان ، بزانین پەیوەندی یەکانمان لەچ ئاستێکدایە؟ تاچ ئەندازەیەك ئێمە پابەندین بە ڕەوشت و ئاکارە ئیسلامیەکان ، پێشێ پەیوەندیمان لەگەڵ خوادا هەڵسەنگێنین چونکە سەرچاوەی پەیوەندی یەکانە ، چون کەسێ لەگەڵ خوا ڕاست نەبێ قەد لەگەڵ خەڵکی خوا ڕاست نابێ ، تەنانەت لەگەڵ خۆیشی دا ڕاست ناکات ، دەی بالەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵگا و دەوڵەت ، لەبازنەی دینداریمان دا پەیوەندی یەکان چاك و پاك بکەین . بارەمەزان بکەینە خولی بەهێزکردنی پەیوەندی یەکان ، بۆ بەختەوەری و سەرفرازی هەردوو دنیامان .

# بەردەوامی وڕاوەستاوی (الإستقامة)

هەمووشتێ سەرەتاوکۆتایی هەیەورەمەزانیش بەکۆتاگەیشت،بەلاّم کێ قازانجی کردوو بردیەوە؟وەکێ بەڕووزەردی مایەوە؟بێگومان ئەوانەی بەفرمێسکی چاو و زمان بە زیکری قورئانەوەشەوانی قەدریان لاوانەوە،بەتەوبەپەڕەیەکی تازەیان لەژیان هەلّدایەوەو پاشانیش بەردەوام بون لەپاراستنی دەستکەوتەکانی ڕەمەزان بەاستقامە وبەردەوامی لەتاعەتی خوا لەدوای ڕەمەزانیش وەبەدور کەوتنەوە لەحەرامەکان بە هۆی بەربەستەکان کەدەبنەقەلّغان ودیوارێکی پتەولەڕووی ئەنجامدانی تاواندا کە زانایانی شەرع بە(زواجر،وموانع)ناویان بردووەوەك چۆن پسپۆڕانی بواری سەربازی هێلّی بەرگریان هەیەئەوانەش بەوشێوەیە دەبنە بەربەست وڕێگرلەئەنجامدانی تاوان کەبریتین لە(هەستکردن بەچاودێری خوایی،بیرکردنەوە لەنارەحەتیەکانی قەبروقیامەت وهەستکردن بەنیعمەتەکانی خوا)

**الإستقامة:** واتە بەردەوام بون لەتاعەت و عیبادەتی خودا(**لزوم طاعة الله تعالى**) ئیستقامە لێکدانەوەوپێناسەی جۆراوجۆری بۆکراوەلەوانە:(**لزوم الصراط المستقيم بالاخلاص والاتباع**) واتە پابەندبوون لەسەر ڕێگەی ڕاست بەدلّسۆزی وشوێن کەوتنی واتەبۆخودابێت وبەپێی شەرعی خوابێت،وەهەروەهاپێشەوائەبوبکر(خ)بەم شێوەپێناسەی کردووە:(ان لايشرك باللهشيئا،ان يستقيم القلب على التوحيد) بەمانای هاوەلّ بڕیار نەدان بۆخواو ساغبونەوەی دلّ لەسەریەك خواناسی ویەکتا پەرستی،پێشەواعمر(خ) بەم شێوەیە پێناسەی کردووە:(**ان يستقيم على الطاعة ولايرغن روغان الثعاليب**) واتەبێ پێچ وپەناو بەڕاستی ئەنجامی بدات، پێشەواعوسمان(خ)دەلّێ:(**تحقيق الاخلاص فى الاقوال والافعال**) بەرجەستەکردنی دلّسۆزی لەکرداروگوفتاردا،وەپێشەوا علی(خ)بەئەنجامدانی فەرزەکان پێناسەی کردووە(**هى اداءالفرائض**)،خوای بالاّ دەست و کاربەجێ بەپێغەمبەر وشوێن کەوتوانیشی دەفەرموێ{ فاستقيم كما أمرت ولاتتبع أهوانهم }واتە نوەکوفەرمانت پێ کراوە بەردەوام بە لەسەردینی خواسارد مەبەرەوەوشوێن هەواوئارەزوی ئەوان مەکەوە،

مانای وایەئەی موسڵمان تۆش شوێنکەوتەی پەیامی خوایی بەگوێ بەلۆمەی نەفامەکان مەدە،لەپێغەمبەردا(ﷺ)هاتوە{وكان أحب الدين أليه مادوام صاحبه عليه(متفق عليه)واتە:چاکترین وخۆشەویسترین دینداری لای خوائەوەیە کەبەردەوام بێت باکەمیش بێ بەداخەوە هەندێ لە موسڵمانان دەبینی کەماوەیەك زۆر گەرم و گوڕن لەسەرخواپەرستی و دینداری دوایی سارد دەبنەوە،کەڕەمەزان تەواو بوونەوانیش تەواوی دەکەن دینداریەکەیان گڕو فرێکە! سوربون و بەردەوامی فەرمانی خواوپێغەمبەرە(ﷺ)ومەرجی سەرکەوتنە، ئەگەرلەڕەمەزاندا ڕۆژی جوزئێك قورئانت خوێندوە دوای ڕەمەزان وازمەهێنەولانی کەم پەنجائایەت بخوێنە، بەهەمان شێوە لەخێر وصەدەقە، لەجەماعەتی مزگەوت وە لە ... هتد، بەردەوام بە، ئێوەش دایکان و خوشکانی بەڕێز: کە لەڕەمەزاندا فەرمانی خوا بەجێ دێنی و خۆت داپۆشیوە،بۆچی کە ڕەمەزان تەواو بووبەرگی شەرعی فڕێ دەدەی دەچیەوە ناو مۆدێل و هەوا وئارەزوی شەیتانی؟خۆ فێڵ لەخوا ناکرێ (پەنا بەخوا )جا پێویستە موسڵمان تا مردن لەتەقوای خوادا بێت ،چونکە بەرەکەت وسەرکەوتن لەبەردەوامی دایە، بەڕێزان، ئەوەتا(أبن حجرعسقلانی)ئەو زانابەرز وبەڕێزە،کاتێك لەخوێندن سارد دەبێتەوە، ڕۆژێ دەچێتە شوێنێ دەبینی دلۆپە ئاوێك بەبەردەوامی ئەتکێتە سەر بەردێ سەرنجی دا بەردەکەی چاڵ کردبوو لەو دلۆپە بچوکە بەهۆی کاری بەردەوامی خۆی توانی بوی شوێنی خۆی بکاتەوە لەسەر ئەوبەردە ڕەقەگەورەیە!لەم کارە پەندی وەرگرت و گرنگی ئیستقامە وبەردەوامی بۆ دەرکەوت تالە ئەنجامدا بوو بە ئەو زانا گەورەیە بەوهۆیەوە بوو لەقەبی (ابن حجر)وەرگرت ئەینا کەس کوڕی بەرد نیە،وە ناویشی (ئەحمەدی کوڕی علی)خەڵکی عەسقەلانی سوریایە،زانایەك دەڵێ:ئادەمیزادلەکاتی بەرەنگاربونەوەدا لەگەڵ دوژمندا، هەندێ جار قاچەکانی حەزی لە هەڵاتنەولاق چەقیو نابێ بۆیە لە پاڕانەوەکەدا لەم ئایەتەدائاوا هاتوە﴿..وثبت أقدامنا .....﴾خوایەلاق چەقیوو خۆڕاگرمان بکەی بەرامبەر دوژمن،ئیستقامە وبەردەوامی سەرفرازی دنیاودواڕۆژە،خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة أن لاتخافوا ولاتحزنوا وأبشروا بالجنة التي كنتم توعدون﴾(فصلت:٣٠) واتە ئەوانەی پشتیان بەخوای خۆیان بەست و بەردەوام بون لەعیبادەت و لە ناحەزانی دین نەترسان وساردنەبونەوە ئەوانەکاتی مردن مەلائیکەی رەحمەت دێنە لایان ومزگێنی بەهەشتیان پێدەدەن وە پێیان دەڵێن‌ئێوە توشی ترس و نارەحەتی نابنەوە لە ئەنجامی دینداری بەردەوام بچنە ئەوبەهەشتەی پەیمانتان پێ دراوە ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بە عبدالله کوری عمری کوری عاص{**یا عبدالله لاتكن مثل فلان كان يقوم من الليل فترك قيام الليل**} (**متفق عليه**)واتە ئەی عبدالله وەك فلان کەس نەکەی کە شەو نوێژی دەکردودوایی وازی لێ هێنا،(ابی عمرو)(خوای لێ رازی بێت)دەڵێ: ووتم بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکم پێ بڵێ زۆر گرنگ بێ وە لەتۆ زیاترداوا لەکەسی ترناکەم؟لەوەلامدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی:{**قل: أمنت بالله: ثم استقيم** } (مسلم)واتە: بڵێ باوەری تەواوم بەخوایە (بەرنامەکەی پیادەئەکەم)پاشان بەردەوام وخۆراگر بە،بەراستی بەردەوامی و(ثبات ) زۆرپێویستەلە دینداریداهەرچەندە ئەم کارە لەم رۆژگاری ئاخیر زەمانەدا کارێکی ئاسان نیە،بەڵکو گرانە بۆیەخێر وپاداشتی گەلێ زۆرە(الاجرعلى قدرالمشقه)ئیستیقامە پێناسی راست ودروست بۆخاوەنەکەی دیاری دەکات وکەسێتی دەپارێزێت ومتمانەپێکراودەبێت،نەك وەك ئەوانەی لەسەرەتاوەباش بوون پاشان دۆراون وگۆراون بۆنمونە: بینراوەتاهەژاربووەبەدین بووکەدەوڵەمەندبوودۆرا! تا لێرەبووبانگخوازبووکەچووبۆهەندەران دۆرا، لەسەر مینبەردەگریاکاتێ پلەوپۆستی وەرگرت وەك جاران نەما،لەرەمەزانادادینداره..دوای رەمەزان لاروخوارە! رەمەزانیش وا بنەوبارگەی پێچایەوە ومالً ئاوایی کرد،نازانی سالێکی تر بەخزمەتی دەگەینەوە یان نا وابزانەکۆتارەمەزانتە،باناگامان لەو وەعدوپەیمانانە بێت کەلەومانگەدابریارمان لەسەردابو وەفاداربین بەرامبەریان، باخۆمان بەدرۆزن دەرنەکەین باخۆراگر ولاق چەقیو بین،وانەزانین دینداری تەنها لەرەمەزان دایە،دوایی دەست بکەینەوە بەخراپەوتاوان بەهۆی چاولێکەری

یان لەبەرلۆمەی لۆمــە کاران،بەڵکوپێویــستە هــەمووژیانمان دینــداری بێــت تالەســەرئیمان وئیسلام بژین وبمرین تا خوارازی دەبێت وخەڵکیش رزگاری بێت ،موسڵمان دەبێت وێنەی دارخورما هەمیشە سەوزوخۆراگر و بــەهێز بێــت بەرهــەم و میــوەی شــیرینی ئیمانەکــەی پێوە دیاربێت ،موسڵمانی قورئانی بین محمدی بین نــەك شــەرقی و غــەریبی لبــا لەرەمــەزان وانەی زۆرمان وەرگرتبیَ تابەهۆیەوەدوای رەمەزانیش بەردەوام بین لەچاکە وخۆمان پــیس نەکەینەوە،وەك زانایانی پێشین فەرمویانە:(کـن ربانیـا ولاتکـن رمـضانیا)خـوا ویــست و خواپەرست بن نەك رەمەزانیلە بن ! کەرەمەزان مانگی خۆگرتنەوەبولەخواردن وخواردنەوە ئەوا دوای رەمەزانیش خۆگرتنەوەیەلەگوناهوتاوان،(شیخ الاسلام ابـن تیمیـة) فەرمویــەتی: نیــشانەی قبولّبــونی رەمــەزان بــەردەوام بونــە لەســەرتاعەت وعیبــادەت دوای رەمــەزان، بەکایگەری رۆژوی رەمەزان،خوای میهرەبان ئەم مانگەی لیَ وەرگرتبین خێـری لەیلــەت و قەدرمان بەنسیب بکات وەلێمان رازی بێت و ئەم دینەمان بۆ بکات بــەحاکم ،خــۆراگر و بەردەوام بین،خــوات لەگــەڵ مــانگی رەمــە زان ...خــوات لەگــەڵ پارشــێو و بــەربانگ ...

الوداع .. الوداع .. یا شهر رمضان الوداع

# لەگەڵ جەژندا

**ئەوا جەژنی ڕەمەزان جارێکی ترهاتەوە... بەمزگێنی وجەژنانەو نیعمەت و خەلاتەوە بادروشمەکانی خواگەورە بن بەلاتەوە..هەرکەس ڕێزیان لێبگرێ تەنهائەودەیباتەوە**

هەموگەلانی جیهان جەژن وبۆنەی تایبەتی خۆیان هەیەلەوڕۆژەداخۆشی خۆیان دەردەبڕن، بۆنەوجەژنەدنیایەکان تایبەتەبەشتی دنیاوەوخۆکردەوەك بۆنەنیشتیمانی ونەتەوەییەکان، بەڵام بۆنە ئاینیەکان خواکردە،موسڵمانانیش خاوەنی دوو جەژنی ئاینی سەرەکین،ئەویش جەژنی قوربان وڕەمەزانە،جەژنی قوربان بە(ایام التشریق)وەچوارڕۆژەبەڵام جەژنی ڕەمەزان تەنها یەك ڕۆژە،جەژن لەدایك بونێکی تازەیە،جەژنی لەخوا نزیك بونەوەو سەرکەوتنە بەسەرنەفس وشەیتاندا،جەژنی خۆشی و تەواویشمان سەرکەوتنمانە لەلەدادگای خوا لە ڕۆژی قیامەت وڕۆیشتن بۆبەهەشتە،خۆشی جەژنی ڕەمەزان بۆ ڕۆژوگرانە،هی قوربانیش بۆ حاجیانە،ئەم جەژنەبەعەرەبی جەژنی(فِطر)ی پێدەوترێ،واتە دەمکرانەوە لە خواردن، (راغب)دەڵێ:هەردووچەکی(فِطر،فِطرَة)هاوشێوەن ونزیکن لەیەکتر،چونکەڕۆژوی ڕەمەزان دەتباتەوەسەرسروشتی بنەڕەتی خۆت(فیترەتی اصلی)کەپاکی وچاکیە

**ئادابی جەژن**

١ ـ پێویستە زەکاتی سەرفیترەی دابێ پێش نوێژی جەژنی ڕەمەزان .

٢ ـ سوننەتە بۆنوێژی جەژن خۆت بشۆی .

٣ ـ موستەحەبەچەنددەنکەخورمایەك بخۆی پێش چونت بۆنوێژ،پێغەمبەر(ﷺ)تاچەند دەنکێ خورمای نەخواردایەنەدەچوو بۆنوێژی جەژنی ڕەمەزان،(پێشەوا بخاری گێڕاویەتیەوە) بەڵام لە قورباندامەیخۆ .

٤ ـ سوننەتە لەڕۆژی جەژندا،هەواڵ پرسین و ڕووخۆشی و چاك وچۆنی گەردن ئازادی و دوعای خێرکردن ڕاستگۆیانە و صادیقانە نەك چوکلاتە وڕاکردن .

هاوەلآن کەلەجەژندا بەیەکتردەگەیشتن دەیان گوت (تقبل الله منا ومنکم )واته :خوا لە ئێمە وئێوەشی قبولّ کردبیّ ،لەکاتی تەوقەکردندا .

٥ ـ لەبەرکردنی جل و بەرگی حەلالّ و جوان بە پیّ ی توانا .

### ٦ـ دڵی خەڵك خۆش بکە:

یەکێك لەورێگایانـەی کەبەهۆیەوەخوالـەخۆت ڕازی ئەکـەیت ئەوەیەکـەدڵی خـەلکی خـۆش بکەیت،حەزرەت(ﷺ) فەرموویەتی:(ان احب الاعمال الی الله تعالی بعد الفرائض ادخـال السرورعلی المسلم)واته:باشترین کردەوەی لای خوای پەروەردگارلەدوای فـەرزەکان خۆشـیە کەبیدەی بەموسڵمانێك،بزانەچی دڵی دەوروبەرەکـەت خـۆش دەکـات حـەزرەت(ﷺ)زیـاتر ئەمە ڕوندەکاتەوەو دەفەرموێت(تکشف عنه کربا،اوتقضی عنه دینا،اوتطردعنه جوعـا) واته:(بەلأوموسیبەتێکی لـەکۆلّ کەیتـەوە،یان قـەرزێکی بۆبەیتـەوە یـان برسـێتی لیّ دوور خەیتەوە) ئنجاحەزرەت(ﷺ) دەفەرموێت: (ولان امشی مع اخی المسلم فی حاجة احب الی من اعتکف شهرا فی المسجد) واته: ئەگەر لەگەلّ برایەکی موسڵماندا بڕۆم بۆجیّ جیّ بەجێکردنی کارێکی بەلامەوە باشترە لەوەی مانگێك لەمزگەوتدا ئیعتیکاف بکەم!.

<u>دورکەوتنەوە لەدیاردەی هەڵەونەگونجاو :</u>

١ ـ تێکەڵی ژن و پیاوی نامەحرەم ،بەتایبەت لە شارەکاندا ئەم دیاردەیە زۆربلأوە ، وە تەوقەکردن لەنێوان کوڕوکچی نامەحرەم باخزمیشی بیّ .

٢ ـ گۆرانی وڕەش بەڵەك وقومارویاری ناو بازاڕەکان،وەفەسادی ناوپارك وسەیرانگاکان چونکە هەندیّ کەس وادەزانن لەوڕۆژەدا هەرچی بکەی دروستە،لە ڕەمەزاندا خۆی پاك کردۆتەوە دوایی خۆی پیس دەکاتەوە .

٣ ـ خەلکانیّ هەن زۆردلّ خۆشن بەم جەژنە بەلأم دەزانن بۆ؟چونکەڕەمەزانیان لەکۆلّ بۆتەوە بەداخەوەکە ئەم بۆچونە هەڵەیە،بەلکو بۆیە خۆشحالّ دەبین کە خوا یارمەتی داین بۆ گرتنی و تەوا و کردنی مانگی ڕەمەزان .

٤ ـ گران فرۆشی وگران کردنی نرخی کالاّ وخواردەمەنی کەلەویژدان دەرچوە.

٥ ـ ترەقەی منالآن وبەرەلاّکردنیان بۆ کاری دیاردەی نارەحەت کەر،جاران تەقەی گەورەکان بوو ئێستا هی منالآن .

٦ ـ دورکەوتنەوە لە نۆجەژنە وسەرقەبران و تازەکردنەوەی پرسە (تەعزیە) .........

٧ـ بەداخەوە هەندێ لەکەناڵ ومیدیاکانی ناوخۆیی جەژنەکان بەبلاّوکردنەوەی بێ شەرعی و خراپەکاری پیرۆزدەکەن ! کەدورن لە نەریت ویاسای کوردایەتی وئیسلامەتی! تەنها خزمەت کردنی بێگانەیە!!

بەکورتی :پێویستەسەردان ویەکتر بینین وچاك کردنەوەی دڵەعاجزەکان و پابەند بون بە رەوشت و نەریتە ئیسلامیەکان،بەسەرکردنەوەی ماڵی هەتیوان وشەهیدان و هەژاران ،لەم رۆژەدا بەدوێنێدا بچینەوە ئەم رۆو سبەیمان روسوکەین، بازاری خزمایەتی و برایەتی و ئازایەتی و لێبوردن گەرمترکەین،ئەی خواپەرستانی مانگی رەمەزان،دوای ئەوەی خۆتان پاکردەوە جارێکی ترمەگەرێنەوە سەرگوناهو تاوان ،دوربکەونەوە لەگوێرایەڵی نەفس و شەیتان ، ئەو بارەجوانە تێك مەدەن وامەزانن کە رەمەزان تەوابوونیتردینداری وتەقواش تەواو، بەندەی خوابن نەك بەندەی رەمەزان ! ئەینا گلەیی لە رەمەزان مەکەن بەلکو گلەیی لەخۆتان بکەن ، چونکە ئەگەر رۆژی چەندجارخۆت بشۆی دوای بچیتەوە ناو پیسی وەکوخۆی پیس دەبیەوە!هیوادارین کەرێزی خۆی لێببگرین،چاولەدەستورومۆدیلی بێگانە نەکەین بەئومێدی جەژنی یەك جاریان لەخزمەت پێغەمبەرویارانیدالەبەهەشتدا،لە کۆتایدادەڵێین: کاتێ جەژن دێتەوە..گوڵی ژیان ئەبوژێتەوە..موحیببەت نوێ دەبێتەوە ،دەرون دەحەوێتەوە..خەمان دەرەوێتەوە.. نیشتمان دەدرەوشێتەوە، خوات لەگەڵ مانگی رەمە زان ..خوات لەگەڵ پارشێو و بەربانگ ...الوداع .. الوداع .. یا شهر رمضان الوداع.

# جەژن ..ئەوسا و ئێستا

یەکێك لەڕۆژەخۆشەکانی ژیان ڕۆژانی جەژنە،بەدەنگی(الله اکبر)وبۆن وهەلاّمی پلاّوگۆشت وجل وبەرگی جوان..سەردانی خزمان.. زەردەی سەر لێوان..پاکردنەوەی دلاّن،چەند دیمەنێکی دڵگیرن لەپەڕاوی دڵداتۆمارکراون کەمرۆڤ ناتوانێ فەرامۆشیان بکاتن،ئەوسا هەمووشتەکان سادەبوون بەلاّم زۆرشیرین وبوون وتامی تایبەتیان بوو! ئەوساژیان بەهەمو دیمەنەکانیەوەلەئێستاجودابونازانم بۆچی ئەوهەموخۆشیانە کاڵبونەوە،

ئەوسا خەڵك هەژاربوجەژنان پلاّوێکیان دەخواردبەلاّم دڵیان دەوڵەمەند بوو،

ئەوسا جلوبەرگیان کۆن وسادەبوبەلاّم دڵێکی سپی وهەستێکی ناسکی تێدابو،

ئەوسا مرۆڤەکان یەکتریان خۆش دەویست وهاوبەشی خۆشی وناخۆشی یەکتربوون،بەلاّم ئێستا خۆشەویستی لەدڵەوەداخزاوەبۆناوورگ،بۆیەدەڵێن ئۆخەی ئۆخەی هەرکەس بۆخۆی! (ئی خۆم بۆخۆم هی تۆش دەخۆم)!

ئەوسا خەڵکی وەك ئەمڕۆباوەشیان نەکردبووبەدنیادا،کاتیان هەبووبۆسەردان وخزمایەتی، ئێستا ڕەنگی شتەکان بزرکاون،تامی بۆنەوجەژنەکان وەك تام و چێژی ئەومیوانەی لێهاتوە کەڕەنگیان جوانەبەلاّم تامی میوەخۆشەکانی جاران نادەن!خۆشەویستان: ژیانمان بەرهەمی کردەی خۆمانە،ئەوکات بەرەوشتە جوانەکان ژیانی خۆیان کردبوەبەهەشتۆکەیەك،بەلاّم ئەمرۆبەدەستی خۆمان کردومانەبەدۆزەخ!دروشمی جوان بەلاّم قرپۆك..ناوی بێناوەرۆك ڕوکەشی جوان دڵی کرمۆك!کەواتە چی وایکردوەبڵێین: ئای بۆجەژنانی جاران دڵی سافی باپیران..،ژیانی هەژاری ئەوسامان پێخۆشتربێت لەدەوڵەمەندی ئێستا؟!

بەڕێزانم ئێمەدەتوانین بەونیەت وئیمانەی جاران تامی خۆشی ژیان بگێڕینەوە لەیەکترنزیك بینەوەچیترتەنها بۆخۆمان نەژین لەچوارچێوەیەکی تەسکدا.. ئەگەروانەکەین ئەوابەدەستی خۆمان زیندانێکی گەرۆك بۆخۆمان دروست دەکەین!ئەوکاتەش ئۆتۆمبێلی مۆدێل بەرزو کۆشك وتەلار.. دیناروداۆلار.. جوانی یار..سەوزایی بەهار..سیاسەتی ڕۆژگار.. ئاسودەیی

نابەخشن بە دڵی نالەبار، دەباناوڕێك لەڕۆح وهەست ونەست ودڵەکانمان بدەینەوەوبەیادی خواتێریان بکەین تائارام بن وبحەوێنەوە،چونکە ئەوان بەدەستی ئێمەوە زۆرماندوبون،
**بالەجـەژندا:**
دەرگای ماڵەکانتان کراوە بێت ..بەلاّم لەپێشدادەرگای دڵەکانتان بکەنەوە..
پەیوەندی برایەتی وخزمایەتی نەك حیزبایەتی ..
سەردانی خزمان نەك سەرقەبران..
جەژنێکی خۆش ـ ڕۆژێکی خۆش ـ دڵێکی خۆش

## ئەو ڕۆژانەی سوننەتە تیایاندا بەڕۆژووبین

**١ـ شەشەلاّن ـ شەش مانگی شەوال :**

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:(**من صام رمضان ثم أتبعه ستامن شوال كان كصيام الدهر**)(رواه مسلم) لەگێڕانەوەی(احمد وطبراني )(فقدصام السنه)،واتە: هەرموسڵمانێك مانگی ڕەمەزانی گرتبێ و بەدوایدا شەش ڕۆژی مانگی شەوال بگرێ،ئەوە وەکوهەموو ژیانیان هەموساڵەکەبەڕۆژووبێ وایە،وەلە ڕیوایەتی سەوبانداهاتوەکە(ابن ماجەونەسائی) گێڕاویانەتەوە:(**خرج من ذنوبه كيومٍ ولدته أمه**)واتە:لەتاوان پاك دەبێتەوە،وەکو ئەو ڕۆژەی کەتیایدا لەدایك بووە؛ بزانەمناڵ چەندەپاکە؟سوپاس بۆ پەروەردگاری بەبەزەیی کەڕۆژوی فەرزکردەوەلەسەرمان لەڕەمەزاندابۆئەوەی ببێتەپاك بونەوەمان لەگوناهوتاوانی (١٠)مانگ، وە بۆدوو مانگەکەی تریش شەش ڕۆژی سوننەتی شەوالی داناوە،تاکو ساڵە کەبەپاکی ڕابرێ بەسەرماندا،چون ساڵ دەڕوات و ناگەڕێتەوە ، کەسیش بێ تاوان نیە ، هەموو هەناسەدانێك لەتەمەنمان کەم دەکاتەوە،بەرەو مەرگ دەچین ، مەرگیش بەرەو

ئێمە دێت(وكل آت قريب)هەموو داهاتویەكیش نزیكە،كەواتە: ٣٠×١٠ = ٣٠٠ ،وە شەش ڕۆژی شەوال(٦×١٠= ٦٠ )كەهەموی دەكاتە ژمارەی ڕۆژەكانی ساڵ(٣٦٠) ڕۆژ . جەژنی ڕەمەزان یەك ڕۆژە،چاكتر وایە لەدووەم ڕۆژی شەشەكانەوە بەڕۆژوبی،بەدوای یەكدا بن چاكە،بێ پچڕان، وەك (ئیمامی ئەبوحەنیفە وشافعی)(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ) ڕایان وایە،چونكە ورگ لەسەر ڕەمەزان دەقی گرتوە،بۆ پشوی ڕیخۆڵەكان باشترە،وەدەتوانی بەئارەزوی خۆت لەومانگەدادووشەمە وپێنج شەممان بیان گری،خوای گەورە یارمەتیمان بدات بۆگرتنی ئەم شەش ڕۆژوەش ، تاكوخێری سەرجەم ساڵەكەمان بۆ بنوسرێ

٢ ـ **لەهەموومانگێكداسێ ڕۆژ:** (ئەبی دەردا (خ) لە پێغەمبەرەوە(د.خ) ئەگێڕێتەوە **{اوصاني حبيبي بثلاث لن أدعهن ما عشت : بصيام ثلاثة أيام من كل شهر وصلاة الضحى وبأن لا أنام حتى أوتر }**(رواه مسلم رقم ٧٢٢) واتە : **خۆشەویستم پێغەمبەر** (د.خ) ئامۆژگاری كردم بەسێ شت هەتا لەژیاندا بم وازیان لێنەهێنم : بەڕۆژوبونی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێكدا ،كردنی نوێژی چێشتەنگاونوێژی ویتر پێش ئەوەی بخەوم .

٣ ـ **دووشەممان وپێنج شەممان :** ئوسامەی كوڕی زەید(خ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی:(**تعرض الاعمال يوم الاثنين والخميس فأحب أن يعرض عملي وأنا صائم**)(رواه أصحاب السنن) واتە:كردەوەكانی مرۆڤ لە ڕۆژانی دووشەممە وپێنج شەممە داپێشانی خوای گەورەدەدرێن لەبەرئەوەپێم خۆشەكاتێ كردەوەكانم پیشانی خوای گەورە دەدرێن كە بە ڕۆژوبم .

٤ ـ **ڕۆژوی عەرەفە بۆ كەسێك كەلە حەجدا نەبێ :**

ئەبوقەتادە(خوای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی (**صيام عرفة أني أحتسب على الله يكفر السنة التي بعده والسنة التي قلبه**)(رواه الترمذي رقم ٧٤٩) واتە: ئومێدم وایە ڕۆژوی ڕۆژی عەرەفە تاوانی ساڵێك لەوەو پێش و ساڵێك لەوە و پاش بسڕێتەوە .

٥ ـ ڕۆژوی موحەڕەم : ئەبوهورەیرەئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی(**أفضل الصیام بعد صیام شهر رمضان شهر الله المحرم**)(رواه الترمذی واتە:گەورەترین ڕۆژوو دوای مانگی ڕەمەزان ڕۆژوی مانگی موحەڕڕەمە.

٦ ـ ڕۆژوی عاشورا:ئەبو قەتادە:(خ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی: (**أن النبي (صل الله علیه وسلم ) قال صیام یوم عاشوراء أني أحسبت علی الله أن یكفر السنة التي قبله**)( رواه الترمذی رقم ٧٥٢)واتە : ئومێدم وایە لای خوای گەورە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عاشورا (دەی مانگی موحەڕەم) گوناهی ساڵێ پێشی بسڕێتەوە .

٧ ـ ڕۆژ نا ڕۆژێك : عەبدولاَی كوڕی عومەر(خ) ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی(**أحب الصیام الی الله صیام داود،كان یصوم یوماویفطریوما**)( رواه البخاری) واتە:خۆشەویسترین ڕۆژوو بەلای خواوەڕۆژوی داودپێغەمبەربووە(علیە السلام) كە ڕۆژێك بەڕۆژوودەبوو ڕۆژێك بەڕۆژوونەدەبوو .

٨ ـ نۆ ڕۆژلەسەرەتای مانگی(ذی الحجة)

هەندێك لە خێزانەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕنەوە و دەڵێن: {**كان رسول الله یصوم تسع ذي الحجة** } (رواه ابوداود رقم ٢٤٣٧ وهو حدیث حسن).

بەوتەی شێخی ئیسلام(ابن تیمیە)كۆتایی دێنم كەفەرمویەتی: وبەردەوامی لەعیبادەت بەگرتنی ڕۆژووە سوننەتەكان ئیستیقامەت وخۆڕاگری لەدوای ڕەمەزان نیشانەی گیرابونی ڕۆژوی ڕەمەزانە).ربناتقبل منااںك انت السمیعُ العلیم وتب علینااںك انت التواب الرحیم....

الحمدُللهِ علی التمامِ فی البداءِ وفی الختامِ و فی الدوامِ

# پێرست

پێرستی بەرگی یەکەم: (وتاری سەردەم)


| بابـــەت | لاپـەڕە |
| --- | --- |
| پێشـــەکی | ٢ |
| بیروباوەڕەکەت ئەی موسڵمان | ٤ |
| بیروباوەر ژیانە | ٨ |
| زیان ومەترسیەکانی شیرك | ١٠ |
| جادوگەری وفاڵچێتی | ١٣ |
| ڕۆڵ وپێگەی مزگەوت | ١٦ |
| ڕۆڵی زانایانی ئاینی لەڕاپەڕینەکاندا | ١٩ |
| بنەمای سیستمی ئیداری لەئیسلامدا | ٢٤ |
| فەرمان بەچاکەوڕێگری لەخراپە | ٢٧ |
| ئاینی - ورفی وچاولێکەری | ٢٩ |
| ڕەوشتی اوەڕدار | ٣٤ |
| دادپەروەری چارەسەرە | ٣٧ |
| پرسی گەندەڵی | ٤٠ |
| بەکێ دەڵێن ڕۆشنبیر؟ | ٤٣ |
| هەستکردن بەچاودێری خوا | ٤٧ |
| زوڵم وستەم | ٤٩ |
| ئەوەی پەندوەرنەگرێ ئەبێ بەپەند | ٥٢ |
| یادی لەدایك بونی پێغەمبەر(ﷺ) | ٥٦ |

| بابـــەت | لاپـەڕە |
|---|---|
| مافی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرشوێنکەوتوانی .......... | ٥٧ |
| پەیامی مانگی مەولود .......................... | ٦٧ |
| تۆئەوەی کەبیردەکەیتەوە .......................... | ٧٠ |
| گەشت وسـەیران ................................ | ٧٤ |
| نیشانەکانی قیامەت | ٧٧ |
| کارەساتی بەناوئەنفال .............................. | ٨١ |
| عەرەبی دوێنێ ونەمڕۆ .............................. | ٨٢ |
| تەکنەلۆژیای‌زانستی لە .............................. | ٨٤ |
| ڕۆژی جیهانی ساوایان .............................. | ٨٧ |
| بەدوای دنیادا ڕامەکە .............................. | ٩٥ |
| ڕێڕەوی وتاری ئاینی | ٩٨ |
| پەتای حیزبایەتی .............................. | ١٠٠ |
| مارەبڕین وگواستنەوە .............................. | ١٠٢ |
| هاوشانی هاوسەران .............................. | ١٠٦ |
| مەئزونی شەرعی .............................. | ١٠٩ |
| بەختیاری خێزان .............................. | ١١١ |
| ئیسلام نەرم ونیانە .............................. | ١١٥ |
| هیممەت بەرزی شێرانە .............................. | ١١٨ |
| تەقوا چیەوچۆنە .............................. | ١٢١ |
| نوێژ ئارامی وبەختەوەریە .............................. | ١٢٥ |
| کاریگەری خراپی تاوان .............................. | ١٢٧ |

| بابەت | لاپەرە |
|---|---|


وانەكانی ئیسراومیعراج ........................ ١٣٠

نەزەری حەرام ........................ ١٣٢

نەزەر بەریدی زینایە ........................ ١٣٦

چۆن ڕزگاربین لەم بارە........................ ١٣٨
لە دوای ناخۆشیان خۆشیە

خۆناسین ........................ ١٤٣

كێن ئەوانەی خۆدەكوژن ........................ ١٤٤
بەردەوامبە و ڕاوەستاوبە چەنز تەوساوێتنا

حیكمەتی حەرامبونی بەراز........................ ١٤٦

شمشێرلەئیسلامدا ........................ ١٥٠

كاریگەری دەستنوێژلەسەرتورەبون........................ ١٥٤

ڕاگەیاندن ئەمانەتە(میدیا) ........................ ١٥٨

جاســوسی ........................ ١٦٤

ئازادبون لەزیندان ........................ ١٦٩

فەزڵ گەورەیی قەرزدان ........................ ١٧٥

ئەوانەی خواسەیریان ناكات........................ ١٧٩

ئەوانەی فریشتەسلاویان لێدەكەن........................ ١٨٥

سیفاتی ئیماندارانی راستەقینە........................ ١٨٩

ماددە هۆشبەرەكان(مەیخۆری)........................ ١٩٧

ریفۆرم(چاكسازی) ........................ ٢٠٢

نرخ وبەهای مرۆ لەیاسای خەلكوخوادا........................ ٢٠٥

پێرست (ناوەرۆك)........................ ٢١٠

پێڕستی بەرگی دووەم: (**مینبەری سەردەم**)


| بابـــــەت | لاپـەڕە |
|---|---|
| پێشـەکی ........................................ | ٢١١ |
| ڕێبازی موسڵمان کامیانە.................. | ٢١٢ |
| زەمین لەرزە ........................................ | ٢١٦ |
| قەرزو قیست ........................................ | ٢٢٠ |
| پێشەواوڕابەر ........................................ | ٢٢٤ |
| غەفلەت وبێناگایی ........................................ | ٢٢٧ |
| نەورۆزی کوردان ........................................ | ٢٣٠ |
| توندوتیژی ........................................ | ٢٣٢ |
| کوشتن وبڕین ........................................ | ٢٣٧ |
| بازرگانی بەمرۆڤ! ........................................ | ٢٤١ |
| ئەنفال لەمیدیاوسیاسەتدا.................................. | ٢٤٤ |
| سوکایەتی بەپیرۆزیەکان ........................................ | ٢٤٧ |
| ئاوسەرچاوەی ژیانە ........................................ | ٢٥٠ |
| پاراستنی ژینگە ........................................ | ٢٥٤ |
| ناسودەیی وئارامی ........................................ | ٢٦٠ |
| چارەسەری وەسوەسە ........................................ | ٢٦٣ |
| دین وژین ........................................ | ٢٦٦ |
| جـەژنی قوربان ........................................ | ٢٦٩ |

| بابـەت | لاپـەڕە |
| --- | --- |
| پەندەکانی جەژنی قوربان........................................ | ٢٧٢ |
| ئامانجەگەورەکە ........................................ | ٢٧٤ |
| گرنگی پەروەردە ........................................ | ٢٨٢ |
| ڕەهەندەکانی کۆچ ........................................ | ٢٨٦ |
| تـەلاقـدان ........................................ | ٢٩٠ |
| لەئەوروپابینیم وبیستم ........................................ | ٢٩٦ |
| زمانی ژمارەلەقورئاندا ........................................ | ٣٠٠ |
| فێربون بەزمانی ژمارە ........................................ | ٣٠٣ |
| کاریگەری ورەبەرزی بۆگۆران وچاکسازی........................................ | ٣١٧ |
| هیممەت بەرزی پیرەژنێکی بەنی اسرائیل........................................ | ٣١٩ |
| فەرمان بەچاکەورێگری لەخراپە هەنگاوی........................................ | ٣٢٠ |
| نەفامێتی هاوچەرخ ........................................ | ٣٢٢ |
| جۆرەکانی نەفامی ........................................ | ٣٢٨ |

## پێڕستی بەرگی سێیەم: (قسەی سەردەم)

| بابـــەت | لاپـەڕە |
| --- | --- |


| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پرۆسەی خوێندن وسەرنج ............................. | ٣٣٠ |
| سیستمی پەروەردە ............................. | ٣٣٤ |
| تێکەڵی کوڕان وکچان | ٣٣٧ |
| گەنجانی ئەمڕۆودوێنێ ........................... | ٣٣٩ |
| چاولێکەری دەردێکی کوشندەیە........... | ٣٤٢ |
| کلتوری بێگانەوخۆمانه ........................ | ٣٤٤ |
| ڕۆژی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی.......... | ٣٤٧ |
| ڕۆژی جیهانی خۆشەویستی(ڤالانتاین)............ | ٣٥١ |
| ڕۆژی جیهانی ئایدز ......................... | ٣٥٤ |
| مافی کرێکارلەئیسلامدا ..................... | ٣٥٦ |
| ڕۆژی جیهانی کرێکاران ...................... | ٣٥٧ |
| ڕۆژی جیهانی بەساڵاچوان ..................... | ٣٦٠ |
| تەمەنی پڕبەرەکەت ............................ | ٣٦٢ |
| ڕۆژی جیهانی هەژاری ........................ | ٣٦٣ |
| ڕۆژی جیهانی کەمئەندامان ................... | ٣٦٦ |
| ڕۆژی جیهانی تەندروستی دەرونی............ | ٣٦٨ |
| ڕۆژی جیهانی لێبوردن ......................... | ٣٧٠ |
| جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ.............. | ٣٧٢ |

